# شازادەی حەمام

بیرەوەرییەکانی

## محەمەد حسین پاپولی یەزدی





بەرگی سێیەم

پێداچوونەوە و دارشتنەوەی:
سالح بێچار

وەرگێرانی لە فارسییەوە:
تەها سێکانیانی

# شازادەی حەمام

**نوسینی: محەمەد حسین پاپولی یەزدی**
بەرگی سێیەم
**وەرگێڕانی: تەها سێکانیانی**
**پێداچوونەوە: ساڵح بێچار**
**تایپ: بەیان رەحیم، رێژنە محەمەد**
**دیزاین: هەرێم عوسمان**
**چاپ: چاپخانەی کارۆ**
**تیراژ: ١٠٠٠ دانە**
**نۆبەتی چاپ: چاپی یەکەم**
**ساڵی چاپ: ٢٠١٩ - سلێمانی**
**نرخ: ٨٠٠٠ دینار**

لە بەرێوەبەرێتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارەی سپاردنی ( ١٥١٥) ی ساڵی ٢٠١٩ ی پێدراوە

# پێڕست


پێشەکی وەرگێڕ ........ ٧
پێشەکی نووسەر ........ ٩
تـــرس ........ ١١
نوێخوازی وخۆشەویستی ........ ٢٠
یـــــەڵدا ........ ٢٥
مسگەرە گەڕۆکەکان ........ ٥٣
کوبراو نیلۆفەر ........ ٨٥
بارامی دارابیان (ناسراو بە بارامەسمێڵ) ........ ١٢٤
یادەوەری زانکۆی مەشهەد ........ ١٣٠
دوویادەوەری لە ئەسفەهان ........ ١٣٥
یەکەم ماڵ لە مەشهەد ........ ١٣٩
ڕەوشی مەشهەد ساڵی ١٣٤٦ /١٩٦٧ ........ ١٤١
ڕەوشی کۆلێژ ........ ١٤٦
ئـــومێد ........ ١٦٦
حسێن عەلی ........ ١٧٩
کوردە کۆچەریەکانی خۆراسان ........ ١٨٠
بێـــژەن ........ ١٨٨
گوڵبەهارو مەراسیمێک ........ ٢١٣
مەرایی کردن بۆ خان ........ ٢٢٤
کۆچ ........ ٢٣٨

پۆلیـس ..................... ٢٨١
نەخۆشی ..................... ٢٩٣
ئامادەبوون لە هەوار ..................... ٣٠٠
زەماوەندی بێژەن ..................... ٣١٩
کۆچی زستانە ..................... ٣٢٤
حەمید تورکمان ..................... ٣٢٨
قورەمەیدان – پەری خانم ..................... ٣٣٤
گەردەنەی شـــەلمی ..................... ٣٧٧
گوندی ڕاجی ..................... ٤٠٧
گەڕبووانی گوند ..................... ٤٤٩
ڕۆیشتن لە گوند ..................... ٤٥٢
ڕۆیشتن لە ئاشخانە ..................... ٤٦٤
هاوڕێیانم لە تاران ..................... ٤٦٩
دووبارە بێژەن ..................... ٤٨٢
یـــەلـــە ..................... ٤٨٤
وێنە یادگارییەکان ..................... ٤٩٣

## پێشەکی

خوێنەری بەڕێز!

ئەم کتێبەی بەردەستت بەرگی سێیەمی شازادەی حەمامە، ساڵی ڕابردوو، بەرگی یەکەم و دووەم، پێکەوە لە توێی کتێبێکدا چاپکرا، هەڵبەت خودی نووسەریش بەرگی یەکەم ودووەمی هەر بە کتێبێک چاپ کردووە. دەمەوێت بڵێم بەرگی سێیەم، زۆر لە دوو بەرگەکەی دیکە جیاوازترە. خودی نووسەریش لە کورتە پێشەکییەکدا نووسیویەتی و دەڵێت: «ڕاستییەکەی ئەوەیە بەرگی سێیەم وەک بەرگی یەکەم و دووەم نییە، بۆیە ئەگەر حەزناکەیت مەیخوێنەرەوە.».

منیش تەنها دەڵێم ئەگەر دەیخوێنیتەوە، تکایە زۆر بە وردی بیخوێنەرەوە!

حەزدەکەم بە خوێنەرانی ئازیز بڵێم، کاتێک خەریکی وەرگێڕانی ئەم بەرگەی «شازادەی حەمام» بووم، چوومە وڵاتی ئێران و سەردانێکی شارەکانی یەزد و مەشهەد و باکووری خۆراسانم کرد بۆ ئەوەی بە چاوی خۆم ئەو شوێنانە ببینم کە نووسەر لەم بەرگەدا باسی کردوون. هەر لەو سەردانەدا لە شاری یەزد چاوم بە بەڕێز پاپۆلی یەزدی کەوت، هاوکات بە بۆنەی ڕۆژی کتێبی ئێرانەوە، پاپۆلی سیمینارێکی هەبوو، بەڕێزیان بەندەشیان بانگهێشتی ئەو سیمینارە کرد، هەر لەوێش منی بە پارێزگاری شاری یەزد و چەند کەسێتییەکی تر ناساند. هاوکات پارێزگاری یەزد سەبارەت بە وەرگێڕانی کتێبی «شازادەی حەمام»، خەڵاتی ڕێزلێنانی پێبەخشیم. پاشان سەردانی باکووری خۆراسانم کرد و چوومە شارەکانی قوچان و شیروان و بۆجنوورد و ئاشخانە، کە زۆربەی زۆری

دانیشتووانەکانیان کوردن و بە شێوەزاری شکاک قسە دەکەن. هەروەها چوومە دەشتی قوڕەمەیدان و گەردەنەی شەلەمی هەموو ئەو شوێنانەم بە چاوی خۆم بینی کە نووسەر لەم بەرگەی یادەوەریەکانیدا باسیان دەکات کە چۆن چووەتە ئەو ناوچانە و سەردانی کوردە کۆچەرییەکانی کردووە. چیرۆکی هەژاریی و دەردەسەرییەکانیان دەگێڕێتەوە. باسی ئەوەش دەکات کوردەکان ڕێزێکی زۆریان گەتووە، باس لەوەش دەکات هەر لەوێ سێ کچی کورد بەنیازی کوشتن، زۆر خراپ ئازاریان داوە.

لە سەردانەکەمدا بە دکتۆر پاپۆلی‌م گوت ئێستا ئێمە خاوەنی کوردستانێکی ئازادین، لە کاتێکدا بەڕێزتان هەموو جیهان گەڕاون، کەچی لەم نزیکەوە هەرێمی کوردستانی ئازادتان نەبینیوە، پێمخۆشە سەردانێکی کوردستان بکەن، ئەویش بە خۆشحاڵیەوە بەڵێنی پێدام کە سەردانمان بکات و لە نزیکەوە کوردستان ببینێت.

دواتر بەڕێزیان بەڵێنەکەی خۆیان بردە سەر و ڕۆژی (۱۶-۳-۲۰۱۹) تەشریفیان هێنا و چوومە مەرزی باشماخ بۆ پێشوازیکردنی خۆی و دکتۆر فاتیمەی وسوقی هاوسەری و فەربودی کوڕیان.

لە ماوەی مانەوەیدا زۆر شوێن گەڕاین، بە هاوکاری هاوڕێم (ساڵح بێچار) ی شاعیر سەردانی مۆزەخانەی نیشتمانیی (ئەمنەسوورەکە) و سەرۆکایەتی زانکۆی سلێمانی‌مان کرد، کە لەلایەن دکتۆر ڕەزا حەسەن سەرۆکی زانکۆی سلێمانی و مامۆستا ئەرکان عەبدوڵڵا سەرۆکی بەشی زمان و ئەدەبی فارسی - کۆلێژی زمان و چەند مامۆستایەکی دیکەی زانکۆوە پێشوازییەکی گەرم و شایستەیان لێکرا.

ماوەتەوە بڵێم (بێچار) ی هاوڕێم، وێڕای پێداچوونەوە و داڕشتنەوەی ئەم بەرگەش، هاوکات ئەو چەند نموونە شیعرەشی هەر بە شیعر وەرگێڕاوە کە (پاپۆلی) لە هەندێک شوێندا و بۆ بەهێزکردنی گێڕانەوەکانی لە شیعری کۆن و نوێی فارسی وەریگرتوون.

تەها سێکانیانی

۲۰۱۹-۵-۱

# پێشەکی نووسەر

**لە ڕێبوارانی چی ماوە جگە لە بەسەرهاتیان**
**دوای ئێمەش، چیرۆکێک دەمێنێتەوە**
**هەر کەسە و بە جۆرێک دەیگێڕێتەوە**
(شەهریار)

هاوڕێکانم زۆر هانیاندام، زۆر باسی بەرگی یەکەم و دووەمی «شازادەی حەمام»یان کرد، زانیم کە پێداهەڵگوتنی ئەمانە ڕاستە. بۆچی باسکردنەکەیان ڕاستە؟ چونکە کتێبەکەیان کڕیوە و پێشکەشی هاوڕێکانیان کردووە. ئێستا چاپی دەیەمی بەرگی یەکەم و دووەم تەواو بووە، خۆیشم حەزمکرد و بەرگی سێیەمم نووسی، ڕاستییەکەی ئەوەیە بەرگی سێیەم وەک بەرگی یەکەم و دووەم نییە، بۆیە ئەگەر حەزناکەیت مەیخوێنەرەوە.

هاوشارییەکی بەڕێزم تەلەفۆنی بۆکردم، گوتی تۆ کاک حسێنیت. گوتم: بەڵێ زۆر زۆر باسی «شازادەی حەمام»ی کرد، گوتی باپیرەم کتێبی «شازادەی حەمام»ی کڕیووە و خوێندویەتیەوە. ئەو هەموو کوڕ و کچ و زاواکانی و نەوەکانی ئاگادارکردۆتەوە، ئەوانیش ئەو کتێبە بخوێننەوە. ئەو خانمە بەڕێزە گوتی ئەو کەسی سی و هەشتەمینە لە خزمەکانی وا کتێبەکە دەخوێنێتەوە. پێمگوت چۆن دەزانیت کە تۆ سی و هەشتەمین کەسیت کە کتێبەکە دەخوێنیتەوە؟ گوتی باپیرەی پێی گوتوون هەر کەسێک کتێبەکەی خوێندەوە ناوی خۆی لە پەڕە سپیەکەی سەرەتای کتێبەکەدا بنووسێت. زنجیرەی ئەو سیوهەشتە. بەو هاوشارییە خۆشەویستەی خۆمم گوت: کارێک خزمەتێکت هەبێت. ئەویش گوتی حسێن ئاغا، لاپەڕەکانی (١٤١-١٤٢) ی کتێبەکەیان دڕاوە. ژمارەی فاکسێکت بۆ دەنێرم، بەڵکو ئەو دوو لاپەڕەیەم بە فاکسدا بۆ ڕەوانە بکەیت. من زۆرخۆشحاڵ بووم کە هاوشارییەکەم کتێب دەخوێنێتەوە و زیادە خەرجیش ناکات، ئەوەندە خۆشحاڵ بووم هەر بۆیەش دەستمکرد بە نووسینی بەرگی سێیەم.

**محەمەد حسێن پاپۆلی یەزدی**

# ترس

ساڵی (١٣٩١-٢٠١٢)، دایکم تەمەنی هەشتاوهەشت ساڵ بوو. دیارە تەمەنێکی زۆر بووە، بەڵام ئەو بە جۆرێکی قسەی دەکرد کە هەر پێنج ساڵێک لە من گەورەتر بێت. ئەو خۆی دەیگوت کاتێک کە شووی بە باوکم کردووە تەمەنی لە نێوان (١٥-١٦) ساڵیدا بووە. من دوای هەشت ساڵ لە زەماوەندیان لەدایکبووم. سوپاس بۆ خودا لە تەمەنی هەشتاوهەشت ساڵیدا تارادەیەک بیری باشە. دایکم هەموو ڕۆژێک دوای نیوەڕوان لە شاری یەزدەوە بە تەلەفۆن قسەم لەگەڵدا دەکات. ئەو وای پێخۆشە خۆی تەلەفۆنم بۆ بکات، زۆری پێیخۆشە هەموو ڕۆژێک ئاگاداری تەندروستی و جۆری خواردنەکانی من بێت. هەموو ڕۆژێک پێم دەڵێت ساردەمەنی نەخۆیت، کاهو، کەلەرم، ماست، بەتایبەتی گۆشتی گوێرەکە نەخۆیت، ئەو دڵنیایە ساردەمەنی بۆ من وەک ژەهر وایە. ئەو دەڵێت تۆ کوڕی کەسێکی تلیاک کێشیت، باوکت تلیاک کێش بووە، کەسێک کە کوڕی پیاوێکی تلیاک کێش بێت نابێت ساردەمەنی و گۆشتی سوور بخوات. منیش جارجارێک بە شۆخییەوە پێیدەڵێم، ئەمڕۆ گۆشتی گوێرەکەم خواردوە بەماست و زەڵاتـەی کاهوو و کەلەرم و خەیار و سـەوزەوە. ئەویش دەڵێت نا، نا نەکەیت ئەوشتانە نەخۆیت، ئەوانە تووشی نەخۆشیت دەکەن، توڕەییت زیاد دەکات و دەسەڵاتت لەدەست خۆتدا نامینێت، تووشی شەڕ دەبیت، خۆ تۆ کەسێکی شەڕەنگێز نیت، قەڵەمت دەردەکەیت هەرچیت بووێت لەسەر کاغەز دەینووسیت. دایکم ڕاستدەکات، ئەگەر من لەم بەرگەدا بیرەوەرییەک بنووسم کە هەندێک کەس پێیان ناخۆش بێت ئەوە هۆکارەکەی دەگەڕێتەوە بۆ خواردنی ساردەمەنی، هەرچییەک بنووسم پەیوەندی بە ساردییەوە هەیە، تاوانەکەی لە ئەستۆی ساردەمەنی و خەیار و سەوزە و گۆشتی سووردا دەبێت. دیارە منیش هەوڵدەدەم ئەوەندە ساردەمەنی نەخۆم کە تووشی ئیفلیجی ببم. ئێوەش خۆتان باش دەزانن بۆ بەرزبوونەوەی پلەی گەرمی لەش پێویستە نەبات بخۆین. نەباتی یەزد یەکێکە لە باشترین نەباتەکانی جیهان. دایکم ڕۆژانە پێم دەڵێت ڕۆڵە بنووسە یەزدییەکان زۆر خەڵکی باشن، زۆر خێرەوەمەندن، پەنجا ساڵ پێش ئێستا ئاغای هیراتی و ڕەسوڵیان و سەرابزادە لە سەرمای زستاندا لێفە و دۆشەک و خەڵوزیان بەسەر خەڵکیدا دابەشکردووە. دایکم دەڵێت بنووسە حاجی محەمەد حسێنی بەرخودار مزگەوتێکی جوان و باشی دروستکردووە، بنووسە ئاغای ڕەسوڵیان لە شاری تاراندا بەشی ناوخۆیی بۆ خوێندکاران دروستکردووە. حاجی محەمەدی سەراف مەڕاسیمی

قورئان خوێندنی پێکدەهێنا. ئاغا سەید محەمەد ئاغا، ئاوی خواردنەوەی بۆ شاری یەزد ڕاکێشا و حسێنیەیەکی گەورەی دروستکرد. بنووسە ئاغای کەرادغولی سەرۆکی کارگەی ئیقبال بوو، هاوکارییەکی باشی کرێکارەکانی دەکرد. بنووسە ئاغای مەسعودی عەمباری ئاوی دروستکردووە، بنووسە خانّ بەهادور چەندین کاری خزمەتگوزاریی ئەنجامداوە، بنووسە بنەماڵەکانی ئەمین و گرامی و ئاگا، چەندین خزمەتی گرنگیان بە یەزد و کرمان و ڕەفسنجان کردووە. ئەو بە من دەڵێت مەگەر خۆت نەتگوت ئەو دوو ساڵ مووچەی شەش کارمەندی تۆی داوە. ئەو کارمەندانەی لە نووسینی کتێبدا هاوکاریان کردویت. ئاگاداربە ئەو کارانە بە جوانی بنووسە. دایکم دەیگوت بنووسە، مامە میرزا عەلی ئەکبەر موقتەدەری، کاری باشیکردووە. بنووسە ئاغای عەباسی ئوستادان، جەژنانەی دەدا بە پاسەوانەکان، بنووسە زەردەشتییەکان چەندین قوتابخانەیان دروستکردووە و زۆر خەڵکی باشن، بنووسە یەهودییەکانی بازاڕی خان، خەڵکێکی زۆر سەر ڕاستبوون، بنووسە دراوسێکانی خۆمان هەموویان کەسانی دەوڵەمەند بوون، بنووسە باپیرەت پیاوێکی باش بووە، کەسێکی بە دین و پیرۆز بووە، بنووسە مامەکانت کەسانی زۆر باشبوون، بنووسە حاجی ئاغا سەید محەمەد وەزیریی، چەندە زەحمەتی کیشا تا کتێبخانەی وەزیریی دامەزراند، بنووسە ئێمە دەوڵەمەند و پارەدار بووین، هیچ کەموکوورییەکمان نەبووە، بنووسە یەزدییەکان زۆر دیندار و لە خودا ترس بوون، بنووسە یەزد باشترین شاری جیهان بووە و ئێستاش باشترینە. زۆر باشە، ئەو دایکە و ڕێزگرتنی فەرزە ئەو دایکە و لە هەمان کاتدا باوکیش بووە بۆ من. ئەو دایکە کاری دەکرد و خوریی دەڕست، تاکو بژێوی بۆ من پەیدا بکات. دایکم دەیگوت: بەڵام کە ئەم شتانەت نووسی، ئاگاداربە نەنووسیت دایکم کاری کردووە، کاتێک تۆ هەندێک لە ڕووداوەکانی یەزد دەنووسیت، من هەموو گیانم دەکەوێتە لەرزە، بە دەست خۆم نییە تەواو تووڕە دەبم، چۆن تۆ دەتەوێت یادەوەریی سەردەمی منداڵیی خۆت بنووسیتەوە؟ چۆن دەنووسیت باوکت سێ ژنی هەبووە؟ خوشکەکەت ئەوەی پێخۆش نییە. چۆن دەنووسیت مامەکانت چیان کردووە؟ دڵنیابە کچە مامەکانت پێیان خۆش نییە، چۆن دەنووسیت کە کوڕە مامەکانت فلان کارییان کردووە؟ ئەوان هەرگیز پێیان خۆش نییە. ئەو دەیگوت تەنها بنووسە، خەڵکی شاری یەزد زۆر خوداپەرست و دیندارن، وەک فریشتەوان، پارەدار و دەوڵەمەندن، وەک فەرەح لەقا. بەڵام من دەمەوێت هەموو کارە باش و خراپەکانی هاوشارییە خۆشەویستەکانی خۆم بنووسم. هەر لە دروستکردنی مزگەوت و قوتابخانە، تا تلیاک کێشان و مەی خواردنەوە و سووخواردن و ڕۆیشتن

بۆ مەکە و مەڕاسیمی قورئان خوێندن، زۆربەی خەڵکی ئەم کارانەیان کردووە. دایکم دەیگوت باوکت عەرەقی نەدەخواردەوە، بەڵکو کۆنیاک و ویسکی دەخواردەوە. واتە دەیگوت ئێستا کە دەتەوێت بنووسیت باوکت عەرەقی خواردۆتەوە جۆرە گرانەکەیان بنووسە. ئەو هەتا لە مەی خواردنەوەشدا دەیویست جۆرە باشەکەیان بخواتەوە. بڵێ ئاغای میرزا پاپۆلی عەرەقخۆر نەبوو، بەڵکو هەر کۆنیاک و ویسکی خواردووەتەوە. ئاخر لەو سەردەمەدا عەرەق هەرزان بوو، چینە هەژار و نەبووەکە دەیانخواردەوە، بەلام کۆنیاک و ویسکی گران بوون، خەڵکە دەوڵەمەند و پارەدارەکان دەیانخواردەوە. یەکێک لە تایبەتمەندییەکانی شارەکەی ئێمە وەک خەڵکی هەر وڵاتێک، دەیانەوێت خۆیان بە گەورە نیشان بدەن. تایبەتمەندییەک کە ڕۆژ بە ڕۆژ بەرەو فراوانی دەڕوات. خەڵکی خۆیان قەرزار دەکەن، چونکە دەیانەوێت خۆیان بە گەورە نیشان بدەن. خەڵکی یەک ڕواڵەت و یەک بیرکردنەوەیان هەیە. کاریان بە ژیانی تایبەتیەوە نییە، بەڵکو کاریان بەسەر کردەوەکانی دەرەوە هەیە.

لە ساڵەکانی (١٣٤٠-١٣٥٠-١٩٦١-١٩٧١) خەڵکی یەزد و تەواوی شارەکانی تری ئێران، هەر کارێکیان بکردایە کاری ساختەچیەتی و قۆڵبڕینیان نەدەکرد. لە هەر شارێکدا خەڵکی باش و خراپ هەیە، خەڵکی شارەکەی ئێمە بەگشتی باشن، لە تەواوی ئێرانیشدا بە خەڵکی باش ناسراون. خۆ ناشکرێت بڵێین شارێک بەگشتی خەڵکی باشن، بەلام دایکم دەڵێت بنووسە خەڵکی شارەکەمان هەموویان باشن، باش، باش. ئێوە وا هەست دەکەن، ئەم قسانە تەنها قسەی دایکمە، نا.. نەخێر وا نییە، ئامۆزاکەشم حاجی جەوادی پاپۆلی، پارچە کاغەزێکی هێناوە و پیشانمی دەدات، کە تێیدا نووسراوە زەکاتی شەرعییان داوە. زەکاتێک کە خودالێخۆشبووی باوکی، واتە حاجی محەمەد عەلی پاپۆلی ساڵی (١٣٣٩-١٩٦٠)، داویەتی. ئەو پێیگوتم ئەمانە بنووسە. منیش پێیدەڵێم ئامۆزا گیان خۆت خوێندەوارییت هەیە و خۆت بینووسە، من یادەوەریی خۆم دەنووسم، باوکی شەرعی من، واتە مامی تۆ هەرگیز زەکاتی نەداوە. باوکم سێ ژنی هەبووە، مەی خۆر و تلیاک کیش بووە، کوا پارەی بۆ ماوەتەوە، تاکو زەکاتی لێ دەربکات؟ خۆ ئەگەر پارەشی هەبووایە، ئەو کەسێکی بێباوەڕ بووە و زەکاتی نەدەدا. کاتێک باوکم مردووە، من تەمەنم شەش ساڵ بووە، بەلام لە تەمەنی چوار ساڵییەوە هەموو شتێکم دێتەوە یاد، نەمدیوە باوکم تەنها یەک جاریش نوێژی کردبێت. بیرمدێت جارێکیان بەیانی زۆر زوو، منی برد بۆ ماڵی ئاغای ئەسفەهانییان بۆ مەڕاسیمێکی ئایینی، تەنانەت لە ژوورێکی هەمان ماڵدا، هەموو پێویستیەکانی تلیاک کێشان ئامادەکرابوو. ئەوە تەنها جارێک بوو

کە لەگەڵ باوکمدا چووم بۆ مەڕاسیم و تا ئێستاش ئەو یادەوەرییەم لەبیرماوە. ئێستا لەوانەیە عەلی ئەکبەر شیر سەلیمیانی هاوڕێم، بنووسێت یەزد وەک کرمان نەبوو، لە مەڕاسیمەکانی یەزددا تلیاک کێشان نەبووە. تلیاک کێشان تایبەت بووە بە کرمان. نا، هاوڕێی بەڕێزم لە هەردوو شارکەدا لە کاتی خوێندنی مەڕاسیمدا تلیاک کێشان هەبوو. هەر وەک لە زۆربەی شارەکانی تریشدا هەبوو. خودا لێیان خۆشبێت، چەند کەسێک لە ساڵی (١٣٣٤-١٩٥٥) دا، تلیاک کێشانیان لە مەڕاسیمەکاندا قەدەغە کرد. لەو کاتە بەدواوە هەموو پێداویستییەکانی تلیاک کێشانیان کۆکردنەوە، ئەم بەهانەیەشم لەو هاوڕێ بەڕێزەمەوە بیرهاتەوە. دایکم دەیگوت جوان بنووسە کە باوکت نوێژکەر بووە، باوکت بە داهاتی زەوییە کشتوکاڵیەکانی دەژیا. تۆ چۆن دەنووسیت باوکت سوو خۆر بووە؟ منیش دەڵێم بەسەرچاو نانووسم باوکم سوو خۆر بووە، بەڵام دەنووسم کە باوکم کۆنیاکی خواردۆتەوە. دایکم توورە دەبێت. منێش دەڵێم ئەگەر سوو خۆر نەبووە ئەو قەرزانەی کە بە میرات بۆ من مابوونەوە لە کوێوە هات؟ ئەو پسوڵانەی کە ئاغای یەدوڵڵا و کوڕەکانی پارەکانییان پێنەدام. ئەگەر کەسێک پارە بە سوو بدات، دەبێت هەمیشە چاوەڕوانی ئەوە بکات کە پارەکەی بخورێت. سوو خۆرەکان وەک خاوەن بانکەکان نین تا یاسا و دەزگا حکومییەکان پشتیوانیان لێ بکات. ئێوە شێوازی قەرزی ئیسلامیتان خوێندۆتەوە، ئەگەر سوو خۆرەکان شێوازی قەرزی ئیسلامی بخوێننەوە، خەڵکی پێیان دەڵێت ئەوان دەیانەوێت حیلە شەرعی دروستبکەن. بە دایکم دەڵێم ئەو چەکەی کە مامە میرزا عەلی ئەکبەر، پارەکەی نەدا و هەرچەندە بڕیاری دادگاش هەبوو کە ئەو پارەیە بدات، من ئێستا دەبێت چی بکەم؟ دایکم دەڵێت من ڕازی نیم تۆ ئەو باسانە بنووسیت، تەنها بنووسە یەزد شاری عیبادەت و خودا پەرستییە، خەڵکەکەی زۆر دیندارن، هیچ کەسێک لەم شارەدا کاری خراپ ناکات، هیچ کەسیک ئالودە نییە، هیچ کەسێک لە هاوسەرەکەی جیا نابێتەوە، هیچ کەسێک کاری خراپ ناکات.. بەهەرحاڵ، دایکم هەمیشە دەترسێت، لە من دەترسێت، دەترسێت کە من ئەم شتانە بنووسم، منیش لە ئەو دەترسم، دەترسم بزانێت کە ئەوشتانەم نووسیوە، من لە ئێوەش دەترسم. ئاخر دایکم خوێندەواریی نییە، ناتوانێت ئەم نووسراوانە بخوێنێتەوە، کەسێکی وەکو ئێوە دەچێتە لای و هەموو ئەو نووسراوانەی بۆ باس دەکات.

دایکم ساڵی (١٣٤٨-١٩٦٩) هات بۆ مەشهەد و لێرە نیشتەجێ بوو. ئەوکات هێشتا گەنج بوو، ڕۆیشت بۆ قوتابخانەی گەورەکان، پۆلی یەکەمی سەرەتایی خوێند، لە کتێبەکەیاندا نووسرابوو زینەت فلان کار دەکات، دایکم یەکەم کار کە کردی ناوی خۆی

گۆڕی بۆ زینەت، بە دراوسێکانی گوتبوو من ناوم زینەتە. ئێستاش دراوسێ کۆنەکانی مەشهەد کاتێک من دەبینن پێمدەڵێن کوڕی زینەت خانمی یەزدی. سوودی خوێندەوارییەکەی دایکم هەرئەوەندە بوو، وەک ئەوەی حەز بە ناوی خەدیجە نەکات. دیارە پاش ماوەیەکی کەم ئەو کەمە خوێندەوارییەشی بیرچووەوە. ئەو ژمارەشی خوێند، بەڵام دایکم چەند هەزار دێڕ لە هۆنراوەکانی حافزی لەبەرە، حەز بەنازناوەکەی خۆشی کە (بیدە) یە، ناکات. ساڵی (١٣٥٣-١٩٧٤) بەیەکەوە چووین بۆلای دکتۆری چاو، کاتێک دکتۆر لێی پرسی تۆ ناوت چیە؟ گوتی ناوم زینەتە. منیش گوتم نازناوی بیدەیە. دایکم هاواری کرد و گوتی بیدە و با، دایکم وای هەستکرد بوو ئەو دکتۆرە کە خەڵکی مەشهەد بوو ئەویش دەزانێت. گوندی بیدە لە کوێیە؟ دەزانێت کە بیدە گوندێکی ناخۆش و وێرانەیە، شوێنێکە خەڵکە هاوتەمەنەکانی دایکم بە پێپەتی بە کۆڵانەکاندا دەسوڕێنەوە و هەموو بێ جلوبەرگ بوون، زۆربەیان شەوانە نان نەبوو بیخۆن و بەبێ خواردن سەریان دەنایەوە. دایکم وای هەستدەکرد کە دکتۆری مەشهەدیش دەزانێت بیدە نیوەی خەڵکەکەی تووشی کەچەڵی و چاوئێشە بوون و زۆربەیان بەهۆی نەخۆشییەوە کەڕ و کوێر ببوون. خەڵکانی هەژار و نەخۆشی بێ دکتۆر و دەرمان ماونەتەوە. دایکم لە تەمەنی حەفتاوحەوت ساڵیدا ڕۆیشتبوو ناسناوەکەی خۆی گۆڕی بوو. چونکە حەزی لە ناسناوی بیدە نەبوو. دایکم وای هەستدەکرد ئەو دکتۆرەش دەزانێت بیدە کاتێک ئاوەدان کراوەتەوە کە خەڵکەکەی بۆ کار و کاسبی بەرەو کوێت ڕۆیشتبوون. دایکم وەک زۆربەی ئەو خەڵکە دوو تایبەتمەندیی هەیە. ئەویش ئابڕوو و ترسە. ئەو زۆر دەترسێت، لە هەموو شتێک دەترسێت، نەک وەک ئەوەی لە گورگ و پڵنگ بترسێت. هەندێک جار لە پشیلەش دەترسێت، بەڵام لە هەموو شتێک زیاتر، لە قسەی خەڵکی دەترسێت. ئەو دەڵێت ئەو خەڵکە بە دوای قسەدا دەگەڕێن تۆ یەک وشەیان لەلا بدرکێنە، ئەوان یەک دونیا قسەی پێوە دەنێن. دایکم دەیگوت ئەو خەڵکەش هەروەک تۆ وان، مەگەر تۆ چەندە یادەوەرییت هەیە؟ چۆن ئەو هەموو قسە و باسەی پێش شەست ساڵت لەیاد ماوە. دایکم دەیگوت تۆ کە دەنووسیت باوکم سوو خۆربووە. ئەو قسەیە تاکو سەد ساڵی تر کاریگەریی هەیە. تۆ نووسیوتە باوکت سێ ژنی هەبووە، ئەی نازانیت یەکێک لەخزمەکانتان چوو بوو بۆ داوای کچێک، بەڵام ماڵی کچەکە گوتبوویان ئەوانە عادەتیان وایە چەند ژنێک بهێنن، هەر بۆیەش گوتبویان ئیمە کچ نادەین بەو بنەماڵەیە. دایکم دەیگوت هەمووان، دوو ژن و سێ ژن دەهێنن. ڕەنگە هەمووان سوو خۆربن. ڕەنگە هەمووان مەی خۆربن، بەڵام بێدەنگن و قسەناکەن، ئەوانە ئەم شتانە نانووسن،

بەندەی خودا ئەی تۆ بۆچی ئەم شتانە دەنووسیت؟ دایکم لەوە دەترسا چەند کەسێک بێن و لەگەڵ کوڕەکەیدا بیکەن بە شەڕ. بۆیە ناچار من بە خودا دەسپێرێت، بەڵام هێشتا هەر دەترسێت، وابیر دەکاتەوە ڕەنگە خودا ڕق هەڵبگرێت و منداڵە جوانەکەی لێبسەنێتەوە. لەو کاتەدا بە پەلەپەل نوێژ دەکات. دراوسێیەکی دایکم لە ناوەندی شار گەوڕێکی دروستکرووە، مەڕی تێدا بەخێو دەکات، بۆنی پشقل و ڕیخ هەموو گەڕەکی هەراسان کردووە. هاوینان جگە لە بۆگەنە پیسەکەی، مێش و مێشولە دەبنە هۆی هەراسانکردنی خەڵکی، بەڵام دایکم سەد جار سوێندم دەدات بە حەزرەتی عەباس کە نابێت بچم شکات بکەم. ئەو دەیگوت ناکرێت دراوسێکان لە خۆمان بکەین بە دوژمن. ئەو دەیگوت سەیرکە دراوسێکانی تریش شکات ناکەن. ئاغای تەباتەبایش هەر شکات ناکات. ئەو ڕاستی دەگوت ئەم دراوسێ و ئەو دراوسێ شکات ناکەن، چونکە هەموویان ئاسایش و سەلامەتی خۆیان دەویست. چۆن دەکرێت دراوسێ بەیەکەوە ببن بە دوژمن؟ واتە لە ساڵی (١٣٩١-٢٠١٢) دا لە ناوەڕاستی شاری یەزد دا کەسێک لە ساڵی (١٣٨٠-٢٠٠١) وە دە ساڵە ئاژەڵداریی دەکات، تەندروستی و شارەوانی و ژینگەپارێز و هەموو لێپرسراوان دەیانزانی و کاریان بە سەریەوە نییە و چاوەڕوانی شکاتی دراوسێکانن. لە وڵاتی ئێمەدا مۆدێرنێتە و پیادەکردنی یاسا و شارستانیەت و دیموکراسی کاری زۆری دەوێت. خزم و کەسەکانی دایکم هەموو کاسبکاری ناو بازاڕن، هەر بە دوو هەفتە جارێک هەموویان لە ماڵێکدا کۆدەبنەوە. هەر پازدە ڕۆژ جارێک کۆڕێکی نزاخوێندن ڕێکدەخەن. ژمارەی ئەو کەسانەی لە کۆڕی نزاخوێندنی شەوی هەینی بەشداری دەکەن پەیوەندی بە جۆری خواردنی ئێوارەوە هەیە، ئەگەر ماڵێک برنج و کەباب ئامادە بکات، ژمارەی بەشداربووان دەگاتە (١٧٠) کەس. ئەگەر ماڵێکیش تەنها کێک و چا پێشکەش بکات، ئەوە ژمارەی بەشداربووان لە (١٥-٢٠) کەس زیاتر نابێت، بەڵام خودانەکات لەو کۆڕ و کۆبوونەوەیەدا گەنجێک بڵێت لێرە گرانییە، ئەوا لە هەر گۆشەیەکی کۆڕەکەدا چەند کەسێک دەستدەکەن بە ئامۆژگاریکردنی و پێیدەڵێن ئەو جۆرە قسانە نەکات و نەڵێت گرانییە، بەڵکو دەبێت بڵێت هەرزانییە، بڵێت هەموو شتێک زۆرە، بڵێت هەموومان ڕازیین. پاشان کەسێکی بە تەمەن ئەم گەنجە ناتێگەیشتووە دەباتە لای خۆیەوە و پێیدەڵێت مەگەر نەتبینیووە و نەتبیستووە کە پادشاکان پێش هەزار ساڵ چیان بەسەر ئەو کەسانەدا هێناوە کە ناڕەزایەتیان دەربڕیووە؟ مەگەر نەتبینی کە محەمەد ڕەزاشا چی لە فلان کەس کرد؟ مەگەر نەتبینیووە و نەتبیستووە کە دە ساڵ لەمەو پێش چیان بەسەر کەسێکی بۆڵەبۆڵکەردا هێنا؟. ئەم ترسە نەفرەتیە هەموو ڕۆحمانی کون کون

کردووە. ترسی ئەم دونیایە هەموو گیانمانی گرتۆتەوە. ترس لە دۆزەخ، ترس لە پردی سیرات، ترس لە گۆڕ، ترس لە تاریکیی گۆڕ، بەڵام ترس لەم دونیایە و لە قسەی خەڵکی لە هەموو ترسەکانی تر کاریگەرترە. بەگشتی هەموومان دەترسین و ترسی سێ هەزار ساڵە. ترسی مێژوویی، هەر ئەو ترسەیە بووە بە کۆسپ لە بەردەم گۆڕانکارییە جۆراوجۆرەکاندا، بووە بە کۆسپ لە بەردەم پێشکەوتنەکاندا. ترس تاریکیی دەهێنێت، ترس دژی گۆڕانکاری و دژی پێشکەوتنە، ئەم ترسە نەفرەتییە نەوە لە دوای نەوە بۆ ئیمە ماوەتەوە، لە باوکەوە بۆ کوڕ و لە دایکەوە بۆ منداڵ، لەبرای گەورەوە بۆ برای بچووک، لەخوشکەوە بۆ برا و لە مامۆستاوە بۆ خوێنکار و لە بەڕێوبەرەوە بۆ مامۆستا، لە وەزیرەوە بۆ بەڕیوەبەر. دایکی منیش هەر یەکێکە لەو جۆرە کەسانە، ئەویش لەم جیهانە و لەم وڵاتە و لەم شارە و لەم کۆڵانەدا ژیاوە. لە هەر دە هەزار کەسێک، یەک کەس، ڕەنگە لە هەر سەد هەزار کەسێک یەک کەس، هەندێک جاریش لەیەک ملیۆن کەس، یەک کەس ناترسێت. هەموو باوکان و دایکان و مامۆستا و دەروونناسان وا بیردەکەنەوە ئەو کەسەی نەترسێت نەخۆشە. زۆر باشە، جیاوازی من و دایکم هەر ئەوەیە، واتە من وا بیر دەکەمەوە کە نابێت لە هیچ کەسێک و لە هیچ شتێک بترسیت، تەنها لە خودا نەبێت. دایکم دەیگوت خودا میهرەبان و بەخشندەیە، خودا تاوان دادەپۆشێت، خودا حەسوود نییە. ئەو دەیگوت خودا خۆشبەختی بەندەکانی خۆی دەوێت. کێ لە کەسەکانی دەوروبەری تۆ بەوجۆرەن؟ دایکم دەیگوت بەتایبەت لەشارە بچووکەکاندا پێویستە لە خەڵکیی بترسین. دایکم دەیگوت لە پێش هەموانەوە دەبێت لە خەڵکی حەسوود بترسیت. دایکە نەخوێندەوارەکەی من دەڵێت قورئان زۆر گەورە و زۆر پیرۆزە. منیش دەڵێم چۆن؟ دەیگوت چونکە لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە (من شر حاسد اذا حسد). دایکم دەیگوت بۆچی لە قورئاندا نەگوتراوە لە شەڕی پیاو کوژ و نەزان و چەقۆکێش و دز و درۆزن پەنا بۆخودا ببەن؟ حەسود هەموو ئەم خەسڵەتانەی تێدایە. باپیرانمان سەدان ساڵ لە پێش من و تودا، لە هەموو شتێک ترساون. لە با، تۆفان، باران، تەرزە، هەورە بروسکە، لافاو، سەرما، گەرما، وشکە ساڵی، ئاژەڵی دڕندە. هەر بۆیەش بۆ هەر یەکێک لەوانە بتێکی دروستکردووە. بتێک بۆ دەریا، بتێکی تر بۆ باران، یەکێکی تر بۆ خۆرگیران. دیارە مرۆڤ لە ساتە وەختی دروستبوونیەوە بوونەوەرێکی ترسنۆک بووە. هەر بۆیەش بۆ ڕەواندنەوەی ترسەکەی پەنای بردووە بۆ ئەو دیو سروشت، بە بت و جۆرەها خوداوەندی دەستکرد پەیوەست بووە. ئەگەر بچین بۆ کێو و دەشتەکان دەبینین بە درەختەکانەوە شتیان هەڵواسیوە. بەردیان تاشیوە. لە

سەردانێکم بۆ یابان، هاوڕێکانم پڕۆفیسۆر (ئویو ئو و شوکراوکازاکی) منیان برد بۆ پەرستگایەک. دەیان هەزار، بەڵکو سەدان هەزار تەختەی بچووکی هێندەی لەپەدەستێک بە دیوارەکەدا هەڵواسرابوون، دیار بوو هەر تەختەیەک کەسێک هەڵیواسیبوو. لەسەر تەختەکان ئارەزووەکانی خۆیان نووسی بوون، داوایان لە بودا، لە پەیکەری بودا، لە پیرۆزییەکانی ڕوح کردبوو ئارەزووەکانیان بەدیبهێنێت. کاتێک چووشم بۆ بەرازیل، لە (ڕیۆدوزانیرۆ) هاوڕێم (مانیل پرودا) بۆ نانخواردنی ئێوارە بانگهێشتی ماڵی خۆیانی کردبووم. ئەو چەند کەسێکی تریشی بانگهێشت کردبوو، هەموویان بە دەوری مێزێکدا دانیشتبوون، سەیرم کرد هیچ کەسێک لای سەرەوەی مێزەکە دانەنیشتبوو. وا هەستمکرد ئەوان دەیانەوێت خۆیان وەک کەسانی بە ئەدەب نیشانبدەن، وا ناچنە سەرەوە بۆ دانیشتن. لە کەسێکم پرسی، بۆچی هیچ کەسێک ناچێتە سەرەوە بۆ دانیشتن؟ هەر چەندە لە سەرەوە کورسییەک بەتاڵە؟ ئەویش سەلیبی حەزرەتی عیسای نیشاندام، کە لەو سەری مێزەکەوە بە دیوارەکەوە هەڵواسرابوو. ئنجا تێگەیشتم کە نابێت هیچ کەسێک پشت بە سەلیبەکەوە بدات. بۆیە گوتم ئێوە زۆر بەڕێزن. ئەویش گوتی دەترسین بۆیە پشت بە سەلیبەکەوە نادەین، قسە لەسەر بەڕێزی نییە، بەڵکو کێشەکە ترسە. کە ڕۆیشتم بۆ ئەفریقای باشوور، منیان برد بۆ ئەو شوێنەی (زۆلۆ) کان سەمایان لێدەکرد، ژن و پیاو بە یەکەوە سەمایان دەکرد. پرسیم ئەم سەمایە مانای چیە؟ ئەوان چوار جۆر سەمایان ئەنجام دابوو. سێ جۆریان تایبەت بوون بە ڕەوینەوەی ترس. لە ئەڵمانیا ڕۆیشتم بۆ سەر پردی کۆنی شاری (هایدلبرگ)، خەڵکی قفڵێکی زۆریان لە ئاسنی پردەکە دابوو، هەر وەکو ئەو گرێیانەی ئێمە لە لقی درەختەکانی دەدەین، ئەو قفڵانەیان بۆیە لە ئاسنی پردەکە دابوو تاکو گرێی بەختیان بکرێتەوە.

لە سەدەی دووەم و سێیەمی زایینیدا هەندێک کەس گوتبوویان خۆر بە دەوری زەویدا دەسووڕێتەوە و زەوی چەقی گەردوونە. پاپا بەم قسانە خۆشحاڵبوو. هەر بۆیە گوتبووی بەڵێ زەوی چەقی گەردوونە و عیسای مەسیح کوڕی خودا و نوێنەری خودایە لەسەر زەوی، هەروەها پاپای گەورە و کڵێساش نوێنەری مەسیحن. پاپاکان و خەڵکی کڵێسا ماوەی (١١٠٠) ساڵ بەرگرییان لەم بیروباوەڕە کرد، ئەوەندە ئەم وتانەیان دەگوت و دەگوتەوە تاکو هەموو کەس چوونە سەر ئەو باوەڕەی کە خۆر بەدەوری زەویدا دەسوڕێتەوە. لە درێژەی ئەو (١١٠٠) ساڵەدا چەند کەسێک بیریان کردەوە کە ناکرێت لەبەر ترس بێدەنگ ببن و ڕاستییەکان نەڵێین. (کۆپرەنگ) یەکەم کەس بوو گوتی زەوی چەقی گەردوون نییە و خۆر بە دەوری زەویدا ناسوڕێتەوە،

بەڵکو زەوی بە دەوری خۆردا دەسوڕێتەوە. کڵێسا لەم قسانە ترسا. (جۆردانۆ برۆنۆ ١٥٤٨-١٦٠٠)، قەشەیەک بوو، وتە زانستییەکانی کۆپەرەنگی گۆڕی بۆ وتەی فەلسەفی و هاواری کرد، زەوی چەقی گەردوون نییە. بەم قسانە هەموو کڵێساکانی تر کەوتنە لەرزین و دەیانگوت ئەگەر زەوی چەقی گەردوون نەبێت هێز و گەورەیی کڵێسا لە چیدایە؟ وتەکانی کڵێسا چیان لێدێت؟ پاشان کوڕی خودا کە تاکو ئێستا لە چەقی گەردوون باڵا دەستبووە چی لێدێت؟ پاشان نوێنەری کوڕی خودا، یا پاپای گەورە کە لە چەقی ئەم گەردوونەدا حکومڕانی کردووە چی لێدێت؟ هەموو کڵێساکان ئەوەندە ترسان هەر بۆیە (جۆردانۆ برۆنۆ) یان بە زیندوویی لە ئاگردا سووتاند. ئەم سووتاندنە لە ڕێکەوتی (٦-٢-١٦٠٠) ی میلادی دا بوو. کاتێک جۆردانۆ برۆنۆ حوکمی مەرگی بەسەردا درا، ڕووی کردە کڵێسا و گوتی ئێوە وا حوکمی کوشتنی منتان دەرکرد، بەڵام خۆتان لە من زیاتر دەترسن. خۆ ئەگەر جۆردانۆ برۆنۆ بترسایە پشگیری قسەکانی کۆپەرەنگی نەدەکرد. چەند ساڵێک لە دوای جۆردانۆ برۆنۆ، کامپلان و وانینی قسەکانی کۆپەرەنگ و جۆردانۆیان دووبارە کردەوە. کڵێساش ترسابوو. قازی کڵێسا بڕیاریدا زمانی کامپلان لە قوڕگییەوە بهێننە دەرەوە و بێدەنگی بکەن، دواتر ئاگر لە لاشەکەی بەربدرێت و خۆڵە مێشەکەشی بدەن بە دەم ئاوی ڕووباری (تەیبەر) ەوە، کە ڕووبارێکە بە ناو شاری ڕۆمادا دەڕوات، بەڵام سیازدە ساڵ لە دوای جۆردانۆ برۆنۆ، گالیلۆی زانا قسەکانی کۆپەرەنگی دووبارە کردەوە. ئەمجارەیان ئەو دووربینی دروستکرد بوو، ڕەنگە خۆتان داستانی گالیلۆ بزانن. سەردەمێک بوو هەموو خەڵکی دەیانگوت جیهان دەشتاییەکی گەورەیە، گەر کەسێک بە ناو دەریادا بەرەو پێش بڕوات لە شوێنێکدا دەکەوێتە خوارەوە، دەکەوێتە ناو دەریای تاوانەوە، کاتێکیش کەوتە ناو دەریای تاوانەوە ئەوا دەچێت بۆ دۆزەخ. خەڵکی لە ونبوون دەترسن، لە مردن دەترسن، لە چوونە ناو دۆزەخ دەترسن.

چەندین هەزار ساڵ خەڵکی دانیشتن و جووڵەیان نەکرد، ئەوە بوو پاشان کەسێکی ئازا و نەترس پەیدا بوو بە ناوی (کریستۆڤەر کۆڵۆمبس) ئەو ڕۆیشت، ڕۆیشت تا هەموو خورافاتەکانی پووچەڵکردەوە و ئەمریکای دۆزیەوە، ئەو هێشتا دەترسا لەوەی بڵێت شوێنێکی تازەم دۆزیووەتەوە، بۆیە گوتی ئەو شوێنەی دۆزیویەتیەوە هیندستانە. خۆ ئەگەر بیگوتایە من شوێنێکی تازەم دۆزیوەتەوە، ئەوا ئێستا هەموو کەس بە ئەمریکایان دەگوت کۆڵۆمبیا. ئەگەر ئەو چەند کەسە ترسنۆک بوونایە، ڕەنگە ڕێنیسانس ڕووی نەدابایە. ئێستاش دکتۆر، دەرمان و کارەبامان نەدەبوو، ئێستاش فڕۆکە نەدەبوو. نزیکەی

سێ هەزار ساڵ بوو دەیانگوت لە تەوراتدا هاتووە زەوی و هەموو دروستکراوەکانی تر لە ماوەی شەش ڕۆژدا دروستکراون. هەموو خەڵکی دەترسان بە پێچەوانەی ئەوەوە قسەبکەن. بە درێژایی (١٥٠٠) ساڵ، پاپاکان دەیانگوت خودا ئەم گەردوونەی (٤٠٠٤) ساڵ پێش لەدایکبوونی مەسیح دروستکردووە. ئێستاش کە ساڵی (١٣٩٠-٢٠١١) یە، هەندێک ڕۆژژمێر تەمەنی زەوی دەگێڕنەوە بۆ (٥٧٩٠) ساڵ. بە درێژایی (١٥٠٠) ساڵ هەموو خەڵکی دەترسان بە پێچەوانەی ئەم بۆچوونەوە قسە بکەن.

بەڵام ترسی دایکم، ترسێک نییە تایبەت بێت بە خۆی، بەڵکو ترسێکی مێژووییە، ترسی من و هاوشارییەکانم و ناوچەکەم، ترسێکی مێژوویی قوڵە. لە هەر سەردەمێکدا چەند کەسێکی وەکو کۆپەرەنگ، نیوتن، جۆردانۆ برۆنۆ، داروین، ئەبوعەلی سینا، فیردەسی، سەعدی و حافز و مەولەوی، دانتی، گاندی و ماندێلا پەیدادەبن و ناترسن. ئەگەر بشترسن کەمێک دەترسن. ئێستا من بەم هەموو ترسە مێژووییەوە دەمەوێت بەرگی سێیەمی یادەوەرییەکانم بنووسم، دیارە ترس دەبێتە هۆی ئەوەی هەموو بەسەرهات و ڕووداوەکـان نەنووسم. هەندێک کەس لەوە دەترسن من هەموو بیرەوەرییەکانم بنووسمەوە، هەندێک لە ئابڕووی خۆیان دەترسن، هەندێکیش لە ئابڕووی بنەماڵەکەیان و هەندێکیش لە ئابڕووی شارەکەیان دەترسن. خودای گەورە هەموو لایەک پایەدار بکات. خودا ترسی سەر زەویمان لە دڵدا دەربکات، خودا ترسی ئاسمانیمان بخاتە دڵەوە.

## یەڵدا: « مۆدێرنێتە و دەمارگیریی»

من ویستم چیتر دەربارەی یادەوەرییەکانم لە یەزد نەنووسم، بەڵام یادەوەرییە و دەست هەڵناگرێت، کاتێک بیرەوەرییەی دەنووسیت یادەوەرییەکی تر بەشوێن خۆیدا دێنێت، تۆش ئەگەر دەستبدەیتە قەڵەم و یادەوەرییەکانت بنووسیت ئەو کاتە تێدەگەیت کەمن چی دەڵێم؟ ساڵی (١٣٤٦-١٩٦٧) بوو، کاتێک داواکاریم پێشکەشکرد و لە زانکۆی مەشهەد وەرگیرام، ئیتر لە یەزدەوە ڕۆیشتم بۆ مەشهەد، لەو ساڵەوە تاکو ئێستا بۆم نەلواوە ماوەی هەفتەیەک لە یەزد بمێنمەوە، هەمیشە بۆ سەردانی دایکم، چەند ڕۆژێک دەچم بۆ یەزد و دووبارە دەگەڕێمەوە.

ئەو ساڵەی من لە یەزد دوورکەوتمەوە، گۆڕانکاری گەورە لە شارەکەی ئێمە و لە شارەکانی تردا ڕوویدا، لە دەیەی ساڵی (١٣٤٠-١٩٦١) دا، باری ئابووریی وڵات بەرەو باشتر دەڕۆیشت. داهاتی نەوت کەمێک باشتر ببوو، گەشتیاران زیاتر سەردانی وڵاتیان

دەکرد. بیری قوڵ هەڵکەندرابوون و بەشێک لە بیابانەکان دەکران بە کشتوکاڵ، شاری (جیرفت) تازە ئاوەدان دەکرایەوە، گۆڕانکاریی لە دەزگاکانی پۆلیس و شارەوانیەکاندا کرا، پۆلیس و پاسەوانەکانیان لابردن و خانەنشینیان کردن. چەتە و قۆڵبڕ و چەقۆکێش و باجگرەکانیان دەسگیرکردن و لێکۆڵینەوەیان لەگەڵدا کردن، هەندێک لەمانە هەر خۆشیان پاسەوان و پۆلیس بوون، هەندێکیان دوای لێدانێکی باش بوون بە کاسبکار و وازیان لە هەموو خراپە کارییەک هێنا و هەندێکیشیان خستنە زیندانەوە.

من زۆر باش لە یادمە لە سالانی (١٣٣٦-١٣٤٢-١٩٥٧-١٩٦٣) لە شاری یەزدی ئارام و بێ کێشەدا، چۆن لاتباز و چەقۆکێشەکان خەڵکی شاریان بە ژن و منداڵ و پیاوەوە هەراسان کردبوو، زۆربەی خەڵکیی لەترسی ئەوان چەقۆ و زنجیریان لەگەڵ خۆیاندا هەڵدەگرت. ڕۆژ نەبوو شەڕ و دەنگەدەنگ ڕوونەدات. ئەو لاتباز و چەقۆکێشانە زیاتر ئامرازی دەستی سیاسەتمەداران و دەوڵەمەند و خاوەن کارخانەکان بوون، خودا ئەو ڕۆژانە نەگێڕێتەوە.

لە دەیەی (١٣٤٠-١٩٦٠) بەدواوە وردە وردە، هێمنی و ئارامی گەڕایەوە بۆ شار، خەڵکی بەرەو ڕۆشنبیریی دەچوون، واتە کارێک کرا کە ئیتر هیچ کەسێک چەقۆکێشی و دزی و خراپەکاری نەدەکرد، هیچ کەسێک جورئەتی ئەوەی نەبوو دەستبەرێت بۆ گیرفانی کەسێکی تر. شارەوانی و پۆلیس و دادگا ڕەگوڕیشەی لەبن دەرهێنان. کاتێک من شاری یەزدم جێهێشت، (٥٠-٦٠) هەزار دانیشتووی هەبوو، تازە کارەبا دەگەیشتە هەندێک لە ماڵەکان، بەڵام هێشتا زۆرێک لە ماڵەکان بۆریی ئاویان ڕانەکێشابوو.

ساڵی (١٣٤٦-١٩٦٧) کاتێک من شاری یەزدم جێهێشت سەردەمی کۆکردنەوەی ئاوی حەوز کۆتایی هاتبوو، سەردەمی بێ پێڵاوی خەڵکیش لە تەواو بووندا بوو، سەردەمی تەوالێتی بەربڵاو و بۆگەنیش لەکۆتایی هاتندا بوو. لە ساڵی (١٣٤٦-١٩٦٧) دا سەردەمی چرای نەوتی بە تەواوی کۆتاییهات، بەڵام هێشتا لە هەر گەڕەکێکدا چەند ماڵێک هەبوون کە شەوانە بە دیار چرای نەوتییەوە دادەنیشتن، لەو ساڵانەدا کرێکارانی ڕستن وازیان لە کارگە تاریکەکانیان هێناو بۆ کارکردن چوونە کارگە گەورەکانەوە. ڕادیۆ لە ناو ماڵان و لە بازاڕدا بەرەو زۆری دەڕۆیشت. هەندێک لە کۆلانەکان قیرەتاو کران، لە ناوشاردا چەند شەقامێکی تازە دروستکران. لە دوای ساڵی (١٣٤٦-١٩٦٧) وە دوای خۆرئاوابوون زۆربەی ژنانی بێکار لەسەر کۆلانەکان دادەنیشتن، هاتنە کۆلانی ژنان ئارامی لە ناو شاردا دروستدەکرد، چونکە دز و خەڵکانی نامۆ لە کۆلانەکاندا هاتوچۆیان نەدەکرد، بەڵام ئەو غەیبەت و قسە و قسەڵۆکانەی کە ئەوان دەیانکرد هیچی

کەمتر نەبوو لە کاری دز و ڕێگرەکان.

ساڵی (١٣٤٦-١٩٦٧) کاتێک من یەزدم جێهێشت ژمارەی خوێندکاران بەرەو زیادبوون دەڕۆیشت، باری خەڵکی باشتر ببوو، ئەو خەڵکە لەبری ئەوەی منداڵەکانیان بنێرن بۆ شاگرد مسگەریی و ئاسنگەریی و کارگەکان، دەیانناردن بۆ قوتابخانەکان، بەڵام هێشتا زۆر ماڵ هەبوون نەیاندەتوانی منداڵەکانیان بنێرن بۆ قوتابخانە. لە خزمەکانی دایکم لانیکەم دە منداڵ هەبوون کە هاوتەمەنی من بوون و نەچووبوونە قوتابخانە و ئێستاش نەخوێندەوارن. دوو کوڕە پوور و چوار کچە پوورم ئێستا خوێندەوارییان نییە. ئێستاش هەندێک کەس لەسەر ئەو باوەڕەن کە نابێت کچەکانیان بچنە قوتابخانە، هێشتا زۆربەی کچان لە تەمەنی (١٣-١٤)ساڵیدا دەدران بە شوو، زۆربەی کچان لە تەمەنی چواردە ساڵیدا دەبوون بە خاوەنی منداڵ.

لە دەیەی ساڵی (١٣٤٠-١٩٦١) بە دواوە لە شارەکەی ئێمەش وەک تەواوی شارەکانی تری ئێران، کوورەی خشتی سوورەوەکراو بەرەو زیادبوون دەچوو. خانووی خشتی سوور جێگەی خانووی خشتی کاڵی گرتەوە. لە خانووی خشتدا مشک، مار، دوپشک، سیسرک و مارمێلکە کەم بوون، بەهۆی بەکارهێنانی خشتی سوورەوە، کۆڵانەکانیش فراوانتر و ڕێکتر بوون، کۆڵانەکان بە جۆرێک فراوان ببوون کە ئۆتۆمبێلی پێدا تێدەپەڕی.

کاتێک من شاری یەزدم جێهێشت بەرزترین خانووی شار سێ نهۆم بوو، کە ئەویش بینای شارەوانیی بوو، لە شەقامی پەهلەوی -ئیمام خومەینی ئێستا- لە بەرامبەر گەراجی ئۆتۆتاج، هەر لەو ساڵانەدا بەرزترین کۆشک، منارەی مزگەوتەکان بوو، لە هەر گەڕەکێکدا چەند موبەریدەیەک پەیدا ببوو. کاتێک من شاری یەزدم جێهێشت گەڕەکی پشتی باخ چەند سەد ماڵێک بوو، لەم گەڕەکەدا تەنها (٤-٥) ماڵ تەلەفۆنیان هەبوو.

ئیتر لە دەیەی (١٣٤٠-١٩٦١)دا، گۆڕانکاریی فەرهەنگی، تەکنۆلۆژی، ئابووریی و کۆمەڵایەتی سەری دەرهێنا بوو، سەردەمی خان و گەورەیی و ئاغا و خزمەتکار بەرەو نەمان دەچوو، چیتر ئاغاکان نەیاندەتووانی خەڵکیی دارکاریی بکەن، ئیتر ئەو جوتیارانەی کە ملکی ئاغایان بەدەستەوە بوو، پێویستی نەدەکرد بۆ ژن و ژنخوازی مۆڵەت لە ئاغاکانیان وەربگرن. پاش چەندین هەزار ساڵ ژنان وەکو مرۆڤێکی تەواو سەیر دەکران، بەڵام لە یادتان نەچێت کە پێنج ژن لە ژنانی ئێمە (١٥٠٠) ساڵ پێش ئێستا شا بوون. بەڵام ماوەیەکی زۆر لە بیر ژنانیان بردبووەوە کە ئەوان تەنانەت مرۆڤیش بووبن. ژنان خۆشیان چووبوونە سەر ئەو باوەڕەی کە ئەوان تواناکانیان لە توانای

پیاوان کەمترە. ژنان هەمیشە لە ژێر زوڵم و چەوسانەوەدا بوون. لە دەیەی (١٣٤٠-١٩٦١) دا، تازە ژنان لە کۆمەڵگەدا دەردەکەوتن و قوتابخانەکانیان بەڕوودا کرابووەوە، مامۆستایانی ئازادیخواز ڕۆژ لە دوای ڕۆژ زیاتر دەبوون، مامۆستایانی کۆنەپەرستی وەک ئەحمەد ئایەتوڵاهی ڕۆژ لە دوای ڕۆژ کەمتر دەبوون. باری ئابووریی گۆڕانکاری بە سەردا هات. ژمارەی هەژار و برسیی و بێلانە و حاڵەکان کەمیان کرد، بەڵێ هەژاران بە ئاگا هاتنەوە.

هاتوچۆی حوشتر و وڵاخەبەرزە و عەرەبانەی دەستی بەرەو کەمی دەڕۆیشت، کۆکردنەوەی تەپاڵە هەر نەما، کۆکردنەوەی تەپاڵە کاری منداڵانی بچووک بوو، ئەوان تورەکەیەکی بچووکیان لە ملیان دەکرد و بەدوای کۆکردنەوەی ڕیخ و پشقل و تەپاڵەی ئاژەڵەکانەوە بوون، لە کۆڵانەکاندا بەدوایاندا دەگەڕان و کۆیان دەکردنەوە و بە بڕە پارەیەکی زۆر کەم، دەیانفرۆشت کە بەشی پارووە نانێکی دەکرد یا نەیدەکرد. لە سەردەمانێکدا کە سووتەمەنی کەم بوو، هەندێک ماڵ تەپاڵە و پشقلیان دەسووتاند، هەندێک ماڵ لەبری ئەوەی منداڵەکانیان بنێرن بۆ قوتابخانە دەیانناردن بۆ کۆڵانەکان، بۆچی دەیانناردن؟ بۆ ئەوەی تەپاڵە کۆبکەنەوە و بیفرۆشن و بە پارەکەی سکی ئەندامانی خێزانەکەیان تێربکەن. هەژارەکان بە ئاگا هاتن، بەپارەی نەوت هەژاران دەیانویست ژیانیان بگۆڕن.

گەنجانی ئەمڕۆ ئەم شتانەیان نە بینیوە. کتێبی قوتابخانەکان لە سەردەمانێکدا خەڵکیان دەگێڕایەوە بۆ سەردەمی هەخامەنشینەکان، ئەمانە بەجۆرێک قسەیان دەکرد کە هەموو خەڵکی لە سەردەمی هەخامەنشینەکاندا لە کۆشکی وەکو تەختی جەمشیددا ژیابن.

هەر کەسێک لەدایکبووی ساڵانی (١٣٢٠-١٣٣٠-١٩٤١-١٩٥١) بووبێت ڕیخ و پشقل کۆکردنەوە و بەتاڵکردنی بیری تەوالێتی بینیوە. ئەم بەدبەختییانە پەیوەست نییە بە هەزاران ساڵ پێش ئێستا، بەڵکو پەیوەستە بە دەیەی (١٣٣٠-١٣٤٠-١٩٥١-١٩٦١) ئێستاش کە ساڵی (١٣٩١-٢٠١٢) یە، لە هەندێک شوێنی وڵات و لە دەوروبەری شارەکان ئەمجۆرە کارانە دەبینرێن.

زۆرێک لە منداڵە بۆیاخچی و دەسگێڕەکان کە قارەمانی نەتەوەیی ئێمەن، ئەوانە بە سندوقی بۆیاخکردنەوە یاخود بە فرۆشتنی بنێشتێک یا بسکیتێک دەیانەوێت پارووە نانێک بۆ خۆیان و خێزانەکانیان پەیدا بکەن، ئەمانە ڕووبەڕووی قسە و قسەڵۆک و سووکایەتی پێکردن دەبنەوە. تازە بە تازە هەندێک کەس دروشم دەدەن و دەڵێن ژمارەی

دانیشتووانی وڵات زیاد دەکەین. بەڵێ کاتێک من لە ساڵی (١٣٤٦-١٩٦٧) دا، شاری یەزدم بەجێهێشت وردە وردە خەریکبوو ڕەوشی وڵات دەگۆڕدرا. تاکسی و ماتۆڕی سێتایە پەیدا ببوو، حەمامی نمرە لە هەموو گەڕەکەکاندا دروست دەکرا. نانەواخانەکان پاش چەند هەزار ساڵێک ئیتر داریان بەکار نەدەهێنا و ئیتر نەوتیان دەسووتاند. ئەوکات تازە لە شاردا خەریکبوو دوو ڕێستۆرانت دروست دەکرا. هێشتا وشەی سۆپەر مارکێت نەچووبووە سەر زاری بەقاڵەکان کە دەیانویست خواردەمەنییەکانیان باشتر و پاکتر ڕابگرن.

لە ساڵی (١٣٤٦-١٩٦٧) دا، لە هەموو شاری یەزددا یەک کیلۆ نۆک یا کیلۆیەک لۆبیا بەستەبەندی نەکرابوو، واتە نەکرا بوونە کیسەوە. ئێستاش کە ساڵی (١٣٩١-٢٠١٢) یە، دوکانەکانی شەقامی ئیمام لە نزیک میرچەخماق خواردەمەنی فەل دەفرۆشن کە ڕۆژی یەک کیلۆ تۆز و خۆڵ و دوکەڵی ئۆتۆمبێل بەسەریانەوە دەنیشێت و دەرخواردی ئەوخەڵکە هەژارە دەدرێت.

تازە بەتازە بەڕێوەبەرێتی تەندروستی قەسابخانەکان و نانەواخانەکان ناچاردەکات دیوارەکانیان کاشی بکەن. ئەمانە بەرگریی لە یەکتری دەکەن، سەدان جوێن بە حکومەت و تەندروستی دەدەن. دەڵێن ئەمانە خەرجییەکی زیادەمان پێدەکەن، دەڵێن تەنها چوار مشک کەوتوتە نێو ئاردەکەوە، چ زیانێکی هەیە؟ چەندین هەزار ساڵە مشک هەیە، ئەی باشە پشیلەکان چی بخۆن؟ هەر ئاشەوانێک و نانەوایەک یەکی دە پشیلەیان هەبوو، تاکو مشکەکان بخۆن. دەڵێن لە یەزد پشیلە زۆر هەبووە، بەڵێ مشکیش هەر زۆر هەبووە. تا دەیەی (١٣٥٠-١٩٧١) یەکێک لە پیشە دەستییەکانی خەڵکی یەزد تەڵەی مشک بووە. تەڵەی مشک لە هەموو جۆرە دوکانێکی یەزد دەستدەکەوت، هەرکاتێک لە شار و لە ماڵەکاندا مشک زۆر بووبێت واتە خزمەتگوزاریی تەندروستی کەمە.

هەندێک کەس چیمەنتۆکاری و کاشیکاری و سپیکاریی دیوارەکانیان بە کارێکی خراپ دەزانی، بەڵام ئەم کارە جگە لە گۆڕانکاریی تەکنۆلۆژی و ئابووریی و تەندروستی، گۆڕانکارییەکی ڕۆشنبیریش بوو، هەندێک کەس ئاوی بۆرییان نەدەخواردەوە، دەیانگوت ئەو ئاوە دەرمانی خراپی تێکراوە، بۆ ئێمەی موسڵمان نابێت بیخۆینەوە. بۆ هەر کارێکی تەندروست و پێشکەوتوو خەڵکی دژی دەوەستانەوە. ڕۆژێک بەڕێوەبەرێتی تەندروستی، ویستی خاولی و لفکە و پەشتەماڵی حەمامەکان کۆبکاتەوە و فڕێیان بدات، لەبری ئەوە لفکە و خاولی خاوێن بکڕدرێت و بەکاربهێنرێت، هەر کەسە و خاولی و لفکەی تایبەت بەخۆی هەبێت. کەچی خەڵکەکە دەیانگوت تەندروستی دەیانەوێت

خاولی و لفکە و پەشتەماڵ بفرۆشن. لەگەڵ پەیدابوونی هەر شتێکی نوێدا خەڵکیی دژی دەوەستانەوە. تەنانەت ئێستاش کە ساڵی (١٣٩١-٢٠١٢) یە، بۆ پێویستییە تایبەتییەکان لە ئارایشتگەکاندا بەرگریی دەکەن! هەموو گۆڕانکارییەک ڕووبەڕووی بەرگرییەک دەبێتەوە، بەڵام بە ڕۆیشتنی کات پلەی بەرگریی و چەقی بەرگریی گۆڕانکارییان بەسەردا دێت.

کاتێک کە من لە یەزدەوە چووم بۆ شارێکی گەورەتر، جیاوازی نێوان هەژار و دەوڵەمەند بەرەو کەمی دەڕۆیشت، چینی ناوەندیش خەریکبوو پەیدا دەبوو، کارمەندانی حکومەت دەیانویست دەرکەون. نرخیش ساڵانە هیچ گۆڕانکارییەکی تێدا نەدەبینرا. پاشماوەی نەهامەتییەکانی دووەم جەنگی جیهانیی خەریکبوو نەمێنێت، حکومەتی ناوەند دەیویست دەسەڵات پەیدا بکات. نە ئەو دەسەڵاتەی کە خەڵکی ئازار بدات و نە ئەوەندە بێهێزیش بێت کە نەتوانێت ئارامی وڵات بپارێزێت. هەڵبەت من ئەگەر بمەوێت ئەو شتانەی کە باسمکردون و یادەوەرییەکانم بە تەواوی بنووسمەوە، دەبێت کاغەزێکی زۆر ڕەشبکەمەوە، خۆ ڕەنگە ڕۆژێکیش بێت ئەو کارە بکەم. ئێستا دەمەوێت بەبیرهێنانەوەی دوو سێ یادەوەریی لە چەند ماڵێک کە شەست ساڵە دەیانناسم بەسەرهاتەکانیان نیشان بدەم.

## یەڵدا

**کەسێ پرسی دێوانەی بێ ماڵ و شوێن — کە تۆ چیت پێخۆشە؟ گوتی جوێن**
**چونکە ئەوان چیم پێبدەن، تا دەمرم — جگە لە جوێن، دەبێت منەت هەڵبگرم**

کاتێک ویستم لە یەزدەوە بچم بۆ مەشهەد، بۆ خوداحافیزیی چووم بۆ ماڵی حاجی ئاغا، ئەو کاتە یەڵدای کچی حاجی ئاغا تەمەنی پێنج ساڵ بوو. کە من لە یەزدەوە چووم بۆ زانکۆی مەشهەد پاش هەژدە ساڵ یەڵدا خانم تەمەنی ببوو بە بیستوسێ ساڵ. ساڵی (١٣٦٤-١٩٨٥) مانگێک بوو ماڵی حاجی ئاغا لە هاتووچۆدا بوون. دیکۆری خانووەکەیان گۆڕیبوو، پەردەی جوان و تازەیان لە جێگەی پەردە کۆنەکان هەڵواسی بوو، پەردەکانی پێشتر کۆن نەببوون، بەڵام حاجی خانم و یەڵدا دەیانویست پەردەکان بگۆڕن.

بەردی مەڕمەڕ تازە پەیدا ببوو، دەیانویست هۆڵ و ژوورەکان هەمووی بکەن بە کاشی مەڕمەڕ، کاشییەک کە بریسکە بداتەوە. ماڵی حاجی ئاغا ساڵێک بوو چووبوونە

خانووە تازەکەیانەوە لە گەڕەکێکی تازەی پێشکەوتوو. واتە گەڕەکی (سەفائیە) و لەوێ نیشتەجێ ببوون، حاجی ئاغا خۆی ئەو خانووەی دروستکردبوو، نیمچە کۆشکێک بوو. خانووە کۆنەکەیان لە شوێنێکی ناخۆشی شار و گەڕەکێکی کۆن و لە نێو خەڵکی خێڵەکیدا بوو، نێو ژوورەکانی خانووە کۆنانەکەیان بە قوڕ و گەچ سواخ درابوو، لانیکەم ئەو خانووە نەوەد ساڵ بوو دروستکرابوو. بەدرێژایی نەوەد ساڵ ناو ژوورەکان بەهیچ شێوەیەک خراپ نەببوون، هیچ کاتێک پێویستی بە کاشیکردن نەبوو، هیچ کاتێکیش بێ فەرش نەبوو.

هۆڵ و ژوورەکانی خانووە تازەکە فەرشی تازەیان تێدا ڕاخرا بوو، بەڵام فەرەشەکان هەموو ژوورەکانی دانەپۆشی بوو. باشە ئەگەر فەرشەکان هەموو نێو ژوورەکانی داپۆشیبایە، چۆن میوانەکان بیانزانیبایە لە ژێر فەرشەکاندا چی هەیە؟ قوڕ و گەچە یان کاشی مەرمەڕی نمرە یەک؟ یاخود کاشی چین و ئیتالیا.

حاجی خانم پێداگریی دەکرد کە سەردانێکی تاران بکات تاکو چلچرای باشتر و جوانتر بکڕێت. هەموو ژوورەکان و هۆڵ و چێشتخانە بە فەرشی بەنرخ داپۆشرا بوون، جگە لەوەش حاجی ئاغا چەند دانە فەرشی ئاوریشمی کڕیبوو. فەرشە ئاوریشمییەکانیشیان لەسەر فەرشەکانی تر ڕاخستبوو. دیارە هێشتا هەر لە لێواری فەرشەکانەوە کاشییە مەرمەڕەکان دەردەکەوتن. زەڕنگەرەکان قاپە زیوییەکانیان بۆ زاخاو دابوونەوە، ژووری چێشتخانە هیچ کەموکووڕییەکی نەبوو. یەکێک دەهات و یەکێک دەڕۆیشت، وەستایەک دەهات و وەستایەک دەڕۆیشت. یەڵدا خانم لە خۆ ئامادەکردندا بوو. حاجی خانم بڕیاری دەدا و حاجی ئاغاش پارەی دەدا.. گفتوگۆکانیان هەر لە سەرەتاوە بە ئەنجام گەیشتبوون. پەیام لە دوای پەیام دەهات و دەڕۆیشت، هەموو هەواڵەکان خۆشبوون. هیچ کەموکووڕییەک نەما بوو، بڕیار بوو دوانیوەڕۆی پێنجشەممە بنەماڵەی زاوا بێن بۆ داواکردنی یەڵدا. دوانیوەڕۆی پێنجشەممە، کاتی بەهار بوو، سەرەتای شۆڕش بوو، دوو گەنجی سادە بە یەکەوە زەماوەندیان دەکرد، هەر دوو بنەماڵە دەیانویست هەموو کارێکی باش بۆ منداڵەکانیان ئەنجامبدەن، حاجی ئاغا دەیگوت من ئابڕووم هەیە و تەنها یەک کچم هەیە، دەبێت مەڕاسیمی شووکردنەکەی شاهانە بێت. حاجی ئاغا ڕۆیشتبوو بۆ لای (شێخ بوشەهری) تا فاڵێک بگرێتەوە، فاڵی شێخ بوشەهری زەماوەندی ئەو دوو گەنجەی بە باشە لێکدابۆوە. شێخ بوشەهری، باشترین فاڵگرەوەی شاری یەزد بوو، هەر کەسێک کارێکی گرنگی هەبووایە دەچوو لەلای ئەو فاڵی دەگرتەوە. حاجی ئاغا چووبووە سەر ئەو باوەڕەی کە ئەم زەماوەندە،

زەماوەندێکی سەرکەوتوو دەبێت. هەر بۆیەش حاجی بە یەڵدای گوتبوو پێویستە بۆ ئەم زەماوەندە تۆ خۆت بڕیاربدەیت، بەڵام یەڵدا بۆ خۆی زووتر بڕیاری دابوو. حاجی پیاوێک بوو بڕوای بە دابونەریتی کۆن هەبوو، بەڵام یەڵدا کچێکی خوێندەوار و نوێخواز بوو. یەڵدا، حسێنی خۆشدەویست، ئەوان ماوەیەک بوو یەکتریان دەناسی و لە کۆلێژ هاوپۆلی یەکتری بوون، بەیەکەوە قسەیان کردبوو. یەڵدا بنەماڵە و دایک و باوکی حسێنی بە باشی دەناسی. (٦-٧) مانگ دەبوو دایکی حسێن بە یەڵدای گوتبوو گوڵەکەم، باوکی حسێن یش پێیدەگوت کچە ناسکەکەم.

بنەماڵەی حسێن دیاری گرانبەهایان بۆ یەڵدا کڕیبوو. حاجی ئاغاش بە حسێنی دەگوت کوڕە خۆشەویستەکەم. چەندین جار ئەو دوو بنەماڵەیە بە یەکەوە و بەخێزانی ڕۆیشتبوون بۆ گەشت، چەندین جار بە یەکەوە چوو بوون بۆ باخەکەی باوکی حسێن لە (مەهریز) و بۆ باخی باوکی یەڵدا لە (دێی باڵا). خوشک و براکانی حسێن زۆر ڕێزیان لە یەڵدا دەگرت. چەند جارێک یەڵدا و حسێن بە یەکەوە بە ئۆتۆمبێل چوو بوون بۆ گەڕان، ئەوان کەوتبوونە سەردەمێکی نوێوە، سەردەمێک کە کوڕان و کچان سەرەتا یەکتریان دەبینی و قسەیان لەگەڵ یەکتریدا دەکرد و دەچوونە دڵی یەکترییەوە و بەیەکەوە هاتوچۆیان دەکرد، پاشان لەگەڵ یەکتریدا زەماوەندیان دەکرد. هەرچەندە ئەو خەڵکە هەموویان بەو جۆرە نەبوون، بەڵام بنەماڵەی حسێن و یەڵدا بەو جۆرە بوون. حاجی ئاغا پیاوێکی ڕاڕا بوو، لە شێوەی حوشترمورغ (نەعامە) دا بوو. لە هەر شوێنێک کارێک لە بەرژەوەندی خۆیدا بووایە، دەبوو بە حوشتر، لە هەرشوێنێکیش کارێک لە بەرژەوەندی ئەودا نەبووایە، دەبوو بە مریشک. حاجی ئاغا پیاوێکی تەڕپوش وخاوێن بوو، هەمیشە جلوبەرگی جوانی دەپۆشی و تەزبیحی بەدەستەوە دەگرت، موستیلەیەکی زیوی نقێم عەقیقی لە پەنجەیدابوو. زۆربەی کات بەپێ لە ماڵەوە دەچوو بۆ بازاڕ، جارجاریش بە پایسکیل دەڕۆیشت، بەیانیان لە مزگەوتی گەڕەک نوێژی دەکرد و هەمیشە لە دوای مەلاوە بوو، بەڵام نوێژی نیوەڕۆیانی لە مزگەوتی بازاڕ دەکرد. بازرگان و کاسبکارێکی باش بوو. ئەم حاجییە هەستی بەعاشق بوونی ئەم دوو گەنجە کردبوو، واتە یەڵدا و حسێن. ئەم دوو گەنجە بە یەکەوە و لەگەڵ هاوڕێکانیاندا دەچوون بۆسینەما و ڕیستۆرانت و دوکانی پیتزا. چەند ساڵێک بوو پیتزا لە یەزد پەیدا ببوو. لە دەیەی (١٣٤٠-١٩٦١) نە لە یەزد و نە لە شارەکانی تری ئێراندا هیچ کەسێک خواردنێکی بەناوی پیتزاوە نەدەناسی. خەڵکی دەچوون بۆ خواردنی برنج و کەباب، بەگشتی خواردنی ئێرانیان دەخوارد. هەڵبەت یەزدییەکان تا دەوروبەری ساڵی (١٣٥٠-

(١٩٧١) نەدەچوون بۆ گازینۆ و ڕیستۆرانت، چونکە زۆر دەستگرەوە و کەم خەرج بوون، بە زۆری دەچوون بۆ گازینۆی یاوەری، چونکە گازینۆی یاوەری دۆندەرمەی باشی نمرە یەکی هەبوو. هەڵبەت یەزدییە دەوڵەمەندەکانیش، وەکو هەموو دەوڵەمەندەکانی تری ئەم جیهانە لەماڵەوە لەگەڵ ماڵ و منداڵەکانیاندا خواردنی زۆرباشیان دەخوارد. شارەکەی ئێمەش وەکو تەواوی شارەکانی تری ئێران ڕازانەوەی خوان و دانیشتن بە دەوریدا باو بوو، بەڵام ئەو نانخواردنە جیاواز بوو لەگەڵ خواردنی پیتزادا. شیوازی خواردن لە سەردەمی گۆڕانکاریدا بوو.

تا دەوروبەریساڵی (١٣٤٠-١٩٦١)، چوون بۆ ڕێستۆرانت کارێکی نەشیاو بوو، دەیانگوت بۆچی خەڵکی ماڵیان نییە تاکو بڕۆن بۆ ڕێستۆرانت؟ هەڵبەت ڕێستۆرانتەکانی ئەو سەردەمە لە ڕێستۆرانت نەدەچوون، بەڵکو دوکانێکی بچکۆلانە بوون و خواردنیان تێدا ئامادە دەکرا. تا پێش شۆڕش ئەو چەند ڕێستۆرانتەی لە یەزد هەبوون لەگەڵ خواردنەکەدا مەی‌یشیان دەفرۆشت. کەسێکی یەزدی ئەگەر زۆر دینداریش نەبووایە دەستی ژن و منداڵەکانی نەدەگرت تاکو بیانبات بۆ ڕێستۆرانتێک، کە مەی لێبفرۆشرایە، یان لانیکەم لە یەزددا ئەم کارەی نەدەکرد. خۆ ڕەنگە لە شارێکی وەک تاران یاخود وڵاتێکی وەک ئیتالیا و بریتانیا ئەم کارەی بکردایە. بەو شێوەیە ڕێستۆرانت لە دەیەی (١٣٤٠-١٩٦١) دا جێگای کەسە بەرەڵاکان، یاخود ئەو گەشتیارانە بوون کە بەوێدا تێدەپەڕین، بەڵام لە دەیەی (١٣٦٠-١٩٨١) بەدوواوە لە شاری یەزد ڕێستۆرانتی گەورە و ئابڕوومەند کرانەوە. لە دوای شۆڕشی ئیسلامییەوە ئیتر لە ڕێستۆرانتەکاندا مەی خواردنەوە قەدەغە کرا.

پێشتر خەڵکی خواردنیان لەماڵەوە دەخوارد و مەیان لەڕێستۆرانتەکان دەخواردەوە، بەڵام ئێستا مەی لە ماڵەوە دەخۆنەوە و خواردنەکەیان لە ڕێستۆرانت. ئەمەش خۆی لە خۆیدا گۆڕانکارییە. پیاوان پێشتر لە ژن و منداڵەکانیان دەترسان، بەڵام ئێستا لە پۆلیس و ئاسایش دەترسن، پیاوان ئێستا ترسیان لە ژن و منداڵەکانیان شکاوە، ترس لە ژن و منداڵ واتا ترس لە خودا. پێویستە مرۆڤ هەمیشە لە شتێک بترسێت، کاتێک لە ماڵەوە ترسایت لە پۆلیس ناترسیت، ئەگەر لە پۆلیس ترسایت لە ماڵەوە ناترسیت. کاتێک لە ماڵەوە نەترسیت ئەوە ڕوودەدات کە ئێستا هەیە. کاتێک پیاوان لە دەرەوە مەی دەخۆنەوە ژنان دەم لە مەی نادەن، بەڵام کاتێک لە ماڵەوە مەی دەخۆنەوە، ژنانیش وردە وردە دەیانەوێت تامی ئەو مەیە بکەن. ڕێستۆرانتەکان شوێنێکی بێ ترسە بۆ خواردنەوەی مەی، بەڵام ئایا ماڵەوە بێ ترسە؟ یەزدییە دەوڵەمەندەکان وەک

تەواوی دەوڵەمەندەکانی تر گەر بیانویستایە بە ژن و منداڵەوە بچن بۆ ڕێستۆرانت، هەم خواردن بخۆن و هەم مەی بخۆنەوە، ئەوا دەچوون بۆ وڵاتانی وەک تورکیا و مالیزیا و ئەورووپا و ئەمریکا. ئەگەر وەک کەو سەرمان بخەینە نێو بەفرەوە و بڵێین لەم وڵاتەدا هیچ کەسێک مەی ناخواتەوە، ئەو کاتە دیارە ئێمە ڕاست ناکەین و چاوی خەڵکیش ناگیرێت و دەمی کەڵەشێریش داناخرێت. دۆسیەی تاوانباریشمان لە دادگادا بۆ دەکرێتەوە.

حسێن و یەڵدا بەیەکەوە دەچوون بۆ ڕێستۆرانت و لەبارەی عیشق و خۆشەویستیەوە وتوویژیان دەکرد، قسەکانیشان هەمووی ئومێدبەخش بوون، بەرنامەیان بۆ دوارۆژی خۆیان دادەنا، دیارە لەو سەردەمەدا ئەو هەڵسوکەوتەی ئەوان خۆی لەخۆیدا شۆڕشێک بوو.. تا دەوروبەری ساڵی (١٣٥٠-١٩٧١) کچان و کوڕانی یەزدی کەی دەیانتوانی یەکتری ببینن؟ دەبوو چەندان پەیامی نهێنیان بۆ یەکتری بناردایە، ئەو کات دەیانتووانی بەترس و لەرزەوە لە شوێنێک یەکتری ببینن.

ئەم دوو عاشقە، بەیەکەوە زۆر شوێن گەڕابوون، جۆرەها خواردنیان بەیەکەوە خواردبوو، زۆر بەجوانی ناخی یەکتریان دەناسی، ڕەوشتیان لەگەڵ یەکتریدا دەگونجا، یەڵدا بۆ خواردن کەمێک دژبوو، هەموو خواردنێکی نەدەخوارد، بەڵام خۆشبەختانە حسێن هەموو خواردنێکی دەخوارد و زۆر بە ئەدەبیشەوە خواردنی دەخوارد، ئەوان هەرگیز یەک جۆر قاپیان بۆ هەموو جۆرە خۆراکێک بەکار نەدەهێنا، بەڵکو بۆ هەر جۆرە خۆراکێک قاپی تایبەت بەو خواردنەیان بەکاردەهێنا. بۆ نموونە بۆ زەڵاتە قاپی تایبەتی زەڵاتەیان بەکاردەهێنا، بۆ شلە قاپی تایبەتی شلەیان بەکاردەهێنا، ئیتر بۆ تێکڕای خواردنەکان بەو شێوەیە بوو، بۆ ئاوخواردنەوە پەرداخی تایبەتیان هەبوو، کە جیاوازبوو لە پەرداخی خواردنەوەی کۆکا کۆلا.

ئەوان زۆر تێکەڵبوون، هەمیشە بەیەکەوە خواردنیان دەخوارد. خۆ خەڵکی مەشهەدیش نەریتێکی جوان و تایبەت بە خۆیان هەیە، بەڵام بەداخەوە ئەم نەریتە لە ئێستادا وا خەریکە بەرەو نەمان دەچێت، بەپێی ئەو نەریتە هەر ژن و مێردێک کە زەماوەندیان دەکرد، دەبوو تاکو یەک ساڵ هەمیشە بە یەکەوە و لەیەک قاپدا خواردن بخۆن.

حاجی ئاغا و حاجی خانم، تەنها ئەو کچەیان هەبوو. یەڵدا تەنها منداڵی ئەو ماڵە بوو، زۆر خۆشەویست بوو، زانکۆی تەواو کردبوو، بەکالۆریۆسی وەرگرتبوو، بەڵام هیچ کارێکی نەدەکرد، ئەو دەیویست لەسەر خوێندن بەردەوام بێت. یەڵدا پێشتر لەگەڵ

چەند دەستە خوشکێکی خۆیدا باسی زەماوەندی خۆی و حسێنی کردبوو، لە هەندێک کاری کڕینی جل وبەرگ و پێویستیەکانیدا ئەو دەستە خوشکانەی هاوکاریان کردبوو، هەر ئەوان بۆ جلوبەرگی بووکێنیش هاوکاری بوون، لەگەڵیدا چوو بوون بۆ شاری تاران، لەوێش هەرچی جلوبەرگێکی جوانیان بینیبوو کڕیبوویان. حاجی ئاغا و حاجی خانم هەستێکی خۆشیان هەبوو، هەستیان بە شادی و بەختەوەرییەکی زۆر دەکرد، ئەوان لە سەرەتای زەماوەندیاندا بۆ ماوەی چەندین ساڵ منداڵیان نەدەبوو. ئەو ژن و پیاوە چیان نەکرد لە پێناوی منداڵدا، خودا دەزانێت چەندجار چووبوونە لای دکتۆر جەلالی موجیبیان. دکتۆر جەلالی موجیبیان باشترین و شارەزاترین دکتۆر بوو لە بوواری ژنان و منداڵبووندا، نەک تەنها لە شاری یەزد تەنانەت لە هەموو ئێرانیشدا. ئێستا (١٣٩١-٢٠١٢) یە، ئەم دکتۆرە بەڕێزە تەمەنی (٨٣) ساڵە و هەر لە شاری یەزدیشە. هەروەها حاجی ئاغا و حاجی خانم چەندین جاریش سەردانی تارانیان کردبوو، خودا دەزانێت چەند جاریش ڕۆیشتبوون بۆ دەرەوەی وڵات، جگە لەوەش حاجی ئاغا و حاجی خانم هیچ خێر و خێراتێک نەمابوو نەیکەن، هیچ پیاو چاکێک نەمابوو سەردانی نەکەن، هیچ ئیمامێک نەمابوو خێری بۆ نەکەن. چەندین فەرشی بەنرخیان بۆ مەرقەدی ئیمام ڕەزای مەشهەد و ئیمام زادەی جەعفەری یەزد کڕیبوو.

حاجی ئاغا باوەڕێکی تەواوی بە ئیمام زادەی (بونافت) هەبوو، ئەو سەردەمە هێشتا جادەی یەزد بۆ بونافت قیرتاو نەکرابوو، حاجی ئاغا بە ئۆتۆمبێلی خۆی بەڕێگای دێهاتەکاندا ڕۆیشتبوو، خۆی شارەزای ڕێگاکە کرد بوو، چەند جارێک بەو ڕێگایەدا لە یەزدەوە ڕۆیشتبوون بۆ گوندی (مەنشاد) و لە مەنشادیشەوە بە پێ ڕۆیشتبوون بۆ لای ئیمام زادەی بونافت. ئەو کاتە لە نێوان دوو گونددا جادە نەبوو، نێوان گوندەکان هەمووی بەردەڵان بوو، کاتێک هەوا گەرم دەبوو لە ژێر زۆربەی بەردێکانەوە ماری گەورە گەورە دەهاتنە دەرەوە، من خۆم لە ساڵانی (١٣٣٨-١٣٤٠-١٩٥٩-١٩٦١) چەندین جار بەپێ لە مەنشادەوە ڕۆیشتووم بۆ بونافت و گەڕاومەتەوە، ئەوەندەی لەو ڕێگایە مارم بینیوە، لە تەواوی ژیانمدا نەمبینیوە. هەڵبەت ئەوە ڕێگا نەبوو، لە ڕێگای کوێستانەوە بە سەربەردەکاندا دەڕۆیشتین، لە هەر چەند هەنگاوێکدا مارێک دەردەکەوت. حاجی خانم لە مار دەترسا. حاجی خانم زۆربەی شەوان خەوی بە مارەوە دەبینی. حاجی ئاغاش دەیگوت خەوەکەت باشە و هیچ مەترسە، چونکە مار لە خەودا سامانە، خودای گەورە سامانمان زیاد دەکات. حاجی ئاغا لە پێناوی منداڵبووندا سەیدێک نەمابوو خێری بۆ نەکات.

حاجی پیاوێکی چرووک و پولەکی بوو، هەموو خەڵکی شار و خزم و کەسەکانی خۆی، دەیانزانی کە کەسێکی چرووکە، پیاوێک بوو ڕیاڵێکی لە دەست هەڵنەدەوەری.
لە ساڵی (١٣٤٠-١٩٦١) حاجی بابای باوکی، ماوەیەک نەخۆش بوو لەماڵەوە کەوتبوو، خزمەتکارێکیان بەکرێگرت بوو بۆ خزمەتکردن و خاوێنکردنەوەی، ئەو خزمەتکارە بە بەردەوامی ئەو پیاوە پیرەی دەشێلا و خواردنی دەکرد بە دەمیەوە و جلوبەرگی دەگۆڕی و خاوێنی دەکردەوە، لەناکاو ڕۆژێک حاجی بابا حاڵی زۆر خراپ دەبێت و دەچێتە حاڵی مردن. حاجی چەند ڕۆژێک بەهۆی نەخۆشی باوکییەوە بێکار دەبێت و ناچێتە سەر کار، دوکانەکەی بە شاگردەکەی دەسپێرێت و دەچێت بۆ لای باوکی.
پاشان وردە وردە حاجی بابا حاڵی باشتر دەبێت، حاجی لەگەڵ دایکیدا حسابی خەرجی و بێکاری ئەو چەند ڕۆژە دەکات و داوای پارەیەکی زۆری لێدەکات لە بری ئەوەی کە لەلای باوکی ماوەتەوە. دایکیشی بۆی دەرکەوت ئەو پارەیەی حاجی داوای دەکات یەکجار زۆرە. حاجی بۆ پێنج ڕۆژ بێکاربوونی خۆی ڕۆژی داوای (٥٠٠) تومەن دەکات.
ساڵی (١٣٤٠-١٩٦١) مووچەی مامۆستایەکی ئامادەیی مانگی (٢٥٠) تومەن بوو. دایکی گوتبوی ئەو (٢٥٠٠) تومەنە چیە کە تۆ دلوای دەکەیت؟ حاجی گوتبوی من پێنج ڕۆژ بێکار بووم، بەهۆی نەخۆشی باوکمەوە نەچووم بۆ دوکانەکەم و کار و کاسبیم نەکردووە، ئەوە ڕۆژانەی خۆمە. دایکی گوتبووی ئەو قاسمەی کە بەکرێمان گرتبوو بۆ خزمەتکردنی باوکت شەو و ڕۆژ خزمەتی دەکرد ڕۆژی دوازدە تومەنمان پێدەدا، ئێستا تۆ هاتوویت بۆ لای باوکی خۆت و ڕۆژی (٥٠٠) تومەنیش وەردەگریت. لە کۆتاییدا حاجی بۆ ئەو پێنج ڕۆژە بە دوو هەزار تومەن ڕازی دەبێت. ئەمە هەڵوێستی کوڕێک بوو بەرامبەر بە باوکی، کوڕێک کە پاش حەوت کچ لە دایک ببوو.

حاجی بە منداڵی نەچوو بووە قوتابخانە، بەڵام لای مەلا هەندێک خوێندەواریی فێر ببوو، لە بارەی حەرام و حەڵاڵەوە هەندێکی دەزانی، لە ناو بازاڕیشدا خۆی وەک پیاوێکی سەرڕاست و لە خودا ترس دەردەخست. ئەو کاتە سوو خۆر لە بازاڕدا زۆر بوون، ئەم حاجیە پارەی دابوو بە کوڕە خاڵەکەی خۆی بە سوو، بەڵام کە پارەکەی پێدا بوو لەپێشدا پارەی سووەکەی لێگێڕابووەوە پاشان پارەکەی تری پێدا بوو. حاجی نموونەیەکی تەواوی حاجیە بازاڕییەکانی یەزد بوو. بازرگان و کاسبکارێکی تەواو بوو، پارەی بە سوو دەدا و لە کاتی خۆیدا پارەکەی وەردەگرتەوە، بەڵام ئەگەر کەسی پارەوەرگر لە کاتی دیاریکراودا نەیتوانیبایە پارەکە بداتەوە، ئەوا حاجی دیسان سوویەکی تری دەخستە سەر پارەکەی. سەیرکەن بانکەکانی ئێستاش هەر هەمان

کاردەکەن، ئەگەر لەکاتی دیاریکراودا پارەیان بۆ نەگێڕیتەوە ئەوا سووت لەسەر زیاد دەکەن. هەزار ساڵە لە بازاڕەکانی ئێمەدا هەمان کار ئەنجام دەدرێت. حاجی هەموو ڕۆژێک نوێژی نیوەڕۆی لە مزگەوتی بازاڕ دەکرد و لە ماڵەوەش نوێژی نەدەچوو. ئەو هەرچەندە تەمەنی بەرەو ژوورتر بڕۆیشتایە زیاتر گرنگی بەنوێژەکانی دەدا.

ئەم حاجییە کەسێکی تایبەت نەبوو، من لە تەمەنمدا زیاتر لە سەد کەسی خراپتر لەم حاجییەم بینیوە، لە شارەکانی یەزد و کرمان و تاران و مەشهەد و شارەکانی تری ئێراندا. کە هەم سوو خۆر بوون و هەم کاری بەدڕەوشتیشیان دەکرد. ئەم حاجییە بە شوێن منداڵی خەڵکەوە نەبوو، بەڵام هەندێک لە حاجییە بازاڕییەکان هەمیشە لەکاتی خۆیدا دەچوون بۆمزگەوت و لە پشتی مەلاوە نوێژیان دەکرد، هاوکات سوو خۆر و منداڵبازیش بوون. ئەوان بە ئاشکرا دەیانگوت ئێمە ڕازی و منداڵ ڕازی خودای گەورەش گوناه پۆشە. ئەم حاجییە تەنها سوو خۆر بوو سیغەشی دەکرد، سیغە کردنەکەشی بۆ تاقیکردنەوەی منداڵ بوونبوو.

هاوینی ساڵی (١٣٤٣-١٩٦٤) من لە گەراجی ئەتمینان کارم دەکرد. پاسەکانی کرمان بۆ تاران و دەوروبەری کاتژمێر نۆ ی شەو دەگەیشتنە یەزد، پاسەکان بەگشتی کە دەگەیشتن چەند کورسییەکیان بەتاڵ بوو، ئەو گەشتیارانە کە دەیانویست بچن بۆ تاران، دەوروبەری کاتژمێر نۆ ی شەو دەهاتن، ئەگەر جێگە هەبووایە بلیتیان وەردەگرت و سەردەکەوتن و دەڕۆیشتن. ئەو کاتە من بلیتم دەفرۆشت و گەشتیارم سواری پاس دەکرد. حاجی ڕەزا چەندین جار کە دەڕۆیشت بۆ تاران دەهاتە لامەوە و دەیگوت «حسێن گیان ئەگەر جێگایەکی بەتاڵ هەبوو لە لای ژنێکی تەنیاوە، ئەو جێگایە بۆ من دابنێ». حاجی دەیویست لە یەزدەوە تاکو تاران شەو تا بەیانی لە تەنیشت ژنێکەوە دابنیشێت. ئای خەڵکینە بترسن و قسەی دڵی خۆتان لای کەسانی وەکو من باسمەکەن، ئەوەتا دوای پەنجا ساڵ ئەم قسەیە لە یادەوەرییەکانمدا دەنووسمەوە.

حاجی خانمی ژنی حاجی ڕەزا، هەر لە منداڵییەوە بەرامبەر بە خزمەتکارەکانی توندوتیژ بوو، لە ڕوانگەی ئەوەوە خزمەتکار و نۆکەر مرۆڤ نەبوون، کاتێک لە ماڵی باوکیشی بووە، پێش شووکردنی هەمیشە خزمەتکارەکەیانی ئازارداوە و دەیگوت ئەگەر خزمەتکار سکی تێربێت گەورەی خۆی ناناسێت، تەنانەت ئەو لەو باوەڕەدا بوو کە خزمەتکار دەبێت کاتژمێر (٤-٥) ی دوانیوەڕۆ نانی نیوەڕۆ بخوات، تاکو باش برسیی بێت و ڕێزی خواردنەکە بگرێت. ئەو ڕەفتارانەی حاجی خانم لەگەڵ خزمەتکارەکانیدا کێشەی کەسێتی نەبوو، بەڵکو کێشەیەکی پەروەردەیی بوو، بەڵام پاشان حاجی خانم

کە ئاواتەخواز بوو خودا منداڵێکی پێببەخشێت، لەگەڵ خزمەتکارەکەیدا کە سەید بوو، میهرەبان بوو، سێ ژەمە بەرلەوەی خۆیان نان بخۆن خواردنی بۆ خزمەتکارەکەیان تێدەکرد. دیارە ئەمکارەی لە ڕووی مرۆڤایەتییەوە نەبوو، بەڵکو لە پێناوی ئەوەدا بوو کە خودا منداڵێکی پێببەخشێت. ئەو ژنە سەیدەش ڕۆژانە نزای دەکرد کە حاجی خانم دوگیان ببێت، نزای دەکرد کە خودا منداڵێک بەو بنەماڵەیە ببەخشێت. لە دواییدا و پاش چەند ساڵ گەڕان بە نەخۆشخانەکاندا و سەردانی دکتۆر و سەردانی مەرقەدی پیاوچاکان، کتوپڕ لە نێو شاردا هەواڵ بڵاوبووەوە و گوتیان حاجی خانم لە تاران لە نەخۆشخانە کەوتووە و لەژێر چاودێریی دکتۆردایە، خەریکە منداڵی دەبێت. گوایە دکتۆر پێی گوتبوو نابێت بەملاولادا بجولێت و پێویستە لە نەخۆشخانە بمێنێتەوە.

ساڵی (١٩٤١-١٩٤٢-١٩٦٣-١٩٦٤) بوو هێشتا زانستی پزیشکی بەم شێوەیەی ئێستا پێشکەوتوو نەبوو. حاجی دەیگوت زۆر سوپاس بۆ خودا وا منداڵێکی پێبەخشیم. ڕۆژێک هەواڵهات کە منداڵەکەیان لە دایکبووە، بەڵام دەبوو حاجی خانم و منداڵەکەی ماوەی (٦-٧) هەفتە لە نەخۆشخانە بمێننەوە. پاش ماوەیەک بە هەزار نزای خێر، حاجی خانم و منداڵەکەیان لە تارانەوە هێنایەوە و مەڕێکیشیان بۆ کردن بەخێر. خەم و پەژارەی ماڵی حاجی گۆڕدرا بە شادی و خۆشی و منداڵەکەیان ناونا یەڵدا. حاجی خانم خۆی شیری نەبوو، دەبوو دایەنێکی بۆ بگرن. یەڵدا بەشیری دایەن گەورە بوو. ئەو سەردەمە تازە شیری وشک پەیدا ببوو، بەڵام کەمبوو، خۆ ئەگەر هەشبووایە لە شارەکەی ئێمەدا زۆر کەم بوو. خەڵکی دەیانگوت شیری وشک لە شیری مانگا دروستدەکرێت هەر منداڵێک شیری وشک بخوات خووی مانگا دەگرێت و لە ئایندەدا وەک مانگا هەڵسوکەوت دەکات. حاجی ئاغا و حاجی خانم ئەوەندە خێر و نزایان کردبوو بۆ لەدایکبوونی یەڵدا، ئەوندەشیان خێر و نزا کرد بۆمانەوەی و نەمردنی. ئێستا ئەم منداڵە تەمەنی بووە بە (٢٢-٢٣) ساڵ و دەیەوێت شوو بکات. حاجی ئاغا بەم هەموو شادی و خۆشییەوە، هەندێک جار دەچووە ژێر بیرکردنەوە و خەم دایدەگرت. حاجی خانم لێیدەپرسی بیر لە چی دەکەیتەوە؟ ناکا بیر لە شتی خراپ بکەیتەوە. حاجی ئاغا دەیگوت. نا.. نا، بیر لە هیچ ناکەمەوە. کچێکمان هەیە وەک فریشتە، وەک چەپکە گوڵ مایەی شادی و خۆشی ماڵەکەمانە، بەڵام ئێستا دەیەوێت بڕوات، بیر لەوە دەکەمەوە ئیتر ماڵەکەمان چۆڵ و تاریک دەبێت. حاجی خانم گوتی بیرکردنەوی ناوێت، یەڵدا لەم شارە دوور ناکەوێتەوە ماڵەکەشیان هەر لە نزیک ماڵی خۆمان دەبێت، هەموو ڕۆژێک دەتوانین یەکتری ببینین. ئینشائەڵلا، یەکەم منداڵ بوونیشی دووانە دەبێت ئەو

کاتە ماڵەکەمان پڕ دەبێت لەگڕوگاڵی منداڵ، بەڵام حاجی ئاغا بە بەردەوامی لە خەیاڵ و بیرکردنەوەدا بوو.

حاجی پیاوێکی لات و باڵایەکی مامناوەندی هەبوو، هەمیشە سەری دەتاشی و کەسێکی قسەخۆش بوو، کە سەیرت دەکرد کەسێکی ناشیرین نەبوو، بەڵکو کەسێکی بازاڕی بوو، چەندین هۆنراوەشی لەبەربوو، جلوبەرگی جوان و خاوێنی لەبەر دەکرد، زۆر چوستوچالاک بوو. لە دوای ساڵی (١٣٤٠-١٩٦١) ـەوە ئۆتومبێلی خۆی هەبوو، بەڵام زیاتر بە سواری پاسکیل هاتوچۆی دەکرد. پاسکیل سواریی نەریتێکی جوانی یەزدییەکان بوو، بەڵام بەداخەوە کاتێک ماتۆڕسکیل پەیدا بوو، ئەوان وازیان لە پاسکیل سواریی هێنا و خوویان دایە ماتۆڕسکیل. یەزدییەکان وردە وردە خوویان دایە زۆرخۆریی و شیرینی خواردن، بۆیە ئێستا ئەم شارە لەڕووی نەخۆشی شەکرەوە یەکەمین شاری ئێرانە. ئەو خەڵکە کاتێک وازیان لە پاسکیل سواری هێنا و سواربوونی ئۆتۆمبێلیان کرد بەنەریت و دەستیانکرد بەزۆرخۆریی و خواردنی شیرینی و پاقلاوە، نەخۆشی شەکرەش پەیدا بوو. بە بێ جووڵەیی و خواردنی شیرینی و زۆرخۆریی خەڵکی قەڵەو دەبن و ورگیان گەورە دەبێت و نەخۆشی شەکرەش ڕوویان تێدەکات. شارنشینی وردە وردە کەسە ساخەکان دەگۆڕێت بە کەسی نەخۆش، هۆکەشی ئەوەیە کە خەڵکی ناجوڵێن و خواردنی سروشتی لە ژەمە خواردنەکانیاندا کەم بووە و چەوریی وشیرینی و نەستەلە جێگای گرتوونەتەوە.

لە وڵاتدا شۆڕش کرابوو، بەڵام لە ماڵی حاجیدا هیچ هەواڵێک نەبوو. وڵات تووشی جەنگێکی گەورە ببوو، بەڵام ماڵی حاجی لە هیچ شتێکیان کەم نەبوو. گەنجەکان دەچوون بۆ بەرەکانی جەنگ، ناوی شەقام و کۆڵانەکۆنەکان دەگۆڕدران بە ناوی شەهیدەکان، خەڵکی گیانی خۆیان بەخت دەکرد و خۆیان بە کوشتدەدا، بەڵام داهاتی حاجی ڕۆژ بە ڕۆژ بەرەو زیاد بوون دەچوو.

هەندێک کەس زۆر بە سادەیی زەماوەندان دەکرد، بەڵام کچی حاجی دەبوو زەماوەندەکەی شاهانە بێت. ئیتر کارەکان ڕێچکەی خۆیان گرت و بڕیاردرا کە بنەماڵەی زاوا بۆ دیاریکردنی مارەیی و ڕۆژی زەماوەند سەردانی ماڵی حاجی بکەن، تاکو هەرچی زووترە مەراسیمی مارەبڕین ئەنجامبدەن. حاجی ئاغا دەیگوت لانیکەم دەبێت یەک هەفتە ماوە هەبێت لە نێوانی مەراسیمی مارەبڕین و بووک گواستنەوەدا. ئەو سەردەمە لە شاری یەزد و زۆربەی شارەکانی تری ئێران تاکو دەیەی ساڵی (١٣٥٠-١٩٧١) ڕێوڕەسمی مارەبڕین و بووک گواستنەوە بە یەکەوە بوون، بەڵام ئێستا بە هۆی

کێشەی ئابوورییەوە جاری وا هەیە پاش دوو ساڵ لە مارەبڕین ئەوکات زەماوەندی بووک گواستنەوە ئەنجام دەدرێت، دیارە ئەمەش گۆڕانکارییەکی ترە. بنەماڵەی زاوا، هاتن و هەموو شتێک بە خێر و خۆشی گوزەرا. زوهرە خانم ژنێکی سەید بوو، خزمەتکاری ماڵی حاجی بوو، لە پێش لەدایکبوونی یەڵداوە لە ماڵی حاجی کاری دەکرد. هەمان ئەو ژنە بوو کە حاجی خانم خێری پێدەکرد و ئەویش نزای بۆ دەکرد تاکو منداڵی ببێت. زوهرە خانمیش دەیویست کچەکەی خۆی بنێرێتە ماڵ و مێردی خۆی، هەڵبەت ئەویش سێ کچی هەبوو، کچە بچووکەکەی مارە کرا بوو. دەیویست چەند دەست نوێن و سیسەمێک بکڕێت و کچەکەی ڕەوانەی ماڵی زاوا بکات. حاجی خانم پێی گوتبوو هەر کاتێک یەڵدا چوو بۆ ماڵ و مێردی خۆی، نوێن و کەلوپەلی خەوەکەی هەمووی بۆ تۆ. ئەویش هەمیشە نزای دەکرد کە یەڵدا بەزوویی بڕوات بۆ ماڵە مێردی خۆی. زوهرە خانم ئومێدەوار بوو لە کاتی بردنی یەڵدادا هەندێک پارەی دەستبکەوێت. هەر بۆیەش زوو مقەڵیی ئەسپەند سووتاندنی ئامادەکرد بوو. ڕۆژی زەماوەند ئەسپەندی سووتاند و دوکەڵی دروستکرد بە دەوری سەری بووک و میوانەکاندا دەیگێڕا، ئەوانیش هەر کەسە و بڕێک پارەیان بۆ دادەنا. زوهرەخانم زۆر زەحمەتی کێشابوو.

ڕۆژێک دوای داواکارییەکە، بووک و زاوا ئەو ئاوێنە و مۆمدانە زیوییەی کە لە تاران چاویان پێیکەوتبوو، هەواڵیان نارد بۆ تاران تاکو بەزوویی بۆیان بکڕن و بۆیان بنێرن، پاش دوو ڕۆژ ئاوێنە و مۆمدان کڕدران و گەیشتنە یەزد. بۆ کڕینی ئەو ئاوێنە و مۆمدانە پارەیەکی زۆر خەرج کرا، چونکە ئەوان بە هەموو ئاوێنە و مۆمدانێک ڕازی نەدەبوون، بۆیە دەبوو زیوکاریی مۆمدان و چوارچێوەی ئاوێنەکە دەستکردی وەستا کارامەکانی ئەسفەهان بێت. دەبوو ئاوێنەکەیان بە جۆرێک بێت کە زۆر بەڕوونی و جوانی یەکتری تێدا ببینن.

ڕۆژێک یەڵدا بەرگی بووکێنی لەبەرکرد و بەرانبەر بە ئاوێنە گەورە تایبەتیەکەی، لە سەر کورسی مارەبڕین دانیشت. ئاوێنەیەک کە چوارچێوەکەی لە زیو گیرابوو، لە تارانەوە بۆی هاتبوو، جوان و ڕازاوە و خۆشبەخت لە هیچ شتێکی کەم نەبوو، غرور و سەرمەستی جوانی و خۆشبەختی خۆی بوو، خاوەنی لەشێکی ساخ و پارەیەکی زۆر بوو، دایک و باوکێکی باش و میهرەبانی هەبوو، هیچ کەموکوڕییەکی نەبوو. بنەماڵەی زاواش بنەماڵەیەکی خانەدان و دەوڵەمەند و ئابڕوومەند بوون. ئیتر یەڵدا لەوە زیاتر چی دەویست، سوپاسی خودای دەکرد و نزای خۆشبەختی دەکرد، ئەو یادەوەریی سەردەمی منداڵی دەهاتەوە پێش چاو، یادی ئەو ڕۆژانەی دەکردەوە کە لە تەمەنی (٣-

٤) ساڵیدا سواری پشتی باوکی دەبوو، باوکیشی بە چوارچنگۆڵە دەڕۆیشت، پوورەکانی لە باوەشیان دەکرد و بالۆرەیان بۆ دەگوت، یادی ئەو ڕۆژانەی دەکردەوە کە دایکی بووکەڵەیەکی بۆ کڕیبوو یاریی پێدەکرد، یادی ئەوەی دەکردەوە کە پوورەکانی و تێکڕای خزمەکانی جۆرەها یارییان بەدیاری بۆ هێنا بوو، ژوورێکی پڕ کردبوو لە دیاریی منداڵانە. حاجی ئاغا بە جۆرێک بەرنامەڕێژیی کردبوو کە هەموو خەرجی ماڵەکەی بکەوێتە سەر بەلاشە. هەندێک پارەی بەسوو دابوو بە قەسابێک، لەبری سووی پارەکە گۆشتی لێ وەرگرتبوو. حاجی لەلای خۆیەوە هەموشتێکی حەڵاڵ کرد بوو. لەگەڵ قەسابەکەدا هاوبەش بوو. لەگەڵ بەقاڵ و قوماش فرۆشدا هاوبەش بوو. وەک دەڵێن پارە پارەی ڕادەکێشا. دیارە لەو سەردەمەدا هەڵاوسانی پارە سفر بوو، بڕێک پارە، پارەی زۆرتری ڕادەکێشا. تەنانەت حاجی لەگەڵ پەردەفرۆش و فەرشفرۆشیشدا هاوبەش بوو. ساڵێک بوو بڕێک پارەی بە سوو دابوو بە فەرشفرۆشێک، لەبری سووەکەی چوار فەرشی لێ وەرگرتبوو.

کاتێک یەڵدا تەمەنی حەوت ساڵ بوو، دەستێک جلی بووکێنیان بۆ کڕیبوو، لەگەڵ محەمەدی کوڕە پووریدا یاریی بووک و زاوایان دەکرد. لە تەمەنی نۆ بۆ دە ساڵیدا، باوکی پێی گوتبوو ئیتر تۆ گەورە بوویت و نابێت لەگەڵ کوڕاندا یاریی بکەیت، دەبێت لە کوڕە پوورەکانت دووربکەویتەوە و نوێژ بکەیت، کە چوویتە کۆڵانیش دەبێت ئاگات لە لەچک و عەباکەت بێت.

ئەوسا هێشتا شۆڕشی ئیسلامی بەرپا نەکرابوو، کەچی باوکی باسی کێشە ئایینییەکانی لەگەڵدا دەکرد، بەڵام ئەو بیری لە ڕۆژانی قوتابخانە و پۆلی یەکەمی سەرەتایی دەکردەوە، کاتێک ماموستاکەی بە میهرەبانییەوە بانگی دەکرد، ئەویش بە هێمنی وەڵامی دەدایەوە، بیری لە تەواوی ڕۆژانی قوتابخانە و ئەو یاریی و شەڕە منداڵانەیەی لەگەڵ هاوڕێکانی کردبوونی، دەکردەوە. بیری لە هەموو ماموستایان و پۆلەکانی خوێندن دەکردەوە، هەر لە سەرەتاییەوە تاکو تەواوکردنی زانکۆ. ئەو ڕۆژانەی بە تەواوی دەهاتەوە پێشچاو و بەو یادەوەرییانە شادمان دەبوو، ئەو هەمیشە باوەڕێکی زۆری بە خۆی هەبوو، باوەڕەکەی بە جۆرێک بوو کە هەر کارێک بیەوێت دەتوانێت ئەنجامی بدات. ئەوەی دەهاتەوە بیر کە کاتێک تەمەنی (١٤-١٥) ساڵ بوو، چەندین جار کوڕان سەر ڕێگایان پێگرتووە و بەڵێنی خۆشەویستییان لێوەرگرتووە، کاتی ژوانیان لەگەڵ دیاری کردووە لە سەربانەکان، بەڵام لە کۆتاییدا ئەو نەدەڕۆیشت. هەمیشە دایک و باوکی پشتوپەنای ئەو بوون. بۆ هەر شوێنێک بڕۆیشتایە خزم و کەسەکانی دایک و

باوکی ئاگادارییان دەکرد. ئەو ئەوەی بە بیر هاتبووەوە کاتێک باپیری -باوکی دایکی- مردبوو نەیدەزانی چەندی میراتی بەرکەوت، چونکە دەوڵەمەندیی دایکی لە دەوڵەمەندیی باوکی کەمتر نەبوو، هەموو سامانی دایک و باوکی بۆ ئەو بوو، ئەو تەنها بیری لەوە دەکردەوە کە زەماوەندەکەی نموونەیی بێت. مەراسیمەکەی نموونەیی بوو، تەنانەت چێشتلێنەریان لە تارانەوە هێنابوو، باشترین ئارایشتگەیان بۆ دابینکردبوو، هەندێک لە هاوڕێکانی زۆر بە سادەیی شوویان کردبوو، بەڵام شووکردنی ئەو گرنگی زۆری پێدرا بوو. چاوەکانی دادەخستن و دەیکردنەوە، خۆی لە ئاوێنەدا دەبینی و بیری لە ڕابردوو و داهاتووی خۆی دەکردەوە، بیری لە مانگی هەنگوینی خۆیان دەکردەوە و بەرنامەڕێژیی دەکرد بۆ ساڵی یەکەمی هاوسەرییان، بیری لە ساڵانی داهاتوو دەکردەوە، منداڵەکانی دەژمارد، بیری لەوە دەکردەوە چۆن ژن بۆ کوڕەکانی بهێنێت و چۆن کچەکانی بە شوو بدات! لە بیری ئەوەدا بوو کە چۆن لەگەڵ هاوسەرەکەیدا دەچوون بۆ گەشتی وڵاتانی ئەورووپا و ئەمریکا، دەچوون بۆ زیارەتی مەککە و مەدینە. بیری لەوە دەکردەوە کە چۆن گەشتێک بۆ وڵاتی چین ئەنجامبدەن و ماوەیەک لەوێ بمێننەوە، چونکە زۆر حەزی بە وڵاتی چین دەکرد، بیری لەوە دەکردەوە کە نەوەکانی گەورە دەبن و ئەو کاتە خۆی و هاوسەرەکەی پیردەبن و یەکی دارێک بە دەستەوە دەگرن و بەکۆڵانەکانی شاردا دەسووڕێنەوە و خانووە کۆنەکەیان چاک دەکەن و دەیکەن بەخانوویەکی جوان و حەوزێکی گەورە لە حەوشەکەیدا دروستدەکەن و بە نەوەکانیشی دەڵێت ئاگاداربن نەکەونە حەوزە ئاوەکەوە. حسێنی هاوسەری بە سەر و ڕیشی سپییەوە وەکو بابە گەورەیەک دەهێنایە پێش چاوی خۆی. ئەو دەیویست گەشت بۆ هەموو جیهان بکات، هەموو شوێنێک بگەڕێت و بۆ هەر شوێنێک ڕۆیشت دووبارە بگەڕێتەوە بۆ ماڵە کۆنەکەی خۆیان و بۆ لای منداڵ و نەوەکانی.

لەناکاو دەنگی دایکی بەئاگای هێنایەوە کە گوتی یەڵدا گیان ئەوە چیە؟ چەند کاتژمێرە تۆ لەبەردەم ئەو ئاوێنەیەدا دانیشتوویت. یەڵدا گوتی دایکە گیان چی بکەم، چیت دەوێت؟ دایکی گوتی وەرە مێزەکە ڕێکبخە و نانی ئێوارە ئامادەیە و ئێستا باوکت دێتەوە، نازانم ئەمڕۆ بۆچی باوکت دواکەوتووە؟ هیچ کاتێک ئەوەندە درەنگ نەگەڕاوەتەوە. ئادەی، تەلەفۆنێکی بۆ بکە بزانە تا ئێستا لە دوکانە!

ئەوان کاتێک لە خانووە کۆنەکەیاندا بوون، هەمیشە لەسەر زەوی دادەنیشتن بۆ نانخواردن، بەڵام لەو کاتەی چووبوونە خانووە تازەکەیانەوە، لە سەر مێز نانیان دەخوارد و شێوازی خواردنەکەشیان گۆڕدرا بوو، ئیتر وردە وردە خواردنی گۆشتاویان فەرامۆش

دەکرد. کاتێک بۆ نانخواردن چوونە سەر مێز و کورسی، گۆشتاویش فەرامۆش کرا. فەرهەنگی هەموو شتێک لە گۆڕانکاریدا بوو. حاجی سێ قرانی لە دەست هەڵنەدەوەری، کەچی لەو کاتەدا بۆ مەراسیمی مارەبڕینی کچەکەی زیاتر لە سەد هەزار تومەنی خەرج کردبوو، حاجی لە سەردەمی منداڵی و لاوێتیدا بە گۆشتاوی دەگوت (دوزوقە) واتە. خواردنە بەچێژەکە. زۆرێک لە خەڵکی یەزد بەگۆشتاویان دەگوت (دوزوقە). کاتێک نانەڕەقیان لە گۆشتا و دەگوشی و بە تامەزرۆییەوە دەیانخوارد، دڵخۆش دەبوون. ئێستا کەسانێک هەن لە ڕۆژێکدا دوو ژەم گۆشتاو دەخۆن، هاوکات کەسانێکیش هەن لە ساڵێکدا جارێکیش گۆشتاویان دەستناکەوێت و بە بۆنی گۆشتاوی دراوسێکەیان مەست دەبن، بەڵام حاجی ئێستا گۆشتا و ناخوات. حاجی پێشتر لە هەفتەیەکدا لانیکەم، چوار جار گۆشتاوی دەخوارد. ئێستا، ساڵی جارێکیش گۆشتاو ناخوات. (فەربود پاپۆلی) کوڕیشم حەز لە گۆشتاو دەکات و ڕۆژانی هەینی لەسەر زەوی دادەنیشین و گۆشتاو دەخۆین. بەلای منەوە نانخواردن بەدانیشتنان و لەسەر زەوی سەد ئەوەندەی خواردنی سەر مێز لەزەتی زیاترە. ڕۆژانی هەینی لە ماڵی خۆماندا بۆ نانخواردن ناچینە سەر مێز، بەڵکو لە سەر زەوی دادەنیشین و نانەکەمان دەخۆین، بەڵام ڕۆژانی تر دەگەڕێینەوە بۆ سەردەمی مۆدێرنێتە و دەچینەوە سەر مێز. شەوانەش هەندێک جار دەگەڕێینەوە بۆ سەردەمی مۆدێرنێتە و لە سەر مێز دادەنیشین و پیتزا دەخۆین. پیتزا خواردنێکە نە پێویستی بە ڕاخستنی سفرە هەیە و نە پێویستی بە قاپ هەیە، خواردنەکە خۆی لە قاپی نایلۆن و کاغەزدا پێچراوەیە، هەر بۆی پیشەسازیی دروستکردنی قاپی نایلۆنی یەکجار بەکارهاتوو، کە هەموو شارەکانت پیس و بۆگەن کردووە.

ئەو ڕۆژە حاجی ئاغا درەنگ گەڕایەوە بۆ ماڵەوە، حاجی هەمیشە نوێژی ئێوارە و خەوتنانی لە مزگەوت دەکرد. ئەو تاکو تەمەنی زیاتر بوایە زیاتر گرنگی بە نوێژەکانی دەدا. حاجی ئاغا خەم و نیگەرانییەکی زۆر بەڕوویەوە دیار بوو، نیگەرانییەکەی بەجۆرێک بوو کە حاجی خانم و یەڵدا هەستیان پێدەکرد. حاجی درەنگتر لە ڕۆژان گەڕایەوە بۆ ماڵەوە، لە سەر مێزی نانخواردن گوتی، هەندێک پارە و فەرشێکم کردووە بەخێر سبەی دەڕۆم دەیبەم بۆ ئاغا سەید، لە نییەتی خۆشبەختی کچەکەمان. ئاغا سەید کەسێکی بەڕێز و خۆسەویست بوو، چەند ساڵێک بوو حاجی ئاغا و حاجی خانم دیارییان بۆی دەبرد. یەڵدا گوتی باوکە منیش لەگەڵتدا دێم، خۆ من هەرگیز چاوم بە ئاغا سەید نەکەوتووە. حاجی گوتی ئێستا تۆ کارت زۆرە دوای زەماوەندەکەت جارێکی تر بە یەکەوە دەچینە سەردانی.

ڕۆژی مەڕاسیم گەیشت، هەموو خزم و کەسەکانیان لە تاران و شار و شارۆچکەکانی ترەوە هاتبوون. ماڵەکەیان زۆر گەڤزە -قەرەباڵغ- بوو، هەموو پوورەکانی بە خۆیان و هاوسەر و منداڵەکانیانەوە هاتبوون، خزمەکانی حاجی خانمیش هاتبوون. هەر کەسە و کارێکی دەکرد. یەڵدا وەکو تاوس خۆی ڕازاندبووەوە و ژوور بە ژوور دەگەڕا بۆ بەخێرهاتنی خزم و کەسەکانی. بڕیار بوو کاتژمێر پێنجی دوانیوەڕۆ مەلا بێت و مارەبڕین ئەنجامبدات. تا دەوروبەری کاتژمێر شەش، واتە پێش ئەوەی خۆر ئاوابێت، مارەبڕینەکە کۆتایی پێبێت. هەندێک کەس لەو باوەڕەدا بوون کە دەبێت مەڕاسیمی مارەبڕین پێش خۆرئاوابوون بێت. ئەو چەپکە گوڵانەی بەدیاریی بۆیان هاتبوو ئەوەندە زۆر بوون ماڵەکەیان لە دوکانی گوڵفرۆش دەچوو. بووک و هاوڕێکانی چووبوون بۆ ئارایشتگە، کاتژمێر دەوروبەری چوار و نیوی دوانیوەڕۆ بوو کە زاوا بووکی بە ئۆتۆمبێلێکی تازە مۆدیل هێنایەوە. ئەو ئۆتۆمبێلەی کە پێش دوو ڕۆژ باوکی بۆی کڕیبوو. یەڵدا خانومان، خانومان بە جلی سپی بووکێنییەوە هاتە ژوورەوە، جلەکانی درێژ بوون دوو کەس لە دواوە هەڵیانگرتبوو، تاکو لە زەوی نەخشێت. هەر لەوێدا و لەبەر پێیدا مەڕێکیان سەربڕی و خوێنی بەو ناوەدا بڵاوبووەوە، ئەسپەندیان سووتاند و دوکەڵ بەدەوری سەری بووکدا ئەڵقەی دروستکرد. دەنگی (الله اکبر) و چاوی حەسوود کوێربێت، هەموو لایەکی پڕکرد بوو. یەڵداش زۆر شۆخوشەنگ بوو ئارایشتگەش هەرچی لە دەستی هاتبوو، بۆ ڕازاندنەوەی دریغی نەکردبوو. مەلا هات بۆ مارەبڕین، مەلا پیاوێکی کامڵ بوو. دیاربوو تەواوی کاتی ئەو دوانیوەڕۆیەی تەنها بۆ ئەو مارەبڕینە تەرخان کرد بوو. هەموو شتێک ئامادە کرابوو، لە شەربەت و شیرینی. خزم و کەسی هەردوو بنەماڵە ئامادە بوون، بەڵام حاجی ئاغا لە ماڵەوە نەبوو، ئەو بۆ شوێنێک ڕۆیشتبوو، گوتبووی کارێکی تایبەتی هەیە. حاجی ئاغا تەمەنی (٦٥) ساڵ دەبوو. حاجی خانم کەوتبووە دڵەڕاوکێ، دەیگوت لەم کاتەدا ئەم پیاوە بۆ کوێ ڕۆیشتووە؟ هەموو شتێک ئامادە کرابوو، لە هیچ شتێک کەم نەبوو، ئەی دەبێت حاجی ئاغا بۆ کوێ چووبێت؟ دوای نیو کاتژمێر حاجی ئاغا لەگەڵ پیاوێکی سەیددا هاتەوە بۆ ماڵەوە. سەید مێزەرێکی سەوزی لە سەردا بوو، پیاوێکی بەڕێز و بەژن و بالایەکی ڕێکوپێکی هەبوو. تەمەنی حەفتا ساڵ دەبوو. حاجی خانم هات و بە حاجی ئاغای گوت. پیاوەکە تۆ لەکوێ بوویت؟ لەم کاتەدا بۆ کوێ چوو بوویت؟ حاجی ئاغا گوتی کارم هەبوو. کارێکی گرنگم هەبوو. پێویستە لەگەڵ ئەم ئاغا سەیدە دا پرسوڕایەک بکەم. حاجی خانم هەرگیز ئاغا سەیدی نەبینی بوو. لە دڵی خۆیدا گوتی دەبێت بۆچی پرسوڕا

بە ئاغا سەید بکات؟ چ شتێک هەیە کە دەبێت پرسوڕای پێبکات؟ ئاغا سەید لە نێو میوانەکاندا دانیشت و فەرمووی خواردنیان لێکرد، بەڵام ئەو دەستی بۆ یەک شت نەبرد و هیچی نەخوارد، هەموو ئەو کەسانەی کە بانگێشت کرابوون و لەوێ ئامادەبوون، یەکتریان دەناسی، بەڵام هیچ کەسێک ئەو سەیدەی نەدەناسی، هەموو میوانەکان خۆیان ڕازاندبۆوە و جلوبەرگی تازە و جوانیان پۆشی بوو، تەنها سەید نەبێت بە جلوبەرگێکی کۆنەوە هاتبوو. ئاغا سەید عەمامەیەکی سەوز لە سەریدا بوو، ڕیشی کەمێک هاتبوو، موستیلەیەکی نقێم عەقیقی لە پەنجەیدا بوو، بە ڕووخساریدا دەردەکەوت کەسێکی مەزهەبی و ئایینییە. حاجی خانم خەریکی کارەکانی خۆی بوو. خەڵکەکەش هەموویان نزایان دەکرد بۆ سەلامەتی باوکی بووک.

حاجی ئاغا هەڵسا و ڕۆیشت لە نێو میوانەکاندا یەڵدای دۆزییەوە و پێیگوت کچەکەی خۆم، چەند خولەکێک بچۆ بۆ ژوورەکەی خۆت کارێکی تایبەتم پێت هەیە، چونکە پاش چەند خولەکێکی تر مەڕاسیمی مارەبڕینەکەتە. یەڵدا لە دڵی خۆیدا گوتی دیارە باوکم دیارییەکی تازەم پێشکەش دەکات. باوک و کچ چوونە ژوورەوە. سەیدیش بە شاڵی سەوزەوە بەدوایاندا چووە ژوورەوە. یەڵدا سەری سوورمابوو بە هاتنە ژوورەوەی ئەو سەیدە و کەمێک خۆی کۆکردەوە، حاجی ئاغا، سەیدی بە یەڵدا ناساند.

حاجی ئاغا گوتی یەڵدا گیان کچی خۆم، نهێنییەک هەیە دەمەوێت پێتبڵێم، ئەمە دەستووری خودایە و پێویستە بیزانیت. من وا تەمەنم ڕۆیشت، دوور نییە سبەی بکەوم و بمرم، دەمەوێت خودا لە گوناهەکانم خۆشببێت. دەمەوێت لەم جیهانەدا لە بەردەم ئەم سەیدە بەڕێزەدا ڕووڕەش نەبم. یەڵدا تێنەگەیشت ئەونهێنییە چیە؟ گوناهی ڕووڕەشی چییە؟ بۆچی باوکی ڕووڕەش دەبێت لەبەردەم ئەم سەیدە بەڕێزەدا؟ بێتاقەت لە نێو جلوبەرگی بووکێنیدا دانیشتبوو چاوەڕوانی دوایین قسەکانی باوکی دەکرد. حاجی ئاغا گوتی یەڵدا گیان بەڕاستی باوکی تۆ ئەم سەیدە بەڕێزەیە نەک من، من تەنها بە ناو باوکی تۆم باوکی ڕاستەقینەت ئەم پیاوەیە. دەبێت ئەم پیاوە مۆڵەتی شووکردنی تۆ بدات نەک من. یەڵدا هیچ لە بابەتەکە تێنەگەیشت، وایدەزانی ئەوەش بەشێکە لە مەڕاسیمی مارەبڕین، وایدەزانی دەبێت سەیدێک بێت و لە کاتی مارەبڕیندا ببێت بە باوکی. یەڵدا گوتی من لەبارەی مەڕاسیمی مارەبڕینەوە هیچ شتێک نازانم، تاکو ئێستا لە مەڕاسیمی مارەبڕینی هاوڕێکانمدا ئامادە نەبووم، نەمزانیوە کە دەبێت سەیدێک بێت و ڕۆڵی باوک ببینێت. حاجی ئاغا گوتی یەڵدا گیان بۆچی تێنەگەیشتی؟ تۆ منداڵی من نیت.. بەڵکو تۆ کچی ئەم پیاوە بەڕێزەیت! دایکی تۆ لە کاتی لەدایکبوونی تودا مردووە. ئەو

کەسەی کە تۆ پێی دەڵێت دایکە، ئەویش دایکی تۆ نییە. ئێمە تۆمان لە کاتی لەدایکبوونتدا لە نەخۆشخانە هەڵگرتەوە. ئێمە بەهاوکاری یەکێک لە کارمەندانی نەخۆشخانەکە بە باوکتمان -کە ئەم سەیدە بەڕێزەیە- گوت، ژن و منداڵەکەت هەردوکیان مردوون، بەڵام ڕاستییەکەی ئەوە بوو، تەنها دایکت مرد بوو، تۆ بەزیندوویی مابوویتەوە. ئێمە درۆمانکرد و تۆمان لە باوکت دزیوە. بە بیستنی ئەم وتانە یەڵدا بەرچاوی ڕەش بوو، کەوت بەزەویدا و بوورایەوە. سەید هاواری کرد کچەکەم... کچەکەم. حاجی ئاغا بانگی کرد یەڵدا گیان.. یەڵدا گیان، بەڵام یەڵدا بوورایەوە و کەوت، سەری دای بە قاچی کورسییەکدا، لەسەر فەرشەکە بێهۆش کەوت. حاجی ئاغا بەپەلە لە ژوورەکە چووە دەرەوە، بانگی میوانەکانی کرد تکایە بەخێرایی حاجی خانمم بۆ بانگ بکەن. حاجی خانم لەگەڵ دوو لە خوشکەکانی حاجی ئاغا، بەخێرایی چوونە ژوورەکەوە. لە حاجی ئاغای پرسی چی ڕوویداوە؟ ئەم سەیدە کێیە؟ بۆچی چوونەتە ژوورەوە و دەرگاکەتان لەسەر خۆتان داخستووە؟ حاجی ئاغا گوتی بەزوویی پەرداخێک شەکراو بهێنە و دکتۆر ئاگاداربکە، بابێتە ژوورەوە، یەڵدا بووراوەتەوە. ژنەکان هەموو هاتنە ژوورەوە سەیریانکرد سەید بە دیار یەڵداوە دانیشتووە و ڕەنگوڕووی تەواو شڵەژاوە و مێزەرە سەوزەکەی لەسەر زەوی داناوە. نەیدەزانی چی بکات؟ ژنەکان نەیاندەزانی ئەم سەیدە کێیە؟ بۆچی سەری بووکی خستووەتە سەر ڕانی خۆی؟ لە ماوەی چەند خولەکێکدا ژوورەکە پڕبوو لە ژن و پیاو. هەرچەندە حاجی ئاغا هاواری دەکرد بڕۆنە دەرەوە، بەڵام کەس بەقسەی نەدەکرد. زاواش هاتە ژوورەوە، بەڵام هێشتا بووک بێهۆش بوو، ژنەکان سەیدیان لە ژوورەکە کردە دەرەوە، بەپەلە نیو پەرداخ شەکراویان کرد بە دەمی یەڵداوە. زاوا گوتی چی ڕوویداوە؟ حاجی ئاغا گوتی نازانم، یەڵدا قاچی لە کورسییەک گیرا و کەوت بە زەویدا و بێهۆش بوو. دکتۆری دراوسێیان کە ئەویش بانگهێشت کرا بوو بۆ ماڵی حاجی ئاغا، بە خێرایی ڕۆیشت بۆ ماڵەوە و کەلوپەلی پزیشکیی لەگەڵ خۆیدا هێنا، هات فشاری خوێنی یەڵدای گرت، فشارەکەی لە خوارەوە بوو، بەزوویی دەرمانی بۆ نووسی و چوون لە دەرمانخانەکەی خوار ماڵیانەوە دەرمانیان هێنا. دکتۆر گوتی هەمووتان لە ژوورەکە بڕۆنە دەرەوە، تەنها دایک و باوکی بووک لە ژوورەوە بمێننەوە، بەڵێنتان پێدەدەم کە دوای نیو کاتژمێری تر یەڵدا باش دەبێت و دێتە دەرەوە و مارەبڕینەکە ئەنجام دەدەرێت. یەڵدا چاوەکانی هەڵهێنا و زۆر بەبێتاقەتی بانگی کرد باوکە...باوکە.

حاجی خانم نەیدەزانی ئەو سەیدە کێیە؟ دەیگوت ئەم سەیدە کاری خۆی کرد و

ڕۆیشت. حاجی خانم لە ماوەی ئەو بیست و چەند ساڵەدا، هەرگیز ئەم سەیدەی نەبینی بوو، بەڵام دەیزانی کە حاجی ئاغا بەردەوام خێر بە سەید دەکات و بە بەردەوامی دیاریی دەبات بۆ ماڵی سەید. حاجی ئاغا چەندین جار گوتبووی خێرم کردووە. حاجی خانمیش چەندین جار گوتبووی منیش پێمباشە ئاغا سەید ببینم. حاجی ئاغا گوتبوی باش نییە تۆ ببینێت، پێویست ناکات.

ئێستا لەو کاتەدا و لە کاتی مەراسیمی مارەبڕیندا، حاجی ڕۆیشتبوو ئاغا سەیدی هێنا بوو. ئاغا سەید چوو بووە حەوشە، زۆر نیگەران بوو. نیگەرانی لەوەی کە چەندین ساڵ لەوەبەر منداڵەکەیان لێ دزیوە و ئەم هەستی پێنەکردووە کە لێی دزراوە. بەڵکو وایان نیشانداوە کە منداڵەکەی مردووە. نیگەرانی و شادی باوکێک کە دوو کاتژمێرە زانیویەتی خاوەنی کچێکی بیست و ئەوندە ساڵەیە. کچێک کە ئێستا وا خەریکە شوو دەکات. حاجی ئاغا هاتە حەوشەکەوە و بە ئاغا سەیدی گوت، وا یەڵدا حاڵی باشبووە تۆ من بکە بە وەکیل و خۆت بڕۆ. سەید گوتی تۆ بۆچی کچەکەمت بەم دەردە بردووە؟ تۆ کەسێکی خۆپەرستیت. یەکەم تۆ ئەو منداڵەت لە من دزیوە، پاشان منت بە ئازارەوە نیشانی ئەو داوە، ئێستاش بەم بێڕوورییەتەوە لە بەردەمی خۆمدا خەریکبوو کچەکەم بکوژیت. حاجی ئاغا گوتی ئێستا کاتی ئەم قسانە نییە. ئەگەر پێت باشە و سەلامەتیی کچەکەتت دەوێت، ئەگەر دەتەوێت مارەبڕینی کچەکەت بە ڕێکوپێکی بڕوات، تۆ من بکە بە وەکیل بۆ مارەبڕینەکە و خۆت بڕۆ، پاشان تۆ هەرچییەکت لە من بوێت پێتی دەدەم، پارەیەکی زۆرت بۆ دەنێرم. ئاغا سەید گوتی پارەکانت سەرت بخوات، تۆ بۆچی لەکاتی مارەبڕینی ئەم کچەدا ڕاستییەکەت پێگوت؟ بۆچی زووتر ئەم ڕاستییەت پێنەگوتووە؟ حاجی ئاغا گوتی. ئاغا سەید تۆ پێتخۆشبوو ئەمە ڕوویدات. سەید گوتی بەندەی خودا تۆ ئەمڕۆ هاتوویت بۆ ماڵی ئێمە و گوتت دەمەوێت ڕازێک ئاشکرا بکەم، گوتت بە هاوکاری کارمەندێکی نەخۆشخانە منداڵەکەی منت دزیوە، گوتت کچەکەی من ئێستا تەمەنی بیست و چەند ساڵێکە و دەیەوێت شوو بکات، گوتت ئەو خێر و خێراتەش کە هێناوتە بۆ ڕازیکردنی من و خوشک و براکانی بووە. منیش گوتم دەمەوێت کچەکەم ببینم، هەموو باوکێک سۆزی هەیە و هەر باوکێکیش لەناکاودا بزانێت کچێکی بیست و ئەوەندە ساڵەی هەیە ڕەنگ و ڕووی دەگۆڕێت، هەر باوکێک ئەگەر ببیستێت ئەو کچەی کە نەیبینیوە و وایزانیوە مردووە، بەڵام ئێستا وا خەریکە شوو دەکات، دەیەوێت چاوی پێی بکەوێت. من کەی پێمگوتویت تۆ کتوپڕ ئەم بابەتە لەگەڵ کچەکەمدا باس بکە. تاوانی دزینی منداڵی خەڵک زیاترە یا بەشوودانی کچێک بەبێ مۆڵەتی باوکی. تۆ

ئەم کچەت گەورە کردووە، بەڵام ئێستا ئەم کچەت تووشی نەخۆشی دەروونی کرد. تاوانی شێتبوونی ئەم کچە داماوە لە ئەستۆی کێیە؟ من مۆڵەتی مارەبڕینی کچەکەم دەدەم بە تۆ، بەڵام منیش حەزدەکەم بێم و قسە لەگەڵ کچەکەمدا بکەم و نزای خێری بۆ بکەم. حاجی ئاغا گوتی من بە ناوی چییەوە تۆ ببەمە ژوورەوە بۆلای یەڵدا؟ هەموو خەڵکی پێمدەڵێن ئەم سەیدە بۆکوێ دەبەیت؟ سەید گوتی بڵێ ئاغا سەید دەیەوێت چەند نزایەکی خێر بە گوێی یەڵدادا بخوێنێت.

یەڵدا چاوەکانی کردبوونەوە، بەڵام بنمیچی خانووەکە لەبەرچاوی دەسووڕا، چاوی بەرەشەوە دەهات، دکتۆر دەرزییەکی بەدەمار بۆ کردبوو، یەڵدا بەرەو باشی دەچوو، بەڵام ئیتر لە کۆتر و تاوس نەدەچوو، یەڵدا هەستی دەکرد کە ئیتر فریشتە نییە. ئەو دکتۆر جەلالی موجیبیانی لەبەر چاو بوو، ئەو چەندین جار بۆ چارەسەر سەردانی دکتۆر جەلالی کردبوو، ئێستاش لە نێوان ئەو هەموو خەڵکەی شاردا تەنها دکتۆر جەلالی موجیبیانی دەهاتە بەرچاو. چەندین جار حاجی ئاغا و حاجی خانم چیرۆکی بە دونیا هاتنی یەڵدایان باسکردبوو. باسیان کردبوو کە چۆن سەردانی دکتۆریان کردووە تا دایکی دووگیان بووە و ئەو هاتۆتە دونیاوە! چۆن ئەو دایکە لە نەخۆشخانەکانی تاراندا خەوێنراوە؟ چەندین جار لەلای خەڵکی گوتبوویان دکتۆر جەلال هەڵەی کردووە؟ چونکە دکتۆر جەلال گوتبووی ئەمانە منداڵیا نابێت، بەڵام دکتۆرەکانی تاران چارەسەریان کردووە و خودا منداڵی پێداون. جگە لە حاجی ئاغا و حاجی خانم تەنها دکتۆر جەلال دەیزانی ئەو منداڵە منداڵی خۆیان نییە، تەنها دکتۆر جەلال ئەو نهێنییەی دەزانی، بەڕاستی کارمەندەکەی نەخۆشخانەش دەیزانی کە ئەو کچە منداڵی حاجی ئاغا نییە.

یەڵدا لە بیرکردنەوەدا بوو، وەک بروسکە بەخێرایی بیری دەکردەوە، پرسیاری لە خۆی دەکرد، ئایا پوورەکانی و زاواکانیان و منداڵەکانیان دەزانن کە ئەو کێیە؟ هەموو شتێک بەلایەوە بێ نرخ ببوو. خۆشەویستی و بووکێنی و نازکێشان و خانووە کۆنەکە و چاوقایمی لە یاریکردندا و سواربوونی کۆڵی حاجی ئاغا و ئەمانەی هەموو بە شتی پڕوپووچ دەزانی. ئەو گەشتانەی کە چەند ڕۆژێک بوو بیری لێکردبوونەوە هەمووی وەک یارییەکی منداڵانە دەهاتەوە بەرچاو؟ هەموو شتێکی ڕابردووی بەلاوە گەمژەیی بوو. خۆشی بە کەسێکی گەمژە دەزانی. دەیگوت هەمووان درۆیان لەگەڵدا کردووم، خۆیشم بووکەڵەیەکی یاریکردنی دەستی حاجی ئاغا و حاجی خانم بووم، ئەوان تەنها بوون و بووکەڵەیەکیان هێناوە تاکو بۆ خۆیان یاری پێبکەن، هەندێک کەس سەگ و پشیلە ڕادەگرن بۆ بێزاریی خۆیان، هەندێکی تر منداڵ دەدزن، ئەوەتا ئەمانە لە

نەخۆشخانە منداڵێکیان دزیوە، ئای ئەمانە چ بێشەرەفییەکیان کردووە؟ دیارە حسێنیش هەر درۆی لەگەڵدا کردووم، بە درۆ دەڵێت خۆشمدەوێت، دیارە بۆ ئەویش هەر بووکەڵەی یاریکردنم. ئەی بۆچی لە تەمەنی (٤-٥)ساڵیدا ئەم ڕاستییەیان پێنەگوتووم؟ بۆچی لە هەر کۆڕ و کۆبوونەوەیەکدا زوو زوو باسی چوونی حاجی خانم دەکەن بۆ نەخۆشخانەکانی تاران؟ لە ماوەی چەند خولەکێکدا هەموو شتێک لەبەر چاوی گۆڕدرا، هەموو خۆشەویستیی دایک و خوشک و هاوسەری ئایندەی وەک تیرێکی ژەهراوی بوو لەلای، ئێستا دەبێت چی بکات؟ حاجی خانم دەیگوت یەڵدا گیان، شکور حاڵت باشە، سوپاس بۆ خودا کە باشیت.

هەموو میوانەکان لە پیاو و ژن و گەورە و بچووک چاوەڕوانی یەڵدا بوون کە هەڵبستێت و بچێتە بەردەمی مامۆستا و مارەبڕینەکە ئەنجام بدرێت. هەر لە مامۆستاوە تاکو هەژار و سواڵکەرەکانی بەردەرگاش چاوەڕوانی خێرێک بوون کە بە دەستیان بگات، بەهۆی ئەم زەماوەندەوە. هەمووان زانیبوویان کە بووک بە زەویدا کەوتووە و دەیانزانی کە دەگری، هەر کەسە و لەلای خۆیەوە لێکدانەوەیەکی بۆ دەکرد و جۆرەها تۆمەتیان هەڵدەبەست..

ڤیکتۆر هوگۆ، ئەو نووسەرە کۆمەڵناسە، یا بڵێین ئەو کۆمەڵناسە ئەدیبە، لە ڕۆمانی (بێ نەوایان) دا لە بارەی مسیۆ مۆریل، ئەو کەشیشە مرۆڤدۆستەی کە زیوەکانی خۆی دابوو بە ژانوالژان نووسیویەتی (مسیو مۆریل پێویستە چارەنووسی هەموو ئەوکەسانەی کە لە شارە بچووکەکاندا دەژین قبوڵ بکات). دیارە شارە بچووکاکان شوێنێکە زمانی زۆری تێدایە بۆ قسەکردن و مێشکی کەمی تێدایە بۆ قسە وەرگرتن. میوانەکان جگە لەوە دەبوو بیر لە چی بکەنەوە، جگە لە بورانەوە و گریان و هاتنی سەیدێکی بێگانە، نەک میوانەکان هەموو خەڵکی شاریش زانیبوویان کە شتێکی وا ڕوویداوە، تەنانەت بە هۆی تەلەفۆنەوە هەواڵەکە گەیشتبووە تارانیش. ئەو خەڵکە بەگشتی دەیانویست بەهێواشی ئەم بورانەوە و گریانەی پێش مەڕاسیمی مارەبڕینەکە لێکبدەنەوە. هەندێک کەوتبوونە سەر ئەو باوەڕەی کە بووک چەند مانگێکە دوگیان بووە، هەندێکی تر دەیانگوت بووک جگە لە حسێن عاشقی کەسێکی تر بووە.

باری ئابووریی هەموو خەڵکی بەدرێژایی (٣٠-٤٠) ساڵ گۆڕانکاریی بە سەردا هاتبوو، گۆڕانکاری تەواو لە ژیانیاندا بەدیدەکرا، ئەوانەی لەوێ بوون لە گەنجیدا تەنها سواری ولاخ ببوون، پاشان سواری پایسکیل و ئێستاش سواری ئۆتۆمبێل دەبن، ئەوان کەسانێک بوون کە باشترین خواردنیان چێشتی دۆکەشک بوو، بەڵام ئێستا جگە لە

قبوڵی و برنج هیچیتر ناخۆن، ئەوان کەسانێک بوون پێشتر جلە کۆنەی باوکیان بچووک دەکردەوە و لەبەریاندەکرد، بەڵام ئێستا قوماشی (هێلدی) ئینگلیزییان پێکەمە، کەسانێک بوون کە ساڵی دوو جاریش لە مەڕاسیمەکاندا شەربەتیان دەست نەدەکەوت بیخۆنەوە، کەچی ئێستا، ساڵی سەد کیلۆ پاقلاوەی حاجی خەلیفە لە ماڵیاندا دەخورێت. کەسانێک لە تافی گەنجێتیدا جگە لە کۆڵانەکانی شارەکەی خۆیان شوێنێکی تریان نەبینی بوو، بەڵام ئێستا منداڵەکانیان لە سانفرانسیسکۆ و نیویۆرک وپاریس دەژین. هەموو شتێک گۆڕانکاریی بە سەردا هاتووە، تەنها فەرهەنگی غەیبەتکردن، هێنان و بردنی قسە و تۆمەت هەڵبەستن وەک خۆی ماوەتەوە. فەرهەنگی ماڵیی بەزوویی گۆڕانی بەسەردا دێت، بەڵام فەرهەنگی کولتووریی چەندین ساڵ و چەندین سەدە و بگرە هەزار ساڵیشی دەوێت. دەنگەدەنگ پەیدا بوو، گوتیان بووکە خان حاڵی باشتر بووە، وا دێتە دەرەوە بۆ لای مەلا و مەڕاسیمی مارەبڕینەکە ئەنجامدەدرێت. حسێن دەستی یەڵدای گرتبوو لە شوێنێکدا دایینیشاند و خۆیشی لە تەنیشتییەوە دانیشت، بەڵام یەڵدا ئەوی بە جۆرێکی تر دەبینی، هەستیدەکرد حسێن ئەو کەسەی پێشوو نییە کە خۆشیدەویست، ئەو کەسە نییە کە پێشتر بینیبووی، هەستیدەکرد ئەو کەسانەی لە دەوری کۆبوونەتەوە، هەموو ڕوخساریان گۆڕاوە. وەک ئەوەی لە ئارایشتگایەکدا لەبری جوانکاری ناشیرینکاریان بۆ کرابێت. حاجی خانم بە پێکەنینەوە گوتی شکور بۆ خودا کچە ئاقڵ و جوانەکەم باشبووە. کاتێک ددانەکانی حاجی خانم دەرکەوتن یەڵدا وای هەستدەکرد کە ئەم ژنە دایکی فولادرزەیە نەک ئەو ژنەی کە چەندین ساڵە پێیدەڵێت دایکە و هەر ئێستا پەلاماری دەدات و بە ددانەکانی گاز لە هەموو جەستەی دەگرێت. وای هەستدەکرد ئەو ژنە پەلاماری دەدات و دەمارەکانی بە ددان دەقرتێنێت و تووشی خوێن بەربوونی دەکات. حاجی خانم گوتی یەڵدا گیان کچە خۆشەویستەکەم مامۆستا چاوەڕوانی تۆ دەکات. یەڵدا دەستێکی بە سەرو ڕووی خۆیدا هێنا و دوبارە دەستیکردەوە بە هاوار هاوار و گریان. گریانەکەی بە جۆرێک بوو هیچ کەسێک نەیدەتوانی هێمنی بکاتەوە. دایک و خوشکەکانی حسێن سەریان سوڕمابوو، دەیانگوت یەڵدا دەبێت بۆچی وابکات، ئەم گریانەی لە پای چییە. بۆچی وا هەموو گیانی دەلەرزێت، دەبێت چی ڕوویدابێت و بۆچی وا بکات؟. ژنان لە ناو خۆیاندا کەوتنە چپەچپ و هەر کەسە و لە بەر خۆیەوە قسەیەکی دەکرد. یەکێک دەیگوت بووک کاری بەدڕەوشتی کردووە، یەکێکی تر دەیگوت خیانەتی کردووە، دەیانگوت ئەمە بەهانەیە و نایەوێت مارەبکرێت و پەشیمان بووەتەوە لە شووکردنەکەی..

یەڵدا ئەژنۆکانی لە باوەش گرتبوو دەگریا، دکتۆر کەسێکی ناردبوو تا دەرزی تری بۆ بهێنن. یەڵدا دەگریا، دەلەرزی، بیریشی دەکردەوە دەبێت چی بکات؟ دەبێت بچێت بۆ مارەبڕینەکە، دەبێت ڕاستییەکان بە حسێن و بنەماڵەکەی بڵێت، دەبێت هاوار بکات، کە ئەو کچی ڕاسیتەقینەی حاجی ئاغا و حاجی خانم نییە، دەبێت هەموو لایەک ئەم ڕاستیە بزانن. لەناکاو بە بیریداهات ڕەنگە هەموولایەک ئەم ڕاستییەیان زانیبێت، تەنها خۆم نەمزانی بێت، مێشکی کەمێک هێور بووەوە، بیری لەوە دەکردەوە ئەگەر هەمووان بەم ڕاستیە بزانن دیارە کێشەکە منم، ئەگەر کەسێک نەزانێت من کێم دەبێت چی بکەم؟ کەسێتی خۆی لێگۆڕا بوو، خۆی خستبووە ژێر پرسیارەوە، کەسێتی و چۆنێتی خۆی لێکدەدایەوە، چەند کەسێک لە هاوڕێ و هاوپۆلەکانی کە بانگهێشت کرابوون و لەوێ بوون، ئەوانیش چوونە ژوورەوە بۆ لای یەڵدا، تاکو هێمنی بکەنەوە و بێت بۆلای ماموستا بۆ مارەبڕین..

حاجی خانم، حاجی ئاغای برد بۆ ژوورێکی چۆڵ و لێی پرسی ئایا ئەو سەیدە باوکی یەڵدایە؟ حاجی گوتبووی بەڵێ خۆیەتی. حاجی خانم گوتی تۆ پیاوێکی زۆر گەمژەیت بۆچی لەم ماوە دوور و درێژەدا قسەت نەکردووە و ئێستا لەم کاتەدا کە کاتی مارەبڕینی ئەو کچەیە باسی ئەم کێشەیەی بۆ دەکەیت؟ حاجی گوتی من هەمیشە بارێکی قورسی تاوانم لەسەر شانە، بەدزینی ئەم منداڵە ئیتر توانای ئەو بارە قورسەم نەماوە، ئێستا چۆن بتوانم تاوانێکی تریش بخەمە ئەستۆی خۆم بە مارەبڕینی ئەم کچە؟ من باوکی ئەو نیم تاکو مۆڵەتی مارەبڕین و شووکردنی بدەم. ئاخر ئەم کارە دژی ئایین وشەرعە. حاجی خانم بەسەریدا قیژاندی. حاجی ئاغا گوتی ئێستا دەنگەدەنگ مەکە با ئەو خەڵکە هەموو شتێک نەزانن.

حاجی خانم گوتی با هەموو شتێک بزانن هەموو خزمەکانمان و دراوسێ و ناسیاوەکانمان و بنەماڵەی زاواش ئەگەر ڕاستیەکە بزانن باشترە، ئەگەرنا سەدان قسە و قسەلۆک بەناوی من و تۆ و ئەو کچە داماوەوە بڵاودەبێتەوە. ئاخر حاجی تۆ کەسێکی گەمژە و کاڵفامیت، من تەمەنێک ژیانی کوێرەوەرییم لەگەڵ تۆدا بەسەر بردووە، هەمووکات تۆ بۆ من خەم و خەفەت بوویت، بۆچی لەلای خەڵکی گوتووتە دکتور مەجیبیان دکتۆرێکی نەزان و نەشارەزایە و هەموو ئازمایشەکانی هەڵەبوون، لەکاتێکدا ئەو باشترین و شارەزاترین دکتۆرە لە تەواوی ئێراندا و هەر ئەویش پێشتر هەموو ڕاستییەکانی بە ئێمە گوتووە، یا بۆچی ئەم ڕاستییەت چەند ساڵێک یا چەند مانگێک لەمەوبەر بەم کچە داماوە نەگوتووە و ئێستا و لەم کاتە هەستیارەدا پێی

دەڵێیت، تۆ بەم قسە نەزانانەی خۆت و بەم نەشارەزاییەت لە شەرع و ئایین و بە باسی بەهەشت و دۆزەخ، هەموومان ڕەوانەی دۆزەخ دەکەیت. لانیکەم تۆ خۆت باش دەزانیت من هیچ کەم و کوورپییەکم نەبووە لە ڕووی منداڵبوونەوە، ئەوە تۆیت کە کەموکورپییت هەیە و کێشەی منداڵ نەبوونمان لە تووە بووە نەک لە منەوە، ئەوە تۆیت کە منداڵت نابێت، بەڵام من لەگەڵ تۆدا هەڵمکردووە. بەڵام ئایا ئەگەر کێشەکە لە منەوە بووایە تۆ دەستبەرداری من نەدەبوویت و ژنت بەسەردا نەدەهێنام؟ بۆچی تۆ وا دەزانیت من ئاگاداری کارە خراپەکانت نیم و نازانم لە تاران چیت کردووە و چی دەکەیت؟ من هەموو ئەو شتانەم زانیوە، بەڵام من باسم نەکردووە و بەسەر خۆممدا نەهێناوە و لەڕووم نەداویت، ئەم کچە تەمەنی چوار ساڵ بووە کە چەندین جار پێم گوتویت خودا لێمان قبوڵ ناکات با ڕاستییەکانی پێبڵێین، چونکە هەر دەبێت بیزانێت، بەڵام تۆ دەتگوت پێویست ناکات با نەزانێت، ئەم نهێنییە هەر خۆم و خۆت و کارمەندەکەی نەخۆشخانە دەیزانین، کەچی ساڵێک لەمەوبەر پاقلاوەیەکی زۆرت کڕی و کردت بە خێر و گوتت کارمەندەکەی نەخۆشخانە مردووە و ئیتر ئەم نهێنییە تەنها لای خۆم و خۆتە، باش دەزانیت هەر خۆت بەرنامەی دزینی منداڵەکەت دانا و منیش و خۆشت خستە ژێر باری گوناهەوە.

یەڵدا لە پڕێکدا شتێک بە بیریدا هاتبوو، گوتی من خۆم دەکوژم و خۆم لەم بارە ناهەموارە ڕزگار دەکەم. یەڵدا حسێنی خۆشدەویست، حسێنیش ئەوی خۆشدەویست، ئێستا حسێن ئەگەر بزانێت یەڵدا کچی حاجی ئاغا و حاجی خانم نییە، ئایا هەر خۆشی دەوێت؟ یەڵدا دەیگوت بەڕاست کە من کچی حاجی ئاغا و حاجی خانم نیم، ئایا مامەکانم ڕێگەدەدەن ئەو هەموو سامانە بە من بگات؟ ئایا من مافی ئەوەم هەیە ببمە میراتگری ئەم ژن و پیاوە منداڵ دزە؟ ئایا حسێن منی چەندە خۆشدەوێت؟ ئایا منی زیاتر خۆشدەوێت یا ماڵ و سامانی ئەم ژن و پیاوە کە خۆیان کردووە بە دایک و باوکی من؟ یەڵدا دڵنیا بوو کە حسێن و بنەماڵەکەی لەبەر خاتری خۆی ئەویان خۆشنەدەویست، بەڵکو خۆشەویستییەکە بۆ پارە، میرات، ئۆتۆمبێل، خانوو، دوکان و تێکڕای سامانی حاجی بووە. کاتێک ناسنامەکەی ئاشکرا ببێت و حسێن بزانێت ئەو کێیە و کچی کێیە؟ دەبێت حسێن هەڵوێستی چۆن بێت. لە پڕێکدا دڵی بە حاڵی حسێن سووتا. دووبارە بیری کردەوە نابێت بە هیچ جۆرێک دڵم پێی بسووتێت، چونکە ئەویش هەر وەک حاجی وایە، ئەویش گەندەکار و گەندەڵ و منداڵ دزە. دووبارە بیری کردەوە و گوتی نا، نا ئەو کوڕێکی باشە لە بەر خاتری خۆی منی خۆشدەوێت، لە بەرخاتری ماڵ و سامان

نییە، بەڵام ئەگەر لە بەر ماڵ و سامان نییە بۆچی لەگەڵ ئەو کچەدا زەماوەندی نەکرد، کە خۆشیدەویست و ساڵێک لە زانکۆ لە دوای ئێمەوە بوو؟ ڕاستییەکەی ئەو کچە لە من شۆخوشەنگتر بوو. ئەوە یەکەمین جار بوو کە یەڵدا دان بەوەدا بنێت کەسێک لەو شۆخوشەنگترە. حسێن (٤-٥) مانگ دەبوو پەیوەندی لەگەڵ ئەو کچەدا دروستکرد بوو، کاتێک چوو بوو بۆ ماڵیان و سەیری کردبوو باوکی ئەو کچە کارمەندێکی ئاساییە و ماڵێکی بچکۆلانەیان هەیە و ئۆتۆمبێلیشیان نییە، سەیری کردبوو مەعسومە بۆ تەواوکردنی زانکۆ ناچارە هاوکاری دایکی بکات بۆ کاری بەرگدروویی، بەڵام کاتێک لە حسێنم پرسی بۆچی وازت لە مەعسومە هێنا؟ ئەو لە وەڵامدا گوتی ڕەوشت و خووی باش نەبوو، کەسێکی توند بوو لەگەڵ مندا نە دەگونجا. یەڵدا خانم قسە و دەنگەدەنگی دەوروبەری بۆ لە یەکتری جیا نەدەکرایەو،ە ئەوانەی لە ژوورەوە لە لای بوون هەر یەکە و لەبەر خۆیەوە قسەیان دەکرد، بەڵام ئەو لە قسەی کەس تێنەدەگەیشت، تەنها دەنگەکە بە گوێیدا پێچی دەخوارد و ئەویش لە یەک وشە تێنەدەگەیشت. هەستیدەکرد یەکێک شانەکانی دەجوڵێنێت و دەڵێت یەڵدا گیان.. یەڵدا گیان کات وا بوو بە هەشتی شەو، مامۆستا دەیەوێت بڕوات، تکایە هەڵسە با بڕۆین بۆ لای ماموستا تاکو مارەبڕینەکە ئەنجام بدەین. یەڵدا چاوەکانی کردەوە و سەیریکرد ژوورەکە پڕبووە لە دوکەڵ، زوهرە خانم خەریکی سووتاندنی ئەسپەند بوو، بەدەوری یەڵدادا دەسوڕایەوە و دەیگوت چاوی حەسوود کوێر بێت، نەفرەت لە خەڵکانی بەد، ئادەی پارچە قوماشێک بهێنن با چاوەزارێکی بۆ بگرمەوە، بە خێرایی هێلکەیەک بهێنن وبا لە سەر سەری بیشکێنم و بزانم کێ بە چاویەوە کردووە؟ پیاوانی میوان پرتەوبۆڵەیان بوو، قسە و گفتوگۆیان تەواو ببوو، لە کاتژمێر پێنجی دوا نیوەڕۆوە دانیشتبوون، قسەیەک نەما بوو تا بیکەن. لەناو خۆیاندا لە یەکتریان دەپرسی بۆچی بووکێ نایات بۆ لای مەلا و مارەبڕین تەواو ببێت.

هێشتا سەید لە ناوەڕاستی حەوشەکە وەستابوو، دوو کاتژمێر زیاتر دەبوو هیچ جووڵەیەکی نەکرد بوو. هیچ کەسێک ئەوی نەدەناسی، هەندێک لە میوانەکان ئەویان لە ناوشاردا بینیبوو، بەڵام ئەویان بە ناو و ناونیشان نەدەناسی، نەیاندەزانی بۆچی ئەو سەیدە لەوێ وەستاوە. هەندێک دەیانگوت کاتێک کە بووک بوراوەتەوە، ئەم سەیدە لەگەڵ حاجیدا لە ژوورەوە بووە. بۆچی ئەم سەیدە لە ژوورەوە بووە؟ باسی هاتنی سەید وردە وردە لە ناو ژناندا بڵاوبۆوە، چەندین لێکدانەوەی نەشیاویان بۆ دەکرد. لەولاوە ژنێک کە گوێی لەو قسانە بوو، چووە ناو ژنەکانەوە و گوتی ئێمە کەسانێکی

سەیرین، هاتووین لەسەر فەرشی خەڵکی دانیشووین و شەربەت و شیرینی ئەوان دەخۆین و لە هەمانکاتدا ئەفسانە بۆ خۆیان و کچەکەیان دروستدەکەین. ئاخر غەیبەت و تۆمەت هەڵبەستن کارێکی باش نییە. ژنێکی تر لەولاوە هەڵسایە سەر پێ و ڕووی لەم ژنە کرد و گوتی کێ غەیبەتی کردووە؟ کێ تۆمەت و بوختان هەڵدەبەستێت؟ خەڵک ئەقڵی هەیە، خەڵک بیردەکاتەوە، بووک نیو کاتژمێر پێش کاتی دیاریکراوی مارەبڕین لەگەڵ باوکی و پیاوێکی سەیددا چووە ژوورەوە. پاشان بووک بوورایەوە و بە زەویدا کەوت، ئێستاش کە ئامادەنییە بێت بۆ مارەبڕین، وەک مردوو، وەک نیوە شێت، پاڵی بە دیوارەوە داوە و قسەی کەس نابیسێت. باشە خۆ هیچ کەسێک قسەیەکی خراپی نەکردووە، تەنها ئێمە گوتومانە کچەکەیان دیارە نەخۆشییەکی هەیە کە وای لێهاتووە. کە دەڵێن سەری بە قاچی کورسییەکە، کەوتووە ئەوە بەهانەیە. ئەو کچە یا بوورانەوەی لەگەڵدایە یا فێی لێدێت، یا نەخۆشی دەروونیی هەیە.. ئیتر قسە و ورتە ورت لە ناو ژناندا دەستیپێکرد. حاجی ئاغا بە دکتۆری گوت، دکتۆری بەڕێز دەستم بە دامانت کارێک بکە لەبەردەمی ئەو هەموو خەڵکە ئابڕووم نەچێت. حاجی خانم ڕووی کردە حاجی و گوتی دکتۆر دەبێت کارێک بۆ تۆی گەمژە بکات، ئێستا کاتی ئەوە بوو بەم کچە بڵێیت تۆ منداڵی ئێمە نیت؟ حاجی ئاغا گوتی، خانم تۆ حاجیت. تۆ چوویتە مەککە وماڵی خودات بینیوە، تۆ پێنج فەرزە نوێژ دەکەیت، تۆ شارەزاییت لە شەرع و ئاییندا هەیە، چۆن ڕێگەدەدەیت کچێک کە من باوکی ئەو نیم، بڕۆم ببمە وەکیلی مارەبڕینی، ئاخر ئەوە منداڵەکانی حەرامزادە دەردەچن، تاکو حەوت پشت تۆشی کێشەی شەرعی دەبین و گوناهەکەی دەچێتە ملی من. دەبێت بەم هەموو نوێژ و خوداپەرستییەوە بچمە دۆزەخ. من نامەوێت بچمە دۆزەخ.

حاجی خانم گوتی هەر ئەوەیە کە من دەیڵێم. تۆ پیاوێکی گەمژەیت بۆچی چوار مانگ لەمەو بەر ئەم باسەت لا نەکردووە؟ بۆچی دە ساڵ یا پێنج ساڵ پێش ئێستا پێتنەگوتووە؟ ئێستا لەم کاتی مارەبڕینەدا هاتوویت پێیدەڵێیت کە تۆ کچی ئێمە نیت. حاجی خانم لە پەنجەرەکەوە سەیری دەرەوەی کرد و گوتی ئەوە ئاغا سەید دوو کاتژمێر دەبێت لە حەوشەکەدا بەبێدەنگ وەستاوە، ئەویش لە داخی تۆ مات و مەلول بووە، هەڵسە برۆ قسەی لەگەڵدا بکە بەڵکو ئەو ڕێگا چارەیەک بدۆزێتەوە. حاجی ئاغا گوتی سەید خۆی پێیگوتوم کە دەیەوێت چەند قسەیەک لەگەڵ یەڵدا بکات. حاجی خانم گوتی ژوورەکە چۆڵ دەکەم و بابێت قسەی لەگەڵدا بکات. حاجی ئاغا گوتی ئەی چی بەو خەڵکە بڵێم؟ حاجی خانم گوتی من خۆم دەڵێم با ئاغا سەید بێت هەندێک نزا لەسەر

یەڵدا بخوێنێت. سەید پێشتریش هاتبوو نزا بکات، بەڵام پێشئەوەی ئەو نزاکانی بکات یەڵدا بەزەویدا کەوتبوو. بۆیە ئێستا پێویستە بێت و نزای بۆ بکاتەوە.

هێشتا حاجی ئاغا نەچووبووە دەرەوە بە شوێن سەیددا. باوکی زاوا چووە بەردەمی حاجی و گوتی دەمەوێت چەند قسەیەکت لەگەڵدا بکەم، حاجی ئاغا گوتی بفەرموو. باوکی زاوا گوتی وا هەستدەکەم کە یەڵدا خانم کێشەیەکی هەبێت وەک کێشەی نەخۆشی دەروونیی و بوورانەوە، بەڵام ئێوە بە ئێمەتان نەگوتووە. حاجی ئاغا گوتی دۆستی خۆشەویستم سوێند بە خودا و بە پێغەمبەر کچەکەمان هیچ نەخۆشییەکی نییە، ئەوە دکتۆر لێرەیە و برۆ لەو بپرسە. حاجی محەمەد (باوکی حسێن ئاغا) گوتی باشە ئەو بەزەویدا کەوتنە، ئەم بوورانەوە و هاتوچۆیەی بۆچییە؟ ئەوەتا هەرچییەکی پێدەڵێن ئەو تێناگات و هۆش و بیری لە شوێنێکی ترە. لە ژێر لێوەوە قسە دەکات و دەڵێت من کێم و من چیم؟ حاجی ئاغا گوتی من بەڕاستی پێتدەڵێم یەڵدا هیچ کێشەیەکی نییە. حاجی محەمەد بەبێ ئەملاولا گوتی بەڕاستی ئێمە هەزار لیرەی بۆ ناکەین بەمارەیی. حاجی ئاغا گوتی ئێمە لەسەر هەزار لیرە ڕێکەوتوین و لەسەر کاغەزیش نووسراوە. حاجی محەمەد گوتی ئێمە هەزار لیرە ناکەین بە مارەیی، لەسێ سەد لیرە زیاتر نادەین ئەگەر قبوڵی ناکەن ئەوا بەزوویی دەڕۆین، ئەویش بەو مەرجە تا نیو کاتژمێری تر مارەبڕینەکە کۆتایی پێبێت، ئەم خەڵکە هەموو برسین و تا ئێستا نانی ئێوارەیان نەخواردووە. هەمووان کاریان هەیە و دەیانەوێت بەزوویی بڕۆن ناتوانن تاکو بەیانی لێرە دابنیشن. حاجی ئاغا گوتی ئەی حسێن چی دەڵێت؟ حاجی محەمەد گوتی، حسێن هیچ قسەیەکی نییە، کەسێک کە خۆی پارەی نەبێت هیچ قسەیەکیشی نییە. حاجی ئاغا گوتی، بەڵام من بە یەڵدام گوتووە هەزار لیرە. حاجی محەمەد گوتی تا نیو کاتژمێری تر ئەگەر لەسەر سێ سەد لیرە مارەی دەکەن باشە ئەگەرنا کچی خۆتان بۆ خۆتان و ئێمە دەڕۆین.

حاجی ئاغا پیاوێکی بازاڕی و لەسەرخۆ بوو، گوتی حاجی محەمەد من و تۆ دۆستی یەکترین، چەندین ساڵە یەکتری دەناسین دەمانەوێت ببین بەخزم و کەسی یەکتری، کەچی تۆ بە یەکجار مارەییت یەک بەسێ زیاتریش کەمکردۆتەوە. حاجی محەمەد گوتی حاجی ڕاستگۆیی شتێکی باشە، کاسە زێڕەکەت نیو کاسەیە. ئەم سەیدە کێیە؟ بۆچی ئەو بە تەنها لەگەڵ تۆ و یەڵدا لە ژوورەوە بوو؟ حاجی گوتی ڕاستییەکەی ئەوەیە ئەو ژنەی من باوەڕی بە نزا خوێندن هەیە، گوتویەتی دەبێت ئەم سەیدە نزا بەسەر کچەکەماندا بخوێنێت، ئێستاش دەڵێت چونکە سەید نزای نەکرد بۆیە ئەم کێشەیە

ڕوویدا، ئێستاش پێیگوتوم کە بچم بە دوای سەیددا تاکو بێت و نزا بکات بۆ یەڵدا. حاجی محەمەد گوتی نزاکردن بۆ کەسێکی نەخۆش. حاجی ڕەزا گوتی قەیدی نییە با مارەییەکەی ببێتە (٧٠٠) لیرە. حاجی محەمەد گوتی نەخێر هەر (٣٠٠) لیرە. پاشان هەردوولا لەسەر (٤٠٠) لیرە ڕێکەوتن. ئینجا حاجی ڕەزا ڕۆیی بەرەو حەوشەکەو چوو بۆ لای ئاغا سەید.

ئاغا سەید گوتی حاجی ڕەزا تۆ کارێکت بەسەر مندا هێناوە کەمەرت شکاندوم، تۆ چۆن ئەم کارەت لەگەڵ مندا کرد؟ بۆچی منداڵەکەی منت دزیوە؟ بۆچی خێرت پێدەکردم و دیاریت بۆ دەهێنام؟ ئێستا پێم بڵێ یەڵدا چۆنە؟ حاجی ڕەزا گوتی، ئێستا باش نییە، بەڵام تۆ ویستت یەڵدا ببینیت، سەید گوتی بەڵێ دەمەوێت کچەکەم ببینم، دەمەوێت زاوا ببینم و بنەماڵەکەیان بناسم.

پاشان سەید هاتە ژوورەوە، یەڵدا نەیدەتوانی کۆنترۆڵی خۆی بکات، وەک ئەوەی کەوتبێتە چاڵێکی قوڵەوە. سەید ڕووی کردە یەڵدا و گوتی کچی شیرینم من سەید مورتەزام، باوکی ڕاستەقینەی تۆ، تکایە بە جوانی کەمێک گوێ بۆ قسەکانم بگرە، کچەکەم تۆ تەنها نیت، تۆ بێکەس نیت، هەست بە تەنهایی و بێکەسی مەکە، من سەیدم و باوکی تۆم، تۆش سەیدیت، دایکیشت هەر سەید بووە، باپیرە گەورەشت هەر سەید بووە و ئێمە هەمووومان لە نەوی پێغەمبەرین.کچەکەم تۆ لە ئەمڕۆوە خاوەن خزم و کەسێکی زۆریت، باش بزانە من تۆم لە سەر ڕێگا فڕێنەداوە، تۆم بەکەس نەبەخشیوە، بەڵکو تۆیان لە من دزیووە و بەمنیان گوتبوو کە منداڵەکەم و ژنەکەشم مردوون. منیش خەمێکی زۆرم خوارد منداڵێکی مردوویان دایە دەستم، منیش ژن و منداڵەکەم بەخاک سپارد، بەڵام ئێستا زۆر خۆشحاڵم، چونکە کتوپڕ بوومە خاوەنی کچێکی گەورەی وەک تۆ، ئێستا تۆ سێ برا و دوو خوشکی ترت هەیە. یەڵدا چاوەکانی کردەوە و سەیرێکی سەیدی کرد و گوتی. لانیکەم تۆ کەسێکی ڕاستگۆی؟ بەڕاست تۆ باوکی ڕاستەقینەی منیت یاخود ئەمە فێڵە؟ بەڕاست من چەند خوشک و برام هەیە؟ سەید گوتی، کچەکەم من باوکی ڕاستەقینەتم، تۆ لە نەوەی پێغەمبەریت. تۆ خوشک و برات هەیە. یەڵدا بەو وتانە خۆشحاڵ بوو، لە جێگای خۆی هەڵساو لەسەر کورسییەکە دانیشت. لە سەیدی پرسی ئێستا من دەبێت چی بکەم؟ سەید گوتی من هەر چییەکم پێگوتیت تۆ ئەوە بکە. گوتی بەسەرچاو باوکە گیان.

کاتژمێر نزیکی نۆ ی شەو بوو. سەید گوتی: یەڵدا گیان هەڵسە بڕۆ بۆ شوێنی مارەبڕین و بڵێ بەڵێ و زەماوەندەکە بکە، من ڕازیم و بە حاجی ڕەزاشم گوتووە. وا

منیش جارێ لیرە دەمێنمەوە. سەید دەرگای ژوورەکەی کردەوە و حاجی ڕەزا و حاجی خانم لەو دیو دەرگاکەوە لەچاوەڕوانیدا بوون. حاجی ڕەزا گوتی چی بوو؟ سەید گوتی یەڵدا ئامادەیە بۆ مارەبڕین. یەڵدا چووە شوێنی مارەبڕین و دانیشت. مەلا گوتی یەڵدا خانم تۆ ڕازیت لەسەر بڕی چوار سەد لیرە مارەت ببڕم لە حسێن ئاغا.. یەڵدا دووبارە سەری لە گێژەوە هاتەوە و گوتی ئێمە لەسەر هەزار لیرە ڕێککەوتبووین، بۆچی بووە بە (٤٠٠) لیرە؟ دیارە لەبەر ئەوەیە کە حسێن و بنەماڵەکەی زانیوویانە من کچی حاجی ڕەزا نیم. ئەمە چ عیشقێک و چ خۆشەویستییەکە؟ کاتێک زانیتان من کچی کێم (٦٠٠) لیرەتان لە مارەییەکەم کەمکردەوە. ئەو کەسانەی لەوێ ئامادەبوون، هەموویان دەیانزانی لەسەر هەزار لیرە ڕێککەوتوون، بەڵام ئێستا بۆچی بووە بە (٤٠٠) لیرە. دیارە بووکە خان نەنگییەکی هەیە، هەمووان دەیانگوت بینیتان کاسە زێڕەکە نیوکاسە بوو. سەید لە دوورەوە خۆی گەیاندە بووکە خان و پێیگوت، کچەکەم هیچ نیگەران مەبە و بڵێ بەڵێ ڕازیم. بووک هەڵسایە سەرپێ و گوتی بەڵێ ڕازیم لەسەر (٤٠٠) لیرە مارە بکرێم. زاواش هەڵسا و بووکی ماچکرد، بووک لە ئاوێنەکەدا ڕووخساری زاوای بینی، کەمێک لە زاوا پەستبوو دەیگوت ئەو بە کەمکردنەوی مارەیی منی سووک کرد. ئەوەی وەبیرهاتەوە کە سەید پێیگوتبوو تۆ سەیدیت و لە نەوەی پێغەمبەریت، بۆیە خۆی توندکردەوە و بەسەر هەڵچوونەکانی خۆیدا زاڵبوو. ئەو حەزی دەکرد چاوی بە خوشک و براکانی بکەوێت بۆیە بەملاولادا دەیڕوانی و چاوی بۆ سەید دەگێڕا.

حاجی خانم لێی نزیکبووەوە و گوتی، بە دوای کەسێکدا دەگەڕێیت؟ یەڵدا گوتی بە دوای باوکی خۆمدا دەگەڕێم. حسێن گوێی لەم قسەیە بوو. باوکی خۆت.. باوکی خۆت کێیە؟ یەڵدا بەبێ ئەوەی ڕابمێنێت گوتی باوکی خۆم، باوکی خۆم هەمان ئەو سەیدەیە کە لیرە چاوت پێیکەوت. من کچی ئەوم نەک کچی حاجی ڕەزا. بە بیستنی ئەم قسەیە حسێن ڕەنگی سپی هەڵگەڕا، گوتی واتە تۆ بەڕاستی کچی حاجی ڕەزا نیت؟ یەڵدا گوتی نەخێر من کچی ئەو سەیدەم کە تۆ لیرە چاوت پێیکەوت. حسێن ئەم هەواڵەی بە باوکی گوت. باوکی حسێن چووە لای مەلا و گوتی کاری مارەبڕین تەواو بووە، واتە ئەوان ئێستا هاوسەری یەکترین. مەلا چەند مەترێک دوور بوو لە بووکەوە و لەسەر کورسییەک دانیشتبوو. گوتی بەڵێ ئێستا ئەوان هاوسەری یەکترین.

یەڵدا و حسێن زەماوەندیان کرد، بەڵام بەردەوام لەکێشەدا بوون. حسێن تێگەیشت کە حاجی ڕەزا هەموو موڵک و سامانەکەی خۆی نادات بە یەڵدا، ئەو تێگەیشت کە حاجی ڕەزا بەشێک لە سامانەکەی دەدات بە خوشک و خوشکەزاکانی، هەروەها بەشێکیشی

دەکات بە خێر. هەروەها حاجی خانمیش سامانەکەی خۆی هەمووی نادات بە یەڵدا.

حسێن هەمیشە توڕە و توند دەردەکەوت، ئەو عیشقەی لەنێوانیاندا هەبوو عیشق نەبوو، بەڵکو عیشقی سامان و پارە بوو. یەڵدا ئەوەشی بۆدەرکەوت کە حسێن لەگەڵ کەسێکی تردا پەیوەندی هەیە. لە کۆتاییدا پاش دوو ساڵ لە زەماوەند، یەڵدا حسێنی لەمارەیی بەخشی و خۆی لەدەستی حسێن و بنەماڵەکەی ڕزگارکرد.

یەڵدا دوای جیابوونەوەی لە حسێن، لەگەڵ پیاوێکی تردا زەماوەندی کرد. پیاوێک کە خۆی خۆشیدەویست نەک لەبەر سامان و پارەکەی. ئەم داستانەی کە من ئێستا (١٣٩١-٢٠١٢) بۆتانی دەنووسم بیستوشەش ساڵە ڕوویداوە. ئێستا یەڵدا دوو منداڵی هەیە، لەگەڵ هاوسەرەکەیدا زۆر یەکتریان خۆشدەوێت و بەیەکەوە دەژین. حاجی ڕەزاش دڵنیایە لەو دنیا دەچێتە بەهەشت.. حاجی ڕەزا لە کاتی مەڕاسیمی مارەبڕیندا هیچ تاوانێکی نەکرد بوو، ئەو دەیویست ڕازیبوونی باوکی یەڵدا بەدەستبهێنێت و هەندێک لە سەروەت و سامانەکەشی بەخشی بوو بە یەڵدا، بەڵام هێشتا خۆی بە ئازاد نەدەزانی، چونکە ئەو منداڵەی دزی بوو، هەر بۆیەش هەمیشە بەشوێن سەیدەوە بوو، تاکو ڕەزامەندیی ئەو بەدەستبهێنێت، حاجی وای بیردەکردەوە کە دەتوانێت بە پارە سەید ڕازی بکات.

سەیدیش پێیگوتبوو حاجی هەندێک شت هەیە بەپارە ناکڕدرێن، وەک دڵی من و بەهەشت، ئەم کارەش کە ئێستا کردم لەبەر خاتری خۆشبەختی کچەکەم بوو، نەک لە بەرخاتری تۆ، من هەمیشە نزای خێر بۆ کچەکەم دەکەم، بەڵام من و تۆ حسابی خۆمان لەسەر پردی سیڕات دەکەین. حاجی ئێستاش وا بیر دەکاتەوە کە بەخێر و سەدەقە دەتوانێت پردی سیڕات پانتر بکات تاکو بە ئاسانی پێیدا بپەڕێتەوە، بەڵام ئایا ئەو دەتوانێت پردی سیڕات پانتر بکات، دیارە ئەوەش خودای گەورە خۆی دەیزانێت.

## مسگەرە گەڕۆکەکان

مانگی (ئەسفەندی ١٣٨٩- مارسی٢٠١٠) بوو، بۆ سەردانی دایکم چوومەوە بۆ یەزد، وەک هەمیشە بۆ بیرهاتنەوەی یادەوەرییەکانم، سەردانی کۆڵان و گەڕەکەکانی یەزدم کرد، گەیشتمە نێو بازاڕی مسگەرەکان. سەیرم کرد وا ئەکبەر ئاغای تەوەجوهی، لەسەر کورسییەک لە بەر دوکانەکەی خۆیدا دانیشتووە. دوکانێک کە سەردەمێک تەقەتەقی چەکوشکاری تێیدا مێشکی مرۆڤی دەبرد، سەردەمێک لەو دوکانەدا ڕۆژانە

زیاتر لە (٤٠ مەن =٢٤٠ کیلۆ) مس دەکرا بە مەنجەڵ، بەڵام ئێستا ئەکبەر ئاغا وەک شێری پیر بەسەر و ڕیشی سپییەوە لەسەر کورسییەک دانیشتووە، بێ هاوکار و بێ شاگرد، چاوەڕوانی ئەوە بوو کڕیارێک ڕووبکاتە دوکانەکەی تاکو قابلەمەیەک یا مەنجەڵێکی لێبکڕێت. بینیم ئەکبەر ئاغا، خۆی چیتر کەلوپەلی مس دروست ناکات، بەڵکو لە کارگەکانی ئەسفەهانەوە دەیانهێنێت. لانیکەم دە ساڵ دەبوو من ئەوم نەبینیبوو، وام هەستکرد ئەو من ناناسێتەوە، جا کەواتە بۆچی سڵاوی لێبکەم؟ بە بەردەمی دوکانەکەیدا تێپەڕیم، لەناکاو بانگی کردم و گوتی سڵاو لە کاکە حسێن ئەوە چییە؟ دەڵێی نامانناسیتەوە. منیش بەشەرمێکەوە گەڕامەوە و چاکوچۆنییەکی گەرمم لەگەڵدا کرد و لە هەواڵی محەمەدی برا بچووکیم پرسی کە هاوتەمەنی خۆم بوو. پاشان لێم پرسی، ئێستا کار و کاسبی چۆنە؟ ئەویش گوتی بۆ نابینی بازاڕ چۆنە؟ ئەوەتا زۆربەی دوکانەکان داخراون، چوار لە دوکانەکان قاپ و مەنجەڵ دەفرۆشن و چەند دوکانێکیش وردەواڵە دەفرۆشن، نزیکەی پەنجا دوکانیش بە یەکجاری داخراون، چەند دوکانێکیش یان خاوەنەکانیان مردوون یان پیشەکەیان گۆڕیوە بە ئیشێکی تر وەکو خاڵت.

پاشان، ئەکبەر ئاغا گوتی هەرگیز وەک ئێستا بازاڕم وا بە چۆڵی نەدیوە.. ماوەیەک لەلای دانیشتم و یادی بیرەوەریی کۆنی ئەوڕۆژگارەمان دەکردەوە کە لەم گوزەرەدا دەنگی چەکوشکاری گوێی پیاوی کەڕ دەکرد، یادی ڕۆژگارێکمان دەکردەوە کە بازاڕی مسگەرەکان بازاڕی بەرهەمهێن بوون، دۆستانی وەکو خودا لێخۆشبوو وەستا غەزنەفەر و ئادابییەکان و قەلەنگەرەکان و یادی وەستا قاسم کە مێردی کچە پوورێکی من بوو، یادی حاجی حەسەنی ئیسنا عەشەر و زۆر کەسی ترمان کردەوە. بەم هەموو یادەوەرییانەوە هەڵسام بڕۆم، لەوکاتەدا مسگەرێکی پیر هات لەبەر چاوم ئاشنا دیار بوو. ئەکبەر ئاغا منی پێناساند، بەڵام ئەوی بە من نەناساند. وای دەزانی کە من ئەو دەناسم، ئەم پیاوە لە ئەکبەر ئاغا بە تەمەنتر بوو، کار و کاسبی تەواو شەکەت و بێ تاقەتیان کردبوو، پشتی کۆم ببوو، سەروڕیشی بە تەواوی سپی ببوو، مسگەرە پیرەکە گوتی حسێن ئێستا کە تۆ بیرەوەریی دەنووسیتەوە، یادێک لە هاوڕێ مسگەرە کۆنەکانیش بکەرەوە، یادێک لەم بازاڕەش بکەرەوە کە سەردەمێک جمەی دەهات و ئێستاش ئەوها چۆڵە و دوکانەکان هەموو داخراون، یادی وەستاکەی خۆشت وەستا حەسەنی ئیسنا عەشەریش بکەرەوە. ئنجا بیرم هاتەوە کەساڵێکیان هاوینەکەی من شاگرد مسگەر بوم لەلای ئەم وەستا حەسەنە. خاڵیشم لە تەمەنی (٧-٨) ساڵییەوە شاگرد مسگەر بووە لەلای مسگەرێک، من لەیادم نییە، بەڵام ئەو خۆی دەیگوت هەمیشە

لە لای وەستا حەسەن لێدانی خواردووە و هەرچۆنێک کاری بکردایە لێدانی هەر هەبووە، لە سەرەتادا چەند ساڵێک بەبێ پارە کاری بۆکردووە و دەبوو ڕۆژی چەند جارێکیش بە (٥٠-٦٠) پلیکانەدا بچێتە خوارەوە بۆ ئاوهێنان، ناو دوکانەکەشیان پێ خاوێن دەکردەوە، ڕۆژانەکەشی تەنها لێدان بووە. ئێستاش کاتێک لەگەڵ خاڵمدا قسە دەکەم، یەکسەر پەنجەکانی دەستیم پیشان دەدات و دەڵێت وەستاکەم پەنجەی شکاندوم و کردویەتیە نێوان دەرگا و چوار چێوەی دەرگاکەوە و فشاری خستۆتەسەر تا پەنجەی شکاندوم.

خاڵم بە باوکی کە باپیرەی منیشە، گوتبوو وەستاکەی پەنجەی شکاندووە، باپیرەشم گوتبووی داری دەستی وەستا هاوکاری باوکە. پاشان باپیرەم پێی گوتبوو داخۆ چ کارێکت کردووە بۆیە وەستاکەت پەنجەی شکاندویت. ئەو خاڵە داماوە تەمەن دە ساڵە بێ پشتوپەنایە بە پەنجەی شکاوەوە ڕۆژانی دواتریش هەرچوو بووەوە بۆ سەر کارەکەی بۆ لای ئەو وەستا ستەمکارە. پاش هەشت ساڵ کارکردن ئیتر وازی هێنا و چووە لای وەستا حەسەنی ئیسنا عەشەر، هەژدە ساڵیش لەلای ئەو شاگرد بووە. لە ماوەی ئەو هەژدە ساڵەدا وەستا حەسەن تەنها جارێکیش لێی توڕە نەبووە و لێی نەداوە. وەستا حەسەن جواننووسیش بوو. خەڵکی تەشت و مەنجەڵی گەورەیان دەکڕی بۆ چێشتلێنان و شەربەتگرتنەوەی ڕۆژی عاشورا، ئەویش بە خەتێکی جوان لە سەری دەنووسین. من تەمەنم پانزە ساڵ بوو کە چووم بۆ دوکانی وەستا حەسەن و بووم بەشاگردی. دوکانەکەی وەستا حەسەن لە بازاڕی مسگەرەکان نەبوو، بەڵکو لە مەیدانی میرچەقماق بوو، لە نزیک دوکانی حاجی خەلیفەی ڕەهبەر. چەند دوکانێکی تری مسگەرییش لە دەرەوەی بازاڕی مسگەرەکان هەبوون. خاڵم لە دوکانی وەستا حەسەن تەشت و مەنجەڵی دروست دەکرد. مەنجەڵی گەورە بۆ چێشتلێنان و تەشتی گەورە بۆ ئاوتێکردن. وەستا حەسەن خۆیشی لەسەر تەشت و مەنجەڵەکان نووسینی هەڵدەکۆڵی، نووسینەکان زیاتر هۆنراوە بوون بۆ گیانی ئیمام حسێن و دەشتی کەربەلا. منیش چەکوشەکانم دەهێنا و دەبرد، بەردەستییەکی تەواوم دەکردن، کارکردنی من لەو هاوینە گەرمەدا بە بێ پارە و بێ کرێ بوو. بەیانیان زوو دەچووم بۆ دوکان تا ئێوارە درەنگ لەوێ دەمامەوە، نیوەڕوانیش لەگەڵ خاڵمدا هەر لەوێ پارووە نانێکمان دەخوارد.

لە دوکانێکی گەرمدا کە پلەی گەرمییەکەی لە چل پلە کەمتر نەبوو، بەبێ موبەریدە و بەبێ پانکە، دوکانەکە ژێر زەمین نەبوو، بەڵکو نهۆمی سەرەوە بوو بە درێژایی ڕۆژ ڕاستەوخۆ هەتاو لێدەدا. کاڵەک و شووتی و ئاوی سارد نەبوو تا بیخۆین. ئێستا

بیری لێدەکەمەوە کە ئێمە چ توانایەکمان هەبووە. ئێستا (١٣٩١-٢٠١٢)، کاتێک لەسەر کارەکەم دەگەڕێمەوە بۆ ماڵەوە، یەکڕاست دەڕۆم دەرگای بەفرگرەکە دەکەمەوە و شتێک دەخۆم، لە ماڵەوەش لەبەر هەوای فێنککەرەوە دادەنیشم و هێشتا هەر هەست بە تینوێتی و گەرما دەکەم.

نازانم کاتی منداڵیم، هاوینان چۆن بەبێ میوە و بێ ئاوی سارد و بێ پانکە و فێنککەرەوە ژیاوین. سوپاس بۆ خودا ئەوکاتە ئێواران دوکانەکان دادەخران و هەمووان دەڕۆیشتنەوە بۆ ماڵەوە، خۆ ئەگەر وەک ئێستا دوکان تا بەرەبەیان کراوە بووایە، دیار نەبوو کەی دەڕۆیشتینەوە بۆ ماڵەوە. ئێستاش زۆرێک لە شاگرد دوکانەکان هەر بەهەمان شێوە کاردەکەن، بەڵام ئێستا ئاوی سارد و جۆرەها ساردەمەنی هەیە. بیرمە هاوینێک خاڵم بۆ دوورکەوتنەوە لە گەرمای تاقەت پڕوکێنی یەزد و کڕین و فرۆشتنی مس، منیشی برد و چوو بۆ نێو کۆچەرییە قەشقاییەکان. ئەو جارە منیش لەگەڵیدا ڕۆیشتم، هەربۆیەش برا مسگەرەکان منیشیان وەک ئەندامێکی چینی مسگەران ئەژمار کرد. هەڵبەت ئەم ئەندامبوونە شانازییەکی گەورەیە بۆ من، هەر چەندە من تەنها ناوی نزیکەی دوانزە جۆر چەکوش دێتەوە یادم، لەگەڵ چەند یادەوەرییەکدا و هیچی تر. خۆم منداڵی گەڕەکی پشتی باخم، زۆربەی مسگەر و شاگرد مسگەرەکانیش خەڵکی هەمان گەڕەک بوون. خۆ ئەگەر باسی ژیانی کاری مسگەری بۆ ئێوە بنووسم ئەوا گریانتان دێت بۆیان، بەڵام دڵم نایات ئێوە بخەمە گریان.

هاوینی ساڵی (١٣٣٩-١٩٦٠) بوو چەند هەفتەیەک لە دوکانێکی گەرمی مەنجەڵ دروستکردندا کارمکرد. گەرمای زۆری یەزد و گەرمیی کوورەی مس تواندنەوە تەواو شەکەتی کردبووم، هیچ ڕۆژانەیەکیشم وەرنەدەگرت. پاش چەند هەفتەیەک دایکم گوتی نامەوێت کوڕەکەم بچێتە ئەم دۆزەخە. هەر بۆیەش منی بردە لای ئاغای کەسایی، کە دوکانی پایسکیلخانەی هەبوو.

ئەو ڕۆژە ساڵی (١٣٨٩-٢٠١٠) کە لەگەڵ ئاغای تەوەجوهی لە بازاڕی مسگەرەکاندا قسەم دەکرد، بازاڕی مسگەرەکان چۆڵ و بێدەنگ بوو، کوڕە پوورەکەم ئەبولقاسمی سیاح، کەلوپەلی لە دوکانەکەیدا دەفرۆشت و وازی لە کاری مسگەری هێنابوو، چەند مەنجەڵێکی کۆنیشی وەکو نموونە دانابوو کە ئێستا خەڵکی وەک شتێکی ناوازە سەیری دەکەن. کوڕە پوورەکەم وەک زۆربەی مسگەرە کۆنەکان چەند ناوێکی هەبوو، لە ماڵەوە پێیاندەگوت عەبدولحسێن، لە بازاڕدا پێیاندەگوت ئەبولقاسم، لە ناسنامەکەشیدا نوسرابوو محەمەد ڕەزا سیاح. براکەشی کە ناوی محەمەد بوو پێیاندەگوت کەمپانی،

ئەویش ماوەیەکی زۆر شاگرد مسگەر بوو، بەڵام ئەم محەمەدەش وەک تەواوی شاگرد مسگەرەکانی تر، چونکە هەمیشە لەلایەن وەستاکەیەوە لێدانی هەبوو، بۆیە لە داخا شاری یەزدی جێهێشت و ڕۆیشت بۆ بەندەر عەباس و پاشان چوو بۆ بەندەر خەمیر و بەندەرەکانی دیکە، پاش دوو ساڵ گەڕایەوە و لە بافق نانەواخانەی دانا.

مسگەرەکان لە ساڵانی (١٣٣٠-١٣٤٠-١٩٥١-١٩٦١) نەدەچوون بۆ سەربازیی و هەمیشە لە ترسی پۆلیس خۆیان دەشاردەوە، هەر بۆیەش هەر یەکە و چەند ناوێکی هەبوو. کاتێک کە پۆلیس دەچوون بۆ بازاڕی مسگەرەکان و بەدوای محەمەد ڕەزا سیاحدا دەگەڕان، هەموو کەس دەیانگوت ئەو ناوە ناناسین. دیارە خۆ ڕاستیان گوتووە، من کە پوورزای ئەو بووم چەندیین ساڵ نەمزانیبوو لە ناسنامەدا ناوی محەمەد ڕەزایە. ئەو دوو برایە هەردوکیان ناوی خوازراویان هەبوو. زۆری تریش لە خەڵکی ئەوسەردەمە ناوی خوازراویان هەبووە. ئەم دوو پوورزایەم هەرگیز نەچوون بۆ سەربازیی، هەرچەندە ئەو نەچوونەیان بوو بە هۆی دواکەوتنیان لە زۆربەی کاروبارەکانیاندا...

کاتێک خاڵم بوو بە مسگەر لە بازاڕدا تەشت و مەنجەڵی گەورەی دروستدەکرد، تا نەیانگوتایە غوڵام موراد، هێچ کەسێک ئەوی نەدەناسی، خاڵم کەسێکی بە هێز بوو بازووەکانی ئەستوور و پتەو بوون، زۆر ئازا بوو لە کارکردندا.

بازاڕی مسگەرەکانی یەزد لە چاو بازاڕی قوماشفرۆشان و بازاڕی خانی یەزد و بازاڕی مسگەری کرمان، بازاڕێکی گەورە نەبوو، بەڵام بازاڕێکی بەرهەمهێن بوو، تێکڕای دوکانەکان بەرهەمیان هەبوو، مەنجەڵ، تەشت، قاپ، سینی، کاسە، پەرداخ، سەماوەر، مەسینە، گوڵدان، تەشت و لەگەنی حەمامیان دروست دەکرد. هەروەها سینی مسی بچووکیان دروست دەکرد کە جێگای یەک پیاڵە و یەک ژێرپیاڵە و چەند کڵۆ شەکرێک دەبۆوە لە سەری، ئەم جۆرە سینیانە زیاتر لە مەراسیمەکاندا بەکاردەهات. کوڕە پوورەکەشم واتە عەبدولحسێن سیاح، جگە لە مسگەری چایچێتیشی دەکرد، ماوەیەک لە مەراسیمەکانی عاشورادا، چای گێڕابوو، پاشان بوو بە چاتێکەر. دیارە من تا نووسینی ئەم یادەوەرییانە وامدەزانی چاتێکردن و چاگێڕان و پیاڵە کۆکردنەوە لە مەراسیمی عاشورادا بێ پارە و بێ بەرامبەرە و لەبەر خاتری ئیمام حسێنە. کاتێک خەریکی نووسینی ئەم یادەوەرییە بووم لەگەڵ دایکم کەوتمە گفتوگۆ، ئنجا تێگەیشتم بۆ ئەم کارەش پیاوان پارە وەردەگرن. دایکم گوتی، بەندەی خودا تۆ کەسێکی چەندە سادەیت، خۆ لە دونیادا هیچ کارێک بەبێ پارە ناکرێت. دایکم گوتی تەنانەت ئەسپەکەی ئیمام عەباسیش تا جۆی نەخواردایە نەیدەتوانی بە ڕێگادا بڕوات. ئەوکاتەی لە

مەڕاسیمی ئیمام حسێن دا بە بەلاش چایان دابەشدەکرد ئەو سەردەمە ڕۆیشت. ئنجا دەیگوت مەڕاسیمی عاشورا ئێستا بۆتە جۆرێک لە کاسبی کردن. من خزم و کەسێکی زۆرم هەبوون کە کاری مسگەرییان دەکرد، بەلام وازیان لە پیشەکەیان هێناوە و ئێستا خەریکی پیاهەڵدانن لە مراسیمەکاندا. هاوینی ساڵی (١٣٨٩-٢٠٠٠) بە بڕیاری دایکم لە ماڵی خۆماندا مەڕاسیمێکمان ڕێکخست، چەند کەسێک لە خزمەکانی خۆمان بەشداریان تێداکرد، بەخوێندنەوەی هۆنراوە و پیاهەڵدان. دایکم گوتی هەندێک پارەش بدە بە جەواد، گوتم بۆچی پارە بدەمە نەوەی پووریشم. دایکم سەیرێکی کردم و گوتی ماشاڵڵا لە ئەقڵی تۆ، وا دەزانیت ئێستا سەردەمی ئەوەیە خەڵکی بە بێ پارە پیاهەڵدان بۆ ئیمام حسێن بکەن، بڕۆ بیست هەزار تومەن بکەرە زەرفێکەوە و بیدەرە دەستی.

جاران خەڵکی لەبەر خاتری ئیمام حسێن مەڕاسیمیان ڕێکدەخست و چایان دەدا بە خەڵکی لەبەر خاتری ئیمام حسێن شیعر و موناجاتیان دەخوێند، بەلام ئێستا وا نەماوە، ئێستا ئاوازخوێن و شیعرخوێن هەیە لە ماوەی دە ڕۆژی مانگی موحەڕەمدا (١٥-٢٠) ملیۆن تومەن پارەی دەستدەکەوێت. کە ئەمەش گۆڕانکارییە، بەلام گۆڕانکاری بەرەو کوێ خۆیشم نازانم. مەلایەک پازدە ساڵ وانەی ئایینی دەخوێنێت، پاش تەواوکردنی خوێندنەکەی دەچێتە مزگەوتێک و ئامۆژگاری خەڵکی دەکات بەلام (١٥-٢٠) هەزار تومەنی پێدەدەن، لە کاتێکدا کەسێک دەنگێکی خۆشی هەیە و سەد دێڕ هۆنراوەی (حافز) ی لەبەرە و بەئیمام حسێندا هەڵدەدات، لە هەر دانیشتنێکدا لانیکەم (٢٠٠-٣٠٠) هەزار تومەن وەردەگرێت.

یەکێک لەو بەرهەمانەی کە لە شاری یەزدەوە هەناردەی شارەکانی تری ئێران دەکرا، بەرهەمی مس بوو. هۆزەکانی قەشقایی و بەختیاری بە گشتی کڕیاری تەشت و مەنجەڵی یەزد بوون. ئەم هۆزانە بۆ کوڵاندنی شیر و دروستکردنی ماست پێویستییەکی زۆریان بە تەشت و مەنجەڵی مس هەبوو. مسگەرەکانی یەزد و کرمان جۆرەها تەشت و مەنجەڵیان، بۆ ئەو هۆزانە دروست دەکرد، بەتایبەت مەنجەڵی گەورە. مسگەرەکانی یەزد لە بەهار و هاویندا، بۆفرۆشتن و چاکردن و سپیکردنەوەی مس دەچوون بۆ نێو هۆزەکان، ئەوان هەم لە دەست گەرمای هاوین هەڵدەهاتن و هەم کار و کاسبیشیان دەکرد. مسگەرەکانی کرمانیش هەر هەمان کاریان دەکرد. مسگەرەکان گروپێکی تۆکمە و یەکگرتوو بوون، هەمیشە سەرۆکێکیان هەبووە، کە سەرپەرشتی دەکردن. ماوەی سێ ساڵ حاجی محەمەد زەڕابی سەرۆکی ئەم گروپە بوو. کاتێک من تەمەنم (١٠-١٢) ساڵ بوو، حاجی محەمەد زەڕابی تەمەنی حەفتا ساڵ زیاتر بوو، ئەو پێنج کوڕی هەبوو،

بەڵام تەنها محەمەدی کوڕی پیشەی باوکی ڕەچاو کردبوو، تەنانەت کوڕێکی کە ناوی عەلی بوو، نازناوەکەی خۆیشی گۆڕی، لە عەلی زەڕابی مسگەرزادەوە کردی بە عەلی والاگەری پارێزەر.

گرووپی مسگەرەکان بەگشتی کەسانی سەر بەدەرەوە و دیار بوون، بەڵام گرووپی دەستچنەکان کەسانی هێمن و لەسەرخۆ بوون و گرووپێکی یەکرێز نەبوون بەیەکەوە، سەرپەرشتیاریان نەبوو، هەڵبەتە دەستچن و جۆلاکان ژمارەیان لە مسگەرەکان زیاتر بوو. وا هەست دەکەم زۆربەی دانیشتووانی گەڕەکەکانی یوزداران، ماڵەمیر، قەلاکون، کۆشکی تازە. واتە خەڵکی گەڕەکە کۆنەکانی یەزد سەر بە توێژی جۆلا و دەستچنەکان بوون...

وا بزانم مانگی شەهریوەری ساڵی (١٣٣٨-١٩٥٩) بوو، هێشتا کێشەی زەوی چارەسەر نەکرابوو. بە خاڵم گوت هەرکاتێک بۆ کاری مسگەریی چوویت بۆ ناو هۆزەکان، منیش لەگەڵ خۆتدا ببە. ئەویش گوتی ئەمساڵ هۆزەکان کۆچیان کردووە. ساڵێکی تر ئەگەر چووم ئەوا تۆش دەبەم. هاوینی ساڵی دواتر چەند منداڵێکی گەڕەکی خۆمان لەگەڵ وەستاکانیاندا بۆ سپیکردنەوەی مەنجەڵی مس ڕۆیشتبوون بۆ ناوچەکانی ئەقلید، موبید، نورئاباد و چەند شوێنێکی تر. لە خاڵم پرسی تۆ کەی دەڕۆیت بۆ ناو هۆزەکان؟ خاڵم گوتی ئەوان زوو ڕۆیشتوون و تەواوی هاوین لەوێ دەمێننەوە، بەڵام من تەنها بۆ فرۆشتنی مس دەچم و دوسێ هەفتە زیاتر لەوێ نامێنمەوە، هەر کاتێک ڕۆیشتم تۆش لەگەڵ خۆمدا دەبەم. کاتی ڕۆیشتن گەیشت و مۆڵەتم لە دایکم وەرگرت. بەخۆم و بوخچەیەکەوە چووم بۆ لای خاڵم. خاڵم ئۆتۆمبێلێکی بەکرێگرت و پڕیکرد لە مەنجەڵ و تەشت و قاپی مس، پاشان قەرەوێڵەکەی خۆی و بوخچەکەی منی تێکرد و کەوتینەڕێ. دیارە هەموو مەنجەڵ و کەلوپەلەکان هەر هی خاڵم نەبوون. چونکە خاڵم ئەوەندە دەوڵەمەند نەبوو، تا بتوانێت ئەوەندە کەلوپەلی مس بکڕێت، زۆربەی مسەکان هی وەستا حەسەن بوون. خاڵم قازانج بەنیوەیی لێی وەرگرتبوو. وا هەست دەکەم خاڵم لەو کاتەدا خاوەنی سەد تومەن نەبووبێت.

دوو کەسی تریش لە پشتەوە لە ئۆتۆمبێلەکەدا بوون، ئەو داماوانە لەنێو ئەو هەموو کەلوپەلانەدا جێگەی خۆیان کردەوە. نزیکی نیوەڕۆ بوو، هەوا گەرم بوو. لە فولکەی باخی میللییەوە بەڕێکەوتین، هەمان فولکە ئێستا ناوەڕاستی شاری یەزدە، ئەوکات دەرەوەی شار بوو. جادەیەکی خۆڵی پڕ لە تاسە و چاڵوچۆڵ بوو، هەردوو شاری (یەزد و تەفت) ی پێکەوە دەبەستەوە. ئێستا جادەی نێوان شاری یەزد و تەفت

قیرەتاوە و دوو سایدە. من و خاڵم لە پێشەوە دانیشتبووین، بە هۆی گەرمیی مەکینەی ئۆتۆمبێلەکە و گەرمای هاوین هەموو گیانمان ئارەقەی لێدەچۆڕا، هەر وەک ئەوەی ئاویان پێدا کردبین. شوفێرەکە زوو زوو بە دەستەسرێک دەموچاوی خۆی دەسڕی. یەکەم شوێن کە پێیگەیشتین باخی خان بوو، تەنها (٢ فرسەخ = ١٢,٤٨کم) لە یەزدەوە دوور بوو. باخێکی پڕ لە درەخت و سەوزایی بوو، چوار دەوری باخەکە بە دیوارێکی بەرد هەڵچنرا بوو، جۆگە ئاوێک بە تەنیشت دیوارەکەدا دەڕۆیشت. لەوێ خەڵکەکە نەیانهێشت بچینە نێو باخەکەوە، ئێمەش بە ناچاری لە ژێر سێبەری درەختەکاندا و لە پشتی دیوارەکەوە دانیشتین. شوفێرەکە ئاوی بە ڕادیێتەری ئۆتۆمبێلەکدا کرد و ساردی کردەوە. من وام هەستدەکرد ئەم باخە هەمان باخە بەردینەکەی چیرۆکی ئەمیر ئەرسەلانی ناودارە. ئەم باخە شوێنێک بوو خەڵکە دەوڵەمەندەکان بۆ پشوودان و کاتبەسەربردن سەردانیان دەکرد. پێشتر زۆر جار بیستبووم کە فڵانەکەس فڵانە شەو لە باخی خان خۆی تەواو مەست کردووە. من لە منداڵیمدا وام هەستدەکرد باخی خان جێگای فولادزرە دێو و جێگەی شەڕ و چەقۆ وەشێنەکانە. بۆیە دەترسام و زۆر حەزمدەکرد هەرچی زووتره ئەو شوێنە جێبهێڵین.. لەدوای شۆڕش، باخی خان بووە جێگای پشوودان و حەوانەوەی هەموو خەڵکی. من جارێکی تر پاش چل ساڵ چوومەوە بۆ سەردانی باخی خان، ئەم شوێنە زۆر خۆش ببوو، نە فولادزرە و نە مەست و نە چەقۆکێشی لێنەبوو. بەڵکو بە جۆرێک ڕێستورانت و چایخانە و دوکانی لێکرا بوونەوە کە گیرفانی خەڵکیان بەتاڵ دەکردەوە. نێوانی یەزد و تەفت لە بیستوپێنج کیلۆ مەتر زیاتر نەبوو. پاش پشوودان بە ڕێکەوتینەوە.

لە ڕێگادا دوو جار مەکینەی ئۆتۆمبێلەکەمان کوڵاندی و ئێمەش دادەبەزین، ئاوی ساردمان پێدا دەکرد و ساردمان دەکردەوە. پاش چەند کاتژمێرێک گەیشتینە تەفت. لەو گەرما زۆرەدا باخەکانی تەفت وەک باخەکانی بەهەشت وابوو. شوفێرەکە گوتی دەبێت چەند کاتژمێرێک لێرە بووەستین، چونکە بەم گەرمایە ناتوانین بڕۆین. لە ڕۆخی ڕووباری تەفت، لە بەردەم باخێکدا وەستاین و ئۆتۆمبێلەکەمان بردە ژێر سێبەری درەختێک. هەر لەوێ مسەکانمان بڵاوکردنەوە. خاڵم دەیویست لەو وەستانەدا سوودێک وەرگرێت و هەر لەوێ هەندێک مس بفرۆشێت. هاواری کرد و گوتی ئەهای مس ئەهای مس بۆفرۆشتن. ئنجا پێیگوتم بڕۆم لە کۆڵانەکاندا هاوار بکەم و بڵێم مس، مس وەرنەوە بۆ مس. گوتی لە دەرگای چەند ماڵێکیش بدە و بڵێ مسگەر هاتووە. منیش ڕۆیشتم بۆ ناو گوندەکە و هاوارمکرد.

پاش چەند خولەکێک چەند کڕیارێک پەیدا بوون یەکێک دەیویست دوو دەسک بۆ مەنجەڵەکەی دروست بکات و ژنێک چەند قاپێکی کڕی و ژنێکی زەردەشتی مەنجەڵێکی هێنا تا لێوارەکانی بۆ ساف بکاتەوە، ژنەکە ژنێکی تەمەن مامناوەند بوو، جلوبەرگێکی زۆر جوانی لەبەردا بوو کە جلوبەرگی تایبەتی زەردەشتییەکان بوو، جلەکانی هەموو ئەندامی گیانی داپۆشی بوو. جلوبەرگێک بوو ڕەنگێکی کراوەی هەبوو دڵ و چاوی پێدەگەشایەوە. خاڵم خەریکی چاککردنی مەنجەڵەکە بوو، منیش چاوم لە ژنە بڕی بوو سەیرم دەکرد. خۆ پێشتر سەدان ژنی زەردەشتیم دیبوو، بەڵام ئەو ڕۆژە و لەو تەمەنە منداڵییەدا و لەو گەرما تاقەتپڕوکێنەدا من سەرسامی سەیرکردنی ئەو بووم. ئەو ژنە زۆر بە میهرەبانیەوە لێی پرسیم و گوتی نانت خواردووە، برسیت نییە، منیش گوتم حەزم لە ئاوی ساردە. ژنە ڕۆیشت و پاش کەمێک گەڕایەوە یەک دۆلکە شەربەتی پڕ لە بەفری هێنابوو. بەفرێک کە لە ڕنووە بەفرە سروشتیەکانی کوێستانەکانی تەرزجانەوە هێنابوویان. بەدوای ئەودا کچۆڵەیەکی بچکۆلانەی وەک سوورەگوڵ هات و هەندێک هەڵوژەی بۆ هێناین. من نەمزانی سەیری هەڵوژەکان بکەم یا ڕوخساری جوانی ئەو کچۆڵەیە، سەر گۆناکانی ئەوەندە جوان بوون هەر دەتگوت پەریی بەهەشتە. خواردنەوەی شەربەتە ساردەکە تەواو سەر مەستی کردبووم. وام هەستدەکرد شوفێرەکە و خاڵیشم بە خواردنەوەی شەربەتەکە سەرمەست بووبن. ئەو دوو کەسەی لە دوای ئۆتۆمبێلەکەوە سوار ببوون خەڵکی تەفت بوون و ڕۆیشتبوون. خاڵم خوانی ژەمیی ڕاخس، کڕیارێک هات بۆ کڕینی مەنجەڵ، ئەویش کاسەیەک ماستی بۆهێنا بووین. وردە وردە کڕیار ڕوویان تێکردیین، چەند کەسێک دەیانویست مس بکڕن، بەڵام پارەیان نەبوو، دەیانویست بەقەرز پێیان بدەین. خاڵیشم دەیگوت من مس بەقەرز نافرۆشم چونکە مسەکان هی خۆی نین و هی خەڵکە. کات گەیشتە دوانیوەڕۆ، شوفێرەکە گوتی با هێواش هێواش بڕۆین. خەریکی کۆکردنەوەی مسەکان بووین، ژنێکی دیکەی زەردەشتی هات، ویستی سەتڵێکی گەورەی بۆ دروست بکەین، خاڵم پێیگوت ئەی مەنجەڵی مست ناوێت، ئەویش گوتی حەزدەکەم دانەیەک بکڕم، بەڵام پارەم نییە و هاوسەرەکەشم مردووە، ئەگەر بە قەرز دەبێت ئەوا مەنجەڵێکم دەوێت. خاڵیشم مەنجەڵێک و چەند قاپێکی بە قەرز پێدا. ئەویش قاپەکانی خستنە نێو مەنجەڵەکە و منیش مەنجەڵەکەم خستە سەر سەرم و بەدوای ژنەکە کەوتم و بۆم بردەوە بۆماڵەوە، ئەویش یەک کیسە قەیسی وشکی پێدام و گوتی لەو سەرەوە کە گەڕانەوە وەرە بۆ ماڵەوە پارەی مەنجەڵەکەت پێدەدەم، منیش کیسە قەیسییەکەم بە دەستەوە گرت و

گەڕامەوە بۆ لای خاڵم، کە هاتمەوە ئۆتۆمبێل ئامادەی ڕۆیشتن بوو، سوار بووین و کەوتینە ڕێ. لە ڕێگا بە خاڵمم گوت بۆچی ئەو هەموو خەڵکە داوایان کرد مسیان بە قەرز بدەیتێ پێت نەدان، کەچی خۆت بە زۆر دات بەو ژنە زەردەشتییە؟ گوتی ئەو زەردەشتییانە پارەی کەس ناخۆن و ئەو ژنەش پارەکەمان بە تەواوی دەداتێ، هەر کاتێک گەڕاینەوە خۆت بڕۆ بۆ ماڵیان و پارەکەی لێ وەربگرە.

شوفێرەکە زۆربە هێواشی ئۆتۆمبێلی لێدەخوڕی و هۆڕنی لێدەدا. سێ کەس لە کۆلانێکەوە ڕایانکردە پێش ئوتومیلەکەوە دەیانویست بچن بۆ (ئەبرکو). کەلوپەلە کانیان خستە دواوە و خۆشیان هەر لە دواوە سوار بوون. لە کێوی (عوقاب - هەڵۆ) ەوە تیپەڕین. بۆیە بەو کێوەیان دەگوت کێوی عوقاب چونکە کێوەکە هەر لە هەڵـۆ دەچوو.

پاش کەمێک گەیشتینە خوراشا، کە شوێنێکی زۆر خۆش و پڕ باخ و باخات بوو. شوفێرەکە لە خاڵمی پرسی دەتەوێت لێرە کەلوپەلەکانت بڵاوبکەیتەوە؟ خاڵم گوتی بەڵێ. شوفێرەکە گوتی باشە ماوەی کاتژمێرێک لێرە پشوو دەدەین، ئۆتۆمبێلەکەی ڕاگرت و خۆی چوو لە بن درەختێکدا لێی ڕاکشا و ئێمەش لە ژێر سێبەری درەختێکدا کەلوپەلەکانمان بڵاوکردەوە. *ئەو سێ کەسەی کە لە گەڵماندا سوار ببوون، بەبێ ئەوەی هیچ نارەزاییەک دەرببڕن و بڵێن بۆ دەبێت ڕابووەستین، وەک ئێمە دابەزین* و پێڵاوەکانیان دانا، ئەوانیش وەک من و خاڵم گۆرەوییان لە پێدا نەبوو، پانتۆڵەکانیان هەڵکرد و قاچیان خستە نێو جۆگا ئاوەکەوە. هەوا بـەرەو فێنکی دەڕۆیشت، چەند کەسێک لە کۆلانەکانی گوندەکەدا هاتوچۆیان دەکرد. خاڵم چەند پارچە مسێکی لەگەڵ ڕۆنی مەڕ ئاڵوگۆڕ پێکرد.

من چەندیین ساڵ لەوە دوا کاتێک لەگەڵ زەڕی سوڵتان لە هەمان جادەوە لە یەزدەوە چووین بۆ شیراز، ئەو جادەیە هێشتا هەر خۆڵ بوو قیر نەکرابوو. ئەمجارە، ساڵی (١٣٧٨-١٩٩٩) پاش چل ساڵ، کە بە ئۆتۆمبێلی خۆم بەو جادەیەدا ڕۆیشتم، جادەکە قیرتاو کرابوو، زۆر شت گۆڕدرابوو، بەدوا گوندی خەراشادا دەگەڕام کەچی گەیشتمە ئیسلام ئاباد. من ئەم شوێنەم نەبینی بوو، گوندێکی گەورە بوو لە ڕۆخی جادەکەدا، چەند دوکانێکی گەورەی لێبوو. لە دوکاندارێکم پرسی خەراشا لێرەوە چەند دوورە؟ ئەویش گوتی هەر ئێرە خەراشایە، لە دوای شۆڕش ناوەکەی گۆڕدرا بە ئیسلام ئاباد. چەپۆکێکم بە سەری خۆمدا کێشا و گوتم ئاخر چۆن دەبێت ناوێکی هەزار ساڵە بگۆڕدرێت؟ باشە خۆ هەموو ئێران ئیسلام ئابادە. بۆچی ناوەکەی دەگۆڕن؟ جا ئەگەر ئیمامی عەباس بێت و دوبارە هەمان ناوی خەراشا لەم گوندە بنێتەوە. پێویستە بە هیچ

جۆرێک لە پاشگری وشەی شا نەترسین، شا ڕۆیشت و سەردەمی شا بەسەرچوو. ئەم وشەی (شا) یە هەر وەکو وشەی شاتوو، شاڕێ، شاجوان، شاڕەنگ وایە، هیچ پەیوەندییەکی بە شاوە نییە. من لە هەموو تەمەنمدا ئەم گوندەم بە خەراشا زانیوە. ئاخر من فەرهەنگی گوندەکان و شوێنە ئایینیەکانی ئەم وڵاتەم نووسیووە. لە نێو فەرهەنگێکی حەوتسەد لاپەڕەییدا، ناوی هەشت هەزار گوند و (٤٠٨٠) شوێنی ئایینی ئەم وڵاتەم تێدا نووسیووە. لەم کاتەدا تۆ لە پشتی سەری منەوە ناوی ئەم گوندانە دەگۆڕیت، من دەبێت ئێستا چی بکەم؟ بڕۆم پاش پێنج ساڵ جارێکی تر ئەم ناوانە بدۆزمەوە و لە چاپی داهاتووی فەرهەرگەکەمدا دیسانەوە ئەم ناوانە بگۆڕمەوە. بە گۆڕانکاری لە ناوەکاندا هیچ شتێک ناگۆڕێت. نە مرۆڤەکان دەگۆڕێن نە کەشوهەوا دەگۆڕێت نە کێو و ڕووبارەکان. ڕۆشنبیریش بە گۆڕینی ناوەکان پێش ناکەوێت. چەندین کەسی تریش وەک من هاوار دەکەن کە ناوی گوند و شوێنەکان مەگۆڕن. هەروەک چۆن ناوی کرماشانتان کرد بە باختەران کەچی پاش چەندین ساڵ دووبارە بەناچاری کردتانەوە بە کرماشان. دیارە مرۆڤەکانیش دەڕۆن و ناوی خۆیان دەگۆڕن، هەموو کەسێک جێگای خۆی دیارە و ئاستی ڕۆشنبیریی و پلەوپایەی هەر ئەوەیە کە هەیەتی، جا ناوی خۆی بگۆڕیت یا نەگۆڕێت. مامۆستایەکی زانای وەکو دکتۆر عەواز کوچەکی کە دەچیت ناوی خۆی دەگۆڕێت و دەیکات بە عەلی ڕەزا، دکتۆرێک کە چەندین کەسی پێگەیاندووە و یەکێکە لە کەسایەتیە جوانەکانی وڵاتی ئێران و زیاتر لە پەنجا بەرگ کتێبی هەیە و ئەندامی دەزگای ڕۆشنبیری زانستییە. کەچی دەچیت لە تەمەنی پەنجا ساڵیدا ناوی خۆی دەگۆڕێت. هەروا بەم هۆیەشەوە لە کاتژمێری (٣.٢٥) ی بەرەبیاندا یادێکم لەم پیاوە بەرز و بەڕێزە کردەوە. لە ساڵی (١٣٩٠-٢٠١١) دا چوومەوە بۆ خەراشا، ئەو گوندە ببووە نیمچە شارێک، ژمارەی دانیشتووانی زیادی کردبوو، باخ و باخاتەکانیشی زیادی کردبوو، خەڵکەکەشی ڕاستگۆ و میهرەبان بوون، بەڵام خەڵکی خەراشای ساڵی (١٣٣٨-١٩٥٩) لە خەڵکی ئیسلام ئابادی ساڵی (١٣٩٠-٢٠١١) میهرەبانتر و ڕاستگۆتر بوون، ئەوان ئەو کاتە هەنگوینی پاک و ساخیان دەفرۆشت، بەڵام ئەوانەی ئێستا دیارنییە ئەو هەنگوینە لە کوێوە دەهێنن و کەچی خۆیان دەڵێن ئەمە هەنگوینی (نیرە) ی لای یەزدە، هەرچەندە کە واش نییە.. گەورەیی مرۆڤەکان لە ڕاستی و ڕاستگۆییدایە. دوکاندارەکانی ئیسلامئاباد هەنگوینی پڕ لە شەکر دەفرۆشن بە خەڵکی بە ناوی هەنگوینی نمرە یەکەوە، بەڵام خەڵکی خەراشای ساڵی (١٣٣٨-١٩٥٩) ماست و دۆ و ترێ یان بە بەلاش پێشکەشی میوانان و ڕێبواران دەکرد. کەچی ئیسلامئابادی ساڵی (١٣٩١-٢٠١٢)

شتی بێ کەڵک و خراپ گرانتر لە بازاڕەکانی یەزد دەفرۆشن.

جیهان لە قۆناغی پەڕینەوەدایە، لە قۆناغی کۆنەوە بۆ قۆناغی مۆدێرنێتە. ئێستا خەڵکە کۆن و ڕووخۆش و ڕاستگۆکەی جاران گۆڕاوە بۆ خەڵکانی پارەپەرست و کەڵەکچی. بە گۆڕینی ناو هیچ شتێک ناگۆڕێت. ناوەکان میراتی فەرهەنگی میللەتن، بەشێکن لە فەرهەنگی دەوڵەمەندی ئەم وڵاتە. ئیمام عەباس نایەت و ناوی شار و گوندەکان ناگۆڕێت، ئەشکەزەر هەر ئەشکەزەرە. داتاشینی ناو بۆ شار و گوندەکان کارێکی باش نییە، هەرچی بکەن ئەگەر هەزار ساڵی تریش بێت، ئەو ناوانە هەر دەبێت بگەڕێنەوە بۆ ناوە ڕاستە قینەکەی خۆیان، بۆیە بەبێ هۆ کێشە دروست مەکەن...

خاڵم هەر لە یەکەم کاتژمێری وەستانماندا کاسبی خۆی کرد و هەندێک لە مسەکانی فرۆشت و لەبری پارە، مسە کۆن و ڕۆنی مەڕی وەردەگرت. بۆ ئێوارە چووینە گوندی (ئەبرکو). ئۆتۆمبێلەکەمان زۆر باش نەبوو، خاڵم و شوفێرەکە پێیان باش بوو، شەو لە ئەبرکو بمێنینەوە، بەڵام ئەو سێ کەسەی لەگەڵماندا بوون، دەیانویست بە زوویی بڕۆن، بۆیە هەر لەوێ لێمان جیا بوونەوە. شوفێرەکە ڕۆیشت بۆ ناو گوندەکە تا کەسێکی شارەزا پەیدا بکات بۆ چاکردنی ئۆتۆمبێلەکە. ئەوکات هیچ فیتەرێک لە (ئەبرکو) نەبوو. خاڵم لەبەر دەمی مزگەوتەکەدا کەلوپەلەکانی بڵاوکردەوە. (ئەبرکو) گوندێک بوو خانووەکانی لە خشتی قوڕ دروستکرا بوون، کۆڵانەکانی تەسک و پێچاوپێچ بوون، بەشێک لە گەڕەکە کۆنەکانیشی بەسەر تەپۆڵکەیەکەوە بوون، هەندێک لە دیواری خانووەکانیش بە بەرد دروستکرا بوون. ئەو شەوە لە (ئەبرکو) ماینەوە شەوێکی زۆر فێنک و خۆش بوو، نان و پەنیرمان خوارد و پارچە بەتانییەکمان لە تەنیشت باخچەیەکەوە ڕاخست و لێی نووستین. بەیانی زوو هەڵساین و کەوتینەڕێ. دەبوو لە دەشتی کەوێری ئەبرکووە بڕۆین. بۆ ئێوارە گەیشتینە یەکەم ڕەشماڵی خێڵەکان، هەر لەوێ لاماندا و شوێنەکە کوێستان بوو، هەوا زۆر خۆش و فێنک بوو.

ئێمە پێویستە زۆر ڕێز لەم وڵاتەی خۆمان بگرین. لە ماوەی چەند کاتژمێرێکدا لە ناوچەیەکی گەرمەسێرەوە گەیشتینە ناوچەیەکی فێنکی کوێستانی، ئەو شەوە لە نێو ڕەشماڵی ئەو کۆچەرییانەدا نووستم، ئەوە یەکەم جارم بوو لە ڕەشماڵدا بنووم. بەیانی زوو بەدەنگی مەڕ و ئاژەڵەکان بەئاگاهاتم. خاڵم و شوفێرەکە دەستنوێژیان گرت و نوێژیان کرد، بەیانی زوو کەوتینەوە ڕێ، بەرەو شوێنێک نەمدەزانی ئەو شوێنە کوێیە کە بۆی دەچین؟ ساڵی (١٣٨٩-٢٠١٠) لە خاڵم پرسی ئەو شوێنە کوێ بوو کە ئەو ساڵە بۆی چووین؟ خاڵم گوتی بۆچی دەپرسیت؟ گوتم بۆ هیچ، تەنها دەمەوێت

یادەوەرییەکانم بنووسمەوە. خاڵم گوتی من حەز بە نووسینەوەی یادەوەرییەکانت ناکەم، ئەگەر یادەوەریی ئەو ساڵە بنووسیتەوە و کەسێک لەبارەی یادەوەرییەکانتەوە پرسیارێک لەمن بکات من وەلامی نادەمەوە و دەڵێم هیچ نازانم. بەراستی خاڵم هیچ هاوکاری نەکردم لە پێدانی زانیاری، بەلام ئەوەندە دەزانم نزیکەی دووسەد کیلۆ مەتر لە شیرازەوە دووربووین. ئێمە لە کێوەکانی فارس لە نێو خێڵی دلێری قەشقاییەکان بووین. خاڵم لە ساڵی (١٣٩١ -٢٠١٢) دا لە تەمەنی (٧٨) ساڵیدا نازناوی خۆی گۆڕی. جیهان گۆڕا خاڵی منیش گۆڕا. خۆ تەنها هەر دکتور کۆچەکی زانا و ماموستای زانکۆ نییە کە ناوی خۆی دەگۆڕیت، خاڵە تەمەن (٧٨) ساڵە نەخوێندەوارەکەی منیش ناسناوی خۆی گۆڕی. گەیشتینە شوێنێک کە وەستا ئەسغەر بەخۆیی و شاگردەکانیەوە لەوێ بوون، وەستا ئەسغەر مەنجەڵ و تەشت و لەگەنی خەڵکەکەی چاک دەکرد. شاگردەکانیشی مسیان سپی دەکردەوە، کەسیک مسەکانی دەسووەوە، کەسێکی تر کوورەی ئاگرەکەی دەدەماند، سێیەمیش مسەکانی پاکدەکردەوە و سپی دەکردنەوە. وەستا ئەسغەر ئەندامی گروپی مسگەرەکان نەبوو، دوکانیشی نەبوو، بەڵکو مسگەرێکی گەڕۆک بوو بە دێهاتەکانەدا دەگەڕا. عەرەبانەیەکیشی هەبوو جارجار سەوزە و میوەی لەسەر دەفرۆشت، بۆیە نەدەکرا وەک مسگەر هەژمار بکرێت، مسگەرەکانیش هەرگیز ئەویان بە ئەندامی گروپی خۆیان نەدەزانی. هەر ئەو شوێنەی کە ئێمە پێگەیشتین و وەستا ئەسغەریشی لێبوو، جێگایەکی یەکجار خۆش بوو، هەروەک بەشێک بێت لە بەهەشت. ئێمە لە یەزدی گەرمەوە هاتبووین، بەلام ئەم شوێنە زۆر کەشوهەوایەکی سازگار و خۆشی هەبوو. ئاوی ڕووبارەکە لە ئاوی سەرچاوەی کەوسەر دەچوو. ئێوارەیەکی درەنگ بوو کە ئێمە گەیشتینە ڕەشماڵەکەی وەستا ئەسغەر، شەویش زوو نووستین. هەر لەو شوێنەدا دوو ڕووبار بەیەک دەگەیشتن و تێکەڵ بە یەک دەبوون. لەوبەری ڕووبارەکەوە ڕەشماڵی کۆچەرییەکان هەڵدرابوو، لەم بەری ڕوووبارەکەشەوە تەنها ڕەشماڵی وەستا ئەسغەر هەبوو، کە بەرامبەر بە ڕەشماڵی کۆچەرییەکان بوو. وەستا ئەسغەر ڕەشماڵەکەی لەسەر سەوزەگیا و لە نێوان دوو درەختدا هەڵدابوو. هەتا بیری لێبکەیتەوە جێگایەکی دڵگیر و خۆش بوو، کەشوهەوای گەرمی دوێنێ لە کوێ و ئاووهەوای فێنک و سازگاری ئەمڕۆ لەکوێ؟ پێڵاوەکانم دانا و لە سەر سەوزە گیاکە ڕاکشام و قاچم خستە نێو ئاوی ڕووبارەکەوە، ئاوەکە هێندە سارد بوو، چەند خولەکێک زیاتر نەمتوانی قاچەکانمی تێدا بهێڵمەوە. سەر لووتکەی شاخەکان هەموو بەفر بوو، ئەو بەفرە ئەوەندی تر سروشتەکەی جوانتر کردبوو. مێگەلە مەڕەکانیش لە

بناری شاخەکانەوە خەریکی لەوەڕ بوون. شاگردەکانی وەستا ئەسغەر چایان لێنا و سفرەی بەیانیان ڕاخست. بەتەواوی هەتاو کەوتبوو، یەکەم کڕیار گەیشتە لامان، چەند کەسێکی تریش بە سواری ولاخ هاتنە لامان. خاڵم کرێی ئۆتۆمبێلەکەی دا بە شوفێرەکە و وەستا ئەسغەریش هەرچی مسەکۆن و کەشک و ڕۆن و خوریی هەبوو خستینیە ئۆتۆمبێلەکەوە و ناردنیەوە بۆ یەزد. خاڵم بۆ فرۆشتنی مسەکان دەبوو ولاخێک بکرێت و مسەکانی لێ بار بکات و ڕەشماڵ بە ڕەشماڵ بیانگێڕێت. دیارە مسەکان لە باری وەلاخێک زیاتر بوون. خاڵم بۆیە هاتبووە لای ڕەشماڵەکەی وەستا ئەسغەر تا مسە زیادەکانی لای ئەو جێبهێڵێت. ئیمە دەبوو بۆ فرۆشتنی مسەکان لە نێوان ڕەشماڵەکەی وەستا ئەسغەر و ڕەشماڵی کۆچەرییەکاندا هاتوچۆ بکەین. هەر کاتێک بارە مسێکمان بفرۆشتایە دەبوو بچین بارێکی تر باربکەین. نزیکەی پازدە بار مسمان هەبوو، دوو ڕۆژ لەو شوێنەماینەوە و هەندێک مسمان فرۆشت، ڕۆژی سێیەم بارێکمان بارکرد و ئەویترمان لای وەستا ئەسغەر جێهێشت و ڕۆیشتین بۆ هەوارەکانی تر. من نامەوێت باسی جوانییەکانی سروشتی ئەو شوێنە بکەم، ڕاستییەکەی ئەوەیە کە دەبێت وێنەکێشێک بێت و وێنەی دیمەنی ئەو سروشتە جوانە بکێشێت. خۆشبەختانە ماوەی بیست ساڵە زۆربەی فەرشە جوان و بەنرخەکان دیمەنی جوانی کۆچەرانیان لەسەر نەخشێنراوە، زۆر حەزدەکەم کە تاکێک لەو فەرشانەی تابلۆی کۆچەرانیان لەسەرە بکڕم و لەماڵەوە دایبنێم. بەڵام مووچەی مامۆستایەکی خانەنشینی زانکۆ بەشی کڕینی ئەو تابلۆیە ناکات، هەر بۆیە هەر کاتێک بە بەردەمی دوکانی فەرشفرۆشەکەی نزیک شوێنی کارەکەمدا گوزەردەکەم چەند خولەکێک سەیری ئەو تابلۆ چنراوە جوانانە دەکەم. دیارە ئێستاش دەڕۆم بۆ دەشت و کێو و شاخ، هۆزە کۆچەرییەکانیش لە نزیکەوە دەبینم، بەڵام ڕاستییەکەی ئەوەیە جوانی تابلۆی سەر فەرشەکان هەرگیز بە جوانی کۆچەرییەکان نابێت. سروشتەکە بەڕاستی زۆر جوان بوو. جۆرەها گوڵ و گوڵاڵە سوورە سەریان دەرهێنابوو، گیا تەواو بەرز ببووەوە، جۆگەلە ئاوی سارد دڵمی شاد کردبوو. مێگەلە مەڕ و سەگی لای مێگەل و شادی و خۆشی شوانەکان ئارامییان بە دڵم دەبەخشی.. زۆربەی خەڵکی، بە تایبەت شوانەکان فارسییان نەدەزانی. ئەوانە هەموو منیان دەبردە جیهانێکی تایبەتەوە، وا بیرمدەکردەوە ئەم شوێنە ئەو بەهەشتەیە کە ئاغا شێخ جەواد لەسەر مینبەر باسیدەکرد، دوور نییە هەر ئەو شوێنە بووبێت.

ئەو سروشتە جوانە منی بە گەشە هێنابوو. تەمەنم (١١-١٢) ساڵ بوو چوست و چالاک بووم، لەملا بۆ ئەولا ڕامدەکرد، بەردم هەڵدەگرت و دەمویست بەو بەردانە ماسی

ڕاو بکەم، بەڕاستی مرۆڤیش دڕندەیە.. شوانیک هاتە لامان کاسەی شیر دۆشینەکەی ڕەش ببوو، ویستی بیگۆڕێت، ئێمەش بۆمان گۆڕی لەبری سەردانەوەی پارە، ڕۆنی پێداین. هەر ئەو شوانە بانگهێشتی نانخواردنی بەیانی کردین و ئاگرێکی کردەوە، چەند بەردێکی خڕی قەبارە گوێزی لە دەم چەمەکە هەڵگرت و خستنیە نێو ئاگرەکەوە، چوو هەندێک شیری دۆشیە نێو کاسە سپییە تازەکەوە و پاشان کە بەردەکان کە لە ئاگرەکەدا سوور ببوونەوە بە دوو پارچە دار هەڵیگرتن و خستنیە نێو کاسە شیرەکەوە و بەم شێوەیە شیرەکەی کوڵاند و هەندێک نانیشی پێداین دەستمان کرد بە نان و شیر خواردن. دوای نانخواردن، شوانەکە دەستیکرد بە شمشاڵ لێدان و مەڕەکانیش هێواش هێواش دەلەوەڕان. بزنێک چووبووە سەر پەلە دارێک زۆرم بەلاوە سەیر بوو کە چۆن ئەو بزنە هاوسەنگی خۆی ڕاگرتووە و بەرنابێتەوە.

شوانەکان زمانی فارسیان نەدەزانی، ئەو کۆچەرییانە لە هۆزی قەشقایی بوون، بە زمانی تورکی قسەیان دەکرد. من و خاڵیشم یەک وشە تورکیمان نەدەزانی، بەڵام خاڵم دەیتوانی بە تورکی تا ژمارە دە بژمێرێت، هەر بۆیەش خاڵم ناچار بوو بەزمانە جیهانیەکە قسە لەگەڵ شوانەکەدا بکات، واتا زمانی ئاماژەی دەست. میهرەبانی و خۆشەویستی بەبێ بەکارهێنانی زمانیش هەستی پێدەکرێت. هەر بۆیەش مەولانای گەورە فەرمویەتی (هاودڵی خۆشترە لە هاو زمانی) بەو منداڵییە لە خۆم دەپرسی چ شتێک بۆتە هۆی ئەوەی ئێمەی مرۆڤ یەک دڵ بین؟

من و خاڵم خەڵکی کەوێر بووین لە بیابانێکی گەرم وسوتێنەری شارنشین بووین، کەسانی کاسبکار و خاوەن پیشە بووین و فارسی زمان بووین، بەڵام هۆزە قەشقاییەکان تورک زمان بوون و خەڵکی کێو و شاخ بوون، لە نێو کەشوهەوایەکی فێنکدا دەژیان و کاریشیان ئاژەڵداریی بوو، ئەوان هەموو شتێکیان هەروەکو ئاوی ڕووبارەکان پاک و ڕوون بوو. ئێمە هەموو شتێکمان وەک ئاوی قەنات لێڵ و لیخن بوو، ئەمانە ڕاستگۆ و بێ پێچوپەنا قسەیان دەکرد، ئەوان نرخی کەلوپەلیان نەدەزانی، بەڵام ئێمە نرخی مسەکانمان دەزانی و چەند بەرامبەر پێمان دەفرۆشتن، ئەوان لە ژێر ئاسمانی شیندا دەژیان، ئێمەش لە ژێر خانووی خشت و گڵدا دەژیاین، ئەوان کرێچی کەس نەبوون، بەڵام ئێمە کرێچی بووین، ئەوان مانگی جارێک پارەیان بۆ کڕین و فرۆشتن بەکار دەهێنا، ئێمە ڕۆژانە بەبێ پارە هیچمان بۆ نەدەکرا، ئەوان تفەنگیان هەبوو، بەڵام ئێمە لە تفەنگ دەترساین، ئەوان سەگی زۆر گەورە و ئازایان هەبوو هیچ لێی نەدەترسان، بەڵام ئێمە لە مشکیش دەترساین، ئەوان ئاغایان هەبوو ئێمەش قائیمقاممان هەبوو.

ئاغای ئەوان هیچ پەیوەندی بە حکومەتەوە نەبوو، بەڵام قائیمقامی ئێمە نۆکەر و ئاڵقە لە گوێی حکومەت بوو، ئەوان مزگەوتیان نەبوو، بەڵام لە شاری ئێمەدا مزگەوت زۆر بوو، ئەوان شانامەیان نەبوو، بەڵام سەدان هۆنراوەیان لەبەر دەخوێند. ئێمە شانامەمان هەبوو، بەڵام کەس نەیدەخوێندەوە. ئەوان مەڕیان هەبوو، بەڵام گۆشتیان نەدەخوارد، ئێمە مەڕمان نەبوو، بەڵام گۆشتمان دەخوارد. بەم هەموو جیاوازییەوە ئێمە و ئەوان یەکگرتوو بووین، هەموومان ئێرانی بووین. یەکگرتوویی ئەم وڵاتەم زۆر بەلاوە جوان بوو. کە هاتم بۆ پارێزگای فارس تێکەڵی چەند کەسێک بووم کە فارسییان نەدەزانی، پاشان تێگەیشتم کە دانەری بناغەی ئەم وڵاتە دانایی و لێهاتویی پیاوێکی گەورەیە بەناوی کۆرشی گەورە، پیاوێک کە هەموو گەلانی ئێرانی بەزمان و ئایین و ڕەگەزی جیاوازەوە لەژێر یەک ئاڵا و لە یەک وڵاتدا جێگیر کردووە، کە ماوەی (٢٥٠٠) ساڵە بەیەکەوە دەژین بەبێ هێچ کێشە و گیروگرفتێک. هەرگیز خەڵکی ئەم وڵاتەی ئێمە بیریان لەوە نەکردۆتەوە کە چۆن کۆرشی گەرورە (٢٥٠٠) ساڵ لە پێش ئەورووپاوە ئەو بناغەیەی چەسپاندووە، ئەو بە هێزو توانای خۆی ئەم وڵاتەی دامەزراندووە..

بەهەرحاڵ ئەو ڕۆژە گەڕەک بە گەڕەک و ڕەشماڵ بە ڕەشماڵ گەڕاین، گوێدرێژی بەستەزمان باری دەبرد و گیای دەخوارد. ئێمەش بەدوای گوێدرێژەوە بووین، باری پشتی گوێدرێژ کەمی نەدەکرد، مسی تازەمان دەدا بە خڵکەکە و لەبەرامبەردا مسی کۆن و کەشک و ڕۆنمان لێوەردەگرتن، پارە وەرگرتن کەم بوو، خۆ هەر لە دە مامەڵەدا ئەگەر کەسێک پارەی بدایە. خاڵم پارەی وەرنەدەگرت، دەیزانی قازانجی باش لە ئاڵوگۆڕەکەدایە. هەربۆیەش باری گوێدرێژی بەستەزمان سووک نەدەبوو، بەڵکو قورستریش دەبوو، منیش زۆر هیلاک ببووم. حەزمدەکرد وەک شاگرد مسگەرێک بەخشیش وەربگرم. چوار دانە کەشک و چەند کەوچکە ڕۆنم وەرگرت و کردمە دەبەیەکی بچکۆلانەی کۆنەوە. دەمویست ببم بە پیاوێکی کاسبکار، بەڵام هەرگیز کاسبکار نەبووم. خاڵم گوتبووی لەم گەشتەماندا دوو هەفتەمان پێدەچێت، بەڵام وا چاوەڕان دەکرا لانیکەم سێ هەفتە بمێنینەوە، تا هەموو مسەکان دەفرۆشرێن. لە نێو ئەو مسەکۆنانەی کە خاڵم دەیکڕین یا بەئاڵوگۆڕ دەستی دەکەوتن، جاری وا هەبوو پارچە مسی وای تێدابوو کە زۆر کۆن بوو ئەم جۆرە مسە کۆنە نرخ و بایەخێکی تایبەتییان هەبوو. مسە کۆنەکانمان دەشکاندن و پانمان دەکردنەوە بۆ ئەوەی جێگا کەمتر بگرن، بەڵام ئەو پارچانەی کە هونەریی بوون و بایەخێکیان هەبوو نەماندەشکاندن و بەساغی هەڵمان دەگرتن، کاتێک دەمانبردنەوە بۆ شاری یەزد و سپی دەکرانەوە، چەند بەرامبەر لە نرخی خۆیان زیاتریان دەکرد.

خاڵم سینیی مسی تازەی دەدا بەسینی مسی کۆن، پاشان لە ئەسفەهان هەر کیلۆیەک لەو مسەکۆنەی دەدا بە دووسەد و پەنجا کیلۆ مسی خاو، واتە سینیەک دوسەد و پەنجا ئەوەندەی نرخی خۆی دەکردەوە. شارییەکان دەیانویست کڵاو بکەنە سەردێهاتیەکان.

ئێمە لە نێوان گەڕەکەکاندا هاتوچۆمان دەکرد، بەڵام بنکەی سەرەکیمان ڕەشماڵەکەی وەستا ئەسغەر بوو. هەڵبەت وەستا ئەسغەر لە دوو هەفتە زیاتر لە شوێنێکدا نەدەمایەوە و جێگۆڕکێی دەکرد و دەڕۆیشت، جارێکی تر لە شوێنێکی تردا ڕەشماڵی هەڵدەدایەوە. وەستا ئەسغەر تەمەنی (٣٥) ساڵ دەبوو، باڵای بەرز و چوار شانە بوو، دەم و چاوێکی ڕوون و جوانی هەبوو، مووی ڕەش بوو، چاوەکانی ڕەش و گەورە بوون، هەمیشە ڕیشی دەهیشتەوە، هەرگیز نەمدیبوو ڕیشی تاشرابێت، بەڕواڵەت پیاوێکی دیندار و لە خودا ترس بوو، لەکاتی خۆیدا نوێژەکانی دەکرد. بە شاگردەکانیشی دەگوت دەبێت نوێژ بکەن، جگەرە و سەبیلی نەدەکێشا، لەو سەردەمەدا واتا لە دەیەی (١٣٤٠-١٩٦٠) دا سەبیل زۆر برەوی هەبوو. من نزیکەی سی ساڵە کەسم نەدیووە سەبیل بیکێشێت.

وەستا ئەسغەر تاڕادەیەک کەسێکی هێمن بوو، خاوەن خزم و کەسیش بوو، کڕیارەکانی خۆشیاندەویست، ڕەشماڵەکەی پڕ کردبوو لە کەشک و ڕۆن و خوریی و هەموو بەرهەمە ئاژەڵییەکان. هەریەکەم ڕۆژ کە ئێمە گەیشتینە لای ئەو، ئەو بەرهەمێکی زۆری بە هەمان ئۆتۆمبێلدا ناردەوە بۆ یەزد، گوایە لە یەزد هاوبەشێکی تری هەبوو. وەستا ئەسغەر کەسێکی زۆر کاسب بوو، کاتێک ئێمە گەیشتینە لای، ئەو چل ڕۆژ بوو لە یەزدەوە هاتبوو، چوار جار جێگەی خۆی گۆڕی بوو، ئەم شوێنە جێگەی چوارەمی بوو کە ڕەشماڵەکەی لێهەڵدابوو. نازانم خاڵم چۆن جێگاکەی ئەوی دۆزیبووەوە، گوایە هەمان شوفێر لە نێوان یەزد و ئەو ناوچەیەدا لە هاتوچۆدا بووە، شوفێرەکە دەیزانی وەستا ئەسغەر لەکوێیە؟

من شاگردەکانی وەستا ئەسغەرم دەناسین هەرسێکیان ماڵیان لە گەڕەکی خۆمان بوو، دەمزانی ماڵیشیان لە کوێیە. دووان لە شاگردەکانی بێ باوک بوون، ئەوی تریشیان باوکی تلیاکی بوو، قاچێکیشی نەبوو. بۆیە دەبوو ئەو منداڵانە کاربکەن و نانی خۆیان پەیدا بکەن، ئەوان دەبوو هاوکاری ماڵەوەشیان بکردایە. منداڵەکان ڕەزا، عەبدال، مەحمود بوون. ڕەزا و عەبدال تەمەنیان (١٤ -١٥) ساڵ دەبوو، بەڵام مەحمود دوو ساڵ لە ئەوان گەورەتر بوو. کەشوهەوای کوێستان و خواردنی کەشک و شیر و پەنیر ڕەنگوڕووی ئەو منداڵانەی جوان کردبوو. مەحمود تەمەنی (١٦- ١٧) ساڵ بوو، هێشتا ڕیشی بە تەواوی دەرنەهاتبوو، کوڕێکی وریا و چالاک و ڕەنگوڕوویەکی جوان

و کەسێکی پاک و خاوێن بوو، نەچووبووە قوتابخانە. ڕەزا و عەبدال کەمێک سمێڵیان دەرکردبوو، هەردووکیان ڕەشتاڵە و کەمێک قەڵەو بوون، بەگشتی لە سپیکردنەوەی مسدا قورسترین و ناخۆشترین کار، کاری ڕەزا بوو. واتە کاری ئەو پاککردنەوەی ناوەوەی مەنجەڵە گەورەکان بوو. دەبوو هەندێک زیخ بکاتە نێو مەنجەڵەکانەوە و بەپێی پەتی بچێتە ناوی و بە بنەپێکانی بیسوێتەوە. ئەو کوڕانە خۆیان داریان دەبڕیەوە و دەیانکرد بەخەڵوز، بەو خەڵوزە مەنجەڵەکانیان سپی دەکردنەوە..

وەستا ئەسغەر بۆخۆی مامەڵەی کڕین و فرۆشتنی دەکرد، خۆ ئەگەر کاری مسگەریی و چاککردنی مەنجەڵە شکاو هەبووایە هەر خۆی ئەو کارانەشی دەکرد. ئەو بەگشتی لە شوێنێکدا ڕەشماڵەکەی هەڵدەدا و دادەنیشت، هەواڵی دەنارد بۆ خەڵکەکە، کە وا مسگەر هاتووە. ئیتر خەڵکەکە بە باری ولاخ تەشت و مەنجەڵەکانیان دەهێنا بۆلای. وەستا ئەسغەر بە چەند هەفتە جارێک شوێنەکەی خۆی دەگۆڕی، شوێن گۆڕینەکەشی بۆ ئەوە بوو، تاکو زیاتر کڕیارەکانی دەستیان پێی بگات. لە هەوارەکەدا توالێت نەبوو، بۆیە لەبری توالێت دەبوو بچووینایە بۆ چۆڵەوانییەک، من زۆر بە نەبوونی توالێت ناڕەحەت نەبووم، دەبوو سوودمان لە مەسینە وەربگرتایە بۆ چوونە سەرئاو، لەوێ خەڵکەکە وەک سەدەکانی پێش مێژوو دەژیان، دیارە کێشەی توالێت یەکێکە لە کێشە گەورەکانی جیهان.

نزیکەی بیست ڕۆژ لەو ناوچەیە بووین، لەو ماوەیەدا تەنها دوو کەسی خوێندەوارم بینی، ئەم دوو کەسەش شانامەیان دەخوێندەوە. زۆر کەسی تریش شانامەیان لەبەر دەخوێندەوە، بەڵام خوێندەوارییان نەبوو، ئەمانە لە ڕێگای گوێگرتنەوە، ئەو هۆنراوانەیان لەبەرکردبوو. زۆر بەلامەوە جوان بوو کە چەند کەسم بینی فارسی‌یان نەدەزانی و نەیاندەتوانی لەگەڵ ئێمەدا بەزمانی فارسی قسە بکەن، بەڵام شانامەیان لەبەر دەخوێندەوە. هەمووان بە ژن و پیاو و گەورە و بچووکەوە نەخوێندەوار بوون. ئەو کەسانەی فارسی‌یان دەزانی زۆر کەم بوون. خەڵکەکە بە گشتی هەژار بوون، هەژاری و نەبوونی هەموو ئەوناوەی گرتبووەوە. لە هەر چەند ڕەشماڵێکدا تفەنگێک هەبوو. زوو زوو دەنگی تەقەی تفەنگێک دەهات. فیشەکێک ئاراستەی کەوێک یان بزنە کێوییەک دەکرا. مرۆڤ و سروشت هەردووکیان لە ژێر فشاردا بوون. نە ڕادیۆ هەبوو، نە قەڵەم و کاغەز و کتێب. هێشتا خەڵکی نەیاندەزانی ڕۆنی ڕووەک چیە؟ ئەوان تەنها ڕۆنی ئاژەڵیان بینیبوو. شەکر و چا نەبوو، سابوون و تایت نەبوو، خۆ ئەگەر هەشبووایە من نەمبینیبوو، جلوبەرگیشیان جلی خێڵەکی تایبەت بە خۆیان بوو. هەر

کەسێک جلی نوێی بۆ مەراسیمەکان هەبوو، بەڵام بەشێوەیەکی گشتی جلوبەرگیان کۆن بوو. ئەوان ناوی هیچ گەورە پیاوێکیان نەبیستبوو، تەنها ناوەکانی ناسر خان و خوسرەو خانی قەشقاییان بیستبوو. وشەکانی شاهەنشا و وڵات لای ئەوان هیچ مانایەکی نەبوو. رێگا و جادە نەبوو. زۆربەی ئەوخەڵکانەی ئێمە بینیمانن نەیاندەزانی کارەبا چیە؟ تەنها چەند پیاوێکی بەتەمەن کە چووبوون بۆ شار گڵۆپ و کارەبایان بینیبوو، بەڵام زۆربەی ژنان و پیاوان نەیاندەزانی کارەبا چییە؟ لە هەر پەنجا کەسێک یەکێک نەچووبوون بۆ سەردانی شاچراخ و ئیمام رەزا. هەر لەو کێوانە لەدایکدەبوون و هەر لەوێش دەمردن. دیارە چونکە زمانی تورکیم نەدەزانی ئەم شتانە زۆر بە سادەیی تێدەگەیشتم. لە هەر دە کەسێک یەکێک فارسی نەدەزانی، بەڵام کەمێک تێدەگەیشتن. گەورەترین گۆرانکاری بەدرێژایی مێژوویان واتا هەڵوەشانەوەی سیستەمی خێڵەکی بەرێگاوە بوو. چەند ساڵ لەوە دوا هـاوار هەڵسا کە لەوەرگەکان خۆماڵی کراون، ئیتر خانەکان لێکەوتن. واتە پەیوەندی چەند هەزار ساڵەی خێڵەکی رووخا. ئەمەش بنچینەی گۆرانکاریی جۆراوجۆری ژیانی هۆزەکانی ئێران بوو. لە وەرگەکان خۆماڵی کران و خانەکانیش نەمان. خەڵکی هاواریاندەکرد و دەیانگوت مردن بۆ خانەکان. شا پشتیوانی لەو خەڵکە دەکرد. هەمان ئەو خەڵکە پاش حەڤدە ساڵ هاواریاندەکرد مردن بۆ شاهەنشا. دیارە لەو سەردەمەدا کە من شاگرد مسگەر بووم، خانەکان هەموو شتێک بوون. پاشان تێگەیشتم کە گۆرانکاری بنچینەیی بەرێوەیە.

وەستا ئەسغەر لە رەشماڵەکەیدا دانیشتبوو خەریکی کاری خۆی بوو، بەڵام خاڵم بە پێچەوانەی ئەوەوە فرۆشیارێکی گەرۆک بوو، بە رۆژ بارە مسی بە ماڵەکانەوە دەگێرا و شەوانە دەگەرایەوە بۆ لای رەشماڵەکەی وەستا ئەسغەر، بەڵام لە زۆربەی شوێنەکان وا رێدەکەوت تا دوو شەو لە رەشماڵی کۆچەرییەکاندا دەماینەوە. خەڵکەکە زۆر هەژار بوون، سەرەتای وەرزی هاوین بوو، هەوا فێنک بوو، گژوگیا زۆر بوو، مەرەکان شیری زۆریان تێدا بوو، هەر ماڵێک (٣٠-٤٠) سەر مەریان هەبوو، هەموو ژیانیان لەسەر ئەو چەند سەر مەرە بوو.

لە بـازاردا جگە لە شەکر و چاو کەمێک ئارد هیچ شتێکی تریان نەدەکری، لە هەموو تەمەنیاندا سێو، پرتەقاڵ، هەنجیر و میوەکانی تریان نەدەخوارد. بەڵام میوەی کێوی لە شاخەکان هەبوون، ئەوانەیان دەخـوارد. تایت و سابوونیان هەر نەدیبوو، هەر نەشیاندەزانی شتێک بەوناوەوە هەیە. بەو شێوەیە ژیانیان لەسەر بەخێوکردنی (٣٠-٤٠) سەر مەر بوو. کرێی خانوو ئاو و کارەبایان نەدەدا. پاش چەند ساڵێک ئەم

خەڵکە هەژارە هاتنە شار و گوتیان بڕوخێ شا. کەسێک کە ئەوانی هێنایە شار و فێری خۆشگوزەرانی کردن هەر ئەو کەسە بەدەستی ئەمانە لەنێو چوو. خۆ ئەگەر ئەوان هەر لەو کێو و کەژە بوونایە و نەهاتنایەتە نێو شارەکان، ئەوا بێدەنگ دەبوون و نەیاندەگوت مردن بۆ شا. کاتێک ٧٥٪ دانیشتووانی ئێران لە گوندەکاندا دەژیان. هوەیدای سەرۆک وەزیران گوتی دەبێت لادێکان بکەینە ٢٥٪. ئەو هەوڵی زۆریدا تا ئامانجەکەی بهێنێتە دی. کاتێک دانیشتووانی گوندەکانی کردە ٥٠٪ و دانیشتووانی شارەکانیشی کردە ٥٠٪ دەنگی مردن بۆ شا بەرز بۆوە.

من ئەو کاتە تەنها سەرسامی سروشت بووم، ئێستا بیری لێدەکەمەوە کە بۆچی ئەو کاتە ئەوەندە سروشتم بەلاوە جوان بوو. هۆیەکەشی ئەوە بووە ئەوکاتە ئێمە لە یەزد تەنها لە ژوورێکی خشتی قوڕدا بووین، کارەبامان نەبوو، شەوانە ژوورەکەمان بێ ڕووناکی بوو، ئاوی بۆرییمان نەبوو، خوشک و برام نەبوو، لە هەوای گەرمی یەزددا و لە کۆڵانی خۆڵەپەتە و تەپوتۆزاویدا، لەو ژوورە تاریکەدا و لەو بێ خوشک و براو بێ باوکییەدا، لەو بێ پارە و نەبوونیەدا، کێوەکانی ناوچەی فارسم بە بەهەشت دەزانی. خۆ ئێستاش کە نیوەی جیهان گەڕاوم لە ئەفریقای باشوور و دەوروبەری ئەمازۆن و چین و یابان و ڕوسیا، هەموو ئەورووپام بینیوە کەچی وا هەست دەکەم کێوەکانی فارس و خۆرئاوا و باکووری ئێران بەهەشتن. قەشقاییەکان بە هۆی پاکی و میواندۆستییانەوە خەڵکانی بەهەشتین. پیاوانی خێڵەکی بەو هەموو هەژاری و نەبوونییەی خۆیانەوە لە ژێر ڕەشماڵێک و لەسەر پارچە لبادێک دادەنیشن. ژنانیش بە هەزار زەحمەت و کوێرەوەریی ئاگرێکیان دەکردەوە، تاکو چایەک ئامادە بکەن، چایەکەشیان پێشکەش بە میوانەکەیان دەکرد. ژنان نانی گەرم و تازەیان بۆ میوانەکانیان ئامادە دەکرد و بە پەنیر و ڕۆنەکەرەوە پێشکەشیان دەکرد. خۆ ئەگەر خاوەن ماڵ ئامادەبووایە ئەوا قاورمەش پەیدا دەبوو. هەندێک جاریش گۆشتیان دەکرد بە کەباب و سەرەتا بۆ میوانەکانیان دادەنا. خێڵەکیەکان لە دڵەوە پێشوازییان لە میوانەکانیان دەکرد، ئەگەر میوانەکەشیان نەناسیبایە. ئەوان ناوی ئێمەیان نەدەزانی. دایک و باوکی ئێمەیان نەدەناسی. لە زمانی ئێمە تێنەدەگەیشتن، یا کەمێک تێدەگەیشتن. نەیاندەزانی شاری ئێمە لە کوێیە، هۆز و بەرەبابی ئێمەیان نەدەناسی، نەیاندەزانی ئێمە سەر بە کام ئاینین، نەیاندەزانی بیرو باوەڕمان چیە؟ ئەوان بۆ ئەو هەموو خزمەتەیان پارەیان لە ئێمە وەرنەدەگرت، باشترین خواردنیان پێشکەشی ئێمە دەکرد، باشترین نوێنی خۆیان دەدا بە ئێمە پێی بخەوین، ئەو خەڵکە لەو سەر زەمینە، لە کەنار ئەو جۆگە ئاوە جوانە ڕەشماڵیان هەڵدا بوو،

دەوروبەریشیان هەموو گوڵ و گوڵزار بوو، دارستانی دەوروبەریشیان ئەوەندە چڕ نەبوو ببێتە جێگای ئاژەڵی دڕندە، ئەوەندەش کەم دار و درەخت نەبوو کە شوێنەکە وەک بیابان دەر بکەوێت. لەو شوێنە دەنگێکی ناخۆش نەدەبیسترا. هەوا زۆر پاک بوو. سروشتێکی یەکجار جوان بوو. ئەو خەڵکە هەژار و کەمدەستە دەموچاویان بە هەتاو سووتابوو. ئەوان هەموو کەسی گەورە و پتەو و بەخۆوە بوون. چاپووک و وریا بوون، وەک بزنە کیوی بە شاخدا هەڵدەگەڕان. وەک پڵنگ بە درەختە بەرزەکاندا سەردەکەوتن. خۆشی و خۆشبەختی بەڕوویانەوە دیار بوو. هەمووان پێدەکەنین و زەردەخەنەیان بە سەر لێوەوە بوو. کچان و کوڕانیان لە زمانی ئێمە تێنەدەگەیشتن، بەڵام داوایان لێدەکردم لەگەڵیاندا بچم بۆ یاری، لە هەمان کاتدا بەڕێز و داوێنپاک بوون. ئەگەر ئەم شوێنە بەهەشت نەبووبێت، ئەی بەهەشت کوێیە؟ ئەگەر ئەو خەڵکە فریشتە نەبووبن، ئەی فریشتە چۆنە؟ یاسای ئەم بەهەشتەش ئێمەی خەڵکی شار پێشێلی دەکەین. ئێمە کەسانێک بووین فێڵمان لە ئەوان دەکرد. مسەکانی خۆمان بە نرخێکی گران بە ئەوان دەفرۆشت، ڕۆن و کەشک و خوریی ئەوانمان بە نرخێکی زۆر هەرزان و بە قەرز لێدەکڕین. ئێمە شارنشینی پێشکەوتوو بووین و ئەوانیش خێڵەکی کێوی. بێ هۆ نییە کە نیما یوسیج گوتویەتی:

**من لە زەبوونانی شارەکان نیم، یادەوەریی پەروەردەی کوێستانەکانم**

من ئەوەندە عاشقی ئەو خەڵکە خێڵەکیانە بووم، کاتێک چووم بۆ پاریس تێزی دکتۆراکەم لە سەر هۆزە کۆچەرییەکان نووسی. وا هەست دەکەم لە هەر شوێنێک عیشق، خۆشەویستی، میواندۆستی، هاوژینی، بوونیان هەبێت و پەیوەندی بە پارەوە نەبێت، ئەو شوێنە بەهەشتە. ئایا لە بەهەشتیش پارە هەیە؟ وا هەست دەکەم ئێمەی ئاژەڵی دوو پێ لەو دنیای تریش فریشتەکان بۆ مەرامی تایبەتی خۆمان بەکاردەهێنین. لەوێش نووسینگەی کڕین و فرۆشتن دادەنێین، مامەڵە بە زەوی دۆزەخ و بەهەشتەوە دەکەین. کاتی خۆرئاوابوون مێگەلەکان دەگەڕانەوە بۆ ناو هەوارەکە. منیش لەگەڵ کوڕ و کچانی قەشقایی دەچوومە نێو مێگەلەکە و سەری مەڕەکانمان دەگرت بۆ بێرییەکان تاکو مەڕەکان بدۆشن. ئای ئەو کارەم چەندە پێخۆش بوو. یا ئەو یارییانەی شەوانە لە ژێر تیشکی مانگە شەودا دەمانکرد. بەڕاستی ژیانی منداڵی ژیانێکی بەهەشتیە. ئەگەر من ئەو کاتە چەند ساڵێک گەورەتر دەبووم وەک ئەو کاتەی کە چووم بۆ کوردستان، ٩٠٪

ی هەستم پەیوەست دەبوو بە عیشق و عیشقبازییەوە. ئەوا ئێستا دەبوو یادەوەرییەکانم بە جۆرێکی تر بنووسیایەتەوە. ئیتر ئەوە ژیانی منداڵییە و لە هەموو شتێک بێ هەواڵم و هیچ کەسێکم وە بیر نایاتەوە.

دوو شەو و دوو ڕۆژ بوو لە ڕەشماڵەکەی وەستا ئەسغەر دوورکەوتبووینەوە. شەوێک میوانی ماڵێک بووین لە نێو هۆزە قەشقاییەکاندا. ئەو ماڵە هەموویان فارسی‌یان بە باشی دەزانی. شەو پیاوی خاوەن ماڵ شانامەی بۆ خوێندینەوە، ئەو پیاوە کەسێکی زیرەک و وریا بوو، شارەزاییەکی باشی لە مێژوودا هەبوو، شتی زۆر دەزانی. من بۆ یەکەمجار بە هۆی ئەوەوە ناوی ناسر خان و خەسرەو خانی قەشقاییم لێرە بەر گوێ کەوت، بەڵام من بەو تەمەنی منداڵییە سەرم لەو بەسەرهاتانە دەرنەدەچوو کە ئەو دەیگێڕانەوە. ئەو پیاوە زۆر بە جوانی شانامەی بۆ دەخوێندینەوە. لە ڕەشماڵەکانی تریشەوە چەند کەسێک هاتبوون بۆ گوێگرتن لە شانامە. من ئێستا نرخی ئەم کارانە دەزانم. لەنێو جەرگەی کێوەکانی فارسدا لە دەیەی (١٣٣٠-١٩٥١) دا و لە نێوان هۆزە قەشقاییە تورک زمانەکاندا، پیاوێک شانامە دەخوێندەوە و شانازی پێوە دەکرد. ئەم پیاوە زۆر لەگەڵماندا میهرەبان بوو، نە مەنجەڵێکی لێکڕین و نەشتێکی پێفرۆشتین، دیار بوو ئەو هاتووچۆی شاری دەکرد، بەڵام وەک میوانێکی شاهانە خزمەتی کردین، شەو مەڕێکی بۆ سەربڕین و کەبابی بۆ دروستکردین.

بەیانی زوو هەڵساین و وڵاخەکەمان بارکرد، خاڵم مسە تازەکانی بە چەند شتی تر ئاڵوگۆڕ دەکرد. گوێدرێژی داماویش هەرگیز باری سوکتر نەدەبوو، بەڵکو لە گەڕانەوەدا باری قورستر دەبوو. منیش ئارەزووم وابوو لەسەر بارەکەوە سواری گوێدرێژە بەستەزمانەکە ببم، چونکە قاچەکانم ئازاریان هەبوو. خاڵم بە ناچاری هەڵیدەگرتم و دەیخستمیە سەر پشتی گوێدرێژەکە. گوێدرێژی داماویش هێزی تیا نەمابوو، نەیدەتوانی بڕوات و جۆشمان پێنەدەدا. خاڵم وای پێباش بوو بەو ڕێگایەدا نەگەڕێینەوە کە پێیدا هاتبووین، بەڵکو لە ڕێگایەکی ترەوە بڕۆین، تاکو خەڵکی زیاتر ببینین و مسەکان بە تەواوی بفرۆشین. بەیانی زوو بەڕێکەوتبووین، دەبوو بۆ ئێوارە بگەینە ڕەشماڵەکەی وەستا ئەسغەر. خاڵم دۆڵێکی گرتەبەر و ویستی لەو دۆڵەوە بڕۆین، ئەم ڕێگایە نزیکتر بوو، بەڵام ڕێگایەکی ناخۆشبوو. پاش ماوەیەک ڕۆیشتن لە دۆڵێکەوە سەرەو خوار بووینەوە، چاومان لێبوو لە خوارەوە چەند ڕەشماڵێک هەبوون. بە بینینی ئەو ڕەشماڵانە ئێمە خۆشحاڵ بووین. دوای نیوەڕۆ بوو گەیشتینە یەکەم ڕەشماڵ. نازانم چۆن بوو کە زۆربەی ئەو خەڵکەی لە ئەوێ دەژیان فارسی‌یان دەزانی، ئەوانیش هەموویان قەشقایی

بوون. ئەوان جۆرە کڵاوێکی تایبەتیان لە سەردا بوو، بەکڵاوەکەی سەریان زانیم کە قەشقایین. پێش ئەوەی بگەینە یەکەم ڕەشماڵ شوانێک پێیگوتین کە منداڵێکی فارسی‌یان لەو کێوە بە برینداری دۆزیوەتەوە و وا لە ڕەشماڵەکەی خوارەوە دایانناوە. خاڵم بەبیستنی ئەم هەواڵە زۆر غەمبار بوو، بەخێرایی کەوتە لێخوڕینی گوێدرێژەکە. لە چەند کەسێکمان پرسی منداڵە بریندارەکە لە کوێیە؟ هەمووان دەیانزانی منداڵەکە لەکوێیە؟ دەیانگوت وا لەو ڕەشماڵەی خوارەوەیە. پاش کاتژمێرێک گەیشتینە ڕەشماڵەکەی خوارەوە، چووینە نێو ڕەشماڵەی ئەو ڕەشماڵەی کە منداڵەکەی لێبوو، خۆشبەختانە خاوەن ماڵ فارسی دەزانی. کە سەیرمان کرد، بینیمان عەبدال بە سەروچاوی خوێناوی و دەستی شکاوەوە لەوێ نووستووە، چەند تەختە دارێکیان بە دەستییەوە پێچابوو. بەیانی پێش هەتاوکەوتن شوانێک عەبدالی دۆزیبووەوە کە لە شاخەوە هەڵدێرا بوو. ئەویش سواری وڵاخێکی کردبوو هێنابوویەوە بۆ نێو ڕەشماڵەکانی خۆیان. خەڵکەکەش فریای کەوتبوون و دەموچاویان بۆ شۆری بوو، خوێنەکەیان پاک کردبۆوە، کراسەکەی خۆی دڕابوو کراسێکی تریان بۆ لەبەر کردبوو. دەستیان هێنابووەوە جێی خۆی و بۆیان پێچابوو. عەبدال خواردنی خواردبوو. خاوەن ماڵ گوتی ئەوە دوو کاتژمێر دەبێت نووستووە. بە خەڵکەکەمان گوت ئەم کوڕە هاوشاری خۆمانە و ناسیاومانە. عەبدال خۆشی بە خەڵکەکەی گوتبوو کە شاگرد مسگەرە. پاش ماوەیەکی کەم عەبدال بەخەبەر هات کە چاوی بە ئێمە کەوت دەستیکرد بە گریان. خاڵم گوتی منداڵی نەگبەت تۆ بۆچی بەو شەوە و بە ناشارەزایی ڕووتکردۆتە ئەو شاخە؟ عەبدال دەگریا و هەموو قاچیشی بریندار بوو، بەڵام برینەکانی قوڵ نەبوو، پێڵاویشی لە پێدا نەبوو، بەپێی پەتی لە شاخەکەوە هاتبووەوە، بنە پێکانی هەموو بریندار ببوون. خاڵم دووبارە لێی پرسییەوە کە بۆچی کەوتۆتە ئەو شاخ و کێوە؟ بۆچی هەڵاتووە؟ عەبدال هیچی نەگوت.

نزیکی ئێوارە بوو سەگوەڕ دەستیپێکرد، مێگەلە مەڕەکەیان هێنایەوە بۆ دۆشین، ماڵەکە هەموویان ڕۆیشتن بۆ دۆشینی مەڕەکانیان. ڕەشماڵەکە جگە لە ئێمە کەسی تری تێدا نەما بوو. خاڵم بە عەبدالی گوت ئەگەر حاڵت باشترە و دەتوانیت، هەڵسە با هەر ئێستا بڕۆین، تۆ سوار گوێدرێژەکەمان دەکەین و حەز دەکەیت بە ڕێگای کێوەکەوە دەڕۆین بە یەک کاتژمێر دەگەینە ڕەشماڵەکەی وەستا ئەسغەر، هێشتا تاریک نەبووە زوو دەگەین. عەبدال گوتی من نایەم بۆ ڕەشماڵەکەی ئەسغەرە سەگباب، من دەگەڕێمەوە بۆ شار و دەچمەوە بۆ لای دایکم. عەبدال و مەحمود باوکیان نەمابوو. باوکی ڕەزاش قاچێکی نەبوو تلیاک کێش بوو، کاریشی دارشکاندن بوو. چەند ساڵێک

لەوەپێش لەکاتی دار شکاندندا تەورەکەی لە دەست دەردەچێت و بەر قاچی دەکەوێت و ئێسقانی قاچی شکاند بوو، پاشان قاچی وردە وردە ڕەش بووە، بۆیە دکتۆر ناچار بووە قاچی ببڕێتەوە، هەر ئەو کاتە لەبری دەرمانی ئازار شکێن تلیاکیان پێدابوو، بۆیە ببووە کەسێکی تلیاکی و بێ قاچ، کوڕەکەشی ڕێگای دەشت و دەری گرتۆتەبەر تا پارووە نانێک بۆ خۆی پەیدا بکات و گەر لە تواناشیدا بوو هاوکارییەکی کەمی خێزانەکەشی بکات.

خالّم گوتی ڕۆڵە گیان هەڵسە با بڕۆین گەر تاریک دابێت ناچاردەبین شەو لێرە بمێنینەوە. عەبدال گوتی من نایەم بۆ ڕەشماڵی ئەو سەگبابە. خالّم گوتی بۆچی شەڕتان کردووە؟ عەبدال گوتی ئەسغەر لەگەڵ ڕەزادا کاری بەدڕەوشتی دەکات، دوێنێ شەو ویستی هەمان کار لەگەڵ مەحمودیشدا بکات، مەحمودیش چەند دارێکی لە ئەسغەر دا و ڕایکرد و ڕۆیشت. منیش بە ئەسغەرم گوت وا دەڕۆم بۆ لای ئەو خەڵکە و شکاتت لێدەکەم. ئەویش دەستیکرد بە لێدانم و سەر و چاوی هەموو بریندار کردم و منیش بە ناچاری ڕامکرد و ڕووومکردە شاخەکە، دونیاش تاریک بوو، هیچ شوێنێکم نەدەبینی زۆریش دەترسام، کاتێک سەر کەوتمە سەر شاخەکە گوێم لە دەنگی ئاژەڵ و حەپەی سەگ بوو، منیش بەدەم دەنگەکەوە ڕۆیشتم تا خۆم بگەیەنمە ئاوەدانی، بەڵام لە بەرزاییەکەوە کەوتمە خوارەوە، ئیتر ئاگام لە هیچ شتێک نەما کاتێک بە هۆش خۆم هاتمەوە شوانێک منی سواری گوێدرێژێک کردبوو، دەیهێنام بەرەو ڕەشماڵەکان. سەگەکان منیان دۆزیبووەوە. شوانەکەش بە دەنگی سەگەکانەوە بەرەو لای من هاتبوو منی دۆزیبووەوە. خالّم گوتی عەبدال تۆ درۆ دەکەیت وەستا ئەسغەر کاری بەدڕەوشتی ناکات، ئەو پیاوێکی نوێژکەرە و هەمیشە لە کاتی خۆیدا نوێژەکانی دەکات.

من ئەو کاتە منداڵ بووم هیچ لە مانای کاری بەدڕەوشتی تێنەدەگەیشتم. عەبدال گوتی بە خودا دەیان جار بۆ خۆم ئاگام لێبووە، هەی هەی تۆ دەڵێیت چی لە کاتی خۆیدا نوێژەکانی دەکات و بێناموسی ناکات؟ خالّم گوتی خۆ لای کەس باسی ئەم کێشەیەت نەکردووە. عەبدال گوتی نەخێر لای هیچ کەسێک باسم نەکردووە، بەشوانەکەشم گوت چووم بۆ ئەو شاخەو هەڵدێراوم. خالّم گوتی خۆ ئەگەر خەڵکی ئەم ناوچەیە بەو کێشەیە بزانن ئەوا یەک ڕاست وەستا ئەسغەر دەکوژن و لێرەدا خوێن دەڕژێ. بۆیە لای هیچ کەسێک باسی نەکەیت تا دەگەڕێینەوە بۆ شار. بە بیستنی ئەم هەواڵە خالّم پێی باش بوو شەو بمێنینەوە و نەڕۆین، بۆیە داوای لە خاوەن ماڵ کرد کە مۆڵەتمان بدات شەو لەلای ئەوان بمێنینەوە. خاوەن ماڵ گوتی بەسەرچاو لە خزمەتداین، دوای

ئەوەی کە شیر دۆشین تەواو بوو نانی ئێوارەیان پێداین، نانخواردنەکەشمان شیر و پەنیر بوو، پاشان جێگایان بۆ ڕاخستین. شەو بۆ نووستن ژنەکانیان چوون بۆ ماڵێکی دراوسێیان، ئێمە و پیاوەکانی ئەو دوو ماڵەش بە یەکەوە لە هەمان ڕەشماڵدا نووستین. عەبدال کەمێک باشتر ببوو، بەڵام دەستی ئازاری هەبوو. ئەو پیاوانە گوتیان دەستی شکاوە، بەڵام ئەو جەڕاحەی ئێمە زۆر شارەزا و کارامەیە، دەستی هێناوەتەوە جێگای خۆی، بە دڵنیاییەوە پاش چەند ڕۆژێکی تر باش دەبێت.

بەیانی زوو پێش خۆرهەڵهاتن ژنان ویستیان مەشکە بژێنن. خاڵم گوتی با زوو بڕۆین. خاوەن ماڵ جوتێک پێڵاوی هێنا کە پڕ بە پێی عەبدال بوون، عەبدال پێڵاوەکانی لە پێکرد، خاوەن ماڵ گوتی تا نانی بەیانی نەخۆن نابێ بڕۆن. بەزوویی نان و چا ئامادەکرا، نانمان خوارد. ژنێکی بە تەمەن هەندێک گیا کێوی کوڵاند و لەگەڵ هەنگوین و نیو کاسە شیردا تێکەڵی کرد و دەرخـواردی عەبدالی دا، وەک ئـەوەی خزمەتی نەوەیەکی خۆی بکات. بەسەر سەریەوە وەستا تا عەبدال دەرمانەکەی بە تەواوی خـوارد. خاڵم بارەکەی بە جۆرێک بارکردبوو کە عەبدال بتوانێت لەسەر بارەکەوە سوار ببێت، خۆشی کوڵێکی لە کۆڵی خۆی نا، تاکو بە تەوای جێگەی عەبدال ببێتەوە، عەبدالی سواری گوێدرێژەکە کرد و هێشتا هەتاو نەکەوتبوو کە ڕێگای کێوەکەمان گرتەبەر. خاڵم گوێدرێژەکەی لێدەخوڕی، گەیشتینە چەند ڕەشماڵێک سڵاومان لێکردن و بەلایاندا تێپەڕین. خاڵم کوڵێکی بە کۆڵەوە بو تەواو ماندوو ببوو، ئارەقەی لێدەچۆڕا، پیاوێک فەرمووی لێکردین بۆ ژێر ڕەشماڵەکەی خۆی. ئێمەش لاماندا و دانیشتین، چا و نقوڵیان پێداین. هەوا خۆش بوو، سەر زەوی سەوز دەچۆوە و دار و درەخت سەوز و تێرئاو بوون. هاژەی ئاوی جۆگەکان کە بەگوێماندا گوزەری دەکرد، هەستێکی خۆشی پێدەبەخشین، لە پشتی هەر بەردێکەوە قاسپەی کەو دەهات، جوانیی سروشت تەواو سەرمەستی کردبووم، ئەو سروشتە جوانە هێشتا بە دەستی مرۆڤ نە شێوێنرا بوو، چاوێکم لەسەر جوانی سروشت بوو، چاوەکەی دیکەشم لای عەبدالی دەست شکاو بوو، عەبدالی داماو ئازاری زۆر بوو، لەبەرخۆیەوە هەر دەیناڵاند، چەند جارێکیش خەریکبوو لەسەر کەرەکەوە بکەوێتە خوارەوە. خاڵم بە کۆڵی قورسەوە ئارەقەی لێ دەچۆڕا، بەداوێنی کێوەکەدا سەردەکەوتین، لە هەمان کاتدا خاڵم زۆر ئاگاداری عەبدال بوو، نەکا لە سەر گوێدرێژەکەوە بەربێتەوە. هەندێک مرۆڤ بۆ پەیداکردنی پاروە نانێک دەبێت چ ڕەنجێک بکێشن؟ هەندێکیش دەبێت خۆیان و شەرەفی خۆیان بفرۆشن.

منیش زۆر ماندوو و شەکەت و نیگەران بووم. وام بیردەکردەوە کە لە نێوانی

خاڵم و وەستا ئەسغەردا شەڕێک ڕوودەدات. گەیشتینە لای ڕەشماڵێک، مەڕ و ماڵاتەکەیان هەموو لە بەردەم ڕەشماڵەکەدا کۆببوونەوە، سەگەکانیان پەلاماریان داین و گوێدرێژەکە لە ترسا دەرپەڕی و عەبدالی داماویش لەسەر گوێدرێژەکە کەوتە خوارەوە و دەستە شکاوەکەی کولایەوە لە تاو ئازار یەک بە خۆی هاواری کرد. چەند کەسێک لە ڕەشماڵەکە هاتنە دەرەوە، ژنێک پەلاماری عەبدالی داو هەڵیگرتەوە و بە تورکی هەندێک قسەی کرد. پاشان پیاوێک هات و گوتی ئەم منداڵە بەسەزمانە بۆچی وای بەسەر هاتووە؟ خاوەن ماڵ ئێمەیان بردە نێو ڕەشماڵەکەوە و پێشوازییەکی باشیان لێکردین. عەبدال هێزی تیا نەمابوو. هەندێک ڕۆنەکەرە و گۆشتی مریشکیان بۆ هێنا، خواردی. ناچار شەو و ڕۆژێکیش لەو ماڵە ماینەوە. خاڵم پێی ناخۆش نەبوو کە ئەو ڕۆژە ماینەوە. خاوەن ماڵەکە زۆر هەژار بوون، ڕەشماڵەکەیان زۆر بچووک بوو، لە چەند شوێنێکیشەوە دڕابوو. یەکێک لە پیاوانی ماڵەکە ڕاوچی بوو، پارچە گۆشتێکی هێنا و چەند قسەیەکی کرد. خاڵم گوتی ئەوە دەڵێت خودا ڕسقی میوان دەنێرێت. ژنێکی بەتەمەن برینەکانی عەبدالی بە ئاو و پارچە پەڕۆیەک شۆری و ڕۆن و هەنگوینی بۆ هێنا و پێیگوت بیخوات. بۆ سبەینێ عەبدال بوو بە کەسێکی تر، دەستی لە ملی دا بوو، بەڵام وریا و بە هۆش بوو. بەیانی زوو بەڕێکەوتین ڕێگاکەمان تا ئەو شوێنەی کەلوپەلەکانمان لێدانا بوو زۆر دوور نەبوو. ڕێگاکەش نشێو و سەربەرەو خوار بوو، بە ماوەیەکی کەم گەیشتینە لای ڕەشماڵەکەی وەستا ئەسغەر. خاڵم گوتی نەوەک عەبدال قسەیەک بکات، بۆیە یەکڕاست نەچووینە لای ڕەشماڵەکەی وەستا ئەسغەر، سەرەتا چووین بارە مسەکەمان لە شوێنێک داگرت، پاشان لە ڕووبارەکە پەڕینەوە و چووین بۆ لای وەستا ئەسغەر. وەستا ئەسغەر خەریکی کاری مسگەری بوو، مەنجەڵێکی گەورەی لەبەر دەستدا بوو خەریکی سپیکردنەوەی بوو. ڕەزاش جوێنی پێدەدا و مەحمودیش لەوێ نەبوو. عەبدال دەیگوت من نایەم بۆ لای ڕەشماڵی ئەو سەگبابە، دەگەڕێمەوە بۆ لای دایکم. سڵاومان لە وەستا ئەسغەر کرد و ئەویش گوتی باشبوو هاتیتەوە چونکە من دەمەوێت لێرە باربکەم و بڕۆم، نەمدەزانی چی لە مسەکانی تۆ بکەم؟ ئەسغەر ڕووی کردە عەبدال و گوتی کەری کوڕی کەر ئەوە لە کوێ بوویت؟ سێ ڕۆژە من لەو کێوانەدا بەشوێن تۆدا دەگەڕێم؟ تۆ دەزانی چیت بەسەر مندا هێناوە؟ ئەی بۆچی دەستت لە ملتدایە؟ عەبدال هیچ قسەی نەکرد و بێدەنگ وەستا بوو. خاڵم گوتی ئەی مەحمود لەکوێیە؟ وەستا ئەسغەر گوتی نازانم ئەم دوو کەرە سێ ڕۆژە لێرە ڕایانکردووە و ڕۆیشتوون و منیشیان دەربەدەری ئەو کێوانە کردووە، ئەوەتا تۆ

ئەمەیانت بە دەستی شکاوەوە هێناوەتەوە و ئەوی تریان نازانم بۆ کوێ ڕۆیشتووە؟ ئەسغەر پیاڵە چایەکی بۆ خالم تێکرد و عەبدال گوتی من دەمەوێت بگەڕێمەوە بۆ شار. ئەسغەر گوتی ناماقوڵت کرد، چۆن دەتوانی بگەڕێیتەوە؟ من پێش ئەوەی بێین بۆ ئێرە دووسەد تومەنم داوە بە دایکت، بۆیە ناچاریت تا کۆتایی هاوین لێرە بیت و کارم بۆ بکەیت. عەبدال گوتی من کار ناکەم. وەستا ئەسغەر دارێکی هەڵگرت و پەلاماری عەبدالی داو گوتی ئاغا غولام ئاگات لێیە شاگردانی ئەم سەردەمە چەندە بێ چاوڕوون؟ عەبدال ڕایکرد و بیست مەتر لە ئەسغەر دوور کەوتەوە، گوتی هۆی پیاوی زللەی نامەرد یا ئێستا تەواوی کرێکەم دەدەیتێ و ڕەوانەی شارم دەکەیتەوە یا ئەوەتا دەچمە ناو ئەو خەڵکەوە و هاواردەکەم و دەڵێم وەستا ئەسغەر کەسێکی نامەرد و ناپاکە و دەیەوێت کاری بەدڕەوشتی لەگەڵ ئێمەدا بکات. وەستا ئەسغەر گوتی بڕۆ چی دەڵێیت بیڵێ مەگەر من ویستومە چی بکەم لەگەڵ ئێوەدا؟ عەبدال گوتی هەر ئەو کارەی لەگەڵ ڕەزادا کردت، بەلام ڕەزا لە تۆ دەترسێت دەنا ئەویش لەگەڵ مندا دەهات، ئەوەتا ڕەزا خۆیشی دەڵێت کە تۆ کاری بەدڕەوشتی لەگەڵدا دەکەیت. ئەسغەر بەردێکی هەڵگرت و عەبداڵیش ڕایکرد بەرەو ڕووبارەکە. خاڵیشم بە شوێنیاندا ڕایکرد. منیش ماندوو و شەکەت لە پەنایەکەوە دانیشتبووم. لە ڕەزام پرسی مانای ئەو قسانە چییە کە عەبدال دەیانکات؟ ڕەزا دەستیکرد بە گریان و بەگریانەوە جوێنی دەدا و دەیگوت دەبێ ئەم ئەسغەرە سەگبابە بکوژین. پاشان خالم و ئەسغەر و عەبدال گەڕانەوە. خالم گوتی من مسەکانم لە تەواو بووندایە، ئەوەی ماومە تەنها دوو بار دەبێت، وا دەچم دوو ولاخ بەکرێدەگرم و مسەکانم باردەکەم و دەڕۆم، ئەم دوو منداڵەش لەگەڵ خۆمدا دەبەم و بەرەو جادەکە دەڕۆین، ئەم مسانەش کە ماوەتەوە لە ڕێگادا دەیانفرۆشم و لەسەر جادە ئۆتوبێلم دەستدەکەوێت و دەگەڕێمەوە بۆ یەزد. تۆش هەر کارێکت دەوێت بیکە، من دەبێت هەرچۆنێک بێت مەحمودیش بدۆزمەوە. عەبدال گوتی دڵنیابە مەحمود نادۆزیتەوە چونکە کاتێک ڕایکرد گوتی دەچم بۆ شیراز. وەستا ئەسغەر زۆر ترسابوو، سەرەتا ویستی بەگژ خالمدا بچێت، بەلام خالم بە توورەییەوە پێیگوت ئەگەر زۆر لە سەری بڕۆیت و نەهێڵیت ئەم منداڵانە لەگەڵ خۆمدا ببەمەوە بۆ یەزد ئەوا لای ئەم کۆچەرییانە شکاتت لێدەکەم، ئەو کاتە خۆت دەزانی چیت لێدەکەن. وەستا ئەسغەریش خێرا خێرا سوێندی بە خودا و بە پێغەمبەر و بە ئیمام عەباس دەخوارد، دەیگوت ئەم عەبدالە وەکو سەگ درۆ دەکات. ئنجا وەستا ئەسغەر ڕووی کردە ڕەزا و پێیگوت کەری بێئەقڵ تۆ بۆ قسە ناکەیت و ناڵێیت عەبدال درۆ دەکات. لەو کاتە دا ڕەزا شیشە ئاسنێکی

لە کوورە ئاگرەکەدا ئەمدیواودیوو دەکرد جوان سوور ببووەوە، وەک پشکۆی لێهات بوو، لە ناکاو شیشە سوورەوەبووەکەی بەهەموو هێزی خۆی کێشا بە دەموچاوی وەستا ئەسغەردا و گۆشت و پێستی دەموچاوی وەستا ئەسغەر هەمووی سووتا، ڕەزا ویستی بۆ جاری دووەمیش شیشەکەی پێدا بکاتەوە، بەڵام خالّم خێرا مەچەکی گرت و نەیهێشت. ڕەزا دەگریا و ئەسغەریش لە تاو ئازار هەردوو دەستی بە دەم وچاوی خۆیەوە گرتبوو بە چوار دەوری خۆیدا دەسوڕایەوە و هاواری دەکرد، باوکەڕۆ سووتام، ڕەزا دەستی ڕاتەکاند و دەستی لە دەستی خالّم کردەوە و شیشەکەی هەڵگرتەوە و ئەمجارە شیشەکەی کرد بە ڕانی وەستا ئەسغەردا چەند سانتیمەترێک شیشەکە چووە گۆشتەوە، دەنگی هاوار هاوار و بۆنی گۆشتی سووتاوی وەستا ئەسغەر هەموو ڕەشماڵنشینانی بە ئاگا هێنا. ڕەزاش بەردەوام جوێنی دەدا. خالّم ڕەزای بێدەنگ کرد، وەستا ئەسغەریش لە تاو ئازار لەسەر زەوی کەوتبوو تلی دەدا. عەبدال بەردێکی هەڵگرتبو بە تاکە دەستێکەوە ویستی بیکێشیت بەسەری ئەسغەردا، وەستا ئەسغەر لە پێ کەوتبوو، هیچ توانایەکی نەما بوو. ئەو دوو منداڵەش وەک شێریان لێهاتبوو. ڕەزا هەرچی بەردەست بکەوتایە دەیکێشا بە سەری وەستا ئەسغەردا. ئەو منداڵانە پێشتر لە وەستا ئەسغەر دەترسان، بەڵام لەو کاتەدا ترسیان شکا بوو. وەستا ئەسغەر بە دەموچاوی سووتاوەوە، بە وەقاچی بریندارەوە هێزی تیا نەمابوو، لەسەر زەوی کەوتبوو، تەنها ناڵە و ئاخ و ئۆفی دەهات. خۆ ئەگەر ئەو منداڵانە ڕێگرییان لێنەکرایە ئەوا ئەسغەریان دەکوشت.. چەند پیاوێکی کۆچەریی لە دوورەوە سەیریان دەکرد. ئەوان بە تەواوی نەیاندەزانی کێشەکە چییە؟ پاشان خالّم هەر دوو منداڵەکەی هێمن کردەوە. وەستا ئەسغەریش زۆر خراپ دەموچاوی سووتابوو، قاچیشی خوێنی لێدەهات. خالّم بە هێواشی بردییە نێو ڕەشماڵەکە و پانتۆڵەکەی پێدانا و سەیری برینەکەی قاچی کرد، قاچی زۆر خراپ سووتابوو. خالّم پێی›گوت پێویستە بە زوویی بچێت بۆ لای دکتۆر، بەڵام دکتۆر لە کوێ؟ دەبوو لانیکەم (٢٠٠) کیلۆ مەتر بڕۆیشتایە تا دەگەیشتە شیراز، چونکە تا شیراز دکتۆر نەبوو. هەڵبەت ئەگەر دکتۆر بە زوویی فریای وەستا ئەسغەر بکەوتایە، زووتر چاک دەبووەوە. ئەسغەر ئازارێکی زۆری هەبوو، دەموچاوی خوێنی لێدەهات، بەڵام زۆرتر خوێن لە قاچی دەهات. چەند پیاوێکی قەشقایی هاتبوونە بەردەمی ڕەشماڵەکە بانگیان کرد وەستا.. وەستا ئەوە چی ڕوویداوە؟ خالّم هاتە دەرەوە و تێیگەیاندن کە وەستا ئەسغەر خۆی کەوتۆتە نێو ئاگرەکەوە و قاچ و دەموچاوی سووتاوە. پیاوە دڵ پاکەکانی قەشقایی کە هەرگیز درۆیان نەدەزانی باوەڕیان بەم قسەیەی خالّم کرد.

ئەو پیاوانە ئەسغەریان سواری کەرێک کرد و بردیان بۆ ڕەشماڵەکەی خۆیان. ئەوان گوتیان لە هەوارێکی ئەولاتر دکتۆرێکی قەشقایی هەیە، هەر ئێستا دەیبەین بۆ لای ئەو دکتۆرە. وەستا ئەسغەر و قەشقاییەکان ڕۆیشتن. خاڵم هەردوو منداڵەکەی بێدەنگ کرد و کەلوپەلەکانی کۆکردنەوە. بڕیاربوو دوو گوێدرێژ بەکرێ بگرین و مسە تازەکان و ئەو مسە کۆن و کەشک و ڕۆنەی وەرمانگرتبوون، باریان بکەین و بەرەو جادەکە بەڕێبکەوین، بەڵکو لە سەر جادەکە ئۆتۆمبێلمان دەستبکەوێت. لەو شوێنەی کە لێیبووین تا سەر جادەی شیراز سێ شەو و ڕۆژ ڕێگا بوو. خاڵم ڕۆیشت بۆ ناو قەشقاییەکان تا وڵاخ پەیدا بکات، دوای نیوەڕۆ خاڵم گەڕایەوە، دوو گوێدرێژ و هێسترێکی لەگەڵ خۆی هێنابوو، گوتی دکتۆرەکە مەڵهەمی بۆ وەستا ئەسغەر دروستکردووە و پێیگوتووە دەبێت چەند ڕۆژێک پشووبدات، چونکە قاچی زۆر خراپ بریندار بووە.

خاڵم بە ئەسغەری گوتبوو ئێمە هەر ئێستا دەڕۆین. وڵاخەکانمان بارکرد و منداڵەکان بوخچەکانیان هەڵگرت، عەبدال چوو لە ڕەشماڵەکەی وەستا ئەسغەر هەندێک کەشک و ڕۆنی هێنا و گوتی ئەوە لە بری کرێی من و ڕەزا. گەیشتینە کەناری ڕووبارەکە چەند ڕەشماڵێکی کۆچەرییەکان لەوێ هەڵدرابوون، خاڵم چووە ڕەشماڵێکەوە کە ئەسغەری لێ دانرابوو بۆ پشوودان، کاتێک خاڵم هاتەوە بیست تومەنی لێوەرگرتبوو بۆ ڕەزا و عەبدال هەریەکەو دە تومەن. لێرەدا داستانەکەتان بۆ کورت دەکەمەوە، چوار ڕۆژمان پێچوو تا گەیشتینە سەر جادەی نێوان شیراز و ئەسفەهان، لەڕێگادا زۆر ماتڵ دەبووین چونکە خاڵم دەیویست مامەڵە بکات و ئەو کەمە مسەی پێی مابوو بیفرۆشێت، خۆ ئەگەر یەکڕێ بهاتینایە ڕەنگە بە دوو ڕۆژ بگەیشتینایە، دوو ڕۆژیش لە سەر جادەکە ماینەوە تا ئۆتۆمبێلێک هات کە شەکر و چای بارکردبوو بۆ یەزد. شوفێرەکە ئێمەی لە پشتی ئۆتۆمبێلەکەدا سوارکرد. واتە ساڵی (١٣٣٨-١٩٥٩) بە سواری ئۆتۆمبێل ماوەی دوو شەو و ڕۆژ ڕێگای شیراز و یەزد بوو. خاڵم داوای لە شوفێرەکە کردبوو دە خولەک لە تەفت بووەستێت. خاڵم گوتی زۆر بە خێرایی بڕۆ بۆ ئەو ماڵە زەردەشتیەی کە مەنجەڵەکەیان بە قەرز بردووە و پارە قەرزەکەیان لێوەربگرە و بە خێرایی وەرەوە. منیش لە ئۆتۆمبێلەکە دابەزیم و بە خێرایی خۆم گەیاندە ماڵەکە و گوتم هاتووم بۆ پارەکە. ژنە زەردەشتیەکەش بە زوویی پارەکەی پێدام و گوتی جارێ پەلەمەکە و مەڕۆ با هەندێک ترێت بۆ بهێنم نزیکەی دە کیلۆ ترێی جوانی بۆ هێنام. بۆ ڕۆژی دواتر گەیشتینەوە یەزد، لەم گەشتەدا بیستوشەش ڕۆژمان پێچوو. لەو ماوەیەدا دایکم هیچ هەواڵێکی لە من نەبوو، بەڵام دەیزانی لەگەڵ خاڵمدا ڕۆیشتووم. لەڕێگادا ڕەزا ئێمەی

سوێند دا کە لای هیچ کەسێک باسی بەدڕەوشتییەکانی وەستا ئەسغەر نەکەین، ئێمەش بەڵێنمان دا کە باسی نەکەین.

دوای دوو ساڵ لە گەڕەکی خۆماندا مەراسیمی ئیمام حسێن هەبوو، منیش چووم بۆ ئەو مەراسیمە، کە سەیرم کرد وەستا ئەسغەر لەوێیە و چا دەگێڕێت، کاتێک دانەویەوە و چایەکی لە بەر دەمم دانا، شوێنی سووتاویەکەی دەموچاوی زۆر بە ئاشکرا دیار بوو، قاچیشی شەل ببوو. وەستا ئەسغەر پاشان تووشی نەخۆشی شەکرە بوو چاویشی کوێر بوو.

ساڵی (١٣٥٠-١٩٧١) جارێکی تر چاوم بە وەستا ئەسغەر کەوتەوە و چاوی کوێر ببوو، قاچیشی بڕابووەوە و لەسەر جادەکان سواڵی دەکرد. ساڵی (١٣٥٢-١٩٧٣) بە نابینایی و بەدبەختیەوە لە تەمەنی پەنجا ساڵیدا کۆچی دوایی کرد، ئەو لە کۆتاییەکانی تەمەنیدا ژیانێکی هەژاریی و پڕ کوێرەوەریی و مەینەتی هەبوو. هەندێک کەس دەیانگوت لە کاتی گەنجێتیدا هەر چەندە ژن و ماڵی خۆیشی هەبووە، منداڵی دەبردەوە بۆ ماڵەکەی خۆی بۆ کاری بەدڕەوشتی. دیارە زۆر کەسی تریش ئەم خووە خراپەیان هەبووە. بەڵام کوێر نەبوون و قاچیشیان نەبڕاوەتەوە. وەک باسدەکرا کوێر بوون و قاچ بڕانەوەی وەستا ئەسغەر پەیوەندی بەو خووە نەگریسەی خۆیەوە هەبووە.

ڕەزاش بێ باوک بوو نەیتوانی قوتابخانە تەواو بکات، بە هاوکاری خزمەکانی کەوتە کاسبی کردن، لە ماوەی پەنجا ساڵدا هەمیشە هاوڕێی یەکتری بووین، ئێستاش لە یەکێک لە شەقامەکانی شاری یەزد دوکانێکی باشی هەیە و کار و کاسبیەکەی باشە، هەرکاتێک دەچم بۆ یەزد سەردانی دەکەم و چایەکی لا دەخۆمەوە، حەزیش ناکات باسی ئەو یادەوەرییانەی لە لا بکەم. سوپاس بۆ خودا ئێستا باری ئابووریی زۆر باشە و دایکیشی تەمەنی نەوەد ساڵە و زۆر بە هۆش و گۆشیشە و لای ئەو دەژی و هەمیشە نزای خێر بۆ کوڕەکەی دەکات..

عەبداڵیش سێ ساڵ لەمن گەورەتر بوو، ئەو بەردەوام بوو لە خوێندن تا دبلۆمی وەرگرتوو ڕۆیشت بۆ سەربازی، پیاوێکی چالاک بوو سەرەتای شۆڕش ڕۆیشت بۆ بەندەرعەباس، دەڵێن لەوێ لەگەڵ چەند کەسیکی تردا هاوبەشە و بە یەکەوە کاردەکەن و زۆر دەوڵەمەند بووە و هیچ هەواڵێکی ترم لە ئەو نییە.

ئەو کاتەی ئێمە لە نێو کۆچەرییە قەشقاییەکانی ناوچەی فارس گەڕاینەوە بۆ یەزد ڕۆژی دواتر دایکی مەحمود هاتە لای خاڵم و وێڵی دوای کوڕەکەی بوو، چونکە لە عەبدال و ڕەزای بیستبوو کە کوڕەکەی لەگەڵ وەستا ئەسغەردا شەڕی کردووە،

بۆیە ڕۆیشتووە و جێیهێشتووە. مەحمودیش باوکی نەما بوو تەنها خوشکێکی لە خۆی بچووکتری هەبوو، دایکیشی نەخۆش بوو، تەنها مەحمود نان پەیدا کەری ماڵەکە بوو، دایکی سەرگەردان ببوو، نەیدەزانی چی بکات، جوێنی بە وەستا ئەسغەر دەدا. خاڵم پێیگوت خۆت نارەحەت مەکە خۆ مەحمود منداڵ نییە و تەمەنی حەڤدە ساڵ دەبێت و بەمزووانە پەیدا دەبێتەوە. دایکی مەحمود ئامۆژگاری نەدەویست بەڵکو کوڕەکەیێ دەویست، بەڵام کێ سۆراخی کوڕەکەی بۆبکات. خۆ هیچ کەسێک ئامادە نەبوو لەو کاتەدا بچێت بۆ شیراز و بەدوای کوڕەکەی ئەودا بگەڕێت. ئەو ژنە دەستەودامانی زۆر کەس بوو، چووە ماڵی هەموو مسگەرەکان، شەوانە دەچووە سەر گۆڕی ئیمامزادەکان، وەک شێت و هاری لێهاتبوو. باشبوو پاش پازدە ڕۆژ مەحمود نامەیەکی هات، نووسیبووی، وا لە شاری شیرازە و کارێکی باشی پەیدا کردووە و حاڵی زۆر باشە. بیست تومەنییشی بۆ دایکی ناردبۆوە، بیست دانە تاک تومەنی. نرخی ئەو پارەیە لانیکەم دەیکردە سەد هەزار تومەنی بەهاری ساڵی (١٣٩١ - ٢٠١٢) و دەیکردە (٢٠٠) هەزار تومەنی مانگی (ئابانی ١٣٩١ - ت. یەکەمی ٢٠١٢). ناردنەوەی ئەو برە پارەیە نیشانەی ئەوە بوو مەحمود ساغ و سەلامەتە. ئێستا باش لە یادم نییە مەحمود چەند ڕۆژ لەوە دوا گەڕایەوە بۆ یەزد و چەند ڕۆژیش مایەوە، بەڵام من چاوم پێیکەوت و زۆر خۆشحاڵ بوو کە ڕەزا و عەبدال لە وەستا ئەسغەریان دابوو، بریندariyan کردبوو. مەحمود دوو ساڵ لە شیراز بوو پاشان هاتەوە دایک و خوشکەکەشی لەگەڵ خۆیدا برد بۆ شیراز و لەوێ ببوو بە شاگردی بازرگانێک. ئەو ساڵەی کە من دبلۆمم وەرگرت ئەویش بە سەردان هاتەوە بۆ یەزد و دەیویست هەر لە شیراز ژن بهێنێت. دیاری بۆ پووری و منداڵەکانی هێنا بوو. دەیویست پووریشی بۆ زەماوەندەکەی لەگەڵ خۆیدا ببات بۆ شیراز. ئەو کات بەهۆی دووریمانەوە پەیوەندیم لەگەڵیدا کەم بوو. پووری هەرکاتێک بیویستایە نامەی بۆ بنێرێت دەبوو من نامەکەی بۆ بنووسم. هەر ئەوەش بووە هۆی ئەوەی کە لە هەواڵی بزانم. بە گشتی من ئاگاداری هەموو کارەکانی ئەو بووم. پووری دەیویست کچەکەی خۆی بدات بە مەحموود، بەڵام مەحمود کچێکی شیرازیی خواست. یەکەمین کارتی زەماوەندی وێنەیی کە بینیبێتم کارتەکەی محمود بوو، کە وێنەی تەختی جەمشیدی لە سەر بوو. کاتێکیش لەگەڵ زەڕی سوڵتاندا چووم بۆ شیراز، ڕۆژێک میوانی مەحمود و دایکی بووم.

ساڵی (١٣٥٠-١٩٧١) مانگێک بۆ مەشقی سەربازیی لە بنکەی باخی تەختی شیراز بووم، من و ژمارەیەک لە خوێندکارانی زانکۆی مەشهەد کە نزیکەی (٤٠٠) خوێندکار

دەبووین. بۆ مەشقی سەربازیی نێردرابووین بۆ شیراز. لەوێ من و حەسەن حوسنی و زیائی مەلیک زادە بە یەکەوە بووین. دیارە من لە پێش هەموویانەوە چووبووم بۆ بنکەکەی شیراز. کە ئەوەش بۆ خۆی چیرۆکێکە. من پەیوەندیەکم هەبوو لەگەڵ مەحموددا، دایکی زۆری پێخۆشبوو من بچم بۆ ماڵیان و هاتوچۆیان بکەم. ڕۆژێکی پێنجشەممە، دوانیوەڕۆکەی مەحمود هات بۆ بنکەی مەشق بە شوێنمدا و منی لەگەڵ خۆیدا بردەوە بۆ ماڵی خۆیان. بۆم دەرکەوت دایکی مەحمود حەزدەکات من کچەکەیان بخوازم و ببمە زاوایان. دایکی مەحمود دەیگوت ئێمە لێرە غەریبین و حەز بە شیراز ناکەین و تەنها شاری یەزدمان پێخۆشە. ژنەکەی مەحمودیش خەڵکی شاری شیراز بوو، لە بنەماڵەیەکی بەڕێزی ئەو شارە بوو.

لە ساڵی (١٣٥٠-١٩٧١) مەحمود ببووە خاوەنی دوکان و کاروانسەرایەکی گەورە، بازرگانی دەکرد و کەسێکی زرنگ و وریا بوو. ئەو ساڵە جەژنی (٢٥٠٠) ساڵەی شایانە بوو، شاری شیراز ببووە چەقی هاتنی گەشتیارانی وڵاتانی دەرەوە. مەحمود نزیکەی دە هەزار سینی بە شێوازی جۆراوجۆر بە دروستکردن دابوو. لەسەر سینیەکان وێنەی تەختی جەمشید هەڵکەنرا بوو. بەو هۆیەوە پارەیەکی زۆری دەستکەوتبوو. ئەو پێشبینی کردبوو ئەو سینییانە فرۆشتنی باشیان دەبێت، بە ڕاستیش پێشبینیەکەی ڕاست دەرچوو بوو. ئەو مانگەی من لە شیراز بووم هاتوچۆم بۆ ماڵی مەحمود زۆر بوو. هاوسەری مەحمود لە وێنەکێشاندا کەسێکی دەستڕەنگین و کارامە بوو. وێنە مێژووییەکانی ئێران بە تایبەت تەختی جەمشید، ئارامگەی سەعدی و حافزی لە سەر قوماش دەنەخشاند. مەحمود بە هۆی منەوە ئاشنایەتی لەگەڵ زەڕی سوڵتاندا پەیدا کرد بوو. لە ڕێگەی هاوسەرەکەی زەڕی سوڵتانیشەوە کە خەڵکی ئەمریکا بوو، لەگەڵ چەند کەسێکی ئەمریکایی ئاشنایەتی دروستکرد بوو. مەحمود تا پۆلی شەشەمی سەرەتایی خوێندبوو، بەڵام لە شیراز خۆی فێری زمانی ئنگلیزی کردبوو. لە ساڵی (١٣٥٥-١٩٧٦) سەردانێکی ترم کرد بۆ شیراز و چاوم بە مەحمود کەوتەوە، ئەو گوتی ماوەیەک کاری گەشتوگوزارم دەکرد، بەڵام لە ئێستادا بەهۆی کەمبوونەوەی گەشتیاران بۆ ئێران ئەم کارە سوودێکی نەماوە. بۆیە بڕیارم داوە واز لەم کارە بهێنم و بڕۆم کارێکی تر بکەم. هەر بۆیەش لەگەڵ چەند کەسێکی تردا لە شیراز کانێکیان بەکرێ گرتبوو، ئەو یەکێک بو لە هاوبەشە سەرەکیەکان، داوای لە من کرد لە فەڕەنسا کڕیاری بۆ پەیدا بکەم. مەحمود زۆر ئامۆژگاری کردم واز لە کاری مامۆستای زانکۆ بهێنم و لەگەڵ ئەودا لە کانەکاندا ببمە هاوبەش. لە ساڵی (١٣٧٠-١٩٩١) مەحمود ببووە دیارترین کەسی وڵاتی ئێران بۆ

فرۆشتن و هەناردەکردنی بەرهەمی کانەکان، ئەو لە چیمەنتۆ، گەچ، کاشی و بەردی مەڕمەڕدا سەرمایەگوزاریی دەکرد. مەحمود منداڵێکی بێ باوکی تەمەن (٧-٨) ساڵ بوو، کاتێک لە قوتابخانە بوو شاگردی دەکرد و خۆی و دایکی و خوشکەکەی لە خانوویەکی خراپی بێکەڵکدا، لە نزیک حسێنیەی کۆڵانی خەتیبی گەڕەکی پشتی باخی یەزد، ژیانیان دەگوزەراند. دایکی بەردەوام ناڵە ناڵی بوو بە دەست نەخۆشییەوە، نەخۆشیەکەشی بە هۆی کەمخۆراکیەوە بوو. مەحمود توانای ئەوەی نەبوو بەردەوام بێت لە قوتابخانە، بۆیە تا پۆلی شەشەمی سەرەتایی خوێند و پاشان بوو بە شاگرد مسگەر و چەندیین جار لەلایەن وەستاکەیەوە لێدانی خواردووە. لە ساڵی (١٣٣٨-١٩٥٩) شاگردی وەستا ئەسغەر بوو. مەحمودی بێ باوک، کەم خوێندەوار، هەژار، بێ کەسوکار، لە دەستی وەستا زۆردار و بەدڕەوشتەکەی ڕایکرد و ڕۆیشت، هەمان مەحمودی هەژار و بێ سەرمایە، بەڵام کەسێکی ئازا و باوەڕبەخۆ بوو، ئەمڕۆ خاوەنی دەیان ملیار تومەن و دەیان ملیۆن دۆلارە و کاری بازرگانی دەکات. ئێستا چوار منداڵی هەیە و هەر چواریان خوێندنیان تەواو کردووە و لە چوار گۆشەی ئەم جیهانەدا جێگیر بوون و لە کار و کاسبیدا هاوکاری باوکیان دەکەن.

عەبدال و ڕەزاش هەرچەندە بەراورد ناکرێن لەگەڵ مەحمود دا، بەڵام کاروبارێکی باشیان هەیە، سوپاس بۆ خودا کە ژیانێکی باشیان هەیە. ئەگەر مەحمود لە دەست وەستاکەی ڕاینەکردایە و نەچووبایە بۆ شارێکی گەورەتر کە لە پەیوەندی نێو دەوڵەتیدا زۆر جیاوازە لەگەڵ شاری یەزد، ئایا ژیان و گوزەرانی لە عەبدال و ڕەزا باشتر دەبوو. مەحمود یەکێکە لە سەرکەوتووترین خاوەن کارەکانی وڵاتی ئێران، نزیکەی چوار هەزار کرێکار لە کان و کارگەکانی ئەودا کار دەکەن.

من هەمیشە ژیانی کەسانی بەدڕەوشتی وەک وەستا ئەسغەر و ژیانی کەسێکی بەڕێز و بە ئابڕووی وەک مەحمود لە پێش چاومن، ئێوە چەند کەس لەم جۆرەکەسانە دەناسن.

## کوبرا و نیلۆفەر

کوبرا کچی گوندێکی کەتیرەکەران بوو، تەمەنی لە (١١-١٢) ساڵ زیاتر نەبوو، کچێکی لاواز و بێ هێز بوو. ڕوخسارێکی جوانی هەبوو، چاوەکانی شین و گەورە بوون، هەرگیز هەستم نەدەکرد کچێک لە بیابانەکانی کەوێرەوە هاتبێت و ئەوەندە سووروسپی و جوان بێت. هەرچەندە ڕەنگی کەمێک مەیلەو زەرد باو بوو، ئەویش

بەهۆی ئەوەوە بوو کە برسێتی مۆڵەتی نەدابوو خوێن لە دەم وچاویدا بگەڕێت. زەردی ڕوخساری بەهۆی برسێتییەوە بوو، برسێتییەک کە چەندین سەدە بوو ئەو ناوچەیەی گرتبووەوە.

ساڵی (١٣٤٣-١٩٦٤) باوکی لە کێوەکانی کەوێرەوە ئەوی هێنابوو بۆ شار تاکو لە ماڵە دەوڵەمەندێکدا بیکات بە خزمەتکار. ئەو خەڵکی یەکێک لە گوندەکانی نزیک بەهاباد بوو، هەمان ئەو گوندانەی کە خەڵکەکەی بۆ کەتیرەکردن دەڕۆشتن بۆ شوێنە دوورەکانی ئێران. باوکە هەژارەکەی، کچەکەی هێنابوو بۆ شار تاکو لە ماڵێکدا بیکات بە خزمەتکاری خەڵکی تا لە گوندەکەی خۆیاندا لەبرساندا نەمرێت. واتا هاتنی ئەم کچە بۆ شار ڕاکردن بوو لە مەرگ، مەرگی وشکە ساڵی و مەرگی بێ ئاوی و مەرگی بێ نانی، ئەمانە دیاردەیەکن زۆر کەس نایزانیت. باوکی کوبرا ساڵانە دەچوو بۆ شوێنە دوورە دەستەکانی ئێران بۆ کۆکردنەوەی کەتیرە، بەڵام چەند ساڵێکە نەخۆشە و هیچ کەسێک نایبات بۆ کەتیرەکردن. کەواتە باوکی ئەم کچە، ساڵانە چوار مانگ دەڕۆیشت بۆ کۆکردنەوەی کەتیرە، کرێکەشی لەماوەی ئەو چوار مانگەدا کە لە بەیانی زووەوە تاکو خۆرئاوا بوون بەڕۆژی درێژی هاوین ئەو خواردن و خۆراکە بوو کە خاوەنکار پێیدەدا. بەگشتی خواردنەکەشی بریتی بوو لە سێ ژەم نانی وشک و هەر ژەمێک یەک چا بە سێ کڵۆ شەکرەوە، ئەگەر لە هەفتەیەکدا ژەمێک شۆربا یاخود کەمێک ڕۆنیان پێبدرایە ئەوا ئەو ڕۆژەیان دەبوو بە جەژن. ئەگەر لە مانگێکدا خاوەن کار بزنە نەخۆشێک یا مەڕە لاتێکی بۆ بکڕینایە و گوشتاویان دروستبکردایە و بیانخواردایە، ئەوا ئەو ڕۆژەیان دەبوو بە جەژنێکی زۆر گەورە. دیارە کەتیرەکردن بە گشتی لە شاخ و کوێستانەکاندا بووە. ئەوان لە کەشوهەوایەکی فێنکدا کاریان کردووە، لەو کێوەنەدا گیای کێوی و میوەی کێوی هاوکارێکی خۆراکی باشبووە بۆ ئەو کەتیرەکەرانە، خۆ ئەگەر هەنگوینی کێویشیان بەدەست بکەوتایە ئەوا بەخۆشیەوە سکی خۆیان لێ تێردەکرد. کەتیرەکەران کە لە گوندەکەی خۆیانەوە بەڕێدەکەوتن و دەڕۆشتن بە جلوبەرگی کۆن و دڕاوەوە دەڕۆشتن، کاتیک دەگەڕانەوە بۆ گوندەکانی خۆیان نەیاندەتوانی دەستێک جلوبەرگی تازە بکڕن. هەر بە هەمان جلوبەرگەوە کە کۆنتر و دڕاوتر دەبوو دەگەڕانەوە. لە ساڵی (١٣٤٤-١٩٦٥) بۆماوەی چوار مانگ کرێی یەک کرێکاری کەتیرەکەری ئازا و بەتوانا (٣٠٠) تومەن یان هەرە زۆرەکەی (٤٠٠) تومەن بووە، بەڵام بۆ کەسێکی نەخۆش و پەککەوتە یا بۆ کەسێکی مێرمنداڵ (١٥٠ تا ١٨٠) تومەن بووە.

تا ساڵی (١٣٥٠-١٩٧١) کۆمەڵگە هەژار و برسییەکان باشترین دابینکەری خزمەتکار

و نۆکەر بوون بۆ خەڵکە دەوڵەمەندەکان. کۆمەڵگەی هەژارنشین لە هەلومەرجی نالەباردا، بەدڕەوشتی و گیانی خۆفرۆشی بەرهەم دەهێنێت. لە خراپترین بارودۆخیشدا گۆڕستانەکانیش بە کەسانی تەمەن (٣٠-٤٠) ساڵ ئاوەدان دەکەنەوە. لە ڕۆژگارێکدا زۆرێک لە خەڵکانی گوندە بێ ئاو و لەوەڕگەکانی کەوێر بەو جۆرە بوون. کوبرا بە ناونیشانی خزمەتکار درایە دەست ماڵێکی دەوڵەمەندی شارنشین. باوکی کچە لە ماڵە دەوڵەمەندەکە پارچە نانێکی وشکی هەڵگەتوو گوتی دەیەوێت بگەڕێتەوە بۆ گوندەکەیان، چەند تومەنێکیشیان بەناوی کرێی ڕێگاوە پێدابوو، ئەو ڕۆیشت و هەرگیز باسی ئەوەی نەکرد کە دەبێت مانگانەی کچەکەی چەند بێت، هەرگیز باسی ئەوەی نەکرد کە دەبێت کچەکەی ڕۆژانە چەند کاتژمێر کار بکات یا ئایندەی ئەو کچە چۆن دەبێت؟ دیارە ئەو خەڵکە کەتیرەکەرانە ئەوەندە چەندوچونیان نەدەکرد. ئەگەر نانێکی مەمرە و مەژییان دەستبکەوتایە سوپاسی خودایان دەکرد و باسی هیچ شتێکی تریان نەدەکرد. بەلای خەڵکانی هەژارەوە منداڵێک کەمتر واتە نان خۆرێک کەمتر.

باوکی کوبرا لەو ڕۆژەوە کە کوبرای هێنابوو بۆ شار ماوەی (٦-٧) ساڵ سەردانی شاری نەکردووە و چاوی بەکچەکەی نەکەوتبووەوە، کاتێک کە هاتەوە بۆ شار بۆ سەردانی کچەکەی نەهاتبوو، بەڵکو بۆ ئەوە هاتبوو بلیتێکی سی هەزار تومەنی کڕی بوو، بە نیاز بوو ئەو پارەیەی بۆ دەربچێت. لەو ساڵانەدا بە سی هەزار تومەن زۆر کاری گرنگ ئەنجام دەدرا. دەتوانرا بەو پارەیە پاسێکی تازە بکڕیت. ئەو پیاوە کە بلیتەکەی کڕی بوو وایدەزانی ڕاستەوخۆ ئەو پارەیە بۆ ئەو دەردەچێت. کاتێک پێیان دەگوت بلیتەکەمان نیشانبدە تاکو سەیری ژمارەکەی بکەین، ئەو بلیتەکەی نیشانی هیچ کەسێک نەدەدا. ژنەکەی بلیتەکەی بە دەرزی و درومان بە چاکەتەکەیەوە دووری بوو. ئەو پیاوە هەژارە دەیگوت بلیت نیشانی هیچ کەسێک نادەم، تەنها لە تاران نیشانی سەرۆکی کۆمپانیای بلیتەکەی دەدەم. ئەو دەیگوت دەچم لە تاران سی هەزار تومەن وەردەگرم و دەگەڕێمەوە، پێش هەموو شتێک کوبرا لە بەندی خزمەتکاری دەردەهێنم و دەیبەمەوە بۆ گوندەکەی خۆمان. گەورەترین ئاواتی ئەوە بوو کچەکەی بباتەوە بۆ گوند.

دەیگوت دایکی کوبرا دەیەوێت چاوی بە کچەکەی بکەوێتەوە، بەڵام خۆیشی دەیگوت لە گوندەکەماندا جگە لە برسێتی هیچ شتێکی تر نییە. ئێستا ژمارەی بلیتەکان خوێندراوەتەوە، ئەو دەبێت بچێت بۆ تاران تاکو پارەی بلیتەکەی وەربگرێت. ئەو دەیویست بەو پارەیە یەک مێگەل مەڕ بکڕێت و گەوڕێکی گەورە دروست بکات و

کاری ئاژەڵداریی بکات دەیگوت هەموو ساڵێک یەک هیزە ڕۆن بە دیاری دەبەم بۆ ماڵی ئەربابەکەی کوبرا.

ئەم پیاوە دوو ڕۆژ لە یەزد مایەوە و پاشان خاوەن ماڵەکەی کوبرا سواری پاسی کرد و بەڕێیکرد بۆ تاران، بیستوپێنج تومەنیشی پێدا بۆ خەرجیی ڕێگا. باوکی کوبرا، پاش چەند ڕۆژێک، لە تارانەوە گەڕایەوە. بلیتەکەی تەنانەت بایی یەک قڕانیش نەبوو. ئەو وایزانی بوو هەر کەسێک بلیتێک بکڕێت ڕاستەوخۆ سی هەزار تومەنی بۆ دەردەچێت. ئەو پیاوە هەژارە یەکەمین جاری بوو بلیتی بەخت بکڕیت، ڕەنگە دوایین جاریشی بوو بێت. ئەم بلیتی بەختە لەو سەردەمەدا واتە لە دەیەی (١٣٤٠-١٩٦١) دەگەیشتە دوورترین گوند. ئەو گوندانەی کە جادە و ئاو و کارەبایان نەبوو، یەک خوێندەوارێک لەو گوندانەدا نەبوو، ئەوان ئەوەندە هەژار بوون تەنانەت نانیشیان نەبوو بیخۆن. خەڵکەکە دوا نیوەڕوانی ڕۆژانی چوارشەممە، چاوەڕوانی خوێندنەوەی ئاکامی بلیتەکانیان دەکرد، تەنانەت ئەوان دەنگی ڕادیۆشیان نەدەبیست تاکو کەسێک گوێ بگرێت و ژمارەی بلیتی دەرچوو بنووسێت.

باوکی کوبرا لە کاتی گەڕانەوەی لە تارانەوە، باسی بەسەر هاتەکانی خۆی دەکرد. کەسێکی نەخوێندەوار بوو، یەکەم جاری بوو بچێت بۆ تاران، دەیگوت لە گوند پێیانگوتوم سی هەزار تومەنم بۆ دەر دەچێت. دیار نەبوو کە چ کەسێک ئەم پیاوە هەژار و سادە لادێییەی خەڵەتاند بوو! ئەو بلیتەی پێدابوو. بەڵام گرنگ ئەوە بوو، ئەم پیاوە بەو هۆیەوە تارانی بینی، ئەو دەیگوت تاران زۆر گەورەیە، ئەوەندە گەورەیە خەڵکی ئەو شارە تەقی خانی بەهابادیش ناناسن. لە هەر کەسێکی پرسیبوو تەقی خانی بەهابادی دەناسن. گوتبوویان نەخێر نایناسین. دەیگوت لەم دونیایە شوێنێک هەیە تەقی خانی بەهابادی ناناسن، خەڵکەکەش پێیاندەگوت لەم جیهانەدا شاری وا هەیە کە شای ئێرانیش ناناسن. ئەویش بەم قسانە سەری سووڕ دەما، پێیان دەگوت لەم جیهانەدا شار هەیە لە تارانیش گەورەترە. ئەویش دەیگوت ئەگەر شار لە تاران گەورەتر هەبێت، بەدڵنیاییەوە خەڵکی ئەو شارە خوداش ناناسن. ئەو لەو گەشتەیدا سێ ڕۆژ لە تاران مابووەوە، وا بیری کردبووەوە کە لە تاران دەچێتە ماڵە ئاشناکانی. ئەو بێچارەیە ناو و ناونیشانی هیچ ماڵێکی لەگەڵ خۆیدا نەبردبوو، وایزانی بوو لە تاراندا هەموو کەسێک ئاشناکانی ئەو دەناسن، بەڵام لە تاران هیچ کەسێک ئاشناکانی ئەویان نەناسی بوو. سوپاس بۆ خودا کە لە یەزد بیستوپێنج تومەنیان پێدابوو دەنا ئەو پیاوە ئەوەندەی تر دەبوو بە پەند. لە کۆتاییدا ئەم پیاوە هەژارە بەهۆی بلیتەکەیەوە پاش (٦-٧) ساڵ

چاوی بە کچەکەی کەوتەوە.

حاجی شەوکەت خانم هەمیشە خزمەتکاری هەبووە. چەند ساڵێک بوو بیبی بەهابادی پیر ببوو، هەڵبەت هەمیشە چەند کرێکارێکی بێکرێ لە دەورو بەری بوون، وەک ئەسغەر و ناسر، بەڵام ئێستا کە کچەکانی گەورە بوون، بەدوای خزمەتکاری کچدا دەگەڕا، خزمەتکار و کرێکاری کوڕ بەکەڵکی ئەو نەدەهاتن، بۆیە کوبرا ئەو کەسە بوو کە ئەو بەشوێنیدا دەگەڕا، کچێکی سادە و چاو نەکراوە و بێئاگا لە هەموو شتێک. کاتێک کە باوکی دابویە دەست ئەو ماڵە و خۆی ڕۆیشتبوو، کوبرا لە تاوا خەریکبوو دڵی بتەقێت، بەردەوام بە بێدەنگ دەگریا، بەڵام هەر سێ کچی ماڵەکە، کە گەورەکەیان دوو ساڵ لە کوبرا گەورەتر بوو لەگەڵ کوبرا چوونە ژوورەکەی پێشەوە و دەستیان کرد بە یاریی کردن. حاجی شەوکەت خانم دەسێکت جلی کچەگەورەکەی خۆی بۆ هێنا و گوتی جارێ بڕۆ بۆ حەمام خۆت پاک بشۆ و پاشان وەرەوە بۆ لام، ئەو کاتە خۆم پێت دەڵێم چی بکەیت.

ماڵی حاجی ئاغا خانوویەکی زۆر گەورە یان هەبوو بە باخێکی گەورەوە کە نزیکەی پێنج هەزار مەتر چوارگۆشە دەبوو، باخەکە پڕ بوو لە درەخت و چەندین جۆر میوەی تێدا بوو. لە حەوشەکەشدا حەوزێکی گەورەی ئاو هەبوو. کوبرا کە تازە هاتبوو بۆ ئەو ماڵە دەبوو سەرەتا بچێت لە حەمامدا خۆی بشوات و پاشان جلوبەرگی نیلۆفەر لەبەر بکات. حاجی شەوکەت خانم بە بیبی بەهابادی واتە خزمەتکارە پیرەکەی گوت: ئەم کچە بەدڵنیاییەوە دوو ساڵ دەبێت خۆی نەشۆردووە. ئێستا سەری پڕیەتی لە ڕشک و ئەسپێ، با جلوبەرگەکانی دابنێت و بیخەنە بوخچەیەکەوە فڕێی بدەنە ژێر زەمینەکە، بۆئەوەی ئەگەر ڕۆژێک لە ڕۆژان دەمهەراشی کرد و لەخۆی بایی بوو، جلە ڕشکاوییەکانی خۆی نیشان بدەین تاکو بزانێت ئەو کێ بووە و لەکوێوە هاتووە؟

شەوکەت خانم، گوتی کوبرا لە گوندەکەی ئێوەدا حەمام هەیە، ئایا تاکو ئێستا تۆ حەمامت بینیوە؟ ئەم کچە هەر شتێکی دەبینی سەری سوڕدەما، چونکە ئەو هیچ شتێکی نەبینیبوو.

کوبرا چاوی بڕی بووە ئەو سینیە گەورەیەی لەبەردەمی حاجی شەوکەت خانمدا دانرابوو. ئەو سینیە چەندین جۆر خواردنی لەسەربوو، سێ جۆر نان و پەنیر و کەرە و چەند جۆر مرەبا و هەنگوین و شیر و قەیماغ و هێلکەی کوڵاوی لەسەر بوو. حاجی شەوکەت خانم پارچە نانێک و کەمێک پەنیری کردە قاپێکەوە دایەدەست کوبرا. یەکێک لە ڕەوشتەکانی حاجی شەوکەت خانم ئەوە بوو، هیچ کەسێک بەبێ مۆڵەتی ئەو بۆی

نەبوو دەست بەرێت بۆ خواردن یا لە خۆیەوە دەرگای بەفرگرەکە بکاتەوە و خواردن دەربکات و بیخوات. ئێستاش کوبرا کە زیاتر لە پەنجا ساڵە لە بەیانییەوە تا نیوەشەو کار بۆ حاجی شەوکەت خانم دەکات و خزمەتی ماڵەکەی دەکات، بۆی نییە سەری قابلەمەیەک هەڵبداتەوە و بۆ خۆی پارچە خواردنێک دەربکات و بیخوات، بەڵکو پێویستە چاوەڕێ بێت تا خواردنەکەی پێدەدەن.

کاتێک ئەم کچە بۆیەکەم جار ویستی بڕواتە حەوشەکەوە، سەگی ماڵەکە پێی وەڕی و ئەویش نەیوێرا بڕوات و گەڕایەوە. منداڵەکان هەموویان گوتیان کوبرا لە سەگ دەترسێت. حاجی شەوکەت خانم گوتی ملی بشکێت، ئەو لە دێهات لەگەڵ سەگ و چەقەڵدا گەورە بووە، کەچی ئێستا لە سەگ دەترسێت، یاڵڵا بڕۆ بۆ حەمام بەزوویی خۆت بشۆ، ئەو بۆگەنە پیسەی تۆ، هەموومانی وڕوکاس کردووە، خۆزگە پێم بگوتنایە پێش ئەوەی بتهێنن بۆ ئێرە بیان بردیتایە بۆ حەمامی بازاڕ و تا پاک بتشۆن و ئەو کاتە بهاتیایە بۆ ماڵی ئێمە. کوبرای داماویش سەری خۆی داخستبوو هیچ قسەیەکی نەدەکرد. ئەو نەیدەزانی حەمام چیە؟ لە گوندەکەی خۆیاندا حەمام نەبوو. ئەوان نەورۆزە و نەورۆز کە دەیانویست بچن بۆ حەمام دەبوو چەند فرسەخێک بە پێ بڕۆیشتنایە تاکو دەگەیشتنە بەهاباد. چەندین ساڵ لەوە دوا کوبرا گێڕایەوە و گوتی کاتێک خانمەکەم پێیگوتم بچۆ بۆ حەمام، وامزانی دەبێ چەند فرسەخ ڕێگا ببڕم تاکو دەگەمە حەمام، هەر بۆیەش ترسابوو. بیبی کچێکی لەگەڵدا ناردبوو تاکو لە سەگ نەترسێت و حەمامەکەشی نیشان بدات و پێیبڵێ حەمام چۆن گەرم دەکرێت.

ئەو کاتە دەوروبەری ساڵی (١٣٤٢-١٩٦٣) بوو. حەمامی ماڵان لە یەزد زۆر کەم بوو. چەند دەیە لەوە دوا ئەوجا غاز هات بۆ یەزد. ئەو کاتە حەمامیان بە دار گەرم دەکرد. من تاکو ساڵی (١٣٤٠-١٩٦١) ئاو گەرم کردنم بە نەوت نەبینی بوو. تەنانەت نەمدەزانی چۆن بەهۆی نەوتەوە ئاو گەرم دەکەن. ئەو کاتە لەو ماڵانەدا کە حەوشی گەورەیان هەبوو، چەندین درەختی تێدا بووە، لق و پەلی درەختەکانیان دەبڕیەوە و دەیانخستە تونی حەمامەکەوە و حەمامیان پێ گەرم دەکرد. دوایی کوبرا لە حەمام هاتە دەرەوە بە لەبەرکردنی جلە کۆنەکانی نیلۆفەر جوانیەکەی باشتر دەردەکەوت، لەشولاری زۆر بە جوانی دەهاتە پێش چاو. حاجی شەوکەت خانم گوتی ئێستا خاوێن بوویتەوە و لە مرۆڤ دەچیت. دە ئیتر هەڵسە بچۆ ئەو هەموو جلە پیس و چڵکنەمان هەیە، بڕۆ بیانشۆ. ئەو کاتە هێشتا جلشۆر زۆر پەیدا نەببوو. بەڵام ژنانی ماڵە دەوڵەمەندەکان بۆ ئەوەی خزمەتکارەکانیان بێکار نەبن و نەهێڵن بێکار دانیشن و ماندوویان بکەن

دەیانگوت جلشۆر جلەکان دەشوات، بەڵام باش پاکیان ناکاتەوە، بۆیە دەبێت بە دەست بشۆرێن. ئەو کچە لەیەکەم ڕۆژی هاتنی بۆ ئەو ماڵە دەبوو چەند قاپ و مەنجەڵی گەورە بشووات... کڕینی شتی وردەش لە بازاڕدا لە ئەستۆی ئەسغەردا بوو، کڕینی نان و خواردەمەنیەکانی تر هەر ڕۆژە و یەکێک لە کرێکارەکانی حاجی دەیکڕی و دەی‌هێنایەوە بۆ ماڵەوە. ئەو سەردەمە لە شاری یەزد هیچ کەسێک بەفرگری نەبوو گۆشت و ماسی و مریشک لە ماڵەوە هەڵنەدەگیرا. دەبوو هەموو شتێک بەتازەیی لە بازاڕدا بکڕدرایە. کرێکارەکانی حاجی هەموو ڕۆژێک دەچوونە بازاڕ و پێویستییەکانی ماڵەوەیان دەکڕی و دەیان‌هێنایەوە. بیبی خزمەتکاری کۆن لە ماڵەوە پیر ببوو، نەیدەتوانی هەموو کارێک بکات، ئەو تەن‌ها خەریکی چێشتلێنان بوو، حاجی شەوکەت خانم بڕیاری دەدا کە کێ چ کارێک بکات؟ کوبرای بچووک هیچ شارەزاییەکی نەبوو، نەیدەزانی چۆن چۆنی قاپەکان بشوات. تازە تایت پەیدا ببوو، ئەو هەرگیز تایتی نەبینیبوو. ئەو تەنانەت سابوونیشی نەدەناسی. کەسێکی هەژار لە کوێرە دێیەکی کەویرەوە هاتبوو، تایت و سابوونی نەبینی بوو، یەکەم جاری بوو، سوار ئۆتۆمبێل ببوو. بەجادەیەکی خۆڵدا هاتبوو بۆ شار. ئەو خۆی بۆ منی گێرایەوە و دەیگوت ئەوە یەکەمجار بووە فەرش و خانووی گەورە و خاوێن و پەنجەرەی شوشە تێگیراو ببینێت. سفرەی خواردن و گڵۆپ و کارەبای نەبینی بوو. ئەو دەیگوت یەکەمجار بووە ئاوێنەی گەورە ببینێت. لە ماڵە هاوسێکەیان ئاوێنەی بینی بوو، بەڵام ئاوێنەیەکی بچکۆلە کە هێندەی لەپەدەستێک بووە. لە هەمووی گرنگتر ئەو یەکەمجاری بووە کە توالێتی بینیبێت. لە گوندەکەیاندا کە چەند ماڵێک بوو، هەمیشە بۆ چوونە سەرئاو، هەندێک لە ماڵەکان دوور دەکەوتنەوە و کاری خۆیان ئەنجام دەدا و بە بەرد و کەرسەکەگڵ خۆیان پاک دەکردەوە.

کاتێک لە دەیـەی ساڵانی (١٣٦٠-١٩٨١) دا خوێندکارەکانم دەبـرد بۆ ناوچە خێڵەکییەکانی خۆراسان و بەختیاری و سـەراوان، یەکەم کارێک کە دەبوو ئەنجامی بدەن، دروستکردنی توالێت بوو. بەگشتی پێشئەوەی بکەوینە ڕێ بێڵ و پاچ و دار و تەختە و بزمارمان دەکڕی. هەندێک جار چیمەنتۆ و شیشمان دەکڕی لەگەڵ گەیشتنمان بۆ شوێنی مەبەست، یەکەم کارێک کە دەبوو ئەنجام بدرێت دروستکردنی توالێت بوو. ئێستا (١٣٩٠-٢٠١١) دەتوانم بڵێم لەم وڵاتەی ئێمەدا لانیکەم نیو ملیۆن کەس سوود لە توالێت نابینێت. لە ڕوانگەی منداڵانی شارنشینەوە لەو سەردەمەدا نەبوونی توالێت شتێکی باوەڕ پێنەکراوە. تێپەڕبوون لە سەردەمی کۆنەوە بۆ سەردەمێکی نوێ لە ڕووی تەکنەلۆژیا و پێویستیەکانەوە لە وڵاتی ئێمەدا، کارێکی زۆر گرنگ و خێرابوو. لە ماوەی

(٢٠-٣٠) ساڵدا بیر و چاڵی هەزاران ساڵەی شاری یەزد و بەتایبەت شاری ئەسفەهان گۆڕدران بە توالێتی فەرەنگی و جێگیر کردنی سیفۆن. ئەمەش واتای تێپەڕاندنی پێنج هەزار ساڵ. تێپەڕاندنی مردن و نەخۆشییەکانی توالێتی کۆن و گەیشتن بە پێشکەوتن و سەلامەتی. یەکەمجار کە ڕۆیشتم بۆ ئەسفەهان ساڵی (١٣٣٩-١٩٦٠) بوو. لە زۆربەی کۆڵانەکانی ئەسفەهان لە ماوەی (١٠-١١) مەتر چاڵێکی گەورەی دانەپۆشراو هەبوو. کە ئاوەڕۆ و پیسایی ماڵەکانی تێدا کۆ دەبووەوە. بەهۆی بەرزی ئاوی ژێر زەوییەوە توانای هەڵکەندنی بیر نەبوو لە ماڵەکانی نزیک ڕووباری زایندە ڕود. لە ئێراندا شاری ئەسفەهان یەکەمین شارە کە سیستەمی ئاوەڕۆی بۆ دابینکراوە. ئەگەر لە شارەکانی تردا زووتر سیستەمی ئاوەڕۆ جێبەجێ کرابێت، من ئەوە نازانم. لە شاری یەزد تا ساڵی (١٣٤٠-١٩٦١) هەندێک لە ماڵەکان بیری توالێتیان نەبوو، پیسایی لە حەوزێکی سەر بەرەڵادا کۆدبووەوە و بە دوو مانگ جارێک بەتاڵ دەکرا، جا، چەند بۆن و بەرامەیەکی پیس و ناخۆشی هەبوو. جگە لە پەیدابوونی مێش و مێشوولەیەکی زۆر کە دەبوونە هۆی بڵاوبوونەوەی جۆرەها نەخۆشی. لەو سەردەمەدا لە ماڵی حاجی ئاغاشدا هێشتا توالێتی چینی و سیفۆنی نەبوو. دیارە لە ساڵی (١٣٤٢-١٩٦٣) لە گەڕەکی ئێمەدا، بگرە لە هەموو شاری یەزدیشدا یەک توالێتی سیفۆن نەبوو. لە ساڵی (١٣٤٢-١٩٦٣) لە هەموو شاری یەزدا دوکانێک نەبوو کە پێویستیە پزیشکیەکان و دەرمانی خۆ پاراستن لە نەخۆشی بفرۆشێت. هەڵبەت لە تەواوی شارەکانی تریشدا ئەو جۆرە دوکانانە نەبوون، بەڵام لە بەشێکی باکووری تاراندا چەند دوکانێک لەو جۆرە پەیدا ببوون. ئەوکاتە لە باکووری تاران بلواری کەشاوەرز دروستکرابوو..

بیبی بەهابادی کوبرای فێر دەکرد کە چۆن دانیشێت و جلوبەرگ بشووات. چۆن جلەکان لە ئاو هەڵکێشێت و بەجوانی دایانبنێت. کوبرا تاکو نیوەڕۆ جلی شۆری، دیار بوو قاچەکانی شەکەت ببوون، دەستەکانیشی پێستیان هەڵدا بوو، بەڵام ناچار بوو دەبوو کار بکات. ئەو بە میوانی نەهاتبوو بەڵکو بە (بەندی) هاتبوو. حاجی شەوکەت خانم دەیویست یەکەم ڕۆژ تێبگەیەنێت کە ئەو بۆچی هاتووە؟ حاجی شەوکەت خانم نەیدەویست تەنها لاشەی کوبرا کۆنترۆڵ بکات، بەڵکو دەیویست سوکایەتی بە گیانیشی بکات. ئەو ژنە پاش پەنجا ساڵ هەمان ڕەوشتی هەبوو، دەیویست سوکایەتی بە هەموو ئەوانە بکات کە لەلای ئەوکاریان دەکرد. نزیکی نیوەڕۆ بوو هەندێک خواردن و پارچە نانێکی لەسەر سینییەک دانابوو بانگی کرد و گوتی کوبرا وەرە نانەکەت بخۆ. حاجی شەوکەت خانم بەدوای ئەوەدا دەگەڕا وشەیەک بەکار بهێنێت کە سوکایەتی بێت بە

کوبرا، چونکە کوبرا لەبەر چاوی ئەو کەسێکی ئەسپێیاوی و ڕشکاوی و چڵکن بوو. کوبرا بەخێرایی هات و خواردنەکەی لە دەستی حاجی شەوکەت خانم وەرگرت و حاجی شەوکەت پێیگوت بڕۆ لە چێشتخانە خواردنەکەت بخۆ، ئەویش سینییە خواردنەکەی برد و لەگەڵ بیبی بەهابادی چوونە چێشتخانەکە بۆ نانخواردن، بەڵام بیبی بەهابادی بەدەنگێکی بەرز گوتی کوبرا خواردنی بۆچییە؟ خۆ لە گوندەکەی ئەوان تەنها بەیانیان و ئێواران نان دەخورێت، لەوێ هیچ کەسێک نیوەڕۆیان نان ناخوات.

واتە لە بەرنامەی ئەواندا نییە کە نیوەڕوان نان بخۆن. خەڵکی ناوچەکانی ماخونەک و بیرجەند و سەربێشە تاکو دەیەی ساڵی (١٣٧٠-١٩٩١) نیوەڕوان نانیان نەدەخوارد. نانخواردن لەلای ئەوان تەنها دوو ژەم بوو. لە گوندەکانی دەوروبەری کەوێر نانی گەنم زۆر کەمبوو، نانی گەنم تایبەت بوو بە ماڵە گەورەکان. دیارە تا دوو سەدە لەوە پێش لە بەشێکی زۆری ئەوروپادا خەڵکی نانی نیوەڕۆیان نەدەخوارد. ئێستاش لەبەشێکی وڵاتی بریتانیادا تەنها بەیانیان و ئێواران نان دەخورێت. کەسانێکی هاوشێوەی کوبرا لەبەر نەبوونی و بێخۆراکی بوو کە نانی نیوەڕۆیان نەدەخوارد، تەنانەت ئەوان نانی نیوەڕۆ و ئێوارەشیان بە ڕێکوپێکی نەدەخوارد. ئێستا زۆرێک لە خەڵکی شارەکان وا بیر دەکەنەوە هەر کەسێک لە لادێکان دانیشێت خاوەنی مانگا، مەڕ، بزن، مریشک و قەلە، کشتوکاڵ دەکەن و لە هیچ جۆرە خۆراکێک کەمیان نییە، بەڵام ئەوان نازانن زۆربەی زۆری گوندنشینان تەنها ماڵەکانیان لە گوندە و سەروەت و سامانەکەیان تەنها هێزی بازوویان و ئەو ئارەقەیە کە دەیڕێژن.

تاکو دەیەی ساڵی (١٣٤٠-١٩٦١) زۆرێک لە خەڵکی گوندەکانی ناوچەی بافق و بەهاباد و یەزد زیاتر هەرزنیان دەخوارد، نانی هەرزان و چێشتی هەرزنیان دەخوارد. لە ماخونەک و سەربێشە و بێرجەند خەڵکەکە زیاتر (پوختەک) یان دەخـوارد، واتە شێلم و چەوەندەریان پاک دەکرد و وشکیان دەکردەوە و هەڵیاندەگرت، کە چەوەندەر و شێلم نەدەما و هیچ خواردنێکی تریان دەستنەدەکەوت، ئەو کاتە دەیانخوارد. کاتێک نان نەبێت و سک برسی بێت، چەوەندەر و شێلمی وشک کراوە تامی پاقلاوە دەدات. ئەو کەسانەی کە (پوختەک) یان، هەبوو لە ڕوانگەی خەڵکانی ترەوە دەوڵەمەند بوون. من خۆم لە ساڵەکانی (١٣٧٤-١٣٨١=١٩٩٥-٢٠٠٢) چووم بۆ ماخونەک و لەوێ چاوم بە (پوختەک) کەوتووە. -سەیری وتارێکم بکەن لە گۆڤاری ئەقلیم بەناونیشانی ماخونەک-. دراوسێیەکمان هەبوو ناوی بیبی ڕوباب مەلا بوو. بیبی ڕوباب دوو کچ و دوو کوڕی هەبوو، کچە گەورەکەی لە شیراز کرێکاری دەکرد، کچەکەی تری نابینا بوو

بەو نابینابیە ماسورەی هەڵدەپێچا، نابینایەک کە هیچ کات شتێکی لە کەس وەرنەدەگرت، بەو کەمە کارەی خۆی و بەبێ هاوکاری حکومەت خۆی دەژیاند. دوو کوڕەکەی بیبی ڕوباب مەلا، محەمەد و حسێن کرێکاری کارگەی ئیقبال بوون. لە ساڵی (١٣٤٠-١٩٦١) دا ڕۆژانە سیودوو ڕیاڵیان وەردەگرت. ژنی محەمەد خەڵکی گوندەکانی لای بافق بوو، ئەو ژنە چێشتی هەرزن و نانی هەرزنی دەخوارد.. دوو برا دوو شەفت کاریان دەکرد، تاکو کەمێک پارە کۆبکەنەوە، دەیانویست ژوورێک لە حەوشەکەی خۆیاندا و بەتەنیشت خانووەکەی دایکیانەوە دروستبکەن. ئەوان خۆیان زۆر شەکەت دەکرد و خواردنیان کەم دەخوارد، تاکو بتوانن ژوورێک بۆخۆیان دروستبکەن. محەمەد لە تەمەنی چلوپێنج ساڵیدا و حسێن لە چلودوو ساڵیدا و ژنی محەمەد لە سیوهەشت ساڵیدا مردن. مردنەکەیان بە هۆی بەدخۆراکییەوە بوو. تاران نشینیەکان و شار نشینیەکان نازانن چ هۆکارێک ئەو هەژارانە پەلکێش دەکات تاکو لە دەوروبەری شارەکاندا کۆببنەوە. لە هەندێک لە گوندەکانی سەراوانی بلوجستان خەڵکانێک هەن کە ناوکە خورما دەکەن بە ئارد و بەو ئاردە چێشت و نان دروستدەکەن و دەیخۆن. تا دەیەی ساڵی (١٣٤٠-١٩٦١) خەڵکە هەژارەکانی ناوچەی سەرخیس و هەژارەکانی گوندەکانی وەک و کچوڵی، تام ڕەسوڵ و تام موختار لە هەژارەکانی خەڵکی سۆماڵی ساڵی (١٣٩٠-٢٠١١) کەمتر نەبوو. هەر بەهۆی ئەو بەدخۆراکیەوە تێکڕای تەمەنی مرۆڤەکان لە (٣٤-٣٥) ساڵ تێنەدەپەڕی. ئەم پارەی نەوتە کە بووە مەکینەی ئابووریی وڵات گۆڕانکارییەکی گەورەی لە ژیانی خەڵکیدا دروستکرد، بە سەدان کەس بە هۆی پارەی نەوتەوە بێ ئەندازە دەوڵەمەند بوون. بەگشتیش خەڵکی لە برسێتی و هەژاریی و پێپەتێتی ڕزگارکرد. لە کۆتاییدا، کوبرا شارەزایی لە ماڵەکە و کارەکانیدا پەیدا کرد. وردە وردە لەگەڵ هەموو شتەکاندا ڕاهات، تەنانەت لەگەڵ سووکایەتی پێکردنی حاجی شەوکەت خانمیش. کوبرا بەزوویی فێربوو کە دەبێت بەیانیان زوو پێش خۆرهەڵاتن لەخەو هەڵسێت و تا نیوەشەوێکی درەنگ کار بکات. پێشتر باوکی و خزمەکانی کە چووبوون بۆ کەتیرە کۆکردنەوە باسی ژیانی بەکرێگرتنی مرۆڤەکانیان بۆ کردبوو. کەتیرەکەرەکان تا کاتی خۆرئاوابوون کاریان دەکرد، بەڵام کوبرا دەبوو تا نیوەشەو بەردەوام کاری بکردایە. دەبوو بەیانی زوو لەگەڵ خوێندنی کەڵەشێردا سەری لەسەر سەرین هەڵبگرتایە، ئەگەر سەرینیشی هەبوو بێت. ماڵی حاجی ئاغا، لە یەکێک لە ژوورەکانی خوارەوەدا چەند مەڕێکیان هەبوو، دەبوو کوبرا بەیانیان زوو هەڵسێت، مەڕەکان بدۆشێت و شیرەکە بکوڵێنێت و بیکات بە ماست، چونکە حاجی ئاغا زۆر حەزی لە ماستی مەڕ بوو. دوای دۆشینی

مەرەکان دەبوو نانی بەیانی ئامادە بکات، چونکە منداڵەکان دەڕۆیشتن بۆ قوتابخانە، دەبوو کاتژمێر (٦:٣٠) نانی بەیانی ئامادە بێت و پاشان قاپ و پیاڵەکان بشۆرێت.

بیبی بەهابادی تەواو پیر ببوو، توانای کارکردنی نەمابوو، بۆیە پێیان گوتبوو بڕوات و ئیتر ئەو بە کەڵکی کارکردن نەماوە. ئەویش بەرەو گوندەکەی خۆی بەڕێکەوت. بیبی دوای پەنجا ساڵ کارکردن لەو ماڵەدا بە پیری و بەو هەموو ڕەنجەی دابووی بەبێ هیچ مووچەیەک، بەخۆی و بوخچەیەکی بچووکی جلە کۆنەوە بەرەو گوندەکەی خۆی گەڕایەوە. بەرەو شوێنێک ڕۆیشت کە پێشتر بەهۆی هەژاریی و نەبوونییەوە جێیهێشتبوو. دوای دوو مانگ مانەوەی لە گوندەکەیاندا هەواڵی مردنی بیبی بەهابادی گەیشتە شار. ئەو هەواڵە زۆر بە ئاسایی و بە سادەیی هەموو کەسێک وەریگرت، مردنی ئەو لەلای ئەو کەسانەی کە ساڵەها بوو خزمەتی کردبوون هیچ شوێنەوارێکی جێنەهێشت و هیچ کەسێک فاتیحایەکی بۆ نەخوێند.

بە ڕۆیشتنی بیبی، کوبراش دەبوو فێری چێشتلێنان ببێت و خواردنی نیوەڕوان و ئێوارانی ئامادە بکات، دەبوو هەمیشە لەکارکردندا بێت. نەدەزانرا کوبرا زیاتر بە لەش ماندوو بوو یاخود بە ڕوح، چونکە دەبوو بەردەوام حەوشێکی (٦٠٠-٧٠٠) مەتری و ڕاڕەو و پلیکانەکان پاک بکاتەوە. شەوانی هاوین دەبوو لە سەربان پەردەکوللەکان هەڵبدات و بەیانیانیش کۆیان بکاتەوە، دانان و کۆکردنەوە ئەو پەردە کوللانە کارێکی دژوار بوو، هەموو کەسێک نەیدەتوانی بەئاسانی ئەو کارە ئەنجامبدات. هەروەها خانوویەکی (٣٥٠) مەتری گسک دەدا، ئەو کاتە گسکی کارەبایی لە هەموو شوێنێک نەبوو. پاشان لەسەر بڕیاری شەوکەت خانم گسکێکی کارەبایی بۆ کوبرا دابینکرا. دەبوو دوای هەموو ژەمێکیش قاپەکان بەزوویی بشوات. بیری لێبکەرەوە بزانە گۆڕانکاری تەکنولۆژیای قاپشۆر و جلشۆر و گسکی کارەبایی چ خزمەتێکیان بە خزمەتکار و نۆکەرە داماوەکان کردووە. ئەم خزمەتکارانە کە دیل و بەندی سەردەمی تازەن مەگەر خزمەتکار و بەندەکان چۆن چۆن کار بکەن. ئەم خزمەتکار و نۆکەرانە ماڵ و موڵکی ئەربابەکانیان بوون، ئەمانە کڕین و فرۆشتنیان پێوە دەکرا. لانیکەم ئەربابەکان بۆ پاراستنی سەروەت و سامانەکانیان پشتیان بە ئەمان دەبەست. هەتاکو توانایان هەبووایە و کاریان پێبکرایە بە ئارەزووی خۆیان دەیانچەوساندنەوە، پاشان کە پەکیان دەکەوت و کاریان پێنەدەکرا، وەکو بیبی بەخۆیان و بوخچەکانیانەوە دەریاندەکردن، تا پاش یەک دوو مانگ لە شوێنێکدا دەمردن. هەروەکو شاری یەزد، لە شارەکانی تریش هەر بەهەمان شێوە بوو. بەتایبەتی لە کرمان، بەندەرعەباس، شیراز، بلوجستان و....تا

دەوروبەری ساڵی (١٣٣٠-١٩٥١) کۆیلە ڕەش پێستەکان یا کاکەڕەشەکان، بەشێوەی خزمەتکار و نۆکەر دەچوونە ماڵان. ئەم خزمەتکار و کۆیلانە تا ساڵی (١٣٦٥-١٩٨٦) لە بلوجستان ڕەواجیان مابوو. لەشوێنە دوورە دەستەکانی بلوجستان وەک گوندەکانی (کەتیج) ی نێوان ئێرانشەهر و بوشگارد و هەندێک لە گوندەکانی میناب تاساڵی (١٣٧٥-١٩٩٦) هەر مابوو. کڕین و فرۆشتنی کۆیلە و بەندەکان بە میرات بۆ دەوڵەمەند و سەرمایەدارەکان دەمایەوە. لە ساڵی (١٣٩٠-٢٠١١) من لەگەڵ هاوسەرەکەم فاتمەی وسوقی و فەربودی پاپۆلی کوڕمدا چووین بۆ سەردانێک لە چابەهار شوێنێک کە ئێستاش (١٣٩١-٢٠١٢)، بۆنی هەژاریی لێدێت و جەرگی مرۆڤ دەسوتێنێت.

کوبرا دوای شۆرینی قاپ و سفرە کۆکردنەوەی نیوەڕۆ، دەبوو عەسرانیش دووبارە خوان ئامادە بکات بۆ منداڵان، لەکاتی گەڕانەوەیان لەقوتابخانە، کوبرا شەوانە دەوروبەری کاتژمێر دوازدە ی شەو دەنووست، ئەگەر زۆر تریش خەوی بهاتایە مۆڵەتی نەبوو بخەوێت. کاتێک هەموو ئەندامانی خێزانەکە دەنووستن، ئەویش لە جێگایەکی ئەو خانووە گەورەیەدا دەنووست. ئەوکاتە هێشتا لە شاری یەزد دا تەلەفزیۆن نەبوو، بە نەبوونی تەلەفزیۆن خەڵکی شار شەوانە زووتر دەنووستن. کوبرا چەندین ساڵ لەو ماڵەدا شوێنێکی دیاریکراوی نەبوو تاکو لێی بخەوێت، چەندین ساڵ لێفە و دۆشەکێکی خۆی نەبوو. لە ساڵی (١٣٩١-٢٠١٢) دا پاش پەنجا ساڵ کارکردن لەو ماڵەدا لێفە و دۆشەکێکی نەبوو. هەر کاتێک حاجی شەوکەت خانم قاچەکانی ئازاریان هەبووایە، دەبوو کوبرا بێت و بە هێواشی قاچی بۆ بشێلێت. لەو ماڵەدا بەهیچ جۆرێک بێکاری نەبوو. کوبرا دەبوو هەمیشە وەک فرفرۆکە هەڵسوڕێت. تەنانەت ئەگەر یەک چرکە بێکاربووایە شەوکەت خانم کارێکی بۆ دەدۆزیەوە و نەیدەهێشت بێکار بێت. خزمەتکار بۆی نەبوو بێکار دانیشێت. ئەگەر هیچ کارێک نەبووایە حاجی شەوکەت خانم دەیگوت کوبرا دەنگی مریشک و کەڵەشێرەکان لە باخەکەوە دێت خێرا بڕۆ بزانە چەقەڵ نەچووەتە کولانەکەیانەوە، کوبراش دەبوو بە غاردان بڕوات، هەرچەندە باش دەیزانی کە نەهەستی چەقەڵ هەیە و نە چەقەڵ دەتوانێت بچێتە حەوشەکەوە، بەڵام ئەو دەبوو زۆر بەخێرایی بڕوات و سەیرێکی کولانەی مریشکەکان بکات. سەرەڕای ئەو هەموو ئەرکەی لەسەری بوو، کوبرا وردە وردە گەورە دەبوو ئەو خواردنەی دەیخوارد سەد ئەوەندەی خواردنی گوندەکەی خۆیان باشتر بوو. وردە وردە ڕەنگ و ڕوی جوانتر دەبوو، ببووە خاوەنی بەژن و باڵایەکی جوان.

نیلۆفەر کچە گەورەی حاجی ئاغا کچێکی گەورە و تەواو بوو، لەشولارێکی ڕێکو

پێکی هەبوو، بالای کەمێک لە بالای کوبرا بەرزتر بوو، چاوەکانی گەورە بوون، ڕەنگی چاوی کوبرا شینی ئاسمانی بوو، بەلام نیلۆفەر چاوەکانی ڕەش بوون. کوبرا و نیلۆفەر هەریەکە و جوانی تایبەتی خۆیان هەبوو. جوانیەکەیان جیاواز بوو لە یەکتر، هەردوکیان جوان بوون، بەلام جیاوازییەکەیان لە دەستەکانیاندا بوو. یەکیان دەستەکانی بریندار و هەمیشە پێچراو بوون، ئەوی تریان دەستەکانی وەک لۆکە نەرم بوو. کوبرا وەک کەسێکی گەورە و تەواو، شەو و ڕۆژ بەردەوام کاری دەکرد، بەلام نیلۆفەر کارەکانی کوڕانە بوو، پاسکیلەکەی ئەسغەری دەبرد و لە کۆلان بە سواری پاسکیل دەسوڕایەوە. لە خەڵکی دەدا و ئازاری دەدان، هەرچەندە لە دلا میهرەبان بوو، بەلام ڕەفتاری توند بوو.

ئەو کاتە تەلەفۆن لە هەموو شاردا نەبوو، زۆربەی ماڵەکانی یەزد تەلەفۆنیان نەبوو. ماڵی حاجی ئاغاش لە قەراغ شار بوو، هێڵی تەلەفۆن نەگەیشتبووە گەڕەکی ئەوان. کارەکانیان بە نامە ناردن ئەنجامدەدا، هەر بۆیە شاگردەکانی حاجی ئاغا هەمیشە لە نێوان ماڵی حاجی و شوێنە جیاوازەکانی تری شاردا لە هاتوچۆدا بوون. دیارە کرێکارەکان بە بەلاش کاریان بۆ حاجی ئاغا دەکرد. واتە تەواوی کرێکارەکان، وەک ڕەنجبەری بێکرێ وابوون. چونکە حاجی ئاغا مۆڵەتی دەدان، باری بازرگانەکان بگەیەنن بۆ شوێنی دیاریکراو، لەبری ئەوە ئەو بێچارانە دەبوو بێگاری بۆ ماڵی حاجی بکەن. ئەو کرێکارانەش کە لە دوکانی حاجی کاریان دەکرد و بەخشیشیان وەردەگرت، هیچ ڕۆژانەیان نەبوو، هیچ کەسێک کرێیەکی پێنەدەدان تاکو دڵیان پێی خۆشبێت، دەبوو زوو کارەکانی شەوکەت خانم ئەنجامبدەن و بگەڕێنەوە بۆ دوکان. شەوکەت خانمیش دەیزانی کە ئەو کرێکارانە هەموویان بە بێگاری هاتوون، ئەو هیچ پەلەیەکی نەبوو، بیری لەوە نەدەکردەوە ئەو کرێکارە بەلاشانە زووتر بەڕێبکات. دەبوو ئەوان لە دەرەوەی ماڵ، لە چاوەڕوانیدا بوونایە تاکو شەوکەت خانم بڕیاری لەسەر کارێک دەدا. شەوکەت خانم هەرگیز چا، یا میوە و هەر شتێکی تری نەدەدا بە کرێکارەکان. لە تەواوی تەمەنیدا تەنها جارێک بە خەیاڵیدا نەهاتبوو کە پاداشتێک بدات بەو بێچارانە، تەنانەت زمانی هاندان و پیاهەڵدانیشی نەبوو، جگە لە زمانی ڕق و کینە و سوکایەتی پێکردن. ئەو گەنجە لادێییانەی لە گوندەکانەوە، بە مەبەستی کارکردن دەهاتن بۆ شار، باربەرییان دەکرد، ئۆتۆمبێل شۆرییان دەکرد، سەرباری ئەوەش، دەبوو بێگاری بکەن بۆ ئەم ژنە، چونکە هاوسەرەکەی مۆڵەتی پێدابوون ئەوان لە دوکانەکەیدا کاربکەن. تەنانەت ئەوان کرێکاری هاوسەری ئەم ژنەش نەبوون و ئەوان هیچ کرێیەکیان لە

حاجیش وەرنەدەگرت، تەنها لەناو بازاڕ و دەوروبەری حاجیدا کاریان دەکرد. لە ساڵی (١٣٤٣-١٩٦٤) سەرپەرشتیاری کاروانسەراکەی حاجی، پیاوێکی تەمەن پەنجاوپێنج ساڵ بوو، ئەو پیاوە تا کۆتایی تەمەنی هەموو ڕۆژێک نانی تازە و گۆشت و هەموو پێداویستیەکانی تری بۆماڵی حاجی دەکڕی و بە پاسکیل چەند کیلۆ مەترێک پایدەری لێدەدا و تاکو خۆراک و پێویستیەکان بگەیەنێتە ماڵی حاجی ئاغا. کرێکەشی تەنها ئەوە بوو کە بەخشیشی لە خەڵکانی تر وەردەگرت، نەک لە حاجی ئاغا یان حاجی خانم. ئەو حاجی خانمە لە ساڵێکدا تەنها دوو ڕیاڵی نەدەدا بە هەژاران. دیارە هیچ کەسێک نرخی بۆ کاری ئەم کرێکارانە دانەدەنا. دەبوو ئەوان لەبەر دەرگا بۆ ماوەیەکی زۆر چاوەڕوان بوونایە، ئەو کاتە دەرفەتێک بۆ نیلۆفەر دەڕەخسا تا پاسکیلی ئەم بێچارانە بەرێت بۆ کۆڵانە چۆڵەکانی دەورو بەری ماڵیان.

ئەگەر کرێکارێکیش ڕێی نەدایە نیلۆفەر پاسکیلەکەی بەرێت، نیلۆفەر بە چەقۆیەک تایەی پاسکیلەکەی کون دەکرد و پەنچەری دەکرد. ئەو ڕەفتارە بەلای نیلۆفەر و هاوشێوەکانی دیاردەیەکی تازە بوو لە یەزد. لە سەرەتای دەیەی (١٣٤٠-١٩٦٠) دا، تا ئەو کاتە زۆر بەکەمی کچان لە نێو کۆڵانەکاندا سواری پاسکیل دەبوون. حاجی شەوکەت خانم چەند برایەکی هەبوو، هەموویان بەدوای کچێکی شۆخ و شەنگ و بەلاشدا دەگەڕان، بەتایبەت برا گەورەکەی. شەوکەت خانم دەبوو زۆر ئاگاداری کچەکەی بکردایە هەر بۆیەش وەک دایکێک ئاگاداری کوبراشی دەکرد و زۆر باش چاودێری دەکرد. نەوەکا گورگەکان بەڵایەکی بەسەربێنن. هەندێک وا بیریان دەکردەوە کە کوبرا پارووی یەکی چەورە، بەڵام ئەوان زوو تێگەیشتن کە حاجی شەوکەت خانم ژنێکی زرنگ و وریایە. جار جارێک کوبرا ئەگەر چاوی حاجی شەوکەت خانمی لێدیار نەبوایە بسکەکانی شانە دەکرد و لەبەر جامی پەنجەرەکەوە ڕووە و کۆڵان دەوەستا. هەرچەندە کۆڵان چۆڵ بوو، ماڵی حاجی ئاغا دراوسێیان نەبوو، بەڵام پشیلە لە دە کیلۆ مەترەوە بۆنی بەز دەکات، گەنجەکان بینیبوویان کە کچێکی شۆخ و شەنگ و سووروسپی بە چاوی شین و قژی درێژەوە لە بەردەمی پەنجەرەدا دەوەستێت، هەر بۆیە هاتوچۆی گەنجەکان لە کۆڵاندا زیادیکرد، جارجاریش لە بەرخۆیەوە گۆرانی دەگوت. کوبرا وا خۆی بە خەڵکی ناساند بوو کە کچی حاجی ئاغایە. شەوکەت خانم تێگەیشت کە دەبێت زیاتر چاودێری بکات. کوبرا تەمەنی (١٥-١٦) ساڵ بوو ڕۆژێک خوازبێنی هات داواکارەکەی کوڕێکی گەنج بوو، شاگرد ئوتومبێل بوو. کوبرا پێیڕازی نەبوو، داوای هاوسەرێکی باشتری دەکرد. حاجی شەوکەت خانمیش هەر ڕازی نەبوو شووی پێبکات، چونکە ئەگەر کوبرا

شووی بکردایە و بڕۆیشتایە کەسێکی تر نەدەبوو بە کارەکەری.

کچە جوان و بەناز پەروەردەکەی حاجی ئاغاش تەمەنی شازدە ساڵ بوو، بەڵام وەک کچێکی بیست ساڵ دەردەکەوت، لە کۆڵان و سەر ڕێگای قوتابخانە، کوڕان زۆر دەهاتنە سەر ڕێگای. کچانی حاجی ئاغا جارجار بە ئۆتۆمبێلی باوکیان دەچوون بۆ قوتابخانە. لەو ساڵانەدا گرتنی پاس بۆ قوتابخانە باو نەبوو، قواتابیان هەر بە پێ دەچون بۆ قوتابخانە. کاتێک نیلۆفەر بە پێ دەچوو بۆ قوتابخانە، هەمیشە چەند گەنجێکی شۆخ و شەنگ بە سواری پاسکیلەوە نزیکی دەبوونەوە پێشوازییان لێدەکرد و ڕێزیان بۆ دەنواند، بەڵام کەسیان هیچیان پێنەبڕا، هیچ کام لەو کوڕانەی لێی دەچوونە پێشەوە جگە لە قسەی زل و پێڕابواردن و جوێن، هیچ شتێکی تریان دەستنەدەکەوت، بەڵام بوونی ئەو هەڵسوکەوتە لەو سەردەمەدا بۆ گەنجەکان شتێکی خۆش و وزە بەخش بوو. چەند کەسێک لەوانە کە دەچوونە سەر ڕێگای نیلۆفەر هاوپۆلی من بوون. ئەوانە بەیانیان خۆیان قیتوقۆز دەکرد و جۆرەها بۆنی خۆشیان لە خۆیان دەدا و ڕیشیان دەتاشی و یەخەی کراسەکانیان بەرز دەکردەوە و هەموو بیر و هۆشیان لەسەر ئەوە بوو کە ئاخۆ نیلۆفەر سەیریان دەکات یان نا. دیارە لە سەردەمی گەنجیدا خەڵکانی وەکو هاوپۆلەکانی من خۆیان بۆ هەموو کچێک دەڕازاندەوە، نەک تەنها بۆ نیلۆفەر. نیلۆفەر هەندێک جار شەڕی لەگەڵدا دەکردن و لە کوڕەکانی دەدا و بە گژیاندا دەچووەوە.

حاجی ئاغا و حاجی شەوکەت خانم، لە بیری ئەوەدا بوون کە دەبێت کچەکەیان بە شوو بدەن. ئەو نەدەچوو بۆ قوتابخانە، بۆیە هیچ پەیوەندییەکی لەگەڵ کوڕاندا نەبوو. نیلۆفەر هەڵسوکەوتی بە جۆرێک بوو هەموو خەڵکی شارەزای ببوون.

کوڕێکی ئەندازیار هاتبوو بۆ خوازبێنی، بەڵام حاجی ئاغا و حاجی خانم هاواریان لێهەڵسا بوو، دەیانگوت باوکی ئەم ئەندازیارە خوێ فرۆشە، چۆن توانیویەتی بێت بۆ خوازبێنی کچی ئێمە. دایکی حاجی ئاغاش هەروەک و حاجی خانم وابوو، ئەگەر کەسێک بهاتایە بۆ داواکاری کچەکەیان و ئەو ماڵەیان بەدڵ نەبوایە دەیگوت ئەوانە کەی مرۆڤن. خوازبێنیکەرێکی تر خوێندکاری پۆلی شەشەمی پزیشکی بوو، باوکی بازرگانێکی مامناوەندی بوو، بە ئەوانیشیان دەگوت ئەمە چ مەخسەرەبازییەکە، ئەم تازە پیاکەوتووانە چۆن ڕوویاندێت داوای کچی ئێمە بکەن. خۆ پەکمان لەسەر دکتۆر نەکەوتوە، چ زۆرە، دکتۆر زۆرە. هەڵبەت لەو سەردەمەدا دکتۆر زۆر کەم بوو. ئیتر ئەوان بە گاڵتە پێکردنەوە دەیانگوت، نەک کچەکەی خۆمان کوبراش نادەین بەو جۆرە خەڵکانە. کوڕێکی تر دایکی ناردبوو بۆ ماڵی حاجی و داوای کوبرای کردبوو، بەڵام

کاتێک کە زانیبووی کوبرا کچی ماڵی حاجی نییە و کارەکەری ماڵی حاجییە، زوو پەشیمان ببوونەوە.

لە دەیـەی ساڵی (١٣٤٠-١٩٦١)دا، شا وردە وردە بەهێز دەبـوو، بەرنامەی چارەسەری کێشەی زەوی و خۆماڵیکردنی لەوەڕگەکان لەکاتی جێبەجێکردندا بوو. سەرکوتکردنی تودەییەکان و حیزبە ئیسلامیەکانی دژی وڵاتی پەهلەوی بـەردەوام بوو.. لایەنگرانی دکتۆر موحەمەد موسەدیق یا پیر ببوون یا بەلاوەنرابوون. لایەنگرانی شۆرشی (١٣٣٢-١٩٥٣) لەسەر کار لادرا بوون. لە مانگی دەی (١٣٤٠-١٩٦١) وردە وردە ساواک و پۆلیس و سوپا بەرەو بەهێزی دەڕۆیشتن، بەهۆی داهاتی نەوتەوە باری ئابووریی وڵات لە گەشەسەندندا بوو. شارەکانیش بەرەو پێشکەوتن دەچوون. وردە وردە چەند شەقامێکی تازە دروستکران. چوار شەقام و چەند کۆڵانێکیش قیرتاوکران. پیشەسازیی‌یش بەرەو فراوانی دەچوو، بازاڕ و بازرگانی‌یش ڕەونەقێکی بە خۆیەوە بینی بوو. تەلەفۆن و کارەبا زۆر ببوو، حەمامی دوش پەیدا ببوو. پێموابێ بەر لە ساڵی (١٣٤٠-١٩٦١) لە هیچ شوێنێکی شاری یەزد حەمامی دوش نەبوو. دیارە دوش لە حەمامەکاندا هەبوون، بەڵام ئەوانە حەمامی گشتی بوون. حەمامی دوشی نمرەیی لە پێش ساڵی (١٣٤٠-١٩٦١) تەنها یەک حەمام هەبوو، ئەویش حەمامی پارس بوو لە شەقامی پەهلەوی -ئیمام خومەینی ئێستا-، لە نێوان گەراجی ئەتمینان و گەراجی ئۆتوتاج دا. لەماڵەکانیشدا زۆر بەکەمی حەمام هەبوون، لە گەڕەکی ئێمە، واتا گەڕەکی پشتی باخ تا ساڵی (١٣٤٥-١٩٦٦) تەنها یەک ماڵ حەمامیان هەبوو.

هەر لەو ساڵانەدا ئاژاوەگێر و چەقۆکێش و عەرەقخۆر و قومارچیەکانی ناوبازاڕ پەکیانکەوت و کەم بوون. واتە کۆمەڵگەی شارنشین بەرەو پێشکەوتن دەچوو. تەنانەت کەسە تلیاک کێشەکانیش ژمارەیان بەرەو کەمی دەچوو. ئیتر لە شارەکاندا خەڵکانی پێپەتی نەدەبینران. شارەوانی مۆڵەتی بە کەس نەدەدا بە بیجامە و دەرپێی کورتەوە بە بازاڕ و کۆڵانەکاندا بگەڕێت. من خۆم جارێکیان ئاگاداربووم کە پۆلیس عەباسی نیوەنگیان بەگیرهێنا بوو، چونکە بیجامەی لە بـەردا بـوو، پاسکیلیشی لێدەخوڕی، عەباس هەرچەند هاواریکرد و پاڕایەوە، سوودی نەبوو، لە کۆتاییدا پەنجاودوو ڕیاڵ سەرپێچییان لێ وەرگرت و ئازادیان کرد. هەڵبەت عەباس ئەو پارەیەی پێنەبوو، دوکانێک لەو نزیکەوە هەبوو کە هی عەباسی بەیرینی بوو پارەکەی لەو قەرز کرد و دای بە پۆلیسەکان، ئەوانیش ئازادیان کرد. تا دەوروبەری ساڵی (١٣٤٢-١٣٤٣=١٩٦٣-١٩٦٤) زۆربەی پیاوان یا بەهۆی هەژاری و نەبوونیەوە یاخود بەهۆی کارئاسانیەوە بوو، بە

بیجامە و دەرپێوە دەچوونە بازاڕ. کاتێک باری ئابووریی خەڵکیی باشتر بوو. پیاوانی جل دڕاو و جل پینەکراو زۆر کەم بوون. پینەچیەکانیش کەلوپەلی خۆیان پێچایەوە، چونکە ئیتر هیچ کەسێک پێڵاوەکانی پینە نەدەکرد. دیاردەی سواڵکردنیش تەواو کەم ببوو. چوار خانووی خشتی سوور لە شاردا دروستکران. هاوکات گەڕەکێکی تازە دروستکرا بەناوی گەڕەکی (سەفائیە)وە، ئەم گەڕەکە لە مێژووی بیناسازی ئێراندا جوان و سەرنجڕاکێش بوو. شارۆچکەی سەفائیە یەکەمین شارۆچکەیە، لە دوای شۆڕش بە بەرنامە و بەشێوازی تازەی ئێران بنیاتنرابێت. هەڵبەت پێشتریش شارۆچکەی لەو جۆرە دروستکرا بوون، بەڵام نەک بەو جوانی و فراوانیەی سەفائیە. تایبەتمەندی سەفائیە ئەوە بوو کە شارۆچکەکە بەهاوبەشی خەڵک و حکومەت دروستکرابوو، بێگومان شار و شارۆچکەی تر کە بە پارەی حکومەت دروستکرابوون کەم نەبوون. لەکاتی وەگەڕخستنی پارەی نەوت و چارەسەرکردنی کێشەی زەویدا، چینی مامناوەند لە کۆمەڵگەدا خەریکبوو پەیدا دەبوو، چینی مامناوەند کە بە هەوڵ و تێکۆشانی خۆی جێگەی خۆی دەکردەوە. گەنجەکان بە هەوڵ و تێکۆشان و خوێندنی خۆیان بەئامانج دەگەیشتن، ئایندەی وڵات لەدەست ئەم چینەدا بوو. هاوشێوەکانی حاجی شەوکەت خانم و خەسووەکەی ڕۆڵیان بەسەرچووبوو. خاوەنکارە کۆنەکان کاری تازەیان قبوڵ نەبوو. لە ڕوانگەی ئەوانەوە لە هەموو شاری یەزد دا، تەنها (٥٠ تا ١٠٠) ماڵ بە مرۆڤ ئەژمار دەکران و ئەوانی تر مرۆڤ نەبوون.

نیلۆفەر تەمەنی نەچووبووە شازدە ساڵ کە لەلایەن بنەماڵەیەکی دەوڵەمەندی بازرگانەوەداوا کرا، حاجی ئاغا و حاجی شەوکەت خانم و دایەگەورە و تێکڕای خزمەکانیان بەبێ هیچ لێکۆڵینەوەیەک لەبارەی ماڵی زاواوە یەکڕاست ڕازی ببوون، ئەوان بەبێ ئەوەی جیاوازی نێوان بنەماڵەیی و فەرهەنگی کوڕ و کچەکە لەبەرچاو بگرن ڕازی بوون. چونکە جگە لە پارە هیچ پێوانەیەک لە کاردا نەبوو. حاجی ئاغای باوکی زاوا، بازرگان و خاوەن کارگەیەکی گەورە بوو. هەروەها بنەماڵەیەکی کۆنی یەزدی بوون. بنەماڵەیەک بوون، لانیکەم سەدوپەنجا ساڵ دەبوو لەگۆڕەپانی ئابووریی یەزد دا لەڕیزی پێشەوە بوون. زاوا تەمەنی نزیکەی سی ساڵ دەبوو خوێندکاری ئەندازیاری چنین بوو لە وڵاتی ئیتاڵیا. باوکی زاوا یەکێک بوو لە خەڵکە هەرە دەوڵەمەندەکانی یەزد، بەڵام قسە لەسەر ئەوە بوو گوایە زاوا نەخۆشی دەروونیی هەبێت. هەندێک کەس ئەم زەماوەندەیان پێخۆش نەبوو. ئیرەییان پێدەبردن و بەگاڵتەپێکردنەوە باسیان دەکردن و دەیانگوت زاوا شێتە. هیچ هەلێک بۆ نیلۆفەر هەڵنەکەوت تا لەگەڵ مەنوچەهردا

یەکتری بناسن، تەنانەت هەلێک هەڵنەکەوت کە بنەماڵەکانیشیان باشتر یەکتری بناسن. لە سەرەتای خوازبێنیکردنەوە تاکو ڕۆژی بووک گواستنەوە مانگێکی نەخایاند. بووک کچێکی کەم تەمەنی دەستوپێ سپی بوو. دایکی فێری هیچ کارێکی نەکردبوو، بووک تەنها ئەوەندەی دەزانی کە گاڵتە بەخەڵکی بکات. لە هەموو تەمەنیدا پێنج کەسی زیرەک و وریای نەبینی بوو، جا چ بگات بەوەی ئەو جۆرە خەڵکانە بناسێت، لە هەموو کتێب و گۆڤارەکانی ئەو سەردەمەدا تەنها گۆڤاری ژنی ڕۆژ و تارانی وێنەیی بینی بوو.

زەماوەندەکەیان لە ساڵی (١٣٤٧-١٩٦٨) دا بوو، چێشتلێنەریان لە ئەسفەهانەوە هێنا بوو، جۆرەها خواردن ئامادەکرابوو، ئەو شەوە سەدان بتڵی شەراب ئامادە کرابوو. حاجی شەوکەت خانم دەیگوت نابێت لە مەڕاسیمی زەماوەندا شەراب بخورێتەوە، چونکە تاوانە و خێر و بەرەکەت ناهێڵێت. حاجی ئاغاش دەیویست زەماوەندی کچەکەی لە شاردا بێ وێنە بێت، خۆشحاڵبوو کە کچەکەی شوو بەکوڕە دەوڵەمەندێکی گەورە دەکات. بنەماڵەی زاواش لە شاردا بنەماڵەیەکی ئایینی بوون، لەگەڵ ئەوەدا نەبوون کە شەراب بە ئاشکرا بخورێتەوە. پێدەچوو، یەکەمین ناکۆکی لە نێوان ئەم دوو بنەماڵیەدا لە هەمان ڕۆژی زەماوەندەکەدا بووبێت، بەهۆی خواردنەوەی شەرابەوە. خۆ ئەو کاتە شەراب خواردنەوە لە تەواوی شارەکانی ئێراندا کارێکی ئاسایی بوو. ئەگەر سەیری کتێبی (پترۆ دولاوالـە) بکەیت تێدەگەیت کە شا عەباسی سەفەوی چۆن میزی مەی خواردنەوەی بۆ ڕازاوەتـەوە. ئەگەر مێژووی (بیهەقی) بخوێنیتەوە دەبینیت کە چۆن پادشا و گەورە پیاوانی وڵاتی ئێمە تەنانەت ئەو کەسانەش کە خۆیان بە نوێنەری ئیسلام دەزانی چۆن مێزی شەراب خواردنەوەیان بۆ ڕازاوەتەوە. ئێستا هەندێک کەس وا هەستدەکەن تەنها محەمەد ڕەزا شای پەهلەوی مەی و شەرابی خواردۆتەوە. بەدبەختی محەمەد ڕەزا شا ئەوە بوو لە سەردەمی ئەودا تەلەفزیۆن پەیدا ببوو، مەی خواردنەکەی ئەو نیشانی هەموو خەڵکی دەدرا. لە شارەکەی ئێمەدا لە هەندێک زەماوەندا مەی و شەراب دەدران بە خەڵکی، بەڵام بە هەندێک خەڵکی تایبەت و لە شوێنی تایبەتدا، کەچی لە زەماوەندی نیلۆفەردا بە ئاشکرا مەی و شەراب دەدرا بە هەموو کەسێک. لە دوای شۆڕش هەموو جۆرە خواردنەوەیەک بە یەکجاری قەدەغەکرا. زۆرێک لە ئێمە میراتگری هەخامەنشینەکان و ساسانیەکانین، هەندێک کار هەیە ناتوانین بە ئاشکرا ئەنجامی بدەین. دیارە لە سەردەمی هەخامەنشینەکان و ساسانیەکاندا ڕەنگە مەی و شەراب خورابێتەوە و کەمتر مەست بووبن، بەڵام مەی خۆرەکانی ئەم سەردەمەی ئێمە، ئەگەر تەواو مەست نەبن و ژیری خۆیان لە دەستنەدەن وەک ئەوە وایە هیچیان

نەخواردبێتەوە.

باری ئابووریی حاجی ئاغا باش بوو، بەڵام ئەوەندەی ماڵی زاوا دەوڵەمەند نەبوون. حاجی ئاغا لەگەڵ سیاسی و دەسەڵاتداراندا تێکەڵاوییەکی باشی هەبوو، بەڵام ماڵی زاوا لەو ڕووەوە هیچ دەسەڵاتێکیان نەبوو. واتە سەروەت و سامان زەماوەندی لەگەڵ دەسەڵاتدا دەکرد، لایەنێک پارەدار و دەوڵەمەند، لایەنەکەی تر تێکەڵاو لەگەڵ وەزیر و شارەوانی و بەڕێوەبەرەکان و لێپرسراواندا. هەر کەسێک خۆی لە دەسەڵات و سامان نزیک بکاتەوە هەمیشە لە مەترسیدایە، لە مەترسی بوختان و مەترسی دەرکردن و کەنارخستن، مەترسی مردن. هەر کاتێک لە دەسەڵات نزیک کەوتیتەوە ئەوا هەمیشە لە مەترسیدایت. هەروەها خەڵکانی دەسەڵاتدار و دیکتاتۆریش هەمیشە لە دەوروبەری خۆیان دەترسن. بەدبینی و ترس هەمیشە لە ناخی دەسەڵاتداراندا هەیە. دەسەڵاتدارێک ئەگەر بترسێت ئەوا خۆشی لە پڵنگ ترسناکترە و هەر کەسێک لێی نزیک ببێتەوە، ئەوا تووشی مەترسی دەبێت و بە بچووکترین قسە و جووڵە و ئاماژە، گیانی دەکەوێتە مەترسییەوە. مێژوو نیشانمان دەدات کە دەسەڵاتداران ڕەحم بە منداڵانی خۆشیان ناکەن، هەر وەکو شاعەباسی خۆمان کە چەند کوڕێکی خۆیشی کوشتووە. نادر شا چی لەگەڵ کوڕەکەی خۆی نەکرد، خەلیفەکانی عەباسی چیان بەسەر وەزیرەکەیان و بەرمەکییەکاند نەهێنا، ناصرالدین خانی قاجار مامۆستا و زڕباوکی خۆی (ئەمیر کەبیر) ی کوشت و ڕێڕەوی مێژووی ئێرانی گۆڕی. ستالین هاوڕێکانی خۆی چۆن لەناو بردن. ڕەزاشا چی بەسەر تەیمورتاشدا هێنا. با بگەڕێینەوە سەر باسی نیلوفەر، زاوا کەسێکی هێمن و بەڕێز بوو، بەڵام خەڵکی دەیانگوت نەخۆشی دەروونیی هەیە. ئەگەرچی کەسێکی دونیا دیدە و میهرەبان بوو. لە ڕوانگەی حاجی شەوکەت خانمەوە وا بوو هەر کەسێک خەڵکی هەژار بە مرۆڤ بزانێت ئەو کەسە شێتە. زاوا لە ڕۆژی زەماوەندەکەیدا چوو بۆلای چێشتلێنەرەکان، سەرۆکی چێشتلێنەرەکان شیشێک کەبابی پێشکەش کرد و ئەویش پارچەیەکی لێکردەوە و خستە دەمیەوە و سوپاسی چێشتلێنەرەکانی کرد، ئیتر بوو بە هەرا و دەنگە دەنگ، گوتیان زاوا شێتە. ئەگەر مەنوچەهر شێت نییە چۆن خواردن لە چێشتلێنەرێک وەردەگرێت و سوپاسی دەکات. دەیانگوت ئاخر کوڕی حاجی مەندەلی خاوەن کارگە لەکوێ و چێشتلێنەرێک لەکوێ؟ ئاخر چۆن دەبێت کوڕی پیاوێکی وا دەوڵەمەند سوپاسی چێشتلێنەرێک بکات؟ بۆ ڕۆژی دواییش زاوا پارچە قوماشی پێشکەشی هەموو ئەو کەسانە کرد کە لە زەماوەندەکەدا خزمەتیان کردبوو. پارچە قوماشەکەی پێدەدان و ئەملاولاشی ماچ دەکردن. ئیتر هەندێک کەس دەیانگوت

بە دڵنیایەوە مەنوچەهر شێتە. چۆن دەبێت ئەو عەباسی کوڵبەر و ئەسغەری دەلال ماچ بکات.

کوبراش کاتێک بینی نیلۆفەری هاوتەمەنی خۆی شووی کردووە، ئەویش حەزیدەکرد شوو بکات، ئەویش دەیگوت من شوو بەکەسێکی گەنج و جوان و دەوڵەمەند دەکەم.ساڵی دواتر حاجی شەوکەت خانم لەوە دەترسا کە ئەم کچە تووشی کێشەیەکیان بکات، بۆیە بڕیاریدا بیدات بە شوو. یەکێک لە کرێکارەکانی حاجی ئاغا هات بۆ داواکردنی کوبرا، حاجی شەوکەت خانم، بەو داواکارییە ڕازی بوو، بڕیاریشی دا ژوورێک لە حەوشەکەدا چاک بکات وماڵێکی بچکۆلانەیان بۆ دروستبکات، بەڵام کوبرا ڕازی نەبوو شووی پێبکات و گوتی من شوو بە کەسێکی دەوڵەمەند دەکەم و شوو بە کوڕە هەژار ناکەم. هەرچەندە حاجی شەوکەت خانم پێیگوت کوڕی دەوڵەمەندی خاوەن پارە نایەت بۆ داواکاری تۆ، بەڵام هیچ سوودی نەبوو. لە ماوەی چەند ساڵێکدا زۆر کەس هاتن بۆ داواکاری ئەو، بەڵام کوبرا ئامادە نەبوو شوو بە هیچ یەکێکیان بکات، چونکە هیچ کام لەوانە دەوڵەمەند نەبوون و بەڵکو کوڕە هەژار بوون..

بڕیار وابوو هاوسەرەکەی نیلۆفەر کە نیشتەجێی وڵاتی ئیتاڵیا بوو، بووکە خانیش لەگەڵ خۆی ببات بۆ ئیتاڵیا. ئەو کاتە ئێرانییەکان بۆ ڕۆیشتن بۆ ئیتاڵیا و ئەڵمانیا و تەواوی وڵاتانی ئەوروپا و ئەمریکا پێویستیان بە ڤیزا نەبوو. هەر کاتێک بیانویستبایە گەشتی خۆیان ئەنجام دەدا، بڕیار بوو دوای میوانەکان، بووک و زاوا بڕۆن بۆ ئیتاڵیا و لەوێ نیشتەجێبن. باوکی زاوا، لە گوندی باڵا باخێکی هەبوو، بووک و زاوا چەند ڕۆژێک چوونە ئەوێ، ئەو کەسانەش کە دەیانویست بۆ پیرۆزبایی سەردانی بووک و زاوا بکەن، دەچوون بۆ گوندەکە بۆ لایان.

زاوا کەسێکی بەڕێز و خوێندەوار بوو. بووکیش گەنجێکی (١٦-١٧) ساڵ بوو هەرگیز لە ماڵی خۆیان دوور نەکەوتبووەوە، هیچ شتێک لە هیچ شوێنێک فێر نەببوو، ئەو لە دوای شاهنشا و سەرۆک وەزیران، باوکی بە دەسەڵاتدارترین کەس دەزانی و لە بارەی پێکهاتەی هێز و دەوڵەتەوە هیچ زانیارییەکی نەبوو، لەبارەی بوونی سامانەوە بیری بۆ هیچ شتێک نەدەچوو. دایە گەورەی باوکی، ئامۆژنی، خاڵەکانی و تێکڕای خزمەکانیان کە لە دەورو بەری ئەو بوون خۆیان لە هەموو خەڵکی بە زیاتر دەزانی. هەموو خزمەکانی وەک یەک بیریان دەکردەوە. لەو ساڵانەدا کۆمەڵگە بەرەو گۆڕانکاریی دەچوو، بەهۆی دامەزراندنی زانکۆوە، ژمارەیەک منداڵی ماڵە هەژارەکان، خەریکی خوێندن بوون و خۆیان پێگەیاند، هەرچەندە بنەماڵەکانیان هەژاربوون، بەڵام

ئەو گەنجانە بە هەوڵ و تێکۆشانی خۆیان، بوون بە ئەندازیار و دکتۆر و کارمەند. لە کۆمەڵگەیەکدا کە هەمیشە کەسە پڕوپاگەندەچییەکان دەیانگوت، کێ بووم و باوک و باپیرم کێ بوون و دایە گەورەم کێ بووە، ئەو قسانە هیچ مانایەکی نەما بوو. لەو بنەماڵانەی کە هەموو شانازییەکەیان ڕەچەڵەکی خۆیان بوو، هیچ مانایەکی نەمابوو. لەم ساڵانەدا باری ئابووریی وڵات بە شێوەیەکی ڕێژەیی بەرەو باشتر دەڕۆیشت، پارەی نەوت بەنێو خەڵکیدا بڵاو ببووەوە، کاسبکارە تازەکان، دەبوون بە خاوەنی پارە. بنەماڵەی حاجی ئاغا وەک چەند بنەماڵەیەکی تر ئەم گەنجە تازە پێگەیشتووانە و کاسبکارە تازە دەوڵەمەندبووەکانیان بە مرۆڤ نەدەزانی. دەیانگوت دکتۆر دەبێت هەر وەکو (دکتۆر حاجبی مورتاز) بێت. لە بنەماڵەیەکی گەورە و دیار و ناسرا و بێت، دکتۆر دەبێت کەسێکی بەژن و باڵا بڵند و دەم بەپێکەنین بێت. دکتۆر دەبێت تاکو دوو پشتی لە کەسانی ناسراو و دەوڵەمەند بووبێت. لەو ساڵانەدا دکتۆر (حاجب) وەک هەڵوژەی پاککراوی ئاوداری نمرەیەک وا بوو. لەو ساڵانەدا چەندین ژن لە چاوەڕوانی ئەوەدا بوون کە دکتۆر حاجب بچێت بۆ خوازبێنی کچەکانیان، ئەو ڕۆژگارە دکتۆر حاجب نموونەی کەسێکی باش و خزمەتگوزار بوو، لە بنەماڵەیەکی زۆر باش بوو، دکتۆریش بوو، پارەداریش بوو، کەسێکی ڕووخۆش و بەڕێز بوو. ئەو سەردەمە بەو جۆرە کەسانەیان دەگوت هەڵوژەی پاکراوی ئاودار. خودای گەورە هەمیشە ئاگاداری دکتۆر حاجب بێت و لەشساخ و سەرکەوتوو بێت. ئێستاش کە ساڵی (١٣٩٠-٢٠١١) یە، چلوپێنج ساڵ دوای ئەو قسە و باسانە، هێشتا دکتۆر حاجب هەڵوژەیەکی پاککراوی ئاوداری میهرەبان، بەڕێز، ڕووخۆش و جوانە. ئەو نەخۆشخانەیەکی باشی بنیاتناوە، نەخۆشخانەیەک کە نموونەی باشترین نەخۆشخانەی شارەکەی خۆمان و وڵاتەکەشمانە. خۆزگە پارێزگاری لەم نەخۆشخانەیە دەکرا و تێکرای پێداویستیەکانی بۆ دابیندەکرا، تاکو هەموو نەخۆشێکی تێدا چارەسەر بکرایە. شاری یەزد زۆر شوێن و شتی بەنرخی تێدایە، هەر لە مزگەوتەوە تاکو دروستکردنی باشترین پاقلاوە، کە شانازییان پێوە دەکەین. شتێک کە دەبێت شانازیی پێوە بکەین ئەم سیستەمی نەخۆشخانەیە.

لەم جیهانەدا لە ڕوانگەی حاجی خانمەکانەوە تەواوی ئەو کرێکار و ڕەنجدەرانە جگە لەو کەسانەی کە ماڵی ئەوانیان پاکدەکردەوە، کەسانێکی هیچ لە باردا نەبوو و گاڵتەجاڕ بوون. دێتەوە یادم گەنجێکی وەرزشکار زانکۆی تەواو کردبوو، لە کۆلێژی ماف بەکالۆریسی وەرگرتبوو، لە بنەماڵەیەکی بەڕێز و خۆشەویست بوو، هاتبوو بۆ خوازبێنی یەکێک لە نەوەکانی خانمی گەورە، واتە نەوەی داپیرەی نیلوفەر. باوکی زاوا

دوکانی گیادەرمانی و شەکر و چایی هەبوو. لە ساڵی (١٣٤٦-١٩٦٧) ئەو کەسانەی کە بەکالۆریوسیان لەمافدا وەردەگرت زۆر کەمبوون. لەو ساڵانەدا لە هەموو وڵاتی ئێراندا تەنها لە زانکۆی تاراندا کۆلێژی ماف هەبوو. یەکێک لە خزمە دورەکانی ئەم بنەماڵەیە کرێکاری حەمام بوو، (بە قسەی یەزدییەکان پشیلەکەیان بە سەربانەکەیاندا ڕایکرد بوو) واتە خزمێکی دووری یەکتر بوون، ڕۆژی خوازبێنی هەردولا کۆببوونەوە. دایە گەورەیان گوتبووی ئەی بۆچی سەکینەی دەلاکتان لەگەڵ خۆتاندا نەهێناوە، بەڕاستی سەکینە لە حەمامەکەدا باش لفکە لە پشتی خەڵکی دەدات و باشیان دەشوات. دیاربوو دایە گەورە، مەبەستی لەم پرسیارە چی بوو، مەرامی شکاندنی بنەماڵەی زاوا بوو، مانای ئەوە بوو کە ئەوان لە بنەماڵەیەکی دەوڵەمەندی شارن و ماڵی زاواش لە بنەماڵەیەکی هەژارن و خزمەکەیان کرێکاری حەمامە و لەوێ پشتی خەڵکی دەشوات. هەر لەوەدا دیار بوو وەڵامی کچ بۆ خوازبێنیکەران، نەخێرە. بەڵام کە پێشتر ماڵی خوازبێنیکەریان ناسیووە و بەو جۆرە بووە بۆچی مۆڵەتیان پێداون، بێن بۆ ماڵیان و داوای کچەکەیان بکەن. بەم هەڵسوکەوت و پەروەردەیەیانەوە دیاربوو کە منداڵانی ئەم بنەماڵانە سەر لە هیچ دەرناکەن. ئەوە مانای وردە بورژوازییە. منداڵانی ئەم بنەماڵەیە جگە لە کتێبی قوتابخانە هەرگیز کتێبێکی دیکەیان نەخوێندبووەوە، تەنانەت کتێبەکانی قوتابخانەشیان بە باشی نەدەخوێندەوە، بە پارە و بەرتیل و دیاری، چەند پۆلێکیان تێپەڕاندبوو. هەرگیز نەچووبوون بۆ کتێبخانە و مۆزەخانە و شانۆگەری. جیهانی ئەوان تەنها بازاڕی بازرگانی و زەڕەنگەری بوو. تەنانەت ئێستاش لە تەمەنی هەشتا ساڵیدا کاتێک باشترین فیلمی سینەمایی لە تەلەفزیۆندا دەبینن تەنها شتێک کە یادیان بمێنێت، ڕەنگی جلوبەرگەکەیان و گوڵی سەر جلەکان و شێوەی ئارایشتی ژنانە.

حاجی ئاغا سێ برای هەبوون. برایەکیان لە خۆی گەورەتر بوو، دووانەکەی تر لەخۆی بچووکتر بوون. برا گەورەکەی بە تەواوی ڕەوشتی لەگەڵ حاجی دا جیاواز بوو. دوو برا بە دوو ڕەوشتی جیاواز لە یەکتریەوە، برا گەورەکەی کەمتر کەسێکی کۆمەڵایەتی بوو، هاوڕێی تایبەت بەخۆی هەبوو. خۆشگوزەرانیەکانی زیاتر قومارکردن بوو، ڕۆژانە لە دوای نیوەڕوانەوە تاکو نیوەشەو، لەگەڵ هاوڕێکانیدا خەریکی قومارکردن بوو. بەڵام حاجی ئاغا خۆشگوزەرانیەکانی ژن و خواردنەوەی مەی و شەراب بوو، ئەو قوماری نەدەکرد. قومارکردن لە شاری یەزد وەک زۆربەی شارەکانی تر جێگای تایبەتی خۆی هەبوو. یەکێک لە سەرپەرشتیارانی (حزبی تودە) کە پاشان بوو بە پارێزەر، قومارچییەکی زۆر بە ناوبانگ بوو، ئەو دوای کودەتاکەی موسەدیق لە لایەنگرانی شا

نزیکبووەوە، ئەو زیاتر لە سەد ساڵ تەمەنی کرد. حاجی ئەوراقچییەکیش هەبوو، ئەویش قومارچییەکی بەناوبانگ بوو. یەکێک لە خزمەکانی منیش کە دەلاڵی بازاڕ بوو، ئەویش قومارچییەکی نمرە یەک بوو. دیارە ئەم خۆشگوزەرانییە تایبەت بوو بە چینێکی تایبەتی شاری یەزد. کۆمەڵە زەحمەتکێشەکانیش ئەوانە بوون کە فەرهەنگی شاری یەزدیان دروستکرد و قوماریان نەدەکرد، ئەمانە بەیانیان زوو دەچوون بۆ کارگەکان و شەوانە دەگەڕانەوە. کاسبکارە هەژار و مامناوەندەکان لە هەموو تەمەنیاندا نە دەمیان لە خواردنەوە داوە و نە لە قومارکردنیش نزیک کەوتوونەتەوە، ئەمانە کەسانی بەرهەمهێن بوون. ڕەنجیان دەدا و کاریاندەکرد. بە پێچەوانەی ئەمانەوە هەندێک کەسی تر هەبوون بەدوای ژن و خواردنەوەوە بوون و لە یانەکانی تاران و ئەورووپادا قوماریان دەکرد و تلیاکیان دەکێشا، ژنەکانیشیان بەرەڵا دەکرد، منداڵەکانیشیان بەرەڵای کۆڵانان دەکرد و بەسەر خەڵکیەوە دەبوون بە بار. برا گەورەکەی حاجی ئاغا چونکە ژنەکەی هەمیشە لەگەڵ حاجی شەوکەت خانمدا لە کێشەدا بوو، لەگەڵ ماڵی حاجی ئاغادا ڕێک نەبوون و هاتوچۆیان نەبوو، ئەوەندە قسە و قسەڵۆک و گاڵتەجاڕیی لە نێوانیاندا دروستببوو، نێوانی هەر دوو برا بەتەواوی تێکچووبوو، تێکچوونەکەیان بە جۆرێک بوو کە ساڵانە یەک جاریش یەکتریان نەدەبینی.

برای سێهەمی حاجی ئاغا ئەویش چیرۆکی تایبەت بە خۆی هەیە. ئەو کەسێکی خۆ ویست و خۆ بەزلزان بوو، چوار ژنی هێنابوو، سیانیانی تەڵاق دابوو، چوارەمیشی بە لێدان نیوە شێت کردبوو. برای چوارەمی کە دەکاتە بچووکترین برا، دیار نەبوو لە ژێر کاریگەری کێدایە، ئەو کەسێکی مەزهەبی زۆر توند بوو، پەیوەندی لەگەڵ هەموو براکانی دا پچڕاند بوو، هاتوچۆی هیچیانی نەدەکرد. بازرگانی ناو بازاڕ بوو، کەسێکی توندی چروک بوو. لە سەرەتای شۆڕشدا کەوتە کڕینی زەوی و پارەیەکی زۆری دەستکەوت. لە دەوروبەری ساڵی (١٣٧٥-١٩٩٦) بە تەواوی ماڵ و منداڵەوە بەرەو ئەمریکا کۆچی کرد، لەو هەموو توندڕەوی و مەزهەبیەی سەردەمی منداڵی و گەنجیدا هیچی بۆ نەمایەوە. لە پێش شۆڕشدا زۆری لە کچەکەیدا بە جۆرێک کە خەریکبوو بیکوژێت، پێیگوتبوو چۆن بەبێ عەبا و مانتۆ دەچیتە دەرەوە. بەڵام ئێستا لە شاری شیکاگۆ دادەنیشن و سێ کچی ئارایشتگەی ڕازاندنەوەی ژنانیان هەیە، وەک دەڵێن خۆیشی لە تەمەنی (٧٨) ساڵیدا، لێپرسراوی ئارایشتگەی ژنانە و هەموو هەڵسوکەوتی سەردەمی گەنجی کردووە بە قوربانی دۆلار.

لەو سەردەمەدا هێشتا تەلەفزیۆن نەبوو، لە ماڵی حاجی ئاغادا کەسێک گوێی لە

رادیۆ نەدەگرت، تەنها هۆکاری پەیوەندیکردن کە هاتە ماڵەکەیانەوە گۆڤاری (ژنی رۆژ) و هەندێ جاریش گۆڤاری (تارانی وێنەیی) بوو. رۆژنامەکانی ئیتلاعات و کەیهانیشیان بۆدەهات. ئەم رۆژنامانە نەدەخوێنرانەوە، حاجی تەنها خشتەی دوا لاپەڕەکەی حەل دەکرد و پاشان رۆژنامەکەیان فڕێدەدا یا شووشەی پەنجەرەیان پێ پاک دەکردەوە و یا لە توونی حەمامەکەدا دەیانسووتاند و حەمامیان پێ گەرم دەکرد. گۆڤاری (بووردا) ی فەرەنسیش هەر بە شەش مانگ جارێک دەردەکەوت. کچەکانی حاجی تەنها سەیری وێنەکانی ئەم گۆڤارەیان دەکرد. گۆڤارەکانی پێش شۆڕش، بۆ زۆرێک لە کچان ببوونە سەرگەرمیی. دیارە ئەو کاتە لە زۆربەی ماڵەکانی یەزددا چەند ژمارەیەک لەم گۆڤارانە هەبوون کە ئەوەش گۆڕانکارییەک بوو. دەتوانین بڵێین لەو سەردەمەدا ٩٧٪ ی ماڵەکانی یەزد و شارەکانی تری هاوشێوەی، لە تەواوی ساڵدا هیچ کتێب و رۆژنامەیەکیان نەدەکڕی. مەگەر ئێستا، ساڵی (١٣٩١-٢٠١٢)، چەند کتێب دەچێتە ماڵەکانەوە، دیارە بەبێ کتێبی قوتابخانە. تەواوی ئەو وتانەی کە منداڵەکانی حاجی لە بەیانییەوە تاکو شەو دەیانبیست تەنها لافوگەزافی خۆهەڵکێشانی بنەماڵەکەیان بوو. ئەوان تێڕوانینێکی رەگەزپەرستانەیان بەرامبەر بەخۆیان هەبوو. وردە وردە چووبوونە سەر ئەو باوەڕەی جگە لە خۆیان و بنەماڵەی دایکیان کەسی تریان بە مرۆڤ نەدەزانی. لە ڕوانگەی ئەوانەوە بەشێک لە بنەماڵەی باوکیشیان مرۆڤ نەبوون، وایان بیردەکردەوە جگە لە خۆیان، تەنها چەند بنەماڵەیەکی ناسراو و بەناوبانگی شار مرۆڤ بوون. چونکە ئەوان دەوڵەمەند و پارە دار بوون. لە نێو تەواوی کارمەندانی وڵاتدا تەنها ئەفسەرانی شارەوانی و ئەفسەرانی هاتوچۆ شایەنی ڕێز لێگرتن بوون. لە ڕوانگەی ئەوانەوە بەڕێوبەر و مامۆستایانی قوتابخانەش واتە مامۆستاکانی منداڵەکانی خۆشیان شایانی ڕێزگرتن نەبوون. تەنها بەڕێوبەری قوتابخانە و قوتابخانەی ئامادەیی لە کاتی ناونووسینی منداڵەکانیان مرۆڤ بوون. لە قوتابخانەی ئامادەییدا منداڵەکانی حاجی ئاغا بەهۆی نزمی نمرەکانیانەوە وا بە ئاسانی ناویان تۆمار نەدەکرا. لە کاتی نووسینی ناوی سەرۆکی قوتابخانە دەبوو ناویم بهێنایە و شتێکم لەسەر بنووسیایە، بەڵام خۆتان دەزانن من لەبارەی فەرهەنگی یەک بنەماڵە و یەک سەردەمەوە نانووسم.

نیلۆفەر خانم زۆر قسەی لە دەوروبەریانەوە بیستبوو، لە پیاوانی دەوروبەریەوە چەندین هاوار هاوار و دەنگە دەنگی بیستبوو. ئەو بە بەردەوامی دەیبیست کە فلان کەس بە چەقۆ لە فلان کەسی داوە. فلان کەس بێئەدەبی کردووە. حاجی ئاغا دەیگوت چوار کەس لە سەرسەرییەکان سەرەیان هاتووە. واتە پێویست دەکات لێیان بدرێت.

دایە گەورەی نیلۆفەر نموونەی کەسێکی خۆپەرست و شەڕەنگێزی تەواو بوو. کاری بە هەموو کەس دەکرد و ڕیاڵێکی بە کەس نەدەدا. هەر کەسێک قسەیەکی بکردایە و ئەم پیرێژنە قسەکەی بە دڵ نەبووایە ئەوا لێدانی دەخوارد. حسێنی شۆفێر بەبێ مۆڵەتی حاجی ئاغا کارێکی کردبوو. حاجی بڕیاری دا بە لێدانی، ئەوەندەیان لێدا کە ئەو داماوە شەش مانگ لە نەخۆشخانە کەوت، یا دەیانگوت فلان کەس قسەی کردووە، حاجی ئاغاش بڕیاری دەدا بە چەقۆ کوتە کوتەی بکەن. بۆیە ئەگەر کەسێک لەو کەشوهەوایەدا گەورە بووبێت کەسێکی قسەزان و گونجاو نابێت. نیلۆفەریش لەو کەشوهەوا کۆمەڵایەتییەدا گەورە ببوو. ئەویش وایدەزانی کە دەکرێت هەموو شتێک بە پارە کڕین و فرۆشتنی پێوە بکرێت. ئەگەر پارەکەش دەوری نەبوو ئەوا بە لێدان کارەکانی خۆیان بە ئەنجام بگەیەنن، ئەگەر خۆشیان نەیانتوانی کەسێک دارکاری بکەن ئەوا لە بنکەی پۆلیس بە گرتنی دەدەن. بەرتیلدان و بێ یاسایی کاری ئەم بنەماڵەیە و خەڵکانی تری هاوشێوەی ئەوان بوو. ڕەفتار و بیرکردنەوەی ئەوان و هاوشێوەکانیان پێچەوانەی فەرهەنگی گشتی خەڵکی یەزد بوو. خەڵکی یەزد خەڵکی گونجاو و بە ئەدەب و میهرەبان بوون. کچان و ژنانی یەزد لە هەموو ئێراندا ناسراو بوون بە خەڵکانی هێمن و لەسەرخۆ و ڕاستگۆ بوون، هەر وەکو سەعدی شیرازی دەڵێ:

**ژنی چـاک و سـەلار و ژیـر ... مێردی هەژار، دەکات بە میر**

شاری یەزد، شوێنی گفتوگۆ و لێبوردەیی و پێکەوە ژیان و ئارامییە، چەندین سەدە، لە یەک کۆڵاندا موسڵمان، زەردەشتی، یەهودی، بەیەکەوە ژیاون، ئەم شارە، بە شاری خێرخوازان ناسراوە. لەو ساڵانەدا دەیان دامەزراوەی فەرهەنگی بە پارەی خەڵکانی موسڵمان و زەردەشتی و یەهودی دروستکراون. خەڵکەکەی بە تێکڕایی ئەهلی کار و کاسبی بوون. زۆر کەم وەک ماڵی حاجی شەوکەت خانم و هاوشێوەکانی بە پارەی مفت پەروەردەکرا بوون، بەڵام گرنگ ئەوەیە بەهۆی هاتنی پارەی مفتی نەوتەوە فەرهەنگی شەوکەت خانم لە برەودا بوو. فەرهەنگی ئەمڕۆ زاڵە بەسەر فەرهەنگی خەڵکی یەزد و وڵاتدا. ئەمە ڕەوشتی وردە بورژوازی یەزد و تەورێز و ڕۆما و پاریس نییە، لە هەموو شوێنێکی ئەم جیهانەدا لەم جۆرە خەڵکە هەن و دەبن.

من یادەوەرییەکانی خۆم دەنووسمەوە. مێژووی گشتی یەزد نانووسمەوە. ژیاننامەی دەیان و بگرە سەدان ژن دەنووسمەوە. ئەو ژنانەی کە نموونەیین و جێگەی

شانازیمانن. سەدەها بەڵکو هەزارەها ژنی هەژار و نەدار، بە هەوڵ و تێکۆشانی خۆیان هاوسەر و منداڵەکانیان پێگەیاندووە و گەیاندویاننەتە لووتکە. ئابووریی شاری تاران و یەزد و فراوانی ئەم شارانە بەهۆی ڕەنجی ئەم ژنانەوە دەسوڕێتەوە. پیاوانیش هەموو دروستکراو و پەروەردەی دەستی ژنەکانن. خوێنەرانی نایەزدی وا بیرنەکەنەوە کە ئەم بنەماڵەیە، نموونەی هەموو بنەماڵەکانی یەزدە. دەمەوێت پێتانی بڵێم، کاتێک دەمانەوێت لە سەردەمی کۆنەوە بپەڕینەوە بۆ سەردەمی نوێ، دوچاری چ کێشەیەکی فەرهەنگی دەبینەوە، کێشەیەک کە پەیوەستە بە فەرهەنگی خۆمانەوە، کێشەیەک کە دیاردەیەک هێرش دەکاتە سەر بەشێکی کۆمەڵگەی ئێمە و بەرگەی دەگرین. کێشەیەک کە ئەنجامی سوڕی پارەی نەوتە. کێشەیەک کە داهاتی نەتەوەی ئێمەی بەرەوپێش برد، بەڵام ڕەوشتمان ون دەکات، دەوڵەمەند بوون هەموو لایەک ناگرێتەوە، وەک هاوشێوەی ئەم بنەماڵەیە کە ڕۆژ بە ڕۆژ لە سەرانسەری ئێراندا حاڵیان بەرەو باشی بڕوات. ئەنجامەکەشی بەرەو ڕووی ئێمە دەبێتەوە.

ساڵانی دوای کودەتا، واتە ساڵی (١٣٣٢-١٣٤٥=١٩٥٣-١٩٦٦) هێشتا پۆلیس ئەو هێز و توانایەی نەبوو. پۆلیس چاوی لەسەر هاوکاری خەڵکە دوڵەمەندەکانی شار بوو. پۆلیس و پاسەوانی تلیاک خۆر زۆر بوون. بە وەرگرتنی مووچەیەکی کەم نەیاندەتوانی گوزەران بکەن و پارەیان لە خەڵکانی دەوڵەمەند وەردەگرت. کاتێک نەورۆز دەهات دەیان پاسەوان لە بەردەمی ماڵە دەوڵەمەندەکانی شاردا ڕیزیان دەبەست تاکو پێنج تومەن جەژنانە وەربگرن. بۆ وەرگرتنی جەژنانە دەچوونە بەردەرگای دەوڵەمەندەکانی دۆستانی شا. ئەو کەسانەی کە پێشینەی حیزبی تودەیان هەبوو پاشان هەڵگەڕابوونەوە و ببوونە دۆستی شا، لەو ساڵانەدا پاساوانەکان دەچوونە بەردەرگای هەر کەسێک کە جەژنانەیان دابەشبکردایە. بیرمدێت نەورۆزی ساڵی (١٣٤٠-١٩٦١)، زیاتر لە پەنجا پاسەوان لە بەردەرگای ماڵی عەباسی ئوستادان لە کۆڵانی ئاوەتفت لە ڕیزدا وەستابوون. ئاغای عەباسی کە پێشتر کەسێکی تودەیی بوو، کەسێک بوو بە دوای دەرفەتدا دەگەڕا حەزیدەکرد ڕیزگرتنەکە لە بەردەرگاکەیاندا درێژ ببێتەوە. پاسەوانەکان لە کۆڵانەکاندا و لە بەردەرگاکەیاندا وەستا بوون، خەڵکی گەڕەک سەیریان دەکردن، کاتێک ژمارەیان زیادی دەکرد، ئەو کاتە ئاغای عەباسی ڕێگەی پێدەدان بچنە ماڵەکەیەوە، ئەوسا نوقڵ و شیرینی پێدەدان و هەر کەسە و پێنج تومەنیشی دەدانێ، پێنج تومەنی ئەو کاتە نرخی هێندەی پەنجا هەزار تومەنی ساڵی (١٣٩٠-٢٠١١) بوو. گرنگ ئەوە بوو، ئەم کارە تەنها لە شاری یەزد دا نەبوو. من چەندین جار بیستوومە لە هەموو شارەکانی

ئێراندا پاسەوانەکان سەردانی ماڵە دەوڵەمەندەکانیان کردووە بۆ وەرگرتنی جەژنانە. دامودەزگا و شارەوانییەکانی وڵات ئەو توانایەیان نەبوو تا ئەم کارە قەدەغە بکەن. پاسەوانە تلیاکییەکان لە سەرەتای ساڵەوە دەچوون بۆ ماڵە دەوڵەمەندەکان و جەژنانەی خۆیان لێوەردەگرتن. لەو سەردەمەدا بەدرێژایی ساڵ منداڵانی ئەو پاسەوانانە لە هەموو ئەو کارە نایاساییانەی ئەنجامیان دەدا ئازاد بوون. منداڵانی زۆربەی ئەو جۆرە کەسانە، منداڵی زۆر بێڕێز دەردەچوون، بەهۆی پلەو پایەی باوکیانەوە دۆخی ئاسایش و کۆمەڵایەتی شاریان دەشێواند. لە شارێکی هێمنی وەک شاری یەزد، ئەوان ئارەقیان دەخواردەوە، خۆیان مەست دەکرد، بە شەقام و کۆڵانەکاندا دەگەڕان و هاواریان دەکرد، ئاژاوەیان دەنایەوە و خەڵکیان ئازار دەدا. بەڵام بنەماڵە ڕەسەنەکان کە ڕەسەنایەتی چەند هەزار ساڵەیان بە ئاکامێکی باش و تازەگەری گەیاندبوو منداڵەکانیان بە جوانترین شێوە پەروەردە دەکرد بۆ خزمەتی وڵات. بووکەخان یا نیلۆفەر خانم بە لە خۆبایی و خۆبەزلزانێکی تەواوەوە بەرەو ماڵی زاوا ڕۆیشت، ئەو هیچ سەبر و تاقەتی نەبوو. لە منداڵیدا هەر کەسێک لەگەڵ ئەودا بچووکترین سەرپێچییەکی بکردایە لێیدەدا. واتە بووکە خان کەسێکی دەستوەشێن بوو، بۆ بچووکترین قسەی خەڵکی وەڵامی توندی هەبوو، بە هیچ جۆرێک گەورە و بچووکی نەدەزانی. هەرگیز کەسێتی خۆی نەدەناسی. باوکی هاوسەرەکەی، واتە خەزووری، پیاوێکی بەڕێزی تەمەن هەفتا ساڵ بوو، هیچ جیاوازیەکی نەدەکرد لە نێوان ئەو پیاوە و منداڵێکی تەمەن پازدە ساڵدا، نیلۆفەر خانم هیچ حسابێکی بۆ دەوروبەر و شوێن و پێگەی کەس نەدەکرد، شێوازی گفتوگۆی نەدەزانی ئەگەر کەسێک بە پێچەوانەی بۆچوونی ئەوەوە قسەیەکی بکردایە، ئەوا ئەویش بە تووڕەیی بە سەریدا دەینەڕاند. یەکێک لە تایبەتمەندییەکانی ڕەوشتی ڕەسەن، ناسینی دەوروبەر و ڕادەی بۆچوونیانە، ئەدەب بە واتای ئەوەی کە هەر قسەیەک لە کوێ دەکەیت و کارەکەش کەی ئەنجام دەدەیت. یەکێک لە هۆکارەکان کە دەڵێن کچان نابێت لە خوار تەمەنی بیست ساڵیەوە شوو بکەن، هەر ئەو خۆ نەناسینەیە. منداڵان سنووری خۆیان نازانن، ئێستا هەندێک کچ هەن لە تەمەنی سی ساڵی تەنانەت تا چل ساڵیش ئەو سنوورە نازانن و خۆیان ناناسن. یەکێک لە نموونەکانی پەروەردە ئەوەیە کە منداڵان سنووری خۆیان بزانن. کاتێک دایکان و باوکان سنووری خۆیان نەزانن چۆن دەتوانن منداڵەکانیان فێری سنوور ناسین بکەن. بووک و زاوا ڕۆیشتبوون بۆ کوێستانی دێی باڵا و پاش چەند ڕۆژێک گەڕانەوە بۆ شار، دەبوو چەند ڕۆژێک لە ماڵی حاجی ئاغای باوکی زاوا بمێننەوە تاکو خۆیان ئامادە بکەن بۆ ڕۆشتن بۆ دەرەوەی وڵات. ڕۆژێکیان

بۆ نانخواردنی نیوەڕۆ گۆشتاو ئامادە کرابوو، بووک لەسەر خوانی نانخواردن گوتی بۆچی تەنها گۆشتاوتان دروستکردووە و هیچ چێشتێکی ترتان ئامادە نەکردووە؟ باوکی زاوا گوتی بووکەخان گۆشتاو خواردنێکی زۆر خۆشە، بووکیش گوتی من گۆشتاو ناخۆم، ئێوە سوکایەتیم پێدەکەن. حاجی باوکی زاواش دەڵێت ئێمە بۆ خۆمان هەمیشە گۆشتاو دەخۆین و گۆشتاومان بۆ تۆش دروستکردووە. بووکە خانیش قاپە ئاوە گۆشتەکەی بەردەمی خۆی هەڵگرت و بە قاپەوە کێشای بە سەرو چاوی حاجیدا. ئیتر لێرەوە کێشە دروست دەبێت، خوشکی زاوا بە بووکی دەڵێت ئەوە چیتکرد؟ هەی ناکەس بەچە. تۆ دەزانیت کچی کێیت؟ مەگەر باوکی تۆ جگە لەخانوویەکی گەورە لە دەرەوەی شار و ئەمبارێکی بە کرێ هیچ شتێکی تری هەیە، ئەوەندە خۆت بە گەورە دەزانیت. بووکە خانیش دەستیکرد بە بۆڵە بۆڵ، هەواڵی شێتێتی زاوا بە بووک گەیشتبوو، بووک لە کاتی قسەکردندا دەیگوت ئێوە و کوڕە شێتەکەتان. خوشکی زاوا دەیگوت ئەگەر براکەی من شێت نەبووایە بێ مێشکێکی وەکو تۆی نەدەهێنا. ئایا دەزانیت بۆچی ئێمە داوای تۆمان کردووە؟ چونکە مەنوچەهری برام شێتە. مەگەر تۆ نازانی کە مەنوچەهر پێشتر ژنێکی تری هەبووە و تەڵاقی داوە، واتە ئەو قسانەی لەوە پێش بەر گوێی دایە گەورە و دایکی نیلوفەر کەوت بوو، ئەوا ئێستا قسەی تریشی هاتە سەر، دیارە کە ئەم دەنگە دەنگە پەیدا بوو هەواڵ لەنێو خەڵکیدا بڵاو بووەوە. کوبراش کە هەمیشە حەسوودی بە نیلوفەر دەبرد بە بیستنی ئەم هەواڵە خۆشحاڵبوو. خەڵکی هەر یەکە و بەجۆرێک هەواڵەکەیان لێکدەدایەوە، یەکێک دەیگوت پێویستە پێش بەم کچە بگیرێت و زیادە ڕۆیی نەکات، یەکێکی تر دەیگوت ئەو کچە کارێکی باشی کردووە کە قاپە ئاوە گۆشتەکەی کێشاوە بە سەری حاجی مەندەلیدا. هەردوو بنەماڵەکە کەوتبوونە قسە هەڵبەستن بۆ یەکتری، بەڵام پاش ماوەیەک توڕەیی و توندی هەردو لا بەرەو ساردبوونەوە چوو. بووک و زاواش ڕۆیشتن بەرەو وڵاتی ئیتاڵیا. لەو سەردەمەدا سیستەمی پەیوەندیکردن زۆر لاواز بوو. دەبوو لە بەڕێوەبەرایەتی تەلەفۆناتی یەزدەوە پەیوەندی بکرێت بە هێڵگۆڕکێی تارانەوە و لەوێشەوە بە هێڵگۆڕکێی ئیتاڵیاوە، ئەگەریش بتوانرایە تەلەفۆنەکە وەربگیردرێت. هەر بۆیە ئەوانیش زیاتر پەیوەندییەکانیان بە نامە ناردن ئەنجام دەدا. کێشەکە لەوەدا بوو، بووک لە نامە نووسیندا باش نەبوو، لەکاتی خوێندکاریشدا داڕشتنی باشی بۆ نەدەنووسرا. نیلوفەر بە زوویی بوو بە خاوەن منداڵ و کوڕێکی بوو، ناویان لێنا ناسر، بەڵام کێشەکانی بووک و زاوا ڕۆژ لە دوای ڕۆژ لە زیادبووندا بوو، هەواڵی ناکۆکیەکانیان لە یەزد بڵاو ببووەوە. بەهۆی ناکۆکیەکانیانەوە

تەلەفۆنکردن و نامە ناردن زیادی کردبوو. نیلۆفەر گوتبووی مەنوچەهر شەوانە درەنگ دەگەڕێتە بۆ ماڵەوە. مەنوچەهریش گوتبووی من شەوانە دەچم بۆ کتێبخانە. نیلۆفەریش گوتبووی دەچێت بۆ یانە و هەندێک جاریش منٔ بە زۆر لەگەڵ خۆیدا دەبات و ئەو منداڵە یەک ساڵانەیەمان بە تەنها لە ماڵەوە جێدەمێنێت. بۆیە بڕیاردرا هەردوو حاجی، باوکی بووک و باوکی زاوا بەرەو ئیتاڵیا بکەونەڕێ. تاکو ئەم دووانە ڕێکبخەنەوە. ئەو دوو حاجیە هەر یەکەیان لەسەر باوەڕێکی جیاواز بوون. یەکیان لەسەر باوەڕی بازرگانی و هێمنی و سیاسەت و گونجاندن بوو، ئەوی دیکەیان لەسەر باوەڕی زۆرەملێ و شەڕ و دەسەڵات و ملهوڕی بوو، خۆزگە ئەو دوو حاجیە هەرگیز بەیەکەوە نەچووبانایە بۆ ئیتاڵیا.. ئەو دوو حاجیە نەک کێشەکەیان چارەسەر نەکرد؛ بەڵکو خۆشیان لە ئیتاڵیا کردیان بە شەڕ. تەنانەت باوکی بووک بە هەموو هێزی خۆی زللـەیەکی لە زاوا دابوو...

ئایا ئەو دوو حاجیە، بە دوو بیروڕای جیاوازەوە دەیانتوانی چارەسەری کێشەکەیان بکەن؟ لە وڵاتی ئێمەدا مرۆڤەکان بە بیروڕای جیاوازەوە ڕووبەڕووی یەکتری دەبنەوە، هەر جارە و یەکیان سەرکەوتوو دەبێت. ئەو دوو بنەماڵەیەش یەکیان سواری کەری شەیتان ببوو دانەدەبەزی. باوکی بووک هەر کە گەڕایەوە بۆ ئێران پێداگری کرد لەسەر ئەوەی دەبێت کچەکەی تەڵاق وەربگرێت. ژنانی خزمی بووکیش دەیانگوت کچەکەمان وەک مانگ وایە لە بنەماڵەیەکی گەورە و بەڕێزە. هەر تەڵاق وەربگرێت سەدان داواکار دێنە سەرمان. هەر بۆیەش بەزوویی شکاتیان کرد و دۆسییەیان بۆ مەنوچەهر کردەوە و داوای تەڵاقدانی کچەکەیان لێکرد، بەبیانووی ئەوەی کە مەنوچەهر کێشەی دەروونیی هەیە. دادگاش بەزوویی بە پیری داواکارییەکەوە چوو. سەرەتا ئامۆژگارییەکی زۆری نیلۆفەر کرا تا لە داواکەی بکشێتەوە، بەڵام بێ سوود بوو. بۆیە لە کۆتاییدا دادگا بڕیاری لەیەک جیابونەوەی دان، پارەی مارەییان لەماڵی زاوا وەرگرت و دایان بە نیلۆفەر. نیلۆفەریش لە تەمەنی (١٨-١٩) ساڵیدا بە منداڵێکی سێ ساڵەوە گەڕایەوە بۆ ماڵی باوکی.

هیچ خوازبێنیکەرێک ڕووی لە ماڵی حاجی نەکرد. خەڵکی دەیانگوت ژنێکی گەنج و جوان تەڵاقی وەرگرتووە و نابێت بڕوات بۆ هەموو شوێنێک، پێویستە ئاگاداری خۆی بێت. نیلۆفەر چوو بوو بۆ زەماوەندی یەکێک لە هاوڕێکانی و ویستبووی شەکر لەسەری بووک هەڵبسوێت، بەڵام هەر لەوێ پێیانگوتبوو، ژنی تەڵاقدراو نابێت شەکر لەسەری بووک هەڵبسوێت. چونکە ئەوە کارێکی باش نییە. نیلۆفەر تا ئەو ڕۆژە نەیزانی بوو کە تەڵاقوەرگرتن لە ڕوانگەی کۆمەڵایەتییەوە کارێکی باش نییە. لەو سەردەمەدا

تەڵاقوەرگرتن و تەڵاقدان وەکو ئێستا سادە نەبوو. ئێستا لە هەر چوار زەماوەند یەکێکیان لەیەکتری جیا دەبنەوە. لە دەیەی ساڵی (١٣٤٠-١٩٦١) لە شاری یەزددا لە هەر (٥٧٨) زەماوەندا، یەکێکیان تەڵاقی وەردەگرت. بێتاقەتی و گریانی نیلۆفەر دەستیپێکرد. ئەو لەو باوەڕەدا بوو کە شووکردن و تەڵاقدانی هەمووی تاوانی دایک و باوکی بووە، هیچ تاوانێکی خۆی تیانەبووە. ئەو هیچ هەڵەی نەکردووە. چونکە، ئەو کاتێک شووی کردووە تەمەنی تەنها شازدە ساڵ بووە. دایک و باوکیشی دەیانگوت ئەوە چارەنووسە. دوای جیابوونەوەیان ناکۆکی ئەم دوو بنەماڵەیە لەسەر منداڵەکەیان دەستیپێکرد. دەبوو کێ ناسری منداڵ بەخێو بکات؟ منداڵەکە تەمەنی ببووە پێنج ساڵ. ناسر منداڵێکی بە هۆش و وریا بوو لە تەمەنی پێنج ساڵیدا دەیگوت دەبێت حسابی بانکیم بۆ بکەنەوە (واتە پارەی لە بانک بۆ دابنرێت)، دەبێت منیش وەک حاجی بابا (باوکی باوکی) بەچەک لە بانک پارە وەربگرم. هەر بۆیەش لە بانکی (سادیرات) ژمارەیەکی بانکی بۆ کرایەوە. ناسر لەلای دایکی بوو، بەڵام هەفتەی چەند جارێک دەڕۆیشت بۆ ماڵی بابە گەورەی. مەنوچەهریش گەڕابووەوە بۆ ئیتاڵیا. لێرە و لەوێ، باسی شووکردنەوەی نیلۆفەر و ژنهێنانەوەی مەنوچەهر دەکرا. ئایا کامیان زووتر دەچنەوە نێو ژیانی هاوسەرێتیەوە. پیاوێک کە دوو جار ژنی تەڵاق داوە و تەمەنی نزیکەی (٣٤) ساڵ دەبێت و وا بڵاو بووەتەوە کە کەسێکی شێتە؟ بەڵام دەوڵەمەندە و لە دەرەوەی وڵات دەژیا. یاخود ژنێک کە تەڵاقی وەرگرتوە و تەمەنی (١٨-١٩) ساڵ دەبێت و بەهۆی پارەی مارەییەوە دەوڵەمەند بووە؟ گەنجێکی تەمەن بیست‌وسێ ساڵ خاوەن شەهادە و کارمەند لە فەرمانگایەکدا داوای زەماوەندی لە نیلۆفەر کردبوو، بەڵام دایە گەورەی وەڵامی بۆ ئەو گەنجە ناردبوو گوتبووی «ئێمە پارووی نیوە خوراو ناخەینە بەر دەمی سەگ». کوبراش کچە سادە لادێییەکە، لەنێو ئەو ماڵەدا خەریکی کاری قورس بوو. تەڵاقدانی نیلۆفەر کاری کردبووە سەر ئەویش. ئەو لە لووتکەی گەشە و جوانیدا بوو. تەمەنی (٢٠-٢١) ساڵ دەبوو. تەلەفۆنی بۆ ئەملاولا دەکرد و خۆی بەناوی نیلۆفەرەوە دەناساند. حاجی شەوکەت لەم هەڵسوکەوتەی زۆر تووڕە دەبوو. هەندێک جار لە تووڕەییدا بڕیاری دەدا کە کوبرا لە ماڵەکەی دەربکات و بینێرێتەوە بۆلای دایک و باوکی، بەڵام خەڵکی دەیانگوت کارەکەری وا لەکوێ دەستدەکەوێت. کوبرا باشترین کارەکەرە.

کانە ئاسنەکانی بافق، بەهۆی کارگەی ئاسن تواندنەوەی ئەسفەهانەوە کەوتبوونە کار، ڕێگای ئاسن گەیشتبووە بافق. هەژارەکانی بافق و بەهاباد کاریان بۆ پەیدا ببوو. هەمان ئەو گوندانەی کە ڕۆژگارێک کوڕ و کچەکانیان بۆ خزمەتکاری دەناردنە شارەکان.

ئێستا منداڵەکانیان بۆ قوتابخانە دەنێرن و دەڵێن حکومەت کارمان بۆ پەیدا دەکات و پارەمان پێدەدات، ئیتر منەت لە کەس هەڵناگرین. وڵات خاوەنی نەوت بوو، باری ئابووریی خەڵک بەرەو باشی دەچوو. گۆڕانکاری ئابووریی بووە هۆی فەراهەمکردنی کار بۆ تەواوی هەژاران. ئیتر هیچ کەسێک ئامادە نەبوو لە بەیانی زووەوە تاکو نیوەشەو بە بەردەوامی کار بکات، قاپ و قاچاخ بشوات، گسکبدات، خواردن دروستبکات، مانگا بدۆشێت، مێزی شەراب خواردنەوە برازێنێتەوە و پێشوازی لە میوان بکات، لە هەمان کاتدا ڕۆژانەکەشی دیار نەبێت چەندە؟ هەر بۆیە بە هەموو لایەکدا بڵاوبووەوە کە کوبرا شێتە و ژیری خۆی لە دەستداوە. هەروەها دەیانگوت کوبرا نەنگییەکی هەیە بۆیە هیچ کەسێک لێی ناپرسێتەوە. چەندین ساڵ بوو هێواش هێواش کەسێتی کوبرا شکابوو، ئەو هەرگیز لە هیچ شوێنێکدا بۆی نەبوو لەسەر کورسی دابنیشێت. ئەو بەوە ڕازی ببوو کە کارەکەرێکی سادەیە. خۆیشی کەسێکی کاڵفام بوو. کاتێک تەمەنی (١٣-١٤) ساڵ بوو لە کاتی سوورکردنەوەی کولەکەدا ڕۆنی گەرم بەسەر دەستیدا ڕژابوو، دەستی بە تەواوی سوتابوو. ئەو کاتە من ئەوم برد بۆ نەخۆشخانە کاتێک دکتۆر پرسی ئەم کچە کاری چیە؟ من گوتم کوبرا کارەکەری ماڵی حاجی ئاغایە. کاتێک لە نەخۆشخانەکە هاتینە دەرەوە، کوبرا گوتی ئەوە نەتدەزانی بڵێیت شاگردی بەرگدرووە، نەک کارەکەر. ئەم قسەیە مانای ئەوە بوو کە کوبرا دوای چەندین ساڵ کارەکەری هێشتا خۆی بە کارەکەر نەدەزانی. حەزی نەدەکرد کەس بزانێت کە ئەو کارەکەرە. ئەو کەسێکی هەژار بوو، بەڵام نەفسێکی گەورەی هەبوو، هێشتا باوەڕەی بە خۆی نەبوو، توانای نەبوو هاوار بکات و بڵێت من کارەکەرم من مرۆڤم.

هەستی کوبرا بەرامبەر بە ناسر، ئەو منداڵە پێنج ساڵەیە هەستێکی دوو لایەنەبوو، بوونی ناسر لەو ماڵەدا ببووە هۆی ئەوەی کە کارەکانی ئەو زیاتر بێت. بوونی منداڵێکی پێنج ساڵ لەماڵیکدا بۆ کارەکەر دەردەسەرییە. کوبرا ئەو منداڵەی وەک منداڵی خۆی خزمەت دەکرد، هەندێک جار خۆشیدەویست و هەندێک جار لێی توورە دەبوو، دەیگوت ئەم منداڵە لەلایەک و هەموو کاری ماڵەکەش لە لایەکی ترە، لە کۆتاییدا چارەنووسی ناسری پێنج ساڵ ئەوە بوو کە بینێرن بۆ وڵاتی ئەڵمانیا، ئەو منداڵە پێنج ساڵەیان سپارد بە (باسیۆنێک) لە ئەڵمانیا، لەوێ بەبێ دایک و باوک گەورە بوو. وردە وردە زمانی فارسی بە تەواوی بیر چووەوە. پاش چل ساڵ هەر کاتێک دایکی بیویستایە قسەی لەگەڵدا بکات دەبوو وەرگێڕێکی لەلا بوایە. من دوایین جار کە ناسر و کوڕەکەیم بینی لە بەرواری (٢٥-٤-١٣٩١=١٥-٧-٢٠١٢) بوو. ئەو هاتبوو بۆ ئێران بۆ سەردان. ئەویش

لە ژنەکەی جیا ببووەوە و تەنها کوڕێکی هەبوو کە خۆی گەورەی کردبوو. ناسر و کوڕەکەی یەک وشە فارسی‌یان نەدەزانی نیلۆفەریش لە زمانیان تێنەدەگەیشت. دەبوو کەسێک قسەی دایکەکەی بۆ کوڕ و نەوەکەی وەربگێڕێت. کاتێک ئەو منداڵە ڕۆیی بۆ ئەڵمانیا نیلۆفەر هەستی بە دڵتەنگی کرد و هاواری دەکرد ئەی ماڵوێران خۆم. کوبراش هاواری دەکرد و دەیگوت بە خودا منیش ماڵ وێرانم. دوو کەس هاوتەمەنی یەکتری لە دوو چینی کۆمەڵایەتی جیاواز بە دوو بیرکردنەوەی جیاوازەوە بەیەکەوە لەیەک ماڵدا دەژیان. هەردوکیان باسی بێچارەیی خۆیان دەکرد، یەکێکیان نانی شەوی نەبوو بیخوات و دەبوو لە بەیانییەوە تاکو نیوەشەو کاری بکردایە و هەمیشە لە چاوەڕوانی ئەوەدا بوو کە خانمی ماڵ پارچە خواردنێکی پێبدات، ئەوی تریشان بەو مارەییەی کە وەریگرتبوو، باری ئابووریی باشبوو. هەردوکیان هەستیان بە بەدبەختی و بێچارەیی خۆیان دەکرد. زۆر کەس دەهاتن بۆ داواکاری نیلۆفەر، بەڵام بنەماڵەی نیلۆفەر بەدوای کەسێکی ئەسڵزادەدا دەگەڕان. هەڵبەت دەبوو ئەو کەسە ئەسڵ زادەیە دەوڵەمەندیش بێت. نیلۆفەر لەڕووی ڕاستی ژیانەوە چاو و گوێی کرابوونەوە، ئەو دەیویست خۆی بڕیار لەسەر ژیانی خۆی بدات، ئەو شووی یەکەم، ژنی کەسێکی دەوڵەمەند بوو، بڕیاریدا ئەم جارەیان ببێتە ژنی کەسێکی جوان و قۆز، دەیویست کەسێکی وای بۆ ڕێبکەوێت بە ماڵە خەزورانی پێشووی بڵێت کە مێردێکی زۆر باشتری دەستکەوتووە.

یەکێک لەو پیاوانەی کە لە ئیتاڵیا چاوی پێیکەوتبوو لەوێ ببوو بە ناسیاوی هاتبوو بۆ خوازبێنی. ئەو کەسێکی جوان و باڵابەرز و هێمن و لەسەرخۆ و هونەردۆست بوو، بەڵام لەڕووی دەوڵەمەندییەوە بەهیچ جۆرێک لەگەڵ ماڵی مەنوچەهردا بەراورد نەدەکرا. دایە گەورەی نیلۆفەر ڕەخنەی دەگرت کە ئەو کەسە لە بنەماڵەیەکی باش نییە. ئەو دەیگوت باوکی ئەو کوڕە دەڵاڵی بازاڕ بووە، چۆن دەبێت نەوەی من ببێتە هاوسەری کوڕی دەڵاڵێکی بازاڕ. دایەگەورەی هاواری دەکرد و دەیگوت ئەی خودایە کەوتوینەتە چ دەور و زەمانێکەوە؟ کچ لە ماڵەوە دابنیشێت و پرچی سپی بهۆنێتەوە باشترە لەوەی کە شوو بە کەسێکی بێ بنچینە بکات. ئەوانەی کە ڕازی بوون بەو زەماوەندە، دەبوو بە دایەگەورەیان بسەلماندایە کە محەمەد کەسێکی بێ بنچینە نییە و بنەماڵەکەیان لە بنەماڵەی خۆیان کەمتر نییە. هەڵبەت هیچ کەسێک ئەو ئازایەتیەی تێدا نەبوو، تاکو بتوانێت گفتوگۆیەک لەگەڵ دایە گەورەدا بکات.

لە دواییدا نیلۆفەر فشاری هێنا یا شوو بە محەمەد ئاغا دەکات یا هەرگیز شوو ناکاتەوە. هەندێک جاریش بە تووڕەییەوە قسەی دەکرد و دەیگوت من تەڵاقم وەرگرتووە

و ئێستا خۆم خاوەنی خۆمم، خۆم بڕیاردەدەم و خۆم دەزانم چی دەکەم. پاشان هاوسەرێتی محەمەد ئاغا و نیلۆفەر سەری گرت، بەڵام دووبارە بیر کردنەوەیان جیاواز بوو، محەمەد ئاغا کەسێکی هونەردۆست بوو، حەزی دەکرد گوێ لە مۆسیقای کلاسیک بگرێت، حەزی لە دەنگی بەنان، عاریف، فاختەای، شەجەریان بوو، بەڵام نیلۆفەر حەزی لە مۆسیقای بازاڕی بوو. پەروەردەی نیلۆفەر بەو جۆرە نەبوو کە بە هاوسەرەکەی بڵێت تۆ حەز لە چ مۆسیقایەک دەکەیت گوێ لەو مۆسیقایە بگرە و منیش حەزم لە چ مۆسیقایەک بێت گوێی لێدەگرم. جگە لەوەش دەچوو کاسێتەکانی هاوسەرەکەی دەسڕیەوە و گۆرانی خراپی لەسەر تۆمار دەکردن. بەو کارانەی هاوسەرەکەی شێتکردبوو. محەمەد ئاغا پێی دەگوت تۆ بۆ وادەکەیت بۆچی ئەو کاسێتانەی من خراپ دەکەیت. پێویستە بڕۆیت بۆ خۆت کاسێتی تازە بکڕیت. نیلۆفەر تورە دەبوو بە سەریدا هاواری دەکرد و دەیگوت ئەو گۆرانیانەی تۆ گوێی لێدەگریت گۆرانی هیچ و پوچن. محەمەد ئاغاش دەیگوت چۆن وا دەڵێیت ئەو گۆرانیانە هۆنراوەی حافز و مەولانان، بە مۆسیقای ڕەسەنی ئێرانییەوە. نیلۆفەر باوەڕی بە گفتوگۆی هێواش و لەسەرخۆ نەبوو، تەنها دەیزانی هاوار بکات.

محەمەد ئاغا دەیویست پەرە بە کۆمپانیاکەی بدات و فراوانی بکات، بەڵام نیلۆفەر بەبێ ئەوەی پرسی پێبکات دەچوو گوڵدانی چینی بە ملیۆن و نیوێک تومەن دەکڕی. لەساڵی (١٣٥٥-١٩٧٦) دا بە ملیۆن و نیوێک تومەن، دەتوانرا سێ بلدۆزەری گەورە بکڕیت، محەمەد دەیگوت ئاخر چۆن تۆ یەک گوڵدانت بە ملیۆن و نیوێک کڕیوە؟ ئەویش دەیگوت لەبەر ئەوە کڕیومە چونکە خانم فلانیش کڕیویەتی، خۆ ئێمە لە ئەوان کەمتر نین. لەلای نیلۆفەر هیچ کاتێک باسی کتێب و وێنەکێشان و فیلم و گەشتی خۆشنەدەکرا، هەرگیز حەزی بە شتی هونەری نەدەکرد. لە هەموو تەمەنیدا ڕۆمانێکی باش ڕۆمانێک کە وانەی ژیانی لێوە فێرببێت، ڕۆمانێک کە فێری ئازادی و تێکۆشانی بکات نەخوێندبووەوە. هەرگیز بیرەوەری سیاسەتمەدارێک یاخود تێکۆشەرێکی نەخوێندبووەوە. تەنانەت ناوی کەسێشی لە گەورە پیاوان نەبیستبوو. ئەو هەستی بە پێوانەیی ژیانی نوێ نەدەکرد. هیچ نرخێکیشی بۆسەردەمی ڕابردوو دانەدەنا. ئەو هیچ شتێکی نەدەزانی. جگە لە ڕێگای بازاڕ و ئاهەنگەکانی ژنان. ئەو ئاهەنگانەی نەئایینی، نەزانستی، نە بازرگانی، نە رامیاری بوون. هەڵبەت کەموکوڕییەکانی نیلۆفەر زۆربەی لە ئەستۆی خۆیدا نەبوو. لەو سەردەمەدا کتێبخانە و کتێب فرۆشتن کەم بوون. سینەماکان فیلمی پەروەردەییان پەخش نەدەکرد. شانۆ نەبوو. لەو سەردەمەدا، هیچ دامەزراوەیەکی فەرهەنگی نەبوو.

لە شارەکەی ئێمەدا. تاکو پێش شۆڕش، زانکۆ نەبوو. لە دوای شۆڕشیش ماوەیەک دەرگای زانکۆکانیان بەسەر خوێندکاران و مامۆستایاندا داخست. زانکۆکانی ئێمە وەک زانکۆکانی ئەورووپا نین، هەر کەسێک حەز بە زانست و هونەر بکات ئازادانە بتوانێت بچێت بخوێنێت. لێرە جگە لە خوێندکار کەسێک ناتوانیت لە دانیشتنی پۆلەکان و کۆنفرانسەکاندا بەشداری بکات. ڕۆژی (٤-٣-١٣٩٠=٢٥-٦-٢٠١١) بۆ مەراسیمی سەدەمین ساڵەی لەدایکبوونی دکتۆر محەمەد حەسەن گەنجی، ڕۆشتم بۆ زانکۆی تاران، چەند سیمینارێک ڕێکخرابوو، کاتیک ویستم لەزانکۆ بێمە دەرەوە، چەند کەسێک لە بەردەرگای زانکۆ وەستابوون، ڕەنگوڕوویان لە خەڵکی وڵاتی فەڕەنسا دەچوو. هەندێکیان چەپکە گوڵیان بەدەستەوە بوو. ئاخر ئەو ڕۆژە ساڵیادی لە دایکبوونی حەزرەتی زەهرا بوو. پاسەوانەکانی زانکۆ ڕێگەیان بە ئەوان نەدابوو بچنە ژوورەوە و بەشداری لە سیمینارەکە بکەن. لە هەموو ئەورووپا و یابان و هیند و ئەمریکا و ئەفریقای باشوور زانکۆیەک نییە کە دەرگای بە ڕووی خەڵکیدا دابخات. لەو وڵاتانەدا پەیوەندییەکان لەگەڵ زانکۆدا پچڕاو نییە. هەموو کەسێک دەتوانێت بچێت بۆ زانکۆ و لە سیمینارەکاندا بەشداری بکات. ئامادەیی خەڵکی لە زانکۆکاندا هەر هەبووە. خەڵکی خۆیان دەزانن چۆن لە زانکۆ سوودمەند دەبن. کەشی زانکۆ کەشی زانست و فێربوونە. ناو زانکۆ پارک و شوێنی وەستانی ئۆتۆمبێلی نییە و شوێنی سوکایەتی کردن نییە. دەرگای زانکۆ دەبێت کراوە بێت بەڕووی هەموو کەسێکدا. زانکۆماڵی هەموو کەسێکە. کام لە سەرۆک زانکۆکانی ئەورووپا دەتوانیت بڵێت من دەرگای زانکۆ بەڕووی خەڵکیدا دادەخەم و ناهێلم بەشداری سیمینارەکان بکەن. ئێستاش تازە وا دەرگای (حەوزەی عیلمی) بەڕووی ئەو کەسانەدا دەکرێتەوە کە دەیانەوێت بەشداری لە خوێندندا بکەن. لە ڕاستیدا هەندێک لە وانەکانی خوێندن لە مزگەوتەکاندا دەخوێنرێن، واتە شوێنی خوێندن لە ماڵی خودایە. کێ دەتوانێت دەرگای ماڵی خودا بەڕووی خەڵکیدا دابخات. ئەوانەی وا بیر دەکەنەوە کە هەموو خەڵکی بەتێکدەر دەزانن و دەرگای زانکۆکان دادەخەن. ئەو کاتانە تەنها هەندێک لە تێکدەرەکان دەچنە زانکۆ و وتەی لێپرسراوان بە ئاودا دەدەن. زۆرێک لە خوێندکارە بێ ئاگاکانی زانکۆ لە هەموو تەمەنیاندا تەنها یەک جاریش سەردانی زانکۆکانیان نەکردۆتەوە. لە وڵاتی ئێمەدا ئەنجومەنە بێکارەکانی خوێندن، گەورەترین کاریان دروستکردنی بینای گەورەی نیشتەجێبون و کڕینی کۆشکە بۆ ئەندامەکانیان. ئەنجومەنی خوێندکارانی زانکۆی مەشهەد لە ماوەی چل ساڵدا سەدان خانووی بۆ ئەندامەکانی دروستکردووە. بەڵام تا ساڵی (١٣٨٥-٢٠٠٦) یەک کتێبیان

بەچاپ نەگەیاندووە. هەڵبەت، دروستکردنی خانوو کارێکی باشە، بەڵام ئەوە کاری بەڵیندەرەکانە.

نیلۆفەر و هاوشێوەکانی لە نێو ئەو بنەماڵە خۆپەرستەدا، چۆن دەتوانن شتی نوێ فێربین؟ ئاشکرایە ئێستا کەناڵەکانی تەلەفزیۆن و سەتەلایت زۆرن، بەڵام هەر کەسێک بە بیرکردنەوەی خۆی و بەویستی خۆی کەناڵێک هەڵدەبژێرێت. ئاکامی ناکۆکی فەرهەنگی نیلۆفەر و هاوسەرەکەی ئەوە بوو. کە هەمیشە لەگەڵ هاوسەرەکەیدا لەسەر هەموو شتێک ناکۆک بوون. ئەگەر بە یەکەوە گەشتێکیان بکردایە و لەسەر سادەترین شت دەبووە دەنگەدەنگیان. محەمەد ئاغا چەندین ساڵ لە وڵاتی فەڕەنسا بووە و لە زانکۆکانی ئەو وڵاتە خوێندبووی و کاری کردبوو. ئەو دەیویست ژیانێکی بەختەوەری هەبێت. نیلۆفەریش دەیویست تەنها گرنگی بە ژیانی تایبەتی خۆی بدات. هەڵسوکەوتەکانی حاجی شەوکەت خانم هەمووانی لێک ترازاندبوو. گرینگترین خۆشییەکانی ئەم خانمە کە ئێستا بۆخۆشی بووە بە دایە گەورە بازاڕ کردن بوو...

حاجی ئاغای باوکی نیلۆفەر زیاتر خەریکی خواردنەوە بوو. کەم ترین کات لەماڵەوە بوو. لە هەفتەیەکدا چەند ڕۆژێک لە تاران دەبوو بۆ سەیروسەفای خۆی، شەوانە لە یانەکاندا دەمایەوە، هەموو شەوێک ئەوەندەی مووچەی یەک ساڵی کرێکارێکی خەرج دەکرد. لە کۆتاییدا حاجی ئاغا لە تەمەنی پەنجا و چەند ساڵێکدا لەگەڵ کچێک کە هاوتەمەنی نیلۆفەری کچی بوو، زەماوەندی کرد. ئیتر ئەمەش بوو بە کێشەیەک و هاتە سەر کێشەکانی تری ماڵی حاجی. حاجی شەوکەت خانم بەرگەی هەموو شتێکی دەگرت تەنها بەرگەی هەوێساری نەدەگرت، ژنێک کە خۆی لە هەموو کەس بە گەورەتر دەزانی، جگە لە خۆی و کەسوکارەکەی هیچ کەسی تری بە مرۆڤ نەدەزانی، ئێستا کەسێکی لێپەیدا بووە و پێیدەڵێت من هاوبەشی ژیانی تۆم و زۆریش لە تۆ زیاتر و باشترم، خۆ ئەگەر لە تۆ باشتر نە بوومایە، پیاوەکەت ژنی تری بەسەردا نەدەهێنایت. حاجی شەوکەت خانم گەورەترین کێشەی ئەو ژنەبوو، بەڵام هێشتا ژیان و هاوسەرەکەی خۆی خۆشدەویست. بۆ نەگونجانیشی لەگەڵ ئەو ژنەدا هەرگیز حەزی بە شکاتکردن نەبوو، تەنها باوەڕی بە نزا و جادوو هەبوو. حاجی ئاغاش لەپێناوی خۆشگوزەرانی خۆیدا ژنی دووەمی هێنا بوو، ئەم ژنهێنانەی کێشەی لە نێوان کەسوکارەکانیشدا دروستکرد بوو. هەندێک لایەنی حاجی ئاغایان دەگرت و هەندێکیش لایەنی حاجی خانمیان دەگرت. حاجی ئاغاش لەگەڵ شەراب خواردنەوەکەیدا ویسکیشی زیاد دەکرد و بە بەردەوامی خەریکی خواردنەوە بوو. لە ئەنجامی خواردنەوەیەکی زۆر و بێخەویەکی

زۆردا ڕۆژێک حاجی سەکتەی مێشک لێیدا و کتوپڕ ئیفلیج بوو، زمانی لە کارکەوت و خوێندن و نووسینیشی بیرچووەوە. تەنها سەکتە و ئیفلیجی توانی حاجی لەماڵەوە جێگیر بکات.

بەم شێوەیە حاجی شەوکەت خانم بووەوە بە خاوەنی هاوسەری خۆی، بەڵام بە ژیانێکی تەواو جیاوازەوە. ئیتر ئەم ژنە دەبوو ئیدارەی ماڵەکەی لە ئەستۆ بگرێت و بچێتە بازاڕ و سەربەرشتی دوکان و کرێکارەکانیش بگرێتە ئەستۆ، ئیتر دەبوو کرێکارەکان مووچەکانیان لە حاجی شەوکەت خانم وەربگرن.

حاجی شەوکەت خانم لە هەموو تەمەنیدا حەزی دەکرد کرێکار هەمیشە برسی بێت و مافی ئەوەی نەبێت تێر نان بخوات. ئەو دەیگوت کرێکار دەبێت هەمیشە خزمەتکاربێت و مافی ئەوەی نییە خانوو و ئۆتۆمبێل و پێویستیەکانی ژیانی هەبێت. ئەو دەیویست کەسێک کە ماوەی پەنجا ساڵ کاری بۆ کردون، نابێت ببێتە خاوەنی خانووی خۆی. ئەگەر کەسێکی هەژار بۆی هەڵبکەوتایە و خانوویەکی بکڕیایە ئەوا ئەو دەیگوت بە پارەی دزی ئەو خانووەی کڕیوە. لە ڕوانگەی حاجی شەوکەت خانمدا، کرێکار هەموویان دزن و مافی پێش کەوتنیان نییە، منداڵە کانیشیان نابێت مافی بەرەوپێشچوونیان هەبێت. کوبراش کارەکانی زیاتر بوو، بەخێوکردنی پیاوێکی ئیفلیجیشی هاتە سەر شان، ئەو تەمەنیشی گەیشتبووە سی ساڵ و هێشتا داواکاریشی نەبوو. حاجی شەوکەت خانم بیری لەوە کردبۆوە کە نابێت کوبرا لە دەستبدات چونکە بە لەدەستدانی ئەو هەموو کارەکانی ئەو ماڵە دەوەستێت. کچەکانیشی یەک بەدوای یەکدا شوویانکرد و ڕۆیشتن.

نیلۆفەر لە محەمەد ئاغا بوو بە دایکی کچێک و دوو کوڕ. حاجی شەوکەت خانم بۆ خۆی کوڕی نەبوو، هەر بۆیە کوڕەکانی زۆر خۆشدەویست. ئەو کوڕانە هەر کارێکیان بویستایە و ئارەزوویان لە هەر شتێک بووایە ئەنجامیان دەدا و دەبوو هەمووانیش لە خزمەتیاندابن. کچێکی تریشی کە شووی کرد بوو، ئەویش خاوەنی دوو کوڕ بوو. ئەم کوڕانەش هەر لەژێر چاودێری حاجی شەوکەت خانمدا پەروەردە کرابوون. ئەو منداڵانە دەیانگوت ئێمە لە هەموو کەس باڵادەست ترین، بۆیە نابێت ئێمە وانەکانمان بخوێنین و کاربکەین. کاتێک گەورەش بوون هەر بەدکاریەک کە ئەنجامیان دەدا تاوانەکەیان دەخستە ئەستۆی خەڵکی تر. ئەگەر وانەیان نەدەخوێند تاوانی خەڵکی تر بوو ئەگەر نەدەچوون بۆ سەربازی تاوانی خەڵکی تر بوو، کاتێک هیچ کارێکیان نەدەکرد تاوانی خەڵکی تر بوو. حاجی شەوکەت خانم دەیگوت بۆچی هەمووتان کۆنابنەوە و ناڕۆن ئەم کوڕانە لە سەربازی ببەخشن؟ بۆچی هەمووتان ناڕۆن کۆببنەوە و نمرە بۆ ئەوانە زیاد بکەن؟

تاکو لە شوێنێک وەربگیرێن. هەر کچ و زاوایەکی حاجی شەوکەت خانم کە لە ئەوان دوور بوون و لە شارێکی تردا دەژیان بیرکردنەوەیان زۆر باشتر بوو. منداڵەکانیشیان کاسب و میهرەبان بوون، ئەوانەی لە دەوروبەری ئەو ژنە بوون هەموویان چاوەڕوانی ئەوەیان دەکرد ئەو بمرێت و شتێکیان دەستبکەوێت. ڕەوشت و خووی حاجی شەوکەت خانم، هۆکارێک بوو بۆ پەیدابوونی کۆمەڵێک گەنجی نەخوێندەوازی بێکار و تەمەڵ. کۆمەڵە گەنجێک کە هەمیشە چاوەڕوان بوون پارەیەکیان لە ئاسمان و زەمینەوە بەدەست بگات و تەنانەت باوکیشیان خزمەتکار و نۆکەریان بێت. حاجی شەوکەت خانم تەنانەت زاواکانی خۆشی جوێنباران دەکرد. نەوەکانی حاجی شەوکەت خانم تەمەنیان لە سی ساڵ تێپەڕی بوو، بەڵام هەر چاوەڕوان بوون تێکڕای کارەکانیان لە سیر تا پیاز خەڵکی بۆیان ئەنجامبدات. ئەوان تەنها ئەوەیان دەزانی کە مانگانە مۆدێلی موبایلەکەیان بەرزبکەنەوە و قسەی زۆر بکەن. ئەوان هیچ شتێکیان لەبارەی بازرگانی و ئابوورییەوە نەدەزانی، بەڵام لەناو موبایلەکەیاندا ناوی دەیان و بەڵکوو سەدان کچیان یاداشت کردبوو. جا ئایا ئەو کچانە وەڵامی پەیوەندیەکانیان دەدانەوە؟ ئەوەش خودا دەیزانێت. ئەو نەوانەی حاجی خانم کە دانیشتووی یەزدن هەموویان بێکار و بێ هونەرن. ئەوان دەوروبەری خۆیان نەدەبینی. لەکاتێکدا کە هەزاران گەنج بەگشتی و ژن و پیاو ڕوویان کردبووە خوێندن و خۆپەروەردەکردن. خەڵکی بەگشتی چاوکراوە بوون و ببوون بە خاوەنی سەرمایە و کار و کاسبی خۆیان. حاجی شەوکەت خانم بە منداڵەکانی و نەوەکانی دەگوت ئەوانە هیچ نەبوون ئێستا وا بوون بەمرۆڤ. هیچ کاتێک نەیدەگوت ئەوانە چۆن کاریان کردووە و خۆیان هیلاک کردووە و بەهەوڵ و تێکۆشانی خۆیان، خۆیان پێگەیاندووە، تاوەکو نەوەکانی خۆیشی بەو قسانە فێرببن و ببنە مرۆڤ. دیارە هەر یەک لە ئێوەش چەند ژنێک و چەند بنەماڵەیەکی لەم جۆرە دەناسن؟ ئێستا قسە لەسەر یەک کەس و یەک بنەماڵە نییە، بەڵام مشتێک نموونەی خەروارێکە.

لە زستانی ساڵی (١٣٨٩-٢٠١٠) دا، چووم بۆ یەکێک لەگوندە دوورە دەستەکانی ئەفغانستان. شەو لەماڵی پیرە پیاوێک بووم لەناوچەی بامیان. بەفرێکی زۆر باریبوو، کۆڵانەکان پڕ ببوون لە بەفر، لە حەوشەی ماڵەکەدا زیاتر لە مەترێک بەفر باریبوو. خانووەکەیان لە خشتی قوڕ دروستکرا بوو. دیوار و بنمیچی خانووەکە بە دوکەڵ ڕەش ببوون. لە لاشیپانی دەرگاکەوە بەفر بەباوە دەهاتە ژوورەوە، ماڵەکە کارەبایان نەبوو. لە تێکڕای گوندەکانی ئەو ناوچەیە کارەبا نەبوو. قاچەکانم درێژ کردبوو بۆ ژێر کورسیەکە پاڵم بە دیوارەکەوە دابوو، لەگەڵ پیرەمێردی خانەخوێدا کەوتمە قسەکردن،

لەبارەی ژیانی منداڵی و دەردەسەرییەکانی میللەتێک کە چەندیین سەدەیە لەپێناوی مافەکانی خۆیاندا دەجەنگێت. میللەتێک کە لە کەمترین مافەکانی ژیانیان بێبەشن. هەر لە ئاوی خواردنەوەی پاک، تاکو هەموو پێداویستیەکانی تریان. بەڵام میللەتێکی میهرەبان و مرۆڤدۆستن. میللەتێک کە بە زمانی ئێمە قسەیان دەکرد، ئەوانیش باوەڕیان بەئاییینی ئێمە هەبوو. فەرهەنگێکی هاوبەشمان هەبوو. حافز و مەولەوی و بێدڵ و سەعدی و فردۆسی‌مان هاوبەشە. ئەو خەڵکە میواندۆستە ڕێزێکی زۆریان لێگرتم و قاورمەیان پێشکەش کردم. تەنها من و خاوەن ماڵ و منداڵەکانی بووین. هاوڕێ شۆفێرە ئەفغانییەکەم سەید ڕەحمانی ئەلفەت بە میوانی چوو بوو بۆ ماڵێکی تر. ئەو پیاوە بەڕێزە ژن و منداڵەکانی خۆی نارد بۆ ماڵی خوشکەکەی. چونکە هیچ ژوورێکی تریان نەبوو لێی بخەون. چرا دەستییەکەی لەسەر کورسییەک دانابوو هۆنراوەی بۆ دەخوێندمەوە. لەو سەرمای کوێستانەدا لەژێر کورسیەکە دانیشتبووین، وتووێژمان دەکرد. من لەسەر پێشنیاری هاوڕێکەم، چوو بوومە ئەو ماڵە. پیرەمێردەکە تەمەنی هەشتاوهەشت ساڵ بوو. بەڵام کەسێکی زرنگ و وریا بوو. لە دورترین گوندە کوێستانییەکانی ئەفغانستان هۆنراوەکانی سەعدی و حافز و بێدڵ و فیردەوسی بۆ دەخوێندمەوە. ڕاستیەکەی ئەو شەوە من زۆر خەجاڵەت بووم، چونکە تەنها یەک دێر هۆنراوەی بێدڵم لەبەر نەبوو. ئەو خاوەن ماڵە میهرەبانە تاکو بەیانی نزیکەی (٥٠٠) دێڕ هۆنراوەی بێدڵی بۆ خوێندمەوە. کارەبایان نەبوو، توالێتێکی خراپیان لە دەرەوە هەبوو. بەیەک کیلۆ خەڵوز کۆرسییەکەی گەرم کردبوو. هەموو سامانەکەی بایی بیست هەزار ئەفغانی نەدە بوو کە دەکاتە چوارسەد هەزار تومەن. بەڵام پیاوێکی هۆشیار بوو. لێم پرسی ڕەحیم خان، کەی ئاشتی لە ئەفغانستاندا بەرقەرار دەبێت؟ وەڵامێکی زۆر و سادە زیرەکانەی دامەوە و گوتی کاتێک یارییەکانی ئێمە گۆڕدران. ئێمە هەر لەمنداڵیەوە بەفەرهەنگی جەنگ پەروەردە کراوین. بە منداڵی وەک چۆلەکە شەڕمان دەکرد، کە گەورەتر بووین وەک کەڵەشیر بەیەکدا هەڵدەپڕژاین، پاشان وەک سەگ شەڕمان دەکرد، دواتر وەک گاکێوی پەلاماری یەکمان دەدا. ئێمە شایی و هەڵپەڕکێ‌شمان هەر شەڕە. هەموو ژیانمان هەر شەڕە. دابوونەریتمان هەر شەڕە. ئێمە دەمانەوێت هەموو کێشەکانمان بە شەڕ چارەسەر بکەین. بۆیە پێویستە هەموو یارییەکانمان کە لەسەر فەرهەنگی شەڕ بنیاتنراون وەلایان بنێین، ئەو کاتە ئاشتی دێتەکایەوە. ئەو پیرەمێردە گوتی. ئێمە چیرۆکەکانمان هەمووی چیرۆکی شەڕن. زیاتر لە سی چیرۆکی بۆ ژماردم کە بابەتی سەرەکی هەموو چیرۆکەکان هەر شەڕبوون. ڕەحیم خان گوتی ئەگەر کەسێک

دەستبداتە کلاشینکۆف و دە کەس لەنێو خاک و خۆڵدا بگەوزێنێت، پێی دەڵێن پاڵەوان. ئێمە ناوی پاڵەوانیشمان گۆڕیوە. ئێمە تیرۆر و کوشتنی خەڵکی بە پاڵەوانبازی دەزانین. ئەو پیاوە پیرە ڕۆشنبیرە زۆربەی کێشەکانی ئەفغانستانی بەکێشەی دەروونیی دەزانی. دەیگوت تەنانەت کاتێک هێزەکانی وڵاتان لێرە ڕۆیشتن خەڵکەکەی ئێمە لە نێو خۆیاندا کردیان بەشەڕ. هەر بەو شێوەیەی کە سوپای سۆڤیەت ئێرەی جێهێشت، شۆڕشگێڕەکان خۆیان لەناو خۆیاندا کردیان بە شەڕ. ئەو چەندین چیرۆکی جۆراوجۆری بۆ ژماردم کە بۆنی شەڕیان لێدەهات. ئەو گوتی ئێمە شەڕ بە پاڵەوانبازی تێگەیشتووین. لە دڵی خۆمدا گوتم (ئۆرلیش مارزلۆڤی) ئەڵمانی جێگەت خاڵی، کە لێکۆڵینەوە بۆ ئەم چیرۆکانە بکەیت. بەڵێ پێویستە فەرهەنگی زیادەڕۆیی و کەموکووڕییەکانی هاوشێوەی حاجی خانم و حاجی ئاغا تێبگەیت تاکو کۆمەڵگە کەمێک بەرەو چارەسەر بڕوات.

محەمەدی هاوسەری نیلۆفەریش، بە تەواوی سەری کردە سەر خواردنەوە و تەواو ئالودەی مادە هۆشبەرەکان بوو. دەبوو بەبەردەوامی خەریکی خواردنەوە بێت. بۆ بەردەوامبوونیش لەسەر خواردنەوە ماڵی جێهێشت و ڕۆیشت. کەسێکی واش نەبوو کە هەوڵی لەگەڵدا بدات تاکو کارێک بکات و لە خواردنەوە و ئالودەبوون دووری بخاتەوە، ئەو بێچارەیە پاش ماوەیەک خۆی کوشت. بەم خۆکوشتنەش هەندێک کەس نیلۆفەریان تاوانبار دەکرد. لەکاتی مردنی محەمەددا نیلۆفەر تەمەنی سویێنج ساڵ زیاتر نەبوو، ئەو چوار منداڵی هەبوو منداڵێک لە هاوسەرە کۆنەکەی و سێ منداڵیش لە محەمەد. دوای مردنی محەمەد هەندێک دەیانگوت نیلۆفەر هەرچی زووترە پێویستە شوو بکاتەوە.

کوبرا و نیلۆفەر هەردوکیان هەستیان بەبێ کەسی و بێچارەیی خۆیان دەکرد. جارێک نیلۆفەر دەیگوت خۆزگە منیش وەک کوبرا بوومایە و هەرگیز شووم نەکردایە. کوبراش دەیگوت خۆزگە منیش وەک نیلۆفەر خاوەنی چوار منداڵ و هەندێک پارە بوومایە. لە کۆتاییدا کەسوکارەکەی کوبرا هاتن وپاش سیوپێنج ساڵ کارکردن، بەزۆر بردیانەوە بۆ گوندەکەی خۆیان. لەوە بەدوا ماوەی (٨-٩) ساڵ هیچ کەسێک هەواڵێکی لێنەدەزانی. ڕۆژێک کەسێک لە فەرمانبەرانی زیندانی ژنانی یەزد کە خزمی منیش بوو، هەواڵی هێنابوو کە کوبرای کارەکەری ماڵی حاجی ئاغا لە زینداندایە. نیلۆفەر بە زوویی چوو بوو بۆ زیندان بۆ سەردانی کوبرا. کوبرا دەستی کردبوو بە گریان، نیلۆفەر گوتبووی بۆچی دەگریت و چیت بەسەرهاتووە. کوبراش بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕابووەوە. گوتبووی خزمەکانم، هەر زوو هەموو ئەو پارانەیان لێسەندم کە چەند

ساڵ بوو لە ماڵی ئێوە کۆمکردبووەوە. ئیتر پارەم هیچ نەماوە. پاشان گوتم دەبێت کار بکەم و مرۆڤ پێویستە کار بکات، کەسەکانیشم هانی کار کردنیاندام. پاشان شەوێک.....

نیلۆفەر لە کوبرای پرسی ئەی منداڵەکە چی لێهات ئەویش گوتبووی سوپاس بۆ خودا لە کاتی لەدایکبووندا مرد و ئێستا بەهۆی کاری بەدڕەوشتییەوە وا لە زینداندام. خزمەکانم، هەڵسوکەوتیان لەگەڵمدا زۆر خراپ بوو، ئێستا من حەز دەکەم چاوم بە هیچ پیاوێک نەکەوێت. نیلۆفەر بە زوویی پارێزەرێکی بۆ گرت و لە زیندان ئازادی کرد. کوبرا پاش چەند ساڵێک دابڕان دووبارە گەڕایەوە بۆ ماڵی حاجی ئاغا.

## بارامی دارابیان ناسراو بە بارامە سمێڵ

بەیانییەکی زووی یەکێک لە ڕۆژەکانی مانگی (شەهریوەری ١٣٤٤- ئەیلولی ١٩٦٥) پاسێک لە بەندەر عەباسەوە هاتە نێو گەراجی ئەتمینانی یەزد. سەرنشینەکانی دابەزین و هەموو گیانیان خۆڵ و تەپوتۆز بوو. ئەو کات هێشتا جادەی یەزد بۆ کرمان و بەندەر عەباس خۆڵ بوو. کاتێک سەرنشینەکان دابەزین، دەتگوت لە ئاش گەڕاونەتەوە، هەموو سەر و دەموچاویان لە تەپوتۆزدا سپی ببوو. لە بەردەرگای ژووری ئیدارەی گەراجەکە دانیشتبووم و سەیری گەشتیارەکانم دەکرد. شوفێر و شاگردی شوفێرەکە خەریکی داگرتنی کەلوپەلی سەرنشینەکان بوون، جگە لەو کەلوپەلانە، چەندین سەبەتە خورماش لە سەرەوەی پاسەکە بارکرابوو. ژنێک بە سێ منداڵەوە، کە سەرتاپای جلەکانیان تۆزاوی بوو، بەرەو لای ئێمە هاتن. ژنەکە عەبایەکی لە خۆیەوە پێچا بوو، سەرپۆشێکی گوڵداری بە سەرەوە بوو. کوڕێکی دە ساڵ و کچێکی نۆ ساڵ و کچێکی تری حەوت ساڵی لەگەڵدا بوو. ژنە زۆر شەرمن دیار بوو، کوڕەکەی سڵاوی کرد و حسێن عەلی کاشی کە ئەویش لە گەراجەکە بوو، گوتی فەرموو دایکەکەم چیتان دەوێت؟ ژنەش بە شەرمێکەوە گوتی ئێوە بارامە سمێڵ دەناسن؟ من کە ئەو کاتە تەمەنم شازدە ساڵ بوو، قسەکەم بە حسێن عەلی بڕی و گوتم بەڵێ دەیناسین، ئەوەش پاسەکەیەتی و کاتژمێر دووی دوا نیوەڕۆ دەڕوات بۆ تاران. ژنە بەم هەواڵە زۆر خۆشحاڵ بوو، گوتی کەی دێت بۆ ئێرە؟ حسێن عەلی گوتی نازانین کەی دێت، ڕەنگە ئێستا بێت، ڕەنگە تا کاتی ڕۆیشتن نەیات، چ کارێکت بە بارام هەیە؟ ژنەکە گوتی کاری تایبەتیم بەخۆی هەیە. لە دەرگاکەوە بانگی شاگردەکەی بارامە سمێڵم کرد، ئەویش هاتە لامان و پێمگوت ئەم ژنە کاری بە بارام هەیە، کەی دێت؟ ئەویش گوتی ئەمڕۆ هەموو کارەکانی پاسەکەم تەواو کردووە، بارام هیچ کارێکی نییە، ڕەنگە نەیات بۆ ئێرە تا کاتی دەرچوونمان بۆ

تاران. ژنەکە گوتی ئەگەر ئێوە مۆڵەتم بدەن، لێرە دادەنیشم تا بارام دێت. حسێن عەلی گوتی خوشکەکەم برۆ دەموچاوی منداڵەکانت بشۆرە و پاشان برۆن لە یەکێک لە ژوورەکانی سەرەوەی گەراج بۆ خۆتان دانیشن تا بارام دێت، هەر کاتێک بارام هات خۆمان ئاگادارت دەکەینەوە.

ژنەکە دەستی منداڵە بچووکەکەی گرت و هەر چواریان بەرەو لای چایخانەکە ڕۆیشتن و بە ئاوی حەوزی لای چایخانەکە دەست و دەموچاوی خۆیان شۆری و چوونە ژوورێکی سەرەوەی گەراجەکە بۆ پشوودان. بارامی دارابیان کە بە بارامە سمێڵ ناسرابوو، ئەو موسڵمان نەبوو، بەڵکو زەردەشتی بوو، چونکە سمێڵەکانی گەورە بوون، پێیاندەگوت بارامە سمێڵ. بارامە سمێڵ پیاوێکی سەرڕاست و ڕاستگۆ بوو، زۆربەی گەشتیارەکان دەیانویست لەگەڵ ئەودا گەشت بکەن و برۆن بۆ تاران.. حاجی دەسماڵچی پیاوێکی موسڵمانی دیندار بوو، ئەو کاتە تەمەنی شەست ساڵ دەبوو، مانگی جارێک دەچوو بۆ تاران. جاری وا هەبوو دوو ڕۆژ گەشتەکەی خۆی دوا دەخست تەنها لەبەر ئەوەی لەگەڵ بارامە سمێڵدا بڕوات. لە کاتێکدا زۆر پاسی تازە و جوانتر لەوەی بارام هەبوون، بەڵام حاجی هەر حەزیدەکرد لەگەڵ بارامدا گەشت بکات. ڕۆژێک لە حاجی دەسماڵچیم پرسی بۆچی تۆ هەمیشە دەتەوێت لەگەڵ بارامدا گەشت بکەیت؟ حاجی گوتی: «حسێن گیان، ئەم بارامە زەردەشتییە، ئەو تەنها شوفێرێکە، لەکاتی نوێژی بەیانی ونوێژی ئێواراندا دروست لە کاتی خۆیدا لە چایخانەکانی سەر ڕێگادا دەوەستێت و سەرنشینەکان دەتوانن لە کاتی خۆیدا نوێژەکانیان بکەن، بەڵام هەر کاتێک لەگەڵ پاسەکانی تردا دەڕۆم، ئەوان گرنگی بە نوێژکردنی سەرنشینان نادەن، تەنانەت هەندێک لە شوفێرەکان سەرنشینەکانیان لەو دەشتە چۆڵ و بێ ئاوەدا پیادە دەکەن بۆ نوێژکردن، هەندێکیشیان هەر ناوەستن و دەڵێن لە نێو پاسەکەدا نوێژەکانتان بکەن، تا ئێستا یەکجار ڕووینەداوە ئەم بەندەی خودایە، ئەم زەردەشتییە بەڕێزە تەنها دە خولەک پێش یا دووای بانگ وەستا بێت».

لەو ساڵانە چایخانە و مزگەوت لەنێوان شارەکاندا زۆر کەمبوون. کاتێک لە یەزدەوە دەردەچوویت تا ئەردەکان و لەوێشەوە تا عەقدا و نائین و ئەردستان جگە لە بیابان هیچ شتێکی تر نەبوو. مزگەوت لە نێو شارەکاندا هەبوون، بەڵام ئەو پێویستیانەی کە ئێستا (١٣٩١ - ٢٠١٢) هەن، ئەوکاتە نەبوون. ئەو دوکان و بازاڕەی کە ئێستا لەسەر ڕێگای شارەکاندا کراونەتەوە کارێکی زۆر باشە. هەڵبەت بوونەتە هۆی کاروکاسبی وبژێوی زۆر کەسیش. لەوسەردەمەدا جادەکان قیرەتاو نەکرابوون، تواناکان کەمبوون

بۆ خزمەتگوزاری خەڵکی، بەتایبەت بۆ کەسە نوێژکەرەکان گرنگ بوو شوفێرەکان پاسەکانیان لە شوێنێکی وا ڕابگرن تا سەرنشینەکانیان بتوانن پشوویەک بدەن و نوێژەکانیان بکەن. بارامە سمێڵ هەمیشە وای دەکرد.

ڕۆژێک پیاوێکی ترهات بۆ گەراج، دەیویست بە خۆی و منداڵەکانیەوە بڕوات بۆ تاران، بەڵام دەیویست بە پاسەکەی بارامە سمێڵ بڕوات، پاسەکەی بارامیش پڕ ببوو جێگا نەما بوو. منیش پێمگوت خۆ پاس هەر پاسە بڕۆن لەو پاسەی تر سواربن، جێگای زۆری هەیە و پاسەکەش باشترە. پیاوەکە گوتی من ژن و منداڵم لەگەڵدایە و دەچین بۆ تاران. بارامە سمێڵ جگە لەوەی خۆی پیاوێکی هێمن و باشە، شوفێرێکی وریا و زیرەکیشە. هەروەها جوێن فرۆشیش نییە و جوێن بەکەس نادات. لەو سەردەمەدا زۆریک لە شوفێرەکان هەمیشە جوێنیان دەدا، جوێنیان بەشاگردەکانی خۆیان و بە سەرنشین و بە هەموو کەسێک دەدا، سەرەتا و کۆتایی قسەیان جوێن بوو، بەڵام بارامە سمێڵ جگە لەوەی کە شوفێرێکی باش بوو هەرگیز جوێنی نەدەدا. خۆ دیار نییە بۆچی زۆربەی شوفێران هەمیشە جوێنیان دەدا. لە زۆر شوێن جوێندان هەر هەبووە. لە کۆنەوە هەندێک لە چین و توێژەکان خەڵکی زمانی جوێنیان بەکار هێناوە، دیارە ئەوەش وەک میراتێک بۆهەندێک لە شوفێران ماوەتەوە، هەڵبەت شوفێرەکان هەموویان جوێنفرۆش نەبوون. لە یەزد خودا لێخۆشبووان، حسێن عەلی کاشی و ئەکبەر ئاغا و مەحمود ئاغا و چەندانی تریش بە هەمان شێوە جوێنیان دەدا. دیارە سەدان شوفێری قسەخۆش و بەڕێزی وەک حسێن ڕوحانی و حاجی مامۆستا ئەحمەد هەبوون، بەڵام ئێستا شوفێر و شاگردەکانیان زۆر بەڕێز و پاکن، بەڵام بە داخەوە ژمارەیەک لە شوفێرەکان و شاگردەکانیان ئێستا گرفتاری ئەم تلیاکە نەعلەتیە بوون، کە ئەوەش چیرۆکێکی درێژ هەڵدەگرێت، بەڵام لە کۆتاییدا گەشتکردن بەسواری هێستر و ئەسپ گۆڕدرا بە گەشتی ئۆتۆمبێل، کە ئەمە گۆڕانکارییەکی گەورەی تەکنۆلۆژیا بوو..

لەو سەردەمەدا، ماڵەکان زۆر بەکەمی تەلەفۆنیان هەبوو، بارام سمێڵیش لە ماڵەوە تەلەفۆنی نەبوو. هەر بۆیە نەمدەتوانی پەیوەندی پێوە بکەم و بڵێم ژنێک بە سێ منداڵەوە وا لێرە چاوەڕێت دەکات و کاری پێتە. ژنەکە چەند جارێک کوڕە بچووکەکەی نارد بۆ لام و دەیگوت بارام نەهات؟ پێمگوت دڵنیابە هەرکاتێک هات ئاگادارتان دەکەمەوە. نیو کاتژمێر پێش کاتی دەرچوونی پاسەکە، بارام هات و پێمگوت ژنێک بە سێ منداڵەوە لە بەندەر عەباسەوە هاتووە و کاری بە تۆ هەیە. گوتی کوا لە کوێن؟ بڕۆ بانگیان بکە.. منیش سەر کەوتمە سەرەوە و چوومە ژوورەکەوە، ژنەکە لەگەڵ سێ منداڵەکانی

لەوێ دانیشتبوون، ژوورەکە بەتاڵ بوو، هیچ کەلوپەلێکی تێدا نەبوو، تەنانەت هیچ ڕاخەرێکیشی تێدا نەبوو تاکو لە سەری دانیشن. شوتییەکیان لەت کردبوو خەریکی خواردنی نان و پەنیر و شوتی بوون. بە ژنەکەم گوت وا بارام هاتووە و لەخوارەوە چاوەڕوانی ئێوەیە. هەر ئەوەندەم گوت و بەخێرایی هەر چواریان هەڵسان و هاتنە خوارەوە بۆ ژووری ئیدارە. سەید هادی خەریکی نووسینی ناوی گەشتیارەکان بوو. بارامە سمێڵ دەبوو کاتژمێر دووی دوا نیوەڕۆ بکەوتایە ڕێ بەرەو تاران. ژنەکە سڵاوی لە بارام کردو گوتی من خێزانی زەینەدینم. بارام وەڵامی سڵاوەکەی دایەوە و بە ژنەکەی گوت بەندەی خودا تا ئێستا لە کوێ بوویت؟ ژنەکە گوتی من خەڵکی میناب‌م، کاتێک هاوسەرەکەم مرد، من هیچ کەسێکم لە یەزد نەبوو، بۆیە دەستی منداڵەکانم گرت و ڕۆیشتم بۆ میناب، ئەم کوڕەم دەچێتە قوتابخانە و لە پۆلی پێنجەمە، چەند ڕۆژێک لەمەوبەر سەیری دەفتەرێکی باوکی کردبوو، بینی بووی شتێک نووسراوە لەسەر بارام سمێڵ، کوڕەکەم نەیتوانی بوو بە باشی بیخوێنێتەوە، بۆیە دەفتەرەکەمان برد بۆ لای دوکاندارەکەی دراوسێمان ئەو پێیگوتم کە بارام سمێڵ چوار هەزار تومەنی هاوسەرەکەم قەرزارە. منیش سێ منداڵم هەیە و هیچ کارێکم نییە و دەستمان زۆر کورتە، بۆیە بڕیارمدا بێم بۆ یەزد و تۆ بدۆزمەوە، بەڵکو تۆش قەرزی باوکی ئەم منداڵە بێ باوکانە بدەیتەوە، هەرچەندە دڵنیاش نیم کە کاتی خۆی تۆ ئەو قەرزەت داوەتەوە بە هاوسەری کۆچکردووم یان نا. بارام گوتی خودا لە هاوسەرەکەت خۆش بێت. کاتێک کە هاوسەرت کۆچی دوایی کرد. من زۆر بەشوێن ئێوەدا گەڕام، بەڵام نەمتوانی ئێوە بدۆزمەوە، بەڵێ هاوسەری کۆچکردووت پارەی لای من هەیە، بەڵام من ئێستا دەچم بۆ تاران، گەشتیارەکان وا لەپاسەکەدا دانیشتوون، من سبەی لە تارانم و دوسبەی دەگەڕێمەوە بۆ یەزد، کە هاتمەوە ئەو کاتە حساب دەکەین. ژنەکە گوتی جا من تاکو دوسبەی لێرە چیبکەم. بارام لێیپرسی و گوتی لە یەزد خزم و کەست هەیە؟ ژنەکە گوتی من لێرە نە جێگایەکم هەیە و نە کەسێکیش دەناسم. بارام ڕووی کردە من و گوتی حسێن من ئەم ژن و منداڵانە بە تۆ دەسپێرم و بیانبە بۆ ئەو میوانخانەیەی بەرامبەر گەراج، لەسەر حسابی من ژوورێکیان بۆ بەکرێ بگرە. بیست تومەنیشی دا بە ژنەکە و خوداحافیزیی کرد و ڕۆیشت. ژنەکە گوتی خودا تەمەن درێژت بکات. پاشان بارام ڕووی کردە من و گوتی ئەگەر من مردم و نەگەڕامەوە حسابی زەینەدین لە دەفتەرەکەمدا نووسراوە. دەفتەرەکەشم وا لەماڵەوەیە. بە ژنەکەم بڵێن بە پێی نووسراوی ناو دەفتەرەکە حساب لەگەڵ ئەم ژنە دابکات. ژنەکە گوتی ئیشەڵڵا بە

سەلامەتی دەگەڕێیتەوە...

منیش ژنە و منداڵەکانیم برد بۆ میوانخانەکەی بەرامبەر گەراج و ژوورێکم بۆ بەکرێگرتن لەسەر حسابی بارامە سمێڵ. ڕۆژی دواتر سەردانی میوانخانەکەم کردەوە. پاش دوو ڕۆژ بارام لە تارانەوە گەڕایەوە، پێش ئەوەی بڕواتەوە بۆ ماڵەوە لێی پرسیم ژنەکەی زەینەدین لە کوێیە؟ گوتم هەر لە میوانخانەکەیە. بارام گوتی وا من دەڕۆمەوە بۆ ماڵەوە دەفتەرەکە دەهێنم و پاش نیو کاتژمێری تر دەگەڕێمەوە، کە گەڕایەوە گوتی حسێن هەڵسە با بەیەکەوە بڕۆین بۆ میوانخانەکە. بەیەکەوە ڕۆیشتین بۆ میوانخانەکە و چووینە لای ژن و منداڵەکان و دانیشتین. بارامە سمێڵ چەند پەڕەیەکی لە دەفتەرەکەی، کە تایبەت بوو بە حسابی زەینەدین، ئەمدیواودیو کرد و ڕووی کردە ژنەکە و گوتی من لە فلان بەرواردا ویستم پاس بکڕم، چوار هەزار تومەنم کەم بوو، بەڵام هاوسەرەکەت ئەو بڕە پارەیەی پێدام و گوتی بەسوو ئەو پارەیەت پێنادەم چونکە من سووخۆر نیم، بەڵام بە بڕی چوار هەزار تومەن لە زیان و قازانجی پاسەکەتدا هاوبەش دەبم.. تا هاوسەرەکەت لە ژیاندا مابوو چەند جارێک قازانجی ئەو چوار هەزار تومەنەی لە من وەرگرتووە، بەڵام ساڵانەی پاسەکە بەناوی هاوسەرەکەتەوە نییە، بەڵکو بەناوی خۆمەوەیە، ئەو تەنها هاوبەش بووە لەگەڵمدا، تەنانەت من ناسناوی هاوسەرەکەشتم نەدەزانی. ژنەکە گوتی ناسناوی (سیرجانی موقەددەمە). بارام گوتی ئەو پاسەی کە ئەوکاتە کڕیم، دوو ساڵ لەمەوبەر فرۆشتم و پاسێکی ترم کڕیوەتەوە، وەسڵی کڕین و فرۆشتنەکەیشم لاماوە. ئێستا وا هەموو حسابەکان لێک دەدەمەوە هەرچیت بەرکەوت پێتیدەدەم. ژنەکە گوتی من نامەوێت حساب لێک بدەیتەوە تەنها چوار هەزار تومەنەکەم بدەرێ و هیچی ترم ناوێت. بارام گوتی وانییە، هەموو شتێک بە حسابە و بەڵێنیش بەڵێنە. بارام نزیکەی یەک کاتژمێر خەریکی دەفتەرەکەی و لێکدانەوەی حساب بوو، پاشان دەفتەرەکەی دا بە من و گوتی تۆش کۆی بکەرەوە. منیش سەیرێکم کرد و هەموو ژمارەکانم کۆکردەوە، لای منیش هەمان ژمارە دەرچوو.. ئنجا بارام ڕووی کردە ژنەکە و گوتی من دەبێت (١٨٤٠٠) تومەن بدەمە ئێوە. ئەوەتا بە هەموو لێکدانەوەیەک من ئەو بڕە پارەیە قەرزاری هاوسەرەکەتم. ئەو ژنە بە بیستنی ئەم قسەیە لە خۆشیاندا بە هەموو هێزی خۆی هاوارێکی کرد و چەند جارێک گوتی چۆن تۆ هەژدە هەزار تومەن دەدەیت بە ئێمە؟ بارام گوتی بەڵێ دەبێ بتاندەمێ، چونکە مافی خۆتانە، بەڵام ئەگەر ئێستا هەموو پارەکەتان پێبدەم یا دەبێ پاسەکە بفرۆشم، یا باخێکم هەیە دەبێت بیفرۆشم و تەواوی پارەکەتان پێبدەم. ژنەکە گوتی من نامەوێت تۆ تووشی کێشە

و ناڕەحەتی بکەم. بارام گوتی من تا نیوەڕۆ پێنج هەزار تومەنت بۆ پەیدا دەکەم و پێتیدەدەم ئەوی تر دەتوانم پاش سێ مانگی تر بۆتانی دابین بکەم، وە ئەگەر پێتان باشە بە ئەندازەی ئەو پارەیەی دەمێنێتەوە، لەپاسەکەدا هاوبەشبن و مانگانە چەند پارەتان قازانج بەرکەوت پێتانی دەدەم. ژنە پێشنیاری دووەمی قبوڵ کرد. بارام نامەیەکی هێناو تێیدا نووسی ژن و منداڵی زەینەدینی سێرجانی بە بڕی (١٣٤٠٠) تومەن هاوبەشن لە پاسەکەیدا. نامەکەی ئیمزا کرد و دایەدەست ژنەکە. بارام تا نیوەڕۆ پێنج هەزار تومەنەکەشی بۆئامادەکردن و پێیدان. ژن و منداڵی زەینەدین سێرجانی لە خۆشیاندا نەیاندەزانی چیبکەن. ئەو شەوەش لە میوانخانەکە مانەوە و بۆ سبەینێ بە کەیف و خۆشییەوە گەڕانەوە بۆ میناب. داوایان لە من کرد سەردانیان بکەم. منیش ساڵی داهاتوو چووم بۆمیناب بۆ سەردانیان. میناب شارێک بوو لە کەپر دروستکرا بوو. واتە لە ساڵی (١٣٤٥- ١٩٦٦) دا هەموو شاری مینابدا پەنجا خانووی تێدا نەبوو. خەڵکەکەی لە کەپردا دەژیان. کەپرەکانیان بە لق و گەڵای دار خورما دروستکردبوو.

بارام خەرجیی ڕۆژێکی تریشی دا بە میوانجانەکە. من زۆر باش ئاگاداربووم کە بارام زوو زوو پارەی دەنارد بۆ ژن و منداڵەکانی زەینەدین. خۆتان بڕیار بدەن کاتێک کە دەڵێن زەردەشتییەکان کەسانێکی ڕاست و ڕاستگۆن، لەبەر ئەم کارە جوانانەیانە. بارامە سمێڵ نموونەیەک بوو لە زەردەشتییەکان..

من کاغەز و نامەی دادگای زۆر کەسم لایە، کە قەرزاری من بوون، خۆیان بە موسڵمان دەزانی و سەردانی مەککەشیان کردبوو. هەندێکیان خزم و کەسی خۆشم بوون، بەڵام پارەکەیان پێنەدامەوە و خواردیان..

بەڕێز (پیرد سپاکس) ی فەرەنسی لە پاریس بە درێژایی یەک ساڵ مانگانە (٢٥٠٠) فەرەنگی بە قەرز پێدەدام. ئەوکاتە من لە زانکۆی سۆربۆنی پاریس خوێندکاری دکتۆرا بووم، تەمەنم نزیکەی سیودوو ساڵبوو. پاش ساڵێک پازدە هەزار فەرەنگم پێدایەوە و پازدە هەزار فەرەنگم لا مایەوە تا ئێستاش ئەو پارەیەم پێنەدایەوە تاکو مرد. ئێستا منداڵەکانی گەورەن و کاروباری خۆیان هەیە، بەڵام من نەچووم بە دوایاندا بگەڕێم و پارەکەیان پێبدەمەوە. واتە پیاوێک لە ناخۆشترین ڕۆژەکانی ژیانمدا هاوکاری منی کردووە و پارەی بە قەرز پێداوم، بەڵام من ئامادە نەبووم ئەو پارەیەی بە قەرز پێیدابووم بۆی بگێڕمەوە، وای لە منی موسڵمان، بۆیە پێویستە لەسەرم ڕێگایەک بدۆزمەوە و پارەی پیرد سپاکس بدەمەوە.

کاتێک باوکم مرد قەرزمان لای زۆر کەس هەبوو، بەڵام تەنها حەسەن بەحرینی

بەندەر ئابادی هاتوو حسابی لەگەڵ کردین و قەرزەکەی بەتەواوی پێدایەوە.. من زۆرم پێخۆش بوو کە زەینەدینی سیرجانی هیچ بەڵگەیەکی قەرزی لەسەر بارامە سمێڵ نەنووسی بوو. لەوەش باشتر ئەوە بوو کە زەینەدین لە دەفتەرەکەیدا ناسناوی بارامە سمێڵی نەنووسیبوو. بارامە سمێڵیش ناسناوی زەینەدینی نەدەزانی. چوار هەزار تومەنی ئەو کاتە لانیکەم سەد ملیۆن تومەنی ساڵی (١٣٩١ - ٢٠١٢) دەبوو.. بەڵام بارام چونکە کەسێکی سەرڕاست و حەرامنەخۆر بوو. هەموو مافێکی بۆ ماڵ و منداڵی زەینەدینی سیرجانی گێڕایەوە.

## یادەوەریی زانکۆی مەشهەد

دەمویست یادەوەریی زانکۆی مەشهەد لە کتێبێکی تایبەتیدا بنووسم، یادەوەرییەکانی زانکۆی مەشهەد چ لە پێش شۆڕش و چ لەدوای شۆڕش، لە تەواوی یادەوەرییەکانی دیکەم جیاوازترە. یادەوەرییەکانی زانکۆ پێویستی بە لێکۆڵینەوەو ڕاڤەکردن و دیدگای جیاواز هەیە کە ئەویش لە توانای خوێنەرانی کتێبی شازادەی حەمامدا نییە، بەڵام بۆ بەردەوامی یادەوەرییەکانی شازادەی حەمام، لانیکەم دەبێت ئاماژەیەک بە یادەوەریی زانکۆی ئەدەبیاتی مەشهەد بدەم. بۆیە زۆر بە کورتی شتێک لەبارەی زانکۆ و کۆلێژەوە دەنووسم. لەم باسەمدا زیاتر مەبەستم ئاشنابوونی خوێنەرانە بە زانکۆ و کۆلێژەکان، لە دەیەی (١٣٤٠-١٩٦١) وە تا چەند ساڵێکی پێش شۆڕش.

لەم بەرگەدا پێش ئەوەی یادەوەرییەکانی زانکۆ بنووسمەوە. دەچمە سەر یادەوەریی لێکۆڵینەوەیەکی زانستی لە نێو هۆزە کوردە کۆچەرییەکانی خۆراساندا، بەڕاستی دەمەوێت خۆم ببوێرم لە نووسینەوەی یادەوەریی زانکۆ، ئێستاش ئەو چەند پەڕەیەی کە دەینووسم تەنها مەبەستم لێی ئاشنابوونی خوێنەرانە بەو سەردەمە.

کاتێک من چووم بۆ قوتابخانە، قوتابخانەکانی وڵات بە خۆڕایی و بێبەرامبەر بوون، ئەوکاتە قوتابخانەی تایبەت نەبوو. تەنها لە شاری تاراندا چەند قوتابخانەیەکی تایبەتی نموونەیی هەبوون، بەڵام لە شارێکی وەک یەزددا قوتابخانەی تایبەت نەبوو. لە شاری یەزد، چەند قوتابخانەی گەورە و باش لەلایەن خێرخوازانەوە دروستکرابوون، بەڵام لە ژێر چاودێری پەروەردەدا بوون. قوتابخانەی کەیخوسرەوی، قوتابخانەی ماکار، قوتابخانەی ڕەسوڵیان، قوتابخانەی ئیتیحاد و.... ئەمانە هەموویان لەلایەن زەردەشتییەکان و موسڵمانەکان و یەهودییەکانەوە دروستکرابوون. قوتابخانەی سەرەتایی و ناوەندی تایبەت کە خوێندن تێیدا بە پارەبێت، لە شاری یەزد لەم جۆرە قوتابخانەیە نەبوو، بەڵام

ئێستا لە تەواوی شارەکاندا ئەم جۆرە قوتابخانە چینایەتیانە پەیدا بوون. لە ئێستادا لە ساڵی (١٣٩١-٢٠١٢)، هەرچەندە زۆربەی مامۆستاکان حەزدەکەن منداڵی خەڵکی بخوێنن و پێبگەن، بەڵام باری ئابووریی ڕێگرە. ئێستا هەر کەسێک پارەی باشتری هەبێت دەچێتە قوتابخانەیەکی باشتر و دەچێتە پۆلی بەهێزکردنەوە و مامۆستای تایبەت دەگرێت و لەکۆتاییشدا سەرکەوتوو دەبێت. دکتۆر ئەمین عەلی زادە، مامۆستایەکی چالاکی ئێرانە و دەڵێت: ئێستا زانست بەشێوەی دەرزیلێدان لە منداڵان دەدرێت. ئەمڕۆ خوێندنی بە پارە بووە بە هۆی دروستبوونی قوتابخانەی چینایەتی. منداڵی دەوڵەمەندەکان دەبن بە ئەندازیار و دکتور و بەڕێوەبەری گەورە، منداڵی دەوڵەمەندەکان لە قوتابخانەشدا دەبنە دۆست و هاوڕێی یەکتری، تا لە دوا ڕۆژیشدا هاوکاری یەکتربن. پارەدارەکان بەیەکەوە دەبنە سەرۆک و پارێزەر و وەزیر.. شارەکان دابەشبوون بەسەر باکوور و باشووردا، قوتابخانەکانیش دوچاری ئەم چارەنووسە بوونەتەوە. ئەگەر بەجوانی سەیربکەیت منداڵانی باکووری شار قەڵەوتر و جوانتر و باڵابەرزترن لە منداڵانی قوتابخانەی گشتی، یا باشووری شار. مامۆستایانی قوتابخانەکانی باکووری شار سواری ئۆتۆمبێلی باشتر و مۆدێل بەرزتر دەبن، خۆ، جاری واش هەیە ڕوودەدات کە منداڵی هەزاران بچنە کۆلێژی باش و پێشکەوتوو.

ئەگەر لە دەیەی (١٣٤٠-١٩٦١) دا، قوتابخانە بەپارە بوایە، ئەگەرێکی زۆر هەبوو من نەچمە قوتابخانە. چونکە دایکم نەیدەتوانی پارەی خوێندن بۆ من دابین بکات. لەو سەردەمی هەژاری و بێ پارەییەدا سوپاس بۆ خودا کە چوونە قوتابخانە بەپارە نەبوو، بەڕاستی مامۆستاکانیش بەباشی وانەیان دەگوتەوە، بەهیچ شێوەیەک باسی پۆلی تایبەتیان نەدەکرد، باش بوو لە کۆتاییدا بەهەوڵ و ماندوبونی مامۆستا بەڕێزەکانم توانیم دبلۆم وەربگرم. لەو پۆلە تێکچڕژاوەدا کە زیاتر لە چلوپێنج خوێندکار بووین. کەمتر لە پازدە کەس توانیمان بچینە زانکۆ، ئێمە هیچ کەسێکمان تەنها یەک کاتژمێر نەچوو بووینە پۆلی تایبەتەوە، چونکە ئەو کاتە قوتابخانە و پۆلی تایبەت نەبوو. زۆربەی هاوپۆلەکانم لەبەر هەژاری و نەبوونی نەیانتوانی لەخوێندن بەردەوامبن. لەو سەردەمەدا وەرگرتنی خوێندکار لە زانکۆکاندا بەسەر یەکەوە نەبوو، بەڵکو هەر زانکۆیەک بە جیا و تایبەت بەخۆی خوێندکاری وەردەگرت، ئەو کاتە مامۆستای زانکۆ ئەوەندە زۆر نەبوون کە حوکمەت بتوانێت لە هەر شارێکدا زانکۆیەک بکاتەوە. بۆ هەڵبژاردنی کۆلێژیش دەبوو لە سەرەتاوە بچوویتایە تاقیکردنەوەت بکردایە. لە هەموو وڵاتدا تەنها لە شارەکانی تاران، تەبرێز، ئەسفەهان، شیراز و مەشهەد زانکۆ هەبوو. هاوکات

زانکۆیەکی ئەفسەرانیش لە تاران هەبوو. هەر لە تاران سێ زانکۆی تریش هەبوو، زانکۆی تاران، زانکۆی میللی (شەهید بەهەشتی) و زانکۆی پێگەیاندنی مامۆستایان. ئەم زانکۆی پێگەیاندنی مامۆستایانە لە هەندێک لە شارەکانی تریش لقی هەبوو. ئەم زانکۆیە ڕاستەوخۆ مامۆستای بۆ وەزارەتی پەروەردە پێدەگەیاند. لە عەبادانیش زانکۆی پیشەسازیی نەوت هەبوو.

من و حەسەن حوسنی و زیائی مەلیکزادە، هەرسێکمان بڕیارماندا تاقیکردنەوەی بەشی جوگرافیا بکەین. حەمید درودیان و سەیدنا حەزیان لە بەشی ماف بوو، عامری و مشیر سلێمانیان چوونە بەشی تر. روح بەخشیش دەیویست بچێتە بەشی مێژوو، بەڵام لە دواییدا لە بەشی مۆسیقای زانکۆی تاران وەرگیرا. ئێمە هەژدە خوێندکاری خەڵکی شاری یەزد بووین، بڕیارماندابوو بۆ تاقیکردنەوە، بچینە شارەکانی تر. تاکو لە زانکۆ وەربگیرێین، دیارە هەندێک لە هاوڕێکانم ساڵی پێشووتر دیبلۆمیان وەرگرتبوو. ئەوان لە تاقیکردنەوەکاندا شارەزاییەکیان هەبوو، ئێمە هەر زوو بڕیارماندا کەسمان نەچین بۆ زانکۆی پەهلەوی شیراز و زانکۆی تەبرێز. چونکە زانکۆی پەهلەوی شیراز، زیاتر گرنگی بەزمانی ئینگلیزی دەدا، ئێمەش هیچ کاممان لە زمانی ئینگلیزیدا باش نەبووین، جگە لە زیائی مەلیک زادە کە لەزمانی ئینگلیزی دا زۆر باش بوو، ئێمە ئەو سێ کەسە دەمانویست بچینە کۆلێژی جوگرافیا، بەڵام زانکۆی شیراز کۆلێژی جوگرافیای نەبوو. تەبرێزیش بۆ ئێمەی خەڵکی شاری یەزد زۆر دوور بوو، زمانی تورکیش لەوێ کێشە بوو بۆ ئێمە. ئەو هەژدە کەسە بڕیارماندا کە بچین بۆ زانکۆکانی مەشهەد و ئەسفەهان و تاران. تاقیکردنەوەی وەرگرتن لە زانکۆی مەشهەد لە کۆتایی مانگی (خورداد - تەموز) دا بوو، زانکۆی تاران لە مانگی (مورداد - ئاب)دا بوو، زانکۆی ئەسفەهان لە مانگی (شەهریوەر- ئەیلول) دا بوو. هەمووومان بەیەکەوە لە گەراجی ئەتمینانەوە سواری پاسێک بووین و بەرەو مەشهەد بەڕێکەوتین. جادەکە لە یەزدەوە تاکو مەشهەد خۆڵ بوو. چوار ڕۆژ پێش وادەی تاقیکردنەوە بەڕێکەوتین. پاس بە چلوهەشت کاتژمێر هەندێک جار بە حەفتاودوو کاتژمێر دەگەیشتە مەشهەد. بۆیە دەبوو زووتر بەڕێبکەوین. شەوی یەکەم لە گوڕەپانی پشتی بادام چەند کاتژمێرێک نووستین. لەگوڕەپانی پشتی بادام پێشهاتێک هاتە پێش و چەند کاتژمێرێک دوای خستین. کاتێک پاسەکەمان لە دامێنی کێوی خەرانقەوە دەهاتە خوارەوە، پڵنگێک لە سەر جادەکە پەیدا بوو، پڵنگی بەستەزمان لایتی پاسەکە لێیدابوو، ئەویش ڕێک هەر بەسەرجادەکەدا ڕایدەکرد. واتە نزیکەی یەک خولەک بەسەرجادەکەدا ڕایکرد. شۆفێرەکەش پاسەکەی هێواشکردەوە

تاکو خۆی بە پڵنگەکەدا نەکێشێت. سەرنشینەکان هیچیان پڵنگیان نەبینی بوو، دەستیان کرد بە هاوار هاوار، ئای پڵنگ ئەوەتا پڵنگ. خۆتان دەزانن ئەو کاتە تەلەفزیۆن نەبوو، لە شاری ئێمەدا باخچەی ئاژەڵانیش نەبوو، هەڵبەت ئێستاش ساڵی (١٣٩١-٢٠١٢) لەشاری یەزدی ئێمەدا باخچەی ئاژەڵان هەر نییە. ئیتر ئەو خەڵکە لە کوێ پڵنگیان بینیبێت؟

ماوەی یەک کاتژمێر سەرنشینەکان لەنێو پاسەکەدا لەبارەی پڵنگەکەوە قسەیان دەکرد. کاتژمێر دوازدە ی شەو گەیشتینە گۆڕەپانی پشتی بادام. بڕیار وا بوو دوو کاتژمێر بخەوین. هەندێک لە سەرنشینەکان هەر لە پاسەکەدا نووستن. هەندێکیش دابەزین و لەبەردەمی چایخانەیەکدا ڕاکشان و نووستن. کاتێک ویستمان سواربببینەوە لەناکاو دەنگی هاواری ژنێک هات، هەندێک گوتیان پەرکەمی گرتووە و بوراوەتەوە. بۆچی بوراوەتەوە؟ کاتی پەڕینەوەی پڵنگەکە لەجادەکە ئەو ژنە نووستبوو، بەڵام هیچ کەسێک ئەوی بەخەبەر نەهێنابوو، کاتی بەیانی هەڵیان سەندبوو تاکو نوێژەکەی بکات. باسی بینینی پڵنگەکەی شەویان کردبوو. ئەو ژنە کە زانیبووی پڵنگێک هاتۆتە سەر جادەکە، ئەو ئینجا ترسابوو، لە ترسا بورابووەوە. چەند ژنێک لە نێوپاسەکەدا هێنایانە خوارەوە، ئەم ژنە دەستیکرد بە دانە جیڕە و کەف لەدەمی دەهات، لەو شوێنە پزیشکیش نەبوو تاکو چارەسەری بۆ بکات، پاش سێ کاتژمێر کە خۆر بەتەواوی هەڵهات ئینجا ژنەی داماو هۆش خۆی هاتەوە، دووبارە کەوتینەوە ڕێ. یەک ڕۆژی تەواو بەڕێگاوە بووین، تەنها سەد کیلۆمەتر ڕێگامان بڕی، شەوی دووەم چەند کاتژمێرێک لەگۆڕەپانی کەلمەرد ماینەوە بۆ پشوودان، ئەو شوێنە شوێنێکی زۆر دڵگیر و خۆش بوو. بەڵام بەداخەوە ئێستا (١٣٩١-٢٠١٢) خەریکە وێران دەبێت. لەو شوێنەدا کەسێک هەبوو، ناوی ئەحمەد شا بوو. من ئەو پیاوە دەناسم، پیشەی دروستکردنی خەڵوز بوو، ئەو کاتە تەمەنی نزیکەی هەفتا ساڵ دەبوو، بە درێژایی پەنجا ساڵ بەخۆی و کرێکارەکانیەوە لە دارستانەکانی کەویر بەتایبەتی درەختەکانی تاج و قیچی هەموو سووتاند، ئەو خەڵوزی بۆ خەڵکی تەبەس و یەزد و شارەکانی تر دروست دەکرد. جگە لە خەڵوز ساڵانە سەدان پیکاب داری وشکی بۆ شارەکان دەنارد. بەهۆی ئەحمەد شا و هاوکارەکانییەوە لە ماوەی نیوسەدەدا تەواوی دارستانەکانی کەویر لەناوچوون. ئەحمەد شا چایخانەشی هەبوو. بە چێشتی کەشکەکی حوشتر پێشوازی لە میوانەکان دەکرد، بەڵام گەشتیارانی یەزدی نان و ماستی خۆیان دەخوارد و کەشکەکی ئەویان نەدەخوارد. هەر چەندە سوودیان لە توالێتەکانی چایخانەکەش وەردەگرت. دیارە ئەگەر شۆفێرێک یا گەشتیارێک بیویستایە کەمێک سەری خۆی گەرم بکات، ئەوا مێزی تلیاک

ئامادە کرابوو. باسی تلیاک کێشان کرا، من لەهەموو تەمەنمدا یەکجار تلیاکم کێشاوە ئەویش ساڵی (١٣٤٨-١٩٦٩) بوو لە یەزدەوە دەچووم بۆ مەشهەد، شۆفێری پاسەکەمان ئاغا سەید جەواد بوو، پیاوێکی زۆر بەڕێز و خۆشەویست و میواندۆست بوو، ئەو کرێی لە من وەرنەگرت، لە ڕێگادا ڕێزێکی زۆری لێگرتم لە دەروازەی گۆناباد بۆ مەشهەد چایخانەیەک و ڕێستۆرانتێک هەبوون، لە پشتی چایخانەکەدا چەند ژوورێک دابینکرابوو بۆ پێشوازیکردن لە شۆفێرەکان. ئاغا سەید جەواد منی لەگەڵ خۆیدا برد بۆ ژووری شۆفێرەکان. لەوێ خوانی کەباب و تلیاک ڕازا بووەوە. لەسەرداوای ئاغا سەید جەواد منیش پێکێک تلیاکم کێشا. بەڵام هیچ تێنەگەیشتم، لەپاسەکەدا لە گۆنابادەوە تاکو مەشهەد خەوم لێکەوت. کاتێک گەیشتمە ماڵەوە خەوێکی قورس دایگرتبووم و بەتەواوی خەوم لێکەوت، جا نازانم ئەو هەموو خەوە بەهۆی شەکەتی ڕێگا دوورەکەوە بوو یاخود بەهۆی کێشانی تلیاکەوە؟ پرسیارێک پێویستە وەڵام بدرێتەوە من زۆر سوپاسی خودای گەورە دەکەم کە هەرگیز ئەم خۆراکە بەتام و پیسەم تاقی نەکردەوە. جارجارێک لە مەشهەد دەچووم بۆ سەردانی ئاغا عەباس کە هەمیشە خوانی شاهانەی ئامادە بوو. نەکێشانی تلیاک بۆخۆی سەرکەوتنێکی گەورەیە. باوکم و مامەکانم هەموو تلیاکی بوون. سوپاس بۆ خودا من ئەم کارەم بەمیرات نەبردووە بۆ خۆم. لەو سەردەمەدا زۆربەی چایخانەکانی سەر ڕێگای شارەکان، مێزی تلیاکیان دەڕازاندەوە بۆ شۆفێرەکان. دیارە ئەوە کاروکاسبیەکی باش بووە بۆ خاوەن چایخانەکان، کە دەیانتوانی بەهۆی تلیاکەوە مشتەری باش بۆ خۆیان ڕابکێشن.

با بگەڕێینەوە سەر گەشتەکەی خۆمان و گۆڕەپانی کەلمەرد. ژنی نەخۆش دووبارە بورایەوە. هەژدە کاتژمێرمان پێچوو بۆ بڕینی (٢٠٠) کیلۆ مەتر. بەیانی زوو گەیشتینە تەبەس، ژنەی نەخۆش و هاوسەرەکەیمان لە بەردەمی دەرمانگایەکدا دابەزاند، نیو کاتژمێر چاوەڕوانمانکردن. دکتۆر گوتی ئەم خانمە پێویستە تاکو نیوەڕۆ لە دەرمانگاکەدا پشوو بدات، بەڵام هەر چۆنێک بێت سواری پاسەکە بووەوە و کەوتینەوە ڕێ بۆ ڕۆژی دوایی گەیشتینە مەشهەدی پیرۆز. لە ئوتێلێکدا سێ ژوورمان بۆ هەژدە کەس بەکرێ گرت و پاشان هەموومان پێکەوە ڕۆیشتین بۆ حەمامی سوڵتانی کە دەکەوێتە نزیک مەرقەدی ئیمام ڕەزا. سێ کاتژمێر لەحەمامداماینەوە پاشان هەریەکەی پازدە ڕیاڵمان دا بەخاوەن حەمام و هاتینە دەرەوە. بۆ سبەینێ، تاقیکردنەوەی زانکۆ بوو، یەکێک لە هاوڕێیانمان کە ساڵی پێشتر بۆ تاقیکردنەوە هاتبوو بۆ مەشهەد. منی لەگەڵ خۆیدا برد بۆ شەقامی زانکۆی مەشهەد، ئەوانەش کە دەیانویست لە بەشی زانستی وەربگیرێن

بردنی بۆلای کۆلێژی زانستی. پاشان منیشی برد بۆ لای کۆلێژی ئەدەبیات. هەندێک لە کورانی خەڵکی یەزد لەگەڵ گروپەکەی ئێمەدا نەبوون، ئەوانیش هاتبوون تاکو لە زانکۆ وەربگیرێن. ڕۆژی دوایی بەیانی زوو لە بەردەمی زانکۆی ئەدەبیاتی مەشهەد چوومە ڕیزی چوونە ژوورەوەی تاقیکردنەوە، ئەوە یەکەم جار بوو لە تەمەنمدا لەگەڵ کچاندا لە ڕیزدا بووەستم. وابزانم (٥٠٠) کەس هاتبوون تاکو لە بەشی جوگرافیادا وەربگیرێن. پرسیارەکانیان زۆر سادە بوون، لەکۆتاییدا من و حەسەن حوسنی و زیائی مەلیک زادە لە ساڵی (١٣٤٦-١٩٦٧) لەکۆلێژی جوگرافیای زانکۆی مەشهەد وەرگیراین. من دوایین کەس بووم کە وەرگیرام، ئەو ساڵە تەنها پەنجا کەس وەرگیران، من کەسی ژمارە پەنجا بووم. خۆ ئەگەر تەنها یەک نمرەم کەمتر بوایە ئەوا وەرنە دەگیرام، لە زمانی ئینگلیزیدا نمرەکەم زۆر نزم بوو، هەرئەوەش بوو منی وا دواخست. ئێمە کە لە زانکۆی مەشهەد وەرگیراین، پاشان لەگەڵ هاوڕێکانماندا چووین بۆ زانکۆی ئەسفەهان و تارانیش.

## دوو یادەوەریی لە ئەسفەهان

دوو یادەوەریی ئەسفەهان‌تان بۆ دەگێڕمەوە، کە بەدەرن لە یادەوەریی زانکۆ و خوێندن. وەک پێشتر باسم کرد، لە یەکێک لە ئوتێلەکانی ئەسفەهان‌دا سێ ژوورمان بەکرێ گرتبوو. ئوتێلەکە لەسەر شەقامێکی گەورەی شاری ئەسفەهان بوو، وابزانم ناوی شەقامی شاپوور بوو، ڕۆژێک نزیکی نیوەڕۆ بوو، خەریکی دروستکردنی خواردنی نیوەڕۆ بووین، گوێمان لە دەنگە دەنگێکی زۆر بوو لە دەرەوە. لە پەنجەرەکەوە سەیرمان کرد، بینیمان وا دوو کەس هەر یەکە و پاسکیلی خۆی بەدەستەوەیە و ڕووبەڕووی یەکتر وەستاون، بەیەکەوە شەڕە قسەیانە و جوێنیان بە یەکتری دەدا و بەسەر یەکتریدا دەیانەڕاند. هیچ قسەیەکی خراپیان بەیەکتری نەدەگوت، بەڵام هەردوکیان زۆر توڕە بوون. ماوەی دە خولەک ئێمە لە پەنجەرەکەوە سەیرمان دەکردن، بەڵام هیچ شتێکی خراپ ڕووینەدا، نە شەقێکیان لەیەکتری هەڵدا و نە بەیەکیاندا کێشا و لە یەکتریش دوور نەکەوتنەوە. ئێمەش پەنجەرەکەمان جێهێشت ڕۆشتین بەلای کاری خۆمانەوە. شەو خەریکی خوێندنەوە بووین دووبارە دەنگە دەنگی ئەو دوو کەسە پەیدابووەوە. ئەو هاوڕێیانەمان کە نانی ئێوارەیان ئامادەکردبوو بانگیان کردین و گوتیان وەرن خواردن ئامادەیە. ئەو دوو کەسەی دەرەوەش بەردەوام بوون لە دەنگەدەنگ و هاوار هاوار. نیوکاتژمێر زیاتر دەنگەدەنگەکەیان بەردەوام بوو، لەکۆتاییدا گوێم لێبوو. یەکێک لەو دوو شەڕکەرە هاواری دەکرد و دەیگوت. ئەی هاوار بۆ خاتری خودا بۆچی

لەم گەڕەک و شەقامەدا کەسێک ڕوحمی خودای لەدڵدانیە، بێتو نەهێڵێت شەڕ بکەین، لێکمان بکاتەوە و هەر کەسەمان بڕۆین بەلای کاری خۆمانەوە. هاواریدەکرد و دەیگوت خەڵکینە تکایە وەرن مەهێڵن شەڕ بکەین. هاوار و پاڕانەوەی ئەو پیاوە بەزمانی شیرینی ئەسفەهانی بەجۆرێک بوو ئێمەی ناچارکرد سەرمان لە پەنجەرەکەوە بکێشینەوە و خێرا بڕۆینە دەرەوە بۆ ناوبژی کردنیان. ڕۆیشتین و داوامان لێکردن لەیەکتری جیاببنەوە پێمانگوتن ئێمە چەند گەنجێکی خەڵکی شاری یەزین هاتووین بۆ تاقیکردنەوەی زانکۆ و خەریکی خۆئامادەکردنین تاکو لە زانکۆ وەربگیرێین، بەڵام بەدەنگەدەنگی ئێوە سەرمان لێشێواوە و ناتوانین بخوێنین. لە کۆتاییدا هەردووکیان سواری پاسکیلەکانیان بوون و ڕۆیشتن. ئەسفەهانیەکانی ئەوسەردەمە دەیانگوت (جوێن بدە، جوێنی گران. کراسێ بکڕە بەهەشت تومەن). ئەم پەندە مانای ئەوەیە تەنها بەدەم شەڕبکە، بەڵام شەڕێک مەکەن دەستتان بگاتە یەک. ئەمە خۆی لە خۆیدا نیشانەی ڕۆشنبیری و شارستانیەت و پاکی خەڵکی ئەسفەهانە. بەداخەوە هەندێک کەس لەم ژیری و ڕۆشنبیریە دوورن، لە سەر شتێکی زۆر ئاسایی پەلاماری یەکتری دەدەن و سەروگوێلاکی یەکتری دەشکێنن. ئەسفەهانیەکان کێشەکانیان بە وتوویژ و لەسەرخۆ چارەسەر دەکەن، بەڵام بەداخەوە هەندێک شوێنی تر هەیە کێشەکانیان بە کوتەک چارەسەر دەکەن. من زۆر لایەنگری ئەو ڕەفتارە جوانەی ئەسفەهانیەکانم. فەرهەنگی ئێران لانیکەم لە سەردەمی سەفەوییەکانەوە قەرزاری فەرهەنگی ئەسفەهانیەکانە. ئێمە (٢٥٠٠) ساڵە، بەتایبەتی لە سەردەمی سەفەوییەکانەوە زۆر شتی باش لە خەڵکی ئەسفەهانەوە فێربووین و دەبێت هەر لەوانیشەوە فێرببین. بەتایبەت هونەر، هۆنراوە، مۆسیقا، ئەدەب، شارستانیەت، پیشەسازی، ئابووریی و کەمخەرجیی، هەروەها خۆشەویستی خەڵک و خاک و وڵات. ئەسفەهان شارێکە زۆر شتی باشی بە ئێمە بەخشیووە. لە ئێراندا شارستانیەت لە شارەکانی ئەسفەهان، تەبریز، ڕەشت و شیراز لەپێش هەموو شارەکانی ترەوەیە. ئەم شارانە تەنانەت لە شاری تارانیش پێشکەوتووترن. بنچینەی شارستانیەت لەم شارانەدا، زۆر لەپێش تارانەوەیە. لەم شارانە و بەتایبەت ئەسفەهان دەکرێت زۆر شت فێرببین.. لەکۆتاییدا تاقیکردنەوەی زانکۆ تەواو بوو، دیارە چەند کەسێکمان بیرمان ئاسوودە بوو. کاتێک ئەنجامی تاقیکردنەوەکانی زانکۆکانی مەشهەد و تاران بڵاوکرایەوە چەند کەسێکمان لە مەشهەد و چەندکەسێکمان لە تاران وەرگیرابووین.

لە دوای تاقیکردنەوەکە بڕیارماندا دوانیوەڕۆی هەمان ڕۆژ بەناو شاردا بگەڕێین. مەیدانی نەخشی جیهان، مزگەوتی شێخ لوتفوڵڵا و بازاڕ گەڕایین. مەیدانی

نەخشی جیهان و مزگەوتی فەزای سەوز، نموونەیەکن لە بەهەشت لە ئێراندا. پارک و مزگەوتەکان نموونەی جوانییەکانی بەهەشتن. کچانیش نموونەی پەری بەهەشتن. ئەسفەهان هەموو ئەو توخمانەی لەخۆ گرتووە، هەر کاتێک سەردانی ئەسفەهان دەکەم وا هەست دەکەم دەچم بۆ بەهەشت. شەو چووین سەردانی سی و سێ پرد (سی و سە پول). ڕووباری زایندە ڕوود ئاوێکی کەمی پیادا دەهات، لەمبەر و ئەوبەری ڕووبارەکە و هەردوو لای پردەکە، قامیشەلانێکی زۆر چڕوپڕ بوو. ئاوی ڕووبارەکەش بەژێر پردەکەدا دەڕۆشت. چەند گڵۆپێک بەسەر پردەکەوە بەسترابوون و سەر پردەکەیان ڕووناک کردبووە. کەشوهەوای مانگی (شەهریوەر - ئاب) ی شاری ئەسفەهان کەشێکی دڵگیر و خۆش بوو. بۆ ئێمەی خەڵکی شاری یەزدی ڕووبار و ئاو نەدیتوو، ڕووباری زایندە وەکو دەریا وابوو بەلامانەوە. شەوێکی زۆر فێنک بوو، چاکەتەکانمان دانابوون. لەسەر ڕۆخی ڕووبارەکە و لە نزیک سی و سێ پردەوە سەکۆی کۆنکرێتی دروستکرابوون. ئەو سەکۆیانە بۆ هاتوچۆی گەشتیاران دروستکرابوون. ئەو کاتە هیچ هەواڵێک، لەو دیوارە جوانەی کە ساڵی (١٣٧٠-١٩٩١) لەسەر ڕۆخی ڕووبارەکە دروستکرا، لەگۆڕێدا نەبوو. لە سەر سەکۆ کۆنکرێتیەکانی کەنار ڕووبارەکە لانیکەم بیست منداڵی تەمەن (١٤-١٥) ساڵ و گەنجی (٢٠-٢٥) ساڵ، دانیشتبوون. سەرەتا وام هەستکرد کە ئەوە گروپێکی لاوانن و بۆ خۆشگوزەرانی هاتوون و سەر سەکۆکانیان قەرەباڵغ کردووە. هاوڕێکانیشم هەر وەکو من بیریان کردبووەوە. ئەو کوڕانە هەر یەکە و شتێکی بەدەستەوە بوو یان لە سەر زەوی شتێکیان ڕاخستبوو. شتەکە وەکو فەرش وابوو، هەندێکیان گونیەیان پێبوو. هەندێکیشیان بەتانیان پێبوو. ئێمە بە سەر پردەکەدا دەهاتین و دەچووین، سەیری ئەو ناوەمان دەکرد. یەکێک لە هاوڕێکانمان گوتی من واهەست دەکەم ئەم منداڵانە کاسبین، کە سەیرم دەکرد پیاوان دێن و یەکێک لەم منداڵانە هاڵدەبژێرن و چەند قسەیەک بەیەکەوە دەکەن و پاشان پیاو و منداڵەکە لە پردەکە دەچنە خوارەوە. پاش دە خولەک یان پازدە خولەک دەهاتنەوە. دیارە هەندێک کەس هەیە لەم جیهانەدا. چاوەڕوانی پەرییەکانی ئەودونیا ناکەن و شەقی حازری ئەمدونیا و ئاگری دۆزەخی ئەودونیا دەکڕن. هاوڕێ دڵسۆزەکانم دیارە لە شارەکەی خۆشماندا لەو جۆرە کەسانەمان بینی بوو. تەنانەت لە گەڕەکەکەی خۆشماندا سێ کەس هەبوون بە ناوەکانی (عەلی ڕەزا، ناسر، حەسەن).. ساڵی دوواتر لە مەشهەد بۆمدەرکەوت کە بەڵێ ڕەنگە لە هەموو شارەکانی وڵاتدا، ئەم جۆرە کاسبییە چ بەئاشکرا و چ بەنهێنی هەبێت. واتە بە هەمان شێوە، چۆن گەڕەک و شوێنی تایبەت هەبووە بۆ

ژنان؛ هەڵبەت بۆ کوڕانیش هەر هەبووە. لە تاران دەوروبەری پارکی شار، شوێنی وەستانی ئەم جۆرە کوڕانە بوو، بەتایبەت کاتی خۆرئاوابوون، ژمارەیان زیادی دەکرد و دەستیان بەکاری بەدڕەوشتی دەکرد. لە زۆر شوێنی تری تاراندا ئەو جێگایانە هەبوون. گوایە خەڵکانی ئەم جۆرە پیشەیە چایخانەی تایبەت بەخۆیان هەیە، بە هەمان شیوەی چایخانەی کرێکاران و شۆفێران. لە شاری مەشهەدیش ئەو کەسە خراپانە، شوێنی تایبەت بەخۆیان هەبوو. شەقامی ئەرگ و بەردەم پارکی میللی شوێنی ئەوان بوو. چەند پیاوێکیش لەو شوێنانە دەلالیان بۆ ژنان و کوڕان دەکرد. ئەوکارە نەخوازراو و قەدەغەکراوە هەر لەپێش نەتەوەی لوتەوە هەبووە. ئێستاش بەردەوامی هەیە، بەگشتی هیچ شارێک نەبووە ئەم جۆرە دیاردەیەی تێدا نەبێت. لە هەندێک لە شارەکانی باشوور و دەوروبەری کەنداوی فارس، کوڕانیان بۆ ئەم جۆرەکارانە پەروەردە دەکرد. تەنانەت هەندێک جار زەماوەندی نێوان کوڕان و پیاوان بەئاشکرا دەکرا. ویلیام فولور کتێبێکی لەو بارەیەوە بە چاپگەیاندووە. گەشتنامەی شارۆنیش باسی ئەو دیاردەیە دەکات لە سەردەمی سەفەوییەکاندا. باس لەوەش دەکرێت یەکێک لە هۆکارەکانی نەخۆشکەوتنی مزەفەرەدینی شای قاجاریش، هەر بەو هۆکارەوە بووە. دیارە ئەم کارە ناپەسندە بەدرێژایی مێژوو برەوی هەبووە، ئەگەر ڕێگە چارەیەکیش هەبێت، من نایزانم تەنها ئەوە دەزانم کە ڕێگە چارە لێدان و کوشتن نییە. هەندێک لەوانە کێشەی لەشیان هەیە، هەندێکیشیان نەخۆشی دەروونییان هەیە. هەندێکیشیان کێشەی ناڕۆشنبیری و هەندێکیش کێشەی ئابوورییان هەیە. هەندێک لەو کەسانە لە سەردەمێکدا چایخانە و شوێنی تایبەتیان هەبووە. لە سەردەمێکیشدا بڵاوەیان پێکراوە و لە سەردەمێکیشدا بە ئاشکرا و بەنهێنی و نیوە نهێنی کاری خۆیان ئەنجام داوە. سەردەمانێک حکومەتەکان چاوپۆشییان لەو جۆرەکەسانە کردووە سەردەمانێکیش لێپێچینەوەی تەواویان لەگەڵدا کراوە. سەردەمانێک هانیانداون و جێگەیان بۆ دابینکردون و سەروەختێکیش لە سێدارەیان داون، بەڵام هەمیشە هەبووە و دەبێت. بەهەرحاڵ، ئەم یادەوەرییەش لە مێشکی مندا هەرماوە، ئێستاش هەر کاتێک دەچم بۆ ئەسفەهان سوپاسی خودا دەکەم کە ئەم کارە لە دەوروبەری سیوسێ پول نییە، بەڵام لەکوێ هەیە؟ من نازانم، پۆلیس، دادگا، ڕۆژنامەنووسەکان لە من باشتر دەزانن لەکوێ هەیە؟

## یەکەم ماڵ لە مەشهەد

لە کۆتایی مانگی (شەهریوەری ١٣٤٦- ئەیلولی ١٩٦٧) دا، ئەو کەسانەمان کە لە زانکۆی مەشهەد وەرگیراین و یەکترمان دەناسی، بەرەو مەشهەد بەڕێکەوتین. بۆ دابینکردنی خەرجییش بەشە (شیر) یکمان هەبوو لە کارگەی ئیقباڵ کە بەمیراتی لە باوکمەوە بۆم مابووەوە، ناچار فرۆشتم بە سەید ئەبوقاسمی ڕوهەنی و پارەکەیم دا بەکوڕە مامەکەم، تا هەر مانگە و کەمێک لەو بڕە پارەیەم بۆ بنێرێت. چەند ڕۆژێک پێشئەوەی بەڕێبکەوم بۆ مەشهەد، یەکێک لە ئاشناکانمان کە خەڵکی یەزدە و ماڵی لە مەشهەد بوو، بەناوی حاجی زراع، لە گەراجی یەزد چاوم پێیکەوت، ئەو لە شاری مەشهەد لە پێنج ڕای ئەبو موسلیم، حەمامی هەبوو، بەناوی حەمامی ئەڵماسی. پیاوێکی باش بوو، کاتێک زانی من لە زانکۆی مەشهەد وەرگیراوم، گوتی من لە ماڵی خۆمان ژووری بەتاڵم هەیە، تۆش وەرە بۆ ماڵی ئێمە. من بەو قسەیە زۆر خۆشحاڵبووم، ژمارە تەلەفۆنی ماڵی خۆیان و حەمامەکەی پێدام. هەر کە گەیشتمە مەشهەد لە گەراجەوە تەلەفۆنم بۆ حاجی کرد و بەرەو ماڵی ئەوان بەڕێکەوتم. ماڵی حاجی زراع لە یەکێک لەکۆڵانەکانی پێنج ڕای ئەبو موسلیم بوو. لە ماڵی ئەوانەوە تاکو کۆلێژی ئەدەبیات، بەپێ تەنها پێنج خولەک بوو. ماڵی حاجی زراع حەوشێکی گەورەیان هەبوو، حەوزێکی بچووکیش لە ناوەڕاستی حەوشەکەدا بوو، خاوەن ماڵ لە لایەکەوە دادەنیشت و لە لاکەی تری حەوشەکەوە دوو ژوور هەبوون، من لە یەکێک لەو ژوورانـەدا دەژیام. ژوورەکە فەرشی تیا ڕاخرابوو، سیسەمێکی نووستنیشی تێدابوو. خۆیشم چووم لە بازاڕ هەندێک پێویستی وەکو فانۆس و تەباخی نەوتی و چەند قاپ و کاسە و کەوچک و قابلەمەم کڕی. حاجی ژن و منداڵەکانی زۆر میهرەبان بوون، ئافرەتێکی تاڕادەیەک گەنجیش لەوێ بوو، ئەویش خەڵکی یەزد بوو، لە حەمامەکە کاری دەکرد، ئەویش کەسێکی زۆر میهرەبان بوو، جارجار خواردنی بۆ دروستدەکردم، هەرچەندە لەحانوتی زانکۆ خواردنی باش هەبوو، بەڵام من زۆرتر لە ماڵەوە خۆم خواردنم دروست دەکرد. لە سەر پێنج ڕای ئەبوموسلیم، لە قەسابێک (١٥٠) گرام گۆشتم دەکڕی و هەروەها تەماتە و هێلکە و شیر و میوە و نانم دەکڕی و دەگەڕامەوە بۆ ماڵەکەم، ئەو کاتە شیری ناو پاکەت نەبوو شیری نێو پاکەت خۆی نیشانەی مۆدێرنێتەیە. حاجییەک دوو دەبەی پڕدەکرد لە شیر و بە ئەملاولای پاسکیلەکەیدا هەڵیدەواسین و بەناو کۆڵان و جادەکاندا دەگەڕا و هۆڕنی لێدەدا، هۆڕنەکەی تایبەت بوو، هەموو کەس دەیانزانی ئەو دەنگە تایبەتە بە حاجی شیرفرۆش، من جار جار شیرم لەو دەکڕی. ئەم حاجیە تا ساڵی

(١٣٦٥-١٩٨٦) بەردەوام بوو لەکارەکەی، پاشان پیر بوو وازی لە شیر فرۆشتن هێنا، بە وازهێنانی ئەو دابەشکردنی شیریش لەکۆڵانەکاندا کۆتایی هات. ژوورەکەم یەک گڵۆپی تێدابوو، مانگی یەکەم تێکڕای خەرجیم نووسی لە کڕینی کەلوپەل و هاتوچۆ و چوونە حەمام، تێکڕای خەرجیی ئەو مانگەم کردیە (٩٦٢) ڕیاڵ. چەند جارێکماڵی حاجی زراع بۆ نانخواردن بانگهێشتیان کردم، جارێکیش لەو خانووەدا نەخۆشکەوتم و تووشی ئەنفلۆنزا بووم. هاوسەری حاجی زراع و ئەو خانمە یەزیدییەی کە لە لایان بوو، زۆریان هاوکاری کردم. نازانم چۆن بوو بیرم لەوە نەکردبووەوە کە کرێی خانووەکەم بدەم؟ وابیرم کردبووەوە کاتێک حاجی زراع پێیگوتبووم کە ژوورێکی بەتاڵیان هەیە، واتە ئەو ژوورە بەبێ کرێ و بەلاشە. چەند گەنجێکی خەڵکی یەزد بە شوێن خانوودا دەگەڕان و دەیانویست هەموویان بەیەکەوە ژوورێک بەکرێ بگرن و بەیەکەوەبن. ئەو کات زانکۆی مەشهەد بەشێکی ناوخۆیی زۆر بچووکی هەبوو کە تەنها جێگای بیستوپێنج کەس دەبوو، ئەویش لە نزیک فولکەی سەراب بوو. لە کۆتایی هەمان ساڵدا شاهنشا خۆی سەردانی زانکۆی مەشهەدی کرد و یەکێک لە کارەکانی کردنەوەی بەشی ناوخۆیی (پەردیس) بوو. خەڵکانی دەوروبەری زانکۆ ژووریان نەدەدا بەخوێندکاران. کە دەچووینە لای نووسینگەی کڕین و بەکرێدانی خانوو، دەیانگوت خاوەن خانووەکان خانووەکانیان نادەن بەکوڕانی سەڵت. من زۆر خۆشحاڵ بووم کە ژوورێکی بەلاش و خاوەن ماڵێکی باشم هەبوو. سێ مانگ بوو لەو خانووەدا بووم. سەرەتای مانگی دوازدە بوو هەوای مەشهەد ساردبوو، ڕۆژێکی هەتاو بوو، ویستم لەلای حەوزی نێوحەوشەکەوە قاپەکانم بشۆم، نەوەیەکی حاجی زراع کە تەمەنی (٦-٧) ساڵ دەبوو، هاتە لامـەوە و گوتی حسێن ئاغا بۆچی شەوانە تا درەنـگ گڵۆپەکە ناکوژێنیتەوە؟ ئەو منداڵە ڕاستی گوت من تا کاتژمێر دوازدە ی شەو بەخەبەر دەبووم و خەریکی خوێندن دەبووم، گوتم من شەوانە خەریکی خوێندنم. ساڵی (١٣٤٦-١٩٦٧) لە مەشهەد تەلەفزیۆن نەبوو، واتا کەناڵی تەلەفزیۆن بۆ شاری مەشهەد نەهاتبوو. کاتێک تەلەفزیۆن نەبێت خەڵکیش شەوانە زوو دەخـەون. حاجی زراع و هاوسـەرەکـەی و ئەو خانمە یەزیدییەی کە لەماڵیان بوو، شەوانە زوو دەنووستن و بەیانیان زوو پێش مەلا بانگدان هەڵدەسان و دەچوون بۆ حەمام، حاجی بۆ خۆی لەسەر حەمامی پیاوان بوو، ژنەکەشی لەسەر حەمامی ژنان بوو. منداڵەکە گوتی ئەی بۆچی کرێی ژوورەکە نادەیت؟ کەوای گوت بەرچاوم تاریک داهات و لە دڵی خۆمدا گوتم بەندەی خودا بیر لە چی دەکەیتەوە. بۆچی بەزوویی کرێی خانووەکەت نادەیت؟ ئاخر من لە هەموو تەمەنمدا واتە تا ئەو

کاتە کە تەمەنم هەژدە ساڵ بوو، کارم بە بەلاش و بێ پارە بۆ خەڵکی ئەنجامدا بوو، وا بیرم کردبووەوە لە بەرنامەی حاجی زراع دا نییە کرێی خانوو لە من وەربگرێت. بە منداڵەکەم گوت ئەمڕۆ کرێکەتان پێدەدەم. هاوڕێکانم عەلی شوکرانە لە بەشی مێژوو، ئەمین هەزینەیی لە بەشی ماتماتیک، حسێن حازمی لە بەشی پزیشکی، ئەمیری دیبانی لە بەشی ئەدەب، لەکۆلانی دکتۆر شێخ خانوویەکیان بە کرێ گرتبوو. هەمان ڕۆژ قسەم لەگەڵ ئەواندا کرد تا منیش بچم بۆ خانووەکەی ئەوان و لەگەڵ ئەواندابم. گەڕامەوە بۆ لای حاجی زراعی و کرێی سێ مانگم پێدا. بۆ هەر مانگێک سی تمەن، بە هەمووی نەوەد تمەنم پێدا، پاشان هەموو خەرجیی مانگی یەکەمم کردییە (١٢٦٢) ڕیال مانگی دووەم و سێیەمیش هەر بەو شێوەیە بوو، یا پازدە ڕیاڵ زیاتر یا کەمتربوو. کەلوپەلەکانم کۆکردنەوە و ڕۆیشتم بۆ لای هاوڕێکانم، لەوێ خانووەکە سەربەخۆ بوو، خانووی ماڵی دکتۆر مودەریسی بوو، خۆی ڕۆیشتبوو بۆ دەرەوەی وڵات، خانووەکە چوار ژوور و چێشتخانەیەک بوو، بەڵام حەمامی تێدا نەبوو، لە حەوشەکەدا چەند درەختێکی گەورەی تێدا بوو، یەکێک لەو درەختانە دار گێلاسێکی گەورە بوو، بەگشتی مانگانە (٢٤٠) تمەنمان دەدا بەکرێی خانووە کە، هەریەکەمان مانگانە چلوهەشت تومەن کرێمان بەردەکەوت. نێوانی ئەم خانووە تا زانکۆ لە خانووەکەی تر دوورتر بوو. ئەگەر بمەوێت یادەوەریی ئەم خانووە بنووسمەوە پێویستی بەیەک کتێبی گەورە هەیە، هەر چەندە دوورنییە ڕۆژێک بێت ئەو یادەوەرییە بنووسمەوە بەناوی یادەوەریی شازادەی حەمام لە بەشی ناوخۆیی خوێنکاراندا.

## ڕەوشی مەشهەد لە ساڵی (١٣٤٦–١٩٦٧) دا

لەو سەردەمەدا، زانکۆی ئەدەبیاتی مەشهەد کەوتبووە خۆرئاوای شاری مەشهەد. لە ساڵی (١٣٩١-٢٠١٢) زیاتر لە هەژدە کیلۆمەتر لە خۆرئاوای زانکۆوە ببووە شار. دووریی نێوان زانکۆ و باخەکانی شەفاتلوو سەعدئاباد زۆر نەبوو، لە پێنجسەد مەتر لەولا زانکۆوە، هەموو ڕەزی ترێ بوو. لە ساڵی (١٣٤٦-١٩٦٧) دا، هێشتا سێ کەس لە خوێندکاران بەسواری ئەسپ دەهاتن بۆ زانکۆ و ئەسپەکانیان بەمیلە ئاسنینەکانی زانکۆوە دەبەستەوە، خۆشیان دەچوونە ناو زانکۆ. هەندێک خوێندکاریش بە سواری عەرەبانەی ئەسپ دەهاتن. ژمارەیەکی زۆریشیان بەسواری پاسکیل دەهاتن. عەلی شوکرانە کە مامۆستایەکی بەڕێز بوو لە یەکێک لەقوتابخانەکان، هەمیشە بەسواری پاسکیل دەهات بۆ زانکۆ، چونکە قوتابخانەکەی لە زانکۆوە دوور بوو. منیش هەر بە

پاسکیل هاتوچۆم دەکرد. ئەو کات نرخی تاکسی لە نێو شاردا بۆ یەک کەس پێنج ڕیاڵ و بۆ سێ کەس دە ڕیاڵ بوو. نرخی تاکسی لە سەر جامی پێشەوەی تاکسییەکان دەنووسرا. ئەو سەردەمە زۆربەی نانەواکان داریان بەکار دەهێنا. دوکانەکان سەلاجەیان نەبوو، هەندێک لەدوکانەکان تازە خەریکبوو دەبوونە خاوەنی سەلاجە. عەرەبانەی ئەسپی لەناو شاردا زۆر بوو. بەشی زۆری شەقامەکان بەپانی (٦-٨) مەتر خۆڵ بوون. گەڕەکی ئەحمەدئاوای مەشهەد کە جوانترین گەڕەکی دەیەی (١٣٦٠-١٩٨١) بوو، ئەو کاتە هێشتا گوندێک بوو. بەشێکی خەڵکی ئەم گوندە خەریکی کاری جوتیاری بوون. ئوتێل هایت (هومای) مەشهەد لە ناوەڕاستی ماڵەکانی ئەم گوندەدا دروستکرا. سەربانی زۆربەی ماڵەکانی مەشهەد بەدارە ڕابوون و پوشیان خستبووە سەر. هەر وەک خانووەکانی شێروان وا بوون. گەورەترین کۆشکی شار چوارقات بوو. تەنها یەک کۆشکی چوارقاتیش هەبوو، ئەگەر کەسێک تاکسی بگرتایە، بە شوفێرەکەیان دەگوت خانووە چوار قاتەکە دەزانیت. ئێستاش پاش چلوپێنج ساڵ کاتێک بە شۆفێری تاکسی بڵێیت بمگەیەنە لای خانووە چوار قاتەکە یەک ڕاست دەتبات بۆ ئەو شوێنە کە ئێستا شەقامی مودەریسە. لە بەشێکی زۆری شاردا ژنان ڕووپۆشی ئیسلامیان دەپۆشی، بەڵام لە بەشی خۆرئاوای شاردا ژنان بێ ڕووپۆش بوون. لە شەقامی ئەرگ و شەقامی تازە دروستکراوی ئەحمەدئاوا و فولکەی تەقئاباد و دەوروبەری زانکۆ، ژنانی بێ ڕووپۆش زۆر بوون. دیارە ژمارەی دانیشتوانی شار لەو ساڵەدا نزیکەی (٤٠٠) هەزار کەس دەبوو. لە ساڵی (١٣٤٦-١٩٦٧) دا، هێشتا لە شاری مەشهەد دا دوکانی پیتزا فرۆشی نەبوو، واتە لەو ساڵەدا لە هەموو، وڵاتی ئێراندا دوکانی پیتزا فرۆشتن نەبوو. پیتزا نەهاتبووە ئێرانەوە. یا ئەگەر لە تاران هەبووبێت من نەمدیبوو. من و هاوڕێکانم، تا ساڵی (١٣٥٥-١٩٧٦) ناوی پیتزامان نەبیستبوو. میوەی مۆز تازە خەریکبوو دەکەوتە بازاڕەکانی ئێرانەوە. من بۆ یەکەم جار، پاییزی (١٣٤٦-١٩٦٧) لە دەوروبەری فولکەی نەخۆشخانەی ئیمام ڕەزا مۆزم بینی، کە میوە فرۆشێک لەسەر عەرەبانە مۆزی دەفرۆشت چەند کەسێک لە هاوڕێکانم لەگەڵمدا بوون، ئێمە هیچ کاممان مۆزمان نەبینی بوو، نەشمان خواردبوو. یەکێک لە هاوڕێکانمان گوتی با من مۆزێک بکرم، بزانین تامی چۆنە. ئەو مۆزەکەی کڕی، بەڵام کەسمان نەماندەزانی چۆن چۆنی توێکڵەکەی لێبکەینەوە چەقۆشمان پێنەبوو. ئاویش نەبوو تاکو بیشۆینەوە. هاوڕێکەمان وەکو خەیار بەدەست مۆزەکەی سڕیەوە و ویستی هەروا بە توێکڵەوە بیخوات، میوە فرۆشەکە چاوی لێبوو کە خەریکە بەتوێکڵەوە دەیخۆین. ئینجا پێیگوتین کە چۆن

تویکڵەکەی لێدەکرێتەوە، هەر یەکە و کەمێک لە مۆزەکەمان لێکردەوە و خستمانە دەممانەوە، مۆزەکە کاڵ و ناخۆش بوو، دەممانی تفت کرد، زۆر بەلامانەوە ناخۆش بوو. پاشان چەندین ساڵی پێ چوو تاکو بووین بە مۆزخۆر.

کۆمپانیا گەورەکانی ئەمریکا بۆ بەرهەمهێنانی مۆز هەوڵیان دەدا لەپێناو بەرژەوەندی خۆیاندا مۆز بخەنە نێو بازاڕەکانی ئێرانەوە، بۆیە دەبوو لە سەرەتادا فەرهەنگی مۆزخواردن پیادە بکەن. بۆ ئەو کارەش چ شوێنێک لە قوتابخانەکان باشترە؟ چ کەسێک لە منداڵ باشترە تا فێری مۆزخواردنی بکەیت؟ بۆیە هاتن لە خوێندنگەکاندا مۆزیان دابەشدەکرد بەسەر منداڵاندا. ئەوانیش حەزیان دەچووە سەر مۆز و بە خواردنی لە برسێتی ڕزگاریان دەبوو، بە پیادەکردنی ئەو بەرنامەیە ئێمە هەموومان بووین بەمۆزخۆر. ئەوان دەیانویست بێنە ناو وڵاتەوە و هەر کارێک بیانەوێت بیکەن و وەکو دەرزی (شرینقە) لە میللەت بدەن، سەرەتاش دەبوو حکومەتیان ڕازی بکردایە.

ماوەی دوو مانگ دەبوو لە مەشهەد بووین (١٤-١٥) کەس بووین، ڕۆیشتین بۆ زیارەتی ئیمام ڕەزا، پاشان ڕۆیشتین بۆ سینەما، سینەماکە لە ئەرگ بوو، ئێستا ناوی ئەو سینەمایەم بیر نەماوە، نازانم ناوی کریستاڵ بوو یا ناوێکی تری هەبوو. هاوڕێیەکمان ناوی حسێن بوو، چوو بۆ توالێت، توالێتەکە لەژێر زەمینەکەدا بوو، پاش ماوەیەک بەشڵەژانێکەوە هاتەوە و گوتی فریاکەون بۆری ئاوی توالێتەکەم شکاندووە. ڕووداوەکە ئەوە بوو کە سەتڵی ئاوی تەوالێتەکە لەپشت سەرییەوە بوو، کاتێک دەستی نابوو بەدوگمەی سەتڵەکەدا ئاو بەخوڕ هاتبووە خوارەوە بۆ نێو سیفۆنەکە. حسێن وای هەستکردبوو کە بۆریی ئاوەکەی شکاندووە، چەند کەسێکمان بەپەلە بە پلیکانەکاندا چووینە خوارەوە تاکو تەگبیرێک بۆ بۆرییە شکاوەکە بکەین. کە چووینە خوارەوە و سەیرمان کرد، حسێن گوتی ئاوەکە وەستاوەتەوە و ئاوی لێ نایەت، منیش دەرگای توالێتەکەم کردەوە و سەیرم کرد ئاوی پیانایەت، ئینجا حسێن پێیگوتم بە پەنجە فشار بخەمە سەردوگمەکە، منیش وامکرد، لە ناکاو ئاوێکی زۆر هاژەی کرد و هاتە خوارەوە بۆ ناو سیفۆنەکە. پاشان چەند جارێک تاقیمان کردەوە و پەنجەمان خستە سەر دوگمەکە بەهەمان شێوە ئاو دەهاتە خوارەوە. دووایی بۆمان دەرکەوت کە ئەو دوگمەیە هی سیفۆنی توالێتەکەیە. دیارە ئێمە ئەو چەند کەسە هەرگیز سیفۆنی توالێتمان بەوشێوەیە نەبینی بوو، ئەوە یەکەمجارمان بوو بیبینین. من ئێستا ئەگەر بچم بۆ هەر وڵاتێک سەرەتا بەدوای خۆراک و میوەیەکدا دەگەڕێم کە نەمخواردبێت، ئەوەشم هەرگیز لەیاد ناچێتەوە، کاتێک لە باشووری فەڕەنسا بووم لە کێوی (مەشرەف) بەلای دەریای

ناوەڕاستەوە دەستم درێژکرد تاکو کەمێک میوەی (کاکتۆس) لێبکەمەوە، بەجۆرێک دەستم سووتایەوە کە ئێستاش پاش چەندین ساڵ هەست بەو سووتانەوەیە دەکەم. نەمدەزانی میوەی (کاکتوس) بەم دڕکە تیژ و بە ئازارە داپۆشراوە. بۆیە تۆش ئاگاداربە هەرگیز دەست نەبەیت بۆ میوەی (کاکتۆس).

لەو ساڵانەدا ژمارەیەک کەبابخانە هەبوون کەدەکەوتنە نزیک مەرقەدی ئیمام ڕەزا و ئەرگ، چەند ڕیستۆرانتێکیش لە فولکەی کۆکاکۆلا هەبوون کە خواردن و خواردنەویان پێشکەش دەکرد. هەروەها کوهسەنگی و وەکیل ئابادیش مەکۆی مەی خۆرەکانی مەشهەد بوون. لە ناوشاریشدا چەند دوکانێکی مەی فرۆشتن هەبوون، بەڵام شوێنی خواردنەوەیان نەبوو. لە دووری (٢٠٠) مەتر لە زانکۆوە شوێنی وەستانی ئەسپ و عەرەبانە بوو. لە ساڵی (١٣٤٦-١٩٦٧) زۆر بەکەمی لە ماڵەکانی مەشهەددا موبەریدە هەبوو، ماڵەکان زیاتر پانکەیان بەکاردەهێنا، لەو ساڵانەدا لە مەشهەد کەمترین ماڵ سوودیان لە شۆفاژی (زەیتی) وەردەگرت بۆ گەرمکردنی ناوماڵەکانیان، لە زۆربەی زۆری فەرمانگەکاندا، سۆپای نەوتی بەکاردەهات کە دڵۆپ دڵۆپ نەوتی پیادا دەهاتە خوارەوە، بنکەی پۆلیسی سەعدئاباد سۆپای دار و نەوتی هەبوو. تەلەفۆنی شار ئەو کاتە چوار ژمارەیی بوو. بەپێی ئاماری ساڵی (١٣٤٦-١٩٦٧)کەمتر لەسەدا دەی ماڵەکانی شار تەلەفۆنیان هەبوو. ئەو ساڵە هێشتا تەلەفزیۆن نەهاتبوو بۆ شار هەر بۆیەش هیچ کەسێک تەلەفزیۆنی نەبوو. ژمارەی دەرمانخانەکانی شار نەدەگەیشتنە دە دەرمانخانە. هەر بەپێی ئەو ئامارە، لە سەدا نەوەدو هەشتی ماڵەکان حەمامیان نەبوو، خەڵکی بەگشتی سوودیان لەحەمامی دەرەوە دەبینی. جادەکانی دەوروبەری شار هەمووی خۆڵ بوون. پۆلیس عەرەبانە ئەسپییەکانی ژمارە دەکرد. تازە خەریکبوو ئۆتۆمبێل زیادیدەکرد، بەڵام هێشتا عەرەبانە ئەوەندە هەبوون کە دەبوو ژمارە بەندییان بۆ بکرایە. گەنجەکان وا هەستدەکەن ئەم شتانەی من باسیان دەکەم هی سەد ساڵ یا هەزارساڵ پێش ئێستا بێت. ئەمانەی من باسیان دەکەم دەگەڕێنەوە بۆ ساڵی (١٣٤٦-١٩٦٧). ئێستا کە من خەریکی نووسینی ئەم بابەتەم ڕۆژی (٤ ئابانی ١٣٩١=٢٦-١٠-٢٠١٢) بەڕاستی وشەی «چواری ئابان» یادەوەرییەکی زۆری بەبیری مندا هێنایەوە. چواری ئابان ڕۆژی لەدایکبوونی محەمەد ڕەزا شای ئێرانە، هەموو ساڵێک لە چواری ئاباندا پشوو بوو، ڕۆژێکی تایبەت بوو بە حکومەتی ئێرانی، بەڵام خەڵکەکە هیچ ڕۆڵێکی لەم جەژنەدا نەدەگێڕا. لەو ڕۆژەدا هەندێک لە شەقامەکان دەگیران. شاری مەشهەد بۆخۆی ببوو بە خاوەنی پارکێکی گەورە بەناوی (پارکی میللەت) شەقامەکانیشی قیرتاو

کراوبوون. خەریکی دروستکردنی نەخۆشخانەیەکی گەورە بوون بەناوی نەخۆشخانەی قائیم. ئاوی بۆری بۆ گەڕەکەکان بەرەو زیادبوون دەڕۆیشت. دوکاندارەکان تابلۆیان بۆ دوکانەکانیان دادەنا. لەو ساڵانەدا لە گوندەکاندا هێشتا خەڵکی بێ پێڵاو و پێپەتی زۆر بوون، بەڵام لە ناو شاردا خەڵکی پێپەتی نەدەبینران. جلی پینەکراو لەبەری خەڵکیدا کەم ببوو. هێشتا لە گەڕەکەکاندا لە سەر عەرەبانەی دەستی چێشتیان دروستدەکرد دەیانفرۆشت. پارە کەمێک پەیدا ببوو، لە دەستی خەڵکدا ئاڵوگۆڕی پێدەکرا. بانک زۆر کەم هەبوو، بانکەکان تازە خەریکبوون حسابیان بۆ خەڵکی دەکردەوە. شێوازی خواردن گۆڕانکاری تیادەکرا، پروپاگەندە بۆ ڕۆنی گیایی دەکرا. چونکە هیچ کەسێک ڕۆنی گیای نەدەخوارد. جۆرەها دیاریی، وەکو ئاڵتوون و دەستە کەوچک و دەستە چەتاڵیان دەخستە نێو قوتووە ڕۆنەکانەوە، تاکو خەڵکی هانبدەن ئەو ڕۆنە بکڕن. یەک قوتوو ڕۆنی گیایی کەکێشەکەی (٤/٥) کیلۆ بوو تەنها بە چل ڕیاڵ بوو واتە چوار تومەن. تایت تازە خەریکبوو لە بازاڕدا زیادی دەکرد، ئەویش بەکارهێنان و کڕینی زیاتر بەهۆی ئەو دیارییەوە بووکە دەیانخستە نێو پاکەتە تایتەکەوە، هێشتا جلشۆر نەبوو.

(تەرگۆڕ و شاندیز) کە دوو گوند بوون لە نزیک مەشهەد. لە هەموو گوندی شاندیزدا یەک چێشتخانە نەبوو. لە تەرگۆڕ و گوندەکانی دەوروبەریش سێ دوکانی گۆشتی کولاو و کەبابخانە هەبوون، بەڵام ئێستا (١٣٩١-٢٠١٢) لە شاندیز و تەرگۆڕ و پیراموون زیاتر لە (٣٥٠) ڕیستورانتی گەورە و بچووک هەیە. لە هەموو شاری مەشهەددا پێنج دەزگای فۆتۆکۆپی هەبوون، کە ئەویش دەوڵەتی بوون، لە دامودەزگاکاندا. لە زانکۆشدا دەستگای پولی کۆپی هەبووکە ئەویش دەزگایەک بوو بە ستێنسڵ کاری دەکرد. ڕەنگە نەوەی نوێ بپرسێت ستێنسڵ چیە؟ زۆر باشە گەر حەز دەکەیت بیزانیت خۆت بەدوادا چوونی بۆ بکە با بیزانیت. لەناو شاری مەشهەددا چەندین چایخانە هەبوون لەسەر شێوازی کۆن، لە نزیک مەیدانی دەروازەی قوچان، سەرەتای شەقامی کاشانی ئێستا، چایخانەیەک هەبوو کە شوێنی کرێکارانی دەردانی بیری توالێت بوو. ئەو کرێکارانە زیاتر لەو چایخانەیە دادەنیشتن. کاتێک کرێچی ئاغای مودەریسی بووین کێشەیەکمان بۆ دروستبوو بەزوویی چووین بۆ ئەو چایخانەیە و لەوێ چەند کرێکارێک لەگەڵماندا هاتن و کێشەکەیان بۆ چارەسەر کردین. لەلای مەیدانی نەخۆشخانەی ئیمام ڕەزاش چایخانەیەک هەبوو کە شوێنی شۆفێری تاکسیەکان بوو، ئەگەر کەسێک بەدوای شۆفێری تاکسییەکاندا بگەڕایە دەچوو لەوێ دەیدۆزییەوە. لە شەقامی گەراجەکاندا چەند چایخانەیەک هەبوون. یەکێکیان تایبەت بوو بە شۆفێرانی ئۆتۆمبێلی گەورە و

بارهەڵگر. یەکێکی تر تایبەت بوو بە شۆفێری پاسەکان. من خۆم چەندین جار سەردانی ئەو چایخانانەیەم کردووە، هەر لەو ناوە چایخانەیەکیش هەبوو تایبەت بوو بە بەناکان، لە مەیدانی سێ‌هەمی ئەسفەهانیش چایخانەیەک هەبوو تایبەت بوو بە پیاوە بەتەمەن و ناسراوەکانی شار.

## ڕەوشی کۆلێژ

لە ساڵی (١٣٤٦-١٩٦٧) دا ئێمە چووینە کۆلێژ، لەو ساڵەدا گۆڕانکاری گەورە بە ڕێگاوە بوو. لە ساڵانی (١٣٤٥-١٣٤٦=١٩٦٦-١٩٦٧) ژمارەیەک لە ماموستایانی شایستە کە نموونەی ڕەوشتبەرزی بوون، دووایین ساڵی خزمەتیان بەڕێکرد. پیاوانی زانستخوازی وەک دکتۆر ئەحمەد عەلی ڕەجائی، دکتۆر لوتفوڵڵای مەفخەم پایان، دکتۆر ڕەحیمی عەفیفی، دکتۆر حەسەن عەلی مویەدی، ماموستا نەوید. جگە لە ئەوانیش چەند ماموستایەکی تر هەبوون کە چەند ساڵێک پێشەنگ بوون لە ناو زانکۆدا، ئەوانیش بریتی بوون لە دکتۆر غولام حسێنی یوسفی، دکتۆر جەوادی حەدیدی، ئەمانیش بەوپەڕی دڵسۆزییەوە کارەکانی خۆیان ئەنجام دەدا. دکتۆر جەلالی مەتینی کەسێکی تایبەت بوو، ئەو زیاتر گرنگی بە کارە لاوەکیەکانی خۆی دەدا تاکو کارە زانستییەکانی. لە بەرگی چوارەمی بیرەوەرییەکانمدا لە بارەی دکتۆر جەلالی مەتینیەوە لانیکەم سێ لاپەڕەم نووسیووە. ئەگەر بتەوێت یەکێک لە هۆکارەکانی دروستبوونی شۆڕشی ئیسلامی ئێران بزانیت. پێویستە کار و کردەوەکانی کەسانی وەکو دکتۆر جەلالی مەتینی جوان هەست پێبکەیت و هەڵوێستەی لە سەربکەیت. هەندیک جار ئەگەر کەسێک یەک دۆستی هەبێت پێویستی بە سەد دوژمن نییە. ڕژێمی پەهلەوی بە چەند سەد کەسێکی وەکو دکتۆر جەلالی مەتینی پێویستی بە دە ملیۆن دووژمن نەبوو. هەر بەهەمان شێوەی دکتۆر ئەحمەدی نەژاد، بە دۆستێکی وەکو ڕۆژنامەی ئێران پێویستی بە پێنج ملیۆن دووژمن نییە. ئەو دۆستانەی لە ڕۆژنامەی ئێران ئەوەندەی پێنج ملیۆن دوژمن کاریان بۆ کردووە.

لە ساڵی (١٣٤٥-١٩٦٦) ژمارەیەک خوێندکاری گەنج لە وڵاتی فەڕەنسا خوێندنیان تەواو کرد بوو، گەڕابوونەوە و وەک ماموستا لە زانکۆی مەشهەد دامەزران. لە ماوەی دوو، سێ ساڵدا چەند کەسێکی تر لە وڵاتی بریتانیا خوێندنیان تەواو کرد و گەڕانەوە بۆ وڵات و لە زانکۆ دامەزران، بەو شێوەیە نەوەی نوێ دەهاتنە زانکۆ تاکو نەوەی کۆن خانە نشین بکرێن. ئەوانەی لە فەڕەنساوە گەڕابوونەوە کلتوری ئازادی و تێکۆشانیان

لەگەڵ خۆیاندا هێنا بووەوە، ئەوانەشی لە بریتانیا و ئەمریکاوە دەگەڕانەوە جۆرە کلتورێکی تریان لەگەڵ خۆیاندا دەهێنایەوە. پێش ساڵی (١٣٤٥-١٩٦٦) خوێندن لە زانکۆی مەشهەد بە زمانی فەرەنسی بوو. لەو ساڵە بەدواوە خوێندنی ئینگلیزیش لەو زانکۆیە دەستپێکرد.

ئەگەر بمەوێت چیرۆکی ژیان و ماڵی خوێندکاران بنووسم، ئەوە خۆی لە خۆیدا دەبێتە ڕۆمانێکی گەورە. ڕەنگە ڕۆژێک بێت ئەو یادەوەرییانەش بنووسمەوە، بەڵام ئایا بەڕاستی دەکرێت ئەو یادەوەرییانە بنووسمەوە؟ خۆ ئەگەر هەموو ئەو یادەوەرییانە بنووسمەوە ئەوا دەبێتە کتێبێکی نهێنی ئامێز. ئایا بەڕاستی دەکرێت باسێک لەو نهێنیانە بکەم؟ یا ئەوانە بەکەڵکی قسە لەسەرکردن نایەن. لەو ساڵانەدا زانکۆی مەشهەد زانکۆیەکی تازە بوو، واتە نزیکەی بیست ساڵ دەبوو بنیات نرابوو. زانکۆ هێشتا کەموکووڕی زۆری هەبوو. کۆلێژەکان لە ناو شار و لە ناو شەقامەکاندا بڵاو بوون، زانکۆیەکی باشی شاراوە بوو. پاشان کۆلێژەکان کۆکرانەوە و لە شەقامی سناباد لە نزیک فولکەی (سەعدی) جێگەیەکی باشیان بۆ دابینکرا. لە دووری سەد مەتر لە کۆلێژەکانی زانست و ئەدەبیات گەوڕێکی بەخێوکردنی ئەسپ هەبوو. کۆلێژی پزیشکی لە شەقامی زانکۆ بوو. کۆلێژی پزیشکی ددان لە شەقامی تاهیری بوو. کۆلێژی زانست لە شەقامی ئەسرار و کۆلێژی ئەدەبیات لە ئەسرار و لە شەقامی شاهروخ بوو، واتە شاهروخی تەیموری، کەکوڕی تەیموری لەنگ بووە. هەروەها هاوسەری گەوهەرشاد بووە، ئەو گەوهەرەی مزگەوتی گەوهەر شادی دروستکردووە. شاهروخ نزیکەی چل ساڵ لە ئێراندا فەرمانڕەوایی کردووە. واتە لە ئێران و ئەفغانستان و بەشێک لە ئاسیای ناوەڕاست. ئەو بە پێچەوانەی باوکیەوە کە خەریکی لەشکرکێشی و خوێنڕشتن و کاولکاری بوو، بەڵام شاهروخی تەیموری کەسێکی بنیاتنەر بووە. شاری هیرات کە پایتەختی حکومەتەکەی بوو گۆڕی بە شارێکی جوان و پێشکەوتوو. شاری خەوافی گۆڕی بە شارێکی پیشەسازیی و هونەری. ئەو لەگەڵ هاوسەرەکەیدا نوێکارییەکی باشیان لە شاری مەشهەددا کرد. گەوهەرشاد خاتوون ژنی شاهروخ مزگەوتێکی بەتەنیشت مەرقەدی ئیمامی هەشتەم (ئیمام ڕەزا) وە دروستکردووە. وەزیرێکی شاهروخ بە ناوی ئەمیر عەلی شێرنەوایی پرۆژەی ئاوی شاری هیراتی دامەزراند و ئاوی سەرچاوەی گێلاسی ڕاکێشا بۆ شاری مەشهەد. واتە نزیکەی سی‌وپێنج کیلۆ مەتر پرۆژەی ئاوی سەرچاوەی گێلاسی هێناوە بۆ مەرقەدی ئیمام ڕەزا. ڕاکێشانی ئەو جۆگە ئاوە بووە هۆی فراوان بوونی شاری مەشهەد. شاهروخ خزمەتێکی زۆری کرد بە

زیادکردنی کشتوکاڵ و بەرهەمی ئاوریشم و پیشەسازیی. هێرشەکانی تەیموری لەنگ، بوون بەهۆی وێرانکاری ناوچەکە، بەڵام شاهروخ بەپێچەوانەی باوکییەوە دەستیکرد بە بنیاتنان و ئاوەدانکردنەوە. ئەو ئابووریی وڵاتی گەشە پێدا و ڕێگەی نوێی بازرگانی ئاوریشمی کردەوە. زۆرترین قوتابخانەی دروستکرد، لەوانە چەندین قوتابخانە لە هیرات و خەواف و مەشهەد، چەندین قوتابخانەشی لە ئاسیای ناوەڕاست و جێگاکانی تر دروستکرد. کاری زۆرباش و خزمەتگوزاری زۆری لە تەواوی ئێراندا ئەنجامدا. فەرمانی داوە بە نووسینەوەی زۆرترین کتێب، کە هەر یەکێک لەو کتێبانە مایەی شانازییە بۆ هەموو جیهان، نەک تەنها بۆ ئێران. بۆ ڕێزی چل ساڵ حوکمڕانی و ئەو هەموو خزمەتەی بە ئێرانی کرد لە شاری مەشهەد شەقامێکیان بە ناوی شاهروخەوە ناو نابوو، بەڵام دوای شۆڕشی ئێران ناوەکەیان لەسەر شەقامەکە لابرد و ناوی شەقامەکەیان گۆڕی بە ناوێکی تر. ئەی خەڵکینە بە شوێن هێز و توانا مەکەون. کاتێک چل ساڵ پاشا بوویت، ئەو پاشایەتیەش زیاتر لە هەموو شاکانی تر بە شوێن ئاشتی و ئاوەدانی و خۆشگوزەرانیەوە بوویت بۆ گەلەکەت، کەچی ئێستا ڕێگە نادەن ناوەکەشت لەسەر شەقامێک هەبڵواسرێت. ئەگەر وا هەستبکەم ناوی ئەو شەقامە بۆ خاوەنە تازەکەی وەفای دەبێت ئەوا من بە هەڵەدا چووم. دونیا بۆ هیچ کەسێک و بۆ هیچ شتێک وەفای نییە، خودای گەورە و بەخشندە، دەستبەرداری هیچ کەسێک نابێت (کل من علیها فأن). ئێمەی مرۆڤی بچکۆلانە و هیچ لەباردا نەبوو لەناودەچین. گۆی زەوی و ئەستێرەکان و مانگ و خۆر و کاکێشانەکان دەمێننەوە. مێژوو، فەرهەنگ، ڕێزی مێژوو، دروستبوونی ڕۆشنبیری ئەویش شتێکی ترە. میللەت ڕێز لە زانایان و ڕۆشنبیرانی خۆی دەگرێت و ڕووبەڕووی کێشەی گەورە دەبێتەوە.

هەزاران کەس، هەزاران جار بە لێپرسراوانیان گوتووە ئەگەر دەتانەوێت ناوی کەسێک لەسەر شەقامێک یاخود کۆشکێک بنووسن، بۆ ئەو خوداليێخۆشبووە بەڕێزە شەقامێک، بینایەک، دامەزراوەیەک دروستبکەن و ناوی ئەوی لەسەر دابنێن. ئەو کات هەم ئاوەدانی دەکەن هەم ڕێزی گەورە پیاوان دەپارێزن. لێپرسراوان پەلەدەکەن لە بەزیندوویی هێشتنەوەی ناوی خوداليێخۆشبووان، بەڵام توانای دروستکردنی مەیدانێکی گەورە یا قوتابخانەیەکیان نییە، ئاسانترین کار بۆ ئەوان گۆڕینی ناوەکانە. بە گشتی لە وڵاتی ئێمەدا شەقامێکی گەورە یا مەیدان و کۆشکێکی مێژوویی بە ناوی کەسێکی زیندووەوە نییە، کەسێکی هەزار ساڵەش گەورەیە و پێویستە بمرێت یا شەهید ببێت تاکو ناوی لەسەر دامەزراوەکان بنووسرێت. دیارە هەندێک جار ڕوودەدات کە شوێنێک

بە ناوی کەسێکی زیندووەوە بێت.

ئەو کاتە کۆلێژی ئەدەبیات لە شەقامی شاهروخ بوو. کۆلێژ لەسەر ڕووبەرێکی بیست هەزار مەتر چوار گۆشە لە بینایەکی کۆنی گەورەدا بوو، کە چوار دەوری بیناکەش دیوار بوو. ژووری ڕاگری کۆلێژ و جێگرەکەی و ژمێریار و لێپرسراوی ئیداری لە بینا کۆنەکەدا بوو. پەنجەرەکانی دوو شووشەیی بوون تاکو بەرگری لە سەرمای زستان بکات. لەم بینایەدا کەسانی وەکو دکتور عەلی ئەکبەر، دکتۆر جەمال ڕەزایی بێرجەندی، دکتۆر ئەحمەد ڕەزایی، دکتۆر جەلالی مەتینی، دکتۆر عەباسی سەعیدی و محەمەد کازمی خواجەییان سەرۆکایەتی کۆلێژیان کردووە. ماموستایانی وەک ودکتۆر جەوادی حەدیدی، دکتۆر غولام حسێنی یوسفی، دکتۆر لوتفوڵڵای مەفخەم پایان، دکتۆر سەرویسی سوهامی و دکتۆر عەلی شەریعەتی لە هاتووچۆدا بوون. ئەم بینا گەورەیە دەکرا بکرێت بە مۆزەخانە و وەک یادگارییەک بمێنێتەوە، کەچی زۆر بە ئاسانی تێکیاندا. ئەگەر بینایەکی ئاوها لە پاریس یا ئەڵمانیا و بریتانیا هەبووایە دەیانکرد بە مۆزەخانەیەک و خەڵکێکی زۆر سەردانیان دەکرد. هەم یادی گەورە پیاوان بەزیندوویی دەمایەوە و هەم لێرەوە پارەیەکی باشیان بەدەستدەهێنا و دەبووە شوێنی بیرهێنانەوەی فەرهەنگی وڵات. هەموو شوێنی کۆلێژەکە بە بیناکەشەوە لە دەیەی (١٣٧٠-١٩٩١) دکتۆر عەبدولڕەزای باقری بە بڕە پارەیەکی زۆر کەم فرۆشتی. لەکاتێکدا دەبوو لێپرسراوان و کاربەدەستانی زانکۆ ئەو شوێنەوارە فەرهەنگیەیان بپاراستایە، کەچی ئەوان پشگیری تێکدانیان کرد.

لەبارەی دکتۆر عەبدولڕەزای باقری کە خەڵکی موبیدە و سەرۆکی زانکۆ بوو، پاشان لەسەر ئەو دەنووسم. ئەو خراپترین سەرۆک زانکۆ بوو کە من لە تەمەنمدا بینیبێتم، ئەو لە سەردەمی دکتۆر خاتەمیدا سەرۆکی زانکۆ بوو. یەکێک لە کارەکانی ئەو سەرۆک زانکۆ و هاوشاریەی من، دروستکردنی دۆسیە و دادگاییکردنی نهێنی ماموستاکان بوو، واتە ئەم سەرۆک زانکۆیە لە سەرەتای سەدەی بیست و یەکدا کە ماموستایەک ئامادە و لەبەرچاو بوو ئەو بە نهێنی دادگایی دەکرد. ئەو بەو جۆرە چاکسازیی دەکرد. ئای لەو چاکسازییە کە کەسانی وەک ئەو سەرۆک زانکۆیە و مستەفا موعینی وەزیری خوێندنی باڵا ئەنجامیان دەدا.

لە ساڵی (١٣٤٦-١٩٦٧) دا، کاتێک چوومە کۆلێژی ئەدەبیاتی زانکۆی مەشهەد سەرۆکی زانکۆ بەڕێز ئیسماعیل بێگی بوو. ڕاگری کۆلێژی ئەدەبیاتیش دکتۆر ئەحمەد عەلی ڕەجائی بوو. دکتۆر ئەحمەد عەلی پیاوێکی بەڕێز و خزمەتگوزار بوو. لە سەردەمی

ئەودا گۆڕانکاری لە زانکۆ و کۆلێژی ئەدەبیاتدا کرا. یەکێکی تر لە ماموستا گەنج و چالاکەکانی کۆلیژی ئەدەبیات دکتور عەلی شەریعەتی بوو. دکتۆر ئەحمەد عەلی ڕەجائی هەر خۆی دکتور عەلی شەریعەتی لە کۆلێژی ئەدەبیات دامەزراند بوو. هەر خۆیشی زۆر پشگیر و هاندەری دکتور شەریعەتی بوو. ئەو کاتە هێشتا کۆلێژ هۆڵی شانۆیی تێدا نەبوو، بەڵام گۆڕەپانێکی گەورەی هەبوو کوڕان و کچان یارییان تێدا دەکرد. ناو ئەو چوار دیوارە لە ڕووی کۆمەڵایەتی وسیاسیەوە جیاوازی هەبوو لەگەڵ هەموو شاری مەشهەددا. کۆلێژەکان تەنها شوێنێک بوون کوڕان و کچان تێکەڵ دەبوون تێیدا و لە پۆلەکاندا بە یەکەوە دادەنیشتن. لە دەرەوەش بە یەکەوە یاریی تۆپێنیان دەکرد. زانکۆ تەنها شوێنێک بوو لە هەموو مەشهەددا کە کچان بە جلوبەرگی وەرزشی دوو پارچەییەوە لەگەڵ کوڕاندا یاریان تێدا دەکرد. تەنها شوێنێک بوو کە گروپ و بیروڕا جیاوازەکان لێی کۆدەبوونەوە و بانگەوازی بیروڕای خۆیان تێدا دەکرد. هەر لەو ساڵانەدا لەکۆلێژ کۆمەڵێک کەسی سەر بە پارت و گروپی چالاک هەبوون. هەموو کۆلێژەکان و بەتایبەت کۆلێژی ئەدەبیات و زانست و پزیشکی، کۆمەڵێک کەسی دژە کۆمەڵگە و دژە شار و دژە لادییی جێگای خۆیان تێدا کردبووەوە. لە ساڵی (١٣٤٦-١٩٦٧) دا، گۆڕانکاری تازە لە کۆلێژی ئەدەبیات لە پەرەسەندندا بوو. دکتور عەلی شەریعەتی وانەی بەشی مێژووی دەگوتەوە. پۆلەکانی ئەو ببووەنە بنکەی ڕۆشنبیران. لە هەندێک وانە وتنەوەدا لە پۆلەکەی ئەودا زیاتر لە (٢٠٠) خوێندکار بە شێوەی ئازاد بەشدارییان تێدا دەکرد. دکتۆر ئەحمەد عەلی ڕەجایی پیاوێکی بەڕێز و خۆشەویست و ئازادیخواز بوو، ئەو پیاوێکی تێکۆشەر و نموونەیی بوو. دێتەوە یادم ڕۆژی (١٦ی ئازەر - ٧ ی ت. یەکەم) خوێندکاران لە کۆلێژ مانیانگرت بوو، لە ڕاڕەوەکە دانیشتبوون، پۆلیس چوار دەوری کۆلێژی گرتبوو. لە مەودای هەر مەترێکدا پۆلیسێک وەستا بوو. دکتۆر ئەحمەد عەلی ڕەجایی هاتە بەر دەرگای کۆلێژ، ئەفسەرێک فەرماندەی پۆلیسەکان بوو. دکتۆر ئەحمەد بە ئەفسەرەکەی گوت، ئێوە بۆچی هاتوون چوار دەوری ئێرەتان گرتووە؟ بۆچی هاتوونەتە ئێرە؟ ئەفسەرەکە گوتی ئێمە فەرمانمان پێکراوە بێینە ئێرە. دکتۆر ئەحمەد گوتی ئەم خوێندکارانە بە من سپێردراون و لە ژێر چاودێری مندان، هیچ کارێکی خراپیش ناکەن. پاسەوانەکە گوتی ئەم خوێندکارانە دەیانەوێت لە کۆلێژدا وتاربدەن. دکتۆر ئەحمەد عەلی گوتی ئەی دەبێت لە کۆلێژدا چ کارێک بکەن، ئەگەر وتار نەدەن؟ خۆ دەبێت یەکێک وتاربدات و ئەوانی تریش گوێی بۆ بگرن. لە کۆلێژدا هۆڵێک نییە تاکو تێیدا کۆببنەوە، ئەمانیش ناچارن لە ڕاڕەوەکە دانیشن و گوێ لە وتارەکان

بگرن. بوونی پۆلیس لەم شوێنەدا خوێندکاران ناچار دەکات پەنا بۆ کاری خراپ ببەن. بۆیە هەتا زووە ئێوە لێرە برۆن بۆ ئەوەی هیچ کارێکی خراپ ڕوونەدات. پاشان ئەفسەرەکە پەیوەندی کرد بە لێپرسراوەکەیەوە و گوتی ئێمە بەڵێنمان لە دکتۆر ئەحمەد عەلی وەرگرتووە کە خوێندکاران هیچ کارێکی نەخوازراو ئەنجام نەدەن، هەر کارێکیش ڕووبدات ئەوا دکتۆر ئەحمەد عەلی خۆی لێی بەرپرس دەبێت. دکتۆر ئەحمەد عەلی بوو بە کەفیلی خوێندکاران و پۆلیس دەوری کۆلێژیان چۆڵکرد. ئەو خوێندکارە گەنجانە هەستیانکرد ئەگەر کێشەیەک ڕووبدات ئەوا بەسەر دکتۆر ئەحمەد عەلی دا دەشکێتەوە. هەر بۆیەش چەند کەسێک وتاریان پێشکەش کرد و مانگرتنەکە کۆتایی هات.

ئەو ساڵە دوایین ساڵی دکتۆر ئەحمەد بوو لە کۆلێژی ئەدەبیات. دوای ئەو دکتۆر جەلالی مەتینی، بوو بەڕاگری کۆلێژی ئەدەبیات، ئەو بە پێچەوانەی دکتۆر ئەحمەد عەلییەوە بوو. دکتۆر ئەحمەد بۆ خوێندکاران باوکێکی بەڕێز بوو، بەڵام دکتۆر جەلالی مەتینی کەسێکی بێ ڕێز بوو. خوێندکاران لە دکتۆر جەلال دەترسان، پەیوەندی کوڕ و باوکێتی لە کۆلێژدا بەرەو نەمان دەچوو. ئەو پەیوەندییە پەیوەست نەبوو بە دکتۆر ئەحمەد عەلی و دکتۆر جەلالی مەتینی، بەڵکو سیاسەتی گشتی ڕژێمی شا لە بارەی زانکۆکانەوە گۆڕانکاری بەسەردا هاتبوو. کەسانی وەکو دکتۆر ئەحمەد عەلی ئاگاداری هەموو کێشەکانی خوێندکاران بوون، پەرەیان بە پەیوەندییەکانی کوڕ و باوکایەتی دەدا. ئەگەر خوێندکارێک کێشەکی هەبووایە بەزوویی هەوڵی چارەسەرکردنیان دەدا. کەسێک بێ پارە بوایە پارەیان پێدەدا. ئەگەر خوێندکارێک بیویستایە زەماوەند بکات ئەوان کۆمەکیان دەکرد، یا ئەگەر مامۆستایەک کێشەیەکی هەبووایە ئەوا کێشەکەیان بۆ چارەسەر دەکرد. هەموو مامۆستایانی هاوبیری دکتۆر ئەحمەد عەلی هەروەکو ئەو بیریان دەکردەوە. خودا لێخۆشبووان دکتۆر لوتفوڵڵای مەفخەم پایان و دکتۆر غولام حسێنی یوسفی هەر بە هەمان شێوە بوون. دکتۆر لوتفوڵڵای مەفخەم پایان، کەسێکی زۆر پاک و دڵسۆز بوو. پێش ئەوەی مامۆستای جوگرافیا یا مۆسیقا بێت، ئەو مامۆستای ڕەوشت بوو. هەر خوێندکارێک کێشەیەکی هەبووایە سەردانی ئەوی دەکرد، یا پارەی لە ئەو قەرز دەکرد. ئەو کەسێکی دەستکراوە بوو، کاری بۆ خوێندکارە بێکار و بێ پارەکان دەدۆزیەوە. ئەوکاتە حکومەت هیچ برە پارەیەکی نەدەدا بە خوێندکاران. زانکۆکان کاریان بە خوێندکاران دەسپارد، بەکرێی یەک کاتژمێر کارکردن بە (٥،١٢) ڕیاڵ. ئەگەر کارەکە هونەریی بووایە ئەوا نرخی یەک کاتژمێر کارکردن بیستوپێنج ڕیاڵ بوو. زۆرترین دۆزینەوەی کار بۆ خوێندکاران بە هەوڵی دکتۆر لوتفوڵڵای مەفخەم

پایان بوو. تاقیگەی جوگرفیا، شوێنی کارکردنی خوێندکارێکی زۆر بوو لە ژێر چاودێری دکتۆر لوتفوڵڵای مەفخەم پایان و خانم دکتۆر زیبای خورسەندا، نەخشەیان دەکێشا لەسەر شووشە. ئەم نەخشانە لایەنی زانستییان نەبوو، زیاتر لایەنی هونەرییان هەبوو. خودالێخۆشبوو دکتۆر لوتفوڵلا پارەی بەقەرز دەدا بەو خوێندکارانەی کە بێ پارە دەبوون. جارێک خوێندکارێکی خەڵکی مەشهەد کە ناوی مەحمود بوو، سەردانی کرد و داوای یەک هەزار تومەن قەرزی لێکرد. دکتۆر هەموو خوێندکارانی بە باشی دەناسی و بۆ هەر خوێندکارێک دۆسیەیەکی کردبووەوە، هەموو زانیارییەکانی خوێندکارەکە لە دۆسیەکەدا نووسرا بوو. بەو هۆیەشەوە هەموو کەسوکاری خوێندکارانی بە باشی دەناسین، هەر بۆیەش کەسوکاری مەحمودیشی بە باشی دەناسی. دکتۆر لوتفوڵلا بە محمود دەڵێت تۆ خەڵکی مەشهەدیت. ماڵتان لە کۆڵانی باغ سەنگییە لە نزیک فولکەی سەراب. باوکت لە فلان شوێن دوکانی هەیە، براکەشت لە فلان شوێن کاردەکات، تۆ کەسوکارت دەوڵەمەندن و هەزار تومەنت بۆ چییە؟ لەو سەردەمەدا هەزار تومەن پارەیەکی زۆر بوو. لەو کاتەدا من مانگی ئەوپەڕی (١٤٠) تومەنم خەرجدەکرد. مەحمود نەیتوانی وەڵامێکی تەواوی بداتەوە. دکتۆر گوتی ئەگەر بەڕاستی پێمبڵێیت ئەو پارەیەت بۆچی دەوێت، ئامادەم پارەکەت پێبدەم. مەحمود گوتی ڕاستیەکەی ئەوەیە هەر کەسێک پارە لە تۆ وەردەگرێت دەیخوات و ناتداتەوە. منیش دەمەوێت پارەکەت لێوەربگرم و نەشتدەمەوە. دکتۆریش هەزار تومەنەکەی پێدەدات، بەڵام لەوەودوا. دکتۆر خوێندکارانی بە بانکی بازرگانی ناساند و لەوێ پارەیان قەرز دەکرد و مانگانە بۆیان دەبردنەوە.

ئەگەر خوێندکارێک بێ پارە بوایە و نەیتوانیایە قەرزەکەی بداتەوە ئەوا دکتۆر لوتفوڵڵای مەفخەم پایان، کارێکی بۆ دەدۆزینەوە، تاکو خوێندکارەکە بتوانێت کار بکات و قەرزەکەی بداتەوە. من ژیاننامەی خودالێخۆشبوو دکتۆر لوتفوڵڵای مەفخەم پایانم لە گۆڤاری کۆلێژی ئەدەبیاتی مەشهەد بڵاوکردۆتەوە. پەیوەندی مامۆستا لەگەڵ خوێندکاراندا زۆر پتەو بوو. لە نێوان مامۆستا و خوێندکاراندا پەیوەندیەکان هاوشێوەی پەیوەندی باوک لەگەڵ کوڕدا بوو.

بیرم دێتەوە ڕۆژێک، خوێندکارێک وابزانم ڕەزای دانشوەر بوو، لە ناوکۆلێژدا چاکەتەکەی دابوو بە شانی ڕاستیدا و بەدەستی چەپی گرتبووی. دکتۆر ئەحمەد عەلی ڕەجائی ئەو خوێندکارەی بانگ کرد و گوتی کوڕم بە جوانی چاکەتەکەت لەبەر بکە ومەیدە بە لایەکی شانتدا. خۆ ئێرە مەیدانی بارنیە. پاشان گوتی ڕۆڵە ئەوانەی لە مەیدانی بار کاردەکەن هەموویان خەڵکانی ڕەنجدەر و بەڕێزن، بەڵام هەر شوێنێک

ڕێکار و یاسایەکی تایبەتی خۆی هەیە. دکتۆر ئەو قسانەی بە شێوازێکی باوکانە و دڵسۆزانە پێگوت. بە جۆرێک ئەو خوێندکارە نارەحەت نەبێت و شەرم نەیگرێت.

با یادەوەرییەک لە سەر دکتۆر ئەحمەد عەلی ڕەجائی بوخارایی بگێڕمەوە. ئەو پیاوێکی بەڕێز و دڵسۆز بوو. دەبوو زووتر و زیاتر لە سەری بنووسم. ڕۆژێکیان لە پۆلەکەی ئەودا بووم، چل خوێندکاری بەشەکەی خۆی لە پۆلدا بوون، نزیکەی بیست خوێندکاری وەکو منیش بە شێوەی ئازاد بەشداریمان کرد بوو لە پۆلەکەدا دانیشتبووین. لە ناوەڕاستی وانە وتنەوەدا بوو دەرگای پۆلەکە کرایەوە. ئاغای باغەبانی بەڕێوەبەری ئیدارەی کۆلێژ داوای مۆڵەتی کرد بێتە ژوورەوە. دیار بوو کارێکی پەلەی هەبوو، هەرگیز لە کاتی وانە وتنەوەدا هیچ کەسێک بۆی نەبوو بێتە ژوورەوە. دکتۆر ئەحمەد پێیگوت فەرموو چیت دەوێت. ئاغای باغەبانی گوتی شتێکی نهێنی هەیە دەمەوێت پێتیبڵێم. دکتۆر ئەحمەد گوتی من هیچ شتێکی شاراوەم نییە لەگەڵ خوێندکارەکانمدا، چیت هەیە فەرموو بیڵێ. ئاغای باغەبانی گوتی سەرۆکی زانکۆ گوتویەتی سەرۆک وەزیران پاش نیو کاتژمێری تر دەگاتە فڕۆکەخانە و سەردانی شاری مەشهەد دەکات، تۆ دەستنیشان کراویت بچیت بۆ فڕۆکەخانە بۆ پێشوازیکردنی، ئۆتۆمبێلیشت بۆ ئامادەکراوە. دکتۆر ئەحمەد زۆر بە ئارامی گوتی وەک دەبینیت من خەریکی وانە وتنەوەم، بە سەرۆکی زانکۆ بڵێ ئەحمەد لە پۆلدایە و ناتوانێت بچێت بۆ ئەو پێشوازییە. ئاغای باغەبانی گوتی ئاخر سەرۆکی زانکۆ گوتوویەتی دەبێت هەر بچێت. دکتۆر ئەحمەد گوتی بڕۆ بە سەرۆکی زانکۆ بڵێ سەرۆک وەزیران خۆشحاڵ دەبێت ئەگەر ماموستاکان لە پۆلدابن و گەورە پیاوان لە فڕۆکەخانە ئامادەبن. پاشان بۆم دەرکەوت کە هەندێک لە ماموستاکان و گەورە پیاوان بە فڕکان فڕکان ڕۆیشتبوون بەرەو فڕۆکەخانە بۆ پێشوازیکردنی سەرۆک وەزیران.

من لە تەمەنمدا گەیشتوومەتە ئەو باوەڕەی هەرچەندە زەبروزەنگی پۆلیس زیاتر بێت، ئەنجامەکەی پێچەوانە دەبێتەوە. بە ئامادەبوونی دکتۆر جەلالی مەتینی و هاوکاری ئەو لەگەڵ دەزگاکانی پۆلیس و ساواک، مانگرتن و خۆپیشاندانی خوێندکاران لە کۆلێژەکەماندا زیاتر دەبوو. ئەوکاتەی ئەو ڕاگری کۆلێژ بوو کێشەکان ئەوەندە زیادیانکرد تاکو هەموو کۆلێژەکانی تریشی گرتەوە. هەڵبەت ئەو هەموو نارەزایی و خۆپیشاندان و چالاکیە خوێندکاریانە، بەهۆی دکتۆر جەلالی مەتینیەوە نەبوو، بەڵکو هەموو سیستەمەکانی ڕژێم دوچاری ئالۆزی ببوون، بەڵام چ کەسانێک و چ هۆکارێک سیستەم و ڕژێم دروستدەکەن؟ هەر ئەو کەسانە و یاساکانیان و زەبروزەنگ و

هەڵسوکەوتیان ئەو سیستەمە بنیاد دەنێن. کێشەکە کێشەی تاکە کەسی نییە. دکتۆر جەلالی مەتینی و هاوشێوەکانی ببوونە هۆی دروستبوون و پیادەکردنی سیاسەتی گشتی ڕژێمی پەهلەوی.

ڕژێمی شا بەرەو دەوڵەمەندی دەچوو. داهاتی نەوت زیادی کردبوو. ئێران زیاتر پەیوەست دەبوو بە وڵاتانی خۆرئاواوە. هاوکات چالاکییەکانی گروپە کۆمۆنیستییەکانی سەر بە ڕوسیا و چین زیادیانکرد بوو. جەنگی ڤێتنام سەرنجی بیروباوەڕی گەنجەکانی ڕاکێشابوو. حکومەت دەیویست هەم فکری گەنجەکان کۆنترۆڵ بکات و هەم ئەو بیروباوەڕەیان لە مێشکدا دەربکات. بۆیە دەبوو سیستمی ساواک بەهێزتر بکات. بەشێک لە دەزگا دەوڵەتییەکان دەیانویست بەکرانەوەی بێ قەید و شەرت و دروستکردنی ژیانێکی تاڕادەیەک باش هەستی گەنجان بەرەو خۆشگوزەرانی ڕابکێشن. دەزگا دەوڵەتییەکان، دەیانویست پەیوەندییە توندەکانی پۆلیس وەک ساواک جێگای پەیوەندی باوک سالاری بگرێتەوە، بەڵام کام حکومەتی پۆلیسی بۆ هەمیشە لەسەر پێی خۆی ماوەتەوە. حکومەتە پۆلیسییەکان ئەوپەڕی توانییان دە ساڵ تا بیست‌وپێنج ساڵ بەردەوامیان هەبێت. پاشان نۆرەی ڕاپەڕین و شۆڕش دێت. یاخود نۆرەی هەڵواسینی دیکتاتۆرەکان دێت. ئەگەر دیکتاتۆرەکان ئەوەندەی لە داهاتی وڵات کە بۆ پۆلیسی خەرج دەکەن بۆ میللەت و ئاوەدانی وڵات خەرج بکەن، وڵات ئاوەدان و خۆشیان سەرکەوتوو دەبن. من بۆچوونی خۆم لەم بارەیەوە لە کتێبی «شا عەباس و پینەچی» دا ئاماژە پێداوە. مەگەر دەکرێت بازاڕ بخرێتە ژێر کۆنترۆڵی پۆلیسەوە؟ پۆلیس دەبێت هێزی بەرگری بێت، پاراستنی ئاسایشی هاووڵاتیان لە ئەستۆی پۆلیسدایە، کاتێک پۆلیس خۆی بە خاوەنی هەموو شتێک بزانێت و خۆی فەرز بکات بەسەر هاووڵاتیاندا و دەست وەربدات لە ئیش و کارەکانیان، ئەو کاتە هیچ شتێک چارەسەر نابێت و پۆلیس خۆیشی دوچاری گەندەڵی دەبێت. لەو جۆرە نموونەیەم لە هەموو جیهاندا بینیووە. پاشان حکومەتی پەهلەوی لە دەوروبەری ساڵی (١٣٤٥-١٩٦٦) هەموو دامودەزگا دەوڵەتییەکانی خستە ژێر چاودێری ساواکەوە. هیچ بەڕێوەبەرێکی گشتی نەیدەتوانی کارەکانی خۆی جێبەجێ بکات بێ پرسی ساواک، بەڵام لە کوێی ئەم جیهانەدا ئەم سیستمی پۆلیسیە بەردەوامی هەبووە. لە ساڵی (١٣٤٧-١٩٦٨) دەسەڵاتی پۆلیس لە کۆلێژەکاندا زیادیکرد و سوپای زانکۆیان دروستکرد. ئەفسەرێک لێپرسراوی سوپای زانکۆ بوو. لەبەردەم هەر کۆلێژێکدا چەند پۆلیسێک وەستا بوون و چاودێریی هاتنەژوورەوە و چوونەدەرەوەی خوێندکارانیان دەکرد و ناسنامەیان لێوەردەگرتن، هەر کچێک ڕووپۆشی پێوە بوایە ڕێگایان نەدەدا

بچێتە ناو زانکووە. لە ساڵی (١٣٥٢-١٩٧٣) لە تەواوی کۆلێژی ئەدەبیاتی مەشهەد تەنها سێ کچ ڕووسەرییان پێوە بوو. پەیوەندییەکانی سەرانی کۆلێژ لەگەڵ پۆلیسدا زیاتر بوو، تا پەیوەندی خوێندکاران لەگەڵ پۆلیسدا. کەسانی وەک دکتۆر جەلالی مەتینی بنیاتنەری ئەو یاسا پۆلیسیە بوون لە زانکۆدا. دکتۆر جەلالی مەتینی بۆ خۆی کەموکووڕییەکی زۆری هەبوو نەیدەویست کەموکووڕییەکانی خۆی چاک بکات، کاتێک بەو هەموو کەموکووڕییەوە بووە ڕاگری کۆلێژ ئیتر سەنگ و قورسایی خۆی لای خوێندکاران لەدەستدا. کاتێک پەیوەندییەکان لەسەر بنچینەی ڕێز و خۆشەویستی دانەمەزرا تەنها هێز ڕۆڵ دەبینێت. لە سەردەمانێکدا کە هەموو زوڵم و زۆرێک بکەوێتە ژێر پرسیارەوە و ئەوانەی دەیانەوێت لە لووتکەی دەسەڵاتدا بمێننەوە چیان پێدەکرێت. ئەوان کارێکیان کرد کە خۆیان ئەنجامەکەیان بینی. شا، ویستی گۆڕانکاری ستراتیژی بکات تا ساڵی (١٣٤٠-١٩٦١) دەیویست بەهێزی خەڵکانی وەکو (شەعبان بێمۆخ) حوکومڕانی بکات، بەڵام لەوە بەدواوە. بەهێزی سەربازی و ساواکی حوکومڕانی دەکرد. ئەو زەبروزەنگەی ئەوان پیادەیان کرد بوو، وردە وردە لە نێو کۆلێژ و زانکۆکانیشدا ڕەنگی دایەوە. ئەو ڕێز و خۆشەویستیەی لە نێوان مامۆستا و خوێندکاراندا هەبوو بەرەو نەمان دەچوو. ئەو مامۆستایانەی داوای نوێخوازیان دەکرد بە دوای پۆستدا دەگەڕان. زۆرێک لە مامۆستا زانستپەروەر و دڵسۆزەکان وڵات وەلانران، مامۆستایانی ئازادیخواز لە ژێر فشاردا بوون، کەسانی بێتوانا و ماستاوچی دەخرانە سەرکار. دەکرێت نموونەیەک باس بکەم، چەند ساڵێک دواتر و لە ساڵی (١٣٥٠-١٩٧١) کارناسی کۆلێژ بووم، شەوێک لە کۆلێژ میوانداریيەک ئامادەکرا بوو. نازانم بە چ بۆنەیەکەوە بوو. مێزی شەش کەسی و هەشت کەسییان دانابوو. من لەسەر مێزێک بووم کە دکتۆر لوتفوڵڵای مەفخەم پایانیش لەسەر هەمان مێز دانیشتبوو. کەسێکی تر هات لامان دانیشت، ئەو کەسە مامۆستای دەروونزانیی بوو. ئەو کەسێکی چوار شانە و هەیکەلێکی گەورەی هەبوو. لە کۆتاییەکانی دەورانی شادا نوێنەری ئێران و سەرپەرشتیاری خوێندکارانی ئێرانی بوو لە هیندستان. دیارە مەبەستم لەو کەسە ئاغای دکتۆر ئەمینە. ئەو پێشتر ناسناوەکەی شێخ زادە بوو، بەڵام پاشان ناسناوی خۆی گۆڕیبوو. خوێندنیشی لە ئێران و لوبنان و ئەمریکا تەواو کردبوو. بە بۆچوونی من ئەو نموونەیەکی تەواوی بیری خۆرئاوایی بوو، هەروەها کەسێکی مەزهەبی و لە بنەماڵەیەکی مەزهەبییشدا گەورە ببوو. هەندێک جار مەڕاسیمی ئیمام حسێنی دەگێڕا بۆ هاوڕێکانی و لە هەمان کاتیشدا بانگەشەی بۆ فیکری ڕۆژئاوایی دەکرد. ئەوەش جۆرێک بوو لە ڕاڕاییەکانی.

ئەم پیاوە نوێنەری ئێران و سەرپەرشتیاری خوێندکارانی ئێرانی بوو لە هیندستان. نازانم لەسەر مێزی نانخواردن چۆن بوو گفتوگۆیەک دروستبوو لە نێوان دکتۆر لوتفوڵا و دکتۆر ئەمینی. دکتۆر ئەمینی لە لای خوێندکارە کچ و کوڕەکانی کۆلێژ بە کەسێکی سەرەڕۆ و بێڕێز ناسرا بوو، بەڵام دکتۆر لوتفوڵڵا نموونەی کەسێکی پاک و بەڕەوشت بوو، مامۆستایەکی چالاک و دڵسۆز بوو، کەسێک بوو بیستوحەوت کتێبی دەربارەی مۆسیقای ئێران نووسی بوو. دکتۆر لەتفوڵڵا لەسەر ئەو باوەڕە بوو کە کوڕان و کچانی خوێندکار وەک کوڕ و کچی مامۆستاکانن، دەیگوت ئەم خوێندکارانە ئەمانەتێکن لەلایەن کەسوکاریانەوە بە مامۆستایان سپێردراون، بەڵام دکتۆر ئەمین بە پێچەوانەی دکتۆر لوتفوڵڵاوە بیری دەکردەوە. دکتۆر ئەمین بە دکتۆر لوتفوڵڵای گوت تۆ وەک منداڵ سەیری ئەم خوێندکارانە دەکەیت و ئامۆژگارییان دەکەیت، ئەمانە تەمەنیان لە هەژدە ساڵی تێپەڕیوە، پێویستیان بە ئامۆژگاری تۆ نییە، ئەوان خۆیان ئازادن هەر کارێک کە بیانەوێت بیکەن. دکتۆر ئەمین دەیگوت یەکێک لە کێشەکانی خوێندکاران کێشەی سێکسییە، پێویستە خوێندکاران ئازادبن بەیەکەوە. دکتۆر لوتفوڵڵا گوتی کەواتە وەک تۆ دەڵێیت ئەگەر من لەگەڵ خوێندکارێکی کچدا دەست تێکەڵ بکەم و لەسەر جێگەکەی لەگەڵیدا بخەوم ئاساییە. دکتۆر ئەمین گوتی ئەگەر خۆی ڕازی بێت زۆر ئاساییە. دکتۆر لوتفوڵڵا توڕەیی گرتبووی و گوتی دکتۆر ئەمینی بەڕێز، بیرکردنەوە و هەڵسوکەوتی کەسانی وەکو تۆ ئەم وڵاتە وێران دەکات و خۆشتان لەناو دەچن، ئێوە دەتانەوێت کۆمەڵگەی ئێران و شاری مەشهەد گەڕوگول بکەن. دیارە چەند ساڵێک بوو دکتۆر ئەمین بۆچوونەکانی خۆی لە پۆلدا و لەگەڵ خوێندکاراندا بە ڕوونی باسدەکرد، باسی پەیوەندییە سێکسییەکانی بۆ خوێندکاران دەکرد. دکتۆر جەلالی مەتینیش بە بێ ئەوەی قسەکانی دکتۆر ئەمین بڵێتەوە، بە کردەوە ئەو بۆچوونەی دکتۆر ئەمینی ئەنجام دەدا. مامۆستایانی وەک دکتۆر محەمەد و هاوڕێکانی پابەندی دابونەریتی کۆنی ئێران بوون و ڕووبەڕووی کەسانی وەک دکتۆر ئەمینی دەوەستانەوە کە تیۆری ئازادی سێکسییان پیادە دەکرد. ئیسلام خوازەکانیش چەند دەستەیەک بوون، لایەنگرانی دکتۆر عەلی شەریعەتی گرووپێکیان دروستکردبوو، لایەنگرانی ئەندازیار مەهدی بازرگان کتێبەکانی ئەویان بڵاوکردەوە، لایەنگرانی ئایەتوڵڵا خومەینی نامە و کاسێتەکانی ئەویان بە نهێنی بڵاودەکردەوە. من خۆم چەندین جار ئاگاداربووم دکتۆر عەلی شەریعەتی بە ئاشکرا بەرگری لە بۆچوونەکانی ئایەتوڵڵا خومەینی دەکرد. ئەو لە بەرامبەر پرسیاری خوێندکارەکانی کە لێیان دەپرسی ئایا دەکرێت لە سەدەی بیستەمدا مەرجەعیەت قبوڵ

بکرێت؟ ئەو چەند کاتژمێرێک درێژەی بەوەڵامەکەی دەدا و دەیگوت کاتێک ئێوە نەخۆش دەکەون سەردانی دکتۆری پسپۆڕ دەکەن. ئێوە دەزانن کە نەخۆشکەوتوون، بەڵام هیچ شتێک لە نەخۆشی نازانن. بۆیە باوەڕ بەدکتۆر دەکەن و ئەو دەرمانانەی ئەو پێتانی دەدات بەکاریدەهێنن. مەرجەعیەتیش ئەوهایە. ئێوە سەردانی زانا ئاینییەکان دەکەن و فەرمانەکانی ئەو جێبەجێ دەکەن. دکتۆر عەلی شەریعەتی کەسێکی زۆر زیرەک و بە توانا بوو. دەیتوانی لەسەر پرسیارێک کە لێی بکرایە، چەند کاتژمێرێک قسە بکات. ئیسلام بەلای ئەوەوە دیاردەیەکی سیاسی بوو نەک شەرعی. من لێرەدا دوو پرسیاری وانەی مێژووی ئەو بە بیردێنمەوە.

- کەسێک لە پاریس چاوڕوانی میترۆیە.

- شازادەی ڕۆمی بە سواری ئەسپەوە لە کەناری ڕووباری نیل دەبینم.

خوێندکاران دەبوو وەڵامی ئەم دوو پرسیارە بدەنەوە. ئەم دوو پرسیارە دەکریت زیاتر(٥٠٠) وەڵامیان هەبێت. زۆر کەسی وەک من لەو باوەڕەدا بوون کە دکتۆر عەلی شەریعەتی کەسێک بووە هەر چەندە لێی نزیکتر بوویتایە زیاتر دژایەتیت دەکرد، هەر چەندە لێی دوور بوویتایە زیاتر لایەنگری بۆچوونەکانی دەبوویت. بە بۆچوونی من دکتۆر عەلی شەریعەتی بیروباوەڕێکی خۆرئاوایی هەبوو. هەرچی لە پاریس بینیبووی پێی خۆشبوو، لێرە دەیبەستەوە بە ئیمامی عەلی‌یەوە. لەو ساڵانەدا، ئێمەی خوێندکار لە ژێر کاریگەریی جۆرەها بانگەشەی سیاسیدا بووین. ئەو کاتە وتەکانی دکتۆر عەلی شەریعەتی کاریگەریی خۆیان هەبوو. هەمووومان دەمانزانی ئەو دەیەویت ڕەگوڕیشەی حکومەتی شا دەربهێنێت. حکومەتی شا باش دەیزانی ئەو چی دەڵێت، بەڵام لانیکەم ماوەی چوار ساڵ (١٣٤٦-١٣٥٠=١٩٦٧-١٩٧١) هیچ کەسێک کاری بەسەر دکتۆر عەلی شەریعەتییەوە نەبوو. زۆر جار کار ئاسانیشیان بۆ دەکرد بۆ وتارەکانی و مۆڵەتیان پێدەدا لە زانکۆکانی تریشدا وتار بدات.

لەو ساڵانەدا دکتور عەلی شەریعەتی لافاوێکی هزریی دروستکرد بوو، خۆ گروپەکانی تریش بێکار نەبوون. هەر ئەو سەردەمەی من لە کۆلێژ بووم، چوار خوێندکاری کۆلێژی ئەدەبیاتی زانکۆی مەشهەد واتە هاوڕێیان (گلەوی، ئارین، تەوەکوللی، ئەرژەنگ) کە هەر چواریان لە ژێر کاریگەری بیر و باوەڕی چەپدا بوون لەسێدارە دران. شا و ساواک تا یادەکانی جەژن شا لە ساڵی (١٣٥٠-١٩٧١) وایان هەستدەکرد کە وتارەکانی دکتۆر عەلی شەریعەتی پێش بە کۆمەنیستەکان دەگرێت و وتارەکانی لە بەرژەوەندی ڕژێمی شایە، بەڵام لە ساڵی (١٣٥٠-١٩٧١) بە دوواوە تێگەیشتن کە وتارەکانی دکتۆر

شەریعەتی خەریکە بە ئاراستەیەکی ترسناکدا دەڕوات، هەر بۆیەش ئیتر ڕێگای وانە وتنەوەیان پێنەدا و لە زانکۆ دووریانخستەوە، بەڵام لە شاری تاران دەرگای حسێنیەی ئیرشادیان بە ڕوودا کردەوە.

ئێمەی لاوانی خاڵکی شاری یەزد، بە هیچ جۆرێک لەگەڵ سیاسەتدا نەبووین. ئەنجومەنی مامۆستایان و خوێندکارانی یەزدی لە ساڵی (۱۳۳۲-۱۹٦۳) بەدوواوە ،کاریگەرییەکی باشیان هەبوو لەسەر خوێندکارانی شاری یەزد. بەڕێز دکتۆر مەحەمەدی تەقی سەراف شیرازی، دکتۆری منداڵان و مامۆستای کۆلێژی پزیشکی بوو، کەسێکی دڵسۆز و خزمەتگوزاری ئەنجومەنەکە بوو. ئەنجومەنەکە بەرنامەیەکی تایبەتی نەبوو، بەڵام پشتیوانییەکی بەهێز بوو بۆ تەواوی خوێندکارانی شاری یەزد. بڕیار وابوو لە کاتی کۆبوونەوەکانی خوێندکاراندا تەنها چا پێشکەش بکرێت. لە کۆبوونەوەی مامۆستایانیشدا کێک و چا پێشکەش بکرێت. چەند جارێک مامۆستایان و خوێندکاران بەیەکەوە کۆدەبوونەوە، لە کۆبوونەوەکاندا تەنها چا پێشکەش دەکرا و بەهیچ جۆرێک باسی سیاسەت نەدەکرا. لەو کاتەدا من لە تاقیگەی گرووپی جوگرافیا کارم دەکرد. ڕۆژانە لە کاتژمێر هەشتی بەیانی تاکو کاتژمێر هەشتی ئێوارە، بەردەوام بووم لە کارکردن، هەندێک ڕۆژیش تاکو کاتژمێر یازدەی شەو دەمامەوە و نەخشەم دەکێشا. من خوێندکارێکی ئاسایی نەبووم، لەلایەکەوە پەیوەندیم بە مامۆستاکانەوە هەبوو، لەلایەکی ترەوە بە خوێندکارانەوە، هەمیشە خۆم بە دوور دەگرت لە وتەی ئاژاوەگێڕی، هەر بۆیەش هەوڵمداوە تاکو هەلێکم بۆ هەڵکەوێت و بڕۆم بۆ گەشت و گەڕان بۆشوێنە جیاجیاکان. مامۆستایانی جوگرافیا دەڕۆیشتن بۆ گەڕان و لێکۆڵینەوەی زانستی، منیش هەوڵم دەدا بە پێی توانا لەو گەشتە زانستییانەدا بەشداری بکەم. چەند جارێک لەگەڵ مامۆستایانی وەکو دکتور عەباسی سەعیدی دوو بە دوو دەچووین بۆ سەردان و لێکۆڵینەوە. چەندین جاریش بە گروپ و لەگەڵ ژمارەیەکی چل کەسی بۆ ماوەی (۱۵-۲۰) ڕۆژ دەڕۆیشتم. لەم باسەدا بەنیازم لەبری یادەوەریی کۆلێژ و زانکۆ یادەوەریی چەند گەشتێک بنووسم، بەڵام لە پێشدا دەمەوێت بە کورتی یادێک لە خوێندکارانی شاری یەزد بکەمەوە و پاشان ئێوە ئاشنا بکەم بە گەشتەکانم بۆ لای کوردە کۆچەرییەکانی باکووری خۆراسان.

جیهان لە یاک باردا ناوەستێت.
شتێک کە دەمێنێتەوە
چیرۆک و سەرگوزەشتەکانە.

لە شاعیرێکی «بلوجی»یەوە

ئەگەر خوێندکاران هەر کارێکیان هەبووایە مامۆستایان و پزیشکانی یەزدی هاوکاریان دەکردن. لەوبارەیەوە دکتۆر محەمەد تەقی سەراف، هەمیشە هاوکاری خوێندکارانی یەزدی و نایەزدییەکانی دەکرد. دکتۆر مەحەمەد تەقی، ئێستا (١٣٩١-٢٠١٢) لە تەمەنی هەشتاوپێنج ساڵیدا نەک تەنها پشتیووانی لە هەموو مامۆستایان و خوێندکارانی یەزدی دەکات، بەڵکو بووە بە پشتیوانیەکی زۆرباش بۆ تەواوی ئەو کەسانەی کە دەیانناسێت و کاریان پێیدەبێت. دکتۆر محەمەد تەقی سەراف شیرازی پیاوێکە پێویستە لە وتە و کار و کردەوەکانیدا شتێکی لێوە فێرببین. من کەسێکم چەندین ساڵ مامۆستای زانکۆ بووم، زۆر شوێنی ئەم جیهانە گەڕاوم، هەر کاتێک دەچمە خزمەتی ئەم پیاوە بەڕێزە، چەند وانەیەکی لێوە فێر دەبم، خودا ئاگاداری بێت و پایەدارتری بکات.

لەو ساڵانەدا ژمارەی کچە خوێندکارانی یەزدی لە زانکۆکان زۆر کەم بوون. خانم میهری ڕەسوڵ زادەگان کە کچە خوشکی عەلی شوکرانە بوو، ئەو لەگەڵ خوێندنی زانکۆدا مامۆستای سەرەتاییش بوو، بە تەواوی ماناوە نموونەی کچە خوێندکارێکی یەزدی بوو. کچێکی شایستە بوو، وانەکانی بەباشی دەخوێند و کاری مامۆستایشی بە جوانی ئەنجام دەدا، لە ناو کۆلێژ و لەدەرەوەی کۆلێژ نموونەی کچێکی بە ئەدەب بوو. خانم میهری ڕەسوڵ زادەگان لە کاتی خوێندکاریدا زەماوەندی لەگەڵ دکتۆر مەنسوری ڕەفیقیدا کرد کە ئەوکات ئەویش خوێندکاری کۆلێژی پزیشکی بوو. دکتۆر مەنسوری ڕەفیقی پاش تەواوکردنی زانکۆ لەگەڵ هاوسەرەکەیدا گەڕانەوە بۆ شاری یەزد. ئەو دکتۆرێکی شارەزا و سەرکەوتووە و مامۆستای زانکۆی پزیشکی یەزدیشە، خزمەتێکی زۆری بەکۆلێژی پزیشکی یەزد کردووە. خانم میهری ڕەسوڵ زادەگانیش مامۆستایەکی سەرکەوتووە، ئێستا (١٣٩٠-٢٠١١) خانەنشینە، لە هەمووی گرنگتر کەسێکی میهرەبان و بەڕێزە.

خانمێکی تری یەزدی ناوی ئەشرەفی نەقیبی بوو، خوێندکاری کۆلێژی ددان بوو. ئەویش کچێکی ئازا و زیرەک و وەرزشکار بوو. من لە ساڵی (١٣٥٠-١٩٧١) تا ئێستا ئەوم نەبینیوە و نازانم لە کوێیە. لە دەیەی ساڵی (١٣٥٠-١٩٧١) لە یەزد تابلۆی نوسینگەکەیم دەبینی. لە ساڵی (١٣٤٨-١٩٦٩) لە هەموو زانکۆی فێردەوسی مەشهەدا تەنها پێنج کچە خوێندکاری خەڵکی یەزد هەبوون. دیارە بە بەراورد لەگەڵ شارەکانی تردا، ئەو پێنج خوێندکارە ژمارەیەکی زۆر بوون. چوار لەو خوێندکارانە بە

تەواوی مانا نموونەی کچە خوێندکار بوون و زۆر بە باشی گرنگیان بە وانەکانیان دەدا و لە خوێندنیشدا سەرکەوتوو بوون، تێکەڵاوی کێشە سیاسیەکان نەدەبوون. باسی خوێندکاری پێنجەم، ئەگەر کرا لە جێگایەکی تردا دەینووسم. ئەو سەردەمە خوێندکارانی یەزدی لە زانکۆی مەشهەد زۆربەیان سەر بە بنەماڵە هەژار و مامناوەندەکان بوون. تەنانەت تەنها یەک خوێندکاریش کە لە بنەماڵەیەکی دەوڵەمەند و ناسراوی یەزد بووبێت لە زانکۆی مەشهەد نەبوو. خوێندکارانی یەزدی چەند کەسێک بەیەکەوە دەژیان، چەند کەسێک بەیەکەوە یا لە بەشی ناوخۆی زانکۆدا یا لە دەرەوە خانوویان بەکرێ گرتبوو. هەمووشیان پشتیوانی یەکتری بوون. شەوانی هەینی لە دەوری یەکتری کۆدەبووینەوە، سەرەتا دەڕۆیشتین بۆ زیارەتی ئیمام ڕەزا و پاشان دەچووین بۆ سینەما. ئەگەر هەوا خۆش بوایە و تاقیکردنەوەمان نەبوایە بە کۆمەڵ دەچووین بۆ تەرەبەقە، جاغرەق، ئەخلەمەد و فەریمان. فەرهەنگی خوێندکاری و یەزدیەتی لە نەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکی تر دەگوازرێتەوە. بە گشتی نووسینی حساب و خەرجیمان زۆر تەواو بوو. کاتیک لە نووسینی حساب تەواو و بێفێڵ بوو خۆشەویستی و هاوڕێیەتیشی بەرەو پێش دەچێت. یەکەمین جار کە بە کۆمەڵ چووین بۆ زیارەتی ئیمام ڕەزا، حسێن گورجی حسابداری خەرجیکردن بوو، ئەو لە حسابەکەیدا زۆر ورد بوو، تەنانەت نەیدەهێشت دە شایش بە فیڕۆ بڕوات و دەینووسی. من لەدڵی خۆمدا دەمگوت کەسێکی چەند سەختگیرە. پاشان زانیم کەسێکی سەر ڕاستە و دڵسۆزی هاوڕێکانیەتی. حسێن گورجی کوڕی ئاغا غولام ڕەزای گورجی سەعاتسازە، سەر بە بنەماڵەی گەورەی گورجیەکانی یەزدە، ئەو تەنها خوشکێکی هەیە کە لەگەڵ حسێندا دووانە بوون، خوشکەکەشی هاوسەری سەرهەنگ فەرید بوو. سەرهەنگ فەرید یەکێک بوو لە ئەفسەرە چالاکەکانی سوپای ئێران. ئەگەر بە هەڵەدا نەچووبم وا بزانم ماوەیەک لێپرسراوی هێزەکەی حسێن فرەدۆست بوو. بە گشتی بنەماڵەی گورجیەکانی یەزد کەسانێکی سەرڕاست و ڕاستگۆن. خەڵکانێکی دڵسۆز و بەڕێزن زۆربەی زۆریان خەریکی کاری بازرگانی و کاری کارگە و پیشەسازیین. لە دەیەی (١٣٢٠-١٣٣٠=١٩٤١-١٩٥١) کاری سەعاتسازیی کارێکی گرنگ و وردەکار بوو، ئێستاش ئەو کارە هەر هەیە. ئاغا غولام ڕەزای گورجی سەعاتسازێکی بەناوبانگی یەزد بوو. حسێن گورجی زۆر زوو دایکی مرد بوو، پێش ئەوەی بچێت بۆ زانکۆ باوکیشی مرد بوو. ئەم حسێن گورجیە لە پێش شۆڕشەوە لە وڵاتی بریتانیا دادەنیشێت. ئەو نموونەی پیاوێکی بەڕێز و دڵسۆزی یەزدیە. ئێستاش ساڵی (١٣٩١-٢٠١٢) پاش سیوپێنج ساڵ نیشتەجێبوونی لە وڵاتی بریتانیادا جوانی و باوەڕی خۆی

لەدەست نەداوە، ئەو هەرگیز وشەیەکی درۆی بەزماندا نەهاتووە، دڵسۆزی هەمووانە و هاوکاری هەموو کەسێک دەکات. لەو سەردەمەدا کە خوێندکاری زمانی ئینگلیزی بوو. لەگەڵ خوێندکاران و مامۆستایانی زمانی ئینگلیزی پەیوەندییەکی باشی هەبوو. ئەو زۆر بەڕێز و خۆشەویست بوو، دوور بوو لە هەموو خوویەکی نەشیاو و ناشرین، هەمیشە و بە بەردەوامی وانەی زمانی ئینگلیزی بە هاوڕێکانی دەگوتەوە بەبێ ئەوەی یەک ڕیاڵ لە هیچ کەسێک وەربگرێت. منیش لە خوێندنی وانەی ئینگلیزیدا کێشەم هەبوو، ئەوەندە وانەی پێگوتمەوە و خۆی لەگەڵمدا ماندوو کرد تاکو لە ئینگلیزیدا بیست نمرەم وەرگرت. بۆ وانە خوێندن دەچوومەماڵیان، چا و میوەشم دەخوارد، ئەو تەنها یەک ڕیاڵی لێ وەرنەگرتووم. ڕۆژی (١٤-٣-١٣٩١=٤-٦-٢٠١٢) تەلەفۆنم بۆ کرد بۆ وڵاتی بریتانیا و لە هەواڵیم پرسی ئەو کاتە نۆ هەفتە بوو نەشتەرگەریی دڵی بۆ کرا بوو. چوار دەماری دڵی گۆڕی بوو، خودا سەلامەت و تەمەن درێژی بکات.
ژمارەیەک لە خوێندکارە یەزدییەکانی مەشهەد پێشتر مامۆستا بوون. ئاغای فەتحی خوێندکاری بەشی مێژوو بوو، بە ماڵەوە هاتبوو بۆ مەشهەد، ئەو پیاوێکی باش بوو، بەڵام فشە و درۆی گەورەی زۆر دەکرد، قسەی ناڕاستی زۆر دەکرد. بۆ نموونە دەیگوت ڕۆژێک لە شەقامی لالەزاری تاراندا پیاسەم دەکرد، گوێم لێبوو کەسێک لە ئۆتۆمبێلێکدا بانگی دەکرد فەتحی گیان، فەتحی گیان، کە سەیرم کرد شاپووری غولام ڕەزا بوو. شاپوور گوتی فەتحی گیان وەرە با بفڕین و بچین بۆ ڕاو. پاشان باسی چۆنێتی ڕاوکردنەکەی بۆ دەکردین. یا دەیگوت لەگەڵ باوکی خێزانەکەمدا کە سەرۆکی دادگایە و یەکێکە لە پیاوە گەورەکانی خۆزستان، بە یەکەوە چووینە ناو دەریا و سواری کەشتی بووین، لە ناکاو گوێمان لە دەنگی تۆپ و دۆشکە بوو. باوکی خێزانم بە خێرایی دابەزی لەگەڵ دابەزینی ئەودا بیستویەک گوللە تۆپ کەوتنە ناو کەشتیەکەوە. ئێمەش لێی کۆدەبووینەوە و دەمانگوت ئاغای فەتحی بەسەرهاتی ڕاوکردنەکەت لەگەڵ شاپوور یان داستانێکی ترمان بۆ بگێڕەرەوە. حسێن گورجی دەیگوت ئاغا فەتحی ئەم جۆرە قسانە مەکە، شتێکی ناشرینە. هەروەها بە ئێمەشی دەگوت تکایە ئەم پرسیارانە لە فەتحی مەکەن. حسێن گورجی تەنانەت حەزی بەشۆخی کردنی درۆش نەدەکرد.
خوێندکارە یەزدییەکان دووربوون لە مەی خواردنەوە. من چوار ساڵ خوێندکار بووم، پێش ڕۆیشتنم بۆ فەرەنسا پێنج ساڵیش لە کۆلێژ کارمکردووە. لەگەڵ خوێندکاراندا زۆر تێکەڵ بووم، لە ماوەی نۆ ساڵدا تەنها دوو خوێندکاری خەڵکی یەزد بوون بە تلیاک کێش. هەرچەندە لەو کاتەدا خواردنەوەی مەی لە ناو خوێندکارەکاندا زۆر ئاسایی بوو.

زۆربەی خوێندکارەکانی یەزدی کەسانی بە دین و نوێژکەر بوون، هەرگیز لە کاری بەد و درۆ نزیک نەدەبوونەوە. دیارە گەنجە یەزدییەکانیش وەکو هەموو گەنجەکانی تری ئەو سەردەمە مارەبڕینی کاتیی (سیغە) یان دەکرد. کەسانێک هەبوون ژنیان بۆ پیاوان دەدۆزییەوە. زیاتر ئەو کەسانە لە چایخانەیەکدا دادەنیشتن. چایخانەیەک هەبوو لە مەیدانی سێهەمی ئەسفەند. حاجی ئیبراهیم پیاوێکی تەمەن (٥٥-٦٠) ساڵ بوو، بە کڵاوی سوور و جلوبەرگی مەلاوە بە ڕیشێکی درێژەوە خەریکی کاری دەڵاڵی بوو، هەر کەسێک حەزی بە زەماوەندی کاتیی بکردایە ئەوا حاجی ئیبراهیم خۆی کارەکەی بۆ جێبەجێ دەکرد و بەڵێننامەکەشی بۆ دەنووسین. ئەو کاتە کەس کاری بەسەر کەسەوە نەبوو، ئەگەر لە یەک خانوودا چوار کەس بژیایە و سێ کەسیان ژنی کاتییان بهێنایە و یەکێکیان نەیهێنایە، هیچ گرفتێک ڕووی نەدەدا، یا گەنجەکان لە کاتی بێکاریدا یاری کاغەزێنیان دەکرد، دیارە یارییەکەیان لەسەر هیچ بوو، تەنها بۆ خۆشی دەیانکرد. کوڕانی یەزدی حەزیان بە قومارکردن لەسەر پارە نەبوو، بەڵکو یاریکردنەکەیان تەنها بۆ خۆشی بوو. جگە لە چەند خوێندکارێک، ئەوانی تر هەمیشە کێشەی بێ پارەییان هەبوو، من ئێستا چیرۆکی کار پەیداکردنی خۆم و نەبوونی دوو هاوڕێم دەنووسم.

من لە ڕووی بێ پارەییەوە لە ژێر فشاردا بووم. ئەو کەمە پارەیەی کە هەمبوو دابووم بە کوڕە مامەکەم، مانگانە دەچووم بۆ گەراجی ئیتیفاقی یەزدییەکان لە مەشهەد بڕی (١٥٠تا٢٠٠) تومەنم لە گەراج وەردەگرت و پسوڵەم بۆ ئیمزا دەکردن و پسوڵەکەیان دەناردەوە بۆ یەزد. هەر بۆیەش دەبوو کارێک پەیدا بکەم، نەمدەزانی دەبێت چیبکەم. لە ساڵی یەکەمی خوێندندا پەنجا خوێندکاری جوگرافیا لە یەک پۆلدا بەیەکەوە بووین. ساڵی (١٣٤٧-١٩٦٨) یەکەم ساڵ بوو کە بەشی جوگرافیا بوو بە دوو بەش، جوگرافیای مرۆیی و جوگرافیای سروشتی. بڕیار وا بوو خوێندکاران بۆ زانینی زانیاری لەسەر هەردوو بەشەکە لە پۆلدا ئامادەبن. خودالێخۆشبوو دکتۆر لوتفوڵڵای مەفخەم پایان، بە ناونیشانی ئاشناکردنی خوێندکاران لەسەر هەردوو بەشەکە هاتە پۆلەوە. دکتۆر پایان پیاوێکی زۆر چالاک و گورجوگۆڵ بوو، لە هەمان کاتدا توند و بێمنەت بوو، ئەو دەستیکرد بە باسکردن و جیاوازی هەردوو بەشەکەی جوگرافیای مرۆیی و سروشتی. فەرمووی خوێندکارێک کە دەستوخەتی جوان بێت، با هەڵسێت بۆ سەر تەختەڕەش، ئەو داواکاریانەی من باسیان دەکەم، ئەو بیاننووسێت. من لەلای زیائی مەلیک زادەوە دانیشتبووم، زیائی مەلیک زادە دەستوخەتی زۆر جوان بوو، بەڵام کەسێکی شەرمن بوو. من ئانیشکێکم لێدا تاکو هەڵسێت بۆ سەر تەختەڕەش. مامۆستا لوتفوڵڵای مەفخەم پایان

جووڵانەوەکەی منی بینی، لێیپرسیم تۆ ناوت چیە؟ گوتم پاپۆلی. گوتی پاپۆلی مانای چیە؟ گوتم پاپۆلی واتە پەپوولە. ئەویش گوتی وەک و پەپوولە باڵەکانت لەیەک مەدە. منیش یەکێک لە بەشەکانم دەستنیشانکرد، ئەو بەشەی من دەستنیشانم کرد. دکتۆر لوتفەڵڵا کەمتر وانەی تیا دەگوتەوە. دیارە من بەشی جوگرافیای مرۆییم هەڵبژارد، بۆیە ڕاستەوخۆ من وانەی دکتۆر لوتفوڵڵام نەبوو، بەڵام چارەنووس ئەوە بوو کە بەڕێزیان لە ژیانی مندا دەورێکی جوان و باشیان هەبوو. دکتۆر لوتفوڵڵا لە خولی خوێندکاراندا سوودێکی باشی بە من گەیاندووە، چەندین جار منی بانگهێشتی ماڵی خۆیان کردووە و چەندین جار جووڵەی زەوی و تەنە ئاسمانییەکانی بۆ باسکردووم. خۆ ئەگەر هەوڵ و پشتیوانی ئەو نەبوایە، ڕێگەم پێنەدەدرا لە ساڵی (١٣٥٠-١٩٧١) دەورەی سەربازییەکەم لە زانکۆی مەشهەد تەواو بکەم. حەسەن ئاغا حوسنی و زیائی مەلیک زادەش لەگەڵ مندا هاتن بۆ بەشی جوگرافیای مرۆیی، من لەگەڵ ئەم دوو بەڕێزەدا لە پۆلی دە تا وەرگرتنی بەکالۆریۆس بۆ ماوەی حەوت ساڵ هاوپۆل بووم. لە پەنجا خوێندکار سیوهەشت خوێندکار چوون بۆ بەشی جوگرافیای سروشتی، تەنها دوازدە خوێندکار چووین بۆ بەشی جوگرافیای مرۆیی، لەو دوانزە خوێندکارە چوار خوێندکاریان کچ بوون، لەو دوازدە خوێندکارە شەش خوێندکار مامۆستای سەرەتایی بوون. یەکێکیش کارمەندی هێلگۆڕکێ بوو.

لە پۆلەکەماندا من تەنها خوێندکار بووم کە نە کەسێک پارەی بۆ دەناردم و نە مامۆستاش بووم، ئەو پارەیەش کە لە کوڕە مامەکەم وەردەگرت، پارەی ماڵی خۆمان بوو، بڕەکەشی دیاریکراو بوو، هەر بۆیە دەبوو خودا پارەیەکم بۆ بنێرێت، بەڵام دەکرێت خودا پارە بنێرێت؟ خودا کارسازە، بەڵام پارەت بۆ ناکاتە زەمیلەوە، لە ئاسمانیشەوە بۆتی نابارێنێت. ساڵی یەکەمی زانکۆم هەر چۆنێک بوو تەواوکرد. ساڵی دووەم هەوڵمدا و گوتم خودایە پارەیەکم بۆ بنێریت و خۆیشم ئامادەکرد بوو بۆ کارێک، ئەگەر دەستمبکەوێت. دەبوو هەر چۆنێک بێت کارێک بکەم. ئەو پەندەش لە مێشکمدا بوو کە دەڵێت لە تۆ حەرەکەت لە خودا بەرەکەت، هەر چەندە بە دوای کاردا دەگەڕام، بەڵام نەمدەزانی لە کوێ بەدوای کاردا بگەڕێم. من بڕیارم دابوو کاربکەم، بە خودای خۆمم گوت کار و پارە بنێرێت. بە خودای خۆمم گوت تەنها خۆت دەزانیت.

یەکەمین وانەی نەخشەکێشان بوو. خانم دکتۆر زیبای خورسەند، مامۆستایەکی زۆر جدی و زۆر میهرەبان بوو. ئەو خوێندکاری دکتۆر لوتفوڵای مەفخەم پایان بوو، مامۆستای وانەی نەخشەکێشان و پێناسینی وڵاتان بوو. لە ناو پۆلدا گوتی من پێویستم

بە کەسێکە کارەکانی تاقیگەی جوگرافیا و نەخشەکێشان ئەنجام بدات. ئاغا ڕەزا کە لە پۆلەکەماندا لە هەمووان گەورەتر بوو گوتی ئاغای پاپۆلی بۆ ئەم کارە کەسێکی باش و شیاوە. مامۆستا و تەواوی خوێندکارەکان پێشنیارەکەی ئەویان قبوڵکرد. ئەو پێناسینەی هاوڕێکانم لەو ڕۆژەدا چارەنووسی منی گۆڕی، ئیتر من بوومە هاوکارێکی باشی خانم دکتور زیبای خورسەند لە کاری نەخشەکێشاندا، مووچەیەکی بۆ بڕیمەوە بە بڕی دوازدە ڕیاڵ و نیو بۆ یەک کاتژمێر. پاش مانگێک کارکردن، دکتور زیبای خورسەند کارەکانی منی بەرز نرخاند و بڕیاری دا کرێی کارکردنم بەرز بکاتەوە بۆ کاتژمێری بیست‌وپێنج ڕیاڵ. منیش ڕۆژانە کاتژمێر هەشت بەیانی دەڕۆیشتم بۆ کۆلێژ تا کاتژمێر (١٠-١١) ی شەو دەمامەوە. یەکەمین مووچە کە وەرمگرت مانگی (١٩٠) تومەن بوو. واتە یەکەم جار کە پارەم لە حکومەت وەرگرتووە لە مانگی (مهری١٣٤٧-ت یەکەم ١٩٦٨) بوو، بڕەکەشی (١٩٠) تومەن بوو. دوای ئەوەی لە پۆل دەهاتمە دەرەوە یەکڕاست دەچووم بۆ ژووری تاقیگە. لە مانگی سێهەمدا تەواوی کەلوپەلەکانی تاقیگەیان بە من سپارد و کلیلی ژووری تاقیگەیان دایەدەست من. پەیوەندیم لەگەڵ تەواوی مامۆستاکاندا زۆرباش بوو، بۆ هەموو وانەکان نەخشەم ئامادە دەکرد. واتە نەخشەی تایبەتم بە هەر وانەیەم دەکێشا و چاپیشم دەکرد. هەرچەندە من وانەی دکتۆر لوتفوڵلام نەبوو، بەڵام ئەو وەک لێپرسراوی یەکەمی کۆلێژ لە کارەکانم ڕازی بوو. خۆم زۆر حەزم لە گەشت و گەڕان بوو، کارکردنم لە تاقیگەدا بوو بە هۆی ئەوەی کە زیاتر بتوانم بەشداری بکەم لە گەشتە زانستییەکان لەگەل مامۆستایاندا. کاتێک ویستم لە گەشتە زانستییەکاندا بەشداری بکەم، داوای مۆڵەتم لە دکتۆر لوتفوڵلای مەفخەم پایان دەکرد، ئەویش مۆڵەتی پێدەدام و مۆڵەتی بردنی (قیبلە نوما، بەرزیپێو، گەرمیپێو، نەخشە) ی پێدەدام. ڕازیبوونی دکتۆر لوتفوڵلا لە کارەکانم بوو بە هۆی ئەوەی دوای وەرگرتنی بەکالۆریۆس خزمەتی سەربازییەکەم هەر لە زانکۆ بکەم. خودا کاری نارد و کارئاسانی سەربازیشم بۆ کرا. خۆ ئەگەر کار پەیدا نەبووایە بە ڕاستی تووشی بێ پارەیی دەبووم.

دایکیشم لە ساڵی (١٣٤٨-١٩٦٩) بـەدوواوە هات بۆ مەشهەد. ژوورێکمان لە ماڵێکدا بەکرێگرت لە شەقامی کەفاش شەقامی (شاهروخ) واتا شەقامی موتەهەری ئێستا. خاوەنی خانووەکە ناوی فەرەنگیس خانم بوو. خانووەکە مامۆستایەک ئیجارەی کردبوو ناوی پەرویزی ڕەزەوی بوو، خەڵکی تـاران بوو، ئەو پیاوە مامۆستایەکی بەڕێز بوو لە هەمان کاتدا خوێندکاری زانکۆش بوو، ژنێک و سێ منداڵی هەبوو، منداڵەکانی ناویان ڕەزا، فەرهاد، فەریدە بوو. خێزانەکەشی ژنێکی زۆر بەڕێز بوو.

ئەوان لە دوو ژووردا بوون و من و دایکیشم لە ژوورێکدا بووین. ماوەی سێ ساڵ لەو خانووەدا بەیەکەوە بووین. من هەرگیز لە ئەوانم نەپرسی خانووەکەیان بە چەند بە کرێگرتووە. چیرۆکی ئەوخانووە و دراوسێکان، هاوڕێیانی دایکم، وانە خوێندنی دایکم، نەخۆشی و نەشتەرگەریی دایکم، داواکردن لە من بۆ ژنهێنان لە شوێنێکی تردا دەنووسم. ژنانی دراوسێ کاتێک زانیان من خەڵکی شاری یەزدم و خوێندکاری زانکۆم، لە زانکۆش کارێکم هەیە، پێشنیاریان بۆ دایکم کرد کە کچێکی ئەوان مارە بکەم. کچێکی باشیان بۆ دەستنیشانکردم، بەڵام من کاتی ژنهێنانم نەبوو. ژنێکی دراوسێمان هاتوو داوای لێکردم کە کچەکەیان بخوازم. واتە ئەوان بۆ داواکاری من هاتبوون بۆ کچەکەیان. هەروەها فەرەنگیس خانمیش داوای منی کرد بۆ کچەکەی، بەڵام کچەکەی گوتبووی من هاوسەرێکی باشترم دەوێت. دایکی کچەش بە کچەکەی گوتبوو ئێستا تۆ شوو بکە و شووکردنەکەت دووا مەخە تاکو لە کاتێکی تردا هاوسەرێکی باشترت بۆ دەدۆزمەوە. فەرەنگیس خانم خۆی سێ شووی کردبوو. مێردی یەکەمی ناوی ئەسغەر ئاغا بوو پیشەی شوفێری بوو، ئەو کچەشی لە مێردی یەکەمی بوو، مێردی دووەمیشی ناوی ئاغا جەلال بوو، نووسینگەی کڕین و فرۆشتنی خانوو و زەوی هەبوو، مێردی سێهەمی پزیشکێکی بەناوبانگی مێشک و دەروونیی بوو. فەرەنگیز خانم شەوێکیان من و دایکم و ماڵی ئاغای ڕەزەوی بانگهێشتی ماڵی خۆیان کرد. کاتێک ئێمە چووین هەرسێ مێردەکەی لەوێ ئامادە بوون. فەرەنگیس خانم فەرمانی دەکرد بەسەریاندا و دەیگوت ئەسغەر ئاغا پارە لە دکتور وەربگرە و بڕۆ خانووی شەقامی کوهسەنگی چاک بکەرەوە. ئاغا جەلال تۆش بڕۆ بۆ هەمان خانوو ئەو کارانەی پەیوەندیان بە ئاو و کارەبا و تەلەفۆنەوە هەیە چاکیان بکە. ئەو ژنە هەرسێ مێردەکەی لە یەک ژووردا بەیەکەوە کۆکردبووەوە، فەرمانی بەسەر هەرسێکیاندا دەکرد. دیارە فەرەنگیس خانم زۆر جوان و شۆخوشەنگ بوو. کارێکی نەدەکرد دژی ئایین و شەرع بێت، بەڵام کاری دژی دابونەریت دەکرد. بەهەر حاڵ ئەو ژنەی منی بە ناونیشانی هاوسەری کاتی بۆ کچەکەی دەستنیشان کرد بوو، دەیویست کچەکەی نەبێتە قەیرە و پیاوێکی باشی بۆ پەیدا بکات. واتە دەیویست خۆی چ کارێکی کردووە کچەکەشی هەمان کار بکات. من کاتی ژنهێنانم نەبوو، هەروەها زانیبووم کە فەرەنگیس خانم چی بە کچەکەی گوتبوو. هەر بۆیەش حەزم نەدەچووە سەر ئەو کچە. هەر چەندە کچە جوانیش بوو، تەمەنیشی (١٧-١٨) ساڵ زیاتر نەبوو. ئەوان دەیانویست من هاوسەرێکی کاتیی بم، تاکو هەلێکی باشیان بۆهەڵدەکەوێت و هاوسەرێکی باشتریان دەستدەکەویت. ژنە دراوسێکەی ترمان

کە هاتبوو بۆ داخوازیی من بۆ کچەکەی، ئەویش خۆی دوو شووی کردبوو. یەکەمجار هاوسەری کارمەندی فەرمانگەیەک بوو، پاشان وازی لە کارمەندەکە هێنا بوو، شووی بە بەڕێوبەری هەمان فەرمانگە کردبوو.

ئیمە باسی ساڵەکانی (١٣٤٧-١٣٤٨= ١٩٦٨-١٩٦٩) دەکەین. کاتیک دایکم هات بۆ مەشهەد من پەیوەندییەکانم لەگەڵ هاوڕێ یەزدییەکانمدا نەپچڕا، شەوانە لەلای خوێندکارە یەزدییەکانی هاوڕێم بووم. ئێمەی خوێندکارانی یەزدی لە یەکتری دانەدەبڕاین و هەمیشە لە هەواڵی یەکتری ئاگادار بووین، بەڵام لە سیاسەت بێئاگابووین. ئێمە ئەو(٤٠-٥٠) خوێندکارە یەزدییەی زانکۆی مەشهەدی ساڵانی (١٣٤٦-١٣٥٠=١٩٦٧-١٩٧١) لایەنگری هیچ لایەنێک نەبووین و هیچ کەسێکمان حەزمان بە سیاسەت نەدەکرد. ڕۆژانە وانەکانی خۆمان دەخوێند و کارمان دەکرد. ئێستا دوو یادەوەریی کورت لە بارەی دوو هاوڕێمەوە دەنووسم و پاشان دەڕۆم بەرەو دەشتودەر، بەرەو لای کوردە کۆچەرییەکانی باکووری خۆراسان.

## ئومێد

ڕۆژانی هەینی، زۆربەی خوێندکارانی خەڵکی یەزد لەلای یەکتری کۆدەبووینەوەو هەر بەیەکەوە نانی نیوەڕۆمان دەخوارد، کارەکانمان لەنێوان خۆماندا دابەشدەکرد، یەکێک دیاری دەکرا بۆ نانکڕین، یەکێک بۆ چێشتلێنان، یەکێکی تر بۆ کڕینی سەوزە و میوە، بەیەکەوە دادەنیشتین و مەتەڵمان دادەهێنا و گرەومان دەکرد لە سەرشتی پڕوپوچ.

لەناکاو بانگیان دەکرد نانی نیوەڕۆ ئامادەیە. کەسانێک کە لێپرسراوی ئامادەکردنی خواردن بوون، خوانیان دەڕازاندەوە و تێکڕای خواردن و سەوزە و ماست و ترشیات و پێویستییەکانی تریان ئامادە دەکرد. بۆنی خۆشی خواردن لەگەڵ بۆنی خۆشەویستی هاوڕێیەتی تێکەڵ دەبوون. یەکێک لە باشییەکانی ئەم کۆبونەوانەی ڕۆژانی هەینی ئەوە بوو کە هەموو هاوڕێیان و هاوشاریان لە هەواڵی یەکتری ئاگاداردەبووین، ئەگەر هاوڕێیەکمان نەهاتبایە بەهۆی یەکترییەوە دەمانزانی ئەو هاوڕێیەمان لەکوێیە؟ ئەوکات نە مۆبایل هەبوو نە تەلەفۆن، سەردەمی پەیوەندییە ئەلکترۆنییەکان نەبوو، بەڵکو سەردەمی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان بوو. بەڵام ئومێد بە تەنها دەمایەوە و تێکەڵاوی ئێمە نەدەبوو. ئومێد خوێندکاری کۆلێژی پزیشکی ددان بوو، باڵایەکی مامناوەندی هەبوو، دەموچاوی سپی و کەم گۆشتبوو، چاوە گەورەکانی بێ ڕووناکی

دەردەکەوتن.. برژانگەکانی درێژ و خەدەنگی بوون، برۆکانیشی کەمانی بوون، کەسێکی دەم بە پێکەنین بوو، هەندێک کات خەم بەڕوویەوە دیاربوو. جارجارێک هاوڕێیان سەریان دەکردەسەری، ئەویش کەمتر تێکەڵاوی هاوڕێکانی دەکرد. زستانی ساڵی (١٣٤٩-١٩٧٠) بوو، ئومێد چەند جارێک داوای لێکردم پارەی بە قەرز پێبدەم. هەندێک جار بڕی پەنجا تومەنی لێوەردەگرتم. من پەیوەندییەکی تایبەتیم لەگەڵیدا هەبوو، وا هەستمدەکرد کێشەیەکی هەبێت، کێشەیەک کە نەیدەویست هاوڕێکانی و دەوروبەری بیزانن. زۆریش تێکەڵاوی نەدەکرین، هۆکەشی بۆ ئەوە دەگێڕایەوە کە وانەکانی زۆرترن و فریای خوێندن ناکەوێت، ئەو تاکە خوێندکاری شاری یەزد بوو کە بە تەنها بۆ خۆی لە گەڕەکی ئەحمەدئابادی مەشهەد ژوورێکی بەکرێ گرتبوو. ئەو کاتە لە گەڕەکی ئەحمەدئاباد دا هێشتا خانوو لەسەر شێوازی گوند زۆر بوون، گەڕەکەکە لە کاتی گۆڕانکاریدا بوو. لە گۆشەیەکی گەڕەکەکەدا تازە خەریکی دروستکردنی ئوتێل هایت (هودا) بوون. گەڕەکەکە لە سەردەمی نوێسازیدا بوو، بەڵام هێشتا خانوی کۆن و لە خشت دروستکراوی لەسەر شێوازی گوندەکان زۆر بوو. ئومێد لە خانوویەکی کۆندا لە ژوورێکی لە خشت دروستکراودا بوو. من دەمزانی لەچ خانوویەکدا دەژی، بەڵام هەرگیز نەچووبوومە نێو خانوو و ژوورەکەیەوە. ئێمە شەوانی هەینی دەچووین بۆ مەرقەدی ئیمام ڕەزا، ئومێدیش لەگەڵماندا دەهات کاتێک دەمانویست بچین بۆ سینەما، ئەو خوداحافیزیی دەکرد و دەگەڕایەوە بۆ ژوورەکەی خۆی، بە بەهانەی خوێندنی وانەکانی.

لە دەوری فولکەی ئەحمەدئابادی مەشهەد لە سەرەتای شەقامێک کە دوای شۆڕش ناویاننا شەقامی تاڵەقانی دوکانێکی بچکۆلانەی جگەر برژاندن هەبوو، ئێستاش ساڵی (١٣٩١-٢٠١٢) ئەو دوکانە هەرماوە و هێشتا لەگەڵ ئەوسادا جیاوازییەکی وای نییە. تەنها جیاوازییەک کە هەبێت ئەوەیە ئێستا بەفرگرێکی بچوکی تێدایە. خاوەنی دوکانەکە سێ پشتە لێرەدا جگەری برژاو دەفرۆشن. ئایا ئەو دوکانە بەپشتی چوارەمیش دەگات یان نا؟ بەدرێژایی سێ پشت دوکانەکە هیچ گەورە نەبووە، هەمان جگەریان هەیە و بەهەمان شیشەوە. پەندێکی مەشهەدی هەیە دەڵێت (هەمان چێشت و هەمان کاسە). من چەند جارێک لەوێوە تێپەڕیوم و ئێستاش بەوێدا دەڕۆم، خۆم دەعوەتی چەندشیش جگەر دەکەم.

ناوەڕاستی هەفتە بوو دەوروبەری کاتژمێر هەشتی شەو بوو، بە لای جگەرخانەکەدا تێپەریم و حەزم چووە سەر جگەر، کاتێک چوومە نێو دوکانەکەوە، بینیم ئومێد لەوێ

بوو جگەری دەکڕی، گونیەیەکیشی بەدەستەوە بوو، کاتێک من چوومە ناو دوکانەکەوە خاوەن دوکانەکە شیشێک جگەری خستە نێو لەتێک نانەوە و دایەدەست ئومێد. ئومێدیش خوداحافیزیی لە خاوەن دوکانەکە کرد. کاتێک ڕووی وەرگێڕا منی بینی، بەڵام لە ڕوویدا دیاربوو بە بینینی من خۆشحاڵ نەبوو، تەنها گوتی کارێکت نییە و ڕۆیشت. منیش لەدوای ئەو چوار شیش جگەرم کڕی، خاوەن دوکانەکە خەریکی باوەشێنی جگەری سەر ئاگرەکەبوو، گوتی ئەوبرادەرەی ڕۆیشت هاوشاری تۆیە! گوتم بەڵێ، گوتی دیارە هاوشاری تۆیە. گوتم تۆ بەچیدا دەزانی کە هاوشانی منە؟ گوتی بەشێوازی قسەکردنتاندا هەردوکتان بەشێوازێکی خەستی یەزدی قسەدەکەن، جگەرفرۆشەکە گوتی دوو ساڵە ئەم هاوشارییەی تۆ هەفتەی دوو سێ جار لەم کاتەدا دێت و تەنها یەک شیش جگەر دەکڕێت، یەک شیش جگەری بۆ دەکەمە چارەکە نانێکەوە و پێیدەدەم و دەڕوات. ئەو هەرگیز ڕێکنەکەوتووە دووشیش بەسەر یەکەوە بکڕێت، ئەو کوڕە زۆر دەستگرەوەیە، من تەنها ئەوە بەبیرمدا هات کە ڕەنگە هۆکاری دورە پەرێزی ئومێد لە تەواوی هاوڕێکانی بەهۆی نەبوونی و بێ پارەییەوە بێت.

ئەو شەوە ئومێد ڕۆیشت. پاش دوو شەوی تر چوومە بەردەرگای ماڵەکەیان، لەدەرگام دا و پیاوی خاوەن ماڵەکە، کە جلوبەرگێکی لادێیی لەبەردابوو، دەرگاکەی لێکردمەوە و گوتم کارم بەئومێد هەیە. گوتی ئومێد وا لە ژوورەکەی خۆیەتی، بانگی کرد، گوتی ئومێد وەرە خوارەوە کەسێک هاتووە و کاری بە تۆ هەیە. پیاوەکە ڕۆیشتە ژوورەکەی خۆیان و ئومێدیش هاتە دەرەوە و گوتی ئەوە تۆیت، خێرە بەم شەوە هاتوویت بۆ لای من؟ بێئەوەی خوڵقم بکات یەکسەر چوومە حەوشەکەوە، ڕاڕەوێکی تەنگ و تاریک بوو. گڵۆپێک لە ڕاڕەوەکەوە دیاربوو بەبێ ئەوەی گڵۆپەکە هەڵبکات، گوتم لێرەوە تێپەڕیم، ویستم لە هەواڵت بپرسم، ئەویش هیچ فەرمووی لێنەکردم و گوتی من لە شوێنێک هەندێک کارم هەیە، دەمەوێت ئێستا بڕۆم. منیش کە چووبوومە حەوشەکەوە، گوتم بەیەکەوە دەڕۆین. لە لایەکی حەوشەکەوە مانگایەک و گوێدرێژێک بەسترابوونەوە. حەوشەکە بەتەواوی حەوشەیەکی لادێیانە بوو، حەوشەیەکی بچووک و تاریک بوو، نە حەوزێ ئاوی تێدابوو، نە باخچەیەک، خانووەکە بریتی بوو لە چەند ژوورێکی بچووکی لەناویەکدا و پەنجەرەشی تێدا نەبوو. ئومێد ڕامابوو، نەیدەزانی من بەرێتە ژوورەکەی خۆی یان نا. گوتی پەلەمەکە با جلوبەرگەکانم لەبەربکەم، ئەو کات بەیەکەوە دەچینە دەرەوە. بەبێ ئەوەی چاوەڕوانی وەڵامی من بکات ڕۆیشتە ژوورەوە، ژوورێک کە لە حەوشەکە باشتر نەبوو بە سێ پلیکانە سەرکەوت بۆ ژوورەوە، کاتێک

ئومێد چووە ژوورەوە، منیش بەبێ ئەوەی چاوەڕوانی فەرمووی ئەو بکەم بەدوایدا چوومە ژوورەوە. هەژاری بە نێو ژوور و ماڵەکەیەوە دیاربوو، ژوورەکەی نیوە تاریک بوو، بەقوڕ سواخ درابوو، ناو ژوورەکە تەڕ و شێدار بوو، ژوورەکە ژووری تەواو نەبوو بەڵکو عەمبار بوو نزیکەی (٢X٢) مەتر دەبوو، تەنها نیوەی ژوورەکە ڕاخەری تێدابوو. تەباخێکی دوو فتیلەیی و قابلەمەیەکی بچووک و کتری و قۆری و پیاڵەی لێبوو، لەگەڵ یەک دەست نوێنی کۆنی بێکەڵک. نزیکەی بیست بەرگ کتێب لەگۆشەیەکەوە هەڵچنرابوون، لە گۆشەیەکی ترەوە گونیەیەکی گەورە هەبوو، پڕپڕ بوو لە شت، لەگەڵ دوو سێ گونیەی بەتاڵ. پاچ و خاکەنازێکیش لەلایەکەوە دانرا بوون، چەند دانە بزمارێکیش بەدیوارەکەدا داکوترا بوون و جلوبەرگەکانی پێدا هەڵواسی بوون. ژوورەکە پەنجەرەی تێدانەبوو، ڕووناکی و هەوا لە هەمان دەرگاوە دەهاتەژوورەوە. بەبێ هیچ خوڵقێک لەسەر ڕاخەرەکە دانیشتم و پشتم بەنوێنەکانەوەدا، گوتم خێرا جلەکانت لەبەربکە و بابڕۆین. گوتی تازە وەک هاتویتە ژوورەوە دانیشە با، بەیەکەوە چایەک بخۆینەوە. گوتم زۆر باشە کەواتە بەخێرایی چایەک لێبنێ. کترییەکەی هەڵگرت و ڕۆیشت لە بۆریی ئاوەکەی حەوشە پڕی کرد و تەباخە دوو فتیلەییەکەی داگیرساند و کترییەکەی خستە سەر. چەند ساڵێک بوو تەباخی نەوتی فتیلەیم نەبینی بوو. تا ئێمە هەندێک قسە و باسمان کرد چایەکەش پێگەیشت، تەنها یەک پیاڵەی هەبوو چایەکی بۆ من تێکرد و خۆیشی چای لە شووشەیەکی بەتاڵی مرەبادا خواردەوە. لەکاتی چاخواردنەوەدا لێم پرسی ئەم قوڵنگ و پاچ و خاکەنازە چین لە ژوورەکەتدا، گوتی هی خاوەن ماڵەکەیە و لێرە جێیهێشتوون. ئەو شەوەی کە من ئەوم لە لای دوکانی جگەرفرۆشەکە بینی وامهەستکرد ئەو گونیەیەی کە بەدەستییەوەیەتی کەمێک قورسە، بۆیە وا هات بەبیرمدا کە ئەو شەوە ئەو قوڵنگ و پاچ و خاکەنازە لە گونییەکەدا بووبێت. هیچ قسەیەکم نەکرد کاتژمێرێک دانیشتم و خوداحافیزییم لێکرد و ڕۆیشتم.

عەلی خوێندکاری کۆلێژی پزیشکی ددان بوو، هاوپۆلی ئومێد بوو، ئەو لە بنەماڵەیەکی ناسراو و بەڕێزی دەوڵەمەندی یەزد بوو، عەلی گەنجێکی پارەدار بوو، ڕووخۆش و خۆشگوزەران بوو، لە مەشهەدیش خزم و کەسێکی زۆری هەبوو، ئەویش لەگەڵ کۆمەڵە خوێندکارە یەزدییەکان نەبوو، واتە هیچ کاتێک لەگەڵ ئێمەدا نەبوو، ئەو خانوویەکی بچووکی سەربەخۆی بەکرێ گرتبوو بەتەواوی ڕاخەر و ناوماڵی باشەوە، من لە یەزدیش تێکەڵاویم لەگەڵ بنەماڵە و خزمەکانی ئەواندا هەبوو، خزمەکانی من و ئەویش خزمایەتییان بەیەکەوە هەبوو، ڕۆژێک چاوم پێیکەوت و لە هەواڵی یەکتریمان

پرسی و لە هەواڵی خزم و کەسانی یەکتریشمان پرسی، لە کاتی قسەکردندا هەواڵی ئومێدم لێپرسی. عەلی و ئومێد هاوپۆل بوون، عەلی گوتی ئومێد حاڵی باشە و لە ئێستادا کاروبارێکی خراپی نییە. گوتم چۆن؟ گوتی لاشەی مردووی هەیە. گوتم باشە ئەم قسەیەی تۆ دەیکەیت مانای چیە؟ گوتی ئومێد کەللەسەری مردوو دەفرۆشێت. گوتم یانی چی؟ گوتی ئەو دەڵاڵی کەللەسەرە و دەچێت کەللەسەری مردووەکان دەکڕێت و دەیفرۆشێتەوە بەخوێندکارانی کۆلێژی پزیشکی ددان. گوتم خوێندکارەکان کەللەسەریان بۆچیە؟ گوتی ئێمەی خوێندکارانی کۆلێژی پزیشکی ددان لەسەر کەللەسەر کار دەکەین، ئێستا کەمتر مردوو دەهێنن بۆ کۆلێژەکەی ئێمە، خوێندکارانیش لەسەر کەللەسەر کاردەکەن و وانە دەخوێنن، ئەو کەللەسەرانەش زۆربەیان لەگۆڕستانەکان دەدزرێن. من یەکسەر پاچ و خاکەناز و قوڵنگ و گونیەکەی ناو ژوورەکەی ئومێدم بیرکەتەوە...

حەفتاوپێنج تومەن قەرزم لای ئومێد هەبوو، چەند ڕۆژێک دوای قسەکردنم لەگەڵ عەلی، من لە تاقیگەی جوگرافیا کارم دەکرد، دەوروبەری نیوەڕۆ بوو، ئومێد هات بۆ سەردانم پەنجا تومەنی قەرزەکەی بۆ هێنابوومەوە، پێمگوت من ئێستا پێویستم بەو پارەیە نییە و لێت وەرناگرم، بەڵام ئەو بەزۆر پەنجا تومەنەکەی پێدام. دایکیشم لە مەشهەد بوو، من لەو کاتەوە کە دایکم هاتبوو بۆ مەشهەد، هەمیشە نانی نیوەڕۆم لە ماڵەوە دەخوارد. خولقی ئومێدم کرد لەگەڵمدا بێتەوە بۆ ماڵەوە تاکو بەیەکەوە لە ماڵی ئێمە نانی نیوەڕۆ بخۆین، ئەویش قبوڵی کرد و لەگەڵمدا هاتەوە. من جارجارێک هاوڕێ یەزدییەکانم بانگهێشتی ماڵی خۆمان دەکرد بۆ نانخواردنی نیوەڕۆ و ئێوارە، چونکە من تەنها بووم و خوشک و برام نەبوو، هەمیشە یەکێک لە کێشەکانی من ئەو تەنیاییە بوو، هەر بەو هۆیەشەوە بوو هەمیشە هاوڕێکانم بانگهێشت دەکرد بۆ ماڵی خۆمان و کۆڕ و کۆبوونەوەمان دەبەست.

ئەو ڕۆژە من و ئومێد و دایکم نانی نیوەڕۆمان بەیەکەوە خوارد، ئێمەش تەنها یەک ژوورمان هەبوو، بەڵام ژوورەکەی ئێمە لەچاو ژوورەکەی ئومێددا کۆشک بوو. لە هەواڵی چۆنێتی ژیان و گوزەرانیم پرسی، ئەویش دەردی دڵی خۆی بۆ هەڵڕشتین. ئومێد چەندین ساڵ بوو باوکی لە دایکی جیا ببووەوە و بە سێ منداڵەوە بەرەڵای کردبوو. ئومێد برا گەورە بوو، دوو خوشکی لە خۆی بچووکتری هەبوو، دایکیشی تووشی نەخۆشی دەروونیی ببوو، چەندین جار لە نەخۆشخانە خەواندبوویان، بەڵام ئەو ژنە بەکرێکاری منداڵەکانی بەخێودەکرد. ئومێدیش کەسێکی بێکاربوو. بەهیچ جۆرێک پارەی لەهیچ شوێنێکەوە بەدەست نەدەگەیشت.

ئومێد گوتی کاتێک کە خوێندکار بووە لە شاری یەزد کاری بارکێشی کردووە بە ماتۆڕێکی سێ تایەوە. ماتۆڕەکەشی هی خۆی نەبووە، ئەو تەنها شۆفێری ماتۆڕەکە بووە. ماتۆڕی سێ تایە، ئامرازێکە لە نێوان عەرەبانەی دەستی و عەرەبانەی ئەسپی. ئەوەش گواستنەوە بوو لە سەردەمی کۆنەوە بۆ سەردەمی نوێ. زۆرێک لەو باربەرانەی بە عەرەبانەی دەستی یا عەرەبانەی ئەسپی باربەرییان دەکرد عەرەبانەکانیان وەلا ناو ماتۆڕی سێ تایەییان کڕی بۆ هێنان و بردنی کەلوپەل. ئەو لەکاتی قوتابخانەشدا بەیانیان زوو پێش کردنەوەی قوتابخانە یا کاتی عەسر لە کاتژمێر پێنجی دوانیوەڕۆوە تا کاتژمێر نۆی شەو خەریکی کاری بارکێشی بووە. کە هاتبوو بۆ مەشهەدیش ماوەیەک بە ماتۆڕ هەر خەیکی هەمان کاربوو. واتە شۆفێری ماتۆڕی خەڵک بووە. ئەو وازی لەو کارە هێنابوو دەیگوت ئەو کارە کاتم زۆر دەگرێت و ناتوانم وانەکانم بخوێنم، خاوەنی ماتۆڕەکەی مەشهەد پارەیەکی زۆر کەمی پێدەدا. ئومێد گوتی لەگەڵ خاوەن ماتۆڕێک هاوڕێیە و هەرکاتێک بێ پارەیی فشاری بۆ بهێنێت دەچێت بە ماتۆڕی ئەو چەند کاتژمێرێک کاردەکات.

یەکێک لە نەنگییەکانی من ڕاشکاوییە لە قسەکردندا. زۆر بەڕاشکاوی گوتم بازاڕی فرۆشتنی کەللەسەر چۆنە؟ کەمێک ڕاماو گوتی من..من، پرسیی تۆ لەکوێ دەزانیت من کەللەسەر دەفرۆشم؟ گوتم کەسێک پێیگوتووم. گوتم کەللەسەر بەچەند دەکڕیت و بەچەند دەیفرۆشیت؟ گوتی تۆ دەتوانیت هاوکاریم بکەیت؟ گوتم چۆن هاوکاریت بکەم؟ گوتی با بەڕاستی پێتبڵێم من دەچم بۆ گۆڕستانەکانی وەک گۆڕستانی (گلشۆر) لەوێ کەللەسەر پەیدا دەکەم و دەیهێنم و دەیفرۆشم. من کەللەسەر لە هیچ کەسێک ناکڕم، چونکە ئەگەر لە خەڵکی بکڕم ڕەنگە تووشی کێشەببم. چەند جارێک خەریکبوو تێبکەوم و تووشی دەردەسەری ببم، لە گۆڕستانەکان زۆر سەگی بەرەڵا هەیە. تۆ لەگەڵ مندا وەرە و تەنها ئاگاداربە کەسێک نەیەت و بمانبینێت، من ئەگەر دووگونیە پڕ بکەم لە کەللەسەر ئەوا بەشی خەرجی یەک مانگمان دەکات.

منی سەر شێتیش ئەم هاوکاریکردنەی هاوڕێ خۆشەویستەکەمم قبوڵ کرد. بڕیارماندا هەر هەمان شەو کاتژمێر نۆ، بێت بەشوێنمدا. هەڵبەت دایکم ئاگاداری ئەم کارەی ئێمە نەبوو. کاتژمێر نۆی شەو من لە بەردەرگایماڵەوە بووم. ئەوکاتە ئێمە ماڵمان لە شەقامی کەفاش بوو. کاتژمێر نۆ ڕووناکی و دەنگی هۆڕنی ماتۆڕێک هاتە گوێم. ئومێد چووبوو ماتۆڕە سێ تایەکەی لە هاوڕێکەی وەرگرتبوو. ماتۆڕەکەی بە مۆڵەتی کاتژمێر هەشتونیو تاکو کاتژمێر یەکی نیوەشەو لێوەرگرت بوو. بەگشتی بۆ

ئەو ماوەیە دە ڕیاڵی دابوو بە خاوەن ماتۆڕەکە. واتە ئومێد بارکیشی بەماتۆڕەکە دەکرد و کرێیەکەی بۆخۆی وەردەگرت و دە ڕیاڵیشی دابوو بە خاوەن ماتۆڕەکە. ئەگەر ماتۆڕەکەش تووشی زیان ببوایە دەبوو ئومێد بەپارەی خۆی چاکی بکاتەوە. بەنزینیش لیتری بە (٤-٥) ڕیاڵ بوو. دیارە ئومێد دەیگوت هەندێک جار کەمتر لەو دە ڕیاڵەی دەستدەکەوێت.

سواری ماتۆڕەکە بووین و ڕۆیشتین بەرەو گۆڕستانی گلشوری مەشهەد. لەو سەردەمەدا هێشتا گۆڕستانی بەهەشتی ڕەزا دروست نەکرابوو. لە مەشهەددا گۆڕستانی زۆر هەبوون، نزیکەی (٢٠-٢٥) گۆڕستانی تێدا هەبوو. گۆڕستانی گلشور لە ساڵی (١٣٠٠-١٩٢١) وە گۆڕستانە، ئەو کاتە تەمەنی ئەم گۆڕستانە تەنها پەنجا ساڵ دەبوو، لە دەوروبەری حەرەمی موتەهیریش چەند گۆڕەستانێک هەبوون. ئەوسا لای ویستگەی ئاسنی مەشهەدەوە هیچ ئاوەدانیەک نەبوو. ئێمە دەبوو لە چۆڵەوانیەکەی دەشتی (بەرهوتیەوە) بڕۆین، کە تازە خەریکبوو تاک تاک خانووی لێ دروست دەکرا، ئەودەم هیچ هەواڵێک لە شەقامە قەرەباڵغەکانی ئێستا، ساڵی (١٣٩٠-٢٠١١) نەبوو. لای پردی ڕێگەی ئاسنینەکەوە کە تێدەپەڕیت بۆ ماوەی شەش کیلۆ مەتر چەند گوندێک هەبوون. ئێمە دەبوو (٢-٣) کیلۆ مەتر دوور بکەوینەوە. تاکو گەیشتینە گۆڕستانەکە دونیا تاریک بوو، هیچ ڕووناکییەک دیار نەبوو، بەیەکەوە قسەمان دەکرد، بەرەبەرە ترس بەسەرماندا زاڵ دەبوو.

بیرم لە چیرۆکی مردووە کفن دزەکە دەکردەوە. چیرۆکێک کە بەشێوەی شانۆگەری نمایشکرا، ئەو چیرۆکە دوایـن جار لە کۆلانی خەتیب نمایش کرا، هەر لەوێش ئەو شانۆگەرییەم بینیی. لە شانۆگەرییەکەدا. پیاوێک دەچوو کفنی مردووەکانی دەدزی، بەڵام من و ئومێد ئەو شەوە دەمانویست سەری مردووەکان بدزین. لە ئومێدم پرسی کەللەسەر دەبێت چۆن بێت. گوتی نابێت تازەبێت و گۆشتی پێوە بێت، نابێت ئەوەندە کۆنیش بێت کە ئێسکەکانی ڕزیبن، بەڵکو دەبێت (١٠-١٥) ساڵ بێت کەسەکە مردبێت.

شەقامی قیرتاوکراو کۆتایی هاتبوو، دەبوو بەجادەی خۆڵدا بڕۆیشتینایە. جادەیەک بوو دەڕۆیشت بەرەو گوندی سیساوا، شوێنێک ئێستا بووە بە گەڕەکێک لە باکووری شاری مەشهەد. ئومێد گوتی دەبێت لە نێوان سەد بۆ سەد و پەنجا مەتر دوور لە گۆڕستانەکە ماتۆڕەکە ڕابگرین و خۆمان بەپێ بڕۆین. ڕووناکی و دەنگی ماتۆڕەکە دەبـووە هۆی بەئاگاهاتنی پاسەوانانی گۆڕستانەکە. ئومێد دەیگوت پاسەوانی گۆڕستانەکە شەوانە گۆڕەستانەکە جێدەهێڵێت و دەڕواتـەوە بۆ ماڵەوە، ئێستا هیچ

کەسێک لە گۆڕستانەکەدا نییە.

من خەریکبوو دەترسام، لە گیانی مردووەکان زیاتر دەترسام تاکو لە پاسەوانی گۆڕستانەکە، هەستم دەکرد گیانی مردووەکان ئازارمان دەدەن و دوچاری کێشەمان دەکەن، ئەو داستانانەی کە لە منداڵیدا دەربارەی گۆڕستانەکان بیستبووم لەبەرچاوم دەبوونە تەلیسمێک.

چیرۆکی پیاوێک کە لەگەڵ هاوڕێکانیدا گرەوی کردبوو، چۆن لەشەوێکی تاریکدا بڕوات بۆ سەر گۆڕستان و لەوێ میخێک بەزەویدا دابکوتێت، ڕۆیشتبوو بۆ ئەوێ و لە تاریکییەکەدا مێخەکەی بەسەردامێنی کراسەکەی خۆیدا داکوتی بوو، کاتێک ویستبووی هەڵبستێت کەچی نەیتوانی بوو. ئەویش وایزانی بوو مردووەکان دامێنی کراسەکەیان گرتووە. بۆیە لە ترساندا دڵی دەوەستێت و هەر لەوێدا دەکەوێت. بەیانی کاتێک هاوڕێکانی دەچن بەسۆراخییەوە سەیردەکەن نیوە مردوو لەوێ کەوتووە.

ڕاستییەکەی کەمێکیش لە ئومێد دەترسام، دەمگوت دەبێت بۆچی منی هێنابێت بۆ سەر ئەم گۆڕستانە، بەم شەوە تاریکە؟ بەڵام ئومێد بەڕاستی بوو، هاتبوو بۆ کەللەسەر دزیین. لەو چۆڵەوانیەدا و بەو شەوە تاریکە لەسەر ئەم گۆڕستانە ترسناکەدا دەترسام، بەڵایەکم بەسەردا بهێنێت. لەشی ئەو دوو ئەوەندەی من دەبوو، خۆ ئەگەر پەلاماری یەکتریمان بدایە دیارە من دەرەقەتی ئەو نەدەهاتم. دووری (٢-٣) کیلۆ مەتر بەماوەی (٩٠٠) کیلۆ مەتری نێوانی یەزد و مەشهەد دەبوو بەلای منەوە. ئومێد ماتۆڕەکەی ڕاگرت و گوتی گەیشتین، دەبێت ئیتر ماوەیەکی کورت بەپێ بڕۆین. ئەو گونیە و کەلوپەلەکانی تری هەڵگرت و دوو گونیەی گەورەشی لەگەڵ خۆیدا هێنابوو، لایتێکیشی هێنابوو، پێمگوت لایتەکە داگیرسێنە تاکو بەرپێی خۆمان ببینین. گوتی نابێت دایگیرسێنین دەنا خەڵکی دەمانبینن، لایتەکە تەنها بۆ بینینی کەللەسەرەکان بوو نەک بۆ بینینی ڕێگا.

بەشێک لەگۆڕستانەکە کۆن بوو، تایبەت بوو بەمردووانی پێش ساڵی (١٣٣٥-١٩٥٦) واتە (١٤-١٥) ساڵ پێش ئەو کاتە. ئومێد ڕۆژی پێشتر بۆ دەستنیشانکردنی گۆڕەکان هاتبوو بۆ گۆڕستانەکە، دەیزانی دەبێت لە کوێوە بڕۆین و کام گۆڕەش هەڵبکەنین. ئومێد بەدوای گۆڕە ڕووخاوەکاندا دەگەڕا، هەڵکەندنی ئەو گۆڕانە ئاسانتربوو لە گۆڕەکانی تر.

لەو سەردەمەدا هێشتا حکومەت ئەو توانایەی نەبوو چاودێری گۆڕستانەکانیش بکات. لە سەردەمێکدا کە ژمارەی دانیشتووانی شاری مەشهەد (٥٠-٦٠) هەزار کەس زیاتر نەبووە، کەچی زیاتر لە (٥٠-٦٠) گۆڕەستانی هەبووە. هاوڕێی بەڕیز و خۆشەویست دکتۆر سەید مەهدی سەید فەرخی کە یەکێکە لە مێژوونووسە دیارەکانی

ولات، رۆژێک دەیگوت نزیکەی (٧٠-٧٥) گۆڕستان لە شاری مەشهەددا هەبووە. بەڵام کەی ئەوەندە گۆڕستان هەبووە؟ دیارە ئەوکاتەی کە ژمارەی دانیشتوانی مەشهەد سەد هەزار کەس بووە. دیارە هەموو شارەکانی تریش بەو جۆرە بوون. ئەو شارانەی کە گەشتیاران زیاتر ڕوویان تێدەکەن و ئەو شارانەی گۆڕی ئیمام و ئیمامزادەیان تێدایە گۆڕەستانەکانیان زۆرترە، بەڵام پێویستە حکومەت هەنگاوی باشتر بنێت و گۆڕستانی وەک بەهەشتی زەهرای تاران و بەهەشتی ڕەزای مەشهەد بنیات بنێت. کە ڕووبەری هەریەک لەو گۆڕەستانانە زیاتر لە دووسەد هێکتار زەوییە. کاتێک دانیشتووانی ولات لە ژێر هێڵی هەژاریدا بوون، ئەو منداڵانەی لەدایک دەبوون لە ئەستۆی بنەماڵەکەیاندا بوون. حکومەت نە ئاماری دەویست و نە ناسنامەی پێدەدان. نە پەروەردە و قوتابخانەشی بۆ دابین دەکردن. حکومەت بە گشتی بێئاگا بوو لە هاووڵاتیان و مردن و لەدایکبوونیان. ئامار و ناسنامە بنەمای هێزی هەر وڵاتێکە. کاتێک حکومەت لاواز و بێ دەسەڵات بوو، مردووەکانیش لە ئەستۆی بنەماڵەی خۆیدایە. حکومەت نە ئاماری دەوێت و نە لاشە، هەر بۆیەش مردوو چ بدرێت بەحکومەت و چ بدرێت بە بنەماڵەکەی، لە هەر شوێنێک بێت ژێر خاکی دەخەن، جا لە نزیک ماڵەوە بوایە یا لە گۆڕستان. لە سەردەمی کۆندا مردووەکانیان بەشێوەی کاتی بە خاک دەسپارد، کاتێک لاشەکە گۆشتەکەی دەڕزی ئێسقانەکانیان کۆ دەکردنەوە و دەیانکردنە کیسەیەکەوە و دەیانگواستنەوە بۆ شوێنێکی تر. لە شارەکانی بیرجەند و یەزد کە کەسێک دەمرد تەرمەکەیان دەبرد بۆ کەربەلا و نەجەف. هەر کاتێک وڵات بە هێزبێت مرۆڤە زیندووەکانیش دەیانەوێت جێ گۆڕکێ بکەن و پاسپۆرت و ڤیزا وەربگرن.

بەڵێ ئەو شەوە تاریکە، ئێمە چووین بۆ دزینی کەللە سەر، ئەو کاتە حکومەت تا ڕادەیەک بەهێز ببوو، منداڵان کە لەدایک دەبوون حکومەت ئاماری لێدەویستن و ناسنامەی پێدەدان. واتا منداڵەکە منداڵی دایک و باوکیەتی و لە هەمانکاتدا حکومەتیش خاوەنیەتی. لە دەیەی (١٣٤٠-١٩٦١) بەدواوە، کاتێک کەسێک دەمرد حکومەت ئاماری دەویست و بەڵگەنامەی گیان لەدەستدانی کەسەکەی دەدا بە کەسوکاری مردووەکە و دەبوو بشزانرێت ئەو مردووە لە کوێ بە خاک دەسپێرێت. واتا مردووەکانیش وەک زیندووەکان حکومەت لێیان بەرپرسیارە. لەم سەردەمەدا حکومەت لە پێش لەدایکبوونی منداڵەوە تاکو چەند ساڵێک دوای مردنیش تەرمەکە بە هی خۆی دەزانێت، بەڵام حکومەتە کۆنەکان تەنها مرۆڤی کارکردە و باجدەر و سەربازیان بە هی خۆیان دەزانی، حکومەتی کۆن هیچ کارێکی بە سەر منداڵ و شێت و بێکار و پیر و پەککەوتەوە نەبوو.

ئەوشەوە من بیرم لەوە دەکردەوە ڕۆیشتن بۆ گۆڕستان و دزینی کەللەسەری مردووەکان تاوانە، بیرم دەکردەوە ئێمە چۆن گیانی مردووەکان ئازاردەدەین، گیانی زیندووەکان و کەسەکانی مردووەکانیش ئازاردەدەین، خزم و کەسی ئەو مردووانە ئەگەر بەو کارەی ئێمە بزانن ئەگەر نەشمان کوژن ئەوا ڕاماندەکێشنە بەردەمی دادگا، بەتایبەت کە ئێمە گۆڕی تازەیەک تازە هەڵدە دەینەوە. لەو بیرکردنانەوەدا بووم ئومێد گوتی تۆ لێرە دانیشە و چاوێکت بکە بە چوار چاو و بە چواردەوری خۆتدا بڕوانە. نازانم چۆنی بوو ئەو شەوە سەگەکان دیار نەبوون. ڕەنگە لە شوێنێکی تر بووبن و پارووە خواردنێکی چەوریان بەنسیب بووبێت. من لەسەر گۆڕێک دانیشتم، ئەو گۆڕە کەمێک لەگۆڕەکانی تربەرزتربوو تاکو بەچواردەوری خۆمدا بڕوانم.

لە ساڵی (١٣٤٩-١٩٧٠) گۆڕستانەکانیش نیشانەی هەژاری وڵاتیان پێوە دیاربوو. لەبەردی مەڕمەڕ و نەخشی سەرگۆڕەکان هیچ هەواڵێک نەبوو. دیارە ئێمە ڕۆیشتبووین بۆ ئەو بەشەی گۆڕستانەکە، کە تەمەنی گۆڕەکانی (١٥-٢٠) ساڵ دەبوو، ئومێد سی مەتر لەولا منەوە، خەریکی هەڵدانەوەی گۆڕێک بوو، بەخێرایی گۆڕێکی هەڵدایەوە و کەللەسەرێکی دەرهێنا، دووبارە گۆڕێکی تری هەڵدایەوە، ئەو دەیزانی کەللەسەری مردوەکە لەکوێوەیە، بۆیە هەر ئەولایەی گۆڕەکەی هەڵدەدایەوە. گڵەکەی فڕێدەدایە لایەکەوە و بەردی ئەلحەدیشی دەخستە لایەکەوە. کەللەسەرەکەشی دەهێنایە دەرەوە. بەو هەموو خێراییەوە لە ماوەی یەک کاتژمێردا تەنها سێ کەللەسەری هێنایەدەرەوە. منیش وردە وردە ترسەکەم ڕەوی. هەستمکرد کە گیانی مردووەکان کارەکانی خۆیان وەستاندووە.

هیچ کەسێک لەو ناوە نەبوو. سەرەتای مانگی (ئەسفەند - شوبات) بوو، کەمێک سەرما بوو، بە ئومێدم گوت کاتژمێر یازدەی شەوە، هیچ کەسێک لەم ناوە دیارنیە ئەگەر پێت باشە بامنیش بێم و هاوکاریت بکەم، ئیتر منیش چووم بۆ هاوکاری کردنی، تا کاتی نیوەشەو هەشت کەللەسەرمان دەرکرد. ئومێد گوتی ماندوو بووم، دەبێت بەزوویی ماتۆڕەکەش ببەمەوە بۆ خاوەنەکەی. من نەمدەزانی کەللەسەری مردوو ئەوەندە قورسە، هەر کەللەسەرێک دوو کیلۆ و نیو بۆ سێ کیلۆ دەبوو. یان ڕەنگە من ماندووبووبێتم و ئەو کەللەسەرانە بەقورسی هاتبێت بەدەستمەوە. هەموو کەللەسەرەکانمان کردە دوو گونیەوە، ئومێد گونیەیەکیانی هەڵگرت لەگەڵ پاچ و خاکەنازەکەدا، منیش بەترس و لەرزەوە گونیەیەکیانم دا بەکۆڵمدا کە تەنها سێ کەللەسەری تێدابوو، ویستمان لە سنووری گۆڕستانەکە بڕۆینە دەرەوە. یەک ڕەوە سەگ بە حەپە حەپ بەرەو ئێمە

هاتن. ئومێد گوتی غاردە با بەخێرایی خۆمان بگەیەنینە ماتۆڕەکە ڕەنگە کەسێک بەهۆی سەگەکانەوە ئاگاداربێت و بۆمان بێت. سەگەکان ئەو ئازایەتیەیان نەبوو پەلامارمان بدەن، خۆ ئەگەر سەگەکان دەیانزانی من چەند دەترسام ئەوا بەزوویی پەلاماریان دەدام و سکیان هەڵدەدڕیم. کاتێک ئومێد ماتۆڕەکەی هەڵکرد و ئەو ناوە ڕووناک بووەوە من وامدەزانی لە قەڵایەکی ئاسایشدام، ئومێد بەخێرایی ماتۆڕەکەی لێدەخوڕی. کاتژمێر یەکی دوای نیوەشەو بوو کاتێک ئومێد منی لە بەردەرگای ماڵی خۆمان دابەزاند و خۆی ڕۆیشت.

من دوو جاری تر لەگەڵ ئومێددا ڕۆیشتبووم بۆ گۆڕستانەکان، جارێک بۆ گۆڕستانی گلشور و جارێکیش بۆگۆڕستانی عەباسئاباد، یاخود گەڕەکی زابوولییەکان لە نزیک دەروازەی قوچان، شوێنێک کە ئێستا سێرییانی شەقامی کاشانە.

ئێستا هەردوو گۆڕستانی گلشۆر و عەباسئاباد کراون بە پارک. لە بەهاری ساڵی (١٣٥٠-١٩٧١) بە ئومێدم گوت پێویستە تۆ کەسێک پەیدابکەیت و کرێی پێبدەیت تاکو ئەو کەللـەسەرەت بۆ بـهێنێت، بۆ ئەوەی خۆت نەچیت بۆ گۆڕستان. گوتی ئینجا من کێ پەیدا بکەم؟ گوتم باشترین کەس پاسەوانی گۆڕستانەکەیە، ئەگەر گۆڕستانەکە پاسەوانی هەبێت لەگەڵ ئەودا قسەبکە. گوتی شتی وا نابێت. گوتم بەندەی خودا وەزیرەکانی وڵات نەوت و خاکی ئەم وڵاتە بەپارە دەفرۆشین، کەچی تۆ وا بیردەکەیتەوە پاسەوانی گۆڕستان لە پارە ڕادەکات، تۆ پارە بدە و ئەو سەری مرۆڤی زیندووت بۆ دەهێنێت. پاش چەند ڕۆژێک ئومێد هات بۆ لام و گوتی کەسێکم دۆزیوەتەوە و ڕێکەوتووین ئەو کەللـەسەرم بۆ بـهێنێت، بۆ هەر کەللـەسەرێکیش بڕی حەفتاوپێنج ڕیاڵی پێبدەم. ئەو کەسە پێیگوت بوو دەچێت بۆ گۆڕستانی گوندەکان لەوێ کەللـەسەری بۆدەدزێت. دیارە ئومێد بە ئەو کەسەی نەگوتبوو کە خۆی کەللـەسەری مردوو دەفرۆشێت، بەڵکو گوتبووی کەللـەسەرەکەی بۆ کۆلێژی پزیشکی دەوێت. ئەو کەللـەسەردزە کەسێک بوو پێشتر بەدوای شوێنەواری کۆندا دەگەڕا و زەوی هەڵدەکۆڵی تاکو شتێکی گرانبەها و بەنرخی دەستبکەوێت. هەموو ئەو زەوییانەی دەوروبـەری مەشهەد گەڕابوو بۆ دۆزینەوەی پارچە ئاسەوارێکی کۆن. ئیتر ئومێد وای لێهات لە دزی کەللـەسەرەوە بوو بە بازرگانی کەللـەسەری مرۆڤ. دیارە کڕیاری زۆر نەبوو، ئەو لە مانگێکدا نەیدەتوانی (١٥-٢٠) کەللـەسەر زیاتر بفرۆشێت.

لە مانگی (شەهریوەری١٣٥٠- ئابی١٩٧١) من ویستم بڕۆم بۆ سەربازی. ئومێد لە مەشهەد بوو، لێم پرسی کار و کاسبیت چۆنە؟ گوتی بەرەو باشی دەڕوات. گوتم خۆ

ئێستا زانکۆ داخراوە، چۆن کار و کاسبیت باشترە؟ گوتی کەسێک لە تاران کڕیارێکی بۆ پەیداکردووم، بەڵام کڕیارەکە خوێندکاری پزیشکی ددان نییە، بەڵکو ئەو کەللەسەرانەی بۆ دیکۆر دەوێت. ئومێد گوتی دوو مانگ دەبێت، خانووەکەم گۆڕیووە و لەو جێگەیە نەماوم کە تۆ هاتیت.

بۆ نانخواردنی ئێوارە منی بانگهێشت کرد بۆ ماڵەکەی خۆی، ناونیشانی ماڵەکەی پێدام لە شەقامی تاهیری نزیک فولکەی سەعدئاباد خانوویەکی بچووکی تازەی بەکرێ گرتبوو، من شەو چووم بۆ ماڵیان کاتێک دەرگای لێکردمەوە گڵۆپی هۆڵ و ڕاڕەوەکەی کوژاندەوە منیش زۆر بەلامەوە سەیر بوو، گوتم باشە بەم تاریکییە بۆ کوێ بڕۆم. ڕێنمایی کردم بۆ ژوورێک، ژوورەکە بە ڕووناکی ڕەنگاوڕەنگ ڕووناک کرابووەوە. کە سەیری ژوورەکەم کرد زۆر ترسام، خەریکبوو بکەوم بەزەویدا، لەناو ژوورەکەدا زیاتر لە بیست کەللەسەری دانابوو. لە چاوی کەللەسەرەکانەوە ڕووناکی دەردەچوو. لە شوێنی چاوەکانیاندا گڵۆپی بچووکی دانا بوو، کەللەسەرەکان دەمیان کرابوونەوە لەدەمی هەر کەللەسەرێکدا گڵۆپێکی بچووکی دانابوو. پاش ماوەیەک گڵۆپی ناوژوورەکەی داگیرساند.

کڕیارە تارانیەکە پێیگوتبوو هەموو مانگێک دەتوانێت شەست کەللەسەری لێ بکڕێت، ئومێد کەللەسەرەکانی لەو کرێکارە دەکڕی دانەی بە حەوت تومەن و نیو تا دە تومەن، پاشان بۆ خۆی پاکی دەکردنەوە و بەستە بەندی دەکردن و دەیناردن بۆ تاران و هەر کەللەسەرێکی بە (٦٥٠ تا١٢٠٠) تومەن دەفرۆشت. هەر بۆیە داهاتێکی باشی دەستدەکەوت.

لەو ژوورە تاریکە و لەو خانووە کەلاوەیەدا کە هەر لە گەورێکی ئاژەڵ دەچوو، گواستیەوە بۆ خانوویەکی جوان و خۆش، بەڵام هێشتا ئومێد تێکەڵاوی هاوڕێکانی نەدەکرد. ئەو لە سەرەتادا تێکەڵ نەبوونەکەی بە هۆی هەژاری و نەبوونیەوە بوو، بەڵام پاشان تێکەڵ نەبوونەکەی بە هۆی کار و کاسبی و سەرقاڵیەوە بوو. لەو ماوەیەدا چەند جارێک لە هەواڵی ئومێدم پرسی. ڕۆژێک ئەو هات بە شوێنمدا و داوای هاوکاری لێکردم. دایکی لە یەزدەوە هاتبوو بۆ لای، ئەو پێشتر هەموو کەللەسەرەکانی کۆکردبوونەوە بۆ ئەوەی دایکی نەزانێت کە خەریکی چییە. پێشتر لە حەمام و توالێتیشدا کەللەسەری دانابوو، بۆ ڕووناککردنەوە گڵۆپی لە جێی چاوی کەللەسەرەکاندا دانابوو. بە داگیرساندنی سویچی کارەباکە گڵۆپی ناو کەللەسەرەکە هەڵدەکرا. ئومێد کەللەسەری ناو حەمامەکەی لابردبوو، بەڵام بیری چووبوو کەللەسەری ناو توالێتەکە لاببات. ئەو

ژنە نەخۆشە داماوە دەچێت بۆ تەوالێت و دەست دەنێت بە سویچی کارەباکەدا و لەناکاو چاوی دەکەوێت بە کەللەسەرێک بە چاوی بریقە و دەمی کراوەوە. ژنەی داماو لە ترسا دەکەوێت و لەهۆش خۆی دەچێت. ئومێدیش بەپەلە دەیگەیەنێتە نەخۆشخانەی ئیمام ڕەزا. ئەو ژنە دوو ڕۆژ بوو لە نەخۆشخانە بوو، کاتێک ئومێد داوای لە من کرد تاکو چەند ڕۆژێک دایکم بنێرم بۆ نەخۆشخانە بە دیار دایکیەوە بێت. دایکم بێکار بوو لە ماڵەوە، قسەم لەگەڵدا کرد و ئەویش بە زوویی چوو بۆ نەخۆشخانە بۆ لای و سێ ڕۆژ لە لای مایەوە، پاشان یەکێک لە خوشکەکانی ئومێد لە یەزدەوە هات بۆ لای. ئەو ژنە بەدبەختە سێ مانگ لە نەخۆشخانە مایەوە و پاشان وردە وردە چاکبووەوە و گەڕایەوە بۆ یەزد. ئومێد وازی لە فرۆشتنی کەللەسەر هێنا و لە کلینکێکی دداندا دەستیکرد بە کارکردن، ئەو دەیگوت لەم کارەمدا داهاتم یەک بە دەیە، دەیویست ئەو خانووەی بەکرێی گرتبوو بیداتەوە بە خاوەنەکەی و بچێت بۆ بەشی ناوخۆیی زانکۆ. لەو ماوەیەدا چەند مانگێک لە ئومێد بێ هەواڵ بووم. کاتێک بینیمەوە گوتی کاروبارێکی زۆر باشم هەیە. ئەو کڕین و فرۆشتنی پێداویستییە پزیشکییەکانی دەکرد، وانەکانی خۆیشی بە باشی دەخوێند و یەکێک بوو لە خوێندکارە سەرکەوتووەکان. لە ساڵی پێنجەمی زانکۆدا لەگەڵ کچێکی هاوپۆلی خۆیدا زەماوەندیان کرد. دوای تەواوکردنی زانکۆ، بوو بە بازرگانی کەلوپەلی پزیشکی. هاوسەرەکەشی خەڵکی تاران بوو، مەشهەدیان جێهێشت و ماڵیان برد بۆ تاران. لە ماوەی پازدە ساڵدا چەند جارێک هەواڵم پرسیووە و دووجاریش سەردانی ماڵیانم کردووە. ئەوان هەردوکیان دکتۆری سەرکەوتووی ددانن و نوێنەری چەندین کۆمپانیای پێویستییە پزیشکییەکانن. هەروەها خاوەنی پیشانگەیەکی گەورەی کەلوپەلی پزیشکین لە شەقامی وەلی عەسر لە نزیک مەیدانی (وەنەک) ژمارەیەکی زۆر کارمەندیان هەیە و لە هەموو ئێراندا کەلوپەلەکانیان بۆ ساخدەکەنەوە.

ئەو هاوپۆلە یەزدیەی ئومێد کە ناوی عەلی بوو، یەکەمجار ئەو بە منی گوت کە ئومێد کەللەسەر دەفرۆشیت، هەمان عەلی کە لە بنەماڵەیەکی دەوڵەمەند و بەڕێزی شاری یەزد بوو. عەلی کاتێک لە شاری مەشهەد لە کۆلێژی ددان بوو، لەکاتی خوێندکاریدا باری ئابووریی زۆر باشبوو، لە هیچ شتێکی کەم نەبوو، هەموو پێویستیەکانی بە ئامادەکراوی بۆ دەهاتە بەردەست. لە مەشهەد لە کاتی خوێندکاریدا خویدایە خواردن و خواردنەوەی مادە هۆشبەرەکان. کاتێک خوێندنی تەواو کرد گەڕایەوە شاری یەزد، دکتۆرێکی نیوە ئالوودە بوو، لە یەزد عەیادەیەکی ددانی دانا و داهاتێکی باشی هەبوو. عەلی وردە وردە بە تەواوی ئالودە بوو، لە دەیەی ساڵەکانی (١٣٦٠-١٩٨١) بە تەواوی

پەکیکەوت و عەیادە و ژن و منداڵەکانی کردە قوربانی مادە هۆشبەرەکان، لە تەمەنی پەنجا و یەک ساڵیدا کۆچی دوایی کرد و بۆ هەتا هەتایە لە گۆڕستان جێگای خۆی کردەوە. دوو هاوشاری هەروکیان خوێندکاری کۆلیژی پزیشکی ددان بوون، یەکێکیان دەبوو خۆی و کەسوکارەکەی بە خێوبکات و شەو و ڕۆژ لەکارکردندا بوو، جۆرەها کاری دەکرد. ئەوی تریشیان هەموو پێویستیەکانی ژیانی بۆ دابینکرابوو. ئەوەیان کە هەژار و نەبوو بوو، هەمیشە لە هەوڵ و کارکردندا بوو، ئێستا بووە بە کەسێکی ملیاردێر، ئەوی تریشیان بۆ خۆی ڕۆیشتووە بۆ گۆڕەستان. ئایا ئەمە شانسە یا چارەنووسە؟ من نایزانم.

دوێنێ شەو (٢٢-١٢-١٣٩١=١٢-٣-٢٠١٢) تەلەفۆنم بۆ ئومێد کرد، لە هەواڵی خۆی و منداڵەکانیم پرسی، لە تەمەنی شەستو پێنج ساڵیدا حاڵی زۆر باشە و خاوەنی چوار منداڵە. پێمگوت دەمەوێت یادەوەریی گۆڕەستانەکە بنووسم. گوتی تۆ بە نووسینەوەی یادەوەرییەکانت هەمیشە ترس دەخەیتە دڵی هاوڕێکانتەوە. پاپۆلی بەڕێز ئەمجارە دەتەوێت چی بنووسیت؟

## حسێن عەلی

وەکو نموونەیەک بۆتانی باسدەکەم. تاکو ئێوەش بزانن هەندێک کەس بە چ کوێرەوەریی و دەردەسەرییەک توانیویانە خوێندن تەواو بکەن. هاوڕێیەکم هەبوو خوێندکاری کۆلێژی پزیشکی بوو. کوڕێکی زیرەک و وریا بوو، بەژن و باڵای بەرز و کەڵەگەت بوو. کەسێکی ڕەشتاڵە و خوێن شیرین بوو. لە سەردەمی خوێندنی ئامادەییدا، بۆ بژێوی خۆی شاگردی نانەوا بوو، هاوکاری ماڵەوەشیانی دەکرد. ڕۆژانە (٦-٧) کاتژمێر لە نانەواخانەیەکدا کاری دەکرد. هاوینان بە بەردەوامی لە نانەواکەدا دەمایەوە. سەرەتا نانی لێدەکردەوە، پاشان هەویری دەشێلا و گونکی دەبڕی، ماوەیەکی زۆریش نانی بە تەنوورەوە دەدا. ئەو تازە لاوە، نانێکی زۆر جوانی دروست دەکرد. حسێن عەلی بە هەوڵێکی زۆر بەبێ ئەوەی یەک کاتژمێر چووبێتە پۆلی تایبەتەوە یان مامۆستای تایبەتی گرت بێت. بە نمرەیەکی بەرزەوە لە کۆلێژی پزیشکی زانکۆی مەشهەد وەرگیرا. لە زانکۆش بە دەم خوێندنەکەیەوە کاری دەکرد. ئەو لەگەڵ دوو هاوڕێی خۆیدا لە ژوورێکدا دەژیا. لە یەزدەوە هیچ پارەیەکی بە دەست نەدەگەیشت. دەبوو هەر چۆنێک بێت بۆ خۆی لە مەشهەد پارە پەیدا بکات. لە مانگی (مهری ١٣٤٩- ت یەکەم١٩٧٠) بابەتێکی بۆ باسکردم، گوتی هاوینی ساڵی (١٣٤٩-١٩٧٠) لە مەشهەد زۆر بێ پارە

بووم. هاوڕێ یەزدییەکانم هەموویان گەڕابوونەوە بۆ یەزد، هیچ کەسێک نەبوو تاکو کەمێک پارەی لێ قەرز بکەم. ڕووشم نەدەهات بچم داوای پارە لە دکتۆر و پیاوە گەورەکانی یەزدی دانیشتووی مەشهەد بکەم. دوو ڕۆژ بوو نانم نەخواردبوو. وام بە بیرداهات کە بچم بۆ ئۆردوگای وەکیل‌ئاباد لەوێ نان بخۆم. ئۆردوگای وەکیل‌ئاباد ئۆردوگایەکی تایبەت بوو. شوێنێک بوو خوێندکاران بە درێژایی هاوین بۆ خولی سەربازی بیست‌ویەک ڕۆژ لەوێ دەمانەوە. حسێن عەلی گوتی تەنانەت دوو ڕیاڵی کرێ پاسیشم پێنەبوو. کرێی پاس لە فولکەی تەقی‌ئابادی مەشهەدەوە تاکو وەکیل‌ئاباد دوو ڕیاڵ بوو. ئەو گوتی بەبێ بلیت سواری پاس بووم و ڕۆیشتم بۆ وەکیل ئاباد دووری ڕێگاکە لە شوێنی وەستانی پاسەکەوە تاکو ئۆردوگاکە نزیکەی سێ کیلۆ مەتر دەبوو. لەوێوە بەپێ ڕۆیشتم بۆ ئۆردوگاکە. نیوەڕۆ و ئێوارە لەلای ئەو هاوڕێیانە نانم دەخوارد. کاتێ هاتنەوەم بەشی دوو ڕۆژ خواردنم کردە قابلەمەیەکەوە و لەگەڵ خۆمدا هێنامەوە بۆ شار. دوو تمەنم لەو هاوڕێیانەم قەرزکرد کە لەوێ بوون. گوتی پاشان بۆ دەستکەوتنی کارێک سەردانی نەخۆشخانەی سینای مەشهەدم کرد. پاشان گوتی لێپرسراوانی نەخۆشخانە لەوێ کارێکیان پێدام. ئەو کاتە خوێندکاری قۆناغی سێیەمی کۆلێژی پزیشکی بوو. بەو شێوەیە لە بێ پارەیی خۆی ڕزگار کردبوو. حسێن عەلی تا تەواوکردنی خوێندن لە نەخۆشخانەی سینای مەشهەد ئێشکگر بوو، پاشان بە سەر نەخۆشخانەوە دەگەڕا و دەرمانی دەدا بە نەخۆشەکان و کەم کەم لە ژووری نەشتەرگەرییدا ئامادە دەبوو. ئەو بە هەوڵی یەکێک لە پزیشکەکان چەندین ساڵە لە یەزد خەریکی کاری پزیشکییە. خۆزگە هەموو ئەو کەسانەی کە نموونەی کار و هەوڵ و تێکۆشانن ژینامەی خۆیان دەنووسییەوە. ئەنجامی هەوڵ و تێکۆشانی ئەو جۆرە کەسە بۆ هەموو لاوانی ئەم سەردەمە پێویستە چ ئەوانەی کە وانەکانیان ناخوێنن و چ ئەو کەسانەی لەبەر بێ پارەیی وازیان لە خوێندن هێناوە.

## کوردە کۆچەرییەکانی خۆراسان

من هەمیشە گەشتوگوزارم پێخۆشبووە، هەر بۆیەش هەرکاتێک هەلێکم بۆ هەڵکەوتبێت بۆ گەشتکردن ئەنجامم داوە. کاتێک کە خوێندکاری زانکۆ بووم، چەندێک توانیبێتم لە گەشتە زانستیەکانی زانکۆدا بەشداریم کردووە. ئێستاش دەمەوێت یادەوەرییەک بنووسمەوە کە لە بەهاری ساڵی (١٣٤٧-١٩٦٨) دا گەشتێکم ئەنجام

داوە بۆ باکوری خۆراسان، گەشتێک کە تایبەت بوو بە لێکۆڵینەوەیەک لەبارەی هۆزە کوردەکانی باکووری خۆراسان. هەر ئەو لێکۆڵینەوەیە پاشان بوو بە نامەی دکتۆراکەم. کە لە ساڵی (١٣٦١-١٩٨٢) لە زانکۆی سۆربۆنی پاریس پێشکەشم کرد و دکتۆرام لە سەر وەرگرت.

دکتۆر عەباس سەعید ڕەزوانی چەندین ساڵ پێشتر و لە دەیەی (١٣٣٠-١٩٥١) دا لیسانسی باڵای لە ئەمریکا وەرگرتبوو، ئەو هەمیشە لە زانکۆ جگە لە وانەوتنەوە، پۆستی ئیداریشی هەبوو. لە پێش شۆڕشیش ڕاگری کۆلێژی ئەدەبیاتی مەشهەد بوو. لە دووای شۆڕشیش ماوەیەکی کەم سەرۆکی کتێبخانەی مەشهەد بوو. پاشان لەلایەن پارێزگای مەشهەدەوە کرا بە لێپرسراوی دامەزراوەی چاپ و بڵاوکردنەوە، تا کۆتایی ژیانی بەڕێوەبەرێکی کارای ئەو دامەزراوەیە بوو. لەم لایەنەوە خزمەتێکی زۆری پێشکەش کردووە بە لەچاپدانی چەندین کتێبی دانسقە و بەنرخ.

من لە سەردەمی خوێندکاری و خولی پێشکەوتووی زانکۆدا. واتە ساڵانی (١٣٤٦-١٣٥٦-١٩٦٧-١٩٧٧) دەیان گەشتی کورت و بەکۆمەڵم ئەنجام داوە، بە تایبەت لەگەڵ دکتۆر عەباس سەعیدیدا. لە سەرەتای ساڵی (١٣٥٧-١٩٧٨) دا شەش مانگ لە پاریس لەگەڵ دکتۆر عەباس سەعیدیدا بەیەکەوە بووین. زۆر شت لەوەوە فێربووم. دەتوانم گەشتەکانی خۆم لەگەڵ دکتۆر عەباس دا بکەم بە دوو بەشەوە. گەشتە بەکۆمەڵەکان لەگەڵ خوێندکاراندا و گەشتە تایبەتییەکان بۆ کاری لێکۆڵینەوە بۆ ناوچەکانی سەرخەس، دەرگیز و دەوروبەری ئەتراک بەناونیشانی هاوکار لەگەڵیاندا بووم.

دکتۆر عەباس لە پێش دەستپێکرنی هەر گەشتێکدا خوێندکارانی دەکرد بە چەند گروپێک. شێوازی ئەنجامدانی لێکۆڵینەوەی تێدەگەیاندین. لەو گروپانەدا ئەرکی هەر کەسێکی چ لە ڕووی لێکۆڵینەوەوە، یاخود لە ڕووی بەشداریکردنی ئیدارییەوە، دیاری دەکرد. لێپرسراوی کڕینی پێویستییەکانی گەشت و خواردەمەنی دیاری دەکرد بۆ تەواوی ڕۆژەکان. ئەم دکتۆرە بەڕێزە مۆڵەتی نەدەدا خوێندکاران کات بەفیڕۆ بدەن و بێکاربن. ئەگەر لە گەشتەکاندا بە تایبەت گەشتە درێژەکان خوێندکاران بێکار بوونایە ئەوا بەدڵنیاییەوە کێشە لە نێوانیاندا دروستدەبوو. بە تایبەت کێشەی سیاسی و چاودێریکردنی کچان لە لایەن کوڕانەوە.

بەرنامەی کارکردنمان لە بەیانی زووەوە دەستی پێدەکرد تا کاتژمێر نۆی شەو. لە سەرەتای هاوینی (١٣٤٧-١٩٦٨) دا گەشتێکی زانستی دوازدە ڕۆژەمان بۆ باکووری خۆراسان دەستپێکرد. من بە ناونیشانی خوێندکارێک بەشداریم لەو گەشتەدا کرد.

هاوکات من لێپرسراوی تاقیگەی جوگرافیای زانکۆی ئەدەبیات بووم. گەشتەکەمان، گەشتێکی زانستی بوو، بۆ ناوچە کوردنشینەکانی باکووری خۆراسان. بڕیار بوو لێکۆڵینەوە بکەم دەربارەی ئەو گوندانەی کە بنچینەی خێڵەکیان هەیە. لەم گەشتەدا، لە نزیکەوە لەگەڵ ژمارەیەک لە کوردانی کۆچەریی باکووری خۆراسان ئاشنایەتیم پەیداکرد. ئەمە یەکەمجار بوو کە وەک خوێندکارێک ڕاستەوخۆ لە ناوچە خێڵەکییەکاندا ئامادەبیم و لە نزیکەوە گفتوگۆیان لەگەڵدا بکەم. لەم گەشتەدا ئاشنایەتییەک لە نێوانماندا دروست بوو، کە تاکو ئێستاش بەردەوامە و ئەو ئاشنایەتیە هەر ماوە. لە مانگی (ئوردیبەهەشتی ١٣٨٩- نیسانی ٢٠١٠) دا یەکێک لەو کەسانەی لە مانگی (خوردادی ١٣٤٧- حوزەیرانی ١٩٦٨) بوو بە ئاشنام و ئێستا بۆتە ڕیش سپی بنەماڵەیەک، منی بۆ ئاهەنگی زەماوەندی نەوەیەکی خۆی بانگهێشت کرد. هەروەها هەر لە هەمان ساڵدا سەردانی یەکێک لەگوندەکانی ناوچەی شێروانم کرد، بەمەبەستی پرسەی ئاشنایەکی تر، لەو پرسەیەدا لانیکەم سی کەسم لە ئاشناکانی ئەو سەردەمە بینییەوە و یادەوەرییەکانمان نوێکردنەوە.

لە گەشتی ساڵی (١٣٤٧-١٩٦٨) دا من هاوپۆلی ئەو خوێندکارانە نەبووم کە لەگەڵمدا بوون، بەڵکو ئەوان دوو ساڵ لەپێش منەوە بوون، بەڵام چونکە من لە بەشی جوگرافیا بە ناوونیشانی کارناسێک کارم دەکرد، لەو گەشتەدا بەشداریم کردبوو. بە جادە تەسک و باریکەکەی ئەو سەردەمەدا و بە دۆڵی ئەتراکدا کەوتینەڕێ بە پێنج ئۆتۆمبێلی لاندرۆڤەرەوە، دوو لاندرۆڤەری شەش کەسی و سێ لاندرۆڤەری دە کەسی و پیکابێک کە خواردەمەنی و پێویستیەکانی چێشتلێنانمان لێ بارکرد بوو. سەرپەرشتیاری شۆفێرەکان ڕەزا کامیل بوو. ئەو شۆفێرێکی چالاک و وریای زانکۆی مەشهەد بوو. چێشتلێنەرەکەشمان بەرێز ئاغای سەرایی بوو. منیش لێپرسراوی پێویستییەکانی زانکۆ بووم، نەخشە و قیبلەنما و بەرزیپێو و تەواوی پێداویستیەکانی تر لە ئەستۆی مندا بوون.

کاتژمێر شەشی بەیانی لە بەردەم زانکۆی مەشهەدەوە کەوتینەڕێ. بەرنامەی دکتۆر عەباس زۆر جدی بوو کاتێک کە دەیگوت کاتژمێر شەش واتە کاتژمێر شەش، نە یەک خولەک زووتر، نە یەک خولەک درەنگتر. هەموو خوێندکارانیش زۆر پابەندبوون بە دکتۆرەوە و گوێڕایەڵی بوون. ئەندامانی گەشتەکەمان پێکهاتبوون لە یەک مامۆستا، یازدە خوێندکاری کچ و هەژدە خوێندکاری کوڕ. شەش شۆفێر و یەک چێشتلێنەر و پێنج ئۆتۆمبێلی جێب و یەک پیکاب.

ئامانج لەم گەشتە، ئاشنایی خوێندکاران بوو بە ناوچەکە و دابونەریتی کوردە کۆچەرییەکانی باکووری خۆراسان. لەم گەشتەدا دەبوو لێکۆڵینەوەیەک بکرێت لە ژێر چاودێری خوداڵیخۆشبوو دکتۆر عەباسی سەعیدیدا، لەسەر دێهاتەکانی دەوروبەری ئەتراک. ئەوە بوو پاشان لێکۆڵینەوەکەی بە چاپ گەیاند، لە ژێر ناونیشانی (لێکۆڵینەوەیەکی سەرەتایی دەربارەی دەوروبەری ئەتراک). منیش لە گەشتەکانی دواتردا و لە لێکۆڵینەوەکانمدا ڕۆڵێکی باشم بینی. بەپێی ئەو بەرنامەیەی کە دانرابوو، دەبوو شەو لە شێروان تێپەڕین و سبەی بەیانی زوو لە گوندی ئۆغازی شێروان بین. واتە مامۆستا پێشبینی کردبوو کە بەیەک ڕۆژی تەواو دەبێت (١٨٠) کیلۆ مەتر ڕێگا ببڕن، لە مەشهەدە وە تاکو شێروان..

ئەو کاتە مەشهەد شارێکی ئەوەند گەورە نەبوو، ژمارەی دانیشتوانی تەنها (٤٠٠) هەزار کەس دەبوو. ترافیک کەم بوو، دەرچوون لە شار زۆر ئاسان بوو. زۆرێک لەو شوێنانەی کە ئێستا کۆنکرێت کراوە و کۆشکی گەورەی لەسەر دروستکراوە ئەوکاتە زەوی گەنم و جۆ بوو، یاخود ڕەزی ترێ بوو. هەر ئەو کاتە دکتۆر عەباس باسی ئەو کاولکارییەی بۆ کردین کە بەسەر ئەو زەویە کشتوکاڵیانەدا دێت و لەو شوێنانەدا کۆشک بەرز دەبنەوە و باشترین زەوی کشتوکاڵی بە سوودی مەشهەد بەکۆشک و تەلار وێران دەکرێت.

کاتی کۆچکردنی کۆچەرییەکان بوو لە گەرمیانەوە بۆ کوێستان، لەو ساڵەدا بەهۆی باشی کەشوهەواو بەفرو بارانی زۆرەوە گژوگیا زۆر بوو، هەر بۆیەش کۆچی کۆچەرییەکان بۆ کوێستانەکان دواکەوتبوو. یەکێک لە ئامانجەکانی دکتۆر عەباس توێژینەوە بوو لەسەر ئەو بابەتی کۆچکردنە، کە بۆچی هۆزەکان یەک مانگ و نیو درەنگتر کۆچ دەکەن. هۆکاری ئابووریی و کۆمەڵایەتی دوا کەوتنی کۆچکردنیان چییە؟

ژمارەیەکی زۆر، ڕەشماڵی کۆچەرییان لە دەوروبەری شاری مەشهەد هەڵدرابوون، هەروەها چەندین ڕەشماڵیش لەقەڵای ئابکۆ -شەقامی سوجادی ئێستا- هەڵدرا بوون. گەڕەکی سوجاد ئێستا (١٣٩١-٢٠١٢) جوانترین گەڕەکی مەشهەدە. لە ماوەی چل ساڵدا شوێنێک کە جێگای ڕەشماڵی کۆچەرییان بوو ئێستا خانووی دەقات لەو شوێنەدا سەریان دەرهێناوە. لە هەموو دەشتی مەشهەد و ئەتراک و لە دەوروبەری گوندەکانی لای قوچان، فاروج و شێروان و لە ڕۆخی ڕووباری ئەتراک ڕەشماڵی کۆچەرییەکان هەڵدرابوون. لەو سەردەمەدا دەوروبەری کارگەی شەکری ئابکۆ کە ئێستا کەوتۆتە نێو شارەوە هەمووی ڕەشماڵی کۆچەرییەکان بوو.

یەکەمین دیدارم لەگەڵ کوردە کۆچەرییەکان، تەنها لە نێوان دوو کیلۆ مەتر دوور لە کۆلێژی ئەدەبیاتی مەشهەد بوو. (کۆلیژی ئەدەبیاتی کۆن لە شەقامی شاهروخ یا موتەهەری) بوو. ئەوان لە (سەرخیس)ەوە دەڕۆیشتن بۆ دەوروبەری کێوەکانی (ئەخلەمەد). بەگشتی لەکاتی کۆچکردنیاندا لە گەرمیانەوە بۆ کوێستان، لە دێهاتەکانی سەر ڕێگایاندا زۆر نەدەمانەوە، ڕۆژێک تا دوو ڕۆژ دەمانەوە. لەوەڕگەکان هێشتا سەوز بوون. دەبوو بەزوویی مەڕ و بزن و حوشترەکانیان بگەیاندایە لەوەڕگە سەوزەکان، هەر بۆیەش کە شەویان بەسەردا دەهات و لە هەر شوێنێک ڕەشماڵەکانیان هەڵدایە بەشێوەی کاتی هەڵیاندەدا و هیچ قایمیان نەدەکردن. ئەو ساڵە کۆچەرییەکان زۆر لە لەوەڕگەکان ڕازی بوون، زستانێکی تا ڕادەیەک باش دەبووە هۆی ئەوەی کە بزن و مەڕەکانیان زووتر بزێن. بەهاری تەڕ و باراناوی هەموو لایەکی سەوز کردبوو. ئاژەڵداران لەبەر خاتری لەوەڕاندن و ماندوو نەبوونی ئاژەڵەکان ڕۆژانە زیاترلە (٨-٧) کیلۆ مەتر زیاتر نەدەڕۆیشتن. بەهۆی نەبوونی جادە و ڕێگاوبانەوە بەهیچ شێوەیەک سوودیان لە ئۆتۆمبێل و تراکتور نەدەبینی بۆ گواستنەوەی پێویستییەکانیان. تاکە هۆکاری گواستنەوەی پێویستییەکانیان حوشتر و ئەسپ و وڵاخەکانیان بوو. تەنانەت ڕەشماڵەکانیشیان هەر خۆیان لە مووی بزنەکانیان دروستیان دەکرد. ژیانیان زۆر سادە و سەرەتایی بوو. ڕادیۆ هەر نەبوو ،کاتژمێر زۆر کەم بوو، نەوت زۆر کەم بوو، گەر هەشبووایە تەنها بۆ ڕووناکی چرا بوو، خواردنیش شەکر و چا دەگمەن بوو، دیارە ئەگەر هەبووایە بۆ هەموو کەسێک نەبوو، ئەو ماڵانەی کە کەمێک باری ئابوورییان باشتربوو دەیانتوانی ئەو پێویستیانە بکڕن. لە هەندێک هەواردا کە ژمارەیان (١٥-٢٠) ماڵ دەبوو، کەسێک یا دوو کەس کاتژمێری دەستیی پێبوو. لە هەندێک لە هەوارەکاندا کەس کاتژمێری پێنەبوو. ڕادیۆ لەوەش کەمتر هەبوو، نەوت تەنها بۆ فانۆسەکانیان بوو، بەشی ئەوە نەبوو تاکو ئاگری پێبکەنەوە. ژنان هەموو جلوبەرگی کوردییان لەبەر دەکرد، پیاوانیش جلی کوردییان لەبەردەکرد بەکڵاو و جامانەوە. زۆربەی منداڵان بێ پێڵاو و پێپەتی بوون و بە بێ دەرپێ و بە لنگی ڕووتی لە دەوروبەری ڕەشماڵەکان یارییان دەکرد.

سەرباری ئەو حاڵەش زۆر میواندۆست بوون. ئێمەش پاش چەند کاتژمێرێک ڕۆیشتین، لە نزیک هەندێک لەم کۆچەرییانە لاماندا و سفرەمان ڕاخست بۆ نانخواردنی بەیانی. سەفەرخانی سلێمانی، ڕیش سپی و گەورەی ئەو کۆچەرییانەبوو. کاتێک بینی وا ئێمە نان و پەنیری خۆمان لەسەر سفرە داناوە زۆر تورە بوو، بانگی ماڵەکەی خۆیانی

کرد تاکو نان و چایمان بۆ ئامادە بکەن و داواشی لە ئێمە کرد سفرە و خوانی خۆمان کۆبکەینەوە. مامۆستا عەباس پێیگوت ئێمە نایەین بۆ ماڵی ئێوە، چونکە زۆرین نزیکەی چل کەس دەبین. ئەویش وەڵامی دایەوە و گوتی ئێوە دەبوو لە دووری ئێمە بوونایە، بەڵام مادام لە نزیک ئێمەن دەبێ نان و چای ئێمە بخۆن، خۆ ئەگەر ئێوە نان و چای ئێمە نەخۆن، من ناتوانم لە نێو ئەم هۆزەدا بژیم و ناتوانم هەرگیز سەرم بڵند بکەم. ئەوان میواندۆستی و پیادەکردنی دابونەریتی خێڵەکی و ڕێزگرتن لە کەسانی نامۆیان بە پاراستنی ئابڕوو و گەورەیی خۆیان دەزانی. هەر لەوێ دکتۆر عەباس هەندێک وانەی بۆ خوێندکاران ڕاڤەکرد.

نیوەڕۆی هەمان ڕۆژ، لە نزیک قوچان بە هۆزێکی تر گەیشتین ئەوانیش هەر کورد بوون. لە کچێکی (١٧-١٨) ساڵم پرسی، مۆڵەت هەیە وێنەیەکت بگرم. هاواری کرد نا.. نا، نەکەیت وێنەم نەگریت، بەڵام پاش نیو کاتژمێر سەیرم کرد هەمان کچ بە جلوبەرگێکی تازەی کوردییەوە و بە سەرپۆش و پێڵاوی تازەوە هاتەوە لام و گوتی دە فەرموو ئێستا وێنەم بگرە. منیش وێنەیەکیم گرتوو، ئەو وێنەیەم لەکتێبی هەوارنشینانی باکووری خۆراسان چاپکردووە.

جیاوازییەکانی کۆمەڵگەی داخراو و گوند و کۆمەڵگە نیوەکراوەکانی هۆزەکان بۆ من ئاشکرا بوو. ژنەکۆچەرییە کوردەکانی باکووری خۆراسان، دەیان جار لە ژنانی لادێ نشینی هەمان ناوچە ئازادتر بوون. هۆکارەکەشیم لەکتێبی کوردە کۆچەرییەکانی باکووری خۆراساندا نووسیووە. جادەی نێوان مەشهەد و قوچان زۆر تەسک بوو، بەشێکی قیرتاو کرابوو، بەشەکەی تری هەر خۆڵ بوو. بیری لێبکەرەوە مەشهەد لەو ساڵانەدا شارێکی زیارەتی بوو چوارەمین شاری ئێران بوو، لە دوای تاران و تەورێز و ئەسفەهان. بەڵام ئەو جادانەی لێیەوەی دەردەچوون خۆڵ بوون. پیکابەکەی سەرایی، پێش ئێمە گەیشتبووە گوندی جەعفەرئاوای قوچان. تا ئێمە گەیشتینە لایان ئەوان خواردنی نیوەڕۆیان ئامادە کردبوو. جەعفەرئاوا شوێنی کوشتنی سەرداری ئازادیخوازی ئێرانی کۆلۆنێل محەمەد تەقی خانی پسیان بوو. یادی ئەو سەردارە بەڕێزە بە خێربێت، کە یەکەمین فڕۆکەوانی ئێرانی بوو. کۆلۆنێل محەمەد تەقی خانی پسیان کەسێکی نیشتمانپەروەر و ئازادیخواز بوو. پێشڕەوی نوێسازی و چاکسازی بوو، لەو سەردەمەدا کە خەڵکی بەگشتی زۆر بێئاگا بوون ئەو هەستی بە نیشتمانپەروەری دەکرد، خۆ ئەگەر کوردەکان هان نەدرانایە بۆ کوشتنی ئەوا لە جێگایەکی تر هەر دەیانکوشت. بەڕێز ئەحمەدی موسلیمی یەکێک بوو لە خوێندکارە زیرەک و بە تواناکان.

ئەو لە زانکۆ دوو ساڵ لە پێش منەوە بوو. ئەو دەستنیشان کرابوو لێکۆڵینەوە بکات لەسەر چۆنێتی تێکهەڵچوونی کوردەکان لەگەڵ کۆلۆنێل محەمەد تەقی خانی پسیان و چۆنێتی ڕووداوەکە و چۆنێتی کوژرانی. ئەحمەد موسلیمی خوێندکارێکی زۆر لێهاتوو بوو، گەنجێکی باڵا بەرز و کەسێکی ڕاستگۆ بوو. جارێک لە پۆلەکەی دکتۆر سەرویسی سوهامی ئامادە هەبوو، لە بارەی داگیرکاری زلهێزەکان و هەژاری لە وڵاتانی سێهەمدا وتارێکی پێشکەش کرد، هەروەها پەیوەندییەکی زۆر باشی لەگەڵ خودالێخۆشبوو دکتۆر عەلی شەریعەتیدا هەبوو. بەهەر حاڵ، ئەو ڕووناکی چاوی هەموو خوێندکاران بوو، هەمیشە یەکەمی کۆلێژەکەی خۆی بوو. ئەحمەد موسلیمی خەڵکی شاری کرمان بوو، ماوەیەک لە وەزارەتی ناوخۆ کارمەند بوو، پاشان کرا بە قائیمقامی شاری میناب، هەر لە هەمان شار ساڵی (١٣٥٨-١٩٧٩) لە ڕووداوێکی ون و نادیاردا کوژرا، یادی ئەو کوڕە زیرەک و هوشیارە بە خێر بێت.

قوچان شارێکی کورد نشین بوو، زۆربەی خەڵکەکەی بە زمانی کوری قسەیان دەکرد. لەو شارە نەتەوەی تورکیش هەبوو. ئەو کات زۆربەی خەڵکی ناوچەکە نەخوێندەوار بوون. قوچان شارێک بوو بەرهەمی ئاژەڵداریی و گیادەرمانی زۆری هەبوو. پەنیر و کەشک و دۆ و کەرەی باشی هەبوو. زۆرترین دوکانی فرۆشتنی گیادەرمانی تێدا بوو، یەکێک بوو لەو شارانەی کە گیادەرمانی دەنارد بۆ شارەکانی تری ئێران.

هاوکات چەندین دوکانی ئاسنگەری تێدا بوو، پێویستییەکانی کشتوکاڵی و ئاژەڵدارییان دروست دەکرد. ناڵ و زنجیری ڕەشمە و ئاوزەنگی و قوڵنگ و جۆرەها پێمەڕە و پاچ و خاکەناز لەم شارەدا دروست دەکران، جۆرەها گۆرەوی و دەستکێش و چاکەتی خوریی و پوزەوانەی دەستچن لە دوکانەکاندا دانرابوون بۆ فرۆشتن. ئەو کات هێشتا بازاڕەکانمان بەڕووی بەرهەمی دەرەوەدا نەکرابووەوە. کاتێک بازاڕی قوچانی ساڵی (١٣٤٧-١٩٦٨) لەگەڵ بازاڕی هەمان شاری ساڵی (١٣٩٠-٢٠١١) دا بەراورد دەکەم وای دەبینم هەرچەندە هەژاربووین، وابەستە نەبووین بەهیچ شوێنێکەوە. بەڵام ئێستا کە دەوڵەمەندین وابەستەین بەبازاڕی چینەوە. تەنانەت کتری و قوریشمان لە چینەوە بۆ دێت. من یەکەم جار لە ساڵی (١٣٩٠-٢٠١١) دا مورووو و تەزبیح و قورئانی چاپکراوی چینیم لە قوچان بینی، ئەو کاتە قوچان چەند شەقامێک بوو کە خەڵکی لە دێهاتەکانەوە بۆ کڕین و فرۆشتن دەهاتن. ئەوسا وەک ئێستا قەرەباڵغ نەبوو.

لە قوچانەوە تاکو شێروان هەمووی ڕەزی ترێ بوو، جۆرەها ترێ لەو ناوچەیە

بەرهەم دەهات، کە بەکاریاندەهێنا بۆ دروستکردنی دۆشاو و شەراب. کشمیشی قوچان زۆر بەناوبانگ بوو. کارگەیەکی شەراب دروستکردن لە نزیک قوچان هەبوو. ترێی ناوچەکەیان دەبرد بۆ ئەو کارگەیە. قوچان ئاوی خواردنەوەی باشی نەبوو. کاتێک ئاوەکەیان دەکوڵاند، کلسێکی زۆری هەبوو. سابوون لەو ئاوەدا باش کەفی نەدەکرد. هەر بۆیەش گڵەسەر لە زۆربەی دوکانەکاندا دەستدەکەوت کە لەبری سابوون بەکاریان دەهێنا. ئاوی شاری ڕۆمای پایتەختی ئیتالیاش هەر باش نییە و کلسی هەیە. کاتێک یەک پەرداخ ئاوی شاری ڕۆما بکوڵێنیت نزیکەی نیو پیاڵە کلس دەبینیت. قوچان لە بەرهەمهێنانی شەراب و عەرەقدا نەک نموونەی سەرجەم شارەکانی پارێزگای خۆراسان بوو، بەڵکو نموونەی تەواوی ڕۆژهەڵاتی ئێرانیش بوو. پیاوانی دەوروبەری کەویر زۆرتر تلیاکیان دەکێشا، بەڵام پیاوانی باکووری پارێزگای خۆراسان زیاتر عەرەق و شەرابیان دەخواردەوە.

بەهەرحاڵ ئێوارە گەیشتینە شێروان، هاوڕێیانی دکتۆر عەباس جێگەیان لە باخێکدا بۆ ئامادە کردبووین، باخێک کە ئاوەکەی سێیەکی هەموو ئاوی ناوچەی شێروان دەبوو. لە هەموو شێرواندا جێگایەک نەبوو بۆ سیوحەوت کەس تا پشووی تێدا بدەن. قوتابخانە هێشتا دانەخرابوو، خاوەن باخێکی شێروان ئەرکێکی زۆری کێشا، هەموو پێویستیەکانی بۆ ئامادە کردبووین. کوڕی خاوەن باخەکە مامۆستا بوو، ئەو لە زانکۆی مەشهەد خوێندکاری دکتۆر عەباس بوو. هەر ئەوەندە بەس بوو کە تەواوی خانەوادەکەیان خزمەتمان بکەن. خزمەتکارەکەمان کورد بوو، ژنەکەشی تورک بوو، هەردووکیان لە بنەماڵە ناسراوەکانی شێروان بوون، جوانترین ژیانی هاوبەشی نێوان دوونەتەوە لە شارەکانی خۆراسانی باکوور بوو. لەم شارانەدا بەتایبەت لە شاری بۆجنوورد چەند نەتەوە و مەزهەب بەیەکەوە دەژیان، کورد و تورک و فارس و شیعە و سونی و هەندێک بلوج و یەهودی و ئەرمەنی بەیەکەوە دەژیان. ئەگەر لە ئەوروپادا و پێش جەنگی جیهانی دووەم شارێکی ئەوها هەبووایە هەرگیز ئاشتی تیا بەر قەرار نەدەبوو، هەمیشە شەڕ و ئاژاوە لە نێوانیاندا ڕوویدەدا. ساڵی (١٣٤٧-١٩٦٨) ژمارەیەک یەهودی و ئەرمەنی لە شارەکانی قوچان و شێروان و بۆجنوورد، بەهۆی کاری بازرگانییەوە هەبوون، ئەرمەنییەکان زیاتر بازرگانی خوریی و بوزوو ڕیخۆڵە و پێستەیان دەکرد.

تا سەردەمی جەنگی دووەمی جیهانی، کە مەنەتەوەکان لە شارەکانی وڵاتانی ئەوروپا کەمترین ئازادی و ئارامیان هەبوو. من کە لە شاری یەزدەوە هاتبووم هاوژیانی ئایینەکان بەلامەوە ئاسایی بوو، بەڵام ئەو پێکەوە ژیانە بەلای ئەو خوێندکارانەی لە

شارەکانی ترەوە هاتبوون، ئەو شارانەی یەک ئایین و مەزهەبیان هەبوو ئەو هاوژیانەیان بە لاوە جوان بوو. گرینگترین وانە کە پێویستە لە کۆمەڵگەی کۆنی خۆمانەوە فێری ببین و شانازی پێوە بکەین هاوژیانی و پێکەوە ژیانی ئایین و نەتەوەکانە. شارەکانی باکووری خۆراسان جوانترین نموونەی مرۆڤ ناسین. جوانترین نموونەی پێکەوە ژیانی خەڵکین، بۆیە پێویستە نرخی ئەم پێکەوە ژیانە جوانە، بزانین و زیاتر پەرەی پێبدەین.

بڕیار بوو بەیانی زوو بەرەو گوندی ئۆغاز لە باکووری شێروان بکەوینەڕێ. هاوڕێیانی ئێمە بەرنامەکەیان وا دانابوو کە دەبێت ئەو ڕۆژە لەوێ ئامادەبین. چونکە ئەو ڕۆژە پێشبڕکێی زۆرانبازی لە ئۆغاز ئەنجام دەدرا. دەبوو ئێمەش ئامادەبین بۆ بینینی ئەو پێشبڕکێیە. ئۆغاز گوندێکی کۆنە، دانیشتووانەکەی هەموو کوردی زەحمەتکێش و خانەدانن. لە نزیک گوندەکە، لە پاڵ چیایەکی ئاوداری فێنک پاڵەوان بازییەکە ئەنجام دەدرا.

## بێژەن

لە دەرەوەی گوندەکە زیاتر لە حەوتسەد تا هەشتسەد کەس کۆببوونەوە، خەڵکەکە هەموو بەشێوەی بازنەیی دانیشتبوون، دەنگە دەنگ پەیدا بوو، هاواریانکرد ڕێگا بکەنەوە. میوانەکان گەیشتن، ڕێگاکە کرایەوە، ئێمە مامۆستا و خوێندکاران بەیەکەوە لە ڕیزی یەکەم دانیشتین. خەڵکەکە هەموو لەسەر زەوی دانیشتبوون، بەڵام بۆ ئێمە لباد و بەڕەمان بۆ ڕاخرا بوو. کچان لە ڕیزێک و کوڕان و مامۆستاش لە ڕیزێکی تر دانیشتن. کەشوهەوا خۆشبوو، نە سارد بوو نە گەرم. کوێخا و دوو کەسی تر لە ڕیش سپیانی گوند بەسەر خەڵکەکەوە دەگەڕان و بەخێرهاتنیان لێدەکردن. خەڵکێکی زۆر لە گوندەکانی سەر بە شارۆچکەکانی چناران و قوچان و شێروان و بۆجنووردەوە هاتبوون.

دکتۆر عەباس داوای لە خوێندکاران کردبوو، لەسەر ئەم زۆرانبازییە هەواڵ ئامادە بکەن. ساڵی (١٣٤٧-١٩٦٨) بوو، هێشتا هیچ هەواڵێک لە کامێرای دیجیتاڵی و کۆمپیوتەر و مۆبایل نەبوو. زانکۆ بۆ هەر خوێندکارێک کامێرایەکی (لۆبیتی) ڕووسی پێدابووین، هەڵبەت خوێندکاران خۆیان پارەی کامێراکەیان دابوو. لە کامێراکەدا فلیمێکی دوانزە وێنەیی هەبوو. هەر کەسە و قەڵەم و دەفتەری پێبوو بۆ ئامادەکردنی هەواڵ، گەر پێویستی بکردایە وێنەشیان دەگرت.

ژنان و کچانی کورد، جلوبەرگی میللی کوردەوارییان پۆشی بوو، بە سەرپۆشی گوڵدارەوە کۆڕەکەیان جوانتر کردبوو. ئەو ڕۆژە تێگەیشتم کە ڕەنگی جلوبەرگەکانیان بنەمایەکی یاساییان هەیە. ئەگەر دامێنی کراسەکەیان زەرد بوایە ئەوە تایبەت بوو بە تەمەنێک، ئەگەر ڕەنگی سوور بووایە تایبەت بوو بەتەمەنێکی تر. هەر خەتێک لە دامێنی کراسەکەوە تایبەت بوو بە بوونی منداڵێک، ئەو ژنانەی لە دامێنی کراسەکەیاندا چوار خەت هەبوایە ئەوە نیشانەی ئەوە بوو، ئەو ژنە چوار منداڵی هەیە.

پاڵەوانانی زۆرانبازی بە جلوبەرگی تایبەتەوە لە گۆشەیەکا هەر کەسە و لە لای سەرۆکی خۆیەوە وەستا بوون و گوێیان بۆ ئامۆژگارییەکان ڕاگرتبوو. زۆرانبازییەکە بە سوپاسگوزاری بۆ خودای گەورە و سەڵاوات لێدان دەستپێکرد. کەسێک بە دەنگێکی بەرزەوە چەند هۆنراوەیەکی لە شانامە خوێندەوەوە. ئەو هۆنراوانە هیوایەکی لە دڵی پاڵەوانەکاندا دەخوڵقاند و سوپاسی خودای گەورەیان دەکرد. سەرەتا کەسێک ناوی پاڵەوانان و گوند و هۆزەکەیانی ڕاگەیاند.

ئەو ساڵە ساڵێکی پڕ بەرەکەت بوو، لە زستانی ڕابردوودا بەفرێکی زۆر باری بوو، لە بەهاریشدا بارانێکی زۆر باری بوو، هەموو شیو و دەشتودەر پڕ ئاو بوو. جوتیارانی ناوچەکە بەرهەمی باشیان هەبوو، چاوەڕوانی درەوکردن بوون. ئاژەڵدارەکان مەڕەکانیان قەڵەو ببوون و گیرفانیان پڕ پارە ببوو. کوڕا ن و کچانیان جلوبەرگی تازە و خاوێنیان پۆشی بوو.

خەڵکی بەگشتی بەرهەمەکانیان بە پارەی کاش فرۆشتبوو. هەمووان شاد و بەکەیف بوون، ئێستا کاتی جەژن و بووک گواستنەوە و زۆرانبازی و شایی و شاباش و خوازبێنی بوو. لە وشکە ساڵیەکاندا بەهیچ جۆرێک زۆرانبازی نەدەکرا. لە ساڵانی نیوە وشکە ساڵیدا بە هەموو هۆزەکان دوو بەران زیاتریان نەدەدا بە خەڵات، بەڵام لەم ساڵە پڕ بارانەدا کەگیا تا ژێر سکی ئەسپەکان هاتبوو، هەر گوندێک و هەر بنەماڵەیەک بەرانێکی وەک دیاری ئامادە کردبوو بۆ براوەی زۆرانبازییەکە. زیاتر لە بیستوپێنج بەران لەلایەکەوە بەسترابوونەوە، بیستودوو گوند و شەش هۆزی کۆچەریی بەرانیان هێنابوو. هەرگیز خەڵکی ئەوەندەیان خەڵات و دیاری ئامادە نەکردبوو. هەر کاتێک ساڵ پڕ بەفر و باران بێت، دیاری زۆرانبازان زیاد دەبێت، هاندەرانی زۆرانبازان زۆر بوون. لەولاشەوە بەرانەکان بەیەکەوە شەڕە قۆچیان بوو. دەنگی لێکدانی شاخەکانیان دەگەیشتە لای ئێمە. دەبوو زۆرەبانبازییەکە زووتر دەست پێبکات، بەڵام هێشتا حاجی عەلی خان گەورەی یەکێک لە هۆزەکان نەهاتبوو، حاجی عەلی خان ئەو ساڵە حەوت

بەرانی بۆ دیاری زۆرانبازی تەرخان کردبوو، هێشتا خۆی و بنەماڵەکەی نەهاتبوون. حاجی عەلی سێ ژن و حەڤدە منداڵی هەبوو. لە ناکاو دەنگی سروود و پیاهەڵدان بەرزبووەوە و گوتیان ئەوا حاجی عەلی و بنەماڵەکەی هاتن. ماڵی حاجی عەلی تەنها ماڵی خۆیان تایەفەیەک دەبوون. حاجی عەلی خۆی و دوو ژنی هاتبوون، لەگەڵ حەڤدە منداڵی و چەند بووک و زاوایەکی و ژمارەیەک لە نەوەکانی، لەگەڵ خۆیاندا حەوت بەرانیشیان هێنابوو. هەموویان بەسواری حوشتر و ئەسپ هاتبوون. حوشترەکانیان گەورە و بەهێز بوون، بە زین و کۆپانی جوان و ڕەنگاوڕەنگ ڕازابوونەوە. خەڵکەکە خۆیان بۆ دواوە کێشایەوە و بازنەیەکی گەورەتریان دروستکرد. حاجی عەلی و بنەماڵەکەی هاتنە نێو خەڵکەکەوە و جێگەی خۆیان گرت.

شوێنی زۆرانبازییەکە لەسەر زەوی بوو، هیچ شتێک ڕانەخرابوو بۆیان. بۆ خەڵکەکەش بە هەمان شێوە شتێکی ئەوتۆ ڕانەخرابوو. زۆربەی زۆری خەڵکەکە لەسەر زەوی دانیشتبوون، پارچە بەڕەیەکیان هێنا بۆ حاجی عەلی و لەسەری دانیشت. بە سەڵاوات لێدان زۆرانبازییەکە دەستپێکرد..

دوو پاڵەوان، دوو قارەمان، دوو گەنجی جوانی بەخۆوە، بۆ یەکتری هاتنە مەیدان. من زۆرم حەز لەم زۆرانبازییە بوو، بەڵام هیچم لێ نەدەزانی. هاواری هاندەران هەر دوو پاڵەوانەکەی هێنابووە جۆشوخرۆش، ورەیانی بەرز کردبووەوە. پاڵەوانەکان لە یەک ئاڵان و دەنگی هاوار هاوار و خۆشی خەڵکەکە دەگەیشتە ئاسمان. لە دەرەوەی گۆڕەپانی زۆرانبازییەکەش چەندین کەس خەریکی سەر بڕینی مەڕ و ئامادەکردنی خواردنی نیوەڕۆ بوون. چەند قەسابێک هاتبوون مەڕەکانیان سەر دەبڕی و خەریکی کەوڵ کردنیان بوون. کەسانێکیش خەریکی چێشتلێنان بوون، چەند ژنێکی کوردیش پیازیان دەجنی و ئاو بە چاویاندا دەهاتە خوارەوە. چەند ژنێکیش برنجیان دەبژارد و دەیانشۆردەوە. منیش لە پشتی گۆڕەپانەکەوە سەیرم دەکرد و دەمویست بەقەڵەمەکەم ئەو جوانیانە تۆماربکەم. تیپی عاشقەکانیش سەرگەرمی دەهۆڵ و زورنا لێدان بوون.

لە باکووری خۆراسان ئەو کەسانەی لەپێناوی کاسبی و داهاتێکدا لە مەڕاسیمی بووک گواستنەوە و خۆشیەکانی هۆزەکان و زۆرانبازی و گەشت و سەیراندا ئامێرەکانی مۆسیقا لێدەدەن و شایی و هەڵپەڕکێ دەکەن پێیاندەڵێن عاشقەکان. چەند کەسێکیش خەریکی دروستکردنی دوکەڵی ئەسپەند بوون و بەسەر سەری کوڕان و کچان و پاڵەوانەکاندا بڵاویان دەکردەوە. پێشبینی دەکرا تا کاتی نیوەڕۆ براوەی یارییەکە دیاری بکرێت و خەڵاتکردنی براوەی یەکەم و نانخواردن و کوڕ و کۆبوونەوەکەش کۆتای

پێبێت.

ئەو ساڵە لە لایەن ئامادەبووانەوە بۆ خەڵاتی براوەی یەکەم، پازدە مەڕ دیاری کرابوو وێڕای هەندێک شاباش. واتە پاڵەوانی یەکەم هەندێک پارە و پولی وەک شاباش پێدەدرا. کات گەیشتە نیوەڕۆ، هەوا کەمێک گەرمی کردبوو، هەتاو لە سەر و کەللەی خەڵکەکەی دەدا، ژمارەیەک لەو کەسانەی کە لە بەیانی زووەوە هاتبوون تەواو بێتاقەت و ماندوو ببوون. چەپڵە لێدان و هوتاف کێشان کەمبووەوە، دواین کاتی زۆرانەکە بوو، هەمووان پێشبینییان دەکرد (برزوو) براوەی یەکەم بێت، ئەو ماوەی سێ ساڵ بوو بە بەردەوامی براوەی یەکەم بوو، ئەمساڵیش پێدەچوو هەر ئەو یەکەم بێت. برزوو پاڵەوانێکی بەئەزموون بوو چەند ساڵێک بوو بەسەر هەموو پاڵەوانەکاندا سەرکەوتبوو. ئەو کەسێکی باڵابەرزی چوار شانە و بێکەس بوو، ماسولکەکانی پتەو و بەهێزبوون، هەر کەسێک زۆرانی لەگەڵدا بگرتایە تەختی پشتی لە زەوی دەدا. یارییەکە لەکۆتاییدا بوو، بەهاوار هاوار و چەپڵەلێدان،گوتیان برزوو بەرامبەرەکەی لە زەویدا و خستی، برزوو سەرکەوت و بردییەوە.

هەندێک کەس خۆیان ئامادەکرد بۆ شاباش کردن. هەندێکی تر خەریکی ئەوە بوون هەڵسن و بڵاوەی لێبکەن. لە ناکاو هاوارێک لە گۆشەیەکی مەیدانەکەوە بڵند بوو. گەنجێک هاواری دەکرد و دەیگوت منیش دەمەوێت زۆران بگرم. کە سەیرم کرد، بینیم گەنجێکی تەمەن هەژدە ساڵ بوو، کوڕێکی باڵابەرزی توندوتۆڵ و ناوشان پان بوو. هاواری دەکرد و دەیگوت منیش ئامادەم بۆ زۆرانبازی. ئەو کوڕە بێژەن بوو، شوانی مێگەلە مەڕی حاجی عەلی خان بوو. دەنگە دەنگ لە نێو خەڵکەکەدا بەرزبووەوە، هەندێک دەیانگوت زۆرانبازی تەواو بووە، هەندێکی تر دەیانگوت تا ئەو کاتەی داواکاری هەبێت زۆرانبازی بەردەوام دەبێت. ڕیش سپییەکان و داوەرەکان کەوتنە گفتوگۆ مامۆستاکەی ئیمەشیان بانگ کرد بۆ گفتوگۆکردن، لەکۆتاییدا بڕیار درا کاتژمێر چواری دوای نیوەڕۆ زۆرانبازی دەست پێبکاتەوە.

لەژێر سێبەرە خەست و خۆڵەکەی درەختی ئەرس سفرەی نیوەڕۆ ڕاخرا، سەر سفرە پڕ بوو لە جۆرەها خۆراک، خواردنی بنەڕەتی گۆشت و برنج بوو، لەگەڵ جۆرەها خواردنی تر کە ئامادەکرا بوون، وەک نان و پەنیر و هەنگوین، ئەمانە سفرەکەیان زیاتر ڕازاندبووەوە، سفرەیەکی تایبەتیش بۆ ئیمەی خوێندکاران و گەورە پیاوانی گوندەکان و سەرەک هۆزەکان ڕازابووەوە. لە ژێرسێبەری دار ئەرسێکدا کە بە کوردی بەو دارەیان دەگوت (مرخ) و بە تورکی پێیان دەگوت (ئەرچە).

جۆگە ئاوێک بە تەنیشت درەختەکاندا دەهات، کچە خوێندکارەکان لەگەڵ هەندێک لە کچە کوردەکان ببوونە هاوڕێ، بڕیار بوو خوێندکاران پرسیارەکانیان ئامادە بکەن، چ شوێنێک بۆ پرسیارەکان لەم شوێنە باشتر هەبوو؟ لە نێو ئەو هەموو ژن و پیاوە خێڵەکییە و پیاوان و ڕیش سپی زیاتر لە بیستوپێنج گوند و سێ کاتژمێر بێکاری.

مامۆستا عەباس لە تەنیشت حاجی عەلی خان دانیشتبوو، منیش لەسەر سفرەکە و لە بەرامبەریان دانیشتبووم. عەلی خان بانگی ئەسەدوڵلای کوڕی کرد، ئەسەدوڵلا تەمەنی نزیکەی چل ساڵ دەبوو. حاجی عەلی بە ئەسەدوڵلای گوت بڕۆ بێژەنم بۆ بانگ بکە. پاش چەند خولەکێک بێژەن هات و سڵاوی کرد و بە حاجی عەلی خانی گوت فەرموو کارێکتان هەبوو؟ خان گوتی بۆچی مێگەلەکەت بەرەڵا کردووە و هاتوویت بۆ سەیری پاڵەوانبازی؟ مێگەلەکەت بەکێ سپاردووە؟ بێژەن گوتی مێگەلەکەم بەکوڕەکان سپاردووە. عەلی خان گوتی کوڕەکان مێگەلەکە دادەبڕن، بێژەن گوتی من دەمەوێت بەشداری زۆرانبازییەکە بکەم. پاریش ویستم بەشداری بکەم، بەڵام تۆ گوتت مێگەلەکە جێمەهێڵە. مێگەلەکەم بە ئەردۆ و ڕەمەزان سپاردووە، ئەردۆ ئێستا شوانێکی باشە. بۆیە دڵنیابە و خەمی مێگەلەکەت نەبێت و هیچیان بەسەر نایەت.

حاجی عەلی خان بە زمانی کوردی لەگەڵ بێژەندا قسەی دەکرد. هاوڕێیەکی کوردمان بەناوی (مەحمود قارەمانلو) قسەکانی بۆ دەکردین بە فارسی. خان بە بێژەنی گوت تۆ هەرگیز بەشداری ئەم پاڵەوانبازییەت نەکردووە، ئێستا چۆن دەتوانی لەگەڵ برزوودا زۆران بگریت؟ بێژەن گوتی خان دڵنیابە وەک ڕۆستەم بڵندی دەکەم ودەیکێشم بە زەویدا. عەلی خان گوتی ئەو هونەری هەیە و شارەزایە، دڵنیابە ئەو تۆ دەدات بەزەویدا.

ئەسەدوڵلا گوتی بێژەن دوێنێ شەو دوو بەرازی کوشتووە ددانی بەرازەکانی هێنایە دەرەوە. بێژەن گوتی بەرازەکان هێرشیان کردە سەر سەگەکان و سکی سەگێکیان دڕی منیش دوو بەرازم بە داردەستەکەم کوشت. عەلی خان گوتی کام سەگەیان؟ بێژەن ناوی سەگەکەی گوت. عەلی خان گوتی بەداخەوە ئەو سەگە نرخی سێ بەرانی هەبوو. دیارە تۆ ئاگادار نەبوویت و نووستبوویت. بێژەن گوتی ئەها خان، ئەوە بەرازە بەراز، خەڵکی بە تفەنگیش ناتوانن بەراز بکوژن، بەڵام من بەداردەستەکەی دەستم دوو بەرازم کوشتووە، کەچی هێشتا پێم دەڵێی تۆ نووستوویت؟ عەلی خان گوتی زۆر باشە ئەگەر برزووت لە زەوی دا ئەوا کارێکت کردووە. ئێستا مادام بڕیارت داوە ئەم پاڵەوانبازییە بکەیت دەبێت کارێک بکەیت سەری خێڵەکەمان بەرز بکەیتەوە. چەند ساڵێک پێش ئێستا

لەم پاڵەوانبازییەدا هۆزی ئێمە یەکەم بوو، بەڵام ئێستا ئەم برزووە لە (کاوانلو) پەیدا بووە و چەند ساڵێکە ئەو یەکەمیەکە دەبات، ئەگەر توانیت براوە بیت ئەوا دووبەرانت پێشکەش دەکەم. بێژەن گوتی بە هەمووی دوو بەرانم دەدەیتێ؟ عەلی خان گوتی: تۆ برزوو لەزەوی بدە ئەو کاتە هەرچی بتەوێت پێتی دەدەم. بێژەن ڕووی کردە ئێمەی خوێندکاران و گوتی خان.. ئەم غەریبانە شاهیدن کە تۆ گوتت هەرچی بتەوێت پێتی دەدەم. حاجی عەلی خان بەکوڕەکەی تری گوت بێژەن ببەرە لای سەفدەری پاڵەوان. سەفدەری پاڵەوان زۆرانبازێکی پیری خێڵەکە بوو، ئەویش ئەو ڕۆژە لە مەڕاسیمەکەدا ئامادە بوو. عەلی خان دەیویست سەفدەری پاڵەوان لەم چەند کاتژمێرەدا بێژەن فێری چەند هونەرێکی زۆرانبازی بکات.

دوای نیوەڕۆ ئێمەی خوێندکاران هەلێکمان بۆ هەڵکەوت و پرسیارەکانمان ئامادە کرد. من دەبوو چاوپێکەوتن لەگەڵ حاجی عەلی خاندا بکەم، پرسیارەکانم ڕووبەڕووی ئەوبکەمەوە، جگە لە پرسیارکردن دەبوو چەند قسەیەکی خۆشیش بکەین. لەو ڕۆژەوە تا کۆچی دوایی حاجی عەلی خان کە لە تەمەنی هەشتاوحەوت ساڵیدا کۆچی دوایی کرد، واتە ماوەی بیستودوو ساڵ چەندین جار ئەوم بینیوەتەوە و میوانی بووم و زۆر شتی لێ فێربووم.

لێم پرسی حاجی تەمەنت چەند ساڵە؟ گوتی تەمەنم شەستوپێنج ساڵە و لە تایەفەی هۆزی گەورەی زەعفەرانلۆم. یازدە پشتە ئێمە هاتووینەتە ئەم ناوچەیە پشتی دوانزەهەممان لە کوردستان بووە ناوی ئەردەشێر خان بووە، بنەماڵەکەی لە لایەن شاعەباسی گەورەوە هێنراون بۆ خۆراسان، ئەرکەکەشیان ئێشکگرتن بووە. لە سنوورەکانی خۆراسان. لە سەردەمی شا سوڵتان حسێندا بەشێک لە لەوەڕگەکانی نێوان قوچان و شێروانی ئەمڕۆ، دراوە بە باپیرە گەورەی ئێمە، لەو کاتەوە تاکو داخستنی سنوورەکان لەلایەن ڕووسیاوە، ئێمە لە نێوان کێوەکانی قوچان و لەوەڕگەکانی دەشتی تورکمانستان، گەرمیان و کوێستانمان کردووە، کاتێک سنوورەکان داخران گەرمیانمان گۆڕی بەرەو دەشتی تورکمان سەحرا. ئێمە ئەژداد و ئابادمان ئێشکگری سنورەکانی ئێران بووە. پرسیم حاجی تۆ بیرت دێت کە ڕۆیشتوون بۆ لەوڕگەکانی تورکمانستانی ڕوسیا؟ گوتی بەڵێ من ئەو کاتە تەمەنم سی و پێنج ساڵ بوو، تا کاتی داگیرکردنی ئێران لە لایەن ڕووس و ئینگلیز و ئەمریکاوە، مەڕەکانم دەبردن بۆ لەوەڕگەکانی ڕووسیا. لە دووەم جەنگی جیهانیدا ڕووسەکان پارەیان پێداین تا دارستانەکانی ئەرس ببڕین و بیدەین بە ئەوان. ئەوان ئەو دارانەیان بۆ ژێر سکەی هێڵی

شەمەندەفەر دەویست. هەمو ئەو دارستانەمان بڕی و لەبنمان هێنان و دارەکانمان بە وڵاتی سۆڤیەت فرۆشت. ژمارەیەکی تری دارەکانمان بڕی و سووتاندمانن، بەهەندێکی تریش لە دارەکان خانوومان دروستکرد. ئێستا دارستانەکانمان نەماون و کۆتاییان هاتووە، ئەوچەند درەختەش وا لەخەیراباد و سەرداب و ئۆغاز و تەنگەی تورکمان و ڕاز و جەرگولان ماون لەچاو ئەو دارستانە لەناوچووەدا هیچ نین. لەدوای بڕینی دار ئەرسەکان لەوڕگەکانیش وردە وردە لەناوچوون و ڕووبارەکانیش بەهۆی لافاوی زۆرەوە فراوان بوون و ئەوەندەی تر ڕووبەری لەوەڕگەکان بەرتەسک بوونەوە.

لێم پرسی حاجی تۆ چەند منداڵت هەیە؟ گوتی حەڤدە منداڵم هەیە. گوتم ئەی چەند سەر مەڕت هەیە؟ گوتی چوار مێگەلی شیردارم هەیە، یەک مێگەلی قسرم هەیە، سێ مێگەلیشم هەیە کە مەڕەکان لات و بێهێزن. گوتم حاجی بەگشتی هەمووی چەند سەر مەڕ دەبن؟ گوتی ئێستا هەموو مێگەلە مەڕەکانم لە تەکمەرانن، لە دەشتی تورکومانەوە دەڕۆن بۆ کێوەکانی فاتمە خانی قوچان. چەند ڕۆژێک لەمەوبەر مەڕەکانم ژماردن بەهەموویان (٣٩٠٠) سەر مەڕبوون بە شیردار و قسر و مەڕە لاتەکانەوە. گوتم چەند شوانت هەیە؟ گوتی من خۆم چواردە شوان و شاگرد شوانم هەیە. کەسێکیشم داناوە بۆ سەرپەرشتیاری شوانەکان. بێژەن یەکێکە لە شوانەکانم، ئەو شوانێکی زۆر ئازا و شارەزایە لە تەمەنی (٦-٧) ساڵییەوە بەدوای مەڕەوەیە، توانایەکی باشی هەیە، مەڕناس و گیاناسە، لەگەڵ ئاژەڵە دڕندەکانیش باش شەڕدەکات. کوشتنی بەراز کارێکی وائاسان نییە، تفەنگ بەدەستەکانیش لە ڕووبەڕووبوونەوەی بەراز دەترسن، بەڵام بێژەن داردەستێکی لەداری ئەرس پێیە و یەک بوڵبڕینگی لەسەری داردەستەکەی قایم کردووە، بەیەک لێدان میشکی گورگ و بەراز دەپژێنێت.

گوتم تۆ لەوباوەڕەدایت بێژەن لەم پاڵەوانبازییەدا برزوو لەزەوی بدات؟ گوتی بەڵێ هیـوادارم کە سەرکەوتوو بێت. برزوو لە خێڵی ئێمە نییە، ئێمە کۆچەرییین و هەموو خزم و کەسی یەکترین، ئێمە هەمووومان کوردیین، ئێمەی کۆچەریی لەگەڵ ئەم گوندنشینانەدا جیاوازین، قارەمانی ئەم پاڵەوانبازیە پێویستە لە ئێمە بێت. لەوەش باشتر ئەوەیە کە لە هۆزی ئێمە بێت، قارەمانی پاڵەوانبازیی چەندین ساڵە لە هۆزی ئێمە نییە، ئێستا ماوەی سێ ساڵە ئەم برزووە بووە بە قارەمان، ئەو کەسێکی ئاقڵ نییە و بووە بە خەڵکی شار و ماڵەکەی بردووە بۆ مەشهەد. ئەو بێهۆ دێت و لێرە زۆرانبازی دەکات، ئەو دێت پۆز بەسەر ئێمەدا لێدەدات، ئەو ڕۆیشتووە بۆ مەشهەد، فێری پاڵەوانبازی تازە بووە، پێویست ناکات بێتەوە ئێرە و لێرە پاڵەوانبازی بکات. ئەمە زۆرانبازی ڕۆستەمە،

ئەمە زۆرانبازی ئەسفەندیارە، زۆرانبازی نامەردان نییە.

گوتم ئەگەر بێژەن براوە بوو چی دەبێت؟ گوتی هیچ هەروەک جاران دەبێت، بەڵام ئەگەر براوەبێت پاڵەوان لە هۆزی ئێمە دەبێت و هەموومان شانازی پێوە دەکەین. لە حاجی عەلیم پرسی تۆ خۆت هیچ کاتێک زۆرانبازیت کردووە؟ گوتی من لە تەواوی ژیانمدا زۆرانباز بووم. بوونی حەڤدە منداڵ و سێ ژن خۆی لەخۆیدا پاڵەوانبازییە. بوونی ئەم هەموو ئاژەڵە لەو گەرما و سەرمایەدا پاڵەوانبازییە، ڕۆیشتن بۆ سەر کێوەکانی قوچان و ڕەشماڵ هەڵدان لە کێو و دەشتەکانی تورکمان پاڵەوانبازییە. پاڵەوانبازیی لەگەڵ سروشتدا، پاڵەوانبازیی لەگەڵ وشکە ساڵیدا، لەگەڵ لافاودا، لەگەڵ سەرما و سەهۆڵبەنداندا، من تا ئێستا سێ جار تەواوی مەڕەکانم لەدەستداوە و دووبارە بە چەند مەڕێکەوە دەستم پێکردۆتەوە، ئەمە خۆی پاڵەوانبازییە، یا جۆرێکە لە قوماركردن.

گوتم حاجی عەلی ئەی بۆچی لە شوێنێک نیشتەجێ نابێت؟ تۆ کە ئەم هەموو مەڕەت هەیە بیانفرۆشە و لە شوێنێک نیشتەجێبە. گوتی یەک مەڕ بە یەک گوند ناگۆڕمەوە. من هەموو مەڕەکانی خۆم دەناسم، لەگەڵیاندا قسەدەکەم ناوم لە هەموویان ناوە. ناوی منداڵەکانم فەرامۆش دەکەم، بەڵام ناوی مەڕەکانم فەرامۆش ناکەم، بەڕاستی بە بڕوای ئێمە ژیانی گوند و شار شوورەییە. ژیانی کۆچەریی شەرەفێکی گەورەیە، ئێمە پیاوی ئەسپ و تفەنگ و ڕاوین، جەژن و شادی لە خوێنماندایە، دەشت و کێو ماڵی ئێمەیە. ئەسەدوڵلای کوڕی گوتی ئەم باوکەی ئێمە وەکو (٧٠٠) ساڵ پێش ئێستا بیردەکاتەوە، ئەگەرچی ئێمە پێیدەڵێین کار و کاسبییەک لە بۆجنوورد یا لە شێروان یا لە تاران بدۆزەرەوە، بەڵام ئەو دەڵێت یەک مەڕ بە هەموو شارەکان نادەم. ئێمە خەریکە لەم دەشتودەرە وێران دەبین، کەچی ئەو شەیدای مەڕە. حاجی عەلی مۆڕەیەکی لە کوڕەکەی کرد، ئەسەد ئەو پیاوە تەمەن چل ساڵە، وەکو مشکێک چاوی بە پشیلە کەوتبێت سەری داخست و ورتەی لێوە نەهات. کوڕەکانی تریشی نەیاندەتوانی لەبەرامبەر حاجی عەلیدا ورتە بکەن. مەنوچەهری دە ساڵەش گوتی حاجی باوکم گوتویەتی ساڵێکی تر لە بۆجنوورد من دەنێرێتە قوتابخانە. حاجی عەلی نزیکەی چلوپێنج سەر حوشتری نێر و مێی هەبوو، هەندێکیان لە جۆری حوشتری زۆرباش و دوو کۆپان بوون. حوشترەکانی بۆ بارکردن و گواستنەوەی ماڵ بەکاردەهێنا. حاجی عەلی چەند ماینێکی ڕەسەنیشی هەبوو کە زۆر شانازی پێوە دەکردن، سیویەک سەگیشی هەبوو، ئەو دەیگوت هەر سەگێک نرخی (٣-٥) بەرانی هەیە. هەندێک جار سەگ و بەرانیان بەیەکتری دەگۆڕیەوە. لای کۆچەرییەکان کڕین و فرۆشتنی سەگ حەرامە، بەڵام ئاڵوگۆڕی سەگ لەگەڵ

بەراندا ئاساییە..

دیسانەوە دەنگی دەهۆڵ و زوڕنا بەرزبووەوە، دووبارە خەڵکەکە بازنەیان بەست دەنگی لێدانی تەپڵ بەرزبووەوە، دیاربوو کاتی پاڵەوان بازییەکە بوو. زۆرانبازی بیژەنی لاوی کەم ئەزموون، لەگەڵ برزووی پڕ ئەزمون بوو. برزوو (٨-٩) ساڵ لە بیژەن گەورەتر بوو. بیژەن بەپێلاو و جلوبەرگی شوانییەوە چووبووە ناوەڕاستی مەیدانەکە، پاشان داوەرەکان داوایان لێکرد بێتە لێوارەوە و پانتۆڵەکەی هەڵبکات تا پشت ئەژنۆی. خەڵکەکە هانی بیژەنیان دەدا. ژنان و پیاوان بەڵێنی شاباش و خەڵاتکردنیان پێدەدا. دوای نیوەڕۆش بەهەمان شێوەی بەیانی پاڵەوانبازییەکە دەستیپێکردەوە. کچە خوێندکارەکان لەگەڵ کچانی خێڵەکان بەتێکەڵی وەستا بوون. بنەماڵەی حاجی عەلی خان بەشێوەیەکی بڵاو تێکەڵی خەڵکەکە ببوون.

من و مامۆستا عەباس سەعیدی لە تەنیشت حاجی عەلی خانەوە بووین، جگە لە چەند پیرە پیاوێک و پیرەژنێک کەسی تر دانەنیشتبوو، تەماشاکەران بە تامەزرۆییەوە هاتبوون، هەڵبەت بەیانی هەموو دەیانزانی برزوو براوە دەبێت، کاتێکیش براوە لەپێشدا زانرا، پێشبڕکێکە ئەو چێژ و خۆشییە نابەخشێت، بەڵام ئەمجارە شوانێکی گەنجی سادەی دڵپاک، لەگەڵ پاڵەوانێکی پڕ ئەزموون لە ململانێدایە. زۆرکەس حەزیان دەکرد بیژەن بیباتەوە. موسای ئومێدەوار کە یەکێک بوو لە خوێندکارەکانی گروپەکەمان، داوای لێکردم هاندەری بیژەن بم. دەنگ و هاواری ئێمەی خوێندکاران کە چل کەس دەبووین تاڕادەیەک کاریگەریی هەبوو، ئێمە بە یەک دەنگ هاوارمان دەکرد بژی بیژەن. برزووش هاتە مەیدان، بەڵام لایەنگری کەم بوو. چەند کەسێک هوتافیان دەکێشا بۆ برزوو، بەڵام دەنگی ئەمانە لە نێوان دەنگی لایەنگرانی بیژەندا ون ببوو. حاجی عەلی خان بە هێمنی وەستا بوو، ئەو هاندەری هیچ کامیان نەبوو، تەنانەت من چاوم لێبوو دەستی بۆ برزوو هەڵدەبڕی، منیش لێم پرسی حاجی زۆر بێدەنگیت، ئەویش بەهێواشی گوتی من لەم جۆرە پاڵەوانبازییەم زۆر بینیوە. وا باشترە من لایەنگری هیچ کامیان نەکەم، بیژەن لە خۆمانە، برزووش ئەگەر براوە بوو دەبێت ڕێزی خۆم و خێڵەکەم بگرێت. حاجی لە دڵەوە ئارەزووی دەکرد بیژەن براوە بێت، بەڵام ئەو خۆی بێلایەن و تاڕادەیەکیش خۆی بەلایەنگری برزوو نیشان دەدا. ئیتر یاری دەستیپێکرد و برزوو هێرشی برد، خەریکبوو بیژەن لە زەوی بدات. بیژەن توانی خۆی لە دەستی برزوو ڕزگار بکات. جارێکی تریش برزوو هێرشی برد، ئەمجارەش هێندەی نەمابوو بیژەن لە زەوی بدات، ئیتر ئامبازی یەکتری بوون و یەکترییان دەهێنا و دەبرد. سەفدەری پاڵەوان

بێژەنی تێگەیاندبوو کە پێویستە سەرەتا برزوو ماندوو بکات. لەم پاڵەوانبازییەدا کاتیان دیاری نەکردبوو، دوو کەس کە زۆرانبازی دەکەن، دەبێت بەردەوامبن تایەکێکیان ئەوی تر لە زەوی دەدات.

وا دەردەکەوت کە برزوو تەنگە نەفەس بوو بێت، بەڵام بێژەن تازە خەریکبوو گەرم دەبوو، چەند خولەکێک بوو یاری دەستپێکرد بوو، بێژەن ڕەتێکی برد و خەریکبوو بکەوێت. سەفدەری پاڵەوان هاواری لێکرد خۆت بەزەوییەوە توند بگرە. لەپڕێکدا بێژەن پەلاماری برزووی دا و بلندی کردەوە و بە هەموو هێزی خۆی دای بەزەویدا و دەنگی شادی و خۆشی بەرزبووەوە، تەنانەت کەسەکانی برزووش هانی بێژەنیان دەدا.

بێژەن پشتی برزووی لە زەوی دا و بوو بەبراوەی زۆرانبازییەکە. دادوەر بێژەنی بەپاڵەوان دەستنیشانکرد، بێژەن بەقارەمانی خۆراسان ناسرا و دەنگی شادی و خۆشی بەرزبووەوە. گەنجەکان بێژەنی پاڵەوانیان بەرزکردەوە و بەسەردەستیانەوە بەناوخەڵکەکەدا دەیانگێڕا، هەر پارە و سکەی زیوی بوو بەسەریدا هەڵدەدرا. خەڵاتی بێژەن بیستودوو بەران بوو جگە لە دوو بەرانی زیادە کە حاجی عەلی بەڵێنی پێدا بوو. بێژەن بە گشتی بیستوچوار بەرانی وەرگرت، جگە لە پارەی شاباش. مامۆستا عەباس سەعید ڕەزوانیش سەد تومەنی بەناوی خوێندکارانەوە پێدا. کات نزیکی ئێوارە بوو خەڵکی بڵاوەیان لێکرد و ڕۆیشتن. هەندێک کەس بەسواری ئەسپ و هێستر لە دێهاتەکانەوە هاتبوون، هیچ کەسێک بە ئۆتۆمبێل نەهاتبوو. ئەوکات ئامرازی گواستنەوە کەم بوو، خەڵکی بە گشتی بۆ هاتوچۆ و گواستنەوەی کەلوپەل پشتیان بەئەسپ و هێستر و حوشتر دەبەست. لە هەموو ناوچەکانی باکووری خۆراساندا هیچ گروپێکی کۆچەریی لە ئۆتۆمبێل سوودمەند نەبوون. تەنانەت زەوییەکانیشیان بە گاجووت دەکێڵا. لە ناوچەکەدا جیاوازی نێوان سەردەمی کۆن و سەردەمی نوێ بەئاشکرا دیار بوو.

بڕیاربوو ئێمە ئەو شەوە لە قوتابخانەی گوندەکەدا بمێنینەوە و بەیانی دووبارە بۆ لێکۆڵینەوە بڕۆین بۆ گوندەکانی دەوروبەر. بە فەرمانی دکتۆر عەباس، ئۆتۆمبێلەکانی ئێمە چەندین پیرەژن و پیرەپیاو و منداڵیان گەیاندەوە گوندەکانی خۆیان. ئەم کارە لە ڕۆژانی دواتردا بۆ ئێمەی خوێندکاران ئاکامێکی باشی هەبوو. خەڵکەکە بەگشتی باشتر وەڵامی پرسیارەکانیان دەداینەوە و میوانداریییەکی شایستەیان لێدەکردین. حاجی عەلی خان لەگەڵ سێ کوڕی خۆیدا شەو لە ئۆغاز مانەوە، بۆ ئەنجامدانی کارەکانیان، ئەندامانی تری بنەماڵەکەیان بەسواری ئەسپ و حوشتر گەڕانەوە بۆ تەکمەران.

تەکمەران جێگایەک بوو کە ئاژەڵەکانی حاجی لێبوو. پێش ئەوەی ڕیش سپیان

بگەڕێنەوە بۆ گوندەکانیان و ئێمە بۆ پشوودان بچین بۆ قوتابخانەکە، بێژەن بەرانەکانی پێش خۆی دا و لە بەردەمی ڕیش سپیەکان ڕایگرتن. حاجی عەلی دەستی خستە سەر شانی بێژەن و گوتی پاڵەوان ماندوو نەبێت. بێژەن گوتی سوپاس حاجی، بەڵام ئاگاداربە بەڵێنەکەی خۆتت لەیاد نەچێت. بەڵێنت پێدام ئەگەر پشتی برزوو لە زەوی بدەم هەرچیم بوێت پێمی بدەیت. ئەم برا غەریبانەش هەموو شاهیدن، بۆیە ئاگاداربە بەڵێن بەڵێنە. حاجی عەلی خان گوتی ڕاستە بەڵێن بەڵێنە، ئێستا چیت دەوێت تا پێتی بدەم؟ بێژەن گوتی من.. من.. دەمەوێت ببم بە سەرپەرشتیاری شوانەکان. حاجی عەلی خان گوتی چیت گوت؟ بێژەن گوتی دەمەوێت ببم بە سەرپەرشتیاری شوانەکانی مێگەلەکانی تۆ. عەلی خان خۆی گرژکرد و بە کوردی قسەیەکی کرد، من نەمزانی چی گوت. پیاوە گەورەکانیش کەمێک ڕامان. عەلی خان گوتی خۆت باش دەزانیت ئەم کارە ناکرێت، سەرپەرشتیاری شوانەکان ئێستا بۆ تۆ زۆرە و لە توانای تۆدا نییە. مەنوچەهری کوڕی خان گوتی باوکە تۆ بەڵێنت پێداوە خۆ سەرپەرشتیاری شوانەکان شتێکی ئەوەندە گرنگ نییە. عەلی خان بەکوڕەکەی گوت تۆ کە نازانی شوانی مانای چییە وا باشترە دەمت داخەیت و قسە نەکەیت؟ چۆن سەرپەرشتیاری شوانەکان شتێک نییە؟ سەرپەرشتیاری شوانەکان واتە بەر پرسیاریتی هەموو ئاژەڵەکان و مێگەلە مەڕەکان. واتە تەواوی بەرپرسیاریتی تێکڕای ئاژەڵەکان دەکەوێتە سەر شانی بێژەن.

حاجی مستەفا کە جوتیارێکی دیاری گوندی ئۆغاز بوو، گوتی خان تۆ بەڵێنت پێداوە پێویستە بەڵێنەکەت ببەیتەسەر. عەلی خان گوتی وەڵا ئەگەر ئەم گەنجە بکەمە سەرپەرشتیاری شوانەکان، واتە ماڵوێرانی و دەردەسەری، ئاخێر کێ هەیە بەرپرسیاریتی ئەم هەموو شوان و ئەم هەموو مەڕ و حوشتر و ئەسپانە بداتە دەست کەسێکی بێ ئەزموون. ئەمە چ قسەیەکە؟ عەلی خان گوتی حاجی مستەفا تۆ جوتیاریت و هیچ شتێک لە ئاژەڵداریی نازانیت. ئاژەڵداریی واتە ماڵی «با» بەیەک هەڵەی شوانێک ئێمە ماڵوێران دەبین، ئەگەر شوانێک گیاکان نەناسێت ئێمە بێچارە دەبین، ئەگەر شوانێک دوو کاتژمێر درەنگتر لەکاتی خۆی ئاژەڵەکان ئاو بدات ئەوا ئێمە دەبێت تورەکەی سواڵ لەمل بکەین، ئەگەر شوانێک شارەزای شاخ و دەشتەکان نەبێت خودا دەزانێت چیمان بەسەر دێت، ئەگەر شوانێک سەرما و گەرما و باو تۆفان و گورگ و بەراز نەناسێت، ئێمە ئاوارە دەبین. خۆ ئەگەر شوان لە نەخۆشی مەڕەکان شارەزایی نەبێت ئەوا ئێمە دەربەدەر دەبین، ئەگەر شوان حوشتر و ئەسپ و سەگ تیمار نەکات تیادەچین. ئەم بێژەنە شوانێکی زۆر ئازایە، بەڵام کەم ئەزموونە. ئەوەتا هەندێک لە شوانەکان دەڵێن بێژەن

بەکەڵکی سەرپەرشتی مێگەلێک نایەت، چ جای ببێتە لێپرسراوی تێکرای مێگەلەکان و تەواوی ئاژەڵەکانی تر. سەرپەرشتیاری شوانەکان واتە بەڕێوەبەری تێکرای مەڕەکان، بەڕێوەبەری دەشت و کێو، بەڕێوەبەری کانی و ڕووبارەکان. سەرپەرشتیاری شوانەکان دەبێت هێمن و لەسەرخۆ بێت. سەرپەرشتیاری شوانەکان دەبێت بزانێت چۆن لەگەڵ خەڵکیدا قسە دەکات. بەشێوازێکی ژیرانە بدوێت و دۆستایەتی خەڵکانی تر بکات و بە شێوەیەکی باش تێکەڵاوییان بکات. خۆی دوور بگرێت لە شەڕ و ئاژاوەگێڕی. سەرپەرشتیاری شوانەکان دەبێت ڕێز لە خەڵکی گوندەکان و سنوورەکان بگرێت. بەڵام بێژەن منداڵە و منداڵانە بیردەکاتەوە. ئەم گەنجانە تەنها دەزانن شەڕ بکەن و لێدان و تێهەڵدان دەزانن. بەبێ ئەوەی بیرێک لە ئاکامەکانی بکەنەوە. ئەو هەموو گوندەکان و خەڵکی گوندەکان بە دوژمن دەزانێت. حاجی عەلی خان گوتی ئاخێر ئێمە زیاتر لە (٧٠ فرسەخ = ٤٣٦،٨کم) ڕێگا دەبڕین لە کێوەکانی فاتمە خانی قوچانەوە تاکو تورکمان سەحرا، بە زیاتر لە پەنجا گونددا گوزەر دەکەین. سەرپەرشتیاری شوانەکان دەبێت لەگەڵ خەڵک و کوێخا و ڕیش سپی گوندەکان هەڵسوکەوتی جوان بێت، ئەگەر ڕێز لەو خەڵکە نەگرێت ئەوا شەڕ دروست دەبێت. ئەم گەنجانە تەنها گورگ کوشتن و بەراز کوشتن دەزانن. ئێستاش کە بوو بە پاڵەوانی ناوچەکە ئیتر هیچ کەسێک پێشی پێناگیرێت. ئەسەدوڵڵای کوڕە گەورەی عەلی خان گوتی باوکە تۆ پشوویەک بدە من خۆم لەگەڵ بێژەن دا قسەدەکەم. بێژەن گوتی قسەکردنی ناوێ خان خۆی بەڵێنی داوە. لە بەردەمی پەنجا کەسیشدا بەڵێنی داوە. خۆی پێیگوتم ئەگەر برزووم لە زەوی دا هەرچییەکم بوێت پێمی بدات. باشە من ئێستا دەمەوێت بیم بەسەرپەرشتیاری شوانەکان..

حاجی سەرایی چێشتلێنەرمان هاتە لامان و گوتی دکتۆر عەباس بفەرموون چا ئامادەیە، وەرن چاکەتان بخۆنەوە. دکتۆر عەباس فەرمووی لە حاجی عەلی خان و ڕیش سپیانی گوندەکان کرد تاکو بێن بۆ چا خواردنەوە، لە کاتی چا خواردنەوەکەدا خوێندکارەکانیشیان پێبناسێنێت. دوو کەسیش کە مامۆستای قوتابخانەی گوندەکە بوون، هاتن لەگەڵماندا. بێژەنیش بەرانەکانی بە کەسێک سپارد تا بیانبات بۆ لای مێگەلەکەی حاجی عەلی خان و خۆیشی هات لەگەڵمان بۆ چا خواردنەوە. حاجی عەلی خان و چەند کوڕێکی و بێژەن، لەگەڵ بیست کەس لە گەورە پیاوان و ڕیش سپیانی گوندەکە و مامۆستا و خوێندکاران چووینە نێو قوتابخانەکە. بێژەن هەر پێداگری دەکرد کە دەبێت ببێت بە سەرپەرشتیاری شوانەکان، بەڵام حاجی عەلی خان دژایەتی دەکرد و دەیگوت هەرچیت دەوێت پێتی دەدەم، بەڵام باس لە سەرپەرشتیاری شوانەکان نەکەیت. حاجی

عەلی خان دەیگوت خۆ ئەگەر بێژەن بڵێت سەد مەڕم بدەرێ، زۆر ئاساییە پێیبدەم، بەڵام بێژەن بۆ سەرپەرشتیاری شوانەکان نابێت. چونکە دەبێت ئەزموون پەیدا بکات ئەو هیچ ئەزموونێکی نییە. حاجی عەلی گوتی دەکرێت سەد سەر مەڕ بدەمە کەسێک، دەکرێت سەد هەزار تومەن بدەم بە کەسێک، بەڵام ناکرێت بە خێرایی ئەزموونی پێبدەم. ئەزموون دەبێت بەهێواشی و لەسەرخۆ کەسەکە خۆی وەری بگرێت و فێرببێت، خۆ ئەزموون بە زۆر بەسەر کەسێکدا ناسەپێت، کە بیەوێت هەموو کارەکانی بە کوتەک و تێهەڵدان ئەنجام بدات. خەڵکەکە هەموو گوتیان حاجی عەلی لەسەرخۆبن بەڵکو ڕێکبکەون. حاجی گوتی ئاخر ئەم بێژەنە تێناگات، من ئەگەر ئەو بکەم بە سەرپەرشتیاری شوانەکان، ئەوا بە ڕیشی سپی خۆم و هەموو دابونەریتی هۆزەکەم پێدەکەنم. کەسێکی تر گوتی حاجی عەلی کاتێک بێژەن پێیگوتی ئەگەر براوە بووم چیم پێدەدەیت من واهەستم کرد بێژەن بڵێت یەکێک لەکچەکانتم بدەرێ، کەچی ئەو دەیەوێت ببێت بەسەرپەرشتیاری شوانەکان. عەلی خان گوتی سوێن بە خودا، ئەم داواکارییەیان زۆر ئاسانترە بەلامەوە، هەموو گەنجەکان بەیەک جۆر داوای ژن دەکەن، بەڵام هەموو گەنجەکان بەیەک شێوە فێری ئەزموون نابن و ئەزموون وەرناگرن، خۆ ئەگەر کچەکەم بدەم بەم گەنجەی کە ئێستا براوەی پاڵەوانێتییەکەیە هیچ نەنگییەکی تێدا نییە، بەڵام ئەگەر مێگەلەکان و ماڵەکەم بدەمە دەست ئەم گەنجە هەموو خێڵ و مەڕدارەکان پێمدەڵێن عەلی خان شێت بووە.

دکتۆر عەباس ڕێڕەوی قسەکانی گۆڕی و تووێژەکەی گۆڕی بۆ تەڕە ساڵی و وشکە ساڵی. بۆیە کەوتە گفتوگۆ لەگەڵ خەڵکەکەدا و دەیویست کاریگەرییەکانی تەڕە ساڵی و وشکە ساڵی لە ڕووی ئابوورییەوە بۆ ڕوون بکەنەوە. حاجی سەرایی بە هاوکاری خوێندکارەکان چەند ڕیز چای تێکرد. سفرەی نانخواردنی ئێوارەش لە گۆشەیەکی تری قوتابخانەکەدا ڕاخرابوو. خەڵکی گوندەکە هەندێک نان و پەنیر و ماستیان بۆ هێنا بووین. کەشوهەواش زۆر خۆش و دڵکەش بوو. من هەر لە منداڵییەوە حەزمدەکرد شارەزاییەکم هەبێت لەبارەی هۆزەکانەوە. زۆر حەزمدەکرد شتێک بزانم لەبارەی شوانی و ئاژەڵدارییەوە. قسەکانی حاجی عەلی لەبارەی پرسی شوانییەوە بۆ من زۆر باش بوون، هەر بۆیەش بڕیار وا بوو من و دوو کەسی تر لە خوێندکاران بۆ کاری مەیدانی سبەینێ لەگەڵ حاجی عەلی خاندا بڕۆین بۆ تەکمەران. تەکمەران جێگایەک بوو هەوار و مێگەلە مەڕەکانی حاجی عەلی خانی لێبوو. بڕیار وا بوو ئێمە سێ کەس، پێنج ڕۆژ لە لە ناو هۆزەکەی حاجی عەلی خاندا بمێنینەوە. دکتۆر عەباس زۆر پێداگری کرد کە ئەو پیاوە گەورە و سەرۆک هۆزانە لای ئێمە نانی ئێوارە بخۆن. کوێخای

گوندەکەش دەیگوت ئەوە شورەییە، ئێمە نانی ئێوارە لەلای ئێوە بخۆین لەکاتێکدا ئێوە میوانی ئێمەن لێرە. لەکۆتاییدا هەمووان بەیەکەوە لەقوتابخانەکە نانی ئێوارەمان خوارد. شەو درەنگانێک بێژەن لە عەلی خانی پرسی و گوتی من سەرپەرشتیاری شوانەکانم یان نا. عەلی خان گوتی نەخێر تۆ مێگەلەکەت بەرەڵا کردووە و لێرە دانیشتوویت، ئەی بەرانەکانت لە کوێن؟ بێژەن گوتی بەرانەکانم ڕادەستی حاجی ڕەزا کرد و بردنی بۆ تەکمەران. عەلی خان گوتی ئەمشەو مێگەلەکەمان دوای دەبڕێت، تۆ چۆن شوانێکی کە مێگەلەکەت بەرەڵا کردووە؟ ئەوها دەتەوێت ببیت بە سەرپەرشتیاری شوانەکان. هەڵسە خۆت بگەیەنەرە مێگەلەکە. بێژەن گوتی ئەگەر سەرپەرشتیاری شوانەکان نەبم ناچمەوە بۆلای مێگەلەکە. ڕیش سپییەکان هاواریان لێهەڵسا و گوتیان بێژەن ئەوە چ قسەیەکە تۆ دەیکەیت؟ تۆ تا شەرتت دەپەڕێت دەبێ شوانی مێگەلەکە بیت. مافی ئەوەت نییە لە نیوەیساڵدا مێگەلەکە بەرەڵا بکەیت، تۆ دەبێت هەتا ڕۆژی سەر ژمێری مێگەلەکە لەگەڵیاندا بیت. شوان دەبێت هەتا ئەو ڕۆژەی شەرتی دەپەڕێت لەگەڵ مێگەلەکەدا بێت. ئەگەر وا نەبێت ئەوا کرێی شوانی وەرناگرێت. کوێخا گوتی من تا ئێستا نەمبینیوە شوان لە ناوەڕاستی ساڵدا بڵێت من مێگەلەکە بەرەڵا دەکەم، هەڵسە بڕۆ بۆ سەر کارەکەت ئێمە خان ڕازی دەکەین کە ساڵێکی تر تۆ بکات بە سەرپەرشتیاری شوانەکان، کێ مافی ئەوەی هەیە لە نیوەی ساڵدا سەرپەرشتیاری شوانەکان لە سەر کار لابدات؟ تۆ شوانیت و ئەمڕۆش بوویت بە پاڵەوان، تۆ دەزانی هیچ مەڕدار و ئاژەڵدارێک مافی ئەوەی نییە لە نیوەی ساڵدا شوانی خۆی لە سەر کار لابدات و نیوەی ساڵ سەرپەرشتیاری شوانەکان بگۆڕێت. کوێخا بەردەوام بوو لە قسەکانی و گوتی بێژەن تۆ هەڵسە و بڕۆ بۆ سەر کاری خۆت، ئێمە خان ڕازی دەکەین. کە ئەم ساڵ لە یەکەم ڕۆژی ژمارەکردنی مەڕەکاندا تۆ بکات بە سەرپەرشتیاری شوانەکان. عەلی خان گوتی تا پێنج ساڵی تر ناتوانێت ببێت بە سەرپەرشتیاری شوانەکان. ئەسەدوڵڵا گوتی خان مۆڵەتبدە با ئەم شەو ئەم وتووێژە هەڵگرین بۆ کاتێکی تر. خۆ تۆ خۆت دەتگوت کات هەموو کێشەیەک چارەسەردەکات.

منیش پەندێکی پێشینانم بیرهاتەوە کە دەڵێت. پاشایەکی زۆردار وەزیرێکی دانای هەبوو ڕۆژێک پاشا ویستی وەزیرەکە تاقیبکاتەوە، لە بەردەمی کۆمەڵێک لە کەسێتیدا و لە کۆبونەوەیەکدا بە وەزیرەکەی گوت تۆ بەدانایی ناوت دەرکردووە. وەزیر گوتی ئەوە چاکی و گەورەیی خۆتە. پادشا فەرمانی کرد کەرێک بهێنن، بەزوویی کەرێکیان هێنا. پاشا ڕووی کردە وەزیر و گوتی دەبێت لە ماوەی سێ ساڵدا ئەم کەرە فێری خوێندن

و نووسین بکەیت. وەزیر کڕنوشێکی برد و گوتی قوربان هەرچی بەڕێزتان بفەرموون من جێبەجێی دەکەم. ئیتر بڕیاردرا وەزیر لە ماوەی سێ ساڵدا کەرەکە فێری خوێندن و نووسین بکات، پاشا یەک کیسە ئاڵتونی وەک پێشەکی دا بە وەزیر. وەزیریش سوپاسی دڵفراوانی پاشای کرد. دوای کۆتایی هاتنی کۆبوونەوەکە چەند کەسێک لە خزم و دۆستانی وەزیر گلەییان لە وەزیرکرد و گوتیان ئەم کارە چۆن دەکرێت؟ تۆ دەبوو بەڵێنت بە پاشا نەدایە. چ نهێنیەک لەم کارەدا هەیە؟ لەکاتێکدا کەر فێری نووسین و خوێندن نابێت، تۆش بەڵێنت بە پاشا داوە. وەزیر گوتی پشتگوێخستنی فەرمانی پاشا کارێکی هەڵەیە. من سێ ساڵ کاتم بەدەستەوەیە، لەم ماوەیەدا یا کەرەکە دەمرێت یان من دەمرم یا پاشا دەمرێت، بەتێپەڕبونی کات شتەکانیش دەگۆڕێن.

بێژەن مات ببوو، گوتی بەم شەوە ڕێگا دەرناکەم و ڕێگاش دوورە، لێرەوە تا تەکمەران (٨ فرسەخ = ٤٩,٩٢کم) ڕێگایە. دکتۆر عەباس گوتی بەیانی زوو حسێن و دوو خوێندکاری تر بۆ لێکۆڵینەوە دەچن بۆ تەکمەران، بێژەنی پاڵەوان دەتوانێت لەگەڵ ئەواندا بڕوات. دکتور عەباس لە حاجی عەلی خانی پرسی سبەی ئێوە چۆن دەڕۆن بۆ تەکمەران؟ خان گوتی بەسواری ئەسپەکانمان دەڕۆین. دکتور عەباس گوتی ئێمە ئۆتۆمبێلمان هەیە و خۆت و سێ کوڕەکەت لەگەڵ برادەرانی ئێمەدا بڕۆن. خان قبوڵی کرد و بڕیاری دا خزمەتکارەکەی ئەسپەکان بباتەوە بۆ تەکمەران و خۆشیان لەگەڵ ئێمەدا بە ئۆتۆمبێل بڕۆن، پاشان هەموو میوانەکان و حاجی عەلی خان و سێ کوڕەکەی هەڵسان و ڕۆیشتن، تەنها بێژەن لای ئێمە مایەوە بەو نیازەی بەیانی زوو هەموومان بەیەکەوە بڕۆین بۆ تەکمەران.

شەو هەموومان، خوێندکارانی کوڕ و کچ لە بێژەن کۆبووینەوە، ئاخر ئەو سەردەمە کچان و کوڕانی خوێندکار بەیەکەوە تێکەڵ بوون، لە گەشتە زانستیەکانیشدا هەر بەیەکەوە دەڕۆیشتن، لە ناو پاس و ئوتومبێلیشدا لە تەنیشت یەکەوە دادەنیشتن و هیچ پێشهاتێکیش ڕووی نەدەدا. من خۆم لە ماوەی نۆ ساڵدا هیچ ڕووداوێکی گوماناویم نەدیووە. بۆ دەیان گەشتی زانستی ڕۆیشتووم هەر لە گەشتی دوو ڕۆژە تا گەشتی هەژدە ڕۆژە، هەر لە دەوروبەری مەشهەدەوە تاکو شارۆچکەی (خاش) ی سیستان و بلوجستان، هەروەها لە گەشتی زانستی بۆ جزیرەی هۆرمز و پارێزگای فارس شاری (شیراز). هیچ کاتێک ڕووداوێکی نەخوازراو نەهاتۆتە پێش. ئەوکاتە تێکەڵاوی و هاتوچۆ و وتووێژ و باسوخواس ئاسایی بوو. ئێستا هەندێک کەس دەڵێن ئەو سەردەمە سەردەمی بێسەرەوبەرەیی بووە. ئەم بەندەیەی خۆتان ئافرەتی بێ عەبا و بێ حیجابم

زۆربینیوە، بەڵام کەسێکی بێ سەرەوبەرەم نەبینیووە. زۆرشت هەیە ئێستا پەیدابووە وەک ئالودەبوونی خوێندکاران کە ئەو کاتە هەر نەبوو..

جەوادی مالیکی یەکێک بوو لە هاورێ خوێندکارەکانمان، ئەو یاری جۆدۆ و کاراتی دەکرد. کەسێکی بەهێز بوو، بالای لە بالای بێژەن کورتتر بوو، بە بێژەنی گوت وەرە با یاریی دەستشکانەوە بکەین. بێژەن گوتی من نازانم یاریی دەستشکانەوە چیە؟ هاورێیانمان تێیانگەیاند، ئەویارییە چۆن چۆنی ئەنجام دەدرێت. هەردوکیان چوونە ناوەڕاستی ژوورەکە و بەرامبەر یەکتری دانیشتن و دەستیان خستە ناودەستی یەکتریەوە. پێشتر هیچ کەسێک نەیتوانی بوو لەویاریەدا دەستی جەوادی مالیکی بشکێنێتەوە، بەلام ئەمجارە لە ماوەی چەند چرکەیەکدا بێژەن دەستی جەوادی شکاندەوە. یارییەکەیان دووبارە و سێبارە کردەوە ئیتر جەواد لە هەموو جارەکاندا نەیتوانی سەرکەوتوو بێت بەسەر بێژەندا، پاشان بڕیار درا سێ خوێندکار بەرامبەر بێژەن دابنیشن، سێ خوێندکارەکە چوونە بەرامبەری و بە هەرسێکیان نەیانتوانی دەستی بێژەن بشکێننەوە. پاشان دکتۆر عەباسی سەعیدی گوتی من ئامادەم پێشبڕکێ لەگەل بێژەندا بکەم. ئێمەش هەموو لە قسەکانی دکتور سەرمان سوڕما، چونکە دکتۆر عەباس کەسێکی وەرزشەوان نەبوو، چۆن دەیتوانی لەگەل ئەو شوانە پالەوانەدا دەستشکانەوە بکات؟ ئەوکاتە دکتۆر عباس تەمەنی لە چل سال تێپەڕی کردبوو. بێژەن پێیگوت من لەگەڵ تودا پێشبڕکێ ناکەم. دکتۆر عباس گوتی پێشبڕکێی من و تۆ بە جۆرێکی ترە و پێشبڕکێی دەست شکاندنەوە نییە. بێژەن گوتی هەر پێشبڕکێیەک بێت من لەگەڵ تودا نایکەم، من ڕێزی پیاو دەگرم. دکتۆر عباس گوتی منیش ڕێزی گەنجەکانم لەلایە، بەلام ئەو پێشبرکێیەی من لەگەڵ تۆدا ئەنجامی دەدەم جیاوازە. بێژەن گوتی قسەی پیاوان یەک قسەیە و من لەگەڵ تۆدا پێشبڕکێ ناکەم. دکتۆر عەباس گوتی باشە تۆ لەگەڵ حسێن‌دا پێشبڕکی بکە و ئەو لەبری من پێشبڕکێت لەگەڵدا دەکات. بێژەن سەیرێکی منی کرد و منیش لەچاو ئەودا وەک ڕیشوڵەیەک دەردەکەوتم. خۆشم هەستم بەو پیشبرکێیە نەدەکرد کە مامۆستاکەم لە بەرچاوی گرتبوو. بۆیە منیش چووبوومە بیرکردنەوە و نەمدەزانی چیبکەم. بێژەن سەیرێکی منی کرد و لە دڵی خۆیدا دەیگوت مەگەر ئەم مامۆستا بەڕێزە شێت بووە کە دەیەوێت لەگەڵ ئەم کەسە بچکۆلانەیەدا پێشبڕکێم پێبکات. بێژەن گوتی چ پێش برکێیەک ئەنجامبدەین؟ دکتۆر عەباس گوتی پێشبڕکێیەکی زۆر سادە و ئاسان. بێژەن گوتی باشە ئەگەر من براوە بووم چیم پێدەدەن؟ دکتۆر گوتی ئەگەر تۆ براوە بوویت بیست بەرانت پێدەدەین. بێژەن گوتی باشە ئەی ئەگەر دۆڕام. دکتۆر گوتی هەرکارێکمان داوا لێکردیت

دەبێت ئەنجامی بدەیت. بێژەن گوتی زۆر باشە من ئامادەم. بێژەن فارسی دەزانی، بەڵام هەندێک جار کێشەی بۆ دروست دەبوو لە قسەکردندا، بۆیە جار جار پێویستی دەکرد هاوڕێ کوردەکەمان وەرگێڕانی بۆ بکات. دکتۆر عەباس لەسەر پارچە کاغەزێک ناوی بێژەنی نووسی و دایەدەست من. ئیتر من لە بۆچوونەکەی دکتۆر تێگەیشتم. من و بێژەن بەرامبەری یەک دانیشین و مێزێک لەنێوانماندا بوو. برادەرانمان دوو قەڵەم و دوو پەڕە کاغەزیان لە سەر مێزەکە دانا، بێژەن بە بینینی قەڵەم و کاغەزەکە سەری سوڕما، دکتۆر عەباس گوتی پێشبڕکێ دەستپێکرد، من لەسەر پەڕە کاغەزێک نووسیم بێژەن بیستودوو بەرانی بردەوە. دکتۆر عەباس گوتی یاڵلا بێژەن تۆش لەسەر پەڕە کاغەزێک شتێک بنووسە. بێژەن گوتی من خوێندەواریم نییە، ناتوانم بنووسم. دکتۆر عەباس گوتی دەی کەواتە ئەوەی حسێن نووسیوویەتی بیخوێنەرەوە. بێژەن گوتی من خوێندەواریم نییە، ناتوانم بخوێنمەوە. دکتۆر عەباس وەک براوەیەک دەستی منی بەرز کردەوە و گوتی حسێن براوەیە، هەموو خوێندکارەکان چەپڵەیان لێدا و گوتیان تەواوە حسێن براوەیە. دکتۆر گوتی بێژەن قبوڵتە کە دۆڕایت؟ بێژەن گوتی بەڵێ دۆڕام ئێستا چی بکەم؟ دکتۆر عەباس گوتی داواکاریمان لە تۆ ئەوەیە کە دەبێت فێری نووسین و خوێندنەوە ببیت. ئەوەیش دەفتەر و قەڵەم بۆ تۆ، حسێن دە ڕۆژ لەگەڵ تۆدا دەبێت، دەبێت لە ماوەی ئەم دە ڕۆژەدا فێری خوێندن و نووسین ببیت، ساڵێکی تر کە ئێمە هاتینەوە بۆ ئێرە دەبێت کتێب و ڕۆژنامە بخوێنیتەوە. بێژەن گوتی من سبەی دەچم بۆ کێو، دکتۆر عەباس گوتی ئەم دە ڕۆژە حسێن لەگەڵ تۆدا دەبێت تۆ بۆ هەر شوێنێک چوویت ئەویش لەگەڵ تۆ دێت. بە فەرمانی دکتۆر عەباس بڕیاردرا من لەگەڵ مێگەلەکەی حاجی عەلی خان و بێژەن و خێڵەکەیان بم. ئەمە سەرەتای لێکۆڵینەوەی من بوو لەبارەی هۆزە کوردەکانی باکووری خۆراسانەوە، ئەگەر ئەوڕۆژە بۆ پێشبڕکێ لەگەڵ بێژەن منیان دەستنیشان نەکردایە ڕەنگە لێکۆڵینەوە لە ژیانی خێڵە کوردەکان وەک خەیاڵێک لە مێشکی مندا بمایاتەوە.

بەیانی زوو ئێمە و حاجی عەلی خان و کوڕ و هاوڕێکانی سواری ئۆتۆمبێلەکەی زانکۆ بووین و لە ئۆغازەوە بەرەو دەشتی تەکمەران کەوتینەڕێ. حاجی عەلی خان بڕیاری دابوو نانی بەیانی لە گوندی قولجوق بخۆین، کاتێک گەیشتینە گوندەکە هەموو خەڵکی گوند و ژمارەیەک لە هۆزەکان کۆببوونەوە، هەواڵیان زانی بوو کە بێژەن براوەیە و بۆتە پاڵەوان. خەڵکێکی زۆر بۆ پێشوازی ئەو هاتبوون. خەڵکی بۆ بێژەنی پاڵەوان، هەستێکی گەورەیان بۆ بێژەنی کوردی زەعفەرانلو دەربڕی و بەسەردەستیانەوە

بەرزیانکردەوە، خەڵکی گوندەکە بەرانێک و چەند دیارییەکیان پێشکەش کرد. هەر لەوێ خوانی بەیانیان ئامادە کرد و خەڵکی گوندەکە هەر کەسە و بەپێی توانا خواردنیان هێنابوو. ژنێکی کورد بە جلوبەرگی تایبەتی کوردییەوە هات و دوو کەڵەشێری گەورەی وەک دیاری پێشکەش بە بێژەن کرد و لە خودا دەپاڕایەوە کە هەموو ساڵێک بێژەن ببێت بە پاڵەوانی ناوچەکەیان و هاوکاری خەڵکی ناوچەکە بکات.

لە نێو ئاپۆرای خەڵکەکەدا بێژەن بەزمانی کوردی چەند وتەیەکی پێشکەش کرد، کەسێک بۆی کردین بە فارسی، کە ئەمە دەقەکەی بوو. من خزمەتکاری هەمووتانم، من هیچ کارێکی ئەوتۆم نەکردووە، بەڵام خزمەتکاری ئێوەم. ئەوەتا حاجی عەلی خان تۆ بەرانی پێداوم لە بەردەمی خەڵکی گوندی ئۆغاز و لە بەردەمی میوانەکانی دەرەوە بەڵێنی پێداوم بمکات بە سەرپەرشتیاری شوانەکان. بۆیە ئیتر لەمەودوا من دەبمە سەرپەرشتیاری شوانەکانی حاجی عەلی خان. هەموو خەڵکەکە دەستیانکرد بە چەپڵەلێدان و هەلهەلەکێشان و سڵاوات لێدان. پاشان سواری ئۆتۆمبێلەکە بووینەوە و چوارپەلی بەرانەکەیان بەست و ئەویشیان خستە نێو ئۆتۆمبێلەکەوە. تا تەکمەران نزیکەی لە (٧-٨) گوندی تر پێشوازی کراین. خەڵکی گوندەکانی حسێنئاوا، قولانلو، نوگور، سەرخەز، سەردارئاوا، هاتبوون بۆ پێشوازیکردن لە بێژەنی پاڵەوان. تا گەیشتینە تەکمەران دوو بەرانی تریش پێشکەش بە بێژەنی پاڵەوان کرا.

نانی نیوەڕۆمان لە گوندی زیارەت لەگەڵ خەڵکی گوندەکەدا خوارد. لە چەندین شوێنی تریش دیارییان پێشکەش بەبێژەن کرد. ئەویش لە هەموو شوێنەکان دەیگوت حاجی عەلی خان بەڵێنی پێداوەکە بیکات بە سەرپەرشتیاری شوانەکانی خۆی و دەیگوت ئەمساڵ کە سەرژمێری مەڕەکان کرا ئیتر من دەبم بەسەرپەرشتیاری شوانەکان.

کاتێک سواری ئۆتۆمبێلەکە بووینەوە حاجی عەلی خان گوتی بێژەن من تۆ ناکەم بەسەرپەرشتیاری شوانەکان. بێژەنیش دەیگوت بەڵێنت داوە بەڵێن. هەموو جارێک حاجی عەلی خان توڕە دەبوو سەرێکی بادەدا و دەیگوت بەنیازی ئەوە نەبێت ببێتە سەرپەرشتیاری شوانەکان. بێژەنیش توڕە دەبوو دەیگوت ئێستا من چیبکەم کە تۆ نەمکەیت بە سەپەرشتیاری شوانەکان؟ حاجی عەلی دەیگوت سەرپەرشتیاری شوانەکان گورگ و بەراز کوشتن نییە، تۆ ئەگەر ئەزموونێکت هەبووایە جگە لە باسی گورگ و بەراز باستدەکرد، بەڵام تۆ هیچ شتێکی تر نازانیت تەنها دەتەوێت لەگەڵ ئاژەڵە دڕندەکان و خەڵکی گوند و دراوسێکان شەڕبکەیت، بەوەش دەبیتە دوژمنی هەموو خەڵکی.

بێژەن لە وەڵامدا گوتی ئەی چۆن من لەگەڵ هەموویاندا شەڕ دەکەم. لەگەڵ هەموو خەڵکی دێهاتەکان و هۆزەکانی تریشدا شەڕدەکەم، ئەوانە باجمان لێوەردەگرن، ئێمە هەر کاتێک ویستبێتمان مێگەلەکەمان لە تەنگەی ئەتراکەوە تێبپەڕێنین ئەوان باجیان لێوەرگرتوین. عەلی خان گوتی ئاخر منیش لەبەر ئەم هۆیانەیە تۆ ناکەم بە سەرپەرشتیاری شوانەکان. ئێمە نابێت لەگەڵ خەڵکانی سەر ڕێگادا شەڕ بکەین، ئەگەر خزمین یان بێگانە، شەڕکردن کاری مرۆڤی ژیر نییە، تۆ وا بیردەکەیتەوە ئەگەر لەگەڵ خەڵکی گوندێکدا شەڕبکەیت براوە دەبیت؟ بێژەن گوتی خەڵکی ئەو گوندانە بۆ تێپەڕبوونی ئاژەڵەکانمان بە نزیک ئەواندا باجمان لێوەردەگرن، پێماندەڵێن نابێت مەڕەکانی ئێمە لەکانییەکانی ئەوان ئاو بخۆنەوە؟ دەڵێن بۆچی مەڕەکانتان لە لەوەڕگەکانی سنوورەکانی ئێمە دەلەوەڕێن؟ ئێ باشە مەڕ ئاو و لەوەڕی دەوێت. حاجی عەلی گوتی هەر کارێک یاسا و ڕێسای خۆی هەیە. کاری ئاژەڵداریی بە زۆر و بەشەڕ ناکرێت، تۆ ئێستا بەکەڵکی سەرپەرشتیاری شوانەکان نایەیت، تۆ تەنها بەکەڵکی گورگ کوشتن دێیت.

عەزیزی هاوڕێم گوتی خانی بەڕێز تۆ کەسێکی زۆر ژیر و دونیادیدەیت. عەلی خان گوتی تەمەن و ساڵ گرنگ نییە، من مێگەلەکەم نادەمە دەست کەسانی تەمەن (٧٠-٩٠) ساڵی بێ ئەزموونیش کە بیانەوێت هەموو کێشەکان بە شەڕ و کوتەک چارەسەر بکەن، هەر کاتێک بێژەن کوتەکەکەی فڕێدا و وتوێژ و قسەکردنی کرد بەپیشەی خۆی ئەوکات دەبێتە سەرپەرشتیاری شوانەکان، سەردەمی کوتەک و شەڕ بەسەرچووە، ئێستا سەردەمی گفتوگۆیە، عەزیز بەهێواشی بەمنی گوت، ئەم خانە کەسێکی وریایە و زۆر شت دەزانێت.

پاش کەمێک ڕۆیشتن گەیشتینە دەشتی تەکمەرانی شێروان. ئەمە یەکەم جارم بوو من بێم بۆ ئەم دەشتە. دەشتێکی کەم ئاو، بەڵام پڕ لە لەوەڕ، هەموو لایەک بە گیا و جۆرەها گوڵ داپۆشرا بوو. ئەو دەشتە وەک فەرشێکی سەوزی پڕ گوڵ وابوو.. جۆگە ئاوێکی باریک بە ناوەڕاستی دەشتەکەدا دەڕۆیشت، خەڵکانی ئەوێ دەیانگوت هاوینان ئەم کەمە ئاوە وشک دەبێت. هێشتا تراکتۆر نەهاتبوو بۆ ئەوناوچەیە تاکوبەکاری بهێنن بۆ کێڵانی زەوییەکانیان.

چەند دارێکی ئەرس و سەروو دەبینران، مێگەلە مەڕ بەو دەشتەدا بڵاو ببوونەوە، لە ماوەی چەند سەد مەترێکدا چەند ڕەشماڵێک هەڵدرابوون، خێڵەکە لە ڕێگای کۆچیانەوە لە تورکمان سەحراوە بۆ کێوەکانی قوچان (١٠-١٥) ڕۆژ لەم شوێنەدا پشوویان دەدا.

پاشان دەکەوتنەوە ڕێ. خەڵکی گوندەکانی ئەم دەوروبەرەش زیاتر ئاژەڵدارییان دەکرد تاکو کشتوکاڵ. هەر گوندێک کەمێک کشتوکاڵی دێمی هەبوو، لێرەدا مێگەلە ڕەشە ولاخیش زۆر بوو. سروشتێکی زۆر جوان بوو. ماوەیەکی زۆر بوو کە ئەو جۆرە سروشتەم نەدی بوو، تەنها لەکوردستان و کێوەکانی سەردەشت دیمەنی ئاوا جوانم بینی بوو. ئێرەش هەر کوردستانە. جێگایەکە بەدرێژایی هەشتا ساڵ گەڕیدەکانی وڵاتان بە کوردستانی خۆراسان ناویان بردووە. کاتێک کە ئۆتۆمبێلەکە دەوەستا و بێدەنگ دەبوو لە پشتی هەر بەردێکەوە دەنگی قاسپەقاسپی کەو دەهات. ئەو شوێنە بە هیچ شێوەیەک جادەی نەبوو بەڵکو بەناو بەرد و گژوگیادا ئۆتۆمبێلەکەمان دەڕۆیشت، لە هەر لاوە خەڵکی بە سواری ئەسپ دەهاتن بۆپشتیوانی و پیرۆزبایی لە بێژەن. حاجی عەلی خان هەرگیز پێشبینی ئەو هەموو پێشوازییەی نەدەکرد لە بێژەن بکرێت.

لێرە بەدواوە بێژەن بە ئۆتۆمبێل نەهات بەڵکو سواری ئەسپێکیان کرد و چەند سوارێکی تر لەملاولایەوە دەڕۆیشتن و بردیان بۆ ڕەشماڵەکەی حاجی عەلی خان. کات دوانیوەڕۆ بوو کە گەیشتینە هەوارەکە، کەشێکی زۆر خۆشبوو، خەڵکێکی زۆر هاتبوون بۆ پیرۆزبایی، بە چەپڵەڕێزان و هەلهەلەکێشانەوە، پاشان شایی و هەڵپەڕکێ دەستپێکرد ژنان و کچان زۆر جوان شاییان دەکرد. لە نێوان ئەو ژنە کوردانەدا ژنێکی بەتەمەن زۆر جوان هەڵدەپەڕی دوو لکی دەسماڵەکەی بە هەردوو دەست گرتبوو، دەسماڵەکەی زۆر جوان بەدەوری سەریدا دەگێڕا. ژمارەیەکی زۆر شاباشیان کرد، لە کەسێکم پرسی ئەو ژنە کێیە؟ وا بەشەوقەوە هەڵدەپەڕێت؟ گوتی ئەوە دایکی بێژەنە و خوشکی حاجی عەلی خانە، زۆر خۆشحاڵە کوڕەکەی بووە پاڵەوان. من تا ئەو کاتە نەمزانی بوو بێژەن خوشکەزای حاجی عەلی خانە. واتە خان خاڵی بێژەن بوو. لە دوێنێ بەیانییەوە تاکو ئەمڕۆ دوای نیوەڕۆ یەکجار بێژەن بە عەلی خانی نەگوت خاڵۆ، ئەم هەموو قسەیەی کرد، بەڵام تەنها وشەی خانی بەکاردەهێنا، عەلی خانیش وشەیەکی بەکار نەهێنا، ئاماژەبێت بەوەی کە بێژەن خوشکەزایەتی. من سەرگەرمی سەیرکردن بووم، لە ناکاو دەستێک لە دواوە کێشای بە شانمدا و گوتی بۆچی لێرە وەستاویت؟ کە ئاوڕم دایەوە بێژەن بوو. من و ڕەزا کاملی برد بۆ ڕەشماڵەکەی عەلی خان، لە ڕاستیدا ڕەشماڵی خان تەنها یەک ڕەشماڵ نەبوو، بەڵکو چەند ڕەشماڵێکیان بەدەم یەکەوە هەڵدابوون و دەرگاکانیان بەیەکەوە دروبوون. ئەو ڕەشماڵە نزیکەی بیست مەتر درێژ و حەوت مەتر پان دەبوو، من هەرگیز لە هیچ هەوارێکی باکووری خۆراسان ڕەشماڵێکم بەو گەورەییە نەدیووە، خەڵکێکی زۆر لەناو ڕەشماڵەکەدا دانیشتبوون گەنجەکان لە دەرەوە

خەریکی کارکردن بوون، دوو هاوڕێ خوێندکارەکەی منیش لەوێ بوون، دانیشتین و بەخێرهاتنیان کردین. عەلی خان منی بەخەڵکەکە ناساند. گوتی ئەم برا بەڕێزە چەند ڕۆژێک لای ئێمە دەمێنێتەوە لەبارەی ئاژەڵدارییەوە چەندین پرسیاری هەیە، تکایە هەمووتان وەڵامی بدەنەوە و هاوکاری بکەن. خەڵکەکە لەبارەی ئاژەڵ و لەوەڕگەکانەوە قسەیان دەکرد. پیرەمێردێک کەوتە قسەکردن و سوپاسی خودای دەکرد کە پاڵەوانی ناوچەکە دووبارە بۆ هۆزەکەی ئەوان گەڕاوەتەوە و نزای سەلامەتی بۆ بێژەن کرد، باسی ئەرکەکانی پاڵەوانی دەکرد و دەیگوت پاڵەوان دەبێت ئەخلاقی ئیمامی عەلی و ڕۆستەمی داستانی هەبێت. هاوکاری هەژاران و لێقەوماوان بێت، هێمن و لەسەرخۆ بێت، ڕێزی هەموو کەسێک بگرێت و بە ڕەوشت و خاوەن ئابروو بێت. بێژەن گوتی بەسەرچاو، بەڵام عەلی خان بەڵێنی داوە من بکات بە سەرپەرشتیاری شوانەکان.

ئیتر لە نێو خەڵکەکەدا بوو بە دەنگەدەنگ. عەلی خان گوتی من بەڵێنی لەو جۆرەم نەداوە تەنها بەڵێنی ئەوەم پێداوە گەر براوە بوو چی بوێت پێی دەدەم؟ ئێستاش چی بوێت پێیدەدەم، بەڵام نایکەم بە سەرپەرشتیاری شوانەکان، ئەو پیاوەی کە قسەی دەکرد ناوی حاجی محەمەد سلێمان بوو، گوتی قسەی حاجی عەلی خان تەواوە، ئینجا ڕووی کردە بێژەن و گوتی دەبێت بۆ بوونت بە سەرپەرشتیاری شوانەکان چەند ساڵێک دان بەخۆتدا بگریت. حاجی عەلی گوتی خۆ من دەتوانم بیست سەر مەڕ بدەم بە هەمووتان خانووتان بدەمێ ڕەشماڵتان پێبدەم، بەڵام شتێک هەیە کەس ناتوانێت بیدات بە کەس ئەویش ئەزموونە. ئینجا ئاماژەیەکی بۆ من کرد و گوتی وەک ئەم برا یەزدییە کە ئێستا مامۆستایەتی دەتوانی بچیت ژنێکی بۆ بهێنێت، بەڵام ناتوانێت بیکات بەئەندازیار، ئەمیش ناتوانێت وا بەخێرایی ببێتە سەرپەرشتیاری شوانەکان. تا ئێستا کەسێکتان بینیوە ڕاستەوخۆ ببێت بە قائمقام یا ببێت سەرۆکی بنکەیەک. دەبێت چەند ساڵ وانە بخوێنێت و کاربکات ئەو کات دەتوانێت جڵەوی کارێک بگرێتە دەست. پیاوێکی تەمەن شەست ساڵ لەگۆشەیەکەوە دانیشتبوو ڕووی کردە حاجی عەلی خان وگوتی بێژەن کوڕێکی گەورە و تەواوە، کاتی ئەوەیەتی ژنی بۆ بهێنن، خۆکوڕە خوشکی خۆتە، تۆ بڕۆ ژنێکی بۆ بهێنە و با ببێت بە خاوەنی ماڵی خۆی ئەو کات ئەویش باسی سەرپەرشتیاری شوانەکان ناکات. بێژەن بەتوڕەییەوە هەستایە سەرپێ و گوتی من ژنم ناوێت و نامەوێت ژنبهێنم، من دەمەوێت ببم بەسەرپەرشتیاری شوانەکان. ئەو پیاوە گوتی تۆ نابێت ببیت بەسەرپەرشتیاری شوانەکان. بێژەن بەتوڕەییەوە گوتی بۆچی؟ پیاوەکە گوتی تۆ زۆر گەنجی، سەرپەرشتیاری شوان نابیت تەمەنی لە سیوپێنج ساڵ

کەمتربێت. تۆ ئەگەر ببیت بەسەرپەرشتیاری شوانەکان، حاجی عەلی داماو دەکەیت و دابونەریتی هۆزەکەمان تێکدەدەیت. وتوویژ بەردەوام بوو منیش چەندێک توانیم پرسیارم کرد و لە دەفتەرەکەمدا نووسیم. کاتی خۆرئاوابوون بوو، کەسێک گوتی مێگەلە مەڕەکە هاتەوە بۆ دۆشین. ژنان و پیاوان ڕۆیشتن بۆ لای ڕەشماڵەکانی خۆیان و دەستبەکار بوون بۆ دۆشینی مەڕەکانیان. وتوویژی بێژەن لەگەڵ خاڵۆیدا هیچ ئەنجامێکی نەبوو، بێژەن زۆر توڕە ببوو. پیاوە ڕیش سپییەکان پێیانگوت بوو بۆئەوەی ببێت بە سەرپەرشتیاری شوانەکان، دەبێت چەند ساڵێک چاوەڕوان بکەیت. بێژەنیش بەو قسانە توڕە ببوو. دونیا تاریک ببوو. دەنگی بێژەن دەهات دەیگوت موهەندیس لە کوێی لەگەڵ مندا دێیت بۆ لای مێگەلە مەڕەکە یا لێرە دەمێنیتەوە؟ دوو هاوڕێ خوێندکارەکەم لای حاجی عەلی خان مانەوە و منیش لەگەڵ بێژەن و ئەردۆ و سێ سەگ و زیاتر لە هەشتسەد سەر مەڕ و بزن و گوێدرێژێک کە خواردن و پێویستییەکانی لێ بارکرابوو، کەوتینەڕێ بەرەو بناری شاخەکە بۆ لەوەڕاندنی مێگەلە مەڕەکە.

ئەردۆ لە بێژەن بەتەمەنتر بوو، بەڵام شاگردی بێژەن بوو. ئەردۆ چەندین ساڵبوو شاگرد شوان بوو، بەڵام نەیتوانی بوو ببێت بە شوان. بێژەن توڕە دەهاتە بەرچاو، ئەو ڕۆژی پێشوو ببوو بەپاڵەوان، بەڵام هیچ گۆڕانکارییەک لە کارەکەیدا ڕووی نەدابوو، هەمان کوتەک بەدەست و هەمان شوان بوو. ئەو بەرانانەی کە پێشکەشی کرابوون، تێکەڵاوی مێگەلەکەی کردبوو. دیاربوو تاقەتی وەڵامدانەوەی پرسیارەکانی منیشی نەبوو. کەم کەم لە ئەردۆ نزیک بومەوە و لەگەڵ ئەودا کەوتمە قسەکردن. ئەردۆ فارسی باش تێدەگەیشت، بەڵام نەیدەتوانی بە باشی قسەی پێبکات. باش لەبیرمە ئەو شەوە دوانزەی مانگ بوو، ئاسمان ڕوون و ساف بوو. ئەردۆ ئەستێرەناسێکی باش بوو، ناوی سەدان ئەستێرەی دەزانی، ئەستێرە ناسیەکەی بەجۆرێک بوو کە ببووە جێی باوەڕی هەموو لایەک. ئەو دەیگوت نابێت مێگەلەکە ڕووی لەو ئەستێرەیە بێت. ئەگەر ڕووی لەوێ بێت ئەوا مەڕەکان خورییەکانیان هەڵدەوەرێت، ئەگەر بەرەو ئەو ئەستێرەیە بڕۆن ئەوا چەند مەڕێک شێت دەبن، بەڵام ئەگەر بەرەو ئەو ئەستێرەیەی تر بڕۆن ئەوا قەڵەودەبن. ئینجا گوتی ئەم گیایەی ئێرەباش نییە بۆیە دەبێت بەرەو بناری شاخەکە بڕۆین.

مێگەلەکە هێواش هێواش بۆ لەوەڕ بەرەو بناری شاخەکە دەڕۆیشت، ئەردۆ دەیویست دووبارە باسی ئەستێرەکانم بۆ بکات. بێژەن بانگی کرد و گوتی کەری بەرەڵا دیسانەوە سەیری ئاسمان دەکەیت! خێرا ئەو مەڕانە بگێڕەوە. ئەردۆش بەزوویی

مەڕەکانی گێڕانەوە. ئەوشەوە لەو کێوەماینەوە، لایتمان لانەبوو، تەنها فانۆسێکمان لابوو ئەویش کوژایەوە. بەو شەوە لەو کێوە سفرەمان ڕاخست و نانی ئێوارەمان خوارد. ئەستێرەکانی ئاسمان کەمێک ڕووناکییان پێبەخشیبووین، گوتم ئێرە ئەوەندە خۆشە وەک بەهەشت وایە. ئەردۆ گوتی بەڵێ ئێستا لە بەهەشت دەچێت، بەڵام هاوین زۆر وشک و گەرمە و زستانیش سارد و سەهۆڵبەندانە، ئێرە وەکو دۆزەخی لێدێت. لە ساڵێکدا یەک دوو مانگ وەکو بەهەشتە ئەوی تری دۆزەخە. بێژەن هەر توڕەبوو. ئەردۆ پێیگوت بێژەن میوانمان هەیە، کەمێک شمشاڵ لێبدە خۆ تۆ چەند ڕۆژێکی تر دەبێت بە سەرپەرشتیاری شوانەکان و گوڵسەنەم مارە دەبڕیت. بێژەن گوتی تۆ لە خۆتەوە قسەدەکەیت، ئەوەتا مێگەلەکە بڵاوبوونەوە نانەکەت بخۆ و بڕۆ بەلایانەوە منیش فانۆسەکە چاک دەکەم.

قەڵەم و دەفتەرم لە کۆڵەپشتەکەم دەرهێنا و بە بێژەنم گوت تۆ بەڵێنت بە دکتۆر عەباس داوە کە فێری خوێندن و نووسین ببیت. بێژەن گوتی باشە، بەڵام ئێستا شەوە بەیانی دەستپێدەکەین. منیش گوتم نابێت هەر ئێستا دەبێت دەست پێبکەین، منیش وشەیەکی گەورەم لەسەر کاغەزێک نووسی گوتم ئەمە چییە؟ گوتی نازانم تۆ پێم بڵێ چییە؟ گوتم نوسراوە سەرپەرشتیاری شوانەکان. بەو قسەیە گەشایەوە و گوتی بۆ دەکرێت بنووسین سەرپەرشتیاری شوانەکان. گوتم دەتوانیت لە سەر ڕووی کاغەز هەموو ناوێک و هەموو شتێک بنووسیت. گوتی دەکرێت لەسەر کاغەز ناوی خودا بنووسرێت؟ گوتم بەڵێ و بە زوویی لەسەر کاغەزەکە ناوی خودام نووسی و گوتم ئەوەش ناوی خودا. گوتی ئەوە ناوی خودا نییە. گوتم بۆچی؟ گوتی خودا زۆر گەورەیە، بەڵام ئەوەی تۆ نووسیوتە زۆر بچووکە. منیش دەفتەرەکەم کردەوە و لە دوو لاپەڕەی بەرامبەردا بەگەورەیی نووسیم خودا. سەیرێکی کرد و گوتی ئێستا کەمێک باشترە. گوتم وەرە وشەی سەرپەرشتیاری شوانەکان بنووسە. کات دەمەوبەیان بوو، مانگ لە ئاوابووندا بوو، کە بێژەن وشەی سەرپەرشتیاری شوانەکانی نووسی. بەڵام وا باشترە بڵێم وێنەی کێشابوو. من وشەکانم بۆ جیاکردەوە هەر لەوێ بێژەن شەش پیت فێربوو. وام بەباش زانی لەبری پیت پیت فێری بکەم، وشەی بۆ بنووسم و فێر بێت باشترە.

دیارە شەو هەر بە دوای مێگەلەکەوە بووین، کاتی بەیانی خەوم دەهات دوو کاتژمێر نووستم. مێگەلەکە دەبوو کاتژمێر حەوت بڕواتەوە بۆ دۆشین، ئەو دوو کاتژمێرەی کە من نووستم بێژەن زیاتر لە دەجار نووسی بووی سەرپەرشتیاری شوانەکان. کاتێک کە مێگەلەکە گەیشتەوە لای هەوارەکە، بێژەن ڕاستەوڕاست چوو بوو بۆ لای حاجی

عەلی خان و نووسینەکەی پیشان دا بوو، ئەویش خوێندەواری هەبوو. وایزانی بوو من بۆم نووسیووە. بێژەن قەڵەم و کاغەزی دەرکرد بوو لەبەر چاوی خان نووسی بووی سەرپەرشتیاری شوانەکان. منداڵەکانی خان لێمان کۆ ببوونەوە و سەیری نووسینەکانی بێژەنیان دەکرد. عەلی خان گوتی موهەندیس وا خەریکە بێژەن فێری خوێندەواری دەکەیت. گوتم بێژەن توانایەکی باشی هەیە، بەڵام دەبێت تەواو خۆمی لەگەڵدا ماندوو بکەم تا باش فێرببێت. بێژەن لە هەوارەکە دوو کاتژمێر نووست. منیش لەگەڵ دوو هاوڕێی خوێندکار و ڕەزا کامیلدا نانی بەیانیم خوارد و کەمێک نووستم. پاشان بێژەن هەڵسا و بانگی کردم گوتی با بڕۆین. مێگەلەکەمان پێش خۆمان دا و کەوتینە ڕێ. ئەو ڕۆژە هەوا گەرم بوو، ئەو ڕۆژە تەنها کاتی نیوەڕۆ کەمێک پشووم دا.

بە بێژەنم گوت وشەی سەرپەرشتیاری شوانەکان باش فێربوویت، ئێستا چی ترت فێر بکەم؟ گوتی ئارەزوی خۆتە. ئەردۆ گوتی وشەی گوڵی فێر بکە. بێژەن دەم و چاوی سوور بووەوە و مۆڕەیەکی لە ئەردۆ کرد. منیش وشەی گوڵم بۆ نووسی، زۆر زوو فێری وشەکە بوو، ئەو ڕۆژە تا نیوەڕۆ بیست جار وشەی گوڵی نووسی. هەر ئەو ڕۆژە دوو پیتی تر فێربوو. (گ) لەگەڵ (ل). کاتێک من و ئەردۆ لە بێژەن دوورکەوتینەوە، گوتم ئەردۆ مەبەستت چی بوو گوتت وشەی گوڵی فێر بکە؟. ئەردۆ بە سادەییەوە گوتی ئەو قسەیە نهێنییەکی تێدایە. گوتم بۆچی ئەو کچەی بێژەن خۆشی دەوێت ناوی گوڵەیە؟ ئەردۆ گوتی ناوی گوڵسەنەمە و کچە مامی خۆیەتی. پێش خۆرئاوابوون، بێژەن بە ئەردۆی گوت ئەم ئاژەڵە بێزمانانە تینوون، دەبێت ئەمڕۆ زووتر بگەڕێینەوە بۆ هەوارەکە. هەتاو هەموو دەموچاوی سووتاندبووم، زۆرم تینوبوو، بەو گەرمایە چەند کاتژمێرێک بوو ئاوم نەخواردبووەوە. ئەوردۆ دەستیکرد بە لێخوڕینی مێگەلەکە بەرەو کانیاوەکە. مەڕکانیش لە تینوێتیدا بە خێرایی دەڕۆیشتن و خۆیان گەیاندە گۆلە ئاوەکان. منیش لە تینوواندا وەک مەڕەکان دانەویمەوە و دەمم خستە ناو گۆلە ئاوەکەوە و تێر تێر ئاوم خواردەوە. پاشان سەر و دەموچاوم شۆرد، خۆ ئەگەر هێندە تینوو نەبوومایە هەرگیز وەک مەڕەکان دەمم نەدەخستە ناو گۆلە ئاوەکەوە. ئێمەی خەڵکی شار خۆڕاگر نین، بەرگەی ئازارەکان ناگرین. یەکەمین شەوی شوانیم بەهەشت بوو یەکەمین ڕۆژی شوانیم دۆزەخ..

ڕەزا کامیل ئەو دوو هاوڕێیەی تری بۆ لێکۆڵینەوە و پرسیارکردن برد بوو بۆ گوندەکانی دەوروبەر، ئەوان هێشتا نەگەڕابوونەوە. عەلی خان بانگی کردم و گوتی وەرە چا ئامادەیە. منیش ڕۆیشتم بۆ لای ڕەشماڵەکە و چایەکیان بۆ تێکردم، هەرگیز

چای وا بەلەزەتم نەخوارد بوو. بێژەنیش بە مرومۆچییەوە هات لامان دانیشت. عەلی خان ڕووی لە بێژەن کرد و گوتی بێژەن ئەمڕۆ موهەندیس چی فێرکردیت؟ بێژەن گوتی هیچ شتێک. لەو لاوە ئەردۆ هەڵیدایە و گوتی بێژەن درۆ دەکات، ئەمڕۆ موهەندیس فێری کردووە کە چۆن بنووسێت گوڵ. منداڵەکانی خانیش سەریان کردە سەر بێژەن و پێیانگوت دەبێت بنووسیت گوڵ. ئەویش کاغەزی لە گیرفانی دەرهێنا و بە جوانی نووسی گوڵ. یەکێک لە ژنەکانی حاجی عەلی هاواری کرد و گوتی ئافەرین هەر بژیت. حاجی عەلی گوتی پێویستە بڕۆین بۆ خوازبێنی. بێژەنیش بێدەنگ بوو قسەی نەدەکرد. وشەی سەرپەرشتیاری شوانەکان بۆ بێژەن نیشانەی هێز بوو، وشەی گوڵیش نیشانەی عیشق بوو. ئەو زۆر بەجوانی ئەو دوو وشەیەی دەنووسی. منیش ئەم دێڕە هۆنراوەیەم بیرکەوتەوە.

## وانەی مامۆستا، گەر زایەڵە بێ بۆ خۆشەویستی
## ڕۆژانی هەینیش منداڵی لاسار دێنێتەوە پۆل

دوو کوڕی خانیش لە هەوارەکەی خۆیانەوە بۆ گفتوگۆکردن هاتبوون بۆ لای باوکیان. سەرپەرشتیاری شوانەکان و چەند شوانێکیش هاتبوون. لەگەڵ حاجی عەلی کەوتنە قسەکردن. بڕیار وابوو دوو ڕۆژی تر کۆچ بکەن بەرەو کێوەکە. ئێمە لە نزیک گوندی سەردارئاوا بووین. حاجی عەلی تێیگەیاندن کە هەر مێگەلە و بە چ ڕێگایەکدا بڕوات، چونکە دەبێت ڕۆژی دواتر کاتی نیوەڕۆ بگەنە (سەرخەزوو). نەدەکرا هەموو مێگەلە مەڕەکان بە یەک ڕێگادا بڕۆن بەرەو کێوەکە. چونکە تووشی کێشەی کەم ئاوی و کەم لەوەڕی دەبوون. دەبوو هەر مێگەلە و لە گەردەنەیەکەوە بڕۆیشتایە. عەلی خان تێیگەیاندن لە ڕێگادا زۆر ئاگاداربن، مەڕەکان نەچنە نێو باخ و کشتوکاڵی دێهاتییەکانەوە. پێیگوتن ئەگەر حوشترەکان لقی درەختەکان بشکێنن و گەڵای درەختەکان بخۆن ئەوا شوانەکان و سەرقافڵەکان سزا دەدرێن. هەروەها بەشوانەکانی گوت ئەگەر لەگەڵ خەڵکی دێهاتەکاندا شەڕ و ئاژاوەگێڕی بکەن ئەوا ملتان دەشکێنم. عەلی خان تەواو دڵنیای کردنەوە کە مەڕ و حوشترەکان زیان بە باخ و کشتوکاڵی خەڵکی نەگەیەنن. لە هەوارەکەی حاجی عەلی دا زۆربەی ماڵەکان مەڕیان هەبوو، بەڵام هیچ ماڵێک لە (٦-٧) سەر زیاتریان نەبوو. ئەوان هەموویان کرێکاری ماڵی خان بوون، پیاوەکان شوان بوون و ژنانیش مەڕەکانیان دەدۆشی، مەشکەیان دەژەند، کەشکیان دروست دەکرد و ئاویان

دەهێنا. ئەگەر بێکاریش بوونایە ئەوا ڕەشماڵیان دەچنی، تەشیـیان دەڕست، تەونیان لە دار دەخست و بەڕەیان دروست دەکرد. بێکاری لای ئەوان هیچ مانایەکی نەبوو. دیارە کچەکانی خانیش کاریان دەکرد، بەڵام ئەوان بە جۆرێکی تر کاریان دەکرد. کاری ئەوان ئەسپ سواری و تفەنگ هەڵگرتن و فەرمانکردن بوو بە سەر خەڵکیدا، لەگەڵ خۆ گۆڕین و لەبەرکردنی جلوبەرگی تازە و جوان.

## گوڵبەهار و مەڕاسیمێک

هەموو ئەو خەڵکەی لە هەوارەکە بوون، خزم و کەسی یەکتری بوون، هەمووشیان خزمی نزیکی حاجی عەلی خان بوون.

چووم لە سەر بەردێک دانیشتم و سەری مەڕێکم گرت، لەولامەوە پیرەژنێک خەریکی مەڕدۆشین بوو، ناوی گوڵبەهار بوو، قژە سپییەکەی لە ژێر سەرپۆشەکەیەوە هاتبووە دەرەوە، دەموچاوی چرچولۆچ ببوو، چاوەکانی بەقوڵدا چووبوون و کەمبینا ببوون، ددانی لە دەمدا نەمابوو، لەبەر هەژاریی و بێپارەیی نەیتوانی بوو ددانی دەستکردیش دروست بکات. جلوبەرگێکی کۆنی لەبەردا بوو کە لە چەندین لاوە پینەی پێوە بوو، بەڵام ڕەنگی جلەکانی جوان بوون، ئەو کراسە کۆنەی لەبەریدا بوو گوڵی جوانی پێوە بوون، لە دامێنی کراسەکەیەوە چوار خەت هەبووکە نیشانەبوو بۆ ئەوەی دایکی چوار منداڵە.

زۆر بەخێرایی مەڕەکانی دەدۆشی، سەیرێکی کردم و گوتی. کاکی موهەندیس ناوت چییە؟ گوتم ناوم حسێنە. گوتی خەڵکی کوێیت؟ گوتم خەڵکی یەزدم. گوتی یەزد چ گوندێکە؟. خەڵکی ئەو دێیە ڕەشماڵنشینن، یان کشتوکاڵ دەکەن؟ گوتم هیچیان، یەزد، شارە و خەڵکەکەی ڕەشماڵنشین نین و لە دەوروبەری یەزد کشتوکاڵ دەکرێت، بەڵام خەڵکی ناو شار نە ڕەشماڵنشینن و نە کشتوکاڵ دەکەن. گوتی ئەی چی دەخۆن؟ ئەگەر نانی گەنم و شیر و ڕۆن و گۆشت نەخۆن چی دەخۆن؟ ناچاربووم بەتەواوی بکەومە قسەکردن لەگەڵ گوڵبەهاردا. پێمگوت چەندین شوێن هەیە لەم جیهانەدا پێیان دەڵێن شار، نە ئاژەڵداریی دەکەن و نە کشتوکاڵ. گوڵبەهار باوەڕی نەدەکرد شوێنێک هەبێت خەڵکەکەی نە ئاژەڵداریی بکەن و نە کشتوکاڵ.

چەند ژنێکیش لەو ناوە بوون، ئەوانیش خەریکی مەڕدۆشین بوون، گوێیان لەقسەکانی من و گوڵبەهار گرتبوو. دوای تەواو بوونی شیردۆشین. چەند ژن و منداڵێک لە دەورم کۆبوونەوە و کەوتنە گفتوگۆ لەگەڵم، بەڵام زۆربەیان فارسیان نەدەزانی و

لە نێو خۆیاندا بە زمانی کوردی قسەیان دەکرد. گوڵبەهار فارسی دەزانی و هەر لە منداڵیەوە فێرببوو، ئەو پێشتر خزمەتکاری ماڵە دەوڵەمەندێکی فارس ببوو لە بۆجنوورد، چەندین ساڵ لەو ماڵە کاریکردبوو، ژن و منداڵی ئەو ماڵە بە فارسی قسەیان کردبۆو، ئەویش لە ئەوانەوە فێری فارسی ببوو. ئەو لە هەموو تەمەنیدا نەچووبوو بۆ هیچ شارێکی تر.

ئەم کوردە کۆچەریانە لەکاتی کۆچکردندا بە نزیک شارەکانی قوچان و شێروان و بۆجنووردا تێدەپەڕین، بەڵام گوڵبەهار و زۆربەی ژنەکانی تریش هەرگیز نەچووبوونە ئەو شارۆچکانەش. گوڵبەهار بەتەواوی لە وشەی شار تێنەدەگەیشت، تەنها ئەوەندەی دەزانی کە شوێنێک هەیە و لەو شوێنە دکتۆر و دەرمان هەیە. ئەو کەسانەی کە نەخۆش دەکەون دەچن بۆ ئەو شوێنە.

نزیکەی (١٥-٢٠) ژن و منداڵ لەدەورم کۆبوونەوە. لێم پرسین، کێ لە ئێوە چووە بۆ شار؟ تەنها دوو کەس چووبوون بۆ شێروان. ساڵی (١٣٤٧-١٩٦٨) بوو ئەو کات شێروانیش شار نەبوو، بەڵکو گوندێکی گەورە بوو. ئەو گفتوگۆیەی من لەگەڵ گوڵبەهار و خەڵکە کۆچەرییە سادەکان وایکرد کە زیاتر لێیان نزیک ببمەوە. بە گوڵبەهارم گوت مۆڵەتم دەدەیت بێم بۆ ڕەشماڵەکەی تۆ کەمێک دانیشم. گوتی بەڵێ ئێوارە وەرە بۆ لای من.

نزیکی ئێوارە بوو نان و چا لە ڕەشماڵەکەی حاجی عەلی خان ئامادە کرابوو، بەڵام من حەزمدەکرد بچم بۆ ماڵی خەڵکە سادەکە، گوڵبەهار منی برد بۆ ڕەشماڵەکەی خۆی کە تەنها شەست مەتر لە ڕەشماڵی حاجی عەلی خانەوە دوور بوو. لە دوورەوە بۆن و بەرامەی هەژاری لە ماڵەکەی دەهات. ڕەشماڵەکەیان لە هەموو لایەکەوە دڕا بوو، ڕەشماڵ لای ئەم کۆچەرییانە وەک خانووی دوو قات و سێ قاتی شار وابوو. ئەم کۆچەرییانە هەوڵیان دەدا دوو ساڵ جارێک ڕەشماڵەکانیان بگۆڕن و حەزیاندەکرد هەمیشە ڕەشماڵەکانیان تازە بێت. گوڵبەهار چەندین ساڵ بوو نەیتوانی بوو ڕەشماڵەکەی بگۆڕێت. بەدوای مندا چەند منداڵێکی ڕەشوڕووتی پێخاوس هاتن بۆ ڕەشماڵەکەی گوڵبەهار، منداڵەکان هەموویان تووشی چاوئێشە ببوون و هەموو گیانیان چڵک و پیسی بوو.

منداڵێکی تەمەن (٦-٧) ساڵ کە زۆر چڵکن بوو چاوەکانی سووربببوونەوە و ڕیپۆقیان دەردابوو، قژە سەری بستێک هاتبوو، جلەکانی لە هەموو لایەکەوە دڕا بوو. لەوناوە دەسوڕایەوە خەڵکەکە بەو منداڵەیان دەگوت «یەلە» واتە وێڵ یا بەرەڵا. ئەگەر

ئەسپ و هێستر لەو ناوە بەرەڵابوونایە و شوانیان نەبوایە پێیاندەگوتن «یەلە».

کاتێک من گەیشتمە ناو ئەم کۆچەریانە و «یەلە» چاوی بە من کەوت زۆر هۆگرم بوو. بۆ هەر شوێنێک بڕۆشتمایە ئەو بەشوێنمەوە بوو، هیچ قسەیەکی نەدەکرد، بەڵام هەمیشە بەشوێن منەوە بوو. کاتی شیردۆشین «یەلە» دەچوو بزن و مەڕەکانی بۆ بێرییەکان دەگرت و هاوکاری دەکردن، بەبێ هیچ خۆ ماندووکردنێک دەچوو بە دوو پەنجە چەناگەی مەڕەکانی دەگرت و دەیبردن بۆلای بێرییەکان. ئەو بە شێوەیەکی زۆر زیرەکانە مەڕەکانی دەگرت. من چەندین جار ویستوومە وەکو ئەو مەڕەکان بگرم، بەڵام هەر چەندم دەکرد نەمدەتوانی. خۆ ڕەنگە بزن و مەڕەکان «یەلە»یان ناسی بێت.

چووم بۆ ڕەشماڵەکەی گوڵبەهار و «یەلە»ش بە شوێنمدا هات، ڕەشماڵێکی بچکۆلانەی کۆنی دڕاوی هەبوو لە نێو ڕەشماڵەکەدا پارچە جەواڵێکی کۆنی دڕاو ڕاخرابوو. یەک دەست نوێنی بێکەڵکیش دانرابوو پارچە جاجمە شڕێکی بەسەردا درابوو، کتری و قۆری و قابلەمەیەک لەگەڵ جەواڵێک کە هەندێک خواردنی تێدا بوو لەوێ دانرابوون، هەموو سامانی گوڵبەهار و هاوسەرەکەی ئەوەندە بوو.

گوڵبەهار هەندێک چیلکە و چەوێڵی هێنا و لە قوڵکەی نێوەڕاستی ڕەشماڵەکەدا ئاگرێکی کردەوە و کتری و قۆرییەکەی پڕ کردن لە ئاو و خستنیە سەر ئاگرەکە. منداڵانیش لە دەوری من دانیشتبوون، زۆربەیان فارسیان نەدەزانی تاکو قسەیان لەگەڵدا بکەم، هیچ کام لەو منداڵانە نەچووبوونە قوتابخانە. پیرەمێردێکی پیری پشت چەماوە بەخۆی و وڵاخێکەوە گەیشتە لای ڕەشماڵەکە، ئەو پیرەمێردە هاوسەری گوڵبەهار بوو، هاتە نێو ڕەشماڵەکەوە، کە چاوی بە من کەوت خۆشحاڵی لەڕوویدا بەدیدەکرا. گوتی موهەندیس چۆن بوو هاتیت بۆ ڕەشماڵی ئێمەی هەژار؟ تۆ دەبێت بچیت بۆ ڕەشماڵی خان. گوتم بۆچی ئێوە میوان ڕاناگرن؟ گوتی میوان خۆشەویستی خودایە. میوان هەردوک چاوی ئێمەیە، بەڵام خان پێیناخۆشە تۆ لەماڵی ئێمە بیت. دوایی پێماندەڵێت بۆچی میوانی ئێمەتان بردووە بۆ ماڵی خۆتان؟ گوتم خۆم بە خان دەڵێم کە خۆم هاتووم بۆ ماڵی ئێوە. ئەو پیرە پیاوە کرێکاری خان بوو، کاری بۆ ئەوان دەکرد. ئەو بە وڵاخێک کە وڵاخی خۆی نەبوو بەڵکو هی خان بوو چیلکە و داری دەهێنا بۆ شیرکوڵاندن و چێشتلێنان، کاری بۆ خان دەکرد و دەبوو هەر کارێکیان پێبسپاردایە بەزوویی ئەنجامی بدات. دەبوو بچێت لە شاخەکە دار بهێنێت، دەبوو ئەسپ و هێسترەکانی عەلی خان تیمار بکات و چاودێرییان بکات، دەبوو پەیامی خان بگەیەنێت بۆ هەر شوێنێک کە پێویستی بکردایە، هەروەها لەگەڵ عەلی خاندا دەچوو بۆ

ڕاو و خان هەر ئاژەڵێکی کێوی بکوشتایە دەبوو ئەو بە کۆڵ لە شاخەکەوە بیهێنێتە خوارەوە، دەبوو گژ و گیای کێوی بۆ ماڵی خان کۆ بکاتەوە و زستانانیش هاوکاربێت لە پێدانی جۆ و ئالف بۆ ئاژەڵەکان. بەگشتی ئەم پیرەمێردە دەبوو لە بەیانی پێش مەلا بانگدانەوە کاری بکردایە تاکو نیوە شەو. بەیانی زوو لەماڵەوە دەردەچوو تاکو ئێوارە نەدەگەڕایەوە بۆ ماڵەوە، ئێوارەش پارووە نانێک و پیاڵەیەک چای دەخوارد و دەڕۆیشتە دەرەوە بۆ چارەسەرکردنی وڵاخەکان و شەو درەنگ هیلاک وماندوو دەگەڕایەوە بۆ ڕەشماڵەکەی خۆیان. ئەو لە دارای دونیا، تەنها سێ بزنی هەبوو، کە لەگەڵ مێگەلە مەڕەکەی خاندا بوون. ئەو وڵاخەش کەکاری پێدەکرد هی خۆی نەبوو، بەڵکو هی خان بوو. ئەو پیاوە پیرە ناوی جان محەمەد بوو، بەڵام پێیاندەگوت جان. ئەو خزمی نزیکی عەلی خان بوو، محەمەد جان دەیگوت خزم بەکەڵکی چی دێت؟ من وا خەریکە لە قاچ دەکەوم هیچ کەسێک لە ئێمە ناپرسێتەوە.

دەنگی ئۆتۆمبێلێک هات کە سەیرمانکرد هاوڕێکانی من بوون، لە دێهاتەکانی دەوروبـەرەوە گەڕابوونەوە. ئـەوان چوونە نێو ڕەشماڵەکەی عەلی خانەوە. بانگی منیشیان کرد کە بچم بۆ ڕەشماڵی خان، بەڵام من لە سەر پارچە پەلاسێک دانیشتبووم و ئارەزووم دەکرد هەڵنەستم و هەر لەوێ دانیشم. گوڵبەهاریش چوو بوو بۆ ڕەشماڵی دراوسێکەیان، تاکو شتێک قەرز بکات و دەرخواردی منی بدات. ئاوی کترێەکە کوڵا بوو، بەڵام هەواڵێک لە چا نەبوو. هەندێک گیای کێوییان هێنا و کردیانە ناو قۆرییەکەوە و ئاوە گەرمەکەیان تێکرد. چەند پیاڵەیەک لەو ئاوە گیاییەیان بۆ تێکردم، کە هەر بەڕاستی تام و لەزەتێکی تایبەتی هەبوو، بەڵام شەکریان نەبوو بەبێ شەکر خواردمانەوە. لە گوڵبەهارم پرسی بەڕۆژ چ کارێک دەکات؟ گوتی بەیانیان زوو لەگەڵ قوقەی کەڵەشێر هەڵدەستم، ماستەکەی ماڵی عەلی خان دەکەمە نێو مەشکەوە و دەیژێنم. ئێستا کە بـەهارە و شیر زۆرە دەبێت هەموو ڕۆژێک (٥-٦) جار مەشکە بژەنم، هەرجارێک نزیکەی کاتژمێرێک بۆ کاتژمێر و نیوێک کاتی دەوێت، هەموو ڕۆژێک تا دووجار مەشکە دەژەنم مێگەلە مەڕەکە دێتەوە ناچار واز لە مەشکەژەندن دەهێنم و هەڵیدەگرم بۆ دوایی و دەچم بۆ دۆشینی مەڕەکان و دەبێت من ڕۆژانە هەشتا سەر مەڕ بدۆشم. پاشان چەند کوندە ئاوێک ببەم بۆ ڕەشماڵی عەلی خان، دواتر دێمەوە و شیرەکە دەکوڵێنم و هەوێنی دەکەم، بۆ سبەی بەیانی دەبێت بە ماست. دووبارە دەستدەکەمەوە بە مەشکەژەندن تا هەموو ماستەکە تەواو دەکەم، پاشان دەچم تێکڕای قاپ و کەوچک و پیاڵەکانی ماڵی عەلی خان دەشۆم. دوای ئەوە ڕۆنەکەرەی ناو دۆکە جیا دەکەمەوە

و ئیتر ئاگر دەکەمەوە و دۆکە دەخەمە سەر ئاگر و دەیکوڵێنم و کەشکی لێ دروست دەکەم.

گوتم گوڵبەهار ئەی منداڵتان نییە؟ پیرە مێرد و پیرە ژن ئاخێکیان هەڵکێشا و گوتیان خودا چوار منداڵی پێداین، بەڵام بە داخەوە هەر بە منداڵی هەر چواریان مردن. گوتم بۆچی مردن؟ گوتیان خودا تەمەنی پێنەدان و بەشی ئێمە نەبوون، یەکێکیان تەمەنی یازدە ساڵ بوو نەخۆشکەوت و مرد. ئەوانی تریش دەبوونە دووساڵ و دەمردن.

منداڵێک هاتە ژوورەوە و گوتی موهەندیس عەلی خان دەڵێت بابێت بۆ ڕەشماڵەکەی ئێمە نانی ئێوارە ئامادەیە. گوتم برۆ بە عەلی خان بڵێ با ئەوان نانی خۆیان بخۆن، من دوایی دێم. پاش کەمێک بێژەن هات گوتی مێگەلەکە دەبەم بۆ لەوەڕ تۆ دێیت یان نا؟ گوتم مێگەلەکە دەبەیت بۆ کوێ؟ گوتی بۆ دەستە چەپی شوێنەکەی دوێنێ؟ گوتم تۆ برۆ دوای کاتژمێرێکی تر من خۆم دێم بۆ لاتان. قسەکانم لەگەڵ گوڵبەهار و هاوسەرەکەی تەواو نەببوو، سەیرم کرد ئەو ژن و پیاوە بەیەکەوە بە زمانی کوردی قسە دەکەن. ژنەکە بە توڕەییەوە قسەی دەکرد. لێم پرسین ئەوە چیە؟ بۆ وا بە توڕەیەوە قسە دەکەن. ژنەکە گوتی هاوسەرەکەم دەڵێت عەلی خان پێیناخۆشە میوانەکەی هاتووە بۆ ماڵی ئێمە، منیش پێمگوتووە عەلی خان پێیخۆشە یا پێیناخۆشە کەیفی خۆیەتی. چیدەکات با بیکات خۆ ژیانمان لە ئیستا خراپتر نابێت و هیچ شتێکمان نییە تا لەدەستی بدەین. گوڵبەهار گوتی ئەم عەلی خانە کوڕە خاڵی خۆمە. لە بەیانی زووەوە تا شەو من کاری بۆ دەکەم مانگانە تەنها (٧مەن = ٤٢ کیلۆ) ئاردم پێدەدات، لە تەواوی وەرزی بەهاردا تەنها یەک جار شیری مەڕەکانی بۆ منە، واتە لە تەواوی ئەو ماوەیەدا کە مەڕەکان شیریان تێدایە یەکجار شیری مێگەلەکە بۆ گوڵبەهار و هاوسەرەکەی دەبوو. گوڵبەهار دەبوو ئەو شیرە بکات بە ماست و لە مەشکەدا بێژەنێت، ڕۆنە کەرەکەی بگرێت، لە دۆکەی کەشک دروست بکات. لەبری ئەو هەموو شەکەتی و ماندوو بوونە لە ماوەی یەک ساڵدا، یەک جار شیرەکە بۆ گوڵبەهار بوو، نەک یەک ڕۆژ، گوڵبەهار هەموو ڕۆژێک ئەو مەڕانەی دوو جار دەدۆشی، بەیانیان و ئێواران. بەم هەموو ئەرک و ماندوبوونەشەوە لە ساڵێکدا یەک جار شیرەکە بۆ گوڵبەهار و هاوسەرەکەی بوو. عەلی خان مانگانە تەنها پانزە تومەن واتە ڕۆژانە پێنج ڕیاڵ پارەی بەو ژن و مێردە دەدا. بە چەند ساڵێکیش ڕەشماڵە کۆنێکی پێدەدان.

دووری نێوان ڕەشماڵەکەی عەلی خان و گوڵبەهار لە شەست مەتر زیاتر نەبوو، بەڵام نێوانی باری ئابووریی و ژیانیان لە ئەرزەوە بۆ ئاسمان بوو. خۆ هەرچەندە

خانیش ئەگەر هەموو مەڕەکانی خۆی بفرۆشتایە نەیدەتوانی دوو دوکانی لە شاری تاراندا پێبکڕێت.

گوڵبەهار سێ مریشکی هەبوو، بەڵام حوشتری نەبوو، لەکاتی کۆچکردندا سوودی لەو وڵاخە وەردەگرت کە عەلی خان پێیدابوون و کاریان بۆ ئەو، پێدەکرد. ئەوان هیچ کەلوپەلیان نەبوو، جگە لە ڕەشماڵێکی بچووک، لێفەیەک، قابلەمەیەک، دوو سێ قاپ، کتری و قۆرییەک. هەموو ماڵەکەیان باری کەرێک نەدەبوو، لەکاتی هەوار گواستنەوەدا سێ مریشکەکەشیان بە سەر باری گوێدرێژەکەوە دەبەست و دەڕۆشتن. حاجی عەلی خان زیاتر لە چلوپێنج حوشتری هەبوو. لەکاتی کۆچکردندا هەموو حوشترەکانی بۆ سوار بوون و باربردن بەکاردەهێنا. گوڵبەهار گوتی ئەگەر لای ئێمە نان دەخۆیت ئەوا هێلکە و ڕۆنت بۆ دروست دەکەم. دووبارە خان ناردیەوە بە شوێنمدا، کە خواردن ئامادەیە و بچم لەوێ نان بخۆم، بەڵام من ئەمجارەش ڕەتمکردەوە و گوتم نایەم من لێرە نان دەخۆم. لەولاوە ژنێکی دراوسێیان هات، ئەویش لە هەژارییدا گوڵبەهارێکی تر بوو، ئەویش هەر خزمەتکاری ماڵی عەلی خان بوو، تازە بە ساج نانی دروست کردبوو. ئەو خەڵکە تەنووریان نەبوو بۆ نانکردن. بەڵکو لەسەر ساج نانیان دەبرژاند. لە زۆربەی زۆری هەوارە کۆچەرییەکاندا تەنوور نەبوو، ئەوان لە هەر هەوارێکدا سێ مانگ زیاتر نەدەمانەوە، ئەو ژنە کاتێک زانیبووی من میوانی ڕەشماڵی گوڵبەهارم، چەند نانێکی هێنا و گوتی ئەم نانەم تازە دروستکردووە. منداڵە وردەکان کە ڕۆیشتبوونەوە، گوتبوویان موهەندیس لە ماڵی گوڵبەهارە. ئەو خەڵکە هەژارە کە یەک لە یەکتری هەژارتر بوون، هەر کەسە و لە ماڵی خۆیەوە شتێکی دەهێنا، یەکێک دوو هێلکە و یەکێک کەمێک ڕۆنە کەرە و یەکێکی تر تەنها چوار دەنک خورما. نەمدەزانی خورمایان لەکوێوە هێنابوو، تەنها چوار دەنک خورما لە ژێر پیاڵەیەکدا. یەکێکی تر پیاڵەیەک ئاوی نەباتی هێنابوو.

گوڵبەهار گوتی کاکی موهەندیس هاتنی تۆ بۆ ڕەشماڵی ئێمە بەرەکەتە و هەر لێرە نانەکەت بخۆ. گوتم باشە لێرە نان دەخۆم، تۆش هێلکە و ڕۆنەکە دروستبکە. منیش چووم بۆ لای ئۆتۆمبێلەکە دوو قوتو گۆشتە ماسی و یەک قوتو لۆبیام هێنا بۆ نێو ڕەشماڵەکە. ئەمجارەش کوڕەکەی عەلی خان هات بەشوێنما و وەک ئەمرێک گوتی کاکی موهەندیس عەلی خان دەڵێت هەر ئێستا بێت بۆ ئێرە. تێگەیشتم کە عەلی خان پێی ناخۆشە هاتوومەتە ڕەشماڵەکەی گوڵبەهار. گوتم من وا لێرە نان دەخۆم و پاشان دەچم بۆ لای بێژەن. ئەمجارەیان بەتوڕەییەوە گوتی خان دەڵێت بابێت بۆ ئێرە. منیش بەکەمێک توڕەییەوە گوتم ئینشائەڵڵا سبەی بەیانی دێم.

گوڵبەهار و هاوسەرەکەی یەک قسەیان نەکرد. کوڕی خان ڕۆیشت. تێگەیشتم بەم کارەم خەریکە پەیوەندی خۆم لەگەڵ عەلی خاندا تێکدەدەم، بەڵام زۆر حەزمدەکرد لە بارەی ژیانی خەڵکانی هەژار و کەمدەرامەتی ئەم کۆچەرییانەوە شتێک بزانم. خەڵکانی هاوشێوەی حاجی عەلی خان لە هەموو باکووری خۆراساندا چەند کەسێکی کەم بوون، بەڵام هاوشێوەی گوڵبەهار یەکجار زۆر بوون. کاتێک کە لێکۆڵینەوەی کۆچەرییەکانی باکوری خۆراسانم دەستپێکرد، تێگەیشتم کە ٦٥٪ ی خەڵکە کۆچەرییەکانی باکووری خۆراسان لە دەوروبــەری ساڵی (١٣٤٠-١٩٦١) دا ژیانیان هەر وەکو گوڵبەهار و هاوسەرەکەی بووە.

محەمەد جان -هاوسەری گوڵبەهار- نیگەران بوو لەوەی عەلی خان پێیناخۆشە من لە ماڵی ئەوانم، بەڵام گوڵبەهار خۆشحاڵبوو کە من میوانیانم، بە بەردەوامی دەیگوت موهەندیس گیان گەورەت کردین بەو میوانداریيەت خۆشحاڵت کردین، چەندین ساڵە میوانێک ڕووی لە ماڵی ئێمە نەکردووە، هەر کەسێک ڕووبکاتە هەوارەکەمان، دەچێت بۆ ڕەشماڵەکەی عەلی خان. هێلکە و ڕۆنەکە ئامادە کرابوو، منیش یەکێک لە قوتووە گۆشتە ماسیەکانم هەڵپچڕی. گوڵبەهار و ئەوان هەرگیز ماسی قوتوویان نەخواردبوو، ئەوان تەنها چەند جارێک ماسیان خواردبوو. ماسیان لە ڕووبارەکەی سەر ڕێگایان گرتبوو. گوڵبەهار هەندێک خواردنی کردە قاپێکەوە و لەگەڵ پارچە نانێک دای بە «یەلە»، ئەویش زۆر بە تامەزرۆییەوە نانەکەی بەگۆشت ماسی و هێلکە و ڕۆنەکەوە خوارد. لە گوڵبەهارم پرسی ئەمە منداڵی کێیە؟.. گوتی منداڵی خودایە. گوتم مانای چیە؟ گوتی باوکی شوانێکی هەژار بوو ناوی موراد بوو، کاتێک «یەلە» لە سکی دایکیدا بوو، موراد لە کێو هەڵدێرا و مرد. کاتێک «یەلە» لەدایکبوو دایکیشی بەسەر ئەوەوە مرد، ئیتر «یەلە» هەتیوو و بێکەس مایەوە. موراد و ژنەکەی هیچ خزم و کەسێکیان نەبوو، تەنها پوورێکی موراد هەبوو کە چاودێری دەکرد، ژنێک چەند جارێک شیری پێدا، بەڵام «یەلە» زیاتر شیری بزنی خواردووە نەک شیری مرۆڤ. ئێستا «یەلە» لەم هەوارەدا بەرەڵایە و هەر شوێنێک ئارەزووی کرد لێی دەخەوێت و هەر شتێکی بەر دەستبکەوێت دەیخوات. ئێمەش هەژارین ناتوانین چاودێری بکەین، تەنانەت هیچ کەسێکیش هیچ ناوێکی لەم منداڵە نەناوە. تەنها پێی دەڵێن «یەلە» (بەرەڵا). هەر بە «یەلە»ش بانگی دەکەن.

«یەلە» هێمن و بێدەنگ دانیشتبوو، گوێی بۆ قسەکانی گوڵبەهار گرتبوو. چاوەکانی زەق کردبوونەوە و سەیری منی دەکرد. گوتم بەڵام پێویستە کەسێک بێت و ئەم منداڵە

بشوات و جلوبەرگی پاکی بۆ لەبەر بکات. «یەلە» لە هەموو شتێک تێدەگەیشت و فرمێسک بەچاوەکانیدا دەهاتنە خوارەوە. پەنجەکانی خۆی لستنەوە و گوتی خواردنەکە تەواو بوو. دیاربوو کە تێری نەخوارد بوو، خواردنەکەشی تەواوببوو. بە گوڵبەهارم گوت دەکرێت دراوسێکانم بۆ بانگ بکەیت و بێنە لام؟ گوتی ئێستا پێیان دەڵێم بێن. محەمەد جان گوتی من زۆر دەترسم عەلی خان پێیناخۆش بێت. گوڵبەهار گوتی پێیناخۆشە کەیفی خۆیەتی. گوڵبەهار تەنها چەند ددانێک لەدەمیدا مابوو. محەمەد جانیش نیوەی ددانەکانی کەوتبوو. گوڵبەهار ڕۆیشت بەشوێن دراوسێکاندا. لەماوەی چەند خولەکێکدا (١٥-١٦) پیاو و ژن و (٣٠-٤٠) منداڵ کۆبوونەوە. خەڵکەکە لە ڕەشماڵەکەی گوڵبەهاردا جێگایان نەدەبووەوە. بۆیە لەبەر دەمی ڕەشماڵەکە دانیشتن. چەند کەسێک فانۆسیان لەگەڵ خۆیاندا هێنا بوو. پیاوەکان ئاگرێکیان کردەوە و خەریکی چا لێنان بوون و کتریان خستە سەر ئاگر. خۆ کتری ئەمانە لەکتری نەدەچوو هەر وەک مەسینەیەکی گەورە وابوو دەسکیان پێوە بوو. چایان لێناو ڕەزا کامیل لە ڕەشماڵەکەی خانەوە هات و بانگی کردم، بردمییە گۆشەیەکەوە و گوتی عەلی خان زۆر تووڕەیە لێت، گوتویەتی خۆ بڕیارەکە وا نەبوو کە ئەم کاکی موهەندیسە خەڵکی کۆ بکاتەوە و باسی سیاسەتیان بۆ بکات. تێگەیشتم کە عەلی خان دەیەوێت کێشەم بۆ دروست بکات. گوتم برۆ پێی بڵێ کە ئێمە هیچ قسەیەکی سیاسی ناکەین، تەنها دەمانەوێت مەراسیمێک بۆ حەزرەتی عەباس ڕێکبخەین. با عەلی خان خۆشی بێت بۆ مەراسیمەکە. ڕەزا کامیل گوتی تۆ بەڕاستی دەتەوێت لێرەدا مەراسیمی حەزرەتی عەباس بگێڕیت؟ گوتم من هاتووم بۆ ڕەشماڵی کچە پووری عەلی خان، دەمەوێت لەبارەی بزن و مەڕ و گیای کێوییەوە هەندێک پرسیار بکەم، بەڵام عەلی خان دەیەوێت تۆمەتم بۆ دروست بکات و دەڵێت باسی سیاسەت دەکات، بەڵام من مەراسیم بۆ حەزرەتی عەباس دەگێڕم. ڕەزا کامیل گوتی حسێن تۆدەتەوێت لێرە هێز و گەورەیی عەلی خان بخەیتە ژێر پرسیارەوە. یەکەم کار دەتەوێت شوانەکەی فێری خوێندەواری بکەیت. پاشان خەریکی خزمەتکارەکانی و هەژارەکان لە دەوری خۆت کۆدەکەیتەوە. ئێستاش دەتەوێت لێرە مەراسیمێک ڕێک بخەیت. گوتم من ئەم شەو هەر لێرەدا و لەبەر دەمی ئەم ڕەشماڵەدا لەنێو ئەو خەڵکە هەژارەدا مەراسیمی حەزرەتی عەباس ڕێکدەخەم.

ڕەزا کامیل پیاوێکی باشبوو، چەندین ساڵبوو شۆفێری زانکۆی مەشهەد بوو. گوتی حسێن گیان تکایە لەکەری شەیتان وەرە خوارەوە. بەم شەوە و لەم چۆڵەوانییەدا مەراسیمی حەزرەتی عەباس هیچ مانایەکی نییە. گوتم من ئەو مەراسیمە هەردەکەم.

ڕەزا کامیل گوتی، وەڵڵا تۆ بەهانە دەدەیتە دەست عەلی خان، ئاخر بەم شەوە درەنگە خۆ هیچ کارێک ئەوەندەی مەراسیمی حەزرەتی عەباس سیاسی نییە. منیش بەدەنگێکی بەرز گوتم. گوڵبەهار من دەمەوێت مەراسیم بخوێنم لە نێو ڕەشماڵەکەی تۆدا، ئایا تۆ مۆڵەتم پێدەدەیت؟ گوڵبەهار و هاوسەرەکەی گوتیان ئێمە سەگی کێین کە مۆڵەت بە تۆ نەدەین؟..

محەمەدجان گوتی سڵاوات لێدەن. بە دەنگێکی بەرز گوتم ڕەزا کامیل برۆ بە عەلی خان بڵێ با ئەویش بێت بۆ مەراسیمەکە. ئینجا بە هێواشی بە ڕەزا کامیلم گوت ئەگەر عەلی خان نەیەت بۆ ئەم مەراسیمە سبەینێ ناتوانێت لەناو ئەو خەڵکەدا بڵێ من خانم. ڕەزا کامیل گوتی عەلی خان نایەت بۆ ئەو مەراسیمە. گوتم من گرەو دەکەم کە دێت چونکە خان هەم لە خەڵکەکەی دەترسێت هەم لە ئیمام عەباس. دووسێ پیاو ڕۆشتن دوو کۆپانی گوێدرێژیان هێناو لەسەر یەک دایاننان و منیش چووم لەسەریان دانیشتم، تا دەست بکەم بە خوێندنی مەراسیمەکە. گوتم چەند خولەکێک سەبر بکەن تا عەلی خان دێت. عەزیزی هاوڕێم هات و گوتی حسێن ئەوە چیە؟ گوتم دەمەوێت مەراسیمێک بۆ حەزرەتی عەباس بخوێنم و برۆ بە عەلی خان بڵێ با ئەویش بێت. عەزیز گوتی مەگەر تۆ دەزانیت مەراسیم بخوێنیت، گوتم من سەدان جار چووم بۆ ئەو مەراسیمانە و ئیستاش لێرە مەراسیمێک دەخوێنم. عەزیز گوتی عەلی خان ئەوەندە پەستە خەنجەری لێبدەیت خوێنی لێنایەت، ئیستا چۆن بچم پێی بڵێم حسێن دەڵێت بێت بۆ مەراسیمەکە.

بەردەمی ڕەشماڵەکەی گوڵبەهار وردە وردە قەرەباڵغ بوو. منیش چوومە سەر کۆپانە گوێدرێژەکە دانیشتم و گوتم سڵاوات لە دیداری پاکی پێغەمبەرمان. سەیرم کرد لە ڕەشماڵی خانەوە چەند چرا بەدەستێک هاتنە دەرەوە. چەند خولەکێک دواتر عەلی خان و کوڕ و کچ و ژنە کانیشی هاتن، هەموو خەڵکەکە لەبەر عەلی خان هەڵسان. خزمەتکارەکانی فەرشیان لەگەڵ خۆیاندا هێنابوو، فەرشەکانیان ڕاخستن. عەلی خان و خانەوادەکەی لەسەر فەرشەکان دانیشتن، خەڵکەکەی تریش لەسەر زەوی دانیشتبوون. کاتێک سەیرم کرد کچە گەورەکەی عەلی خان نەهاتبوو. هەمان ئەو کچەی کە جلوبەرگەکەی لەگەڵ خەڵکەکانی تر جیاواز بوو. ئەو تەنها کەسی خانەوادەی خان بوو نەهاتبوو بۆ مەراسیمەکە. دەستمکرد بە خوێندنی مەراسیمەکە. نازانم ئەو خەڵکە لە فارسی تێدەگەیشتن یان نا، بەڵام بە ناوهێنانی ئیمام عەباس دەستیان دەکرد بە گریان و هۆن هۆن فرمێسک بەچاوانیاندا دەهاتە خوارەوە.

خەڵکانی هەژار و بێچارە هەمیشە ئامادەن کەسێک قسەیان بۆ بکات و ئەوان

بگرین. گریان باشترین ئارامکەرەوە و سوکنایی بەخشی مرۆڤە هەژارەکانە. خەڵکە دەوڵەمەندەکان دەڕۆن بۆ وڵاتان بۆ گەڕان و لە ئوتێلی پێنج ئەستێرەدا دەخەون تا هێمن ببنەوە، بەڵام هەژارەکان بە هەڵڕشتنی فرمێسکەکانیان هێمن دەبنەوە. مانگ بە نیوەی ئاسمانەوە بوو، چەند چرایەکی دەستیش ئەو ناوەیان ڕووناک کردبووەوە. منیش هێزێکم بە بەردا گەڕابوو. من پێشتریش هەمیشە چیرۆکم بۆ خەڵکی دەگێڕایەوە. چیرۆکەکانی ئەمیر ئەرسەلان و حسێن کوردی شەبەستەری و ئەسکەندەرنامە و چەندین جۆر چیرۆکی تر. ئێستاش کە باسی ئازایەتی و فیداکاری ئیمام عەباس و تینوێتی منداڵەکانی ئیمام حسێن و هەوڵدان بۆ گەیشتن بۆ سەر ڕووباری فوڕات و بڕینەوەی دەستەکانی ئیمام عەباس و هەوڵدانی حەزرەت بۆ هەڵگرتنی کوندە ئاو و کونبوونی کوندە ئاوەکە بە تیری دوژمنان و کەوتنە خوارەوەی ئیمامی عەباس بەسەر ئەسپەکەیەوە، دەکەم، بە جۆرێک بوو کە نەک هەر خەڵکەکە تەنانەت عەلی خانیش دەستی کرد بە گریان. وا بزانم ئەگەر شەمەریش لەوێ بوایە لە گریانی ئەو خەڵکە ئەویش دەستی دەکرد بە گریان.

من لەپێشوازیکردنی بێژەنی پاڵەواندا شادی و خۆشی ئەو خەڵکەم بینی بوو. ئێستاش گریان و فرمێسک ڕشتنی ئەوان دەبینم. فرمێسک ڕشتن بۆ ئیمام عەباس و بۆ داماوی خۆیان. منی خەڵکی شاری یەزدی هیچ کاتێک ئاژاوەگێڕ و شەڕخواز نەبووم. تەنها ویستم پەیوەندییەکی باشتر دروستبکەم. هەر بۆیەش لە کۆتاییدا بۆ سەلامەتی خانی گەورە حاجی عەلی خان کەمایەی شانازی کوردانی خۆراسان و مایەی خۆشگوزەرانی و ژیانی ئەو خەڵکە بوو، نزامکرد. چەند وشەیەکیشم دەربارەی پیاو چاکی عەلی خان و پیاوەتی ئەو گوت، هەستمکرد عەلی خان ئەو نزایانەی پێخۆشە. داواشم لەخەڵکەکە کرد بۆ سەلامەتی خۆیان و خان سڵاوات لێبدەن. ئاخر من ئەو کاتە و ئێستاش سەر بە هیچ ڕێکخراوێکی سیاسی نەبووم و نابم، بەڵام عەلی خان گوتبووی ئەو باسی سیاسەت دەکات. ئەو سەردەمە لە دەوروبەری (١٣٤٠-١٩٦١) سیاسەتکردن واتە کۆمۆنیستبوون. واتە لایەنگری سۆڤیەت. ئەوەش بزانن کە ئێمە (٣٠-٤٠) کیلۆ مەتر لە سنوری سۆڤیەتەوە دوور بووین. خوێندنی مەراسیم بۆ ئیمام عەباس واتە پوچەڵبوونەوە لە کۆمۆنیست بوون.

من لەو کاتی گەنجیەمدا دەمزانی ئەگەر خان نەبێت ئەو خەڵکە هەموویان بڵاو دەبنەوە و هەریەکە و ڕوودەکەنە شوێنێک. ئەو خەڵکە ڕوودەکەنە شارەکان و لەوێ سەد ئەوەندەی ئێرە خراپتریان لێ بەسەردێت و دەستدەکەن بە کاری کرێکاری،

بەکارێکی مەمرە و مەژی لە هەمان کاتدا واتە لە ساڵی (١٣٤٧-١٩٦٨) دا دەمزانی کە ئێمە سەدان جار بەرز دەبینەوە و دادەبەزینەوە. لەکۆتاییدا دەوڵەمەندەکان دەوڵەمەندتر دەبن هەژارەکانیش بەهەژاری دەمێننەوە. ئێستا ڕەنگە هەژارەکان دەستیان بگاتە پاروەوە نانێکی بەرماوەی دەوڵەمەندەکان..

هاو پۆلەکانم پێیاندەگوتم تۆ کۆنەپەرستیت. منیش دەمگوت من کەسێکی ڕاستبین (واقیعی) م، سەروبن کردنی وڵاتێک تەنها سەروبن کردنی دەوڵەمەندەکانە. ئاخر دەوڵەمەند و هەژار، سەرمایەدار و کرێکار، خان و نۆکەر، ئاغا و خزمەتکار هەر هەبووە، بەڵام پێویستە جیاوازییەکانیان کەمبکەینەوە، خۆناتوانین کێشەکە بەتەواوی بنبڕ بکەین. هەموویان بەیەکەوە هاوتاو یەکسان بکەین. ئەوسەردەمە وشەی دادوەری کۆمەڵایەتی زۆر زۆر کەم بەکار دەهات. ئەم وشەیە لەدوای شۆڕش کەوتە سەرزاران ولە ئەدەبیاتدا زیادکرا. دادوەری کۆمەڵایەتی واتە دادوەری ڕێژەیی کۆمەڵایەتی..

ڕۆژی (٤ ئابانی ١٣٩١_٢٦-١٠- ٢٠١٢) لە ماوەی پێنج خولەکدا دوو پەیام (sms) م بۆهات. وا لێرەدا هەردووکیان دەنووسمەوە. یەکێکیان نووسرا بوو (٥٥٢) مەتر زەوی بازرگانی لە بلواری سوجادی مەشهەد بۆ فرۆشتن بەنرخی بیستوپێنج ملیار تومەن. پەیامی دووەم نووسرا بوو سڵاو دکتۆری بەڕێز من....... م زۆر پێویستم بەهاوکای هەیە کوڕە گەورەکەم پارێزەری تەواو کردووە لەزانکۆی تاران. کچەکەشم ئەندازیارە لە بێرجەند، کوڕە بچووکەکەشم خوێندکاری زانکۆی ئازادە. هاوسەرەکەشم بێکارە و دەبێت نەشتەرگەری دڵی بۆبکرێت، کرێچیشم پارەی نەشتەرگەریمان نییە و کرێی خانووشم نەداوە. پێم شەرمە داوا لەکەسی تر بکەم، گوتم بەڵکو بەڕێزتان هاوکارییەکم بکەن خودای گەورە پاداشتان بداتەوە.

من دەمزانی ئەم کەسە کێیە؟ ئەو کەسە بیستوحەوت ساڵ لەپێش مندا لیسانسی وەرگرتوە و مامۆستای ئامادەیی بوو، پاش بیستوپێنج ساڵ خزمەتکردن خۆی خانەنشین کردووە..جا ئێوە سەیرکەن کەسێک لەسەر بلواری سوجادی مەشهەد (٥٥٢) مەتر زەوی بازرگانی دەفرۆشێت بە بیستوپێنج ملیار تومەن. کەسێکی تر دوای بیستوپێنج ساڵ خزمەت ژیانی چەند لەدواوەیە.

پاش چەند ڕۆژێکی تر کچێک کە ساڵی (١٣٧٨-١٩٩٩) خوێندکاری خۆم بوو نامەیەکی بۆناردم. ئەم کچە خەڵکی باکووری سەرسەوزە، لیسانسی لە جوگرافیادا وەرگرتوە. بەو بڕوانامەیەوە چووە لە کێڵگەی بەرهەمهێنانی برنج دا کاردەکات و چەڵتوک دەچێنێت و کرێ وەردەگرێت. لە تەمەنی سی‌ویەک ساڵیدا خەریکی وەرگرتنی

لیسانسی باڵایە (١،١٠٠،٠٠٠) تومەنی پێویستە تاکو خۆی ناونووس بکات، بەڵام ئەو پارەیەی نییە ئەویش داوای هاوکاری لە من کرد. منیش بە تەلەفۆن پێمگوت تۆ بەو هەمووو کارەوە چۆن توانای ئەوەت نییە ئەو پارەیە دابین بکەین؟ گوتی مامۆستا باوکم مردووە، هەندێک پارەم پەیداکرد بوو بۆکڕینی ناو ماڵ و پێویستییەکانی خۆم، بەڵام دایکم سەکتەی دڵ لێیدا. منیش ناچار ئەو کەلوپەلانەی کڕی بووم هەموویم فرۆشتەوە بۆ چارەسەرکردنی دایکم، ئێستا دایکم نەشتەرگەریەکەی بۆکراوە و کەمێک باشبووە، بەڵام من حەز دەکەم بخوێنم..

ئێستا ئێوە دەتانەوێت من بـهێننە سەر ئەو باوەڕەی کە دەڵێن ڕۆژێک هەژارەکان دەوڵەمەند دەبن و سیستەمی سەرمایەداری ناهێڵن. ئێستا من لە تەمەنی شەستوسێ ساڵیدا زۆر خۆشحاڵم کە لە تەمەنی گەنجیمدا و لەو سەردەمەدا، کە سەردەمی بانگەشەی کۆمۆنیستی و ماویستی بوو، هەندێکی تریش لایەنگری دکتۆر عەلی شەریعەتی بوون کە داوای کۆمەڵگەی یەکسانیان دەکرد، بەڵام من باوەڕم بە هیچ کامیان نەبوو. تەنها وابیرم کردۆتەوە، کە دەکرێت بە بەرنامەڕێژی و بەڕێوەبردنێکی ڕاست دەتوانین کەمێک ژیانی هەژاران باشتر بکەین.

هەر کەسێک دەڵێت با هەمووان وەکو یەک هاوتا و یەکسانبن. یان خۆی گەمژە و نەزانە یان دەیەوێت کڵاو لە سەر خەڵکی نێت..

## مەراییکردن بۆ خان

ئەو شەوەی کە کۆتایی بەهاری (١٣٤٧-١٩٦٨) بوو، لە دەشتی تەکمەرانی شێروان. پاشان تێگەیشتم کە نەدەبوو ئەو گرژییە لە نێوان من و عەلی خاندا ڕوویدات. دوایی بیرم کردەوە کە نەدەبوو من لەگەڵ خاندا کێشە دروست بکەم. بۆیە دەبوو کارێک بکەم، لای عەلی خان خۆم خۆشەویست بکەم و گرژی و ئاڵۆزیی لە نێوانماندا نەمێنێت. دەبوو کارێک بکەم، دڵی خان لە خۆم ڕازی بکەم. لەدوای مەراسیمەکە نزای خێرم کرد بۆ گیان و ماڵی خان، بەمە عەلی خانم خۆشحاڵ کرد و ئەویش هاتە لامەوە و گوتی، حسێن مەڕاسیمێکی جوانت بەڕێوەبرد، دەستت خۆش بێت با بڕۆین بۆ ڕەشماڵەکەی خۆمان. گوتم بەسەرچاو لە خزمەتتدام. خوداحافیزییم لەخەڵکەکە و محەمەد جان و گوڵبەهار کرد و چووم بۆ ڕەشماڵە پڕ نان و ئاوەکەی عەلی خان. هەر چەندە نانی ئێوارەم خواردبوو، بەڵام چەند پاروویەکی تریشم لەو خواردنە خوارد، کە لە بەردەمم دانرابوو. «یەلە»ش بـەدوای مندا هاتە ڕەشماڵەکەوە و لە بەرامبەرم دانیشت. هیچ

کەسێک شتێکی لەبەر دەمی دانەنا. منیش کەمێک خواردنم لە نانێکەوە پێچا و دامە دەست «یەلە». ئەویش بەخێرایی خواردی و پاشان هەڵسا و ڕۆیشت. باسی ئەوەم نەکرد کە لە ڕەشماڵی گوڵبەهار نانم خواردبێت. بیرم لەوە دەکردەوە ئەگەر مەڕاسیمم بکردایە بە پیشەی خۆم، ئەوا نانم دەکەوتە ڕۆنەوە و دەبوومە خاوەن پارەیەکی زۆر و لەنێو نوێنی نەرم و گەرمدا دەنووستم. پاشە ڕۆژیش جێگام بەهەشت دەبوو.

کاتژمێر یازدەی شەو بوو بە عەلی خانم گوت بەڵکو کەسێکم لەگەڵدا بنێریت دەچم بۆلای مێگەلە مەڕەکە بۆ لای بێژەن. ئەویش گوتی بە خودا تۆ تاقەتێکی سەیرت هەیە. لە مەڕاسیمەکەدا ژن و کچەکانی عەلی خان هەموو لە دەورو بەری مندا، دانیشتبوون. تەنها کچە گەورەکەی نەهاتبوو...

پاش کاتژمێرێک گەیشتمە لای بێژەن. مێگەلەکە لە دامێنی شاخەکەدا بڵاو ببوونەوە. ئەو شەوە دوایین شەو بووکە مێگەلەکە لەتەکمەران بێت، سبەی کۆچ دەکرا و هەوارەکەیان جێدەهێشت. بێژەن گوتی درەنگ هاتیت. منیش باسی مەڕاسیمەکەم بۆکرد. بێژەن گوتی بۆچی تۆ مەلایت؟ گوتم لەکاری مەلایەتیش دەزانم. دەفتەر و قەڵەم و قەڵەمدایەنم دابوو بە بێژەن. بەبێژەنم گوت بنووسە سەرپەرشتیاری شوانەکان. ئەویش دەفتەرەکەی دەرهێنا و زیاتر لە دەجار وشەی سەرپەرشتیاری شوانەکانی نووسی. وشەی گوڵیشی هەر بە جوانی نووسیبوو. کاتێک نووسینەکانی نیشاندام، من پێم سەیر بوو کە چۆن بێژەن بەبێ من ئەو وشانەی ئاوا بە جوانی نوسیووە. دەنگی زەنگوڵەی ملی بزنەکان هاتە گوێم، گوتم بێژەن بڵێ بزن گوتی بزن. گوتم ئێستا بنووسە بزن. گوتی ناتوانم بنووسم. منیش بۆم نووسی بزن، ئەویش دە جار ئەم وشەیەی نووسییەوە. مێگەلەکە بە هێواشی دەلەوەڕان. ئەردۆش لە ناوەڕاستی مێگەلەکەدا بوو، من و بێژەنیش لە ژێر ئاسمانی شیندا و لە سەر سەوزە گیا دانیشتبووین، ڕووناکی ئاسمان کەم ببوو. چرا دەستیەکەمان هەڵکردبوو. من بیرم لەو وشانە دەکردەوەکە زیاتر لەسەر زمان سوکن و ڕۆژانە بەکاریان دەهێنین، ئەو وشانەی کە سێ یان چوار پیت زیاتر نین. گوتم وا باشترە کە بێژەن فێری ئەم وشانە بکەم، ویستم تا بەیانی کەمێک بخەوم. بێژەن وشەکانی بزن، کەر، ئەسپ، گا، کە ژمارەی پیتەکانیان کەم بوون فێرببوو، زۆر بە حەز و تاسەوە، وشەکانی دەنووسین.

خوێندکارێکی تەمەن (١٩-٢٠) ساڵ لە شەوێکی تاریکدا، لە پۆلێکی فراوانی دەشتی تەکمەرانی شێروان، پیاوێکی تەواو شوان و پاڵەوان عاشقی کچێک بوو بەناوی گوڵسەنەم، خەریکی نووسینی ئەلف و بێ بوو. خێرایی فێربوونی بێژەن بە جۆرێک بوو

من سەرم لێی سوڕمابوو، هەرچییەکم پێبگوتایە زۆر بەزوویی فێری دەبوو. بەڵام من درەنگ ناوی گیایەکان فێر دەبووم. سەیرەکە لەوەدا بوو سوودی گیاکانم دەزانی، بەڵام ناویانم لە بیر دەچووەوە. کاتێک بێژەن لێی دەپرسیم ئەم گیایە چییە؟ من بەخێرایی دەمگوت ئەم گیایە شیری مەڕ زیاد دەکات، یا ئەم گیایە شیری مەڕ خراپ دەکات، ئەم گیایە مەڕ قەڵە و دەکات، ئەم گیایە ڕەنگی گۆشت سپی دەکات. بێژەن وایدەزانی من ناوی گیاکان هەموو دەزانم، بەڵام من ناوی گیاکانم نەدەزانی. دیارە بێژەن لەمن زیرەکتر بوو.

وابزانم کات دوو سێی دوای نیوەشەو بوو کە من لەسەر فەرەنجییەکەی بێژەن لەو دەشتەدا نووستم. ئەو شەوە سەگەکان زۆر دەهاتن و دەچوون و دەوەڕین. ئەردۆ گوتی. گورگەکان لەم نزیکانەن. من نووستم و چوومە خەوێکی قوڵەوە، کاتێک گوێم لە دەنگی ئەردۆ بوو بانگی لێدەکردم. دەیگوت موهەندیس هەڵسە خۆر هەڵاتووە. کە چاوم هەڵهێنا سەیرم کرد بەتەواوی هەتاو کەوتبووە، حەزمدەکرد بخەومەوە، بەڵام تیشکی خۆرەکە لە چاومی دەدا و نەمدەتوانی بخەوم. ئەردۆ گوتی موهەندیس هەڵسە با بڕۆین، بێژەن مێگەلەکەی بردووە بەرەو لای هەوارەکە. هەڵسام و کەوتینەڕێ بەدەم ڕێگاوە لە ئەردۆم پرسی و گوتم. تۆ نوێژ دەکەیت؟ ئەردۆ گوتی من نازانم نوێژ بکەم. گوتم تۆ هیچ کاتێک نوێژ ناکەیت؟ گوتی نەخێر هیچ کەسێک فێری نەکردووم چۆن چۆنی نوێژ بکەم؟ گوتم پێتباشە من فێری نوێژت بکەم تا تۆش نوێژ بکەیت. گوتی نەخێر من لەو کێوە خۆم لەگەڵ خودادا قسە دەکەم، بۆیە نوێژ ناکەم. هێواش هێواش بەیەکەوە بەڕێگاکەدا دەڕۆیشتین. گوتم ئەردۆ حەزرەتی پێغەمبەر ناوی چیە؟ گوتی ناوی حەزرەتی پێغەمبەرە. گوتم باشە حەزرەتی محەمەد ناوی چیە؟ گوتی باشە ناوی حەزرەتی پێغەمبەرە. پێمگوت چەند ئیمامان هەیە؟ گوتی نازام. گوتم ئیمامەکانم بۆ بژمێرە. گوتی یەکەم حەزرەتی عەلی، دووەم حەزرەتی حەیدەری کەڕار، سێهەم حەزرەتی ئەسدوڵڵای غالب، حەزرەتی ئیمام حسێن، حەزرەتی ئەبولفەزڵ. گوتم ئەی ئیمامەکانی تر. گوتی ئیمامی هەشتەم لە مەشهەدە. گوتم باشە ناوی ئیمامی چوارەم تا هەشتەم بڵێ؟ گوتی نازانم. گوتم ئیمامی زەمان ئیمامی چەندەمە. گوتی ئیمامی (١٢٤) هەزارەمە. گوتم چۆن؟ گوتی دوا ئیمام لەدوای هەموویانەوەیە و لە دوای (١٢٤) هەزارەکەوەیە. گوتم چەند جار چوویت بۆ شار؟ گوتی هەرگیز نەڕۆیشتووم. گوتم هیچ کاتێک ڕۆیشتوویت بۆ مەڕاسیمی ئیمام حسێن؟ گوتی هەرگیز نەڕۆیشتووم. گوتم ئەی بۆ کوێ ڕۆیشتوویت؟ گوتی ڕۆیشتم بۆ سەر کێوی فاتمە خان و تا ئایتەمەر و

تورکمان سەحرا ڕۆیشتووم. گوتم تۆ لە چەند ساڵیەوە شوانیت؟ گوتی من شوان نیم. من شاگردی شوانم. گوتم لەکەیەوە لەگەڵ مێگەلە مەڕدا دەچیت بۆ دەشتودەر. گوتی لە هەشت ساڵییەوە. گوتم ئێستا تەمەنت چەند ساڵ دەبێت؟ گوتی بەتەواوی نازانم، بەلام ژنەکەم دەڵێت چلوپێنج ساڵم. گوتم تۆ تەمەنت چلوپێنج ساڵە و کەچی شاگردی بێژەنی تەمەن بیست ساڵیت. گوتی ئاخر بێژەن لە من زیاتر گیاکان دەناسێت، لە من زیاتر مەڕەکان دەناسێت. گوتم ئەی تۆ بۆ مەڕەکان ناناسیت؟ گوتی من دەمەوێت ئەستێرەکان بناسم. گوتم ئەستێرەکان. گوتی بەڵێ ئەستێرەکان. گوتم باشە چەند ئەستێرە دەناسیت؟ گوتی زۆر. گوتم لە کێوە فێربوویت؟ گوتی لە خەسرەوەوە.

ئەردۆ ماوەی بیستودوو ساڵ شاگردی خەسرەو ببوو. خەسرەو هەموو ئەستێرەکانی دەناسین. خەسرەو پێشبینی کەشناسیشی دەکرد. گوتم خەسرەو لەکوێیە. گوتی پیر بوو مرد. گوتم چۆن مرد؟ گوتی بوو بەسواڵکەر و مرد. گوتم بوو بە سواڵکەر؟ گوتی بەڵێ ئێمەی شوانەکان لەکۆتاییدا دەبینە سواڵکەر، کاتێک کە پیر بووین دەمانبەن بۆ گوندێک و لەوێ فڕێمان دەدەن، خەڵکەکەش بەزەییان پێماندا دێتەوە و شتێکمان پێدەدەن کە بیخۆین، کاتێک خەڵکەکە خواردنمان پێنادەن ئێمەش لەبرساندا دەمرین. گوتم لەکوێ فێری فارسی بوویت؟ گوتی لە خەسرەوەوە. خەسرەو ئەردۆشی فێری کەشناسی و ئەستێرەناسی کردبوو. گوتم خەسرەو لەکوێ فێری فارسی ببوو؟ گوتی لە مەلاوە. مەلا شانامەی خوێندبووەوە و خەسرەویش فێرببوو. گوتم خەسرەو هیچ کاتێک لە بارەی ئیمامەکانەوە لەگەڵ تۆ قسەی نەکردووە؟ گوتی نەخێر. گوتم خەسرەو نوێژی دەکرد. گوتی نەخێر. گوتم تۆ چۆن چۆنی قسە لەگەڵ خودادا دەکەیت؟ گوتی زۆر باش لەگەڵ خودادا قسە دەکەم و شمشاڵ بۆ خودا لێدەدەم و بۆ خودا هەڵدەپەڕم. گوتم ئەی چۆن لەگەڵ خودادا قسە دەکەیت؟ گوتی لە شاخەکە قسەی لەگەڵدا دەکەم. کاتێک من لەم بەرەوە بانگی دەکەم ئەویش لەو بەرەوە وەلامم دەداتەوە. تومەس لەو ناو شاخ و دۆڵەدا کە ئەردۆ هاواری کردووە و دەنگەکەی ئەو لە شاخەکەوە دەنگی داوەتەوە ئەو وایزانیوە ئەوە خودایە و وەلامی دەداتەوە. من لەگەڵ ئەردۆدا قسەم دەکرد و خێرا خێراش بەڕێگادا دەڕۆشتین. بێژەن مێگەلەکەی بردبوو بۆ سەرچەمەکە بۆ ئاو خواردنەوە. چونکە دەبوو پێش ئەوەی مەڕەکان بدۆشرێن ئاو بخۆنەوە. ئێمەش بە بێژەن و مێگەلە مەڕەکە گەیشتینەوە. لەو شوێنە لەسەر کانییەکی کەمئاو گۆلە ئاویان دروستکردبوو. مەڕەکان خەریکی ئاو خواردنەوە بوون.

بێژەن قەڵەم و دەفتەرەکەی بەدەستەوە بوو. چەند جارێک وشەی گوڵی

نووسیبوو. بە بێژەنم گوت بنووسە خودا. گوتی بیرم نەماوە نازانم چۆن دەنووسرێت: دووبارە وشەی خودام بۆ نووسیەوە..گوتی ئەمە خودا نییە. گوتم چۆن ئەوە نووسراوە خودا؟ گوتی خودا زۆر گەورەیە. ئەم وشەیە لە وشەی بزنیش بچووکترە. چارە نەبوو جگە لەوەی کە دووبارە وشەی خودای بەگەورەیی بۆ بنووسمەوە. بۆیە ئەمجارەش بەگەورەیی نووسیم خودا. بێژەن گوتی بینیت گوتم خودا گەورەیە.

چەند هەفتە لەوە دوا لەسەر کێوی فاتمە خانی قوچان توانیم تا ڕادەیەک بێژەن تێبگەیەنم کە دەکرێت وشەی خودا بە بچووکیش بنووسرێت. هێشتا دوو کاتژمێر مابوو بۆ کاتی مەڕدۆشین دەموویست مەراییەکی زیاتر بکەم بۆ عەلی خان. دەمویست کارێک بکەم تا عەلی خان لێم دڵگیر نەبێت، چونکە بەڕاستی نەمدەزانی ئەو چەند ڕۆژەی کە ماومە چۆن لای حاجی عەلی خان بەسەرببەرم؟ یا ئەگەر خان لێم ڕازی نەبێت و دکتۆر عەباس پێبزانێت ئەو کات چۆن بتوانم لای دکتۆر عەباس سەرم هەڵبرم. حەزیشم دەکرد بچمەوە بۆ لای ڕەشماڵەکەی عەلی خان و کچەکانی لە دەوروبەرم بن، لەگەڵ ئەواندا قسە بکەم و پرسیاریان لێبکەم. دیارە بۆ گەنجێکی تەمەن (١٩-٢٠) ساڵ، ئەو بیرکردنەوەیەی دواییان لە هەموان گرنگترە. مەگەر دەکرێت کەسێک باوکی ئەو کچە شۆخ و شەنگانە لە خۆی بڕەنجێنێت، دەبێت ئەو کەسە زۆر بێ ئەقڵ بێت کە ئەم کارە بکات.

تا ئەوکاتە وشەی سێ پیتی و دوو پیتیم فێری بێژەن کردبوو، ئیتر دەبوو وشەی گەورەتری فێر بکەم و بەشێوەی ڕستە، سەرەتا وشەکانی پێبڵێم و پاشان وەک ڕستەیەک دەرکەوێت. عەلی خان پیاو باش و خانی گەورەیە. هەموو وشەکان بچووکن جگە لە وشەی گەورە نەبێت. چونکە دەمزانی کاتێک کە گەڕاینەوە بۆ هەوارەکە، عەلی خان دەفتەرەکە لەبێژەن وەردەگرێت و سەیری دەکات و دەڵێت بزانم فێری چی بوویت؟ پاشان فێری ئەم ڕستەیەم کرد. عەلی خان پیاوێکی باش و خانێکی گەورەیە. بێژەن ئەم ڕستەیەی چەند جارێک نووسی. بەبێژەنم گوت کە چوویتە لای عەلی خان دەبێت ئەم ڕستەیە بەدەنگی بەرز چەند جارێک بخوێنیتەوە بۆ ئەوەی خان تۆی خۆشبوێت.

من مامۆستایەک بووم لە پێش هەموو شتێکدا بەرژەوەندی خۆمم دەویست. بێژەن گوتی زۆر باشە بە دەنگی بەرز بۆی دەخوێنمەوە.. ئەردۆ مێگەلەکەی پێش خۆی دابوو ڕۆیشتبوو. من و بێژەنیش لەسەر کانییەکە هەڵساین و بەخێرایی کەوتینەڕێ. لە نزیک هەوارەکە گەیشتینەوە بە مێگەلەکە. ئەردۆ دەیزانی چۆن ئاگاداری مێگەلەکە بکات؟ بەڵام لەبری ئەوەی گیاکان بناسێت، ئەو ئەستێرەکانی دەناسی. چەندین ساڵ

لەوە دوا لە ساڵی (١٣٧٨-١٩٩٩) ڕۆژێک دکتۆر محەمەد تەقی عەدالەتی، ماموستای ئەستێرە ناسی زانکۆی فیردەوسی مەشهەد. لێی پرسیم و گوتی ئایا کەسێکی گوندنشین یا کۆچەریی ناناسیت کە شارەزاییەکی هەبێت و ناوی ئەستێرەکان بزانێت؟ منیش ئەردۆم بیرهاتەوە. ئەوە بوو بە هەزار دەردەسەری ئەردۆم دۆزییەوە. ئەردۆ وازی لە کاری شوانی و دەشت و کێو هێنابوو. لە شاری بۆجنوورد ببووە کرێکار لە کێڵگەی بەخێوکردنی پەلەوەردا. من و دکتۆر محەمەدتەقی عەدالەتی و ئەردۆ چوار شەو بەبێ نووستن لە چیاکانی باکووری خۆراسانماینەوە. من بەڕۆژ هەوڵم دەدا یادەوەرییەکانم و ناوی گیاکانم بیربێتەوە. دکتۆر عەدالەتی دەیگوت خۆزگە ئەم پیاوە تەنها شەش ساڵی بخوێندایە و کەمێک خوێندەواری هەبووایە، خۆزگە چەند ساڵێک لەمەوبەر ئەم پیاوەم بناسیبایە. ئەم پیاوە ئەگەر بچوبایەتە زانکۆ دەبوو بە گەورەترین ئەستێرەناس. چونکە ئەمە هەموو ئاسمان دەناسێت. ئەردۆ تەنها سەیری ئاسمانی کردبوو. ناوی ئەستێرە کانیشی لە خەسرەو و خەڵکە کۆچەرییەکانی تر پرسیبوو. هەر ئەستێرەیەک کە ناوی نەبوو ئەردۆ بۆخۆی ناوێکی بۆ دانابوو. بەهەر حاڵ، من بەدوای بە دەستهێنانەوەی دڵی عەلی خانەوە بووم. عەلی خان بۆ من نموونەی دیکتاتۆرێکی لاساربوو لە ناوچەیەکی بچووکدا. ئەو حاکمی هەموو شتێکی ئەو ماڵانە بوو کە بە چواردەورییەوە بوون و خزمەتی ماڵ و مێگەلە مەڕەکانیان دەکرد. بەرژەوەندییەکانی عەلی خان پەیوەست بوو بە هەژاری و دواکەوتوویی ئەو خەڵکەوە. ئەوان هەژاری مادی و مەعنەوی بوون. ئەگەر ئەو خەڵکە خوێندەوار بوونایە، ئەگەر شارەزاییەکیان لە شار و گوندەکان هەبووایە، ئەگەر شارەزاییەکیان لە بەندەکانی مافی مرۆڤ هەبووایە. ئەوا وازیان لە عەلی خان دەهێنا و بەزوویی لێی دووردەکەوتنەوە. ئەو خەڵکە بێچارەیە وایاندەزانی هەموو جیهان بریتییە لە هەوارەکەی عەلی خان، هەموو جیهان واتە مەڕەکانی عەلی خان، هەموو جیهان واتە کێوەکانی فاتمە خانی قوچان و ئایلەر و دەشتی ئاقتەقەی مراوتەپە و تورکمان سەحرا. هەموو جیهان واتە گیانکێشان و مردن. هەموو جیهان واتە مانگی حەوت مەن ئارد و ڕۆژی پێنج ڕیاڵ کرێ. چارەسەری کێشەی زەویوزار ئەنجامدرا بوو. لەوەرگەکان خۆماڵی کرابوون. گوتبویان دەبێت ژنان هاوشانی پیاوان بچنە سەر سندوقەکانی دەنگدان. پیاوان نابێت بەبێ ئیزنی ژنەکانیان ژنی دووەم بهێنن. سوپای خوێندن چووبووە گوندەکانەوە. لە ناوچەی فارس قوتابخانەی کۆچەریی بە هەوڵی پیاوێکی گەورەی وەک محەمەد بەهمەن بێگی لە برەودا بوو، بەڵام هێشتا خانەکان خۆسەپێنیان دەکرد. خۆسەپاندن و زوڵمکردن و چەوسانەوەی خەڵکی پەیوەستە بە

خودی خەڵکەکە خۆیانەوە کە ئەو زوڵمە قبوڵ دەکەن. ئێمەی خەڵکی شار، ئێمەی خوێندکارانی شار لە پای وتەکانی هاوشێوەی دکتۆر عەلی شەریعەتی دادەنیشتین، دەچووین بۆ سینەما، ئاوی بەلوعەمان دەخواردەوە، سوودمان لە کارەبا دەبینی و. ڕۆژنامەمان دەخوێندەوە، لە حانوتی زانکۆدا کەباب و گۆشتی قەلمان دەخوارد بە بیبسی و پرتەقاڵەوە نەفەری بە (٥،١٢) ڕیاڵ. سوودمان لە توالێتی سیفۆن دەبینی و دکتۆر و دەرمانیشمان هەبوو. لە زانکۆ هیتەری کارەبایی و لە ماڵەوەش سۆپای نەوتیمان هەبوو بۆ خۆ گەرمکردنەوە. ڕێگا دوورەکانمان بە پاس و تاکسی دەبڕی. زۆر کاری تریشمان دەکرد. ئێمە نەماندەتوانی تێبگەین کە لە پشت دەروازەکانی شارەکانی مەشهەد، شیراز، تەورێز، ورمێ (ڕەزاییە)، سنە، ئەهەر و تەنانەت تارانیش چی دەگوزەرێت. نەماندەتوانی تێبگەین کە چ هەژارییەک لەم وڵاتەی ئێمەدا هەیە؟ لە ئاکامی حکومەتە یەک لەدوای یەکە خۆسەپێنەکاندا بەدرێژایی چەندین سەدە نەمانتوانی تێبگەین کە ڕیشەکێشکردنی ئەم هەژارییە چ هەوڵ و تێکۆشانێکی دەوێت؟ هەروەک خوالێخۆشبوو دکتۆر عەباس سەعیدی مەشهەدی بەو گەشتە زانستیانە چاوی ئێمەی کردەوە. ڕاستییەک کە دەیانجار لە وتە هەستبزوێن و خەیاڵاوییەکانی دکتۆر عەلی شیریعەتی ڕاستر بوو. من خۆم چەندین جار لەگەڵ دکتۆر عەلی شەریعەتیدا گەشتم کردووە. تێکڕای گەشتەکانم لەگەڵ ئەودا گەشتی یەک ڕۆژە یا ئەو پەڕی دوو ڕۆژە بووە، بەڵام گەشتەکانم لەگەڵ دکتۆر عەباسی سەعیدی، دکتۆر سەرویسی سوهامی، دکتۆر مەهدی سدیقی و دکتۆر عەلی ئەسغەر ئاریایی (١٥-٢٠) ڕۆژە بوون. لە نێوان ساڵەکانی (١٣٤٦-١٣٥٠=١٩٦٧-١٩٧١) سەدان کاتژمێر لە پۆلەکانی وانەوتنەوەی دکتۆر عەلی شەریعەتیدا بەشداریم کردووە. منیش وەک دەیان و بگرە سەدان خوێندکاری ساڵەکانی (١٣٤٦-١٣٥٠=١٩٦٧-١٩٧١) ی زانکۆی مەشهەد تەنانەت بە ئەوانەشەوە کە لە وانەکانی دکتۆر عەلی دا نمرەی بیستیان وەردەگرت. هیچ باوەڕێکمان بە وتەکانی ئەو نەبوو. دکتۆر سەرویسی سوهامی و دکتۆر مەحمود عەلەوی لە مانگی (مورداد ی١٣٥٤-ئابی١٩٧٥) بۆ ماوەی پازدە ڕۆژ خوێندکارانیان برد بۆ سیستان و بلوجستان. چووین بۆ گوندەکانی خاش و زابوڵ. من بە ناونیشانی کارناسێک لەگەڵیاندا بووم. لەم گەشتەدا من زیاتر هەستم بە هەژاری بلوجەکان کرد. ئەوەی من لەوێ بینیم و هەستم پێکرد گرنگتر بوو لە سەدان وتار. ڕۆژێک دکتۆر عەلی شەریعەتی وانەی دەگوتەوە. ئەو هەمیشە لە پۆلدا جگەرە لەدوا جگەرە دەیکێشا. ئاغای لوقمان کە ئەویش جگەرەکێش بوو. زوو زوو جگەرەی بۆ دادەگیرساند. لوقمان بە قسەکانی دکتۆر شەریعەتی سەری دەلەقاند. لوقمان دە ساڵ

لە ئێمە گەورەتر بوو. ئەو ماموستای سەرەتایی بوو. لە ناوەڕاستی وانەکەدا دکتۆر شەریعەتی گوتی لوقمان ئەمڕۆ سەرت زوو زوو دەجوڵێنیت. ئەگەر پرسیارێکت هەیە فەرموو پرسیارەکەت بکە. لوقمان گوتی نا دکتۆر پرسیارم نییە من هەر خۆم سەرم دەلەقێنم. پاش چارەکە کاتژمێرێک دکتۆر هەمان داواکاری لە لوقمان کردەوە. لوقمانیش جگەرەیەکی تری بۆ دکتۆر داگیرساند و دایەدەستی و دیسانەوە سەری بۆ لەقاندەوە. دکتۆر قسەکەی خۆی بڕی و گوتی لوقمان دەبێت قسە بکەیت. دیارە ئەو ڕەوشتەی دکتۆر عەلی شەریعەتی لەو ساڵانەدا ڕەوشتێکی جوان بوو، ڕەوشتێک کە ماموستا مۆڵەت بدات خوێنکارەکەی قسە بکات، بەڵکو پەلکێشیشی بکات بۆ قسەکردن. لوقمان گوتی دکتۆر من ماموستایەکی سەرەتاییم لە قوتابخانەیەکی لادێدا. تۆش ماموستای زانکۆیت. باوکی من سەوزە فرۆشە. سەوزە فرۆشێک کە تۆش جار جار سەوزەی لێدەکڕیت. باوکی تۆش ماموستا محەمەد تەقی شەریعەتییە، ماموستا و بانگخوازی ئیسلامیە. من کاتێک بێکاردەبم لە دوکانی سەوزە فرۆشییەکەی باوکمدا سەوزە دەفرۆشم، تۆش لە کاتی بێکاریدا کتێبی ئیسلامناسی دەنووسیت. چۆن دەکرێت من ڕەخنە لە وتەکانی تۆ بگرم. دیارە تۆ لە ئێمە باشتر دەزانیت بۆیە ئەو قسانە دەکەیت. دکتۆر شەریعەتی گوتی قسەکانت بکە. لوقمان قاچی بەرز کردەوە و پێڵاوە دڕاوەکانی نیشاندا و گوتی من بەم پێڵاوە دڕاوانەوە دەبێت ڕۆژانە چەند کیلۆمەترێک بە پێ بڕۆم، بە جادەی خۆڵدا و بە بەفر و باران. دەبێت بچم بۆ گوند و منداڵان فێرە خوێندن بکەم، من هیچ لە قسەکانی تۆ تێناگەم، من کەسێکی بێ ئەدەبم، بمبەخشە، ئەو شتانەی تۆ باسیان دەکەیت بەلای منەوە هیچ مانایەکیان نییە، ئەم قسانەی تۆ نە لەگەڵ ئاییندا دێتەوە، نە لەگەڵ ڕاستیەکانی ژیاندا دەگونجێت. من لە قسەکانی تووە گەیشتوومەتە ئەو باوەڕەی کەر هەر هەمان کەرە و تۆ دەتەوێت کۆپانەکەی بگۆڕیت. ئەو قسانەی کە تۆ دەیانکەیت تەنها هەستی خۆتە. کەمترین قسە لە قسەکانی تۆ و زانا ئیسلامیەکانی هاوشێوەی ئایەتوڵڵا میلانی قبوڵیانە. دکتۆر ئەو قسانەی تۆ دەیانکەیت بەڵگەی مێژووییان نییە. تۆ چوویت بۆ پاریس و چەند ساڵێک لەوێ ماویتەوە، هەرچییەکت لەوێ بینیوە و پێتخۆشبووە هاتوویتەوە لێرە باسی دەکەیت. یارانی پێغەمبەر گوتویانە لە کۆتاییدا تۆ یەک چەپک گوڵی خراپبوو دەدەیت بە ئاودا. گەنجانی وڵات هاندەدەیت و هەزاران کەس بەکوشت دەدەیت. ئیتر هیچ کەسێک بە قسەکانی تۆ کەوەر ورد ناکات. بۆیە لە کۆتاییدا کەر هەر هەمان کەرە و کۆپانەکەی گۆڕاوە. لە تەواوی ئەو وانەیە و دەیان وانەی تر، دکتۆر عەلی شەریعەتی نەیتوانی لوقمان بگەیەنێتە قەناعەت. بەڵکو ڕۆژ بەڕۆژ ژمارەی

لوقمانەکان لە زیاد بووندا بوون. من خوێنکاری جوگرافیا بووم ،وانەی تایبەتیم لای دکتۆر عەلی شەریعەتی نەبوو، بەڵام منیش وەک سەدان خوێندکاری تر نەدەچوومە پۆلەکەی خۆم و دەچوومە پۆلەکەی دکتۆر شەریعەتییەوە و لە وتووێژەکانی ئەودا بەشداریم دەکرد..



دکتور محەمەد حوسین پاپولی یەزدی و دکتور عەلی شەریعەتی، ١٩٦٨

ئەو بەیانییە زووەی بەهاریساڵی (١٣٤٧-٩٦٨ ( لە دوای مێگەلە مەڕەکەوە دەڕۆیشتم، لە پێش هەموو شتێکدا لە بیری ئەوەدا بووم پێش ئەوەی بگەمە هەوارەکە لەو دەشتەدا شوێنێک بدۆزمەوە بۆ دەستبەئاو گەیاندن، چونکە لە هەوارەکەدا توالێت نەبوو. من بە هۆی ئەو فشارەی بۆم هاتبوو بەو بەیانییە زووەی ئەو بەهارە، لەوەوە تێگەیشتم کە هەموو وتەکانی دکتۆر عەلی شەریعەتی بۆ ئەو خەڵکە هەژارە نان و ئاو و توالێت بەرهەم ناهێنێت. ئێمە میللەتێکی زۆر بە بەزەیین، بەڵام لە هەمان کاتدا یەکێکین لە هەستیارترین گەلانی جیهان، زۆرێک لەو هەلانەی بۆمان هەڵکەوتووە بەهۆی هەستیاریمانەوە لە دەستمانداوە. پاشان بە هەڕەشە بەسەرماندا شکاوەتەوە. با بگەڕێینەوە بۆ یادەوەرییەکان. دیارە من هیچ کاتێک کەسێکی سیاسی نەبووم و پەیوەندییەکی باشم لەگەڵ سیاسەتدا نەبووە، هەر بۆیەش وتەکانی دکتۆر عەلی

شەریعەتی نەدەچوونە مێشکمەوە، چونکە پێش هەموو شتێک وتەکانی ئەو وتەی سیاسی بوون.

لەو بەرەبەیانی بەهاری ساڵی (١٣٤٧-١٩٦٨) دا لە دەشتی تەکمەرانی شێروان بە دوای شوێنێکدا دەگەڕام بۆ دەستبەئاو گەیاندن. لە هەمان کاتدا بیرم لەوە دەکردەوە، چۆن پەرە بە پێشکەوتنی وڵات بدەین؟ واتە لە ڕێگای وتەکانی دکتۆر عەلی شەریعەتیەوە کە دەیگوت سەرەتا پەرە بە بیری سیاسی بدەین، یا لە ڕێگەی وتەکانی هاوشێوەکانی دکتۆر عەباسی سەعیدیەوە، واتە سەرەتا دامەزراندنی ئابوورییەکی بە هێز.

ههەرحاڵ ئەو ڕۆژە ویستم زووتر بگەمەوە هەوارەکە، تا ببینم کاتێک عەلی خان سەیری دەفتەرەکەی بێژەن دەکات بە خوێندنەوەی ڕستەی عەلی خان پیاوێکی گەورەیە و خانێکی بەڕێزە، هەڵوێستی چۆن دەبێت؟ من لەو ساڵانەدا و لە ساڵانی دواتریشدا دەستم بە محەمەد ڕەزا شای پەهلەوی و هیچ شازادەیەکی تر نەگەیشت، بەڵام ئەم عەلی خانە بۆ من شایەکی بچووکی ناوچەکە بوو، ئەو خاوەنی هەموو شتێک بوو، خاوەنی لەوەڕگەکان، ئاژەڵ، ئۆتۆمبێل -دیارە جیپەکەی لە شار بوو نەک لە کێو- تفەنگ و ڕاو، سەرچاوەکانی ئاو، ئەسپ، وڵاخ، حوشتر، کچی جوان، کە هەموو کارەکەیان خۆشگوزەرانی خۆیان بوو. ئەو خاوەنی ئەو خەڵکە بوو. ڕەشماڵەکەی لە چاو ڕەشماڵی خەڵکەکەی تردا وەکو کۆشک بوو. ڕەشماڵەکانی تر لە چاو ڕەشماڵی خاندا کولانە مریشک بوون. لەو دەشتودەرە، هەموو پێداویستییەکانی ژیانی خۆی دابین کردبوو. لە شاری بۆجنووردیش ماڵ و خانووی هەبوو. کچەکانیشی کاریان نەدەکرد و خۆیان ماندوو نەدەکرد، ئەوان جلوبەرگی جوانیان دەپۆشی و هەمیشە سکیان تێر بوو، جێگەیان گەرم و سەرینیان نەرم بوو، هەر لە ماڵی خۆیاندا ماموستای تایبەتیان بۆ دەگیرا، زمانی فارسی‌یان باشدەزانی و دەیان جار بۆ زیارەت چووبوون بۆ مەشهەد. دوان لە کوڕەکانی سەردانی مەککەیان کردبوو. خەڵکانی دەوروبەری عەلی خان هەموو هەژار بوون، برسی بوون، نەخۆش و پەککەوتە بوون، من وام هەستدەکرد کە گوڵبەهار و هاوسەرەکەی تەمەنیان (٧٥-٨٠) ساڵ بێت. پاشان زانیم کە هەردووکیان تەمەنیان لە دەوروبەری پەنجا ساڵدایە. برسێتی و کار و ڕەنج و چەوسانەوە، هێزی لە بەر بڕیبوون. پاشان تێگەیشتم لە تەواوی هەوارەکانی تری عەلی خاندا ئەو کەسانەی چاودێری مێگەلەکانی خانیان دەکرد تەنها چوار کەس تەمەنیان لە پەنجا ساڵ زیاتر بووە. ئەوانەی کە تەمەنیان دەبوو بە پەنجا ساڵ مردن، چونکە چیتر توانای کارکردنیان نەدەما، ڕوویان دەکردە شار و گوندەکان، لەوێ خەریکی سواڵکردن دەبوون تا دوا جار

لە پەنایەکدا دەمردن. لەو هەوارەدا هەژار و دەوڵەمەند لە بەردەمی مندا بوون و تەنها شەست مەتر لە یەکترییەوە دوور بوون. خزمەتکاری کوێرانە و بێئاگایی ئەو خەڵکە منی تووشی سەرسوڕمان کردبوو. ئەوان باوەڕێکی لە ڕادەبەدەریان بە خان هەبوو. خانیان بە گەورەترین پشتوپەنای خۆیان دەزانی. باوەڕیان وا بوو ئەگەر سێبەری خان بە سەریانەوە نەبێت ئەوا بە تەواوی نابووت دەبن و لە ناو دەچن. بێژەن تەنها کەسێک بوو دەیویست بە پێچەوانەی ویستی خانەوە شوێن پێی خۆی بکاتەوە و ببێت بە سەرپەرشتیاری شوانەکان.

شەوی پێشتر لە بەر دەمی ڕەشماڵەکەی گوڵبەهاردا لەگەڵ کەسێکدا بە ناوی (کیو) قسەم دەکرد. «کیو» وەک کەسێکی شەستوپێنج ساڵ دەردەکەوت، بەڵام لە ڕاستیدا تەمەنی لە چل ساڵ زیاتر نەبوو. لەوم پرسی بۆچی عەلی خان حەزناکات بێژەن ببێت بە سەرپەرشتیاری شوانەکان؟ گوتی ئەگەر بێژەن کوڕە خوشکی خان نەبوایە ئەوا دەمێکبوو لوتیان شکاند بوو. ئاخر هیچ کەسێک بۆی نییە لە بەرانبەر خاندا قسە بکات...

لە سەردەمی دیکتاتۆریدا گەورەترین هونەر هونەری ژیانە. ژیانێک بەبێ گرفتاری و کێشە و ئاڵۆزی. کاتێک دیکتاتۆر دەبێتە خاوەن هێز، هەر کەسێک خاوەن هێز بوو خۆی لە خۆیدا دەبێتە دیکتاتۆر. هەر کەسێک لە پشتی مێزەوە دانیشێت دەبێتە دیکتاتۆر بەسەر دەوروبەرەکەی خۆیدا. دەرگاوانی فەرمانگەیەکیش دەبێتە دیکتاتۆر. باوک لە ماڵدا دەبێتە دیکتاتۆر. تەنانەت ماموستای پۆلی یەکەمی سەرەتاییش دەبێتە دیکتاتۆر. لە سەردەمی دیکتاتۆریەتدا مرۆڤەکان هەموو بێزار دەبن. حەسوودەکان فرسەت دەهێنن لە ئازاردان و چەوسانەوەی خەڵکی، لە سەردەمی دیکتاتۆریەتدا خانێکی بچووکی کۆچەریی هەواڵ دەنێرێت بۆ گەنجێکی خوێندکار و پێیدەڵێت تۆ پڕوپاگەندەی سیاسی بڵاودەکەیتەوە. هەر بۆیەش لە کاتی مەراییکردندا ئەوەندەی تر لە خۆی بایی دەبێت. دیارە مەراییکردن خزمەتێکی زۆری بە هەژاران کردووە. کاتێک ڕژێمێکی دیکتاتۆر دەسەڵاتی گرتەدەست و بە تەواوەتی خۆی سەپاند، دەچێتە سەر ئەو باوەڕەی کە ئەقڵ تەنها لای ئەوە و خۆی بە گەورەترین کەس و ئاقڵترین کەس دەزانێت و خۆی بەسەر خەڵکیدا فەرز دەکات. مۆڵەت نادات کەسێک قسە بکات و ئەویش گوێیان بۆ بگرێت. دەیەوێت لە هەموو کۆڕ و کۆبوونەوەکاندا هەر خۆی بڕیاردەر و قسەکەر بێت و خەڵکیش تەنها گوێگربن و فەرمانەکانی جێبەجێ بکەن. دیکتاتۆر دەست بەسەر تەواوی سەرچاوە نەتەوایەتیەکاندا دەگرێت. هەر وەکو عەلی خان کە تەواوی لەوەڕگەکان و ئاژەڵەکان هی خۆی بوون. تەواوی خەڵکەکەش هەر ماڵی ئەو بوون، منداڵانیش کاتێک

دەکەوتنە سەر پێی خۆیان ڕاستەوخۆ یا ناڕاستەوخۆ کاریان بۆ ئەو دەکرد. تەنانەت ئەو بەدبەختانە ئەگەر بیانوویستایە بچن میوەی کێوی وەکو بەلاڵوک و زرشک و هەنجیرە ڕەشە کۆبکەنەوە، دەبوو مۆڵەت لە خان وەربگرن و ئەوەی کە دەستیان بکەوتایە بەشێکی بۆ ماڵی خان بوو. ئەگەر بیانوویستایە دوو مەڕ یا دوو بزن بکڕن دەبوو پرسیان بە خان بکردایە. تەنانەت مافی ئەوەشیان نەبوو بچن بۆ شاخ و کێوەکان بۆ ڕاووشکار. ڕاوکردن تەنها مافی ماڵی خان بوو. ئەوان دەبوو وەکو سەگی ڕاو بەدوای شوێن پێی خانەوە بوونایە و ئەو ئاژەڵەی کە خان و منداڵەکانی ڕاویان دەکرد، ئەوان بە کۆڵ لە شاخەکەوە بیان هێنایەتە خوارەوە.

کەسانێک کە هەموو سەرچاوەکانی ژیان و مرۆڤەکان و تەنانەت ئەقڵ و بیرکردنەوەشیان لە ژێر دەستی ئەودا بێت، مەگەر دەکرێت لە کەری شەیتان بێتە خوارەوە؟ ئەو خەڵکە هەموو هێز و توانا و ئەقڵ و پشتبەستن بە خۆیان لەدەستدا بوو، جگە لە دەوروبەری خۆیان، هیچ جێگایەکی تریان نەبینی بوو، پەیوەندیان لەگەڵ خەڵکانی تر بە تەواوەتی پچڕابوو، کەواتە دەیانتوانی چی بکەن؟ لەو هەلومەرجەدا دەبوو دیکتاتۆر بخەنە خەو خەوێکی قووڵ. دەرمانی خەوی دیکتاتۆرەکان مەرایی کردنە.

کاتێک گەیشتینەوە هەوارەکە ڕۆیشتم بۆ ڕەشماڵەکەی عەلی خان. ڕەزا کامل بەرەو ڕووم هات و گوتی عەلی خان چەقۆی لێبدەیت خوێنی لێنایەت. خۆ ئەگەر میوانی و میوان دۆستی نەبووایە پێیدەگوتین بە زوویی لێرە برۆین. بۆیە پێویستە زۆر ئاگاداربیت لە کار و کردەوەت. گوتم ئیشەڵڵا چارەسەری دەکەم و تۆ هیچ خەم مەخۆ. چوومە نێو ڕەشماڵەکەی خانەوە و سڵاوم کرد. دەوروبەری عەلی خان جگە لە کوڕەکانی خۆی چەند کەسێکی تری لێبوو، دیاربوو میوانێکی گرنگ بوون و لە هۆزەکانی ترەوە هاتبوون بۆلای..

عەلی خان گوتی موهەندیس وەرە دانیشە، دیاربوو دەیویست لەبەر چاوی میوانەکانی خۆی دەربخات و بڵێت من میوانی موهەندیسم هەیە. بێژەنیش بەدارەکەی دەستییەوە هاتە نێو ڕەشماڵەکە. باس باسی پاڵەوانی بێژەن بوو. منیش گوتم ئەوە لوتف و گەورەیی عەلی خان بوو کە بێژەنی هێنایە ژێر باڵی خۆیەوە، چونکە عەلی خان بەسەفدەری قارەمانی گوت، کە بێژەن فێری پاڵەوانبازی بکات و خان مۆڵەتیدا بە بێژەن کە بەشداری ئەم پاڵەوانەتیە بکات، ئەگەر لوتفی خان نەبووایە بێژەن هەرگیز نەدەبوو بە پاڵەوان، ئەوەتا نۆ بەرانیشی پێشکەشی بێژەن کردووە، لەوەش گرنگتر خان منی

وەک مامۆستایەک هێناوە تا بێژەن فێری خوێندن و نووسین بکەم...

خان خەریکبوو لێم ڕازی دەبوو. ڕەزا کاملیش لە تەنیشتمەوە دانیشتبوو، بەقاچی پاڵی بەقاچمەوە دەنا، تێگەیشتم کە ئەویش قسەکانی منی پێباشە. یەکێک لە میوانەکان گوتی بێژەنی پاڵەوان ئادەی بزانین چی فێربوویت؟ بێژەن بە لەخۆباییبوونێکەوە دەفتەرەکەی کردەوە و ئەم ڕستەیەی زۆر بەجوانی خوێندەوە. عەلی خان خانێکی گەورەیە. دەنگی ئافەرینی میوانەکان بەرز بووەوە. دووبارە بێژەن دەستیکرد بە خوێندنەوەی وشەکانی تر وەکو. خان، سەرپەرشتیاری شوانەکان، بزن، مانگا، بەران، حوشتر. عەلی خان پێی سەیر بوو، کە چۆن لە ماوەی ئەم چەند ڕۆژەدا بێژەن ئەم وشانە فێربووە بنووسێت و بخوێنێتەوە.

عەلی خان پیاوێکی باڵابەرزی ناو شان پانبوو، تەمەنی شەستوپێنج ساڵ دەبوو، وریا و چوست و چالاک بوو، لەشولارێکی پیاوانەی هەبوو، چاوەکانی گەورە و ڕەنگ شین بوون، جامانەی کوردی لە سەردا بوو، جلوبەرگەکەشی کوردی خۆراسانی بوون. ڕیشی دەتاشی بەڵام سمێڵێکی درێژی هەبوو هەر وەکو سمێڵی شا عەباس وابوو. ددانەکانیشی هەموو ساخ و دروست بوون، وا دەردەکەوت لە گیانیدا هیچ جۆرە نەخۆشییەکی نەبێت، کاتێک بەڕێگادا دەڕۆیشت یا دادەنیشت پشتی ساف و ڕێک بوو بە هیچ جۆرێک پشتی نەچەمابۆوە، ورگیشی نەبوو. جووڵە و گەڕان لە سروشتدا و ڕاو و خۆراکی باش و هەوای خاوێن ئەویان زۆر بەشادی و سەلامەتی هێشتبووەوە. هەمیشە جلوبەرگی خاوێنی لەبەردا بوو. چاکەت و پانتۆڵەکەی لە باشترین و چاکترین جۆری قوماش بوو. جلەکانی لە سەر شێوازی تازە و مۆدێرن بوو، بەڵام جامانەشی لەسەری دەکرد، دەست و پەنجەکانی گەورە و بەهێز بوون. کاتێک لەسەر فەرش دادەنیشت و پاڵی بە سەرینەکەوە دەدا واتدەزانی شاعەباسی گەورەیە. کوڕەکانی ڕێزێکی زۆریان لێدەنا خەڵکەکەش کە هەمووی خزم و کەسی دوور و نزیکی خۆی بوون، لێی دەترسان و گوێڕایەڵی فەرمانەکانی بوون. دیاربوو لە هەندێک کاتدا تووڕە دەبوو. پەیوەندییەکانیشی لەگەڵ خەڵک و دەوروبەردا باش بوو، بەتایبەتی لەگەڵ پۆلیسدا...

نانی بەیانیم لە خزمەت عەلی خاندا خوارد، زۆر زۆرم خەو دەهات، دەمویست بڕۆم سەیری کاری شیردۆشین بکەم، بەڵام هیلاک و ماندوو بووم، چووم بۆ ئەو ڕەشماڵەی کە تایبەت کرابوو بۆ شوێنی نووستنی من و هاوڕێکانم، کە چووم سەیرم کرد وا «یەلە» لەگۆشەیەکی ڕەشماڵەکەدا نووستووە، هیچ شتێکی بەخۆیا نەدابوو. بەتانییەکم پێدادا و خۆشم لێی نووستم. لە خەودا بووم کە گوێم لە دەنگی بێژەن بو

وبانگی دەکرد و دەیگوت موهەندیس لەگەڵ مێگەلەکە دێیت بۆ کێو یان نا. ئەو ڕۆژە وابریار بوو ماڵەکانیان باربکەن و بڕۆن بەرەو لای کێوەکە. بەگشتی هەموو جارێک بەیانی زووەکەی باریان دەکرد، بەڵام ئەمجارە بیبی گوتبووی دەبێت نزیک نیوەڕۆ بار بکەین.

بیبی پیرەژنێکی تەمەن حەفتا ساڵ بوو، ئەو شارەزاییەکی باشی هەبوو لە باشی و خراپی ڕۆژەکان و تەنانەت کەشوهەواش. کاتی ئەنجامدانی کارە گرنگەکان ئەو دەستنیشانی دەکرد. کاتی بەڕێکردنی مێگەلەکە، ڕۆژ و کاتی کۆچ، ڕۆژەکانی ڕۆشتنی گەرمیان و کوێستان، ڕۆژ و کاتی زەماوەند، تەنانەت کاتی بەخاکسپاردنی مردووەکانیشیان ئەو دیاری دەکرد. زانیارییەکی یەکجار زۆرییشی هەبوو لەسەر گیادەرمانییەکان و گۆشتی پەلەوەرە کێوییەکان و لەوەڕی ئاژەڵەکان. ئەو دەیزانی شیری ئاژەڵەکان بۆ چ نەخۆشیەک باشە. ڕۆنی مار بەکاری چی دێت. جگە لەوەش بیبی دوعانووسیش بوو. هەروەها سەری لە فاڵ گرتنەوەش دەردەچوو.

گوڵبەهار دەیگوت بیبی ئەم هەموو زانیارییەی لە دایکی و نەنکیەوە بۆ ماوەتەوە، تەنانەت خانیش هەموو پرس و ڕایەکی بە بیبی دەکرد و بەبێ ئیزن و بڕیاری ئەو هیچ کارێکی نەدەکرد، بەبێ مۆڵەتی ئەو ئاویشی نەدەخواردەوە. عەلی خان جارجار دەچووە ڕەشماڵەکەی بیبییەوە کاتژمێرێک زیاتر لای دەمایەوە تا سحر و جادووی بۆ بکات. یا ئامۆژگاری بکات. قسەکانی بیبی حسابی تایبەتیان بۆ دەکرا بەتایبەت دوای ئەوەی کە بێژەن بوو بە پاڵەوان.

ئەو چەند ساڵێک پێشتر، پێشبینی کردبوو کە بێژەن دەبێتە پاڵەوان. هۆزە کۆچەرییەکانی تر کە لە دەوروبەری ئەواندا بوون، ئەوانیش دەهاتن بۆ سەردانی بیبی و پرسیان پێدەکرد. ئەو زۆر بەباشی ڕۆژە خراپ و ڕۆژە باشەکانی دیاریدەکرد.. بیبی هەموو خێڵ و هۆزەکانی بەباشی دەناسین. لە سیرەوە تا پیاز هەموو شتێکیانی دەزانی. ئاگاداری عیشق و عیشقبازی کوڕ و کچەکانیش بوو.

پاش چەند مانگێک کە سەردانی هۆزەکەم کردەوە، چوومە سەردانی بیبی. ئەو گوتی موهەندیس کامەیانت دەوێت تا کارێک بکەم شەیدات بێت. گوتم بیبی هیچ کامیان. من تەنها بۆ کارکردن هاتووم بۆ ئێرە. گوتی وا نییە. عیشق و عیشقبازی تۆی هێناوەتە ئێرە. کاری تۆ لە شاردایە، بەڵام خۆشگوزەرانیت لێرەیە، یا خۆت یەکێک لە کچەکان دیاری بکە با بزانم کامیانت دەوێت، یا خۆم تا نیوەڕۆ بۆتی دیاری دەکەم کە حەزت لە کامەیانە. هێشتا نیوەڕۆ نەهاتبوو کە پێیگوتم. ئەو کچەی کە تۆ حەزی لێدەکەیت

ناوی گڵپۆیە. من هیچ باوەڕم بەقسەکەی نەکرد، بەڵام پاشان پەیوەندییەکی باشم لەگەڵ کەسێکدا پەیدا کرد کەناوی گڵپۆ بوو.

## کۆچ

ئەو ڕۆژەی کە ویستیان مێگەلەکە لە هەوارەکەوە بەڕێبکەن، بە بێژەنم گوت من لەگەڵ مێگەلەکەدا نایەم، شەو خۆم دێم و دەتدۆزمەوە. دەمویست چۆنێتی کۆچی خەڵکەکە بزانم. هاوڕێکانیشم عەزیز و موراد بە ئۆتۆمبێلەکەی ڕەزا کامیل ڕۆیشتبوون بۆ گوندەکانی تر، ئیتر یەکترمان نەدەبینییەوە. لەتەکمەران بەولاوە ڕێگای ئۆتۆمبێل نەبوو. بۆیە بڕیارمان وا بوو ڕۆژی دوایی لە ئۆغاز یەکتر ببینینەوە. ژنەکان ئەو ڕۆژە شیری بەیانیان کرد بە پەنیر چونکە ئەگەر بیانکردایە بە ماست، تا دەیانژەند و کەرەکەیان لێدەگرت، دەکەوتنەوە ڕۆژی دواتر. هەڵگرتنی ماستیش کێشە بوو بۆ ڕێگا، گواستنەوەی وا ئاسان نەبوو، بۆیە شیرەکەیان کرد بەدەڵمە و پاشان کردیان بە پەنیر. دەڵمەکەیان کردە پارچە قوماشێکەوە. دەیانویست بکەونەڕێ. بەشی زۆری ئاوی پەنیرەکە لە قوماشەکەوە دەتکا.

هەمووخەڵکەکە لە دەوری ماڵی خان کۆببوونەوە بۆ ئەوەی لە پێشدا ماڵی خان کۆ بکەنەوە و باری بکەن. ئەوەش جۆرێک بوو لە بێگاری، بەڵام ئەوان پێیاندەگوت هاوکاری. هیچ کەسێک لە منداڵانی خان لەم کارەدا بەشدارییەکی ئەوتۆیان نەکرد. کچەکانی خان کارە بچووکەکانیان ئەنجام دەدا و کوڕکانیش سەرپەرشتیان دەکردن. چەند کوڕێکی تری خان لە هەوارێکی تر بوون. ئەوانیش سەرپەرشتی چەند مێگەلە مەڕێکی تریان دەکرد، بەجیا و لە شوێنێکی تر.. کاتێک خەڵکەکە ڕۆیشتن کەلوپەلی ماڵی خۆیان ئامادە بکەن، هیچ کەسێک لە خانەوادەی خان نە چوون بۆ هاوکاری کردنیان. منیش بە کامێراکەم خەریکی وێنەگرتنیان بووم، بەڵام بە کامێرای ساڵی (١٣٤٧-١٩٦٨) کە دەمتوانی تەنها چەند وێنەیەک بگرم. کامێراکە فیلمێکی دوانزە وێنەیی تێدابوو. ئەو کاتە تەنها فیلمی دوازدە وێنەیی هەبوو. پاشان فیلمی سی‌وشەش وێنەیی پەیدا بوو، کە ئەوەش شۆڕشێکی تەکنۆلۆژی بوو.. نزیکی نیوەڕۆ حوشتر و هێسترەکانی ماڵی عەلی خان بار کرابوون و بەڕێکەوتن. نزیکەی چلوپێنج حوشتر و دوازدە ئەسپ دەبوون. کچەکانی عەلی خانیش سواری ئەسپ ببوون. حوشتری پێش قافڵەکە زۆر بە جوانی ڕازابووەوە، چەندین گوڵ و گەردنبەندیان بە لاملیدا هەڵواسیبوو، جاجمێکی ڕەنگاوڕەنگی جوانیان بەسەر بارەکەدا دابوو. یەکێک لە کچەکانی خانیش جلوبەرگێکی جوان و

تایبەتی پۆشیبوو، هەوساری حوشترەکەی گرتبوو لە پێشیەوە دەڕۆیشت. حوشتری پێشەوە دەبوو زۆر ئازا و توندوتۆڵ بێت، جوان و پڕ شەوق بێت، ئەو کچەش کە هەوسای حوشترەکەی بەدەستەوە دەگرت دەبوو کچێکی جوان و ئازا و چالاک بێت و جلوبەرگی جوان و ڕەنگاو ڕەنگی لەبەردابێت.

پرسیارم لە بیبی کرد، ڕازاندنەوەی ئەم حوشترە بۆ چییە؟ گوتی ئەمە دابونەریتی تایبەتی خۆمانە، بەرەکەت و ئابڕووی هۆزەکەمانە. بیبی حوشترێکی نێری گەورەی هەبوو، کەلوپەلی ماڵەکەی لێ بارکردبوو. بیبی کچێکی شووی کردبوو لە گوندی ئاشخانە دادەنیشت، دوو کوڕیشی هەبوون ئەوانیش ماڵیان لە شێروان بوو. بیبی دەیگوت ئێمە هەموومان لە ژێر سایەی عەلی خانداین. عەلی خانیش ڕێزی تایبەتی لە بیبی دەگرت. چونکە لە نێو هۆزەکەیاندا پلە و پایەی بەرزی هەبوو.

ڕۆژانە ژمارەیەک خەڵکی لە دوور و نزیکەوە دەهاتن بۆ لای بیبی بۆ دیدەنی و زانینی پێشبینییەکان. ئەوانەی دەهاتن هەر یەکە و دیارییەکی لەگەڵ خۆیدا دەهێنا، هەر لە ڕۆنەکەرە و مریشک و کەڵەشێر تا مەڕو پارە. بیبی چارەنووسی ئەوانی دیاریدەکرد و کێشەکانیانی پێدەگوتن و فاڵیشی بۆ دەگرتنەوە، پاشان بیبی دیارییەکانی کە بۆی دەهاتن لەگەڵ عەلی خاندا بەشی دەکرد و لەدیارییەکان بێبەشی نەدەکرد، زۆر و کەم هەرچی هەبووایە هەردوکیان هاوبەشبوون. جگە لە بیبی کە حوشترێکی گەورە و بەهێزی هەبوو خەڵکەکەی تریش وڵاخیان هەبوو، بەڵام کەلوپەلێکی زۆریان نەبوو، تەنها ڕەشماڵێکی بچووک و دوو پارچە نوێن و کەمێک قاپ و قاچاخیان هەبوو، بۆ هەڵگرتنی ئەمانەش تەنها وڵاخێک بەس بوو.

هاوسەنگی دابەشکردنی سامان لە هۆزەکەدا زۆر نا بەرامبەر بوو. هەموو شتێک هی خان بوو، لە هۆزەکانی تردا کە دواتر بینیم هاوسەنگییەکان زیاتر بوو. هەموو کرێکارەکانی عەلی خان تێکڕا خاوەنی سەد سەر ئاژەڵ نەبوون. واتە هەموو ژیانیان لەسەر کارکردن بووە بۆ خان. خەڵکەکە چاوەڕوانی ئەوەیاندەکرد کەمێک باری شارەکان باشتر بێت، چاوەڕوانی ئەوەیان دەکرد شارەکان پێویستیان بە کرێکار هەبێت و تا ئەمانیش واز لەژیانی کۆچەریی بهێنن. لە دوا سەرما زۆرەکەی (١٣٤٨-١٩٦٩) و وشکە ساڵییەکەی (١٣٥٠-١٩٧١) زۆربەی کۆچەرییە هەژارەکان بەرەو شارەکان ڕۆیشتن..

لە نێو هۆزەکەدا، دابەشکردنی کارەکان بە بەرنامە بوو. عەبدالی تەمەن چواردە ساڵ ئەرکەکەی کۆکردنەوەی سێپای مەشکەژەندن و بارکردنیان بوو لە حوشترێک،

عەبدال کوڕێک بوو هەمیشە لە دەوری من بوو. کاتێک زانی من بێژەن فێری خوێندن و نووسین دەکەم، ئەویش حەزیدەکرد فێری خوێندن و نووسین بێت، ئەو کوڕی پیاوێکی هەژار و کەمبینا بوو. باوکی عەبدالْ چاوەکانی ئازاریان هەبوو، بەرپێی خۆی بە باشی نەدەبینی، من وامزانی ئەم پیاوە هەر بە سکماک وا بوویێت، بەڵام عەبدال پێیگوتم کە باوکی هەر چەند مانگێکە چاوەکانی لێڵ و کەمبینا بوون. پیاوی هەژار و دەستکورت چووبوو بۆ لای بیبی، ئەویش هەندێک شیر و گیادەرمانی لە چاوی کردبوو، بەڵام هیچ سوودی نەبووە. عەبدال دەبوو لەبری خۆی و لەبری باوکیشی کار بۆ ماڵی عەلی خان بکات. عەبدال دوو خوشکی هەبوو ئەوانیش کاریان بۆ ماڵی عەلی خان دەکرد، شیریان دەدۆشی و ماستیان دروستدەکرد و مەشکەیان دەژەند، زستانانیش ئالفیان بۆ ئاژەڵەکان ئامادە دەکرد و چەندین کاری تریشیان دەکرد، دایکیشی جۆرەها کاری بۆ ماڵی عەلی خان دەکرد. ئەوان تەنها نانی مەمرە و مەژیان دەستدەکەوت. عەبدال دەیویست فێری خوێندن و نووسین ببێت و بڕوات بۆ شار، حەزیدەکرد باوکی بباتە لای دکتۆر. کاتێک کە زانیم چاوەکانی حاجی ڕەزای باوکی عەبدال چەند مانگێکە تووشی نەخۆشی و کەمبینی بوون، هەواڵێکم بۆ دکتۆر عەباس نارد کە پیاوێک لەم هەوارەدا خەریکە چاوەکانی کوێر دەبێت و پێویستە بە زووترین کات بگەیەنرێتە لای دکتۆر، تکایە فەرمانتان بەچییە؟ لەوکاتەدا کە خەڵکەکە خەریکی کۆکردنەوە و کەلوپەل و ڕەشماڵە کانیان بوون. چاوم لێبوو ئۆتۆمبێلێک بەرەو لامان دەهات، هەموو خەڵکەکە دەستیان لەکارکردن هەڵگرت و سەیری ئۆتۆمبێلەکەیان دەکرد تاکو بزانن کێیە هاتووە و بۆچی هاتووە؟ کە ئۆتۆمبێلەکە گەیشت سەیرم کرد قادر بوو، هەر خۆی بوو کەسی تری لەگەڵدا نەبوو. ئەو شۆفێری ئۆتۆمبێلی زانکۆ بوو. لەلایەن دکتۆر عەباسەوە نێردرابوو.. کاتێک کە من هەواڵم بۆ دکتۆر ناردبوو، کە کەسێک خەریکە هەردوو چاوی لەدەستدەدات، ئەویش ئەو ئۆتۆمبێلەی ناردبوو، تاکو نەخۆشەکە بەرن بۆ لای دکتۆر لە شێروان و قوچان. هەموو خەڵکی هەوارەکە لە هۆی هاتنی ئۆتۆمبێلەکە تێگەیشتن. عەلی خان بە ئەمە زۆر نیگەران بوو. گوتی ئەم موهەندیسە خۆی لە هەموو کارێکی ئێمە هەڵدەقورتێنێ و هیچ پێویست ناکات حاجی ڕەزا بچێت بۆ لای دکتۆر. دیارە عەلی خان لەوە نیگەران ببوو کە من بێپرس و مۆڵەتی ئەو هەواڵم بۆ دکتۆر عەباس ناردبوو. عەلی خان بەتوڕەییەوە بەخەڵکەکەی گوت بڕۆن بەلای کارەکانتانەوە، بۆچی کارەکانتان جێهێشتووە؟ بە زوویی هەموویان چوونەوە سەرکارەکانیان. من زۆر سەرم سوڕمابوو لەو خەڵکە، بۆ کەسێک لە عەلی خان ناپرسێت کە بۆچی حاجی ڕەزا

دەبێت نەچێت بۆلای دکتۆر؟ حاجی ڕەزاش خەریکی بەستنی بارەکەیان بوو کە لەسەر حوشترەکەیان بارکرا بوو. عەلی خان بەتووڕەییەوە مۆڕەیەکی لێکردم. لەدڵی خۆمدا گوتم ئیستا پێم دەڵێت لێرە بڕۆ و نەیەیتەوە بەلای ئێمەدا. عەبدال هاتە لامەوە و گوتی ئەگەر باوکم بڕوات بۆلای دکتۆر چاوەکانی باش دەبن. گوتم ئەگەری زۆر هەیە کە باشببن. عەبدال هاواری کرد ئەهای عەلی خان باوکم دەیەوێت بچێت بۆ لای دکتۆر و هیچ پەیوەندییەکی بەتۆوە نییە؟ عەلی خان هیچی نەگوت، بەڵام یەکێک لە کوڕەکانی خان بەخێرایی بەرەو لای عەبدال هات و بەمشت و پێلەقە کەوتە سەری و هەرچی جوێنێکی بەدەمیدا هات بە عەبدال و باوکی عەبدالی دا. خەڵکەکە هەموو بێدەنگ بوون، کوڕی خانیش بەردەوام بوو لە لێدانی عەبدال. دایکی عەبدالیش بە دارێکەوە هێرشی کردە سەر کوڕەکەی عەلی خان و بە هەموو هێزی خۆی تێلایەکی لە نێوقەدی دا. ئەو پیاوە تەمەن سی‌وپێنج ساڵە ئاخێکی کرد و کەوت بەزەویدا. ئەو ژنە وەک شێر دەستیکرد بەلێدانی و بەکوردی قسەی دەکرد، من هیچی لێ تێنەدەگەیشتم. کوڕەکانی تریش هێرشیان کردە سەر ئەو ژنە تا لێیبدەن، چەند ژنێکی تر بەخێرای هاتن لەنێوان کوڕەکانی خان و دایکی عەبدالدا وەستان تا بەزوویی شەڕەکە ڕابگرن.

دیاربوو کە ژنان لە پیاوان ئاشتیخوازتر بوون. ژنانی ئەم ناوچەیە زیاتر لە هەر چین و توێژێک زیاتر شێرە ژن بوون. من هەمیشە گەواهی ئەوە دەدەم کە ژنانی ئەم وڵاتە لە پیاوان ئاشتیخوازترن. لە هەر شوێنێک زۆرداریم بینیبێت ژنان لە پێش پیاواندا نارەزاییان دەربڕیووە، هەروەک ئەوەی کە دایکی عەبدال ڕۆستەم ئاسا ئەنجامیدا و گورزێکی لە کەمەری کوڕی عەلی خان سرەواند. بە بۆچوونی من ئەو ژنە دەسەڵاتی خانی لەرزاند. بێ‌هۆ نییە کە دەڵێن. هەندێک کەس ئامادەن ڕەنج بدەن و لە هەمان کاتدا قسەی نابەجێی بەرامبەرەکەشیان قبووڵ بکەن. لەو کاتەدا کامێراکەم دەرکرد، تا چەند وێنەیەک بگرم. عەلی خان ئاگاداربوو کە من خەریکی وێنەگرتنم بانگی کەراڕی کوڕی کرد و چەند قسەیەکی لەگەڵدا کرد. وا هەستم کرد لەبارەی منەوە قسەی لەگەڵدا دەکات. کەراڕ هات و براکەی کە لەسەر زەوی کەوتبوو هەڵسانەوە و جوێنێکی بە دایکی عەبدال گوت و ڕۆیشت. کوڕەکەی تری خان گوتی یالڵا هەمووتان بڕۆنە سەر کارەکانتان. هەموویان چوونەوە سەر کارەکانیان وەک ئەوەی کە هیچ شتێک ڕووی نەدابێت.

دایکی عەبدال بوخچەیەکی دایەدەست هاوسەرەکەی و سواری ئۆتۆمبێلەکەی کرد. حاجی ڕەزا گوتی موهەندیس من تەنها پازدە ڕیاڵ پارەم هەیە.. ئەو هیچ پارەی تری نەبوو، هەرچی هەیبوو هەر ئەو پازدە ڕیاڵە بوو. قادری شۆفێر گوتی دکتۆر عەباس

پەنجا تومەنی بۆ ناردوە و گوتویەتی تێکڕای تێچوی دکتۆریش خۆی جێبەجێی دەکات. ئەو ژن و پیاوە جگە لە نزای خێر هیچی تریان لە دەست نەدەهات. ئەو خەڵکە وەک ئەوەی کە باوەڕیان نەبێت بەبێ پرس و مۆڵەتی خان هیچ کارێک بکەن. کاتێک بینیان حاجی ڕەزا سوار بوو، ئۆتۆمبێلەکەش کەوتەڕێ هەموویان دەستیانکرد بە سڵاوات لێدان، دەنگی سڵاوات لێدان خۆشی و شادی خستە دڵی هەموو خەڵکەکەوە. جگە لە ماڵی عەلی خان. ئەو هەموو هەوڵەی کە شەوی پێشوو دام لەپێناوی ئەوەی عەلی خان لێم دڵگیر نەبێت و ڕازی بێت لێم، هەمووی بەبا چوو، خان بەتەواوی لێم دڵگیر ببوو، بەڵام بەهۆی پێشکەشکردنی مەڕاسیم و ناردنی حاجی ڕەزا بۆ لای دکتۆر، ڕەزامەندی خەڵکەکەم بەدەستهێنا بوو، بەڵام ئایا ڕەزامەندی ئەو خەڵکە بۆ من یەکسان بوو بە ڕەزامەندی خان؟ دیار بوو کە عەلی خان ئیتر چارەی منی نەدەویست. ئەگەر لەبەر خاتری گڵێۆ نەبووایە منیش لەگەڵ قادری شۆفێر و حاجی ڕەزادا دەڕۆیشتم، بەڵام زیاتر لەبەر خاتری گڵێۆ مامەوە و کەمێک لە ترسی دکتۆر عەباس و کەمێکیش لەپێناوی خۆشەویستیم بۆ ژیانی کۆچەرییەکان و شوانی لە دەشتودەر و مانەوەی شەوم لەگەڵ بێژەندا. دایکی عەبدال لەلایەکەوە خۆشحاڵ بوو کە هاوسەرەکەی بۆ چارەسەر دەچوو بۆ شار و نزای خێری بۆ من دەکرد، لە لایەکی ترەوە زۆر نیگەران بوو کەوا لە تورەییدا ئەو دارەی کێشاوە بەکەمەری کوڕی خاندا. ئەو ژنە لە خۆی نەدەترسا بەڵکو لەگیانی کوڕەکەی دەترسا. عەبدالیش کە لێدانی خواردبوو خوێن بە دەم وچاویدا دەهاتە خوارەوە، ئەو هەمیشە وەک گوێدرێژ حەماڵی بۆ ماڵی خان دەکرد. گوڵبەهار مەسینەیەک ئاوی هێنا و دەموچاوی عەبدالی شۆری و خوێنەکەی بۆ پاککردەوە. من نەمدەزانی گوڵبەهار پووری عەبداڵە. هەموو هۆزەکە خزم و کەسی یەکتری بوون. دایکی عەبدالیش هەر خزمی نزیکی عەلی خان بوو. نزیکی نیوەڕۆ ماڵی عەلی خان و کوڕ و کچەکانی هەموو بەڕێکەوتن. ئەوانی تریش دەبوو بەزوویی کەلوپەلیان باربکەن و بکەونەڕێ. کاتژمێر یەکی دوای نیوەڕۆ تەنها شوێنەوارێک لە جێگای ماڵەکان جێمابوو. من هەر سەیری هەوڵ و ماندووبوونی ئەو خەڵکە برسییەم دەکرد، ئەو ڕەشماڵەش کە من و هاوڕێکانم شەوانە تێیدا دەنووستین لە حوشترێکی خان بارکرا بوو، ئەو ڕەشماڵە دوایین ڕەشماڵی ماڵی خان بوو کە بارکرا.. هیچ کەسێک کۆڵەپشتەکەی لێ وەرنەگرتم. ئەو خەڵکە بێچارەیە، وڵاخیان کەمبوو، بارەکانیان لە وڵاخەکانیان زیاتر بوو، خانیش لە من تورەبوو.. من دوایین کەس بووم کە کۆڵەپشتەکەم کردە کۆڵم و کەوتمەڕێ.

هیچ کەسێک نانی نیوەڕۆی نەخوارد بوو، هەر کەسە و پارووە نانێکی بەڕێگاوە

دەخوارد. دوو کیسە پەنیرە تازەکەیان لە حوشترێک بارکرد بوو، ئاوی لێدەچۆڕا. کچێکی تەمەن یازدە ساڵ بە جامێکەوە بەدوای حوشترەکەدا ڕایدەکرد و قاپێکی بە دەستەوە بوو، قاپەکەی بۆ دڵۆپە ئاوی پەنیرەکە دەگرتەوە و بەو ئاوە تریتی دەکرد و دەیخوارد. سەرم سوڕمابوو لە هەژاری و سەبر و تاقەتی ئەوخەڵکە. منیش لە دوای ئەوانەوە دەڕۆیشتم، بەڵام ئایا من لەگەڵ ئەواندا دەردەچوم؟ پیاوەکان زۆر بەخێرایی دەڕۆیشتن، ژنان و منداڵان دوا کەوتبوون. پرسیم ئەو پیاوانە بۆچی وا بەخێیرایی دەڕۆن؟ گوتیان پێویستە ئەوان زووتر لە حوشترەکانی عەلی خان بگەنە جێ هەواری تازە، تاکو شوێنێک چاک بکەن و ڕەشماڵی خانی تێداهەڵبدەن و باری حوشترەکانی لێبخەن.

خودای گەورە بێ هۆ کەسێک ئەوەندە دەوڵەمەند ناکات. ئەو کەسە دەزانێت چۆن خەڵکی بۆ مەرامی خۆی بەکاربهێنێت، بەڵام خەڵکی نازانن کە بێگاری و خزمەتکاری نەکەن. تەنانەت خان ئەوەشی نەکرد کە پارووە نانێک و هەندێک پەنیر یا ڕۆن بداتە ئەو خەڵکە تا ئەوان نانبخۆن و تێربن و توانای کارکردنیان هەبێت، ئەوان دەبوو نانی خۆیان بخۆن و کاریش بۆ ئەو بکەن. دیارە خان دەیزانی ئەو خەڵکە هەژارە نانی خۆشیان هەر بەنانی ئەو دەزانن. خەڵکەکە وا بیریان دەکردەوە ئەگەر نانی ژەهراویش بخۆن ئەوە پیت و بەرەکەتی خانە. ئەگەر عەلی خان نەبێت کاریش نییە، یان ئەگەر خان دەریانبکات ئەمان ڕوو بکەنە کوێ؟. زۆربەی خەڵکی وڵاتی ئێمە بەشوێن خاندا ڕادەکەن و هیچ باوەڕیان بەخۆیان نییە و پشت بە خۆیان نابەستن، وا دەزانن ئەگەر خان نەبێت ئەوان ناتوانن درێژە بە ژیانیان بدەن. «یەلە»ش بەدوای مندا دەهات و لەخەڵکەکە دوا دەکەوت و جێدەما. منداڵێکی (٦-٧) ساڵ بەپێپەتی و بێ پێڵاو بە نێو ئەو بەردانەدا دەڕۆیشت. گوتم «یەلە» نانت خواردووە؟ گوتی نانم نەخواردووە. منیش نانم پێنەبوو جگە لە ماسی قتو هیچی ترم لا نەبوو، بە «یەلە»م گوت خێراتر بڕۆ.. خۆشم خێراتر ڕۆشتم و خۆم گەیاندە گوڵبەهار و پێمگوت کەمێک نان پەیدا نابێت. ئەویش دەستیکرد بەلایەکی بارەکەدا و پارچە نانێکی دەرکرد و دایە دەستم. منیش نانەکەم دا بە «یەلە» و ئەویش بەخێرایی نانەکەی خوارد و خێرا خێرا لە دواوە دەڕۆیشت تا جێنەمێنێت. لە بیری ئەوە دابووم کە چۆن جوتێک پێڵاو بۆ «یەلە» پەیدا بکەم.

ساڵی (١٣٤٧- ١٩٦٨) سەرەتای گەشەکردنی شارەکان بوو، دروستکردنی جادە دەستپێکرد بوو، هێشتا نرخی نەوت زۆر هەرزان بوو، شەڕی عەرەب و ئیسرائیل لە ساڵی (١٣٥٢-١٩٧٣) دا بوو بە هۆی بەرزبوونەوەی نرخی نەوت. ساڵی (١٣٤٧-١٩٦٨)

لە شارەکاندا کار دەستنەدەکەوت، ئەوخەڵکە دەیانتوانی بچن بۆ کوێ؟ ئەوان بەو هەژاری و نەبوونییە ڕاهاتبوون. زۆربەیان بۆ هیچ شوێنێک نەڕۆشتبوون و شارەکانیان نەبینیبوو. ئەمانە لە زیندانێکی جوگرافی دیاریکراوی کەمێک بەرفراواندا بوون.

گڵپۆش یەکێک لەکچە هەژارەکانی هۆزەکە بوو. باڵای دە سانتیمەتر لە باڵای من بەرزتر بوو. تەمەنی نزیکەی (١٨-١٩) ساڵ دەبوو، کراسێکی درێژی لەبەردابوو، گۆرەوی درێژی لە پێ کردبوو. کاتێک بەڕێگادا دەڕۆیشت وریا و گورجوگۆڵ بوو، سەرپۆشی بەسەردا دابوو. چاوی شین بوو، دەموچاوێکی جوانی هەبوو، لەکارکردندا زۆر ئازا بوو. خۆی حوشترەکانی باردەکرد و زۆر بەخێرایی مەڕەکانی دەدۆشی، مەشکەی زۆر بەخێرایی دەژەند، مەشکەکەشی لە مەشکەی هەمووان گەورەتر بوو. خوێندەواری نەبوو، بەڵام فارسییەکی باشی دەزانی، لەگەڵ مندا بە فارسی و کوردی قسەی دەکرد.

ژنە خێڵەکیەکان لە سەرانسەری ئێراندا لە تێکڕای ژنانی شارەکان ئازادتر لەگەڵ پیاواندا قسە دەکەن. تەواوی ئەو ژنە کوردانە زۆر بەباشی وەڵامی پرسیارەکانی منیان دەدایەوە. ژن و کچانی کوردی کۆچەری هەروەک ئاوی سەرچاوەی کانی کوێستانەکان پاک و بێگەردن. گڵپۆش یەکێک بوو لە نموونەی ئەو ژن و کچانە. کاتێک ڕۆژی یەکەم گوتم گڵپۆ خێراترین مەڕدۆشە ژنانی تر خۆشحاڵیان دەربڕی و چەپڵەیان لێدا و دەستیان کرد بە سڵاوات لێدان. گڵپۆ دایکی لە کاتی منداڵ بووندا مردبوو. پووری گەورەی کردبوو. کاتێک تەمەنی چوار مانگ بوو باوکی ژنی هێنا بووەوە. پیاوانی لادێی و کۆچەریی بەبێ ژن هەڵناکەن، کێ مەڕەکان بدۆشێت؟ کێ مەشکە بژەنێت؟ کێ ئاوبهێنێت؟ بیبی دەیگوت باوەژنەکەی گڵپۆ زۆر لەگەڵیدا خراپە. گڵپۆ تا ئێستا چەندین جار لە دەست باوەژنەکەی ڕایکردووە و ڕۆیشتووە بۆ گوندێک بۆلای خزمەکانی دایکی، بەڵام باوکی ئەوی دۆزیوەتەوە و بە لێدان هێناویەتیەوە بۆ نێو هۆزەکەی خۆیان. کاتێک بە کۆڵەپشتەوە بەڕێگادا دەڕۆیشتم، گڵپۆ تەنها چەند مەترێک لە پێش منەوە بوو. ڕاستیەکەی ئەوەیە من کەمێ خێرایی خۆم کەمکردەوە تا ئەو پێشم بکەوێت. پاشان بڕۆم نەمدەتوانی بەپێی ئەو بڕۆم، ئەو وڵاخەکەی بەخێرایی لێدەخوڕی و خۆیشی بەخێرایی بەشوێنیدا دەڕۆیشت. چرکە بە چرکە نێوانمان زیادی دەکرد، وامهەستدەکرد کە دڵم دەیەوێت لە من زیاتر و خێراتر بڕوات. جارجارێک ڕامدەکرد و نێوانمان کەمتر دەبووەوە، بەڵام جارێکی تریش جێدەمامەوە.

بیبی لە سەرباری حوشترەکەیەوە سوارببوو. عەلی خان و بنەماڵەکەشی

ڕۆیشتبوون. بیبی بەدوای ئەواندا ڕۆیشتبوو. خەڵکەکەی تریش وەک لەشکرێکی تێکشکاو لە دواوە دەڕۆیشتن. خۆ ئەگەر نێوانم لەگەڵ عەلی خان دا تێکنەچووبایە لە وەبوو سواری ئەسپێک یان حوشترێکیان بکردمایە، یان لانیکەم کۆڵە پشتەکەیان بۆ هەڵبگرتمایە، بەڵام خان و کوڕەکانی خۆیان لە من نەگەیاند و تەنانەت نەیانگوت تۆ لەگەڵ ئێمەدا دێیت یان نا، بەڵام خەڵکەکەی تر ڕێزیان لێدەگرتم. «یەلە»ش پێبەپێی من دەهات، من و «یەلە» نەماندەتوانی لەگەڵ پیاوەکاندا بەخێرایی بڕۆین، بەڵام لەگەڵ ژنەکاندا دەردەچووین. پیرەژن و پیرەمێردەکانیش لە دوای ئێمەوە بوون. پاش دوو کاتژمێر ڕێڕۆیشتین دەشتی تەکمەرانمان جێهێشت. شوێن هەواری دواییمان (تۆگۆر) بوو، بەڵام عەلی خان گوتبووی لە (قولانلو) پشودەدەین، تۆگۆری بۆ مێگەلە مەڕەکەی تر جێهێشتبوو. ئەو دوو مێگەل لە مەڕەکانی لە تۆگۆڕ جێگیر دەکرد و مێگەلەکانی تری لە قولانلو جێگیر دەکرد. خۆی هەمیشە لەگەڵ ئەو مێگەلەدا دەڕۆیشت، کە لە پێش هەمووانەوە بوو. گەیشتینە هەوارێک کە ئەسەدی کوڕەگەورەی خان لێی جێگیر ببوو. ئێمە دەبوو نزیکەی (١٥-١٦) کیلۆ مەتری تر ڕێگا ببڕین.

هاوڕێکانی خۆم کە لە گوندەکاندا کاری لێکۆڵینەوەیان دەکرد، ئەوان ژیانیان لە من باشتر بوو، خانوویەکیان بەکرێ گرتبوو بۆ مانەوە و پشودانیان.. ئۆتۆمبێلیشیان لە لابوو بەڵام من لە دۆخێکی خراپتردا بووم. یەک بەرزپێو، یەک قیبلەنما و نەخشەیەکی (١:٢٥٠٠٠٠) ناوچەکە و دووربینێکی زانکۆ، کامێرایەکی خۆم. لەگەڵ چەند قوتو ماسی و لۆبیا کە بۆ من مابوونەوە. مەتارە و کیسە خەو و کۆڵەپشتیش کەهی خۆم بوون. هاوڕێکانیشم لە دەوروبەری (ئۆغاز) جێگیر ببوون. کەسێک چێشتی بۆ لێدەنان، من و دوو هاوڕێم کە لەو ناوچەیە بووین و لەگەڵ کۆچەرییان بووین، دەبوو خواردنی لە قوتو نراو بخۆین، یان خواردنی ماڵی خەڵکی و ماڵی خان بخۆین. هەڵەی من ئەوە بوو کە مۆڵەتم لە خان وەرنەگرت، کاتێک پەیامم بۆ دکتۆر عەباس نارد، ئەو کاتەش کە قادر هات ئەگەر بە هێواشی بەمنی بگوتایە کە بۆچی هاتووە؟ دەمتوانی ئەوکاتە مۆڵەت لە خان وەربگرم، بەڵام قادر بەدەنگێکی بەرز گوتی من بۆ کاری حاجی ڕەزا هاتووم بۆیە بەقسەکانی ئەو من ئەوەندەی تر کارەکەم لە دەست دەرچوو.

کام کوێخا و کام شا مۆڵەت دەدەن لە سنووری ناوچەی ئەودا بەبێ مۆڵەتی ئەو ئاویش بخۆیتەوە، قسە دەبێت قسەی خان بێت. لەم وڵاتەی ئێمەدا، کام مامۆستا ئامادەیە بە بێ مۆڵەتی ئەو خوێندکارەکەی بچێت بۆ (WC). خوێندکار دەبێت پەنجەی شادەی دەستی ڕاستی هەڵبڕێت و بڵێت مامۆستا بەیارمەتیت دەمەوێت بچم بۆ (WC).

دیارە ئەم کارە سەرەتای دکتاتۆریەتە. چونکە ئەو منداڵە تا کۆتایی ژیانی چاوەڕێی مۆڵەت وەرگرتنە لە بەڕێوەبەر. ئێستا من دەبێت باجی مۆڵەت وەرنەگرتن لە خان بدەم. ئەوەتا بە پیادەڕەوی بەکۆڵەپشت و کیسە خەوێکی قورسەوە بەدوای کاروانەکەدا دەڕۆم.

گوڵبەهار گوتی موهەندیس کیسە خەوەکەتم بدەرێ لە سەر بارەکە بۆت دابنێم. کیسە خەوەکەی لێوەرگرتم و لەسەر باری وڵاخەکەی دایناا. منیش کەمێک بارم سوکتر بوو. چەند کاتژمێرێک لە نیوەڕۆ لای دابوو برسی و تینوو بووم، بەڵام لەگەڵ خەڵکەکەدا وردە وردە هەر دەڕۆیشتم، جارێک دوادەکەوتم و جارێک پێشدەکەوتم. لە نێوان ژنەکاندا هاجەری ژنی مستەفا دووگیان بوو. ئەو بە حەوتەمین منداڵییەوە دووگیان بوو. سکی گەورە بوو، لەوە دەچوو حەوت یا هەشت مانگ بێت. تەنانەت ئەویش پێش من کەوتەوە. ڕۆیشتن بەو شاخ و کێوەدا وەکو ڕۆیشتن لە چوارباخی ئەسفەهان وابوو بەلایانەوە. من تەنها برسێتیم دەبینی، دەمویست برسێتیم نەمێنێت. ئەوان بە یەکباز خۆیان هەڵدەدا لەم بەرد بۆ ئەو بەرد. منیش بەکۆڵە پشتی قورسەوە دەبوو لە دواوە بڕۆم. هەندێک جاریش خێراییەکەم زیاد دەکرد و چەند هەنگاوێک پێش گڵپۆ دەکەوتم. بەڵام زۆربەی کات لە دواوە بووم.

من یەک وشەم لە بارەی هەستی خۆمەوە بەگڵپۆ نەگوتبوو، زاتم نەدەکرد، لەوە دەترسام کە کێشەیەک دروست ببێت و پارچەی گەورەم گوێچکەم بێت. ئێستا کە لەگەڵ عەلی خاندا پەیوەندیم تێکچووە بۆ ئەو ئەوەندە بەسبوو کە بەهانەم پێبگرێت. ئەگەر عەلی خان گومانی ببردایەکە من حەزم لە یەکێک لەکچەکانی هۆزەکەیەتی بەهانەیەکی گەورەی دەستدەکەوت، ئەو خەڵکە سادانە لەم جۆرە کارەدا زۆر توندڕەون، بەڵام چ کچێک هەیە بەسەیرکردنی کوڕێک هەموو شتێک نەخوێنێتەوە. گڵپۆ هەموو شتێکی دەزانی، ئەویش سەیری منی دەکرد و هەستی بەوە دەکرد کە دڵم بۆی دەسووتێت، بەڵام نەمدەزانی چی بوو لە سەر لێوی بزە بوو یا زەردەخەنە. بیرمکردەوە کە نامەیەکی بۆ بنووسم، بەڵام بەداخەوە ئەو خوێندەواری نەبوو.

ئەوکاتە ناوی محەمەد بەهمەن بێگم بیستبوو، چەند مانگێک لەوە دوا نەمدەزانی کە چۆن ناوی ئەوم بیستووە. زانیم کە پیاوێک بە ئیرادەیەکی پۆلاینەوە لە ناوچەی قەشقاییەکانی فارس قوتابخانەیەکی کۆچەریی دروستکردووە. ڕاپەڕینێکی بەرپاکرووە لەپێناو فێرکردنی کۆچەرییەکانی ئەو ناوچەیە. منیش لەبەر خاتری گڵپۆ دەمویست ببم بە مامۆستای ئەم هۆزە. گەنجێکی بیست ساڵ ئەمڕۆ عاشقە و سبەینێ بەتاڵ. کاتێک

چەند مانگێک لە گلێو دوور کەوتمەوە ئەقڵ گەڕایەوە بۆ مێشکم و زیاتر سەرنجم لە سەر کچانی زانکۆ بوو تا کچانی ئۆغاز و کچانی کێوەکانی فاتمە خانی قوچان..

بە هەر حاڵ دوای نیوەڕۆ گەیشتینە (قولانلو) ڕەشماڵەکەی خان هەڵدرا بوو، پیاوەکان گەیشتبوون و باری و شترەکانیان خستبوو، مێخ و دیرەگی ڕەشماڵەکانی تریشیان چەقاند بوو، بەڵام کەلوپەلەکانیان هێشتا لەو ناوەدا کەوتبوون. عەلی خان لە سەر هەندێک نوێن دانیشتبوو. سڵاوم لێکرد، بەڵام گوێم لە وەڵام نەبوو، وەک ئەوەی گوێی لە سڵاوەکەم نەبووبێت. دەبوو دڵنەواییم بکردایە، ئەو قیت دانیشتبوو یاری بەسمێڵەکانی دەکرد. گوتم خان مۆڵەتم دەدەیت وێنەیەکت بگرم؟ چونکە بەشێوەیەکی زۆر جوان دانیشتوویت هەر لە شا عەباسی گەورە دەچیت. چاوەڕوانی وەڵام نەبووم، دەستم برد بۆ کۆڵە پشتەکەم و کامێراکەم دەرکرد، وام هەستکرد پێمبڵێ بڕۆ ونبە لەبەر چاوم، بەڵام دووان لە کچەکانی هاتنە ئەملاو ئەولای باوکیانەوە، ئەوان خۆیان بۆ وێنەگرتن ئامادە کردبوو. گوتم چاوتان لێیە چۆن خانی گەورە لە شا عەباسی گەورە دەچێت. وامدەزانی کچانی خان نەخوێندەوارن، هێشتا لەگەڵ ئەو کچانەدا قسەم نەکردبوو، ،بەڵام کچەکان ڕێک وەستا بوون وەک ئەوەی کچی شا عەباسی گەورەبن. لە دڵی خۆمدا گوتم خۆزگە کامێرای فەوریم لابووایە تا دەمودەست وێنەکە بەئامادەیی وەربگیرایەوە. لە سەردانەکانی تردا وێنەکانم بۆ هێنانەوە، وێنەکان زۆر جوان بوون. خانیش لەگەڵمدا میهرەبانتر بوو. خۆ لەوانەیە هۆی میهرەبانبوونی خان شتێکی تر بووبێت. خان زوو توڕە دەبوو، بەڵام پاش کەمێک سارد دەبووەوە و میهرەبان دەبوو.

ژنان و پیاوان شەکەت و ماندوو خەریکی ماڵ کۆکردنەوە و ڕێکخستنی ماڵی خۆیان و خان بوون. دەمزانی کە ئەمشەو هاوڕێکانم لەگەڵ ڕەزا کامیل لەگوندی (سەردارئاوا) ماونەتەوە و ناگەڕێنەوە بۆلای ئێمە. ئەو ڕێگەیەی کە ئێمە پێیدا هاتبووین ڕێگای ئۆتۆمبێل نەبوو. دەبوو هاوڕێکانم لە گوندەکانی دەوروبەری تەکمەران کار بکەن. خان خەریکی چا خواردنەوە بوو، بەڵام خولقی منی نەکرد. ئەو ڕەشماڵەی کە بۆ من و هاوڕێکانم دانرا بوو هێشتا هەڵنەدرا بوو. لە سەر زەوییەکە کەوتبوو، وەک ئەوەی کە نەیانەوێت ئەو ڕەشماڵە بۆ من هەڵبدەن، وام بەباشزانی کە ئەمشە و بچمە لای بێژەن و لەگەڵ ئەودا لای مێگەلەکە بم، بەڵام هێشتا مێگەلەکە نەگەیشتبوو، مێگەلەکە بەهێواشی و بە لەوەڕ دەهات. ئێمە بەڕێگادا بەخێرایی دەهاتین، بەڵام مێگەلەکە دەبوو زۆر بە هێواشی بێت. بە هەر حاڵ من تێدا مابووم نەمدەزانی چیبکەم، هەڵسام و بە عەلی خانم گوت بەیارمەتی بەڕێزتان من ڕەشماڵەکەم هەڵدەدەم، بانگی چەند ژن و پیاوێکم کرد کە

بێن و هاوکاریم بکەن. ئەوانیش هاتن و لەماوەی چەند خولەکێکدا ڕەشماڵەکەیان هەڵدا. یەکێک لە ژنەکان پارچە جاجمێکی هێناو لەناو ڕەشماڵەکەدا ڕایخست. کۆڵەپشتێ و کیسە خەوەکەم خستە نێو ڕەشماڵەکەوە. لەبەر خۆمەوە بیرم دەکردەوە لە شوێنێکدا کە دوورە دەستە و دەرامەت کەمە، نابێت بڵێیت میوان ڕادەگرن؟ بەڵکو دەبێ بڵێیت میوان هات. ئەم بیرکردنەوەیە دەیان جار لەگوند و نێو هۆزەکاندا بە مێشکی مندا هاتووە. «یەلە»ش هاتە نێو ڕەشماڵەکەوە و بەبێ ئەوەی هیچ بڵێت یەکسەر لێی نووست. ئەو منداڵە لە ڕێگادا ئەوەندە ماندوو ببوو بۆیە بەزوویی خەوی لێکەوت. کیسە خەوەکەم کردەوە و «یەلە»م پێداپۆشی. مێگەلەکە دەبوو بگاتە جێ و مەڕەکان دەبوو بدۆشرێن. لەم هەوارەدا چەند کانییەکی بچووک هەبوون، لەوەڕەکەش لەو ناوچەیەدا تەنها بەشی سێ ڕۆژی دەکرد. چووم بۆسەر کانییەک و دەموچاوم شۆری. هێشتا دوو کاتژمێر کاتی مابوو بۆ ئێوارە، لە سەر گیای بەردەمی ڕەشماڵەکە دانیشتم و یادەوەرییەکانم دەنووسییەوە، عەبداڵ و دایکی کەمێک بێکار ببوون و هاتنە لامەوە. دایکی عەبدال گوتی چۆن بتوانین هەواڵی حاجی ڕەزا بزانین ئاخۆ دکتۆر چی پێگوتووە، ئاخۆ چاوەکانی چاک دەبن یان نا. دەبوو بە جۆرێک قسە بکەم کە نەهێڵم ئەوان نیگەران بن، بەڵام من چۆن هەواڵێکی حاجی ڕەزا بزانم، خۆ هیچ هۆکارێکی پەیوەندیکردن نەبوو..

چاوم بۆ کچانی هۆزەکە دەگێڕا، بەتایبەت سەیری گڵپۆم دەکرد، ئەگەر لە خەڵکەکە و باوکی گڵپۆ و عەلی خان نەترسامایە دیار نەبوو کە چیم دەکرد. ئیستا لە خۆم دەپرسم، بۆچی لەگەڵ گڵپۆدا پەیوەندیم پەیدا کردووە؟. لە ساڵی (١٣٤٧-١٩٦٨) لە زانکۆی ئەدەبیاتی مەشهەد چەند سەد خوێندکارێکی کچ هەبوون لە نێوان ئەو هەموو خوێندکارە کچەدا سێ یان چوار کچ لەچکیان هەبوو، ئەوانیتر هەموو بێ لەچک و سەر ڕووت بوون و جلوبەرگی کورتیان لەبەر دەکرد. لەکاتی وەرزشکردنیشدا کچان بە شۆرتێکی کورتەوە یاریان دەکرد، زانکۆ وەک ساڵۆنی خۆڕازاندنەوە وابوو. نازانم بۆچی دڵم نەدەچووە سەر یەکێک لەو کچانە، بەڵام بۆچی حەزم چووبووە سەر ئەو کچە کۆچەرییە؟ خۆ ئەم کچە جگە لە دەستەکانی و دەموچاوی هیچ شوێنێکی تری دەرنەدەکەوت، جلەکانیشی تەسک و چەسپ نەبوون. بەڵکو جلوبەرگی کوردی فش و فراوانی لەبەرادبوو، سەرپۆشی دەدا بە سەریدا تەنانەت تاڵێکی قژیشی دەرنەدەکەوت، خوێندەوارییشی نەبوو، لە نێو ئەو هۆزە کۆچەرییانەدا هەژارترینماڵیش بوون، باوەژنەکەشی هەمیشە ئازاری دەدا و کاری شیردۆشین و مەشکەژەندن بوو، دوای ئەم کارانەش دەبوو بچێت ئاژەڵە بریندارەکان تیمار بکات. هیچ ئەقڵێک ڕێگەی نەدەدا کە

واز لەو کچە شارنشین و خوێندەوارانە بهێنم و دڵم بچێتە سەر ئەو کچە کۆچەرییە. کاتێک عیشق دێت ئەقڵ دەڕوات. لە بیرکردنەوەدا بووم کە گوێم لە دەنگی زەنگی مێگەلە مەڕێک بوو هەڵسام و بەرەو لای مێگەلەکە کەوتمەڕێ.

کاتێک مێگەلەکە گەیشت شوانەکەی بێژەن نەبوو. ئەو شوانە گوتی بێژەن لە جێگایەکی ترەوە دێت، مێگەلەکان هەریەکە و لە ڕێگایەکەوە دێن تاکو لەوەڕ و ئاو بەشی هەموو ئاژەڵەکان بکات. ئەم مێگەلەش هەمووی هی حاجی عەلی خان بوو، بەڵام هەوارەکەیان لە هەواری ئێمە جیابوو. ئەم شوانە ناوی خدێو بوو، گوتی ئەگەر دەتەوێت بێژەن ببینیت دەبێت لەو دۆڵەی ترەوە بڕۆیت و لە ڕووبارەکە بپەڕیتەوە و لەوبەرەوە چاوەڕوانی بکەیت. گوتم مادام وایە لە هەوارەکە دەمێنمەوە. تاکو دێت. خدێو گوتی بێژەن ناتوانێت ئەمشەو بگاتە هەوارەکە. گوتم ئەی چۆن مەڕەکان دەدۆشن؟ گوتی هیچ، ئەمشەو مەڕەکان نادۆشن.

کاتی ئێوارە بوو، خۆر خەریکی ئاوابوون بوو، گوتم بەپشتیوانی خودا دەکەومەڕێ بەم دۆڵەدا، دادەگەڕێم تا دەگەمە لای ڕووبارەکە، لەوێ چاوەڕوان دەکەم تامێگەلەکە دەگات و شەو لە لای بێژەن و ئەردۆ و مێگەلەکە دەبم. گەڕامەوە بۆ ڕەشماڵەکە لایت و مەتارەی ئاوەکەم هەڵگرت و کەوتمەڕێ، سەد مەتر نەڕۆیشتبووم کە عەبداڵ بەشوێنمدا هات و گوتی موهەندیس بە تەنیا بۆ کوێ دەچیت؟ گوتم بەرەو خوار دەڕۆم، بێژەن مێگەلەکە دەهێنێت بۆ خوارەوە. ئەو منداڵە کە تازە پەیوەندی لەگەڵ مندا دروستکردبوو. گوتی کات درەنگە و ئێستا دونیا تاریک دادێت، باش نییە بە تەنیا بڕۆیت، لێرە گورگ زۆرە، لە گورگیش خراپتر سەگی لای مێگەلەکانن، کەمێک بووەستە، دەچم بە دایکم دەڵێم و منیش دێم لەگەڵت. پاش چەند خولەکێک عەبداڵ لەگەڵ دوو منداڵی هاوتەمەنی خۆی، برزوو و موحسین هاتن، هەریەکە و تێلایەکیان بە دەستەوە بوو. تێلایەکیشیان بۆ من هێنابوو. گوتم مۆڵەتتان لە عەلی خان وەرگرتووە؟ گوتیان شەوە و خان هیچ کارێکی بە ئێمە نییە، ئێمە بە ڕۆژ دەبێت نۆکەری خان بین و شەویش کەری خۆمانیین. چوار کەس کەوتینە ڕێگا منیش ترسم شکا. هێشتا نەگەیشتبووینە سەرەتای دۆڵەکە دونیا بە تەواوی تاریک بوو. ئەو منداڵانە هەروەکو بزنە کێوی بەسەر بەردەکاندا لە پێش منەوە ڕایاندەکرد، دەیانگوت موهەندیس دوا کەوتی. پاش ماوەیەک گەیشتینە دامێنی دۆڵەکە، جێگایەکی زۆر خۆش بوو پشوویەکماندا و لایتەکەم دەرکرد و یاداشتەکانم نووسییەوە. برزوو تەمەنی (١٦-١٧) ساڵ دەبوو، نەخوێندەوار بوو، خۆیشی بە تەواوی نەیدەزانی تەمەنی چەندە؟ دەیگوت تەمەنم (١٥-٢٠) ساڵە، بەڵام هێشتا نەچووبوو بۆ

سەربازی، حەزیدەکرد بچێت بۆ سەربازی، دەیویست شاربیبینێت. ئەو هەرگیز هیچ شارێکی نەدیبوو، تەنانەت شێروان و مراوتەپەشی نەدیبوو، هەر کارێک عەلی خان و کوڕەکانی پێیانبگوتایە ئەو بەبێ ئەملاولا ئەنجامی دەدا. داری دەهێنا، مەڕی دەلەوەڕاند، چاودێری حوشترەکانی دەکرد، گیای کێوی بۆ بنەماڵەی خان کۆدەکردەوە، زرشک و میوەی کێوی بۆ دەهێنان. ئەگەر خان بیگوتایە دار ئەرسەکانی بۆ دەبڕییەوە، هەر کاتێک کوڕەکانی خان بڕۆیشتنایە بۆ ڕاو ئەویش لەگەڵیاندا دەڕۆیشت و هەر ئاژەڵێکیان بکوشتایە ئەو سەری دەبڕی و لاشەکەی هەڵدەگرت. ئەو بە منی گوت پەری خانم خوێندەوارییەکی باشی هەیە. برزوو گوتی پەری خانم کتێبی زۆری هەیە، کتێبەکانی لە نێو خورجێندا هەڵگرتووە. باری دوو حوشتر کتێبی هەیە.

ئەگەر کوڕەکانی خان بیانویستایە لە کەسێک بدەن. ئەوا برزوویان دەنارد تاکو لەو کەسە بدات. کاتێک مەڕەکان دەزان هەر ئەو بەچکەکانی کۆدەکردنەوە و ئاگاداری دەکردن. کرێکەشی مانگی پێنج مەن (٣٠ کیلۆ) ئارد بوو لەگەڵ ساڵی دەستێک جلی کۆن کە عەلی خان لە شار بۆی دەکڕی لەگەڵ جوتێک پێڵاوی کۆنەی سەربازی. برزوو خۆی و دایک و باوکی و خوشک و براکەی هەموویان کاریان بۆ خان دەکرد. لە ساڵێکدا دوو ڕۆژ شیری مێگەلەکە بۆ ئەوان بوو. باوکیشی مانگی پازدە تومەن کرێی لە خان وەردەگرت. باوکی بەگشتی هەشت مەڕ و دوو وڵاخی هەبوون. موحسینیش کوڕە هەژارێکی وەک برزوو بوو، تەنها ماڵی ئەوان ساڵی یەک ڕۆژ شیری مێگەلەکەیان هەبوو. ژمارەی خێزانی ماڵی موحسین کەمتر بوو. ئەم منداڵێکی بچکۆلانە بوو، بەڵام برزوو کەسێکی چوارشانە و بەهێز بوو، لەشولارێکی جوانی هەبوو، هێشتا ڕیشی نەتاشی بوو، ساڵی یەک دوو جار سەرتاشێکی گەڕۆک سەردانی هەوارەکەیانی دەکرد سەر و ڕیشی هەمووانی دەتاشی. ئەو شەوەی کە لەگەڵ مندا بوو هەشت مانگ بوو سەری نەتاشی بوو. هەر لە خەڵکی ناو دارستانەکان دەچوو، مەبەستم لە شۆڕشگێڕەکانی ناو دارستانەکانە کە لەگەڵ میرزا کوچەک خانی جەنگەڵی بوون. ئەویش حەزی دەکرد بچێت بۆ پاڵەوانبازی. ڕەوشتێکی پیاوانەی هەبوو، هەمیشە حەزیدەکرد هاوکاری خەڵکانی تر بکات. هەرچییەکی دەستبکەوتایە دەیخوارد هەر لە لاشەی مەڕی منارەوە بوو تاکو مار. ئەو ماری دەکوشت و ناوسکەکەی دەردەکرد و پاشان دەیبرژاند و دەیخوارد. ئەو دەیگوت هیچ کەسێکی تر گۆشتی مار ناخوات. برزوو دەیگوت حاجی ڕەمەزان دەڵێت تۆ حەرام خۆریت، بەڵام ئەو چی دەڵێت بابڵێت من هەرشتێکم بەردەست بکەوێت دەیخۆم. ئەو دەیگوت لەو شاخ و کێوە هەموو

شتێک حەڵاڵە. برزوو فەلسەفەیەکی بۆ خۆی دانابوو، دەیگوت حەرام سکی بەتاڵە. ئەو کەسێکی دەم بە خەندە بوو هەمیشە پێدەکەنی، ڕۆژانی پێشوو تریش هەموو ڕۆژێک دەمبینی، بەڵام هەرگیز لای دانەنیشتبووم و قسەم لەگەڵدا نەکردبوو.

عەبدال گوتی وابزانم ئەگەر کاتژمێرێکی تر بڕۆین دەگەینە مێگەلەکە. کەوتینەوە ڕێ هەوا خۆش بوو، شنەی شەماڵی بەهاری کوێستان دڵی مرۆڤی شاد دەکرد. ئەو کوێستانە جوانییەکی نموونەیی هەبوو. گیای ژێر پێم تەواو بەرز ببووەوە، وامدەزانی بە سەر قەیفەدا دەڕۆم.

چل ساڵ لەوەدوا لە ساڵی (١٣٨٧-٢٠٠٨) لە هەمان کات و ساڵدا ڕۆیشتم بۆ هەمان شوێن، بەڵام بە داخەوە هیچ شوێنەوارێک لە جوانی ئەو گژوگیایە نەمابوو. لەوەڕگەکان لەنێو چووبوون. کەشوهەوا و سروشت بەو جوانییە نەمابوو. خەڵکەکە بە تراکتۆر و تفەنگی ڕاوکردنەوە بەو جێگایەدا دەڕۆیشتن. ئەو سروشتەیان وا لەناوبرد بوو کە بە دەیان نەوەی تر ناتوانن جارێکی تر ئەو سروشتە جوانە بگێڕنەوە.

عەبداڵ و منداڵە هاوتەمەنەکانی ئەو کەمی خواردنیان لە نێو سروشت قەرەبوو دەکردەوە. دیارە مافی ئەوەیان نەبوو کە ڕاو بکەن. ڕاوکردن تەنها مافیماڵی خان بوو. ئەگەر بزنێک یا مەڕێک خەریکبووایە بمرێت خان سەری دەبڕی و گۆشتەکەی پێدەدان. خان هەموو ساڵێک لە جەژنی قورباندا حوشترێکی سەر دەبڕی و نیوەی گۆشتەکەی لە نێوان دانیشتووانی چوار هەواردا دابەشدەکرد. ئەو چوار هەوارە هەموو کرێکاری ئەو بوون. نیوەکەی تریشی دادەنا بۆ بنەماڵەی خۆیان.

بەڕێگادا دەڕۆیشتین و گفتوگۆمان دەکرد لەبارەی یاری و ئاژەڵەکانەوە. لەبارەی ئەوشتانەی کە برزوو دەیخواردن. قسەماندەکرد. برزوو کیسەڵیشی دەکوشت و گۆشتەکەی دەخوارد. مشک و جرجی دەکوشت و ناوسکەکەی دەردەکرد و گۆشتەکەی دەخواردن. ئەو منداڵانە دەیانگوت برزوو جگەری گورگیشی خواردووە. خۆشی دەیگوت خواردوومە. گفتوگۆکانمان بەردەوام بوو. لەو منداڵانەم پرسی کێ سەرپەرشتیاری شوانەکانە؟ هەموویان بەیەکەوە گوتیان دوو ساڵ لەمەوبەر سەرپەرشتیاری شوانەکان مرد. ئێستا عەلی خان سەرپەرشتیارێکی (ئەسفەچیری) هێناوە. ئەو هەمیشە لەگەڵ شوانەکاندا شەڕ دەکات، لە شوانەکان دەدات و مووچەکەشیان کەمدەکاتەوە. سەرپەرشتیاری شوانەکان لە هەوارێکی ترە، زۆر کاری بەسەر ئەو شوان و مێگەلەوە نییە کە لای خانە. سەرپەرشتیاری شوانەکان ئەسپێکی هەیە و سەردانی هەموو مێگەلەکان دەکات. ئەگەر ببینێت شوانێک نووستووە ئیتر چی لەدەست بێت بەرامبەری دەیکات،

ئەگەر مێگەلەکە پەراگەندە ببوو ئەوا سەرپەرشتیاری شوانەکان دەیکاتە شەڕ لەگەڵ شوانەکەدا و لێیدەدات، ئەگەر سەگی لای مێگەلەکە بریندار بوو ئەوا سەرپەرشتیاری شوانەکان ئەو شوانە زۆر خراپ سزا دەدات. سەرپەرشتیاری شوانەکان ئاگادارە و دەزانێت کە مەڕەکان باش لەوەڕاون یان نا. مەڕەکان دەبێت خورییەکەیان بریسکەی بێت، ئەگەر مەڕەکان باش نەلەوەڕابن ئەوا خورییەکەی بریسکەی نایات. ئەو منداڵانە زۆر لەبارەی کێشەی نێوان شوانەکان و سەرپەرشتیاری شوانەکان قسەیان کرد. عەبدال گوتی بێژەن دەیەوێت ببێت بەسەرپەرشتیاری شوانەکان. ئەم سەرپەرشتیاری شوانانە تاکو ئێستا چەندین جار لەگەڵ بێژەندا بووە بەشەڕیان.

لە ناکاو عەبدال گوتی بێدەنگبن و خۆی خستە سەر زەوی و گوێی بەتەختە بەردێکەوەنا. گوتی مێگەلەکە یەک (چیغ = نزیکەی سێ کیلۆ مەتر) لە ئێمەوە دوورە. ڕۆیشتنەکەمان خێراتر کرد پاش کەمێک گوێمان لە دەنگی سەگەکان بوو، عەبدال گوتی کوڕینە ئەوسەگانە هەستیان بە بوونی پڵنگ کردووە لەم ناوەدا، بۆیە ئاگاداری خۆتانبن. کاتێک بەمێگەلەکە گەیشتین مێگەلی بێژەن نەبوو. ئەو منداڵانە دەنگی سەگەکانیان دەناسییەوە هەر سەگێک بۆ خۆی دەنگێکی تایبەتی هەیە. دەنگی دوو سەگ ئەگەر لەیەک دابکیشبن دەنگیان وەک یەک نییە. ئاخر لە سروشتدا دوو شت وەک یەک نین. ڕووەکناسەکان دەڵێن دوو گەڵای یەک درەخت وەکو یەک نین.. لە لایەن چوار سەگەوە دەورە دراین. سەگەکان ئەو منداڵانەیان دەناسی زیاتر بە من دەوەڕین. پاشان (باجۆی) هاوکاری شوانەکە گەیشتە لامان، کە باوکی برزوو بوو. لە منداڵەکانم پرسی ئەگەر ئێوەم لەگەڵ نەبووایە سەگەکان چیان بەسەر مندا دەهێنا؟ گوتیان ئەگەر لە جێگای خۆت دانیشتیتایە لە دەورت کۆدەبوونەوە و هاواریاندەکرد تا شوانەکە یا باجۆ دەهاتن، بەڵام ئەگەر ڕاتبکردایە پارچە پارچەیان دەکردی.

باوکی برزوو ئاگری کردەوە و کترییەکەی خستە سەر ئاگر و چای بۆ ئێمە و شوانەکە لێنا. پاشان شیری چەند مەڕێکی دۆشی و جۆرە تریتێکی دروستکرد بۆ میوانی عەلی خان کە من بووم، ماستی لەگەڵ شیری کوڵاودا تێکەڵ کرد و نانی لە شیر و ماستەکە گوشی، بۆ شەش کەس خواردنی ئامادەکرد، من لەگەڵ سێ کەسی تر و شوانەکە و باجۆ هەموومان دەستمان خستە ناو ئەو تریتەوە کە باجۆ ئامادەی کردبوو، بەوشێوەیە نانی ئێوارەمان خوارد. دوو کاتژمێر لەگەڵ شوانەکانی ئەم مێگەلە دانیشتم. لە بارەی مەڕ، بزن، ئاو، ئاڵف، ڕەنگ و بۆنی پشقلی مەڕ، قسەمان کرد و زۆر شتم لێ بیستن. شوانەکە بە بۆنی ڕیخ و پشقلی مەڕ و بزنەکان دەیتوانی تێبگات کە ئەو ئاژەڵە

نەخۆشە یان نەخۆش نییە. ئەو دەیزانی ئەو ئاژەڵانە چییان خواردووە و بۆنی شیر و گۆشتەکەی چۆن دەبێت؟ شوانەکە کەسێکی دونیا دیدە و شارەزا بوو.

پاش دوو کاتژمێر دەنگی سەگەکانی مێگەلەکەی بێژەن گەیشتە گوێمان. دەنگی زەنگۆڵەی ملی بزنەکانی پێش مێگەلەکە لە شاخەکەوە دەنگی دەدایەوە. شوانەکە و باجۆ گوتیان ئێمە دەبێت مێگەلەکەی خۆمان دوور بخەینەوە، چونکە ئەگەر مێگەلەکەی بێژەن بگاتە ئێرە ئەوا سەگی هەردوو مێگەلەکە دەبێتە شەڕیان. ئەو سێ منداڵەی کە لەگەڵ مندا هاتبوون گوتیان ئێمەش دەگەڕێینەوە بۆ هەوارەکە. گوتم دانیشن مەڕۆن شەوە و زۆر تاریکە بەیانی زوو بڕۆن، بەڵام ئەوان لە هیچ شتێک نەدەترسان نە لە شاخ و نە لە تاریکی و نە لە گورگ، ئەوان ڕۆشتن و لە تاریکی شەودا ونبوون. دەبوو بەیانی زوو لە هەوارەکە ئامادەبووانایە، خۆ ڕەنگە کارێک نەبووبێت بۆ ئەوان تا ئەنجامی بدەن، بەڵام دەبوو هەر لەوێ ئامادەبن. منیش بەتەنها بەرەو لای مێگەلەکەی بێژەن کەوتمە ڕێ. سەگەکانی مێگەلەکەی بێژەن منیان دەناسی و جێگای مەترسی نەبوون بۆم. دەموویست شەو لە لای بێژەن و ئەردۆ بمێنمەوە.

ئەردۆ هەموو شەوێک سەیری ئاسمانی دەکرد، ئەو شەوەش هەر وەکو شەوانی پێشوو سەیری ئاسمانی ساف و بێگەردی دەکرد. بێژەن بانگی کرد و گوتی لەبری ئەوەی سەیری ئاسمان بکەی سەیری مێگەلەکە بکە. ئەردۆ گوتی پاش چەند کاتژمێرێکی تر باران دەبارێت. بێژەن گوتی دووبارە فاڵت گرتەوە؟ ئەوەتا ئاسمان سافە و پەڵە هەورێک بە ئاسمانەوە نییە، چۆن باران دەبارێت؟ ئەردۆ گوتی بارانێکی زۆر بەهێز دەبارێتپێدەچێتە لافاویش هەڵسێت. ئەردۆ گوتی نابێت مێگەلەکە لەم دۆڵەدا بێت، دەبێت مێگەلەکە ببەینە قەدپاڵی شاخەکە. لەنێوان بێژەن و ئەردۆ دەنگە دەنگ دروستبوو. بێژەن دەیگوت دەبێت مێگەلەکە لە ڕووبارەکە بپەڕێنینەوە و بیانبەین بۆ هەوارەکە تاکو بەیانی زوو ژنەکان مەڕەکان بدۆشن. ئەردۆش گوتی وا من دەڕۆم بە سەفەر دەڵێم کە مێگەلەکەی لە نزیک شیو و دۆڵەکە دوور بخاتەوە.

سەفەر شوانی مێگەلێکی تری خان بوو. بێژەن باوەڕی بەپێشبینییەکەی ئەردۆ کرد. گوتم بێژەن زوو باوەڕت بەقسەکەی ئەردۆ کرد. بێژەن گوتی تا ئێستا لە بارەی باران و لافاوەوە هەرچییەکی گوتووە ڕاست دەرچووە، ئەگەر ئەردۆ لە باران و لافاو بترسێت ئەوا من دڵنیام کە پێشبینییەکەی ڕاست دەردەچێت. ئەردۆ بەڕاکردن ڕۆشت و هاواری دەکرد ئەها سەفەر هۆ سەفەر ئاگاداربە پاش کەمێکی تر بارانێکی بە خوڕ دەبارێت و لافاو هەڵدەستێت.

بێژەن گوتی ئەگەر قسەکانی ئەردۆ ڕاست بێت ئەوا دەبێت مێگەلەکە ببەینە پاڵ شاخەکەوە بۆ لای کانی (دەلو) لەوێ ئاویش هەیە و پەناگەیەکی باشیشە. دەوروبەری نیوەی شەو هەردوو مێگەلەکە بە ماوەی پێنجسەد مەتر لە دەوریی کانی (دەلو) بوون. مێگەلەکە بە هێواشی دەلەوەڕان، منیش بێژەنم فێری نووسین دەکرد. وشەکانی:کانی، دەلو، باران، لافاوم فێر دەکرد. هیچ پەڵە هەورێک بە ئاسمانەوە نەبوو، هیچ شتێکم بەدینەدەکرد کە ئاماژە بێت بۆ باران بارین. ئەستێرەش بە ئاسمانەوە دەجریوانەوە. بێژەن دەستیکرد بە خوێندنەوەی هۆنراوەیەکی کوردی. گوتم بێژەن ئەو هۆنراوەیە بنووسەرەوە. گوتی بۆ هۆنراوەش دەنووسرێتەوە؟ دوو کاتژمێری پێچوو تا (١٠-١٢) وشەی ئەم هۆنراوەیەی نووسی. زۆر دڵخۆشبووم، گوتم پێتخۆشە کە خۆشەویستەکەت فێری خوێندەواری ببێت؟ گوتی نەخێر با فێر نەبێت. گوتم ئەگەر هەوڵبدەیت ئەویش فێری خوێندەواری ببێت ئەوکاتە دەتوانیت نامەی بۆ بنووسیت. گوتی زۆر باشە تۆ بڕۆ فێری بکە. گوتم من ناتوانم. گوتی بۆچی؟ گوتم چونکە من پیاوم. گوتی زۆر باشە مادام تۆ پیاویت کەواتە تۆ فێری بکە، باشتر کە تۆ ناپیاو نیت. لە هەموو تەمەنمدا وەکو ئەو شەوە مانای پیاو و ناپیاوم لەو قسانەی بێژەن جوانتر نەبیستووە، من وەک پیاو وام بۆیە دەبێت وانە بەو کچە بڵێم کە ئەو خۆشیدەوێت، ئەو گوتی تۆ ناپیاو نیت.

من لە تەمەنمدا چەند جارێک پیاو بووم؟ چەندین جاریش نا پیاو بووم، خۆم دانی پێدادەنێم کە من لە تەمەنی چواردەساڵییەوە تاکو ئەم تەمەنەم چەند جارێک ناپیاو بووم. لە کاتی خۆیدا چیرۆکی ناپیاوی خۆم دەنووسمەوە. بە بێژەنم گوت هەواڵ بنێرە بۆ گوڵسەنەم با بڕوات بۆ لای سوپای خوێندن، تا ببێتە خوێندەوار. گوتی زۆر باشە هەواڵی بۆ دەنێرم. گەیشتینە لای ڕووباری (قلجەق)، من لەگەڵ بێژەندا باسی خوێندن و دروستکردنی ڕستەمان دەکرد. وشەی سێ پیتیم فێردەکرد، بەتایبەت ئەو وشانەی کە پەیوەندیان هەبوو بە ئاژەڵداریی و ژیانی کۆچەرییەوە. هەروەها ئەو وشانەی کە بۆنی عیشق و عیشقبازی‌یان لێدەهات ئەو وشانەی کە پەیوەندی بە وانەوە هەبوو زووتر فێردەبوو، وەکو وشەکانی پشقل، دووگ، لق، خوریی، عیشق، گوڵ، ئەندام، سەنەم. وردە وردە فێر دەبوو ڕستەی لێدروست دەکردن. بێژەن ئارەزووی هەبوو بە زوویی فێری نووسین و خوێندنەوە ببێت تاکو نامە بنووسێت. پێنج ڕۆژ بوو دەستی بە نووسین کردبوو. بۆ خۆی دەیتوانی هەندێک وشە بنووسێت، بەڵام زیاتر بیرو هۆشی لای مێگەلەکە بوو. لە ناکاو بێژەن هاواری کرد ئەردۆ... مەڕە زەرد لە مێگەلەکە دوور کەوتۆتەوە ئەوەتا وا بزنە شاخ زیویش چوو بۆ لای، بەزوویی سەگەکە بنێرە با بیانگێڕێتەوە.

بێژەن دارلاستیکێکی پێبوو بەردی پێدەهاویشت. زۆر بە باشی لە مەودای (٧٠-٨٠) مەتردا نیشانی دەپێکا. بەو دارلاستیکە دەیتوانی ئاژەڵەکان بگێڕێتەوە. ئەو بەردەی کە پێی دەهاویشت تا (١٠٠-١٥٠) مەتر دەڕۆیشت. لە بەرد هاویشتندا شەو و ڕۆژ بۆ ئەو هیچ جیاوازییەکی نەبوو. هەستی بیستن و بۆنکردنی بێژەن زۆر لە ئێمەی خەڵکی شار بە هێزتر بوو. ئەردۆش بە هەمان شێوە بوو. نزیکی نیوە شەو بوو سەگەکان دەستیان کرد بە وەڕین. بێژەن بە خێرایی دەستی دایە گۆپاڵەکەی و گوتی ئەوە گورگ هاتووە. ئەو گوتی کاتێک گورگ بێت سەگەکان بەو جۆرە هاوار دەکەن. مێگەلەکەی بە من سپارد و خۆی و ئەردۆ بەخێرایی ڕایانکرد بەرەو لای سەگەکە. مەڕەکانیش دەترسان و دەیانویست بڕۆن و بڵاوببنەوە. هەر چۆنێک بوو مەڕەکانم کۆکردنەوە و چاودێریم کردن. پاش نیو کاتژمێر بێژەن و ئەردۆ گەڕانەوە. دوو گورگیان کوشتبوو گوێی گورگەکانیان بڕی بوو، لەگەڵ خۆیان هێنابوویانن، یەکێک لە سەگەکانیش لاملی بریندار ببوو، بەڵام بێژەن زوو فریای کەوتبوو. بە گۆپاڵەکەی لە سەری گورگەکەی دابوو یەکسەر کوشتبووی. شوێن برینی سەگەکە هێشتا خوێنی لێدەهات. بێژەن بەخێرایی ئاگری کردەوە و میلە ئاسنەکەی لە ئاگرەکەدا سوورکردەوە و نایە سەر برینی سەگەکە، پاشان خۆڵەمێشی بە برینەکەیدا کرد. سەگەکەش لە تاو ئازار نوزە نوزی بوو. ئەردۆ بە پەتێک دەست و پێی سەگەکەی بەستبوو. گەردنی سەگەکەشی بە پارچە قوماشیک بەست، پاشان دەست و پێی سەگەکەی کردەوە و کاسەیەک شیری دۆشی و خەستیە بەردەمی. چەند ڕۆژێک سەگەکە بە برینداری مایەوە و پاشان چاکبووەوە و ئامادەی شەڕکردن بوو لەگەڵ گورگەکاندا. کات ببوو بەنیوەی شەو. پیادەڕۆیی تەواو ماندووی کردبووم، بێژەن فەرەنجییەکەی لە سەر پشتی گوێدرێژەکە داگرت و لە سەر بەردێکی گەورە و تەخت ڕایخست، منیش لە سەری ڕاکشام، بێژەن گوتی ئێرە لەوەڕەکەی باشە تا بەیانی هەر لێرە دەمێنینەوە. ئەگەر خەوت دێت بخەوە. منیش لە سەر پشت ڕاکشام و سەیری ئاسمانی سافم دەکرد. ئەستێرەکان دەجریوانەوە، بیرم لە ئاسمانی یەزد دەکردەوە. ئاسمانی بیابان زۆر جوانە. ئاسمانی ئەم ناو شاخ و داخە هێندە جوان نییە. هەوا کەمێک سارد بوو،بەڵام شتێک نەبوو ببیدەم بە خۆمدا، لە سەر پشت ڕاکشا بووم، دەمویست ئەستێرەکان بژمێرم. ئەستێرەی باکوور، ورچی گەورە، ورچی بچووک، خەوم لێکەوت و چوومە خەوێکی قوڵەوە. لە شیرینی خەودا بووم، دەنگێکی گەورەی ترسناک ڕایپەڕاندم کە چاوم کردەوە سەیردەکەم هەورە بروسکە و گرمەگرمی هەورە. دەنگی هەورەکە لە شاخەکانەوە دەنگی دەدایەوە بەجۆرێک بوو کە ترسی لەگیانمدا

دروستکرد. یەکەمین دڵۆپە باران بەر ڕومەتم کەوت. بێژەن و ئەردۆ مێگەلەکەیان لێدەخوڕی. منیش هاوکاریم کردن. بێژەن گوتی موهەندیس مەڕەکان لە پاڵ شاخەکەدا کۆدەکەینەوە تاکو مەڕەکان بچنە ژێر ئەو درەختانەوە. دووبارە، هەورە بروسکە و گرمە گرمێکی زۆر بەهێز دەستی پێکرد، تەنها لە ساڵی (١٣٦٤-١٩٨٥) دا گوێم لە هەورە بروسکە و گرمەی وا بەهێز بووە. لە نزیک چا بەهار و لە ساڵی (١٣٦٨-١٩٨٩) دا لە باکووری بەرازیل جارێکی تر بینیوومە.

لەپڕ بارانێکی بەهێز دایکرد، بە جۆرێک لە کەمترین کاتدا هەموو گیانمان ئاوی لێدەچۆڕا، ئاو لە سەر زەویش هەڵسا بوو. سەگەکان دەستیانکرد بە وەڕە وەڕ، ئێمەش هەوڵمان دەدا مەڕەکان لە نزیک جۆگەلە ئاوەکانەوە کۆنەبنەوە، بەڵام بزنەکان بزێو بوون، کۆکردنەوەی بزنەکان ئەستەمتر بوو لە مەڕەکان. بارانەکە تا دەهات بەهێزتر دەبوو. بایەکی بەهێزیش هەڵیکرد، هەر چەندە لە ژێر درەختێکدا وەستا بووین بەڵام، سەرتاپا لە ئاو هەڵکێشرابووین، هەموو گیانمان تەڕببوو، دەتگوت تۆفانەکەی حەزرەتی نوحە. هەور زۆر ڕەش و چڕ بوو، بۆیە شەوەکەی تاریکتر کردبوو، بێژەن و ئەردۆ سەگەکانیان بێدەنگ دەکرد تاکو مەڕەکان بڵاوە پێنەکەن.

گوێدرێژەکەش بەرەڵا ببوو ڕۆیشت، ئەردۆ یەکێک لە سەگەکانی نارد بەشوێنیدا، گوێدرێژی داماو بەکەڵبەی سەگەکە گەڕایەوە. خۆ ئەگەر سەگ نەبووایە شوانی و ئاژەڵداریی کارێکی زۆر ئەستەم دەبوو. نزیکەی نیو کاتژمێر بارانێکی زۆر بەخوڕ باری، پاشان کەمێک هێواشی کردەوە، بەڵام باران هەر بەردەوام بوو. ئێمە وەک مشکی لە ئاو هەڵکێشراومان لێهاتبوو، پاش کاتژمێرێک باران خۆشی کردەوە. دەنگی گرپە و ناڵە دەهات، ئەردۆ گوتی ئەوە لافاوە، لافاوێکی گەورەیە، ئەوەش دەنگی بەردی گەورەیە کە ئاوەکە تلیان دەدا و لەگەڵ خۆیدا دەیانهێنێت. ئەردۆ گوتی خۆ ئەگەر لێرە نەبووینایە بەرەو هەوارەکە بڕۆیشتینایە ئەوا تووشی لافاوەکە دەبووین. دەنگ و هاوار هاواری خەڵکی دەهات. دەنگی شوانەکانی مێگەلەکەی تر بوو. ئەوان نەیانتوانی بوو مێگەلەکە کۆ بکەنەوە و ئاگاداری بکەن. داوای هاوکاریاندەکرد. بێژەن ئەردۆی نارد بۆلایان تاکو هاوکاریان بکات. کاتێک دونیا ڕووناک بووەوە، لافاوەکەمان بەجوانی دەبینی. ڕووبارەکە تەنها سەد مەتر لە ئێمەوە دوور بوو، بەڵام نەماندەتوانی بچینە لێواری ڕووبارەکە، چونکە هەڵدێرێکی بەرز بوو. هەر دوو مێگەلەکە لە نزیکی یەکتری بوون. لە مێگەلی ئێمەدا هیچ مەڕێک ون نەببوو، بەڵام لە مێگەلەکەی تر یازدە مەڕ و بزن ون ببوون. شوانەکان و سەگەکان بەدوای مەڕە ونبووەکاندا دەگەڕان، سێ بزنیان

بەسەر پەلی درەختێکەوە دۆزینەوە، بەڵام ئەوانی تر بۆ هەمیشە ونبوون، تەنانەت بە مردارەوەبووش نەدۆزرانەوە. دونیا بەتەواوی ڕووناک ببووەوە. هەتاو کەوتبوو، ئاسمان ساماڵ بوو، وەک ئەوەی هەرگیز هەوری پێوە نەبووبێت، بەڵام هێشتا لە هەموو لایەکەوە لافاو بوو. دوو شوانی مێگەلەکەی تر زۆر دەترسان، دەیانگوت دەبێت عەلی خان چیمان لێبکات، ڕەنگە عەلی خان بمانکوژێت. منیش دڵم دەدانەوە و دەمگوت ئەگەر ئێوە ئەوەندە خۆتان ماندوو نەکردایە ئەوا تەواوی مێگەلەکەتان لافاو دەیبرد، بۆیە پێویستە خان سوپاستان بکات. ویستم ئاگرێک بکەمەوە بەڵام نەمتوانی، لق و چڵی درەختەکان هەموو تەڕ بوون، شخارتەکەی گیرفانیشم خوسابووەوە، هەموومان هەڵدەلەرزین لە سەرمادا. ئەو کوردە میهرەبانانە فەرەنجییەکەی خۆیان دا بەسەر شانی مندا، بەڵام فەرەنجییەکەش تەڕ و قورس بوو. ئەردۆ گوتی تا کاتی نیوەڕۆ ناتوانین لە ڕووبارەکە بپەڕینەوە. ئەو کاتەش بۆ پەڕینەوە دەبێت نزیکەی (٢ فرسەخ = ١٢,٤٨کم) ڕێگا ببڕین تا دەگەینە جێگایەک کە ڕووبارەکە لەو شوێنەدا پان بێت و قوڵییەکەشی کەم بێت ئینجا دەتوانین بپەڕینەوە.

من زۆر خەمی ئەو سێ منداڵەم بوو کە شەو گەڕابوونەوە، گوتم دەبێت بە سەلامەتی گەیشتبنەوە هەوارەکە. بێژەن گوتی دڵنیابە بە سەلامەتی گەیشتوون. ئەو دڵنیا بوو کە ئەوان لانیکەم دوو کاتژمێر پێش بارانەکە گەیشتوون. وردە وردە کەوتینە، ڕێگا بەڵام مێگەلەکە زۆر بەهێواشی دەڕۆیشت. هەموو شیو و دۆڵەکان ئاویان پێدا دەهات. ئێمە لە نێوان شاخەکە و ڕووبارەکەدا مابووین، بە هیچ لایەکدا ڕێگەمان نەبوو. نزیکەی (١٥٠٠) سەر مەڕ و پێنج مرۆڤ و دوو گوێدرێژ و حەوت سەگ لە پارچە زەوییەکدا گیرمان خوارد بوو کە فراوانییەکەی تەنها پێنج هێکتار دەبوو. لایەکمان شاخ بوو لاکەی ترمان هەڵدێرێکی زۆر سەخت بوو کە بەسەر ڕووبارەکەدا دەیڕوانی. هەردوو لاکەی تریشمان دوو شیوی گەورە بوو، ئەو دوو شیوەش لافاوێکی زۆریان پێدا دەهات، شیوێکیان لافاوەکەی زۆر بەخوڕی پێدا دەهات، شیوەکەی تریشیان لافاوەکەی زۆر بوو پانییەکەی پازدە مەتر دەبوو، ئۆتۆمبێلیش نەیدەتوانی لێی بپەڕێتەوە، بۆیە هیچ چارەیەکمان نەبوو جگە لەوەی سەبر بکەین. ڕۆشتم بۆ سەر هەڵدێرەکە تا لە نزیکەوە سەیری ئاوی ڕووبارەکە بکەم، بەڵام ئاوی چی؟ سوراوێک بە لرفە لرف دەهاتە خوارەوە، ئاوەکە لەگەڵ خۆیدا داری گەورە و لاشەی مەڕو بزن و مانگای دەهێنا. دیاربوو کە لافاوەکە زەرەر و زیانێکی زۆری دابوو.

بزن و مەڕەکان بە هۆی نەدۆشینیانەوە ناڕەحەت ببوون، شوانەکان گوتیان

گوانیان پڕ لە شیرە و زیاتر لە بیست‌وچوار کاتژمێرە نەدۆشراون، بەچکەکەنیشیان لە لا نەبوو تا شیرەکەیان بخۆن. سەفەر کە لە هەمووان بەتەمەنتر بوو. گوتی ئەگەر تا نیوەڕۆ نەمانتوانی لێرە بڕۆین و بچینەوە بۆ هەوارەکە ئەوا ئەوکات دەبێت شیرەکەیان بدۆشین. ئەردۆ گوتی ئیتر باران نابارێت و هەوا خۆش دەبێت و لافاوەکەش تا چەند کاتژمێرێکی تر دەنیشێتەوە، بەلام سەفەر هێشتا هەر دەترسا. زیاتر لە عەلی خان دەترسا. وردە وردە هەتاو گیانمانی گەرمکردەوە، بەلام هەتاو نەیدەتوانی ترسی ئەو دوو شوانە لە عەلی خان کۆتایی پێبهێنێت. قسەکانی منیش هیچ سوودێکی نەبوو بۆ ئەو شوانە داماوانە.

لە سەر لێواری هەڵدێرەکە دانیشتبووم. سەیری تورەیی سروشتم دەکرد، هەوڵ و ماندووبوونی ئەو چوار شوانەم دەبینی، لە دڵی خۆمدا گوتم ئێمەی خەڵکی شار بەکەڵکی چی دێین؟ هەرگیز بیرم لەوە نەکردبووەوە کە ئەم گۆشت و شیر و ڕۆنەی ئێمە دەیخۆین. بە چ دەردیسەرییەک بەدەستدێت؟ کەسانێک دەبێت بەرهەمی بهێنن و چ ئەرک و ئازارێک بکێشن تا پاروە نانێک بەدەست دەهێنن؟ بەلام ئێمە هەست بەماندووبوونی ئەوان ناکەین و بە ئامادەکراوی خواردنمان بۆ دێتە بەردەست.

لەو ساڵانەدا کە من لە زانکۆ بووم. نان و خواردنی نیوەڕۆ و ئێوارەیان پێدەداین. کە خواردنێکی باش و نموونەیی بوو، لە هەفتەیەدا دوو ڕۆژ گۆشتی قەلمان هەبوو بە برنجەوە، کە ڕانە قەلێک یا سنگی قەل دادەنرا بە برنجەوە لەگەڵ شوشەیەک دۆ یاخود بیبسی کۆلا لەگەڵ پرتەقاڵێکدا. لە بەرامبەر ئەم خواردنە باشەدا تەنها (٥،١٢) ڕیاڵ وەردەگیرا. ڕۆژانی تریش شیشێک کەباب یان گۆشتی برژاو بوو بە برنجەوە. خوێندکاران لانیکەم لە سێ بەش بەشێکی خواردنەکەیان پێنەدەخورا و دەیانڕشت. ساڵی چەند جارێکیش شووشە بیبسیەکەیان بە شووشەی پەنجەرەکاندا دەکێشا و شووشەکانیان دەشکاند و مانیان دەگرت، هەر وتەیەکی ناشیرین هەبووایە ئاڕاستەی زانکۆ و سەرۆکی زانکۆ و کەسانی تر دەکرا، بەهانەش ئەوە بوو کە خواردنەکە باش نییە. هەڵبەت خواردنەکە زۆر باش بوو، بەلام ئێمە بەهانەمان دەگرت، گرنگ ئەوە بوو خواردنەکە بڕێژین. هەروەها ئەو پۆلیسانەی کە زانکۆیان دەپاراست ئەوانیش لە سێ بەش بەشێکی خواردنەکەیان دەڕشت. تەنانەت وای لێهاتبوو خەڵکی لە ماڵەکەی خۆشیاندا خواردنیان بەهەدەر دەدا، بەلام لە هەمانکاتدا خەڵکانی تری هەژار و داماو لەو کێو و دەشت و شاخە ڕەنجیان دەدا تاکو گۆشت و شیر و ماست و پەنیر بەرهەمبێنن و لە ترسی عەلی خان دەلەرزین، لەگەڵ ئەم هەموو ڕەنج و مەینەتیەشدا هەمیشە برسی بوون.

کاتژمێر لە دووی دوا نیوەڕۆ لایدا بوو. هێشتا نەماندەتوانی بڕۆین، هەموومان زۆرمان برسیبوو. مەڕ و بزنەکانیش برسی بوون، ئەو جێگایەی لێی بووین زۆر بەر تەسک بوو. لەوەڕی لێنەمابوو، بزن و مەڕەکان برسی و تینوو بوون، هەر چەندە ئاو زۆر بوو، بەڵام ئاوەکە هەر قوڕاو بوو بەکەڵکی خواردنەوە نەدەهات.

ئەردۆ بەهەزار ئەملاولا توانی ئاگرێک بکاتەوە و چای لێنا، بەڵام شەکرەکە بەهۆی بارانەکەوە خوسابووەوە. کەمێک نان کە لە شوانەکان مابووەوە ئەویش تەڕ ببوو وەک هەویری لێهاتبوو بەکەڵکی خواردن نەدەهات، لە کۆڵەپشتەکەمدا دوو قوتو گۆشت ماسیم پێبوو، دەرمهێنا و دابەشم کرد و بەیەکەوە خواردمان. شیریش زۆر بوو. شیریشمان کوڵاند و خواردمان. سەگەکانیش زۆریان برسی بوو، نانە خوساوەکەمان دا بەسەگەکان.

نزیکەی کاتژمێر چواری دوانیوەڕۆ بوو. لە دوورەوە پێنج ئەسپ سوار دەرکەوتن. بێژەن گوتی ئەوە عەلی خان و کوڕەکانییەتی. سەفەر ترسی لێنیشت چونکە لافاوەکە هەشت سەر لە مەڕەکانی بردبوو. عەلی خان و سێ لە کوڕەکانی و یەک کەسێکی تر گەیشتنە سەر لێواری ڕووبارەکە، هێشتا لافاوەکە بەتوندی دەهات. عەلی خان ڕووی کردە شوانەکان و گوتی مەڕەکان هەموویان سەلامەتن؟ هیچ مەڕێک ون نەبووە؟ شوانەکان گوتیان هەشت مەڕ لافاو بردویەتی. عەلی خان گوتی بۆچی مێگەلەکەتان هێناوە بۆ ئەم جێگەیە؟ بۆچی نەتانهێناوەتەوە بۆ هەوارەکە؟ ئەردۆ لە ترساندا گوتی موهەندیس پێیگوتین مێگەلەکە لێرەدا ڕاگرین. سەفەریش هەمان قسەی ئەردۆی دووبارە کردەوە و گوتی موهەندیس پێیگوتین. خۆ من لە پێشبینی باران باریندا هیچ شتێکم نەدەزانی، ئەوە ئەردۆ بوو کە ئێمەی دڵنیاکرد و گوتی باران دەبارێت ولافا و هەڵدەستێت. ئەردۆ بوو گوتی پێویستە مێگەلەکە لەم شوێنەدا کۆبکەینەوە. ویستی خودا بوو ئێمە لەم جێگەیەدا بووین، کاتێک باران بەهێز دایکرد، مەڕەکان بڵاو بوون، کۆمانکردنەوە. سەفەریش کاتێک زانی باران دەبارێت ئەو کاتە مێگەلەکەی هێنا بۆ ئێرە، ڕاست ئەو کاتەی کە ویستی دواین مەڕ لە بوارەکەوە بهێنێت بۆ لای ئێمە لافاو هەڵسا بوو هەشت مەڕیش ئاو بردبوونی.

عەلی خان و کوڕەکانی چەند گوریسێکیان لەگەڵ خۆیاندا هێنا بوو، سەرێکی گوریسەکەیان هەڵدا بۆ ئەمبەر بۆ لای ئێمە. ئێمەش پێنج کەس سەری گوریسەکەمان گرت و ئەوانیش ئەو سەری گوریسەکەیان بەئەسپێکەوە بەست، یەکەم کەس کە پەڕییەوە بۆلامان ئەو پیاوە بوو کە لەگەڵ خان و کوڕەکانیدا هاتبوو. ئاوەکە کەم ببوو،

بەڵام هەر بەهێز بوو، هێشتا ئاوەکە تا بن سکی ئەسپەکە دەهات، خۆ ئەگەر بەبێ گوریس بپەڕیایەتەوە ئەوا لافاوەکە ئەسپ و سوارەکەشی دەبرد. من لە بیرکردنەوەی ئەوەدا بووم کە چۆن قسە لەگەڵ خاندا بکەم. خان لە دوێنێوە لە من تورە بوو، دوێنێ شەو جێیەکی بەمن نەدا، ئێستاش ئەم شوانانە بەو قسانەی کردیان، ئۆباڵی هەشت سەر مەڕی ئاوبردوویان خستە ئەستۆی من. بە بێژەنم گوت عەلی خان زۆر تورەیە. گوتی وایە تورەیە، بەڵام لە مێگەلی ئێمە هیچ مەڕێک نەفەوتاوە. عەلی خان کەسی چوارەم بوو لە ئاوەکە پەڕییەوە. یەکێک لەکوڕەکانی خان لەوبەری ئاوەکە مایەوە.

خان تەمەنی شەستوپێنج ساڵ بوو، بەڵام هێشتا کەسێکی ئازا و بەهێز بوو، لە هەموویان باشتر لە ئاوەکە پەڕییەوە. کاتێک لە ئەسپەکە دابەزی لە باوەشی گرتم و سەری ماچکردم. گوتی موهەندیس بەڕاستی موهەندیسیت، هیچ جێگایەک لەم شوێنە باشتر نییە. باشترین جێگات دیاریکردووە و مێگەلەکەتان بۆ هێناوە، خۆ جگە لەم جێگایە لە هەر جێگایەکی تر بوونایە لانیکەم سەدوپەنجا سەر مەڕ ئاو دەیبرد. شوانە داماوەکان ورتەیان لێوە نەهات. عەلی خان و کوڕەکانی ماندوو ببوون. شەڕواڵەکانیان تەڕببوون.. ئاگرمان کردەوە و هەموومان لە دەوری کۆبووینەوە. عەلی خان گوتی بەهۆی لافاوەکەوە وا باشترە ئەمشەویش مێگەلەکە هەر لێرەبێت، ناکرێت مێگەلەکە لە ڕووبارەکە بپەڕێتەوە. بێژەن گوتی لێرە لەوەڕ نەماوە مەڕەکانیش نەدۆشراون ئێستا ئازاری گوانیان هەیە. عەلی خان گوتی ناتوانین ئەم هەموو مەڕە لەم ئاوە شێتە بپەڕێنینەوە، لە دە جێگای تر ئاویان دێتە پێش. ئەگەر لە هەموویان بپەڕینەوە. لەڕووباری (قەلجەق) ناتوانین بپەڕینەوە.

ئەوان نزیکەی بیست کیلۆ مەتر لەهەوارەکەوە بەرەو ژوور ڕۆیشتبوون تاکو توانیبوویان لە ڕووبارەکە بپەڕنەوە، واتە خۆیان گەیاندبووە شوێنێک لەو شوێنەدا ڕووبارەکە ببووە چەند لقێک ئەوسا توانیبوویان بپەڕنەوە. عەلی خان هیچ هەواڵی لە مێگەلەکانی تر نەبوو، بەڵام لەیەکێک لە مێگەلەکانی زیاتر لە هەشتاوپێنج سەر مەڕ بێسەروشوێن بوون، بەو مەڕانەی کە لە مێگەلەکەی سەفەردا ئاو بردبوونی تێکڕا نزیکەی نەوەدوپێنج سەر مەڕ ئاو بردبووی، بەڵام عەلی خان هێشتا خۆشحاڵ بوو. عەبداڵ و هاوڕێکانیشی بەسەلامەتی گەیشتبوونەوە هەوارەکە.

عەلی خان چایەکەی بەبێ شەکر خواردەوە و گوتی جۆ بدەن بە ئەسپەکان با هەندێک پشووبدەن و بگەڕێنەوە. کاتژمێر پێنجی دوانیوەڕۆ بوو، عەلی خان بە مێهرەبانییەوە پێیگوتم موهەندیس ڕێگامان دوورە، تۆ لەگەڵ ئێمەدا بگەڕێرەوە بۆ

هەوارەکە، بەبێ ئەوەی یەک قسەی تر بکات کوڵە پشتەکەی منی هەڵگرت و ڕۆیشت. ئەو کەسەی لەگەڵیاندا هاتبوو ناوی سەمەد بوو. عەلی خان بە سەمەدی گوت تۆ لێرە بمێنەوە و ئەسپەکەت بدەرە موهەنیس. منیش گوتم خانی بەڕێز من ناتوانم سواری ئەسپ ببم. عەلی خان بەسەر سوڕمانەوە گوتی چۆن ناتوانیت سواری ئەسپ ببیت؟ گوتم بەڵێ من هەرگیز سواری ئەسپ نەبووم. زۆر بەلایەوە سەیر بوو، گوتی چۆن تا ئیستا سواری ئەسپ نەبوویت؟ گوتم سوار نەبووم. ئەسەدی کوڕی خان هەر چۆنێک بوو منی سواری ئەسپەکە کرد و خوداحافیزییم لە بێژەن و ئەردۆ و سەفەر و باوکی عەبداڵ کرد و بەهۆی گوریسەوە لە ڕووبارەکە پەڕینەوە.

ڕێگاکە سەخت بوو، ئەسپەکان ماندوو ببوون، لە بەیانییەوە بەڕێگاوە بوون. دەبوو لە چەن ڕووباری پڕ ئاوەوە بپەڕینەوە. پاش ڕۆیشتنی چەند کیلۆ مەترێک گەیشتینە زەوییە کشتوکاڵییەکانی گوندی (گورگانلو) لافاو تەواوی کشتوکاڵی ئەو گوندەی بردبوو، هەموو گەنم و جۆی گوندەکەی بردبوو، زۆربەی دارەکانیشی هەڵکەندبوو، نزیکەی نیوەی خانووی گوندەکەی ڕوخاندبوو، کەسێکیش ئاو بردبووی، هەروەها نیوەی بزن و مەڕەکانیان ئاو بردبوونی. نزیکی ئێوارە بوو کوێخا و خەڵکی گوند هێشتا لە گەڕاندا بوون بەشوێن ئاژەڵە ونبووەکانیاندا، بەڵام هیچ کەسێک نەهاتبوو بەهانایانەوە، هیچ کۆمەکێکیان پێنەگەیشت بوو. بە گشتی هەموو خەڵکەکە بێلانە و ماڵوێران ببوون، خەریکی دەرهێنانەوەی کەلوپەلەکانیان بوون لە ژێر قوڕ و لیتەی خانووە ڕووخاوەکانیاندا، خەڵکەکە هەموو گیانیان لە قوڕ هەڵکشا بوو، وێڕای ئەو دۆخە خراپەشیان، هێشتا کوێخا بە خەڵکەکەی گوت بەپەلە چا بۆ عەلی خان لێبنێن. مزگەوتەکەیان نەڕووخا بوو، چونکە شوێنەکەی لە بەرزیی بوو. تەواوی خەڵکەکە ماڵ و حاڵیان ئاو بردبووی و زۆربەی خانووەکانیشیان ڕووخا بوو، لە مزگەوت کۆببوونەوە، بەهۆی لافاو و خراپی ڕێگاوبانەکەوە نەیانتوانی بوو هەواڵ بنێرن بۆ شێروان کە چ بەلایەکیان بەسەردا هاتووە. چا، ئامادەکرا و چایەکی گەرمم بەشەکرەوە خوارد. زۆر خولقیان کردین شەو لای ئەوان بمێنینەوە، خولقکردنەکەیان لە دڵەوە بوو. کوێخا گوتی عەلی خان تا بەیانی ناگەنە هەوارەکانی خۆتان. هەموو شوێنێک ئاو دایپۆشیوە، بۆیە وا باشترە هەر لێرە بمێننەوە. عەلی خان گوتی ڕێگاکان شارەزاین و دەڕۆین.

شەو داهات و لە هەر ڕووبارێک بە هەزار دەردەسەری دەپەڕینەوە. گەیشتینە ڕووباری گەورەی (قەلجەق). ویستمان لە جێگەیەکەوە بپەڕینەوە. پانی ڕووبارەکە لەو شوێنەدا (١٥٠) مەتر زیاتر بوو. عەلی خان دڵنیا نەبوو کە بەو تاریکییە دەتوانین لە

ڕووبارەکە بپەڕینەوە یان نا؟ بۆیە بڕیاریاندا هەر چوار ئەسپەکە بەتەنیشت یەکەوەی بڕۆن. گوریسەکەیان لە هەر چوار ئەسپەکە بەست و هەر کەسە و گوریسەکەی لە کەمەری خۆیشی بەست، ئەسپەکان لە ماوەیەکی شەش مەتریدا و لە نزیک یەکترەوە کەوتینەڕێ، سەرەتا کوڕێکی خان گەیشتە ناو ئاوەکە، ئەسپەکەی منیش دووەم بوو. لە هەندێک شوێندا ئاوی ڕووبارەکە دەگەیشتە بن سکی ئەسپەکان. منی ئاو نەدیوی سواری ئەسپ نەبوو، منی یەزدی لەو شەوە تاریکەدا و بە پشتی ئەسپەوە چەسپ ببووم. قووڵی ڕووبارەکە وەک یەک نەبوو. لە هەندێک شوێندا زۆر قوڵ بوو، لە هەندێک شوێنی تریش قوڵییەکە کەمتر بوو. لە هەندێک شوێندا ئاوەکە خوڕ و بە تەوژم بوو. گەیشتینە ناوەڕاستی ڕووبارەکە گوریسەکە بەجۆرێک لە کەمەرم توند ببوو، خەریکبوو پەراسوەکانم بشکێنێت. ئەسپەکەی دوای من کەوتە ئاوەکەوە. عەلی خان هاواری کرد، ئاگاداری خۆتبە. ئەسەد بەخێرایی سەری ئەسپەکەی ئەسپەکەی سوڕاندەوە و لە ئەسپەکە دابەزییە ناو ئاوەکە، براکەی کە کەوتبووە ناو ئاوەکەوە لە ژێر پێی ئەسپەکەی دابوو خێرا ڕزگاری کرد و منیش بەهۆی ئەو گورسەوە کە سەرێکی بەسترابوو بەمنەوە بەربوومەوە بۆ نێو ڕووبارەکە، خۆشبەختانە ئەسەد سەری گوریسەکەی بەدەستەوە بوو منی ڕاکێشا و نەیهێشت ئاوەکە بمبات. هەرچەندە ڕووبارەکە لەو شوێنەدا قوڵ بوو، بەڵام بەهێز نەبوو. ئەوان بە هەرسێکیان ئەسپە کەوتووەکەیان هەڵسەندەوە و بەخێرایی هەریەکە و سواری ئەسپی خۆیان بوونەوە و کەوتینەوە ڕێ، بەڵام هەموو گیانمان لە ئاو هەڵکشا بوو. خۆ ئەگەر ئەو گوریسە نەبووایە ئەوا ئاو دەیبردم. ئەو ماوەیەی کە مابوومان، زۆر بە وریایی لە ئاوەکە پەڕینەوە.

دونیا تاریکی کرد بوو. مانگ خەریکبوو سەری دەردەهێنا. ڕووناکییەکەی دەرکەوتبوو، بەڵام هێشتا لە لای ئێمەوە بە تەواوی نەدەبینرا.. لە ڕووبارەکە پەڕینەوە. ئەسپەکان لە شەکەتیدا هەنکە هەنکیان بوو. لە ئەسپەکان دابەزین و بە پێ کەوتینەڕێ، ڕێگاکە هەمووی قوڕبوو. کە زانیم ترس لەسەر ژیانم نەماوە یادی گلێۆ هاتەوە بیرم.

لەو کاتەوە کە باران دەستیپێکرد بوو، عیشق و خۆشەویستی لەسەرمدا نەمابوو.

مرۆڤ کاتێک دەکەوێتە ترسەوە عیشق و خۆشەویستی لە مێشکی دەردەچێت. من لە ژیانمدا چەندین جار زۆر پەیوەستبووم بەخوداوە. کاتێک کە دەمویست لەگەڵ کەتیرەکەرەکاندا بە ڕێگای قاچاغ لە سنووری عێراق و ئێران بپەڕمەوە لەبەر ترسێکی زۆر وام هەستدەکرد کە لەگەڵ خودادا ئاوێزانم. ئەمجارەش کە بەو شەوە تاریکە لە ناوەڕاستی ڕووباری قەلجەق لە ئەسپەکە بەربوومەوە بۆ ناو ئاوەکە، هەمان هەستم

هەبوو. وامدەزانی دەستێک لە ئاسمانەوە لە نێو ئاوەکە بەرزم دەکاتەوە.

هەوا زۆر سارد بوو جلوبەرگمان هەمووی تەڕ ببوو. عەلی خان بە کوڕەکانی گوت. ڕێگامان زۆر دوورە، سەرێک لە گوندی (پەلکانلۆ) بدەین. عەلی خان گوتی لێرەوە بۆ گوندەکە زۆر دوور نییە. ئەسپەکان زۆر شەکەت ببوون، بەڵام ئێمە بەردەوام بووین لە ڕۆیشتن. لە دوورەوە چاومان لە ڕووناکی چرایەک بوو، هیچ کام لە گوندەکانی ئەو ناوچەیە کارەبایان نەبوو. هەموومان زۆر برسی و تینوو بووین. ئەسپەکانیش برسی‌یان بوو، پێویستیان بەپێدانی جۆ هەبوو. گەیشتینە گوندەکە، دیاربوو کە ئەو گوندەش دوچاری لافاو ببوو. بەرەو مزگەوتەکە ڕۆیشتین. مزگەوتەکە بەو شەوە زۆر قەرەباڵغ بوو. کوێخا و ڕیش سپیانی گوند عەلی خان و کوڕەکانیان دەناسی.

لەو گوندەدا لافاو چوار کەسی بردبوو، شوانێکی تەمەن چلوپێنج ساڵ و خزمەتکارێکی تەمەن حەڤدە ساڵ لافاو بردبوونی. نزیکەی سەد سەر مەڕ و چەندین گا و مانگای بردبوو. دوو کەسیش کە ویستبوویان لە ڕووبارەکە بپەڕنەوە، بەهۆی تەوژمی لافاوەکەوە ئاو بردبوونی. چەند ماڵێک لە نزیک ڕووبارەکەوە بوون لافاو ئەو چەند ماڵەشی بردبوو، چەند خانوویەکی تریش بەهۆی بارانەوە ڕووخابوون. خەڵکی گوندەکە دەیانگوت تەواوی زەوییە کشتوکاڵییەکانیان بەهۆی لافاوەکەوە وێران بووە. داریان هێنا و زۆپای مزگەوتەکەیان گەرمکرد تا جلوبەرگمان وشک بکەینەوە. چایان لێنا و چایەکی گەرمم خواردەوە. چایەکی ئەوەندە بەلەزەت بوو بەلامەوە هەرگیز بیرم ناچێتەوە. زۆر لە خەمی دکتۆر عەباس و هاوڕێکانمدا بووم، ئەوان لە گوندەکاندا بوون بەدڵنیاییەوە جێگایان باشبوو. خەڵکەکە دەیانگوت دوو ڕۆژ لەمەوبەر دوو کچ و کوڕێکی خوێندکار بۆ پرسیارکردن هاتبوون بۆ گوندەکەیان.

ئەو شەوە ژنەکان لە خانووەکانیاندا مابوونەوە و نەهاتبوون بۆ مزگەوت. بۆ ئەوەی ئەگەر خانووەکانیش ڕووخان پیاوەکان بەسەلامەتی دەربچن. هەموو پیاوانی گوندەکە لە مزگەوت بوون و نانیشیان هەر لەوێ خواردبوو. کوێخا سفرەی نانخواردنی بۆ ئێمەش ڕاخست، نان و کەرە و پەنیریان هێنا. هەر بەڕاستی ژەمێکی خۆش بوو. پاشان شیری کوڵاویشیان بۆ هێناین، من بەو نان خواردنە بووژامەوە. عەلی خان بەکوڕەکانی گوت پێویستە شەو هەر لێرە بمێنینەوە، بەکەڵکی ئەوە نایەت بڕۆین. کوێخا بە پیاوەکانی گوت توورەکەی ئەسپەکانی عەلی خان پڕبکەن لە کا و جۆ. کوێخا لە خانی پرسی لافاو لە مێگەلەکانی تۆشی داوە؟ عەلی خان گوتی هیچ هەواڵێکم لە مێگەلێکیان نییە. مێگەلێکیش کە موهەندیس ئاگاداری بووە هەمووی سەلامەتن و یەک مەڕ لەناو

نەچووە. لە دوو مێگەلی تریش نزیکەی نەوەد سەر مەڕ ئاو بردونی. فانۆسەکەیان بە تەواوی ڕۆشنکرد، لەبەر خاتری خان دوو فانۆسی تریشیان هێنا، مزگەوتەکە تەواو ڕووناکبووەوە.

گوندەکە مەلایان نەبوو. ساڵی چەند جارێک فەقێکان سەردانی گوندەکەیان دەکرد، ئەویش زیاتر لە مانگەکانی ڕەمەزان و موحەڕەمدا دەهاتن. خەڵکەکە لایەنگری ئایەتوڵڵا خوبی بوون، چونکە بەهۆی نەخوێندەواری و نەبوونی مەلاوە، زانیارییەکی ئەوتۆیان لەبارەی ئایینەوە نەبوو. خەڵکەکە بۆ گیانی ئەو چوار کەسەی کە لافاوەکە بردبوونی، فاتیحایان خوێند. عەلی خان گوتی موهەندیس دەتوانێت مەڕاسیم بخوێنێت. منیش (٥-٦) ڕۆژ بوو ڕیشم نەتاشی بوو ڕیشم تەواو هاتبوو. خەڵکەکە گوتیان سەڵاوات لێدەن بۆ گیانی کۆچکردووان، ئامادەبووان سەڵاواتیان لێدا. ڕیش سپییەکان گوتیان موهەندیس فەرموو لەبەر خاتری گیانی مردووەکان بڕۆ سەر مینبەر.. لە دڵی خۆمدا گوتم ئاخر بەندەی خودا، خۆ تۆ نە مەلایت نە مۆڵەتت هەیە، چۆن دەچیتە سەر مینبەر. ئەوە چ کارێک بوو عەلی خان تووشی کردم؟ ئاخر ئەو کاتە سەردەمی شا بوو. خوێندنی مەڕاسیم مۆڵەتی دەویست، خەڵکی لە هەر شوێنێک بیانویستایە مەڕاسیم بگێڕن، دەبوو بچن لە بنکەی پۆلیس مۆڵەتیان وەربگرتایە، ئەو کەسەش کە مەڕاسیمی دەخوێند دەبوو مۆڵەتی هەبووایە. منێکی خوێندکار کە گەڕیدەی ناو هۆزە کۆچەرییەکان بووم، چۆن دەبوو مەڕاسیم بگێڕم؟ لە بیرکردنەوەدا بووم کە دووبارە دەنگی سەڵاوات لێدان بەرز بووەوە. نەدەکرا هیچ قسەیەک بکەم. خان گوتبووی کە من دەتوانم مەڕاسیم بگێڕم، خۆ نەدەکرا بڵێم من شارەزای مەڕاسیم خوێندن نیم، عەلی خان خۆی بینیبووی کە مەڕاسیمی حەزرەتی عەباسم خوێندبوو. لەناکاو یادی مەڕاسیمەکانی یەزد هات بەبیرمدا، ڕەنگە لەوکاتەوە تا ئێستا کە تەمەنم گەیشتۆتە بیست ساڵ، هەزار کاتژمێر لە مەڕاسیمەکاندا دانیشتبێتم. خەڵکەکە سەڵاواتی سێیەمیان لێدا. منیش چووم لەسەر پلیکانەی سێیەمی مینبەر دانیشتم، چونکە لەوکاتەدا هەرچی ڕستە و وشەی عەرەبی هەبوو کە پێش دەستپێکردنی مەڕاسیم دەخوێندرا هەموویم لەیاد چوو بوو، بۆیە ناچار نامەی ئیمام ڕەزام خوێندەوە دواتریش پیا هەڵدانەکانی حەزرەتی زەینەبم خوێند. ئەو کاتەی کە چوومە سەر مینبەر هیچ ژنێک لە مزگەوتدا نەبوون، بەڵام کاتێک خەریکی مەڕاسیمەکە بووم دەنگی گریان و هاواری ژنان بەرزبووەوە، ژنێک زۆر بە کوڵ دەگریا و بە خۆیدا دەکێشا. دوایی زانیم ئەو ژنە دایکی ئەو کوڕە تەمەن حەڤدە ساڵە بوو کە لافاوەکە بردبووی، لە کۆتاییدا سەبر و ئارامی ئیمامەکانم بە نموونە بۆ هێنانەوە و نزام

کرد کە خودا ئارامیان پێببەخشێت. خودا جارێکی تر تووشی هیچ کارەساتێکیان نەکات.

خەڵکی ئەم گوندە بەتەواوی ماڵوێران ببوون، چوار کەس گیانیان لەدەستدابوو. نیوەی سامانەکانیان لە دەستدابوو، هیچ کەس و شوێنێک بەهانایانەوە نەهاتبوون، هیچ کۆمەکێک نەکرابوون، هەر بۆیەش ئومێدیان بەکەس نەمابوو، جگە لە سەبر و خۆڕاگری هیچی تریان لە دەست نەدەهات. کات درەنگ ببوو، زۆریش شەکەت و ماندوو بووم. دیار بوو خەڵکەکەش هەموو هیلاک و ماندوو بوون. گوندنشینان بەگشتی شەوان زوو دەخەون و بەیانیانیش زوو هەڵدەستن، لەو سەردەمەدا نە کارەبا هەبوو، نە تەلەفزیۆن، نە ڕووناکییەکی باش، ئەو خەڵکەش لە ترسی ڕووخانی خانووەکانیان هەموویان لە مزگەوتدا کۆببوونەوە. چوار کەس ئاوبردبوونی مەلایەکیش نەبووتا مەڕاسیمیان بۆبەڕێوە بەرێت. تاکە مەلا من بووم کە خودا بۆ ئەوانی ناردبووم.

لە دوای تەواو بوونی مەڕاسیمەکە، کوێخای گوند بە عەلی خانی گوت ئێمە ئەمشەو لە مزگەوت دەخەوین، بەڵام دوو ژووری ماڵی ئێمە، سەربانەکەیان زۆر بەهێزە و لە تەختە دروستکراون، هیچ ترسێکی ڕووخانیان نییە، ئێوە لەوێ جێگاتان بۆ ئامادەکراوە، ئێوە دەتوانن بۆ نووستن برۆن بۆ ئەوێ. عەلی خان سوپاسی کوێخای کرد و بەڕێیان کردین. کاتێک کە گەیشتینە ماڵەکە لە ژوورێکدا چوار جێگا ڕاخرابوو بۆ عەلی خان و کوڕەکانی، ژوورێکی بچووکی تایبەتیش هەبوو لەو ژوورەشدا جێگایەکی خاوێن و پاکیان بۆ من ڕاخستبوو، وا هەستم دەکرد بەهۆی خوێندنی مەڕاسیمەوە ڕێزی من زیاتر بوو لە خان.

بۆ نوێژی بەیانی ڕۆیشتم بۆ مزگەوت. گوتم مادام من مەڕاسیمم خوێندووە. دەبێت لەپێش هەمووانەوە بۆ نوێژکردن بڕۆم بۆ مزگەوت. ڕۆیشتم بۆ مزگەوت، بەڵام کە سەیرم کرد ئەو خەڵکە هێشتا لە خەودا بوون، وەک ئەوەی هەزار ساڵ بێت خەویان لێکەوتبێت، هەڵبەت کەسێکیش بانگی بەیانی نەدا بوو. سەیرم کرد شوێنێک لە مزگەوتەکەدا نییە بۆ دەستنوێژگرتن و نوێژکردن، واتە هەموو مزگەوت پڕ ببوو لە خەڵک. گەورە و بچووک لە مزگەوتدا نووستبوون. خەڵکەکە وا تێکچڕژابوون، سوژنت هەڵدایە نەدەکەوتە سەر زەوی، ناچار گەڕامەوە بۆ ماڵی کوێخا. دوای نانخواردنی بەیانی سواری ئەسپەکانمان بووین و بەڕێکەوتین. لە ڕووناکی ڕۆژدا، وێرانیی گوندەکە باشتر دەبینرا، خانوویەک نەمابوو زیانی پێنەگەیشت بێت. کۆڵانەکان بەهۆی زۆری لافاوەکەوە هەڵکەنرا بوون. زۆربەی دیواری ماڵەکان ڕووخابوون، لانیکەم دە خانوو بەتەواوی وێران ببوون. وێرانبوونی باخ و زەوی کشتوکاڵیی بەڕۆژ باشتر هەستی

پێدەکرا.

بۆ گەیشتن بە هەوارەکەی عەلی خان، لانیکەم دەبوو (٢ فرسەخ ١٢,٤٨کم) برۆیشتینایە. بەهۆی خراپی ڕێگاکە و چەند جارێک پەڕینەوە لە ڕووبار، دوانیوەڕۆ گەیشتینە لای ڕەشماڵەکانی خان. لە ڕێگادا بەلای گوندێکی دیکەدا ڕۆیشتین، لەو گوندەش کەسێک ئاو بردبووی، چەند کەسێکیش بریندار ببوون. کاتێک گەیشتینەوە هەوارەکە، هەمووان بە پیرمانەوە هاتن. ڕەشماڵەکان لە بارێکی ناجێگیردا هەڵدرابوون و هەریەکەی بەلایەکدا لاربببوونەوە، لافاو ئەملاولای ڕەشماڵەکانی هەڵکەندبوو، ئاو چووبووە نێو ڕەشماڵەکانەوە. هەموو کەلوپەل و جۆ و ئارد و شەکریان تەڕ ببوو، هەرچیەکیان هەبوو هەموویان هێنابووە دەرەوە و لەبەر هەتاو هەڵیانخستبوون، بۆئەوەی وشک ببنەوە. خەڵکەکە شەو لە نێو ڕەشماڵەکەیاندا و بەدەوری ئاگردانەوە دانیشتبوون یان نووستبوون. هەموو نوێنەکانیان تەڕ ببوو، ئاو لە ڕەشماڵەکانەوە نەهاتبووە ناوەوە، چونکە ڕەشماڵەکان لە موو دروستکرابوون، بەڵام چونکە ڕەشماڵەکان بەشێوەی کاتی هەڵدرابوون، ئاو لە ژێرەوە دزەی کردبووە ناوەوە. ئەوان هەموویان بەبینینی ئێمە خۆشحاڵبوون، دایکی بێژەن و هاوسەری ئەردۆ بە زانینی هەواڵی ئەوان خۆشحاڵبوون. لە مێگەلەکەی تری عەلی خان نزیکەی پەنجاوپێنج سەر مەڕ لەناوچوو بوون.

دواتر بۆم دەرکەوت زیانەکانی عەلی خان بەهۆی لافاوەکەوە بریتی بوو لە (١٤٤) سەر مەڕ و یەک ئەسپ و دوو حوشتر. عەلی خان سوپاسی خوای دەکرد و بەو زیان لێکەوتنە زۆر شکور بوو. دەیگوت زۆر سوپاس بۆ خودای گەورەکە کەسێک لە هۆزەکەم گیانی لەدەستنەداوە و هەموو لایەک سەلامەتن. خان ڕووی کردە من و گوتی موهەندیس ماڵی دونیا ئەوهایە، ماڵی دونیا وەک قومار وایە هەندێک ساڵ دووقات زیاد دەکات هەندێک ساڵیش نیوە زیاد دەکات، هەندێک ساڵیش ڕەنگە هەر زیاد نەکات. خان گوتی لە ماوەی پەنجا ساڵدا دوو جار سەرجەم ئاژەڵەکانم لەناو چوون، بەڵام کۆڵم نەداوە، دووبارە هەوڵمداوە و ئاژەڵی دیکەم پەیدا کردووەتەوە و پاشان زۆر بوونەتەوە. عەلی خان پیاوێکی زۆر بەهیمەت و خۆڕاگر بوو، ئەو تەنانەت یەک قسەشی بە شوانێک نەگوت، فەرمانی دا کە دوو مەڕ سەر ببڕن و بیکەن بەقوربانی. گۆشتەکەی کرد بە چوار بەشەوە، هەر بەشێکی نارد بۆ هەوارێک تا بەسەر هەموو خەڵکەکەدا دابەش بکرێت. خان (١٤٤) سەر مەڕ و حوشتری تێداچوو بوو، کەچی هێشتا سوپاسگوزاری خودای دەکرد، دوو مەڕیشی کردە قوربانی. ئەمە وانەیەکی باش بوو بۆ من، ئەم خانە سەخی و شوکرە، زیانی لافاو و لەدەستدانی ئەو هەموو ئاژەڵەی نەخستە ئەستۆی

شوانەکان، بەڵکو زۆر بەمیهرەبانیش لەگەڵیاندا هەڵسوکەوتی دەکرد.

لافاو تێکڕای خواردەمەنی ماڵەکان و ماڵی خانی خراپ کردبوو. ئاردەکەیان تەڕببوو، هەموو شتێکیان لە جەواڵدا بوو، جەواڵەکانیش لە قوڕ هەڵکێشرابوون، ئارد و قوڕ تێکەڵ ببوون. شەکر هەر تێکەڵی ئاوەکە ببوو، تەنها خواردەمەنی و کەلوپەلی بیبی زیانیان بەرنەکەوتبوو، نازانم بیبی چی کردبوو کە زەخیرەکانی هەر بە وشکی مابوونەوە؟ ئەو ڕەشماڵەکەی لە سەر گردۆڵکەیەکی بچکۆلانە هەڵدابوو. عەلی خان دەبوو لە بیری پەیداکردنی خواردەمەنیدا بێت. ئەو سەردەمە هێشتا کیسەی نایلۆن پەیدا نەببوو. ئەم نایلۆنە بۆ هەندێک کات و هەندێک شوێن بەرەکەتە. خۆ ئەگەر ئەو خواردەمەنیانە لەناو کیسەی نایلۆندا بوونایە کەمتر تەڕ دەبوون.

هەرچۆنێک بوو هەندێک خواردنیان بۆ ئێمە هێنا، خان کاتێک تێری خوارد گوتی مەڕەکانتان دۆشیون، کەسێک وەڵامی دایەوە و گوتی نەخێر. خان دەستیکرد بەجوێندانی ئەو کەسە. هەموو خەفەتی لەدەستدانی (١٤٤) مەڕی لەو داماوەدا بەتاڵکردەوە. هەندێک لەو خەڵکە هەژارە خۆشیان مەڕیان لەدەستدابوو. نەمدەزانی کە خان خەم و پەژارەی خۆی بەتاڵدەکردەوە یان هەست و گەورەیی خۆی دەردەبڕی. مەنجەڵێک گۆشتاو لەسەر ئاگر بوو دەکوڵا. خانیش بەردەوام بوو لە جوێندان، نەمدەزانی کاتێک ئەو خەڵکە گۆشتاوەکە دەخۆن جوێنەکانیان بیر دەچێتەوە یان نا، بە هەر حاڵ من پاش چلوسێ ساڵ ئەم جوێنانەم بیر نەچوەوە.

خوێندکارێکم هەبوو پاشان دکتۆرای وەرگرت. خۆم هەوڵێکی زۆرمدا بەدامەزراندنی بەناوی ئەندامی دەستەی زانستی، هەموو ئەندامانی گروپی جوگرافیای زانکۆی مەشهەد دژی ئەو دامەزراندنە بوون، بەڵام من هەوڵێکی زۆرم دا تا ئەو دامەزرا، پاش ماوەیەکی زۆر بوو بە بەڕێوەبەری گروپەکە، ڕۆژێک من قسەیەکم کرد، بەڵام ئەو بە پێچەوانەوە لێکیدایەوە، هەر لەسەر ئەو قسەیە کەوتە دژایەتی کردنم. هەر کارێکی لە دەست هات، لە دژی من کردی. واتە کارێکی کرد کە لە مامۆستای زانکۆ ناوەشێتەوە. واتای قسەکەی من نە جوێن بوو نە سزادان، ئەم برادەرە خراپ تێگەیشتبوو. کاتێک کە خوێندکارێک دەبێتە مامۆستای زانکۆ لەگەڵ مامۆستاکەی خۆیدا لەسەر یەک وشە هەرچی لە دەستبێت دەیکات، نازانم ئەو مامۆستایە چی بەسەر خوێندکارەکانیدا دەهێنێت؟ من نیگەرانی ئەو مامۆستایەم، چونکە ئەوەی دەیچێنێت هەر ئەوە دەدورێتەوە، خۆ دووریشنییە، من خراپم چاندبێ کە ئەوەم دوورییەوە. خودا پاداشتی هەموو لایەک بداتەوە.

ئایا ئەو خەڵکە کۆچەرییانە جوێنەکانی خان فەرامۆش دەکەن؟ یاخود خان

دەبەخشن و بەخشیویانە، نازانم. ئایا هەر کەسێک خوێندەوارترە، بێئەدەبترە؟ خەڵکەکە جوێن و گۆشتاویان بەیەکەوە خوارد.

مێگەلەکەی تری خان کە نزیکەی پەنجاوپێنج سەر بزن و مەڕی لەدەستدابوو، گەیشتنەوە هەوارەکە، هاوار و جوێندانی خان، ژن و پیاوانی وریاکردەوە. تاوەکو بەزوویی دەستبکەن بە دۆشینی مەڕەکان. گوڵنسا ژنێکی تەمەن سیوپێنج ساڵ بوو. پووری عەبداڵ بوو، بەگریانەوە خەریکی مەڕدۆشین بوو، ئەو تەنها دوو بزنی هەبوو لافاو هەردوو بزنەکەی بردبوو، کە هەژاریی و دەستکورتی ئەو ژنەم بینی، باشتر لە مانای فیلمی (گا) ی داریوشی مەهرەجویی تێگەیشتم. گوڵنەسا دەیگوت لافاو ئاردەکەشی خەسار کردووم. پاشان لە منی پرسی تۆ بڵێیت عەلی خان دووبارە ئاردمان پێبداتەوە؟ خۆ ڕەنگە فرمێسکەکانی ئەم ژنە بۆ دوو بزنەکەی کەمتر نەبووبێت لە گریانی ئەو ژنەی کە لە مزگەوتەکەدا بۆ کوڕە ئاوبردووەکەی دەگریا. دڵم بۆ ئەم وڵاتە دەسووتا کە شا دەیویست بەرەو پێشکەوتنی گەورەی بەرێت.

کوڕەکانی کۆرش و داریوش لە سەردەمی مۆدیرنەتەدا ئەم زیان و ماڵوێرانییەیان دەبینی، بەڵام هیچ دامودەزگایەک نەبوو کە ئومێدێک بە ئەمانە ببەخشێت. ئەو خەڵکە هەژارە تەنها ئومێدێکیان هەر خان بوو، خانێک کە خۆیشی بە لەدەستدانی مەڕەکانی خەمگین و تازیەدار بوو.

عەلی خان دوو مەڕی سەربڕی بوو، دەیگوت گوایە بۆ سوپاسگوزاری خودایە، بەڵام وا نەبوو، ڕاستییەکەی لە ترسا بوو، وایدەزانی خودا دووبارە بەڵایەکی دیکەی بەسەردا دەهێنێت، یاخود دەیویست دوو مەڕ وەک بەرتیل بباتە بەردەرگای خودا. ئاخۆ خان بیری لەوە کردبێتەوە کە ئەو خەڵکە، هێندە برسین کە دەبێت کارێک بکات تا هێزیان بێتەوەبەر؟

عەلی خان دوای نانخواردن لەگەڵ کوڕەکانی سواری ئەسپ بوون تا سەرێک لە هەوارەکەی تر بدەن. ئەو هەوارەی کە مێگەلە مەڕەکەی تری لێبوو. خان هیچ هەواڵێکی نەدەزانین. مێگەلێکی تریشیان لە دەشتی تەکمەران مابوون لە هەوارێکی تردا.

کات گەیشتبووە ئێوارە، خەڵکەکە دەیانویست کەلوپەلەکانیان کۆبکەنەوە، هەتاو زۆرێک لە کەلو پەلەکانیانی وشک کردبوونەوە. پیاوەکان خەریکی قایمکردنی ڕەشماڵەکانیان بوون.

ماوەی سێ ڕۆژ بوو، هیچ هەواڵێکم لە دکتۆر عەباس و هاوڕێکانم نەبوو، دۆخی نالەباری ئەو خەڵکە هەژارە منیشی پەرێشان کردبوو. ئەو ژن و پیاوانەی کە ئێمە

لە شارەکانەوە شانازییان پێوە دەکەین، ئەوانەمان بە هۆزێکی تێکۆشەر دەزانی لەو کێوانەدا، دوچاری هەژاری و چەوسانەوە ببوون. هەژاری ببووە چارەنووسیان. کاتێک کە خان جوێنی پێدەدان هیچ کام لە ژن و پیاو و منداڵ بچووکترین نارەزاییان دەرنەدەبڕی. گەنجە وریا و چالاکەکانی وەک عەبداڵ و برزوو و موحسین لە بەرامبەر خاندا وەک مشک دەچوونە کونەوە. خان خۆیشی بە جۆرێک لە جۆرەکان کەسێکی بێچارە بوو. ئەگەر سەرجەم ئاژەڵەکانی دابەشی سەر ماڵەکانی دەوروبەری خۆی بکردایە، بۆ هەر کەسێک نزیکەی سەدوپەنجا مەڕی بەردەکەوت، هەڵبەت یەک مەڕ بۆ هەر کەسێک لەو ساڵەدا زۆر بوو. عەلی خان نە بیمەی هەبوو نە ئومێدێکی بە ئایندە هەبوو، بە بارانبارینێک لە سەدا پێنجی ئاژەڵەکانی لەدەستدابوو، منداڵەکانیشی ئاوارەی ئەو دەشت و کێوە ببوون، تەنها پایە کۆمەڵایەتیەکەی لەو سنوورەدا مایەی دڵخۆشی بوو بۆی.

بڕیارم دا، سبەینێ هەر چۆنێک بێت بڕۆم بۆ ئۆغاز یا شێروان، بەڵام چۆن؟ جادە و ڕێگاوبان بەگشتی لافاو تێکیدابوون. ئۆتۆمبێلەکەش نەیدەتوانی بێت بە سۆراخمەوە ڕووباری قەلجەقیش هێشتا ئاوێکی زۆری پێدا دەهات. کات بوو بە شەو ڕەشماڵەکەم ئەوەندە تەڕ و قورس ببوو کە نەدەکرا هەڵیبدەین. ڕەشماڵەکە بەهۆی لافاوەوە خراپ ببوو، هیچ کەس لە خەمی ڕەشماڵەکەی مندا نەبوو. بەیانی زوو باران باریبوو، هەر کەسێک لە بیری ڕەشماڵی خۆیدا بوو. ڕەشماڵەکەی منیش کەوتبووە ژێر قوڕ و بارانەوە. عەبداڵ و منداڵەکانی تر کیسە خەوەکەمیان لە ژێر قوڕاودا دەرهێنابووەوە، بەڵام ڕەشماڵەکەیان ڕاست نەکردبووەوە.

بیبی بانگی کردم و گوتی موهەندیس وەرە لای ڕەشماڵەکەی من پشووبدە. کەلوپەلەکانم لە ڕەشماڵەکەی عەبداڵەوە برد بۆ ڕەشماڵی بیبی، «یەلە»ش بەدوامدا هات، بەبێ ئەوەی قسەیەک بکات هات لەلامانەوە وەستا، جلوبەرگەکەی هەمووی قوڕاوی بوو، ڕەنگوڕووی زەرد ببوو، دیار بوو کە برسی بوو. بیبی سەیرێکی «یەلە»ی کرد و گوتی برسیتە؟ «یەلە»ش سەرێکی بەڵێی بۆ لەقاند. بیبی پێیگوت بچۆ لەو ماڵانە دوو هێلکە پەیدا بکە یەکێکیانت بۆ دەکەم بە هێلکەوڕۆن و بۆخۆت بیخۆ. «یەلە» ڕۆیشت بۆ پەیداکردنی هێلکە. بیبی گوتی هیچ کەسێک لە خەمی ئەم منداڵەدا نییە، بۆیە پێویستە فێری بکەم کە خۆی لە خەمی خۆیدا بێت.

غەفار کوڕێکی (١٣-١٤) ساڵ بوو، کوڕێکی وریا و زرنگ بوو، بەوە ناسرابوو کە دزی دەکات. غەفار لەبەر دەمی ڕەشماڵی بیبییەوە ڕەتبوو، بیبی بانگی کرد و

پێیگوت کە جلوبەرگی «یەلە» دڕاو و بێکەڵک بوون، پێویستە هەر چۆنێک بێت دەستێ جلوبەرگی بۆ پەیدا بکات. «یەلە»ش بە دوو هێلکە و پارچە نانێکەوە گەڕایەوە. بیبی پێیگوت «یەلە» وا خەریکە زرنگ دەبێت. بیبی هەر دوو هێلکەکەی کردە کەمێک ڕۆنەوە و لە بەردەمی «یەلە»دا داینا. «یەلە» بەخێرایی خواردی و هەر لە هەمان جێگەدا خەوی لێکەوت. غەفار یەک دەست چاکەت و پانتۆڵی مەنو چەهری کوڕی خانی هێنا کە چوو بوو لە ژنەکەی عەلی خانی وەرگرتبوو. بیبی پانتۆڵەکەی بە ئەندازەی «یەلە» بچووک کردەوە پاشان «یەلە»ی لە خەو هەڵسان و پانتۆڵەکەی بۆ لەپێکرد. چاکەتەکەی مەنوچەهر بۆ «یەلە» گەورە بوو. بیبی قۆڵەکانی چاکەتەکەی بچووک کردنەوە، بەڵام چاکەتەکە گەورەبوو. «یەلە» زۆر خۆشحاڵ بوو. پاشان گوتی بیبی تۆ دایکی منی؟ بیبی بەبیستنی ئەم وتەیە فرمێسک بەچاوانیدا هاتنە خوارەوە. «یەلە»ش لە خۆشیدا هەندێک پێکەنی و لە هەمان جێدا لێی نووستەوە. بیبی پارچە قوماشێکی پێدادا. منیش پرسیم «یەلە» هیچ کەسێکی نییە؟ بیبی گوتی هیچ کەسێکی نییە، پوورێکی باوکی هەبوو ئەویش پار مرد. ئێستا هیچ کەسێک خەمی لێناخوات.

نزیکی ئێوارە بوو، مێگەلێکی تر گەیشتەوە هەوارەکە، بەڵام مێگەلی عەلی خان نەبوو مێگەلی کوردەکانی تر بوو. ئەو مێگەلە لە دەشتەوە دەڕۆیشت بۆ کێو. ئەو مێگەلەش دوچاری لافاو ببوو. نزیکەی سی‌وپێنج سەر مەڕیان ئاو بردبوونی، مێگەلەکە هی دوو بنەماڵە بوو، خاوەنەکانیان دوو ڕۆژ پێشتر ڕۆیشتبوون بۆ کێو، شوانەکان لە لای مێگەلەکەیان بوون، شوانەکان ئەو شەو و ڕۆژەیان بەسەختی گوزەراند بوو، زۆر شەکەت و ماندوو بوون، زۆریش ترسا بوون، داوای هاوکاریان لە خەڵکی هەوارەکە دەکرد تا ئاوی خواردنیان پێبدەن، بەڵام ئاوەکە هەمووی لێڵ و لیخن بوو. ئاوی کانییەکەش هەر ببوو بە قوڕاو، خەڵکەکەش ئەوەندەی لە توانایاندا بوو هاوکاریانکردن، ئەوانیش مۆڵەتیاندا بەخەڵکەکە تا شیری مەڕەکان بدۆشن بۆ خۆیان. ئەو خەڵکە هەژارە وایان هەستدەکرد ئەو شیرەی کە دەیدۆشن هی خۆیانە. زۆر بەخێرایی کەوتنە مەڕدۆشین، منیش هاوکاریم کردن بە گرتنی مەڕەکان بۆ دۆشین. هەر کەسە و بەخێرایی شیرە دۆشراوەکەی دەبرد بۆ ڕەشماڵەکەی خۆی. لە یەکێکیانم پرسی، بۆچی ئەوەندە پەلە دەکەن لە دۆشینی ئەو مەڕانە؟ ئەویش گوتی ئەگەر عەلی خان بێتەوە شیرەکەمان لێ دەستێنێت بۆ خۆی. بۆیە تاکو خان نەهاتۆتەوە دەبێت شیرەکە ببەینە ڕەشماڵەکەی خۆمان!

شەو لە ڕەشماڵەکەی بیبی نووستم، بەری بەیانی باران بارین دەستیپێکردەوە،

بەڵام وەک دوو شەوی پێشتر بەهێز نەبوو، خەڵکەکە هەموو بەخەبەر بوون خان و کورەکانیشی نەگەڕابوونەوە، لەو کاتەدا، دڵم لای گڵپۆ بوو. ئایا دەمتوانی هاوکارییەکی ئەومالە بکەم؟ خەڵکەکە لە ترسی باران هەموو لە ڕەشماڵەکەی خان کۆببوونەوە. پرسیاریان لە من دەکرد و دەیانگوت موهەندیس چی بکەین؟ وا عەلی خان لێرە نییە ئەوان وایانزانی بوو من دوو شەو لەوەوبەر پێشبینی باران بارینم کردووە. داوای ڕێگە چارەیان لە من دەکرد. منیش پێمگوتن نیگەران مەبن ئەمشەو باران بە لێزمە ناباریت، بەڵکو بەنەرمی و لەسەر خۆ دەباریت. بۆیە ئەم قسەیەم کرد تا خەڵکەکە نەترسن. ئەو خەڵکە وایاندەزانی ئەگەر کەسێک موهەندیس بێت لە کەشناسی شارەزایە و دەتوانێت پێشبینی لافاو بکات و جێگایەکی باش بۆ مێگەلەکە دیاری بکات. بینیم وا گڵپۆش سەیری من دەکات، لەو کاتەدا حەزمدەکرد باڵام دە سانتی مەتر بەرزتربووایە. مرۆڤ چییە؟ چەندە گەمژەیە. بە درۆی خەڵکانی تر گەورە دەبێت... خۆ شەوی لافاوەکە من نە پێشبینی کەشوهەوام کردبوو، نە لافاو، نە شوێنی جێگیرکردنی مێگەلەکە، بەڵام بۆچی سەفەر ئەم قسەیەی بەمنەوە چەسپاند و ئەردۆ و بێژەنیش لێی بێدەنگ بوون. خۆ منیش نەمگوت پێشبینی باران بارین لە لایەن ئەردۆوە بووە. ئیتر هەر چۆنێک بێت من بەکەشناس سەیر دەکرام، هەرچەندە هیچم لێنەدەزانی.

شەو لە ڕەشماڵی بیبی و هاوسەرەکەیدا مامەوە، بیبی منی بانگهێشتی ڕەشماڵەکەی خۆیان کرد بوو. تێگەیشتم کە هۆی بانگ هێشتنەکەم ئەوەبوو کە دەیویست پێشبینی کەشناسی بزانێت. منیش پێمگوت کە ئەردۆ پێشبینی باران و لافاوەکەی کرد نەک من. ئەوان هەر زوو باوەڕیان کرد بوو کە من پێشبینی باران و لافاوەکەم کردووە نەک ئەردۆ. هەرچەندە من زۆر پێدا گریم دەکرد کە من نەبووم بەڵکو ئەردۆ بوو، بەڵام کەس باوەڕی نەدەکرد. بیبی پێداگری دەکرد تاکو فێری کەشناسی بکەم، منیش بە چەند قسەیەکی تێکەڵ و پێکەڵ و ئەملاو ئەولا واملێکرد کە هیچ تێنەگات، لەبارەی هاتوچوون و تێکەڵبوونی جۆرەکانی هەور و هەر لە خۆمەوە هەندێک قسەم بۆ کرد، ئینجا ئەو ژنە داماوە گوتی پێشبینی کەشوهەوا کاری من نییە، ئەمە کارێکی وا ئاسان نییە. من بۆ سبەینێ پرسیارم لە ئەردۆ کرد گوتم چۆن تۆ لەو ئاسمانە سافەدا زانیت کە پاش چەند کاتژمێرێکی تر باران دەباریت؟ ئەو چەند قسەیەکی سادەی بۆ کردم، بەڵام من هیچ لە ماناکەی تێنەگەیشتم و لە هەموو تەمەنمدا نەمتوانیوە لە ئاسمانێکی سافدا مانگ بە ئاسمانەوە بێت و ئاسمان پڕ لە ئەستێرە بێت و من پێشبینی بارانبارین بکەم. منیش پرسیارم لە بیبی کرد کە چۆن ئەو لە سیر تا پیاز ڕەفتار و کار و کردەوەی نەک تەنها

خەڵکانی ئەم هەوارە دەزانێت بەڵکو هی هەوارەکانی تریش دەزانێت. ئەو بنج و بناوانی هەموخەڵکەکەی دەزانی.

شەو درەنگ ببوو، ویستم بچمە کیسە خەوەکەمەوە و بخەوم. گوتی تۆ گڵپۆت خۆشدەوێت. باشە من هەرگیز لەبەر چاوی ئەو و هیچ کەسێک قسەیەکم لەگەڵ گڵپۆ نەکرد بوو. لە لای هیچ کەسێک باسم نەکرد بوو کە ئەو کچەم خۆشم دەوێت.. گوتم نەخێر خۆشمناوێت گڵپۆ کێیە؟ گوتی ئای موهەندیس من لە قسە و سەیرکردنی پیاوەکان تێدەگەم کە لە کام گوندە عاشق بوون، بەڵام تۆ وا لە لای خۆمەوەیت و گڵپۆش هەر لێرەیە، ئێستا تۆ کاتی ژنهێنانتە ئەگەر دەتەوێت لەم هۆزەی ئێمە ژن بهێنیت ئەوا سبەی شەو هەموو کارێکت بۆ جێبەجێ دەکەم و گڵپۆت لێ مارە دەکەین. منیش بەخێرایی قسەم گۆڕی و دەنگی ژەندنی مەشکە دەهات. گوێم لێبوو چەند کەسێک خەریکی مەشکەژەندن بوون. گوتم بیبی بۆچی بەم شەوە مەشکە دەژەنن؟ گوتی شیرەکە هی مەڕی خەڵکی بووە بەخێرایی شیرەکەیان هەوێن کردووە و بۆتە ماست، ئێستا تاکو عەلی خان نەهاتوتەوە دەیانەوێت مەشکە بژەنرێت و ڕۆنە کەرەکەی جیا بکرێتەوە. گوتم ئەوە شیری (٤٠٠-٤٥٠) بزن و مەڕ بوو، گوتی ئەوە نیعمەتی خودایە بەشی منیش ئامادەیە، شیرەکەی خۆم داوە بە کەسێک، تاکو عەلی خان نەهاتوتەوە دەبێت ڕۆنەکەرەکە بگرن. بۆیە دەبێت ژنەکان تا بەیانی مەشکە بژەنن. گوتم بەشی تۆ کێ دەیژەنێ؟ گوتی خەینسا. گوتم بە بەلاش بۆت دەژەنێت گوتی نەخێر لە سێ بەشی بەشێکی ڕۆنەکەرەکە و دۆکەش بۆ ئەوە و دوو بەشەکەی تری بۆ منە. بیبی گوتی خەینسا، بۆ چەند کەسی تریش مەشکە دەژەنێت ئەو کوڕەکەی سەربازە و دەیەوێت کەمێک پارە پەیدا بکات و بۆ کوڕەکەی بنێرێت. خودا لە ئاسمانەوە شیری بۆ ناردوین، ئێمە چەند کەسێک شیرەکەمان داوە بە ئەو تاکو شتێکی دەستبکەوێت.

باش بوو باسی گڵپۆ گۆڕا و هیچ قسەیەکی تری لەو بارەیەوە نەکرد، دەترسام ئەگەر خودا نەکردە قسەیەکی نابەجێ بکەم ڕەنگە هەر ئەو ژنە بەکوشتم بدات، بۆیە بڕیارمدا بەزوویی ئەم هەوارە جێبهێڵم، بەڵام چۆن بڕۆم.. هێشتا هەتاو نەکەوتبوو کە دەنگی هاوار هاوار و گریان لە خەو ڕایپەڕاندم. بیبی لە خەو هەڵسابوو، پرسیم ئەوە چیبووە؟ گوتی کەسێک مردووە. لە ڕەشماڵەکە هاتمە دەرەوە خەینسا مردبوو، منداڵەکانی ئەو بوون دەگریان. خەینسا حەوت منداڵی هەبوو، چوار منداڵیان تەمەنیان لە ژێر دەساڵەوە بوو، کوڕێکی تەمەن (١٤-١٥)ساڵیشی هاوکاری شوان بوو لە مێگەلی هەوارێکی تر، کچێکی (١٣-١٤) ساڵیشی هەبوو، کوڕە گەورەکەشی ناوی عەلی

بوو سەرباز بوو. هاوسەری خەینسا دەگریا و بەسەری خۆیدا دەکێشا. ئەو خەڵکە هەموو خزم و کەسی یەکتری بوون یەکێک هاواری دەکرد پوورم مرد، یەکێکی تر دەیگوت ئامۆژنم مرد، تێگەیشتم کە خەینسا یازدە جار دووگیان بووە، حەوت منداڵی ماوە و چوار منداڵیشی مردووە. ئەو چەند ڕۆژ بەهۆی باران و لافاوەوە نەنووستبوو. خودا شیرێکی زۆر و بەلاشی ناردبوو بڕیاری دابوو کە ماستی چەند کەسێک بژەنێت تا بە فرۆشتنی کەشک و ڕۆنەکەی کەمێک پارەی دەستبکەوێت و بینێرێت بۆ کوڕە سەربازەکەی. ئەو داماوە ئەو شەوە ئەوەندە مەشکەی ژەندبوو تا سەکتە لێی بوودا و دەستبەجێ گیانی دەرچوو بوو. لاشەکەی لە پێش دەمی ڕەشماڵەکە لە سەر زەوی کەوتبوو، هاوسەرەکەی دەیگوت من چی لەم منداڵانە بکەم؟ گریان و شیوەن هەموو لایەکی پڕ کردبوو. هەتاو بەتەواوی کەوتبوو. دەبوو چی بکەین؟ عەلی خانیش هێشتا نەگەڕابووەوە. هیچ کام لەکوڕە گەورەکانی خانیش لەوێ نەبوون، کچ و ژن و منداڵە بچووکەکانی خانیش نەیاندەتوانی هیچ بڕیارێک بدەن. پەری خانم کچی عەلی خان ئەویش لەوێ نەبوو، بەیانی زوو پێش خۆرهەڵاتن ڕۆیشتبوو بۆ ڕاو. پیاوەکان گوتیان لاشەکەی بخەنە نێو ڕەشماڵەکەوە، بەڵکو ئیشەڵڵا تا نیوەڕۆ خان بگەڕێتەوە. دەیانگوت پێویستە پێشنیوەڕۆ تەرمەکە بە خاک بسپێردرێت، گەر وا نەکەین گوناهبار دەبین. ڕەشماڵی عەلی خان کرا بەشوێنی پرسە. گەنجەکان چوون لە سەر کانییەکە ئاویان هێنا و چایان لێنا هەر چەندە شەکرەکەیان تەڕببوو. حاجی ڕۆستەم کە لە هەمووان بەتەمەنتر بوو بە منی گوت موهەندیس قورئان بخوێنە. حاجی ڕۆستەم تەمەنی نزیکەی حەفتا ساڵبوو، ڕیش سپی هۆزەکەبوو، هەمووان ڕیزیان لێدەگرت. منیش زۆر پرس و ڕام پێکرد بوو. حاجی ڕۆستەم گوتی سەڵاوات لێبدەن. لە هەوارەکەدا بەشوێن قورئاندا گەڕان، بەڵام هیچ کەسێک قورئانی نەبوو. جگە لە بیبی هیچ کەسێک نەیدەتوانی قورئان بخوێنێتەوە. دەیانگوت خان قورئانی هەیە، بەڵام چەند گەڕان نەیان دۆزییەوە. حاجی ڕۆستەم گوتی موهەندیس تۆ مەلایت و قورئان بخوێنە.

خودا لێی خۆش بێت، کاتی خۆی مەلا نەباتی هەشت جوزئی قورئانی پێ لەبەر کردبووم، بۆ لەبەرکردنی ئەو هەشت جوزئە لانیکەم بیست جار شوڵکە هەنار لە لەپی دەستم دراوە. منیش دەستمکرد بەسڵاوات لێدان سورەتی ڕەحمانم لەبەر خوێند. حاجی ڕۆستەم گوتی موهەندیس زۆر باشت خوێند، تکایە بەردەوامبە. دەستمکرد بە خوێندنی سورەتی (النبا)، (عم یتساءلون عن النباء العظیم) لە ناوەڕاستی سورەتەکەدا بووم کە مەنوچەهر کوڕە پازدە ساڵەکەی عەلی خان هات و گوتی مێگەلەکە هاتووە، دەبێت

مەڕەکان بدۆشن. حاجی ڕۆستەم سڵاواتی خەتمی قورئانەکەی لێدا. هەموویان هەڵسان و ڕۆیشتن بە لای کارەکانیانەوە. خۆشحاڵبووم بەهاتنی کوڕەکەی خان، ئەو کوڕە کە هات دیار بوو کە کوڕی عەلی خان بوو، لە شێوازی قسەکردنیدا وەک فەرمان قسەی دەکرد، دیاربوو وەک سەرۆکێک قسە لەگەڵ خزمەتکارەکانیدا بکات، وابوو. یا وەک ئەفسەرێک قسە لەگەڵ سەربازەکانیدا بکات، هەمووان ڕۆشتن بۆ شیردۆشین. منیش هەڵسام ڕۆیشتم و لە سەر بەردێک دانیشتم. تا سەری مەڕەکان بگرم. گڵپۆهات لەسەر بەردێک بەرانبەری من دانیشت، بەبێ هیچ قسە و ڕوانینێک، مەڕێک هات بۆ لای بێرییەک و من سەری مەڕەکەم گرت و بێریش دەیدۆشی. لەگەڵ کەسێکی تەنیشتی مەترێک نێوانمان نەبوو. لەگەڵ پیاوێک کە لە سەر بەردێک دانیشتبوو لە تەنیشتمەوە قسەم دەکرد. گڵپۆ چەند بزن و مەڕێکی دۆشی بوو. لەولاوە بیبی هەر خەریکی مەڕدۆشین بوو، بەدەنگێکی بەرز گوتی موهەندیس زۆر باش قورئانت خوێند. ئیتر شارەزاییت لە چ کارێکی تردا هەیە؟ دیارە تۆ شارەزاییت هەیە. بەدەنگێکی بەرز باسی لەکارەکانی من دەکرد، ئینجا گوتی موهەندیس کەی خوێندنەکەت تەواو دەکەیت؟ گوتم دووساڵی تر. گوتی کاتێک خوێندن تەواو دەکەیت چەندە مووچە وەردەگریت؟ گوتم نازانم. گوتی ئەی ئێستا چەندە مووچە وەردەگریت؟ گوتم هەزار تومەن. هەموو هاواریان لێهەڵسا و گوتیان چۆن ئەو هەموو پارەیە وەردەگریت؟ هەزار تومەن پارەیەکی زۆر بوو، بۆ ئەو سەردەمە. مووچەی ئەفسەرێک (٩٠٠-١٢٠٠) تومەن بوو. ژنان و پیاوان بە یەکەوە لە بارەی هەزار تومەنەوە قسەیان دەکرد.

سەیرم کرد گڵپۆ وا دەگری. گوتم بۆچی دەگریت؟ گوتی خەینسا پووری من بوو. ئێمە تازیەبارین، دەبێ تا یەک ساڵی تر تازیەبار بین. کچەکەی خەینسا خەریکی مەڕ دۆشین بوو، کچێکی تەمەن (١٣-١٤) ساڵ، تەنها دوو کاتژمێر بوو دایکی مرد بوو، دەبوو ئەویش وەک خەڵکەکەی تر مەڕی خانی بدۆشیایە. ویستم لە گڵپۆ بپرسم بڵێم پوورت تەمەنی چەند بوو، بەڵام پێم باش بوو ڕاستەو خۆ لەگەڵ گڵپۆدا نەکەومە قسەکردن، بۆیە بە دەنگێکی بەرز گوتم خەینسا تەمەنی چەند ساڵ بوو؟ پیاوێک لە تەنیشتمەوە دانیشتبوو، خاڵی خەینسا بوو، گوتی تەمەنی سی‌وپێنج ساڵ بوو. هاوسەرەکەشی تەمەنی چل ساڵە. خەینسا بە هۆی ماندووبوونی زۆرەوە مرد. تەرمەکەیان لە نێو ڕەشماڵەکەدا دانابوو، چاوەڕوانی ئەوەیان دەکرد بەڵکو خان بێتەوە، ئەوسا بە خاکی بسپێرن.. منداڵانی خەینسا و هەموو خەڵکەکە دەبوو کاربکەن. مەڕو بزنەکان بدۆشن، خزمەتی ئاژەڵەکان بکەن، خواردنیان بۆ ئامادە بکەن.

خەڵکی خاوەن ئاژەڵ خۆشیان دیلن. لێرەدا خەڵکی دیلی ئاژەڵەکانیان بوون، دیلی سروشت بوون، دیلی خان بوون. دیلی ئەندێشەکانی خۆیان بوون، دیلی باری کۆمەڵایەتی و جوگرافیایی خۆیان بوون. لە هەمووی گرنگتر دیلی بیروباوەڕی خۆیان بوون، وایاندەزانی ئەگەر لە بەرامبەر خاندا نافەرمانیەک بکەن خان دەریاندەکات، ئەوکات ئەمان ڕووبکەنە کوێ؟ «شا»ش ڕۆژێک گوتبووی ئەوەی نایەوێت ببێت بە ئەندامی پارتی رستاخیز، پێویستە لە وڵات بڕواتە دەرەوە. هەر بۆیەش پۆل پۆل ماموستایان دەبوونە ئەندام لە پارتی ڕستاخیزدا. وایاندەزانی ئەگەر نەبنە ئەندامی ئەو پارتە بەڕاستی دەبێت وڵات جێبهێڵن و بڕۆن... یا بە پێچەوانەوە ئەوها بە کۆمەڵ چوونە ناو ئەو پارتەوە پێکەنین بوو بەڕیشی شا.

لە نێو ئەو هەموو خەڵکەدا جگە لە ماڵی خان، شەستوسێ کەسی گەورە و بچووک هەبوون، هیچ کامیان بۆ هیچ شوێنێک نەڕۆیشتبوون. تەنها دوو کەسیان چوو بوون بۆ مەشهەد، ئەوانیش حاجی ڕەزا و حاجی ڕۆستەم بوون. کوڕە یازدە ساڵانەکەی خان هەر وەک و شازادەکانی قاجار سەیری چۆنێتی شیردۆشینی ئەو خەڵکەی دەکرد، دوو ژنی خان و کچەکان لە ڕەشماڵەکەی خۆیان نەهاتنە دەرەوە، پەری خانمیش ڕۆیشتبوو بۆ ڕاو. ئاسمانیش نیوە هەور بوو. هەرگیز تێنەگەیشتم ئەو ڕۆژە بۆچی گلێۆ ئەوها ڕووبەڕووی من دانیشتبوو، ئایا ڕێکەوت بوو؟ یاخود بەرنامەی بیبی بوو؟ بۆچی بیبی لەبارەی خوێندن و مووچەی منەوە ئەوەندە بە دەنگی بەرز پرسیاری دەکرد؟ بەڵام من کە لە سەر بەردێک دانیشتبووم و ئەو کچەی کە خۆشمدەویست لە بەرامبەرم دانیشتبوو، بەوە خۆشحاڵ ببووم، کچێک کە بۆ مردنی پووری دەگریا، کچێک کە دەیگوت من تا ساڵێکی تر تازیەدارم، من لە مانای قسەکانی باش تێنەدەگەیشتم. ئایا دەیویست بە من بڵێت ئەگەر تۆ منت دەوێت، دەبێت تا ساڵێکی تر لێم بووەستیت؟ من لە بیرکردنەوەدا بووم و لە جێگای خۆم هەڵسام و غەفار هات لە جێگاکەم دانیشت. ڕۆیشتم بۆ لای بێژەن و ئەردۆ، ئەوان تازە مێگەلەکەیان هێنابووەوە و لە پەنایەک دانیشتبوون تا پشوو بدەن. هەردووکیان خزمی خەینسا بوون. بێژەن قەڵەم و دەفتەری دەرکرد و گوتی موهەندیس وشەی (مرد) چۆن دەنووسرێت ؟ گوتم خۆت بینووسە. چەند جارێک گوتی مرد، مرد لە کۆتایی دا توانی بینووسیت. گوتم بنووسە مردن، بەڵام نەیتوانی بینووسێت بەڵکو نووسی (مرن) ڕەنگە وا بیری کردبێتەوە کە هەموو وشەکان لە سێ پیت پێکدێن.

تەرمی کەسێکی مردوو لە ڕەشماڵێکدا دانرا بوو، بەڵام ژیان بەردەوام بوو، لەو

بارە ناهەموارەدا بیبی دەیویست من بکات بە خاوەن دەزگیران. پرسیارم لە ئەردۆ کرد گوتم ئەمشەو باران دەبارێت؟ گوتی بەڵێ دەبارێت بەڵام کەم، گوتی بەری بەیانی باران دەبارێت. ئەو کاتە بەیانی بوو، بەڵام ئەو دەیگوت بەری بەیانی باران دەبارێت.

کات بوو بە نزیکی نیوەڕۆ هێشتا عەلی خان نەگەڕابووەوە. گۆڕ هەڵکەنرا بوو. دوای شیردۆشین ژنان دەستیان کردەوە بە گریان. شیری مێگەلەکەی ڕۆژی پێشوویان کرد بوو بەماست و مەشکەیان ژەندبوو. هەموو ڕۆنە کەرە و دۆکەیان دا بە ماڵی خەینسا. سەرەتا وا هەستم کرد ئەم کارەیان لە ڕووی خزمایەتی و کەسایەتیەوەیە. پاشان بیبی پێیگوتم شیری ئەو مێگەلەی کە هاتبوو، پیتوبەرەکەتی نییە. گوتم بۆچی پیتوبەرەکەتی نییە؟ بیبی گوتی شوانەکان خاوەنی مێگەلەکە نین.. خاوەنی میگەلەکە ڕازی نین ئێمە شیری مەڕەکانی ئەوان بخۆین..

حاجی ڕۆستەم هەموو خەڵکەکەی کۆکردەوە و گوتی وا نزیکی بانگی نیوەڕۆیە، خان نەگەڕاوەتەوە، لاشەی مردووەکەمان هەروا لە سەر زەوییە، ئەوە تاوانە، دەبێت بە زوویی تەسلیم بە خاکی بکەین و بیخەینە گۆڕەوە. حاجی ڕۆستەم گوتی هەمووتان وەرن بۆ لای ڕەشماڵەکەی خەینسا، گەورە و بچووک هەمووان دەگریان، هەر بە زوویی ژنان لە پشتی ڕەشماڵەکەوە لاشەکەیان شۆری. هیچ تەختەیەکی گەورەیان دەستنەکەوت تا لاشەکەی لە سەر دابنێن و بیبەن بۆ سەر گۆڕەکە.

لە ژیانی هەوارنشنیدا تابووت نەبوو بۆ مردوو هەڵگرتن. ئەو کۆچەرییانە لە هەر جێگایەک کەسێکیان لێ بمردایە، هەر لە هەمان شوێن بەخاکیان دەسپارد. شوێنی گۆڕەکە لە ڕەشماڵەکەوە تەنها بیستوپێنج مەتر دەبوو. پیرەژنێک لە هەوارەکە، کفنی هەبوو. کفنەکەی پێدان و لە تەرمەکەیانەوە پێچا. هەموومان لە بەردەمی ڕەشماڵەکە وەستابووین، کاتێک سەیری نێو ڕەشماڵەکەم کرد، نەمتوانی نەگریم، ڕەشماڵێکی بچکۆلەی ٣X٣ مەتر لە ژێر ئەم ڕەشماڵەدا خەینسا و هاوسەرەکەی و شەش منداڵ دەژیان. کوڕێکیشیان لە سەربازیی بوو. بەشی زۆری نێو ڕەشماڵەکە ڕاخەری تێدا نەبوو، چەند پارچە نوێنێک لە لایەکەوە دانرا بوون لەگەڵ چەند جەواڵێک کە هەندێک کەلوپەل و خواردەمەنیان تێدا بوو. هاوسەرەکەی خەینسا ڕامابوو، ژنەکەی مردبوو، منداڵەکانیشی بچووک بوون، نەیدەزانی چی بکات؟ خەڵکەکە دەیانگوت شکور بۆخودا. خەینسا لە سیازدەساڵیدا شووی کردبوو. تا تەمەنی بیستوحەوت ساڵی هەموو ساڵێک منداڵێکی ببوو. کوڕە تەمەن هەژدە ساڵەکەی لە بیرجەند سەرباز بوو. چوار منداڵی بچووکی پێڵاویان لە پێدا نەبوو، لە نێو ئەو بەرد و خۆڵەدا بە پێپەتی دەسوڕانەوە.

تەرمەکەیان لە سەر پارچە ڕەشماڵێک دانا بوو، پارچەیەکی تریشیان پێدادا بوو. چوار پیاو هەر یەکە و گۆشەیەکی ڕەشماڵەکەیان گرت و هەڵیانگرت و گوتیان (لا اله الا الله) تەرمەکەیان برد بۆلای گۆڕەکە. کاتێک تەرمەکەیان لە سەر لێواری گۆڕەکە دانا، حاجی ڕۆستەم گوتی موهەندیس تکایە نوێژی مردووی لەسەر بکە. منیش نەمدەزانی چۆن نوێژی مردوو بکەم؟ من هەمیشە لە پشتی مەلاوە وەستا بووم و نییەتم هێناوە. بێدەنگ وەستابووم، جگە لەو ڕاوەستانە هیچ شتێکی ترم لە نوێژی مردوو نەدەزانی. خۆ جێگای ئەوەش نەبوو کە بڵێم من نوێژی مردوو نازانم، هەموو خەڵکەکە سەیری منیان دەکرد، منیش گوتم حاجی ڕۆستەم خۆت نوێژی لە سەر بکە. حاجی ڕۆستەم گوتی من نوێژی مردوو نازانم، نازانم بڵێم چی؟ هیچ کەسێکی تر نەیدەزانی نوێژی مردوو بکات.

ئەوان خەڵکێکی هەژار و نەشارەزا بوون، لە ڕووی دینییەوە، تاکە کەسی زیرەک و شارەزایان حاجی ڕۆستەم بوو کە ئەویش هیچی نەدەزانی. ئەو پێشنوێژییەش کە من بۆمدەکردن جۆرێک بوو لە خۆ هەڵخەڵەتاندن، منیش بێدەنگ وەستا بووم. لە دڵی خۆمدا دەمگوت خودای گەورە من ببەخشە بەڵێن دەدەم هەر کاتێک گەڕامەوە بۆ شار خۆم فێری هەندێک بابەتی ئایینی بکەم. بەناچاری هەندێک ورتە ورتم کرد، هەر چەندە خۆشم نەمدەزانی چیم گوتوە، بەڵام هەرچییەکم گوتبێت نوێژی مردوو نەبوو. تەرمەکەیان خستە گۆڕەوە و گڵیان بە سەردا کرد، پاشان چەند بەردێکیان بە تەنیشت گۆڕەکەوە نا، فاتیحامان خوێند و گەڕاینەوە. بیبی هەموو خەڵکەکەی بانگهێشت کرد بۆ ڕەشماڵەکەی خۆی، بەڵام ناو ڕەشماڵەکە جێگای هەموو خەڵکەکە نەدەبووەوە، بۆیە هەندێکیان لە دەرەوەی ڕەشماڵەکە بە پێوە وەستا بوون. لەوێش فاتیحایەکمان خوێند و پاشان چامان خواردەوە و بڵاوەمان لێکرد.

دەمزانی کە منداڵەکانی خەینسا نانی نیوەڕۆیان نەبوو بیخۆن، لە کوڵەپشتەکەمدا تەنها سێ قوتو گۆشت ماسیم پێمابوو دەرمهێنان و دامەدەست هاوسەرەکەی خەینسا کە لەگەڵ منداڵەکانی لە نێو ڕەشماڵەکەیاندا بێدەنگ دانیشتبوون. لە ڕەشماڵەکانی تریشەوە هەریەکە و کەمێک خواردنیان بۆ هێنان، لە ڕەشماڵەکەی خانیشەوە هەندێک خواردنیان بۆ هێنان و بە ئاردە تەڕوو خراپ بووەکە هەندێک نانیان دروستکرد. دەیانگوت خان و کوڕەکانی ڕۆیشتوون بۆ شار تاکو ئارد بهێنن. ڕۆژی سێیەمی لافاوەکە بوو، هیچ هاوکارییەک لە هیچ شوێنێکەوە بە دەستیان نەگەیشتبوو، بۆنی کەلاکی مندارەوە بوو دەهات. لافاوەکە سەدان سەر ئاژەڵی لەگەڵ خۆیدا هێنا بوو،

چەندین لاشەی ئاژەڵ لەمبەراوبەری ڕووبارەکە جێمابوون. نێوانی ڕووبارەکە تاکو هەوارەکە زۆر دور نەبوو. بێژەن و ئەردۆ لەگەڵ مێگەلەکەدا ڕۆیشتبوون، تەنانەت لە کاتی بە خاکسپاردنی تەرمەکەش ئەوان ئامادە نەبوون.

دڵم بۆ ئەم بەد بەخت و هەژارانە دەسووتا، ئێمە بەو حاڵەی خۆمان لە شاردا هێشتا ناڕازی بووین، بەڵام لەو کێو و بەندەنەدا خەڵکی وەکو سەردەمی بەرد دەژین. دەوڵەتی شا دەیویست کۆمەڵگە بەرەو پێشکەوتن بەرێت. لێپرسراوانی زانکۆش دەیانویست بە داپۆشینی سەری کچان وڵات بەرەوپێش بەرن. ڕۆشنبیرانیش لە لێکۆڵینەوەکانیاندا تیا مابوون، هەندێکیش بیریان لە ڕۆژی دوایی و نەمانی ئەم جیهانە دەکردەوە. دڵم زۆر تەنگ بوو، زۆرم خەمی ئەو ژنە بوو، ژنێک کە مەشکەی دەژەند و خۆی ماندوو دەکرد، تا کەمێک ڕۆنەکەرە بەدەستبێنێت، پاشان بیفرۆشێت و پارەکەی بنێرێت بۆ کوڕە سەربازەکەی. کوڕێک کە بەبێ وەرگرتنی هیچ برە پارەیەک سەربازیی دەکرد بۆ دەوڵەت. ئەم ژنە ئەوەندە مەشکەی ژەند، تاکو هێزی لەبەر بڕا و مرد. گڵپۆش لە ژێر فشاری باوەژنەکەیدا دەیویست بڕوات و سەری خۆی هەڵگرێت. «یەلە»ش بێ کەسوکار و سەرگەردان بوو، ئەی منداڵانی خەینساش لە ژێر باڵی کێدا کۆببنەوە. منی قەلخۆریش هەر لە بیری خۆشگوزەرانی خۆمدا بووم، باشە من بۆ چی هاتبووم بۆ نێو ئەو خەڵکە زوڵم لێکراو و چەوساوەیە؟ بۆ نێو ئەو خەڵکە هەژار و نەدارە، بۆ نێو ئەوخەڵکە لافاو لێدراو و ماڵوێرانە. ئایا بۆ ئەوە هاتبووم کە هەست بەو ژیانە چەرمەسەرییەیان بکەم؟ یا بۆ چاوگێڕان بەدوای کچی جواندا، دڵم زۆر تەنگ بوو هیچ قسەیەکم نەبوو تا بیکەم، خەڵکەکەش هەموو دەیانگوت ئەوە بەشی خودایە.

دوبارە ڕۆیشتمەوە بۆ ڕەشماڵەکەی خەینسا، سەیرم کرد وا هاوسەرەکەی لەگەڵ منداڵەکاندا بە غەمبارییەوە دانیشتبوون. گوتم عەلی کوڕت کەی دێتەوە؟. عەلی سەرباز بوو لە بیرجەند. ئەو بۆ گەڕانەوە و سەردانکردنی کەسوکاری چاوەڕوانی ئەوەی دەکرد، دایک و باوکی پارەی بۆ بنێرن. هاوسەری خەینسا ناوی ڕەجەب بوو. ئەویش کاری بۆ عەلی خان دەکرد و هەر کارێکیان پێبسپاردایە ئەنجامی دەدا، زۆرترینی کارەکانی ئەو لە زستاندا بوو، کاتێک مەڕەکان دەزان ئەو بەچکەکانی کۆدەکردنەوە و چاودێری دەکردن و دەیبردن بۆ لای دایکیان بۆ شیر خواردن، ئەو هەموو کار و بەرخەکانی دەناسین، دەیزانی کام بەچکە هی کام مەڕەیە. لێم پرسی خەینسا چ کارێکی دەکرد؟ گوتی داماوی و شیردۆشین و مەشکەژەندن و ئاوهێنان و خزمەت کاری و هەزاران بەدبەختی.

خەینسا لە شەوی لافاوەکەوە نەنووستبوو، بەردەوام خەریکی کارکردن بوو. شیری دۆشی بوو مەشکەی ژەندبوو. کاتێک بارانەکە باری بوو هەموو لایەک ببوو بە لافاو هاوکاری هاوسەرەکەی کردبوو، تاکو ڕەشماڵەکەیان نەکەوێت و ئاو نەیاتە ژێریانەوە، تاکو منداڵەکانیان سەلامەتبن. کاتێک بارانەکە خۆشیکردبووەوە عەلی خان داوای لە هەموو لایەک کردبوو کە بچن هاوکاری ژن و منداڵەکانی بکەن، خەینسا یەکێک بوو لەوانەی بە زوویی چوو بوو بە هانایانەوە، ئەو شەوە هەموو گیانی تەڕببوو، هەر بە جلوبەرگی تەڕەوە چووبووە نێو نوێنە تەڕەکانەوە و بەیانی زووش هەڵسابوو بۆ مەشکە ژەندن. خەینسا کەسێکی کارکردە بوو، کاتێک کوڕەکەی ڕۆیشتبوو بۆ سەربازی خەینسا بوخچەیەکی بۆ پێچابووەوە و عەلی خانیش پێنج تومەنی پێدا بوو، باوکیشی هەرچۆنێک بوو دوو تومەنی بۆ پەیدا کردبوو، شەش مانگ بوو کوڕەکەی ڕۆیشتبوو، ڕۆژێک هەواڵی ناردبوو کە دەیەوێت بە مۆڵەت بگەڕێتەوە، بۆ سەردانیی دایک وباوک و کەسوکاری، بەڵام پارەی هاتنەوەی پێنەبوو، خەینسا نزای کرد بوو بەڵکو خودا پارەیەکی بۆ بنێرێت و ئەویش بینێرێت بۆ کوڕەکەی تاکو بتوانێت بگەڕێتەوە و چاویان بە یەکتری بکەوێت.

ئەو مێگەلە مەڕەی ڕووی کردبووە هەوارەکەیان، ماوەی ڕۆژ و نیوێک بوو نەدۆشرابوون. شوانەکان گوتبوویان مەڕەکان ئازاریان هەیە و نەدۆشراون، کار و بەرخەکانیش لێرە نین تا شیرەکە بخۆن. خەینساش بیری لە دووری کوڕە سەربازەکەی کردبووەوە و بەخێرایی چوو بوو شیری زیاتر لە هەشتا مەڕی دۆشی بوو. شیری لە چەند ژنێکی تریش وەرگرتبوو تا بەنێوەیی بۆیان بژەنێت و کەمێک پارەی دەستبکەوێت و بینێرێت بۆ کوڕەکەی، خۆ ئەگەر عەلی خان لەو کاتەدا بهاتایەتەوە ئەوا هەموو کەرە و دۆکە بۆ ئەو دەبوو، بۆیە دەبوو ئەوەندە بە خێرایی مەشکە بژەنێت تا خان نەهاتۆتەوە کەرە و دۆکە لە یەکتری جیا بکاتەوە. هەمیشە سەیری ڕێگاکەی کرد بوو. کچە سێ ساڵەکەشی گوتبووی دایکم هەمیشە گوێی بۆ دەنگی پێی ئەسپەکانی خان هەڵخستبوو نەوەکا لە ناکاو خان بێتەوە. خەینسا لەوە دەترسا کە ئەو شیرەی بۆی پەیدا بووە بۆ ئەو نەبێت. تا ئەو کاتەی مرد هەمیشە نیگەرانی ئەوە بوو. کچەکەشی هاوکاری کردبوو، هاوسەرەکەشی ڕۆیشتبوو بۆ کێو تا دار بهێنێت و دۆکەی پێ بکوڵێنن. خەینسا زۆر بە خێرایی ماستی دروستکرد بوو مەشکەی ژەند بوو. هەر ئەو ماندوبوون و شەکەتیە بوو کە ببووە هۆی سەکتە لێدان و مردنی.

هەندێک کەس وایان بیر دەکردەوە کە گڵێۆ شوو بە کوڕەکەی خەینسا دەکات.

گڵپۆ ئەو کچەی نیو نیگام بۆی هەبوو، کچێک کە بیبی دەیویست بیکات بە دەزگیرانی من، کچیک کە هاتبوو ڕووبەڕووی من دانیشتبوو بۆ مەڕدۆشین، ئەو پێی گوتم کە خەینسا پووریەتی، بە مردنی پووری ئەو تا ساڵێکی تر ناتوانێت شوو بکات. ئەم کچە لە ڕوانگەی خەڵکەوە دەبوو شوو بە کوڕە پوورەکەی خۆی بکات. ئێستا کە من لە شارەوە هاتووم و دەمەوێت چاو برکێ لەگەڵ ئەو کچەدا بکەم، ئایا گڵپۆ بیری لە خۆی کردبووەوە؟ ئایا بیری لەوە کردبووەوە کە خودا گەنجێکی لە شارەوە ناردووە و تا ئەو ڕزگاربکات لەو زیندانەی تێیدایە؟ خۆزگە ڕێگا چارەیەکم بۆ ئەم کچە هەبووایە، خۆزگە بمتوانیایە ئارەزووەکانی ئەم کچە بەدیبهێنم، ئارەزووی ژنێکی هەژاری کۆچەریی لەو ساڵانەدا دەبێ چی بێت؟ جگە لە دوو کیلۆ ڕۆنەکەرە و چەند کیلۆ کەشکێک کە لە ئاسمانەوە بە دەستی بگات تا بیفرۆشێت و پارەکەی بنێرێت بۆ کوڕە سەربازەکەی لە بێرجەند، بەڵکو بەو پارەیە بگەڕێتەوە و بەدیداری دایکی شاد بێتەوە. ئەم ئارەزووانە ئارەزووی گەورەن، ئایا لە پێناوی ئەم ئارەزووەدا دەبێت سەکتە لێت بدات و بمریت؟ ئایا دەکرێت ئەو ئارەزووانە بە تموحی مرۆڤ ناوزەد بکرێت؟ ئایا کاری خەینسا تەماح بوو یا میهر و خۆشەویستی دایکێکی هەژار؟ ئایا ئەو مێگەلە مەڕەی کە ڕووی کردە هەوارەکەیان نیعمەت بوو یا نەگبەت؟

ویستم بیری لێبکەمەوە ئێمە لە کوێین؟ کاربەدەستانی تاراننشینی ئێمە چیدەڵێن؟ ئەم کۆمەڵگە داخراوە خێڵەکییەی کە خەڵکە سادەکانی ئەوەندە هەژاربن ئەو گوندانەی کە وەکو دورگە لە دڵی کێو و دەشتەکان هەڵکەوتوون، لە ساڵی (١٣٤٧-١٩٦٨) ڕێگای هاتوچۆیان زۆر خراپ بوو. لە هەر هەزار گوند، گوندێک تەلەفۆنی نەبوو. شەپۆلی ڕادیۆ نەدەگەیشتە زۆربەی گوندە کوێستانییەکان، ڕۆژنامە و گۆڤار و کتێب نەدەگەیشتنە گوندەکان و خێڵە کۆچەرییەکان، لە بیری ئەوە دابووم کە پوختەی ئەوانە لە سێ دێڕ هۆنراوەی شاعیری بەڕێز ئەرجومەند مەحمود ئارمین کورت بکەمەوە.

**ئەو هەموو شادی و هیوایە بەرەو کوێ چوو؟**
**بۆ دەرد و خەفەت لە دڵدا نیشتەجێ بوو؟**
**چی بەسەر هات، وڵاتی ئاوەدانی دڵ؟**
**وێرانەیە و هێلانەی پەپووی لێ چێ بوو**
**مەگەر ناپەیدا چارەسەری زوڵم بێت**
**پەپوو؛ باز بیکوژێت و نەزانێ کێ بوو**

پێنج، شەش ساڵ بوو کێشەی چارەسەرکردنی زەویوزار دەستپێکرد بوو. لەوەرگەکان خۆماڵی کرابوون. سوپای خوێندن بە کاغەز و دەفتەرەوە تیشکێکی ئومێد بوو کە بەدیدەکرا. کاربەدەستانی تاراننشین تەواو لە خۆیان بایی ببوون، سێ ساڵ لەوە دوا ئەسەدوڵڵای عەلەم گوتی پێویستە ئێمە جەژنەکانی شا بەرز رابگرین. تەنانەت ئەگەر لێفەکانی سەر خۆشمان فرۆشتووە، دەبێت جەژنەکان بەرز رابگرین. خۆزگە ئەوانەی ئەم قسانەیان دەکرد سەردانێکی دێهات و خەڵکە کۆچەرییەکانیان دەکرد. بەڵکو تێبگەیشتنایە کە دەبێت لێفەکانیان بفرۆشن و کارێک بۆ ئەو خەڵکە هەژارە بکەن، نەک جەژنەکانی شا بەرز رابگرن، خۆ ئەگەر ئەو کارەیان بکردایە ئەوا بە سەربەرزی و ئابڕوومەندیی و شکۆدارییەوە دەمانەوە، بەڵام باییبوون و خۆبەزلزانینی کاربەدەستان و مەراییکەرانی دەوروبەریان، بارەکەی گۆڕی. شا شانازی بە فڕۆکە ڤانتۆنەکانییەوە دەکرد. کاربەدەستانی سۆڤیەت شانازییان بە مووشەکە دوور مەوداکانیانەوە دەکرد، سەدام حسێن و قەزافی شانازییان بەسوپاکەیانەوە دەکرد، بەڵام سوپای ڕاستەقینەی هەمووشیان خەڵکی هەژار و ڕەشوڕووتە. ئیتر منیش وازم لە خەیاڵ و بیرکردنەوەکانم هێنا.

## پۆلیس

دوو کاتژمێر دەبوو لە نێو ڕەشماڵەکە لای ئەو پیاوە دانیشتبووم، پیاوەکە زۆر غەمبار بوو، ژنخوشکەکەی و چەند ژنێکی تر هاتن و خواردنیان دا بەمنداڵەکان و ڕۆیشتن. پەیوەندی خزمایەتی لە نێوانیاندا بەهێز بوو. گوتم وا باشە بڕۆم بۆ ڕەشماڵەکەی بیبی، لەوێ پشوویەک بدەم و شەویش لەگەڵ بێژەن و ئەردۆدا لەگەڵ ڕانەمەڕەکەدا دەڕۆم. پیاوەکان دەیانگوت لێرە ئاو و لەوەڕ کەمە، لافاو لەوەڕگەکانی تێکداوە، مەڕەکانیش برسی بوون. عەلی خان دەبوو بگەڕێتەوە تا کارێک بکات، سێ ڕۆژ بوو ئەم خەڵکە گرفتاری لافاو ببوون و هیچ هاوکارییەکیان پێنەگەیشتبوو. دوانیوەڕۆ، بوو بە دەنگە دەنگ، سەیرم کرد منداڵان بەخێرایی بەرەو ڕەشماڵەکان ڕادەکەن. عەبداڵ و برزوو و منداڵانی هاوتەمەنیان بەخێرای بەرەو ڕەشماڵەکان دەهاتن. غەفار بەرەو ڕەشماڵەکەی بیبی هات و گوتی پۆلیس، پۆلیسەکان هاتن. من وام هەستکرد پۆلیسەکان کۆمەکیان بۆ خەڵکەکە هێنابێت. منداڵێک بەکوردی قسەیەکی بەبیبی گوت. بیبی گوتی مەترسە. منیش گوتم بۆچی دەترسێت؟ ئەو فارسییەکەی باش نەبوو. بیبی گوتی لە پۆلیسەکان دەترسێت. گوتم ڕەنگە کۆمەکیان بۆ هێنابن، بیبی گوتی چی؟ پۆلیس بۆ

هێنانی کۆمەک نایەن بۆ ئێرە، بەڵکو بۆ ئەوە دێن ئازارمان بدەن. من لە ڕەشماڵەکە نەهاتمە دەرەوە حەزم نەدەکرد چاوم بە پۆلیس بکەوێت. ئەفسەرێکی پلە بەرز و دوو ئەفسەری تر بەسواری ئەسپ هاتبوون، هێسترێکی زیادەشیان پێبوو سواری بەسەرەوە نەبوو. کەس لە دەرەوەی ڕەشماڵەکان نەبوو، وەک ئەوەی کە هیچ کەسێک لەوێ نەبێت، تەنانەت منداڵانی خانیش لە ڕەشماڵەکەیان نەهاتنە دەرەوە. پۆلیسەکان لە ئەسپەکانیان دانەبەزین، یەکێکیان هاواری کرد و گوتی سەگبابینە ئەوە لە کوێن بۆچی نایەنە دەرەوە؟ دەڵێی هەمووتان مردوون؟ ئەوە لە کوێن؟ حاجی ڕۆستەم لە ڕەشماڵەکەی هاتە دەرەوە و لەگەڵ ئەفسەرەکان کەوتە قسەکردن. پۆلیسەکان لە ئەسپەکانیان دابەزین. دوو پیاوی تریش لە ڕەشماڵەکانەوە هاتنە دەرەووە. منیش سەر و کەللەم هەر لە کۆچەریی دەچوو، (٦-٧) ڕۆژ بوو ڕیشم نەتاشی بوو، دوو جار جلوبەرگەکەی بەرم تەڕببوون و هەر لە بەرمدا وشک ببوونەوە. جل و پێڵاوەکانم قوڕاوی و چڵکن بوون، پێمەوە دیار نەبوو کە من جیاوازبم لە ئەوان، تەنها بە چۆنێتی جلوبەرگەکەم دەزانرا من لەو کۆچەرییانە نیم.

یەکێک لە پیاوەکان بە پۆلیسەکانی گوت ئێمە تازیەمان هەیە. پۆلیسەکان گوتیان کێ مردووە؟ پیاوەکە بەسادەیی گوتی ژنێک مردووە. پۆلیسەکە گوتی کەی مردووە؟ پیاوەکە گوتی ئەمڕۆ بەیانی مردووە. پۆلیسەکە گوتی چیتان لە لاشەکەی کرد؟ حاجی ڕۆستەم گوتی بەخاکمان سپارد. پۆلیسەکان گوتیان سەگبابینە چۆن بێ پرسی ئێمە خستانە گۆڕەوە؟ کێ دەڵێت پیاوەکەی نەیکوشتووە؟ ڕەجەب گوتی بەڕێز ئەمە چ قسەیەکە؟ ئەجەلی هاتووە و مردووە. پۆلیسەکە گوتی ئەوە قسەی هەموو خەڵکانی وەکو ئێوەیە، بەڵام من دەبێت لێکۆڵینەوە بکەم. ئینجا گوتی تەمەنی چەند ساڵ بوو؟ یەکێک گوتی تەمەنی سیوپێنج ساڵ بوو. پۆلیسەکە گوتی کەسێکی تەمەن سیوپێنج ساڵ هەر لەخۆیەوە و وا بەئاسانی نامرێت. هەڵبەت کەسێک لێیداوە و کوشتویەتی. هاوسەرەکەی خەینسا زۆر خەمبار و بێتاقەت وەستا بوو. پۆلیسەکان گوتیان ئێستا هاوسەری ئەو ژنە لە کوێیە؟ ڕەجەب گوتی من هاوسەری ئەوم. پۆلیسەکە گوتی وەرە پێشەوە پێمان بڵێ چۆن ژنەکەتت کوشتووە؟

ژنی عەلی خان گوتی بەڕێز جارێ وەرن بۆ ژێر ڕەشماڵەکە پشوویەک بدەن و چایەک بخۆنەوە، عەلی خان لێرە نییە، بەڵام خۆ خێزانەکەی لەماڵە. کاتێک پۆلیسەکان زانیان ئێرە هەواری عەلی خانە، زمانی قسەکردنیان گۆڕی. پۆلیسەکان و خەڵکەکە هەموویان چوونە نێو ڕەشماڵی خانەوە، منیش هەر چووم بۆ ژێر ڕەشماڵەکە، چا

ئامادە کرابوو. حاجی ڕۆستەم گوتی بەڕێزتان ئێوارە لێرەبن و میوانی ئێمەبن. با بەرخێک سەربڕین و پێکەوە بیخۆین. پۆلیسەکان گوتیان تۆ بەرخەکە سەر ببڕە ئەگەر ماینەوە دەیخۆین و ئەگەر نەشماینەوە ئەوا گۆشتەکە لەگەڵ خۆماندا دەبەین.. گرنگ ئەوە بوو بەرخەکە سەر ببڕدرێت. کوڕە تەمەن یازدە ساڵەکەی عەلی خان بەدەنگێکی لێپرسراوانە گوتی پۆلیسی بەڕێز ئەو ژنە خۆی مرد، هیچ کەسێک ئەوی نەکوشتووە. پۆلیسەکە گوتی تۆ قسە مەکە. کوڕی خان گوتی باوکم و براکانم لێرە نین من گەورەی ئەم هەوارەم، هیچ کەسێکیش خەینسای نەکوشتووە. هەستمکرد پۆلیسەکان بەم جۆرە قسەکردنەی مەنوچەهر ناڕەحەتبوون. منداڵێکی یازدە ساڵ لە بەردەمی ئەم هەموو خەڵکە گەورە و ڕیش سپییەدا بڵێ من گەورەی هەوارەکەم.

ئەفسەرەکە گوتی لێکۆڵینەوە بکەن کەسێک لەو تەمەنەدا هەروا بەئاسانی نامرێت. حاجی ڕۆستەم گوتی ئەفسەری بەڕێز خۆت دەزانیت کە ژنانی ئێمە زیاتر لە بەهاراندا دەمرن، ئەوان ئەوەندە کاردەکەن و مەشکە دەژەنن تا دەمرن، خەینساش سێ شەو و ڕۆژ نەنووستبوو، لە شەکەتیدا کەوت و مرد، ئێمەش خستمانە گۆڕەوە. ئەفسەرەکە بە تەوسەوە گوتی بە ئارەزووی خۆت قسەبکە، ئێوە خۆتان ژنەکانتان دەکوژن و بەزوویی دەیانخەنە گۆڕەوە. حاجی ڕۆستەم گوتی ئێمە ژنەکانمان ناکوژین، بەڵام بەزوویی مردووەکانمان بە خاک دەسپێرین، چونکە خودا فەرمویەتی مردوو لە سەر زەوی مەهێڵنەوە و بەزوویی تەسلیم بە خاکی بکەن، تۆش کە موسڵمانیت ئەوە باش دەزانیت، ئەی لەم چۆڵەوانییە و بەم هەموو با و باران ولافاوە دەبێ چی لە مردووەکانمان بکەین؟ مەنوچەهر گوتی ئێمە لە کوێ دەمانزانی کە ئێوە دێن بۆ ئێرە؟ بیبی گوتی بەڕێز چایەکەت بخۆرەوە تا سارد نەبووەتەوە. ئەفسەرەکە گوتی ئەم شەکرە تەڕ و قوڕاوییە چۆن چای پێدەخورێتەوە؟ بۆ مەگەر لەم هەوارەی ئێوەدا چەند کڵۆیەک شەکری خاوێن پەیدا نابێت؟

لە هەوارەکەدا یەک کڵۆ شەکری پاک و وشک پەیدا نەدەبوو، من کە هاتم بۆ ئەوە بوو کە قسەیەک بکەم، بەڵام گوتم پێویستە من شاهیدبم و بزانم چی دەگوزەرێت. ئەفسەرەکە قەڵەم و کاغەزی دەرکرد و دەستیکرد بە لێکۆڵینەوە. لە ناکاو سەیرێکی خەڵکەکەی کرد و گوتی سەربازەکانتان لە کوێن؟ بۆ کوێ ڕایانکردووە؟ بۆچی لەم هەوارەدا کەسێک نییە کە کاتی سەربازی هاتبێت؟ حاجی ڕۆستەم من و چەند کەسێکی تری ئاگادارکردەوە کە بچینە دەرەوە، ئێمەش هاتینەدەرەوە. حاجی ڕۆستەم گوتی موهەندیس چی بکەین؟ ئەمە شتێکی دەوێت دەبێت بەرخێک و دوو گیسک و یەک

مەن ڕۆن و سێ مەن کەشکی پێبدەین و بڕوات، ئەگەر پێینەدەین لێرە دەمێنێتەوە و ئازارمان دەدات. بیبی لەگەڵ ژنی دووەمی عەلی خان و مەنوچەهر لەلامان وەستا بوون. ژنی خان گوتی ئەم ئەفسەرە سەگبابە شتی دەوێت و خانیش لێرە نییە. بیبی گوتی هیچ شتێکی پێنادەین لافاو هاتووە و هیچمان نییە، لەبری کۆمەکمان بۆبهێنێت کەچی هاتووە گەرمان پێدەکات. حاجی ڕۆستەم گوتی کوڕەکانمان دەسگیر دەکات و لە ئێمەش دەدات، مەنوچەهر گوتی دەچم بە تفەنگەکەی باوکم دەیکوژم. دایکی پێیگوت تۆ دانیشە و هەڵەی وا نەکەیت. ئەو منداڵە ڕایکرد بەرەو ڕەشماڵەکە تاتفەنگەکەی باوکی بهێنێت، یەکێک لە پیاوەکان ڕایکرد بە شوێنیدا و گرتی، مەنوچەهر دەیگوت ئەی تفەنگ بۆ چی باشە، ئەگەر پۆلیسی پێنەکوژیت؟

بڕیارماندا من لەبری هەموویان چەند قسەیەک لەگەڵ ئەفسەرەکەدا بکەم. چووینەوە نێو ڕەشماڵەکە، ئەفسەرەکە کەوتە پرسیارکردن لە هاوسەری خەینسا. ئەو مەبەستی لێکۆڵینەوە نەبوو، بەڵکو مەبەستی ترساندن بوو. کاتێک ئێمە دانیشتین پێش ئەوەی من قسە بکەم ڕووی کردە من و گوتی تۆ چوویت بۆسەربازی؟ منیش کارتی زانکۆم دەرهێنا لەگەڵ ئەو کارتەی کەبە پلەی ئەفسەر بۆ ئێمەی خوێندکاران کرابوو بۆ کاتی چوونە دەرەوەی زانکۆ و ڕۆیشتنمان بۆدێهاتەکان و شوێنەکانی تر بۆ لێکۆڵینەوە. ناوەکانیشمان لە لای پارێزگار و قائمقام و هەموو ناحیە و قەزاکان هەبوو. ڕۆیشتم لە لای ئەفسەرەکەوە دانیشتم و کارتەکانم پێدا. ئەفسەرەکە گوتی تۆ خەڵکی شاری یەزدیت؟ گوتم بەڵێ. گوتی تۆ کورد نیت. گوتم نەخێر. گوتی ئەی لێرە چی دەکەیت؟ منیش نامەی پارێزگار و نامەی فەرماندارم لابوو پێمدا. کاتێک خوێندییەوە دەموچاوی بەتەواوی گۆڕا، چونکە زانی لە ناسنامەکەدا نووسراوە ئەفسەرە. هەستایە سەر پێ و گوتم ببەخشە فەرموو دانیشن... ئینجا بە ئەفسەرەکەم گوت من شاهیدی دەدەم کە ئەو ژنە بە سەکتە مرد. چونکە لێرە توانای ئەوە نەبوو ببرێتە شار بۆ لای پزیشکی دادوەریی، ئەم خەڵکە پرسیان بە من کرد چی لەو تەرمە بکەین، منیش وام بە باش زانی بە زوویی بە خاک بسپێرێت، هەر بۆیە لێرە بە خاکمان سپارد. ئەفسەرەکە گوتی مادام تۆ ئاگاداریت و پرس بە تۆ کراوە ئێمە بەهیچ جۆرێک لێکۆڵینەوە ناکەین. ئەو پەڕە کاغەزەی کە نووسیبووی دڕاندی و فڕێیدا. ئەفسەرەکە گوتی ئێستا وا شەو داهات ڕێگاکەش ئاو خراپیکردووە تاکو گوندی سەرەوە دوو کاتژمێر ڕێگایە بەیارمەتی ئێوە، ئێمە دەبێ بڕۆین. ئەمەی گوت و هەستان و پێڵاویان لەپێکرد و لە ڕەشماڵەکە هاتنە دەرەوە و ڕۆیشتن. خەڵکەکە سڵاواتیان لێدا و ئەسپەکانیان بۆ

هێنان. ئەفسەر و پۆلیسەکان ڕێزێکی زۆریان لە من گرت، سواری ئەسپەکان بوون و دەستیان بەرزکردەوە. حاجی ڕۆستەم بوخچەیەکی بەدەستەوە بوو خستیە نێو خورجێنی هێسترەکەوە و خوداحافیزیی لێکردن. ژنەکانی خان تا ئەو کاتە زۆر قسەیان لەگەڵ مندا نەکرد بوو، بەڵام لەو کاتەدا گوتیان موهەندیس وەرە بۆ ڕەشماڵەکەی خۆمان لەوێ پشوو بدە. منیش گوتم چونکە خان و کوڕەکان لەماڵەوە نین دەبێت مۆڵەتم بدەیت دەچمە ڕەشماڵەکەی بیبی لەوێ پشوو دەدەم. مەنوچەهر گوتی بۆچی؟ ئەی من چیم موهەندیس؟ منیش سەری مەنوچەهرم ماچ کرد و گوتم ئەگەر خان لە ماڵ نەبێت ئەوا تۆ لەبری خان هەموو شتێکیت، بەڵا مۆڵەتم بدەن دەچم بۆ ڕەشماڵی بیبی. حاجی ڕۆستەم گوتی ڕەشماڵی موهەندیس هەڵدراوە. دیار بوو لەو چەند خولەکەدا ڕەشماڵەکەی منیان هەڵدابوو. ڕۆیشتم بۆ ڕەشماڵەکەی خۆم، هەر کەسە و شتێکی هێنا و لە نێو ڕەشماڵەکەدا داینا فەرشێکیان لە ڕەشماڵەکەی خانەوە هێنا و ڕایانخست.

لە حاجی ڕۆستەمم پرسی، ئەوە چی بوو خستتە نێو خورجێنی هێستری پۆلیسەکانەوە؟ گوتی شتێکی وا نەبوو، نیو مەن ڕۆن بوو، دەزانیت ئەگەر پێمنەدانایە جارێکی تر کە دەهاتنەوە تۆش لێرە نەدەبوویت و ئازاریان دەداین، ڕۆنەکە ژنی عەلی خان بۆی هێنا بوو، ئێمەش نیو مەن کەشکمان پێدان. ئەمە بوو هاوکاری فەرمانبەرانی دەوڵەتی شاهنشایی بۆ ئەو خەڵکە هەژار و لێقەوماوە لافاو لێدراوە. دونیا خەریک بوو تاریک دەبوو، دوو فانۆسیان هێنا بۆ ڕەشماڵەکەی من، هەستمکرد ئەوخەڵکە بۆیە ڕێزم لێدەگرن چونکە لێمدەترسن، هەر کەسە و شتێکی هێنا و لە نێو ڕەشماڵەکەدا داینا. حاجی ڕۆستەم گوتی موهەندیس ئەوە ژنی عەلی خان مریشکێکی بۆ تۆ سەربڕیوە نان نەخۆیت تا گۆشتەکە دەکوڵێت و پێدەگات. گوتم برۆ پێیبڵێ مریشک سەر نەبڕێت. گوتی خۆم بەدەستی خۆم سەرم بڕی. واخەریکن ئاوەڕووتی دەکەن.

ئەو خەڵکە هەژارە لە هەموو کەسێک دەترسان. پۆلیسەکان ڕۆیشتبوون، بەڵام ئێتر لە من دەترسان. لە ڕەشماڵەکە هاتمەدەرەوە، مەڕەکان هاتبوونەوە، دەبوو مەڕەکان بدۆشرانایە. منیش هاتم بۆلای بێرییەکان، بەڵام پیاوەکان نەیانهێشت لە سەر بەردێک دانیشم و سەری مەڕێک بگرم. حاجی ڕۆستەم گوتی موهەندیس تۆ ئەرک مەکێشە. هەستمکرد ڕەفتاری خەڵکەکە لەگەڵمدا گۆڕاوە. ئەو ڕێز و خۆشەویستییەی جارانیان بۆم نەماوە. ئەو ڕێزەی کە لێیان دەگرتم لە ترسا بوو، ئەو نوسراو و ناسنامانەی کە پیشانی پۆلیسەکانم دابوو، شەڕی نێوان پۆلیسەکان و خەڵکەکەی ڕاگرت، بەڵام منی لە خەڵکەکە پەراوێز خست. ئەو چەند کەسەی چەند ڕۆژ لەوە پێش بە فارسی قسەم

لەگەڵدا دەکردن ئیستا خۆیان لە من بە دوور دەگرن و دەیانگوت فارسی نازانین. ئیتر منیان وەک دەزگایەکی جاسوسی دەوڵەتی سەیر دەکرد، نەک کەسێکی سادە. من ئەو کاتە سەرەتای گەنجێتیم بوو، ئێستاش دوای چلوسێ ساڵ ئەزموون گەیشتوومەتە ئەو باوەڕەی هیچ کاتێک خەڵک، کەسانی سەر بە حکومەت بە بەشێک لە خۆیان نازانن، هەر بۆیەش من نەمدەتوانی چیتر پرسیارەکانم ئاراستەی ئەو خەڵکە بکەم. تا ئەو کاتە من لەگەڵ خەڵکەکەدا زۆر تێکەڵ بووم و پیرەژنێکی وەک بیبی تەمەن حەفتاوپێنج ساڵ جێگەی منی لە ڕەشماڵەکەی خۆیدا کردەبووەوە، بەڵام لەمە بەدواوە لە ڕەشماڵێکی جیا و تا ڕادەیەک دوور لە ڕەشماڵەکانی تر جێگیر بووم.

ژنەکان مەڕەکانیان دەدۆشی و پیاوان سەری مەڕەکانیان بۆ دەگرتن. عەبداڵ و منداڵانی تری هاوتەمەنی کە پێشتر لە دەوری من کۆدەبوونەوە، بەڵام ئێستا لێم دوورەپەرێزن. ئەو ناسنامە و نامانەی پیشانی پۆلیسەکانم دا لەو کاتەدا بۆ خەڵکەکە باش بوو، بەڵام هاوکات لە نێوان من و خەڵکەکەشدا دابڕانێکی دروستکرد. خۆ من ئەگەر تەنها ناسنامەی زانکۆم بدایە بە پۆلیسەکان بەس بوو. ئەفسەرەکە ئەوەندەی لە من پرسی و گوتی تۆ چوویت بۆ سەربازی یان نا؟ وەڵامی پرسیارەکەی ئەو تەنها ناسنامەی زانکۆ بوو، بۆیە نەدەبوو شتی تری پیشان بدەم، بەڵام ویستم بەو نامانە شەڕی نێوان پۆلیس و خەڵکەکە دوور بخەمەوە، یا ڕەنگە ویستبێتم خۆم لە نێو ئەو خەڵکەدا بەگەورە و گرنگ پیشان بدەم.

خەڵکانی سادە هیچ کاتێک خەڵکانی گەورە و دەسەڵاتدار بە بەشێک لە خۆیان نازانن. منیش هەمان شەو بیرم لە خۆم کردەوە کە من مرۆڤێکی گرنگ نیم. دوای شیردۆشین خوڵقی حاجی ڕۆستەمم کرد تاکو بێت بۆ ڕەشماڵەکەی من، بەڵام ئەو گوتی موهەندیس ئەمشەو تۆ ماندوویت و خواردنت بۆ دەهێنین بیخۆ و پشوو بدە. خەڵکەکەی تریش ڕۆیشتنەوە بۆ ڕەشماڵەکانی خۆیان، منیش لە ڕەشماڵەکەی خۆمدا دانیشتم و لە ژێر ڕووناکی چراکەدا، دەستمکرد بە نووسینەوەی یادەوەرییەکانم. هەر بەڕاستی ماندوو بووم، دەمویست شتێک بخۆم و بخەوم، کیسە خەوەکەم کردەوە تا بخەوم، گوێم لێبوو دەنگێکی نەرم بانگی دەکرد و دەیگوت موهەندیس خواردنم بۆ هێناویت. لە ڕەشماڵەکەم هاتمە دەرەوە بینیم یەکێک لە کچەکانی عەلی خان لە سەر سینییەک قاپێک مریشکی کوڵاو و هەندێک ڕۆنەکەرەی بۆ هێنا بووم، بیرم کردەوە بۆچی لە نێوان ئەم هەموو کرێکار و خەڵکەدا کچی خان خواردنی بۆ هێناوم؟ کچەکە گەورە بوو، تەمەنی (١٨-١٩) ساڵ دەبوو. تا ئەوکاتە تەنها لە دوورەوە ئەو کچەم

بینیبوو. گوتی موهەندیس هەر شتێکت پێوویستە پێمان بڵێ. گوتم سوپاس هیچ شتێکم پێویست نییە و هەموو شتێکم لەلایە. ئینجا گوتی موهەندیس من لە بۆجنووردَ تا پۆلی شەشەمم خوێندووە چەند کتێبێکم هەیە ئەگەر پێوویستت بە کتێب هەیە بۆتی دەهێنم. گوتم کتێبی چیت هەیە؟ گوتی دیوانی حافز و شانامەی فیردەوسیم هەیە. گوتم ئەگەر ئەرک نەبێت دیوانی حافزم بۆ بهێنە. پاش چەند چرکەیەک هەمان کچ لەگەڵ مەنوچەهر بەیەکەوە هاتن و دیوانی حافزیان بۆ هێنام و خوداحافیزییان کرد و ڕۆیشتن.

من شەکەت و ماندوو بووم، توانام نەبوو لەگەڵ بێژەن و ئەردۆ بڕۆم بۆلای مێگەلەکە، بۆ یەکەم جار بێژەن و ئەردۆ مێگەلەکەیان برد بۆ لەوەڕ بەبێ ئەوەی من ئاگادار بکەنەوە، کە لەگەڵیان دەڕۆم یان نا، دەستمکرد بە نانخواردن و «یەلە» هات و بەبێ ئەوەی یەک قسەیەک بکات لە بەردەممدا دانیشت، هەندێک گۆشتم بۆ کردە ناو پارچەیەک نانەوە و پێمداو خواردی. گوتم «یەلە» چۆنیت باشی شکور. گوتی ئا ئا باشم. گوتم جلوبەرگەکەت زۆر جوانە، لە خۆشیدا پێدەکەنی، هەندێک قسەم لەگەڵدا کرد، گوتم «یەلە» هەموو ڕۆژێک دەست و دەموچاوت بە جوانی بشۆ. گوتم من دەگەڕێمەوە بۆ شار ئەگەر هاتمەوە بۆ ئێرە جوتێک پێڵاوی جوانت بۆ دەهێنم. بەبێ ئەوەی یەک قسە بکات قاچەکانی درێژ کرد و پیشانیدەدام. قاچەکانی چڵکن بوون، بەڵام قاچی وەک قاچی منداڵێکی شەش ساڵ نەبوو. پێستی قاچی زۆر ئەستور بوون. پێمگوت شەو لەکوێ دەخەویت؟ هیچ قسەیەکی نەکرد هەر لە هەمان جێگای خۆیَ ڕاکشا و خەوی لێکەت. منیش یەکێک لەو خۆرجێنانەی لەوێ بوو پێمدا دا. لە نێو ئەم هەوارەدا و لەم جیهانەدا هیچ کەسێک چاودێری ئەم منالەی نەدەکرد.

کات نزیکی نیوە شەو بوو باران دایکرد. چەند خولەکێک زۆر بەخێرایی دەباری. خەڵکەکە دەوری ڕەشماڵەکانیان بە قوڕ و بەرد قایم دەکرد. پاشان هاتن بە لای ڕەشماڵەکەی منیشەوە، باش بۆیان قایم کردم. ئاو لە زەوییەکە هەڵسا، بەڵام نەبوو بە لافاو. لە کیسە خەوەکەمدا ڕاکشام و چوومە خەوێکی قوڵەوە. بەیانی بە دەنگەدەنگی مەڕەکان بەئاگاهاتم، «یەلە»ش لە ڕەشماڵەکەدا نەمابوو. هەتاو کەوتبوو، ئاسمان ساماڵ بوو، بەڵام زەوی ببوو بەقوڕ. بەدوای بێژەندا دەگەڕام ژنان و پیاوان ڕۆیشتن بۆ شیردۆشین، پێش ئەوەی پیاوان لەسەر بەردەکان دانیشن بۆ گرتنی سەری مەڕەکان منیش بەزوویی چووم لە سەر بەردێک دانیشتم، بەڵام هیچ ژنێک نەهاتە لای منەوە بۆ شیردۆشین. هەمووان بەترس و ساردییەوە سڵاویان لێدەکردم.

گڵپۆش هات، سەیرێکم کرد و ئەویش ڕووی وەرگێڕا، تێگەیشتم وا هەستدەکات

من لە ئەوان جیاوازم. ڕۆیشتم بۆلای ڕەشماڵەکەی بیبی. ئەو پیرەژنە فەرمووی لێکردم و منیش لە بەردەم ڕەشماڵەکەیدا دانیشتم. گوتم بیبی تۆ هیچ کاتێک ناچیت بۆ شیردۆشین؟ گوتی چۆن ناچم، هەر کاتێک مەڕەکان شیری زۆریان تێدا بێت منیش دەچم بۆ شیردۆشین.. گوتم تۆ خۆت مەڕت هەیە؟ گوتی بەڵێ چواردە سەر مەڕ و هەشت بزنم هەیە. گوتم کێ دەیاندۆشێت؟ گوتی خوشکەکەم. تازە بۆم دەرکەوت کەبیبی خوشکی ژنەکەی حاجی ڕۆستەمە.

ژنی خان نان و چای بەیانی بۆ هێنابووم بۆ نێو ڕەشماڵەکەم. بێژەن و ئەردۆش هاتن بۆ لام، بێژەن گوتی کارێکی باشت کرد شەو نەهاتیت، بارانێکی زۆر باری بەهیلاک دەچوویت، بە درێژایی شەو باران بوو. گوتم دەتوانم کەمێک وانەت فێر بکەم؟ گوتی ئێستا خەوم دێت. گوتم من دەمەوێت بگەڕێمەوە بۆ شار. گوتی بەسەلامەتی بڕۆیت. گوتم ئەگەر عەلی خان نەیەتەوە نازانم چۆن بڕۆم؟ گوتی یەکێک لە حوشترەکان بگرە و بیبە لەگەڵ خۆت، کە گەیشتیتە شار لەوێ حوشترەکە بەرەڵابکە و ئیتر خۆی دەگەڕێتەوە بۆ ئێرە.

بێژەن گوتی بەتەنها مەڕۆ بۆ شار، ڕووبارەکە ئاوی زۆرە و ناتوانیت بپەڕیتەوە، جادە و ڕێگاکەش لافاو هەمووی تێکداوە، تۆش نەشارەزایت، بۆیە وا باشە پەلە نەکەیت تاکو خان دەگەڕێتەوە. گوتم باشە، بەڵام ئەمڕۆ لەگەڵ تۆدا دێم بۆ کێو. ئەو هیچ قسەیەکی نەکرد و وەڵامی نەدامەوە، بەڵام من لەگەڵ بێژەن و ئەردۆدا دوای مێگەلەکە کەوتم و لەگەڵیاندا ڕۆیشتم. «پەلە»ش لەگەڵماندا هات، بێژەن چەند جارێک خۆی لە «پەلە» تورەکرد و پێیگوت بگەڕێوە تۆ ناتوانیت بێیت. ئەویش چەند هەنگاوێک دەگەڕایە دواوە و پاشان هەر وازی نەهێنا و هات لەگەڵماندا. ئاسمان ساماڵ بوو، لای نیوەڕۆ هەوا گەرم بوو، هەڵم لە زەوییەوە بەرزدەبووەوە. دوای نیوەڕۆ دونیا بوو بەتەم و خومار بە جۆرێک تەم وڵاتی داگرتبوو، بەباشی مێگەلەکەمان نەدەبینی. پێشنیوەڕۆ چەند وشەیەکم فێری بێژەن کرد. بێژەن گوتی موهەندیس تۆ سەرۆکی پۆلیسەکانیت؟ گوتم نەخێر، گوتی ئەی بۆچی ئەفسەری پۆلیسەکان لە تۆ ترسا و ڕۆیشت؟ گوتم باشە تۆ چۆن بیری لێدەکەیتەوە؟ گوتی من دەڵێم تۆ موهەندیس نیت، بەڵکو تۆ بۆ چاودێری ئێمە هاتوویت... هاتوویت تاکو بزانیت ئێمە چیدەکەین؟ زۆرم قسەم بۆکرد کە وانییە و من چاودێریی ئێوە ناکەم، بەڵام بێژەن قسەکانی منی بە گوێدا نەدەچوو، خۆی بەدوور دەگرت لە من، بەڵام ئەردۆ بە پێچەوانەوە زیاتر خۆی لێنزیک دەکردمەوە و زیاتر قسەی لەگەڵدا دەکردم. بێژەن قەڵەم و کاغەزی پێبوو. چەند و شەیەکیش فێر ببوو.

وای لێهات بوو زۆربەی پیتەکانی دەناسین. چەند کاتژمێرێک بوو دونیا تەمتومان بوو، هێشتا زەوی تەڕ بوو، لافاوەکەی چەند شەوی پێشوو چەندین ئاودڕی دروستکردبوو، لەوەڕگەکانی هەموو تێکدابوو، بە جۆرێک مەڕەکان نەیاندەتوانی بەباشی بلەوەڕێن. «یەلە» بزنێکی گرتبوو وەک و کاریلە بۆی کەوتبووە سەر چوار پەل و گوانی بزنەکەی دەمژی. چەند خولەکێک سەیرم کرد. بزنەکەش بەئارامی بۆی وەستا بوو، وەک ئەوەی بۆ کارژۆڵەکەی خۆی وەستابێت. «یەلە» هەڵسایەوە و گوتم تێرت خوارد؟ هیچی نەگوت، ئەمجارەش گوتم تێر بوویت. بە نیشانەی نەخێر سەری جوڵاند و پێکەنی بەرەو ناوەڕاستی مێگەلەکە ڕۆیشت و لەوێ بزنێکی تری گرت تاشیرەکەی بخوات.

نزیکی عەسر بوو، کاتێک گەیشتینەوە هەوارەکە. عەلی خان و کوڕەکانی لە شار گەڕابوونەوە. باری چەند حوشترێک خواردەمەنیان هێنا بوو. عەلی خان لە سەر بەردێک دانیشتبوو، کوڕەکانیشی خەریکی دابەشکردنی ئارد و شەکر و نان بوون لە نێوان خەڵکەکەدا. بۆ یەکەمجار عەلی خان لەبەرم هەڵسا، هەواڵی هاتنی پۆلیسەکانیان پێگوتبوو. عەلی خان تا شێروان ڕۆیشتبوو. گوتی هاوڕێکانت بەشوێن تۆدا دەگەڕێن. ئەوان لەبەر خاتری تۆ ئۆتۆمبێلێکیان لە شار داناوە و ئەو ئۆتۆمبێلە هاوکاری باشی خەڵکی کردووە لەکاتی لافاوەکەدا، هاوڕێکانت و دکتۆر عەباس گەڕاونەتەوە بۆ مەشهەد. تێگەیشتم لافاوەکە بۆتە هۆی ئەوەی گەشتەکەمان کۆتایی پێبێت. بە گەڕانەوەی عەلی خان و کوڕەکانی هەوارەکە گەشەیەکی پێوە دیاربوو. خان سەردانی مێگەلەکەی تریشی کردبوو. ئەم مێگەلە لە کاتی لافاوەکەدا، شوانەکەی بەرەو گوندێک بردبووی.بیستودوو سەر مەڕ لەو مێگەلە لافاو بردبوونی. دوو مەڕیشیان دابوو بە کوێخای گوندەکە. خان گوتی لافاوەکە زۆر بەرفراوان بووە، زۆر شوێنی گرتۆتەوە، ڕووباری قەلجەق زۆر هەڵسابوو. خەڵکی شێروانیش دوچاری لافاو ببوونەوە. ئێستا ژمارەیەک لە خەڵکی ئەو شارە لە ژێر ڕەشماڵدا دەژین، هیچ گوندێک نییە لەم ناوچەیەدا بەهۆی لافاوەوە زیانی پێنەگەیشتبێت، خەڵکەکە زیاتر لە دەوڵەت بە هانای لافاو لێدراوانەوە چووبوون، بەڵام هەموو کۆمەکەکان برابوون بۆ شارەکان و گوندەکانی نزیک شارەکان، بە هۆی نەبوونی جادەوە گوندە دوورەدەستەکان هیچ هاوکارییەکیان پێنەگەیشتووە و کۆچەرییەکانیش بەگشتی پشتگوێ خراون. عەلی خان گوتی تەواوی کشتوکاڵی جوتیاران لەنێوچووە. لە هەموو لایەکەوە بۆنی ئاژەڵی مردارەوەبوو دێت. لە هەر شیو و دۆڵێکدا کەلاکی چەندین ئاژەڵی ئاوبردوو هەیە. عەلی خان زۆر خەمی ئاژەڵەکانی بوو. دەیگوت تەنانەت لەوەڕگەکانیش ئاو بردونی، دەیویست بڕوات بۆ دێهاتەکانی دەوروبەر تاکو

شوێنە کشتوکاڵییەکانیان لێ ئیجارە بکات و بیانکاتە لەوەڕگە بۆ ئاژەڵەکانی. گوتی ئەم ئیجارەکردنە لە بەرژەوەندی جوتیاران و ئێمەشدایە، چونکە جوتیاران ئەمساڵ گەنم و جۆیان نابێت. ئێمەش ڕووبەڕووی کەم لەوەڕی دەبینەوە. بە عەلی خانم گوت دەمەوێت بڕۆم بۆ مەشهەد. ئەویش گوتی ئەگەر بۆمکرا سبەی ڕەوانەت دەکەم و ئەگەر بۆم نەکرا دوو سبەی خۆم هەر دەڕۆم بۆ شێروان و قوچان ئەوکاتە بەیەکەوە دەڕۆین.

خان منی برد بۆ ڕەشماڵەکەی خۆی. تێکڕای خەڵکەکە خۆیان دوورە پەرێزدەگرت لە من، بەڵام بە پێچەوانەوە عەلی خان هەڵسوکەوتی لەگەڵمدا زۆر لە جاران باشتر بوو. ئەو، وایهەست کردبوو من پەیوەندیم بە شوێنێکەوە هەبێت، چونکە پۆلیسەکان ڕێزیان لێ گرتبووم. ئەو خەڵکە هیچیان نەبوو تا لە دەستی بدەن، بەڵام بۆچی دەترسان، خانیش دەبوو سامانەکەی بپارێزێت، بۆیە بە هەر شێوەیەک بێت دەبوو خۆی بەهێز بکات. پێشتر من لە ڕوانگەی خانەوە خوێندکارێکی سادە بووم، بەڵام کاتێک ژن و منداڵەکانی بۆیان باسکردبوو چۆن پۆلیسەکان ڕێزێکی زۆریان لێگرتووم، بۆچوونی گۆڕدرا بوو. لە ڕەشماڵەکەی عەلی خاندا هەمووان هاتن بۆ بەخێرهاتنم، تەنها پەری خانم نەهات. من چاوم لە ئەو بوو، بەڵام ئەو نەهات بۆ لای ڕەشماڵەکە. نانی ئێوارەم لەگەڵ خاندا خوارد، گوتم ئەمشەو لەگەڵ بێژەن و ئەردۆدا منیش دەچم بۆلای مێگەلەکە. خان بانگی بێژەنی کرد. بێژەن هات و خان پێیگوت موهەندیس ئەمشەو لەگەڵ تۆدا دێت بۆلای مێگەلەکە وریابە سەرمای نەبێت. ئەویش گوتی بە چاوان. عەلی خان گوتی هەولبدە باش فێری خوێندن و نووسین ببە.

شەو لەگەڵ بێژەن و ئەردۆ بووم. پێش ئەوەی بڕۆین ئەردۆ گوتی موهەندیس ئەمشەویش باران دەبارێت، زۆریش دەبارێت، بەڵام بەهێز نابێت، ئەگەر لەگەڵماندا دێیت کەلوپەل بهێنە. منیش داوام لە عەلی خان کرد وڵاخێک و فەرەنجیەکم پێبدات. هاتمەوە بۆ ڕەشماڵەکەم، دوو خورجێن و پارچە ڕەشماڵێک و بەتانییەکم لەگەڵ خۆمدا هەڵگرت هەموویم خستە سەر پشتی وڵاخەکە، لە هەمان کاتدا «یەلە» پەیدا بوو گوتی کاکی چاودێر دەست و دەموچاوم شۆریوە. یەکەم جار بوو کەسێک من بەناوی چاودێر بانگ بکات. هەڵبەت کەسێک بە «یەلە»ی گوتبوو کە من چاودێری ئەوان دەکەم. لەگەڵ بێژەن و ئەردۆدا بەدوای مێگەلەکە کەوتین و ڕۆیشتین. «یەلە» ویستی لەگەڵماندا بێت، بەڵام بێژەن هەڕەشەی لێکرد نەیەت لەگەڵمان. منیش پێمگوت کە بڕاوت بۆ نێو ڕەشماڵەکەی من و لەوێ بخەوێت. ئەو شەوە من زیاتر لەگەڵ ئەردۆدا باسی ئەستێرەکانمان دەکردن. بێژەن وەک شەوەکانی پێشتر قسەی لەگەڵدا نەدەکردم،

سەرەتا لە من دەترسا، بەڵام وردە وردە لەگەڵمدا کەوتەوە قسەکردن. ئینجا بە بێژەنم گوت بۆچی دەتەوێت ببیت بەسەرپەرشتیاری شوانەکان؟ گوتی خان زۆرداری دەکات، دەمەوێت پێش بەزۆردارییەکانی ئەو بگرم. گوتم عەلی خان زۆرداری لەکێ دەکات؟ گوتی لە هەمووان، لە من، لە ئەردۆ، لە خەڵک، گوتی خان تەنانەت زۆرداری لەگەڵ ئەو گوێدرێژەشدا دەکات. جۆ بە گوێدرێژەکە نادات، ڕۆژانە لێیدەدات، ئەردۆ پێکەنی و گوتی تۆ ئەگەر ببیت بەسەرپەرشتیاری شوانەکان خۆ ناتوانی پێش لە زۆردارییەکانی خان بگریت، چونکە تۆ دەبیتە سەرپەرشتیاری شوانەکان، ئەو هەر کاتێک بیەوێت دەرتدەکات و ناهێڵێت چیتر سەرپەرشتیاری شوانەکان بیت، پێویستە تۆ ببیت بە خاوەن پارە. بێژەن گوتی چۆنی دەبم بەخاوەن پارە؟ ئەردۆ گوتی من لەبری تۆبم، بۆ خۆم مێگەلە مەڕێک دروستدەکەم و خۆم دەکەم بەخاوەنی مێگەلی خۆم. بێژەن گوتی چۆن ببم بەخاوەنی مێگەلی خۆم؟ ئەردۆ گوتی ئێستا چەند مەڕت هەیە؟ بێژەن گوتی هەشت مەڕ و پێنج بزنم هەیە و بیستوچوار بەرانیشم هەیە کە وەکو دیاری پێشکەشم کراوە. ئەردۆ گوتی ئەگەر بەرانەکانت بگۆڕیتەوە بەمەڕ دەتوانیت چل مەڕ وەربگریت، بەمەڕ و بزنەکانی خۆتەوە دەبیت بە خاوەنی پەنجا سەر مەڕ، ئێستا تۆ پاڵەوانیت، خەڵکی ڕێزت لێدەگرن، کەمێک پارەش قەرزبکە یا لە خەڵکانی تر بە قەرز چەند مەڕ و بزنێک بکڕە. ئەو کاتە دەبیتە خاوەنی حەفتا سەر مەڕ و بزن، لە ماوەی دوو ساڵدا دەبیتە خاوەنی مێگەلی خۆت. بێژەن کەمێک بیری کردەوە و پاشان ڕووی کردە من و گوتی موهەندیس ئەردۆ ڕاست دەکات؟ گوتم بەڵێ ڕاست دەکات، ئەگەر خۆت کار بۆ خۆت بکەیت زۆر باشترە. بێژەن سەرێکی لەقاند و گوتی تەواوە ئێوە ڕاستدەکەن ئیتر وادەکەم. بێژەن بەزوویی بڕیاری خۆی گۆڕی و گوتی من نامەوێت ببم بەسەرپەرشتیاری شوانەکان، بەڵکو دەمەوێت ببم بە خان.

گوتم بێژەن ئەگەر مەڕەکانت بفرۆشیت و پارچەیەک زەوی کشتوکاڵی بکڕیت و لە گوندێکدا دابنیشیت باشتر نییە؟ وەک ئەوەی قسەیەکی ناشرینم پێگوتبێت و ناڕەحەت بوو، بەتوڕەییەوە گوتی ئێمە لە گوند دانانیشین، ئێمە کۆچەریین ئێمە ڕەشماڵنشینین، ئێمە مەڕدارین، ئێمە مەڕێک بە گوندێک ناگۆڕینەوە، ئێمە ژیانمان لەگەڵ مەڕەکانماندایە، بەبێ مەڕ دەمرین. گوتم باشە ئەو کارە بکە کە ئەردۆ پێیگوتیت، خۆت مێگەلێک دروستبکە و خۆت ببە بەخان.. گوتی ئا.. ئا.. من دەمەوێت ببم بە خان. بێژەن بڕیارێکی گەورەیدا لەبری ئەوەی ببێت بە سەرپەرشتیاری شوانەکان، بڕیاریدا خۆی ببێت بەخان. گوتم کەواتە بنووسە دەبیت بەچی؟ قەڵەم و کاغەزی دەرکرد و ڕووناکی چراکەی زیاد کرد

و لە سەر زەوییەکە دانیشت. نووسی من دەبم بە خان. نەیتوانی بنووسێت (دەمەوێت) فێری ئەوەشم کرد و پاشان توانی بینووسێت، ئینجا نووسی من دەمەوێت ببم بەخان. من دەمەوێت ببم بەخاوەنی مێگەلی خۆم، من دەمەوێت ببم بە خاوەنی مەڕو بزنی خۆم. گوتم بنووسە من یەک مەڕ بە یەک گوند ناگۆڕمەوە ئەو ڕستەیەی چەند جارێک نووسی، بەڵام لەگەڵ نووسیندا دەبوو چاودێری مێگەلەکەش بکات. لەکاتی نووسیندا چەند جارێک جێگۆڕکێمان کرد. مێگەلەکە هێواش هێواش دەلـەوەڕا، زەوی وشک ببووەوە. دەبوو ئاگاداری مێگەلەکە بووینایە گورگەکانیش تێر بوون و مەترسییان نەبوو، سەگەکانیش هێمن ببوونەوە منیش لە ڕۆژانی پێشوو ئارامتر بووم.

ئەو ئەرکەی دکتۆر عەباس بەمنی سپارد بوو سەبارەت بە فێرکردنی بێژەن تەواوبوو. بێژەنم لە ماوەی هەشت شەو و ڕۆژدا فێری ئەوە کرد کە بتوانێت ڕستە بنووسێت. ئەوی تریش دەکەوتە سەرشانی خۆی. لە نێو ئەو هۆزەدا جگە لە خان و کوڕەکانی و کچەکانی هیچ کەسێکی تر خوێندەواری نەبوو. ئایا ئەوان هیچ هاوکاری بێژەنیان دەکرد؟ باشە ئەگەر خان چاوی بەدەفتەرەکەی بکەوتایە چیدەگوت. لەکاتێکدا بێژەن نووسیبووی من دەمەوێت ببم بە خان. کاتێک بێژەن ئەو ڕستەیەی نووسی و ئەردۆش گوتی ئەوا بوویت.

لە ئەردۆم پرسی ئەی تۆ دەتەوێت ببیت بەچی؟ بێ بیرکردنەوە و دوو دڵی گوتی من دەمەوێت ئاسمان بناسم، ئەستێرەکان بناسم، دەمەوێت هەمیشە شەو بێت و دانیشم و سەیری ئەستێرەکان بکەم، دەمەوێت هەور و با بناسم. گوتم تۆکە ئەستێرە و هەور و با دەناسیت لە کوێ فێربوویت؟ گوتی لە شوانەکەم. گوتم پێویستە تۆ ناوی گیاکان لە بێژەنەوە فێرببیت. گوتی من ناتوانم سەرم شۆڕبکەمەوە و گیاکان ببینم. من دەمەوێت سەرم لە ئاسمان بێت.

سەدەها کەسی وەک ئەردۆ لەم وڵاتەدا ژیانیان بە هەدەر ڕۆیشتووە. ئەم جۆرە کەسانە دەیانتوانی ببنە یەک هەواناس. وەیا ناوچەناس و فیزیازان و ئەستێرەناسی یەکەمی نێونەتەوەیی، بەڵام ئەم هەموو زانیارییە بە بەلاش ڕۆیشت.

ئەردۆ لە هەموو تەمەنیدا هەر شاگردی شوان بوو، هەرگیز نەبوو بە شوانێکی باش. سوودی هیچ جۆرە گیایەکی نەدەزانی. لە ساڵی (١٣٨٧- ٢٠٠٨) لە گوندێکی نزیک لە شێروان دەژیا، هەر لەو گوندەدا بەپیری و هەژاری و نەبوونی مرد.

نیوەشەو بوو بێژەن خەریکی نووسین بوو. دەنگی ئەردۆ دەهات و هاواری لە مێگەلەکە دەکرد. ئینجا ئەردۆ هاواری کرد و گوتی بێژەن تا نیو کاتژمێری تر باران دەبارێت، وەرە با مێگەلەکە کۆبکەینەوە. بێژەن گوتی بەم ساماڵە سافە؟ سەیری ئاسمانم

کرد پەڵەیەک هەور بە ئاسمانەوە بوو، هەورەکە هات و مانگەکەی داپۆشی بێژەنیش سەری بۆ ئاسمان بەرزکردەوە و گوتی قسەی ئەم شێتە هەمیشە ڕاست دەردەچێت. هەڵسا و قەڵەم و دەفتەرەکەی خستە نێو خۆرجێنی سەر وڵاخەکە و دارەدەستەکەی هەڵگرت و ڕۆیشت بۆ کۆکردنەوەی مێگەلەکە. منیش ئەو پارچە لبادەی لە سەری دادەنیشتبووم خستمە سەرپشتی وڵاخەکە و لایتەکەمم کوژاندەوە و فەرەنجییەکەم دا بەشانمدا و لە دوای بێژەنەوە ڕۆیشتم. مێگەلەکەمان لە گۆشەیەکدا کۆکردەوە.

هێشتا مێگەلەکە بەتەواوی کۆنەببووەوە کە بڵێسەی هەورە بروسکە ئەو ناوەی ڕووناک کردەوە، گرمەی هەورەکەش لە شاخەکەوە دەنگیدەدایەوە، یەکەم دڵۆپە باران هاتە خوارەوە، ئینجا بە لێزمە دایکرد، بەڵام پاش چەند خولەکێک هێواش بووەوە. ئیتر تا بەیانی بە بەردەوامی و بەهێواشی دەباری. منیش کڵاوەکەم بیرچوو بوو هەر چەندە لە ژێر فەرەنجیدا بووم، بەڵام ئاو بەسەرمدا دەڕۆیشتە خوارەوە تابنی پێم. هەوا زۆر سارد نەبوو. کاتێک دونیا ڕووناک بووەوە کەم کەم بارانەکەش خۆشیکردەوە. جۆگە ئاوەکان پڕ لە ئاو ببوونەوە. مێگەلەکەمان بە هێواشی بەرەو هەوارەکە لێخوڕی کە گەیشتینە هەوارەکە یەکڕاست چوومە ژێر ڕەشماڵەکەمەوە و لێی نووستم کاتێک بەخەبەر هاتم بێژەن و ئەردۆ مێگەلەکەیان بردبوو بەرەو کێوەکە بۆ لەوەڕ..

## نەخۆشی

هەستمکرد هەموو گیانم ئازاری هەیە و «تا»یەکی زۆرم هەیە، گوتم دەبێت هەر چۆنێک بێت خۆم بگەیەنمە شار، لە ڕەشماڵەکەم هاتمە دەرەوە، سەیرم کرد عەلی خان سواری ئەسپەکەی ببوو، سڵاوم لێکرد. گوتی موهەندیس ئەمڕۆ باش نووستیت، زۆرم بانگ کردیت خەبەرت نەبووەوە، من لەگەڵ منداڵەکاندا دەڕۆم بۆ کێو یەکێک لە مێگەلەکان نەهاتۆتەوە، دەبێت بڕۆم سۆراخێکی بکەم و بیاندۆزمەوە.

بە عەلی خانم گوت من دەبێت بڕۆم بۆ شار، گوتی تۆ ئێستا بۆ خۆت پشوو بدە، چاوەڕوانبکە تا ئێمە دەگەڕێینەوە ئەو کات بەیەکەوە دەڕۆین بۆ شار. منیش دووبارە گەڕامەوە بۆ ڕەشماڵەکەم، لەرزێکی زۆرم لێهاتبوو، لە ڕەشماڵەکەی خانەوە نانی بەیانیان بۆ هێنام، گوتم نەخۆشم و لەرزم لێهاتووە. پاش چەند خولەکێک بیبی هات بۆلام هەر بە دەستی خۆی فشاری خوێنی بۆ گرتم. گوتی موهەندیس تایەکەت زۆربەرزە. ڕۆیشت هەندێک شیری کوڵاوی هێنا و گوتی شیر بخۆ، بەڵام نەمتوانی هیچ بخۆم، پاش چەند خولەکێکی بیبی دووبارە هاتەوە یەک کاسە گیادەرمانی کوڵاوی

هێنابوو. کەم کەم گیانم بێهێز دەبوو هەستمدەکرد «تا»کە خەریکە دەمسووتێنێت، لەبەرخۆمەوە قسەم دەکرد. «یەلە»ش لە تەنیشتمەوە بوو، ئەو منداڵە زۆر خەمی منی بوو، بەڵام هیچ دەسەڵاتێکی نەبوو، بۆ ئەوەی من خۆشحاڵ بکات گوتی موهەندیس من دەست و دەموچاوم شۆردووە.

ورده ورده هەستم بەگێژ بوونی خۆم دەکرد، نەمدەزانی چ کاتێکە و لەکوێم؟ چەند کەسێک هاتنە ژێربالْمەوە و بردیانم بەرەو لای ڕەشماڵەکەی بیبی، ئەو پیرەژنە زۆر لە خەمی مندا بوو، گوێم لە دەنگی عەبداڵ و غەفار و برزوو و منداڵانی تر بوو، دەنگی خەڵکی تریشم دەبیست، لەرزوتایەکی زۆرم هەبوو، خەوم لێکەوت، نەمزانی دونیا تاریک بوو یان نا؟ هەستم بەوە دەکرد کات لە دوای کات بارم خراپتر دەبوو، تەواوی ئێسقانەکانم ئازاریان هەبوو، گیادەرمانییەکەی بیبی هیچ سوودێکی نەبوو. «یەلە» بەدەورمدا دەسوڕایەوە دیار بوو ئەو منداڵە نیگەرانی من بوو.

دەمزانی کە شەو و ڕۆژ دێت و دەڕوات، بەڕاستی وام هەستدەکرد کە لەم گۆشەی وڵاتەدا دوور لە دایکم دەمرم، وام لیهات هەستم بەهیچ شتێک نەدەکرد، تەنها گوێم لە دەنگی ئۆتۆمبێلێک بوو چەند کەسێک هاتنە نێو ڕەشماڵەکەوە. کاتێک دەرزییەکیان بە دەماری دەستمدا کرد هەستم بەشتێک کرد. لێفەکەیان لە سەر دەموچاوم لابرد، هەوایەکی فێنک بەر دەموچاوم کەوت، کاتێک چاوم کردەوە سەیرم کرد ڕەزا کامیل و عەزیزی هاوڕێم لە لامەوەن. بیبی بە خۆشحاڵییەوە هاواری کرد و گوتی منداڵینە، خەڵکینە، شکور بۆ خودا موهەندیس چاوی کردەوە. کەسێکی تریش لەولاوە دانیشتبوو، من نەمزانی ئەو کەسە دکتۆرە. بەهاوکاری دکتۆر ئەحمەد شەریفی لە ماوەی نێو ڕۆژدا توانیم دانیشم. ڕەزا کامیل، حاجی ڕەزای باوکی غەفاری لەگەڵ خۆیدا هێنابووەوە. ئەو چاوەکانی نەشتەرگەریی کردبوو، ڕووناکی بۆ چاوەکانی گەڕابووەوە، تێکڕای تێچووی نەشتەرگەرییەکەی دکتۆر عەباس لە ئەستۆی گرتبوو.

ئێوارە بێژەن و ئەردۆ گەڕانەوە بۆ هەوارەکە. ئەوان هاتن بۆ سەردانم. بێژەن یەک خورجێن گیای کێوی بۆ هێنابووم. دکتۆر ویستی لە ڕەشماڵەکەی مندا نەخۆشەکانی تریش چارەسەربکات، عەلی خانیش هات بۆلام.

ڕەزا کامیل گوتی تۆ چوار ڕۆژە نەخۆشیت، عەلی خان خۆی بەسواری حوشترهات بۆ شێروان و لەوێوە تەلەفۆنی کرد بۆ مەشهەد، ئێمەش لە قوچان بووین. دکتۆر عەباس لە ڕێگەی قائیمقامی قوچانەوە ئێمەی ئاگادارکردەوە، گوتی حسێن زۆر نەخۆشە و دکتۆرێک لەگەڵ خۆتاندا ببەن و بڕۆن بەهانایەوە. ئێمەش لەگەڵ عەلی

خان و عەزیز و ئەم دکتۆرە بەڕێزەدا هاتین، بەڵام جادەکە بەهۆی لافاوەوە زۆر خراپ ببوو لە شێروانەوە تا ئێرە بە چواردە کاتژمێر هاتین، چەند جارێک خەڵکی گوندەکان یارمەتییاندان، هەر کە لە قوڕ دەچەقین دەریاندەکردین. جارێکیش بە جۆرێک ئۆتۆمبێلەکەمان چەقی بوو کە ناچار بوون چوار گاجوتیان هێناو سەری حەبلێکیان بەگاکانەوە بەست و سەرەکەی تریشیان لە ئۆتۆمبێلەکە بەست و گاکان لە پێشەوە دەڕۆیشتن و ئۆتۆمبێلەکەیان ڕادەکێشا، خەڵکەکەش لە دواوە پاڵیان دەنا تا لەقوڕەکە دەریانکرد.

ئەو سەردەمە هێشتا سەردەمی گاجووت بوو، لە هەموو ئەو ناوچەیەدا کە من و هاوڕێکارانم کارمان تێدا دەکرد تەنها یەک تراکتۆرمان بینی، جگە لەو تراکتۆرە هیچ شتێکی تر نەبوو. واتە لە باکوروی بۆجنوورد و شێروان لە ساڵی (١٣٤٧-١٩٦٨) دا تراکتۆر زۆرکەم بوو.

دکتۆر گوتی ئێستا وا باشتر بوویت سبەی بەیانی زوو بەڕێدەکەوین و دەگەڕێینەوە، بەڵام ئاغای پاپۆلی تۆ بەتەنها لێرە چیدەکەیت؟ بێژەن گوتی ئەم موهەندیسە منی فێری خوێندەواری کردووە. منیش بێژەنم وەک پاڵەوانی ناوچەکە بە دکتۆر ناساند. بێژەن دەفتەرەکەی نیشاندام، نووسیبووی موهەندیس نەخۆشە ئەو باشبووە ئەو نامرێت. موهەندیس پیاوی باشە، من مەڕ و بزن دەکرم، من دەبم بە خان. هێشتا حاڵم باش نەببوو، بە عەزیزی هاوڕێم گوت تۆش هەڵەکانی بۆ چاک بکەرەوە. ئەردۆش هاتە نێو ڕەشماڵەکەوە زۆر خۆشحاڵ بوو، گوتی موهەندیس ئێمەت ترساند، بەڵام شکور بۆ خودا ئێستا باشبوویت. بیبی ئەو پیرەژنە میهرەبانە وەک دایکێک خزمەتی منی کردبوو، عەلی خان و کوڕەکانی و ژن و منداڵەکانیشی بەڕاستی خزمەتیان کردم.

ئەو کوردانەی خۆراسان وەک تەواوی گەل و هۆزەکانی ئەم وڵاتە خەڵکی میهرەبان و ڕاستگۆ و میواندۆستن. ئێمە لە ڕەشماڵەکەدا بووین «یەلە» هاتە ژوورەوە کە چاوی بەمن کەوت باش ببووم، زۆر خۆشحاڵ بوو. هاتوو لە تەنیشتمەوە دانیشت لە ناکاو گوتی موهەندیس من هەموو ڕۆژێک دەست و دەموچاوم دەشۆم، کە سەیرم کرد دەموچاوی پاک بوو، دیاربوو کە بەباشی شۆردبووی. دەستم بەسەری دا هێنا و «یەلە» هەڵسا و لە ڕەشماڵەکە ڕۆیشتە دەرەوە. پاش چەند خولەکێک بە پارچە کاغەزێکەوە هاتەوە لە سەر کاغەزەکە نووسرابوو من «یەلە»م. «یەلە» کاردەکات. گوتم «یەلە» کێ ئەوەی نووسیوە؟ گوتی خۆم نووسیومە. گوتم کێ فێری کردویت بنووسیت؟ گوتی بیبی فێری کردم، زۆرم پێخۆش بوو، بە «یەلە»م گوت، ئەگەر وانە

بخوێنێت دەبێتە پیاوێکی گەورە و گرنگ. تۆ زۆر زرنگیت بۆیە دەبێت بخوێنیت. «یەلە» هیچی نەگوت، بەڵام قەڵەمێکی لە گیرفانی دەرهێنا و لەگەڵ کاغەزێکدا دایەدەستم منیش وشەکانی خاک، ئاو، گیام بۆ نووسی، نیو کاتژمێر وانەم پێگوت. «یەلە» بەزوویی فێردەبوو. بیبی هات بۆ نێو ڕەشماڵەکەم، سوپاسم کرد و گوتم بیبی کارێکی باشت کردووە «یەلە»ت فێری خوێندن و نووسین کردووە. بیبی گوتی من خوێندەوارییەکی باشم نییە. هەندێک هۆنراوەم لەبەرە و دەتوانم بخوێنمەوە، بەڵام پەنجا ساڵە هیچم نەنووسیووە و ناتوانم بنووسم. «یەلە» کاتێک بینیبووی بێژەن دەنووسێت ئەویش حەزی بەخوێندن و نووسین کردبوو. خودا بکات ئەم منداڵە بێکەسە فێری خوێندن و نووسین ببێت. من و بیبی «یەلە»مان هاندەدا تاکو زیاتر هەوڵبدات و فێری نووسین ببێت. بیبی گوتی بە کچەکانی خان دەڵێم هاوکاری «یەلە» بکەن و فێری خوێندن و نووسینی بکەن.

عەلی خان هەموومانی بانگهێشت کرد بۆ ڕەشماڵەکەی خۆی. کاوڕێکی سەربڕی بوو، سفرەیان ڕازاندبووەوە. ئەو سێ چوار ڕۆژە باران باری بوو، بەڵام ئەو ڕۆژە باران نە دەباری و ئاسمان ساماڵ بوو. بێژەن لەگەڵ ئەردۆدا هات و گوتی موهەندیس ئێمە دەڕۆین بۆ لای مێگەلەکەمان. عەلی خان پێیگوتن مێگەلەکە زیاتر بەولاوە بەرن سبەی هەموومان کۆچ دەکەین و هەوارەکەمان دەگوازینەوە بۆ ئەولاتر، پاشان ڕووی کردە من و گوتی موهەندیس تۆش لەگەڵماندا دێیت؟ ڕەزا کامیل گوتی موهەندیس لەگەڵ ئێمەدا دەگەڕێیتەوە بۆ شار. حاڵم زۆر باش نەبوو، بەڵام هێزمدایە خۆم و هەڵسام و بێژەنم لە باوەش گرت، ئەویش وەک کەسێکی نزیک و هاوڕێیەکی کۆن باوەشی پێداکردم و گوتی موهەندیس زۆر حەزدەکەم جارێکی تر سەردانم بکەیتەوە و چاوم پێتبکەوێتەوە. گوتم با بەتەواوی باش ببمەوە، بەدڵنیاییەوە سەردانتان دەکەمەوە. گوتی بەڵێنم پێبدە کە پاش پازدە ڕۆژی تر بێیتەوە. ئەردۆش کاتێک خوداحافیزیی لێکردم دەستیکرد بە گریان. گوتم ئەردۆ ئەمشەو باران دەبارێت یان نا؟ گوتی تا چەند ڕۆژێکی ترباران نابارێت، ئیتر هەوا خۆش دەبێت هەر وەک چۆن حاڵی موهەندیس باشبووە.

ئەردۆ و بێژەن هەردوکیان ئەملاولای منیان ماچکرد و ڕۆیشتن. دکتۆر هەندێک دەرمانی لەگەڵ خۆیدا هێنابوو خەریکی چارەسەری نەخۆش بوو لە شوێنەکانی تریشەوە بەسواری ئەسپ خەڵکی هاتبوون. شەو لە ڕەشماڵەکەی بیبیدا نووستم، هاوڕێکانیشم لە ڕەشماڵەکەی من نووستبوون. «یەلە»ش هات بۆ ڕەشماڵەکەی بیبی. شەو لە ژێر

ڕووناکی فانۆسەکەدا چەند وشەیەکم فێری «یەلە» کرد. هەندێک کاغەزی سپی و دوو قەڵەمم دایە و ئەویش زۆرخۆشحاڵ بوو. «یەلە» لە هەمان شوێن و لە ڕەشماڵی بیبیدا نووست، چەند جارێک گوتی موهەندیس من هەموو ڕۆژێک دەست و دەموچاوم دەشۆم، ئەو کە قسەکەی منی لە گوێ گرتبوو، ڕۆژانە دەست و دەموچاوی دەشۆری و خۆشحاڵ بوو. ئەو شەوە تا بەیانی بە باشی نووستم، بەیانی زوو لە خەو هەڵیانسانم و گوتیان دەمانەوێت بەزوویی بڕۆین، خۆم هەستم بەخۆم دەکرد کە بۆگەنم لێدێت چواردە ڕۆژ بوو خۆم نەشۆری بوو، جلوبەرگەکەشم چڵکن بوو، خەڵکەکە هەموویان لە بەردەم ڕەشماڵی بیبی کۆببوونەوە. حاجی ڕەزا، حاجی ڕۆستەم، عەبدال، ڕەزا، غەفار، موحسین، گڵپۆ و تەواوی خێزانەکەیان، ڕەمەزان و کوڕانی هاوتەمەنی، خان و مەنوچەهر، بەڵام کچەکانی خان نەهاتبوون. هەموویان بەڵێنیان لێوەرگرتم کە جارێکی تر بگەڕێمەوە بۆ لایان. خۆشی و میهرەبانی گەڕابووەوە بۆیان، ئەو ترسەی لە من هەیان بوو بە هۆی ڕێزی پۆلیسەکانەوە لە لایان ڕەوی بووەوە. کات هەمووشتەکان چارەسەردەکات.

کاتێک کە نەخۆشکەوتبووم تێگەیشتبوون مرۆڤ مانای مرۆڤە. جا چ پۆلیسەکان لە ئەوان بترسن یا ئەوان لە پۆلیسەکان بترسن. لە کاتی ڕۆیشتنمدا بیبی پریاسکەیەکی بچکۆلانەی پێدام و زۆر بەهێواشی گوتی ئەوە دیاری گڵپۆیە من داوام لە گڵپۆ کردووە کە دیارییەکت پێشکەش بکات، دڵنیابە بۆتی جێبەجێ دەکەم، بەڵام دەبێت ماوەیەکی تر بێیتەوە بۆ سەردانمان.

عەلی خان ڕووی کردە ڕەزا کامیل و گوتی لە جادەی کەناری ڕووباری قەلجەقەوە بەرەو شار مەڕۆن. باوەکو دوێنێ تووشی ئەرک و ناڕەحەتی نەبن، خان حەیدەری کوڕی لەگەڵماندا نارد و گوتی لە سەر گردی ماهورەوە بەرەو تەکمەران بڕۆن. لەوێشەوە بەرەو جادەی (بۆجنوورد- مەشهەد) بڕۆن. بەیانی زوو بەڕێکەوتین و دوای نیوەڕۆ گەیشتینە شێروان، لەوێش لافاو هەڵسابوو. دکتۆر ئەحمەد شەریفی لەوێ لە ئێمە جیابووەوە. درەنگانێک بەخۆم و کەلوپەلەکانم و کۆڵێک یادەوەرییەوە گەیشتمەوە مەشهەد و چوومەوە ژوورەکەی خۆم. لە ماوەی چواردە ڕۆژدا خەڵکانی وڵاتی خۆم باشتر ناسین. کاتێک پریاسکە بچکۆلانەکەی گڵپۆم کردەوە، بینیم لاچاوکە و سەرپۆشێکی خۆی بەیادگاری بۆ ناردبووم، کچێک کە لە چەند قسەیەک زیاترم لەگەڵدا نەکردبوو، ئایا ئەو دەیویست بە هەر جۆرێک بێت لەو کێو و دەشتودەرە دوور بکەوێتەوە؟ ئایا ئەو کێو و بەندەنە سەرسەوزە کە وەک بەهەشتی خودا وابوو بۆ ئەو

زیندان بوو؟ ئایا بەڕاستی شار شتێکی هەبوو کە پێشکەش بە ئەوی بکات؟ ئایا من بەڕاستی شتێکم لە دەست دەهات کە ببمەمایەی خۆشگوزەرانی ئەو؟

بیبی ئەو پیرەژنە میهرەبانە کە دەیویست دڵەکان بەیەک بگەیەنێت. دەیگوت ئەم ژیانە زیندانی ئێمەیە. هەر کەسێک لە وەرزی بەهاردا بێت بۆ ئەم کەژ و کێوە خۆزگە دەخوازێت بەژیانی ئێمە، بەڵام هیچ کەسێک ئامادە نییە لە وەرزی گەرما و سەرما و سەهۆڵبەندان لەگەڵ ئێمەدا بمێنێتەوە. بیبی دەیگوت لە ئافاتەکانی سروشت خراپتر دەمی ئەو خەڵکەیە، قسەی ئەو خەڵکە زیندانی ئێمەیە. لێرە بچووکترین کارێک کە دژی دابونەریت بێت حەرامە، بچووکترین جووڵەی کچان و کوڕان و پیاو و ژن کە دژی دابونەریت بێت خەڵکی ڕووبەڕووی دەبنەوە. بیبی دەیگوت لەم جیهانە ڕووکەشەدا ئەو جوانیانەی کە وەک دۆزەخ وان پێویستە وەدەرنرێن.

ئایا ئەو گوندنشینانەی کە بارگە و بنەی خۆیان دەپێچنەوە بەرەو شارەکان کۆچدەکەن پێش ئەوەی بە ئومێدێکەوە بڕۆن، لە باری ئاڵۆزی ژیانیان ڕادەکەن؟ ئایا ئەوانەی کە وڵاتی خۆیان جێدەهێڵن پێش ئەوەی کە بگەنە ئەو بەهەشتەی لە مێشکیان دایە، لە دۆزەخ ڕادەکەن؟ یا ڕاکردنە لە مردن لە پێناوی ژیانیاندا، یا ڕاکردنە لە زیندانی وڵاتەکەی خۆیان بۆ هەڵمژینی کەمێک هەوای ئازادی. من ڕۆژانە لە تەلەفزیۆن کۆچبەرانی ڕاکرودووی نایاسایی ئەفەریقیایی و ئاسیایی دەبینم کە بە ڕێگەی هاتونەهاتدا وڵاتی خۆیان جێدەهێڵن بەبێ ئەوەی بزانن ئەو شوێنەی کە بۆی دەچن کوێیە؟.

بەیانی زوو لە حەمامی سەدەفی مەشهەد خۆم شۆری و خۆم خاوێن کردەوە، لە هەموو تەمەنمدا تەنها سێ جار ئەوەندە ڕیشم درێژبووە و نەمتوانیوە بیتاشم، جارێکیان ئەم پازدە ڕۆژە بوو، جارێکی تریش لە ساڵی (١٣٦٤-١٩٨٥) دا بە هۆیەکەوە کە پاشان باسیدەکەم. جارێکی تریش هەژدە ڕۆژ لە ساڵی (١٣٧٥-١٩٩٦) دا، لە خوێندنگەی ئەعلەمی مەشهەد میوانی هاوڕێ خۆشەویستەکانم بووم، خزم و هاوڕێکانی خودالێخۆشبوو غەفور ئاغای پێغەمبەرزادە منیان بانگهێشت کردبوو..

کاتێک ڕۆیشتمەوە بۆ زانکۆ هاوڕێکانم دەورەیان دام و دەستیانکرد بە پرسیارکردن. یەکێک دەیپرسی بەندەی خودا لە کوێ بوویت؟ ئێمە دەمانگوت لافاو بردویتی، یەکێکی تر دەیگوت لە نێو کۆچەریاندا خۆشت گوزەراند. کاتێک دکتۆر عەباسی سەعیدی چاوی پێمکەوت زۆر خۆشحاڵ بوو، چونکە زۆر نیگەران ببوو بۆم. ئەو لە ڕۆژی شەشەم و لە کاتی خراپبوونی کەشوهەوا و تۆفان و هەورە بروسکەکەدا گەڕابووەوە بۆ مەشهەد، باسی ئەوەم بۆ کرد کە لەوێ گیرمخوارد بوو بەهۆی نەبونی ئۆتۆمبێل و خراپبوونی

جادە و ڕێگاکەوە. پاشان چوار ڕۆژیش نەخۆشکەوتبووم. خوداڵێخۆشبوو دکتۆر لوتفوڵڵای مەفخەم پایان و ماموستای میهرەبان خانم دکتۆر زیبای خورسەند بە بینینم خۆشحاڵبوون. دکتۆر لوتفوڵڵا داوای لێکردم کەمێک لای دانیشم، ئەوە یەکەم جارم بوو بە تەنیشت ئەو بەڕێزەوە دابنیشم، هەرچی ماندوێتی و شەکەتییەکی لەم گەشتەدا چەشتبووم بەو میواندارییە بچووکە هەموویم بیر چووەوە. ماموستایانی ئەو سەردەمە خۆشەویستیان لە دڵدا بوو. دکتۆر لوتفوڵڵاش بە هەموو مانایەکەوە خۆشەویستی و میهرەبانی لە دڵدا بوو.

کەسێک کە شەوی پێشتر لە سەرە مەرگدا بوو خەریکی گیان لەدەستدان بوو، ئێستا هێزی داوەتە بەر خۆی تاکو دەستی ماموستا بەڕێزەکەی دکتۆر (محەمەد حەسەن گەنجی) ماچ بکات، بەڵام بەداخەوە ئەو ماموستا بەڕێزە واتا محەمەد حەسەن گەنجی لە تەمەنی (١٠١)ساڵی داو لە بەرواری (٣٠-٤-١٣٩٠=٢١-٧-٢٠١١) دا کۆچی دوایی کرد. ئەم ماموستایانە نموونەی ماموستای دڵسۆز و میهرەبان بوون. نەک ئەو کەسەی کە ئێستا بووە بە ماموستا و ماموستاکەی خۆی دەفرۆشێت بە سێسەدوپەنجا هەزار تومەن. هاوڕێیانی گەشتەکەم لە پۆلەکانی پێش منەوە بوون بەبینینی من خۆشحاڵبوون. دوو هەفتە دواتر ڕاپۆرتی کارەکەم لەگەڵ ئەو وێنانەی بەکامێراکەم گرتبوومن پێشکەشکردن بە دکتۆر عەباس سەعیدی. ئەویش دوای چەند ڕۆژێک بانگی کردم و پێی گوتم کە سیمینارێک ڕێکبخەم بۆ هاوڕێیانی زانکۆ و باسی دابونەریتی کۆچەرییان و گەشتەکەمیان بۆ بکەم.

پێچاوکە و سەرپۆشەکەی گڵپۆم بەتەنیشت قەرەوێڵەکەمەوە هەڵواسی، چاوەڕوانی کۆتایی ساڵی خوێندن بووم کە بڕۆم بۆشاخەکانی فاتمە خانی قوچان. نازانم بۆچی بڕیارمدا کە بڕۆم؟ بۆ ئەوەی شەوانە لەگەڵ مێگەلەکەدا بڕۆم بۆ سەردانیی بێژەن و ئەردۆ، بۆ سەردانی عەبدال و غەفار و تێکڕای ئەو کوڕە گەنجانە، بۆ سەردانی حاجی ڕۆستەم و حاجی ڕەزا و بیبی و عەلی خان و بنەماڵەکەی؟ بۆ سەردانیی سروشت و هێ هێی شوانەکان؟ بۆ خواردنی تریت و شیری مەڕەکان؟ بۆ نووستن لە سەر گیا و سەیرکردنی ئەستێرەکان؟ بۆ لێکۆڵینەوە دەربارەی ژیانی کۆچەرییان؟ یا بۆ سەردانی گڵپۆ؟ بە هەر حاڵ سەردانیی گڵپۆ لەگەشتی دواییدا نەخشێکی گەورەی هەبوو.

## ئامادەبوون لە هەوار

ڕۆژم دەژمارد تاکو تاقیکردنەوەی دەوری دووەم تەواوبوو. بە دکتۆر عەباسی سەعیدیم گوت، دەمەویت بڕۆم بەرەو هەواری هۆزەکان. ئەویش هەموو پێویستییەکانی لە ڕووی داراییەوە بۆ دابینکردم. ئۆتۆمبێلێکی لاندرۆڤەری بۆ دابینکردم کە شۆفێرەکەی قادر بوو. پێویستییەکانی تریش وەکو نەخشە، دووربین، کامێرا، بەرزپێو، ڕەشماڵێکی یەک کەسی و هەندێک کەلوپەلی ترم لە زانکۆ وەرگرت. ماوەی گەشتەکەم چوار هەفتە بوو، لە ماوەی سێ ڕۆژدا گەیشتمە کێوەکانی فاتمەخانی قوچان و چوومە هەوارەکانی عەلی خان. چونکە جادە نەبوو ئۆتۆمبێلەکە نەیدەتوانی تا هەوارەکەی عەلی خان بڕوات. ئەو شوێنەی کە ئۆتۆمبێلەکەمان لێ وەستاند، تاکو هەواری عەلی خان بە پێ چەند کیلۆ مەترێک بوو. قادریش لەگەڵمدا هات بۆ هەوارەکە، یەکەم کەس کە چاوم پێی کەوت عەبدال بوو.

عەلی خان پێشوازی لێکردم و فرمانی کرد بە زوویی ڕەشماڵێکم بۆ هەڵبدەن. بیبی کە چاوی پێمکەوت گوتی زۆر باش دەمزانی کەدێیتەوە بۆ ئێرە. گوتم بیبی بەڵام بەو شێوەیە نەگەڕاومەتەوە کە تۆ بیری لێدەکەیتەوە. بیبی گوتی من جگە لە خۆشی و شادی و سەلامەتی خەڵکی، بیر لە هیچ شتێکی تر ناکەمەوە. ئەم جۆرە ژنانە مایەی شانازی ئێمەن. ئەم گەشتە سەرەتای لێکۆڵینەوەم بوو لە نێوان هۆزە کوردەکانی خۆراساندا.

نەمزانی بێژەن چۆن زانیبووی کە من گەڕاومەتەوە، مێگەلەکەی سپاردبوو بە ئەردۆ، تاکو هەوارەکە بەڕاکردن هاتبوو، کە گەیشتە لام باوەشی پێداکردم و ئەملاولای ماچکردم، دواتر دەفتەرەکەی دەرهێنا و پیشانیدام، دەیان لاپەڕەی نووسیبووەوە. کاتێک من گەڕابوومەوە بۆ شار نزیکەی بیست پیت فێرببوو، بەڵام نەیتوانی بوو پیتەکانی تر فێربێت و بیاننووسێت، هەر بەهەمان ئەو بیست پیتە زۆرشتی نووسی بوو. بۆ نموونە نووسیبووی من زەماوەند دەکەم، ژن دەهێنم، من دەبم بە خان. گوتی دەبێت بەزوویی بگەڕێمەوە بۆ لای مێگەلەکە، هەر بۆیە بە زوویی ڕۆیشت. مەڕەکان شیریان کەم ببوو، تەنها بەیانیان مەڕەکان دەدۆشران، بۆیە دەیتوانی لە هەوارەکەوە دوورتر بڕوات.

چوار هەفتەی هاوین لە نێو هەوارەکانی کوردەکانی خۆراساندا لە کێوەکانی قوچان بووم. چەقی کارکردنم هەوارەکانی حاجی عەلی خان بوو. خان ڕەشماڵێکی تایبەتی بە من دابوو. قادریش یەکێک لە باشترین شۆفێرانی زانکۆی مەشهەد بوو. چەندین جار بەیەکەوە گەشتمان کردووە، ئەو منی بەسەخت ترین و ترسناکترین و دوورترین

جادەدا بردووە. دەیان جار بەیەکەوە بەشوێنی وادا ڕۆیشتووین کە بەهیچ شێوەیەک جادە نەبووە. چەندین جار لە شوێنە هەڵدێرەکان نزیک بووەتەوە و خەریکبووە بە خۆمان و ئۆتۆمبێلەوە هەڵدێرێین، بەڵام بەهۆی وریایی و لێزانی ئەوەوە ڕزگارمان بووە. بەهۆی سەختی ڕێگاکەوە کە ئۆتۆمبێلەکەمان جێهێشتبوو، بڕیار وا بوو ڕۆژی دواتر قادر بگەڕێتەوە بۆ مەشهەد.

دکتۆر عەباس بە ناونیشانی لێپرسراوی ئیداری زانکۆ، تەواوی نامە و پێویستییەکانی بۆ دابین کردبووم. زانکۆش بۆ خەرجیی چوار هەفتە بڕی هەشتسەد تومەنی پێدا بووم، بەڵام چونکە دەمزانی لە نێو هەواری کۆچەرییەکاندا هیچ پارەیەک خەرج ناکەم، بۆیە مەکینەیەکی شیرکوڵاندنم کڕی بە (٤٧٠) تومەن، کە دروستکراوی ئەڵمانیای خۆرهەڵات بوو. بەڕاستی حەزمدەکرد ئەو مەکینەیە وەک دیارییەک پێشکەش بە گڵێو بکەم، بەڵام عەقڵم مۆڵەتی ئەو کارەی پێنەدەدام. پاشان ویستم پێشکەشی بیبی بکەم چونکە ئەو خزمەتێکی زۆری بە من کردبوو. هەر چەند بیرمکردەوە پێشکەشی کێی بکەم، هیچ چارەم نەبوو جگە لەوەی کەمەکینەکە پێشکەش بکەم بەماڵی عەلی خان.

ئەم مەکینەی شیرە کاری ژنان لە مەشکە ژەندەن و کاری پیاوانیش لە دارهێنان لانیکەم دەجار کەم دەکاتەوە. جوتێک پۆتینیشم بۆ «یەلە» کڕیبوو بە چلوهەشت ڕیاڵ. دکتۆر عەباسیش یەک بوخچە جلوبەرگ و گۆرەوی بۆ «یەلە» ناردبوو. دیارە ئەو جلوبەرگە هی کوڕەکەی خۆی بوو، هی سەعیدی کوڕی بوو، کە پاشان بووبە باشترین دکتۆری منداڵان. جوتێک پێڵاوم بۆ بێژەن و بۆ ئەردۆش هێنابوو. سێ کەللە شەکر و بەتانییەکم بۆ بیبی کڕیبوو. هەندێک نوقڵ و چکلێت و بسکیتیشم بۆ عەبداڵ و غەفار و برزوو بردبوو. بۆ هەریەک لە ماڵی حاجی ڕۆستەم و حاجی ڕەزا، یەکی یەک کەللە شەکرم برد بوو. بەگشتی بایی (٦١٠) تومەن دیاریم لەگەڵ خۆمدا بردبوو. بەگشتی ئەو ماوەیەی کە لەلای ئەم هۆزانە بووم تەنها یەک تومەنم خەرج نەکرد. واتە ئەوان مۆڵەتیان نەدەدا کە هیچ پارەیەک خەرج بکەم. کاتێک کە گەڕامەوە پێنج تومەنیشم دا بە «یەلە».

«یەلە» پێڵاوەکانی لەپێ کرد بوو جلوبەرگەکەشی گۆڕیبوو ئەو منداڵە لەخۆشیاندا خەریکبوو باڵی دەگرت، بەو پێڵاو و جلوبەرگانەوە خۆی بەشازادە دەزانی. پێڵاوەکانی پیشانی هەموو کەس دەدا. ئەو چەندین شەو پێڵاوەکانی لەپێ دەکرد و پێیانەوە دەنووست. بوخچە جلوبەرگەکەشی لە ڕەشماڵەکەی بیبی دانا بوو.

کەشوهەوا زۆرخۆش بوو. شەوانە کەمێک سارد بوو، پێویستم بەکیسە خەو نەبوو

بەتانییەکی تەنکم لا بوو ئەوەم بەس بوو. لەوەرگەکەش باش بوو. خان سواری ئەسپ دەبوو بەهەوارەکانی ترەوە دەگەڕا و سەردانی مێگەلەکانی دەکرد، خان ڕاوچییەکی بەتوانا بوو، گۆشتی بنەماڵەکەی بەڕاوکردن دابیندەکردن. تەنانەت کوڕە بچووکەکەشی تفەنگچییەکی کارامە بوو. هەر نێچیرێکی ببینیایە، بەیەک فیشەک دەیکوشت. پەری خانمی کچیشی لەگەڵ هەموو کچانی تردا جیاوازی هەبوو. کچانی تر زیاتر لە نزیک ڕەشماڵەکان بوون و کاریاندەکرد و خەریکی یاریکردن بوون.

کچانی خان هەرگیز کاری مەشکە ژەندن و مەڕدۆشینیان نەدەکرد. پەری خانم جیاواز لە خوشکەکانیشی پوتی لەپێ دەکرد و قایشی تفەنگەکەی گورج دەکرد و تفەنگەکەی ڕاستوچەپ دەکردە شانی و ئەسپ سوارێکی بە توانا بوو، ئەسپێکی زۆر باشی هەبوو بەیەک خۆهەڵدان سواری ئەسپەکەی دەبوو، جارجاریش بەبێ زین سوار دەبوو، چەند جارێک سڵاومان لە یەکتری کرد، بەڵام دیار بوو ئەو حەزی بە بینینی من نەدەکرد، جگە لە سڵاو هەرگیز هیچ قسەیەکی تری لەگەڵدا نەدەکرم. کچەکانی تری خانیش هەر بەهەمان شێوە بوون، بەڵام پەری خانم وا دەردەکەوت کە ڕقێکی هەبێت و حەزی نەدەکرد چاوی بە من بکەوێت، ئەگەر من لە شوێنێک بوومایە ئەو نەدەهات بۆ ئەو شوێنە، ئەگەر لە ڕەشماڵەکەی خاندا، دانیشتمایە بەو ناوەشدا نەدەهات. هەندێک جار لە ڕەشماڵەکەی خانەوە دەنگێک دەهات دەیانگوت ئەوە پەری خانمە دوتار دەژەنێت، لەو هەوارەدا تەنها حاجی ڕۆستەم دوتاری هەبوو جارجار دەیژەنی، من کەسێکی مۆسیقی نیم و نەمدەزانی حاجی ڕۆستەم دوتار باش لێدەدا یان نا؟ بەڵام من زۆر حەزم لە دەنگی دوتارەکەی بوو.

هەژدە شەو لەگەڵ شوانەکاندا بووم دوازدە شەویان لەگەڵ بێژەن و ئەردۆ بووم، شەوەکانی تریش لەگەڵ شوانەکانی تر، لەگەڵ سەفەر و خەسرەو و برزوو بووم. زۆر شت لە شوانەکانەوە فێربووم. ئەوساڵە بەهۆی بارانی زۆرەوە کێوەکان سەرسەوز بوون. دار و درەخت پڕ شەوق و جوان بوون. ئاژەڵی کێویش زۆر بوو، مەڕەکان باش دەلەوەڕان و تەواو قەڵەو ببوون، کچانی خان بە جلوبەرگی ڕەنگاوڕەنگی جوانەوە سواری ئەسپ دەبوون، ئەوان لە سەرلا و هەردوو قاچیان بەیەک لادا شۆڕدەکردەوە لەسەر ئەسپەکە.

یەکێک لە کچەکانی خان ناوی فەریبا بوو، کچێکی زۆر میهرەبان بوو. ئەو لە کچەکانی تر زیاتر لە بیری خەڵکەکەدا بوو. کچێکی باڵابەرز بوو، زۆربەی کات بسکەکانی لە ژێر سەرپۆشەکەیەوە دەهێنایە دەرەوە، قژێکی درێژی هەبوو، ئەو تەنها

کچی خان بوو کە زۆربەی کات بەشێوەی کچانی شار خۆی دەڕازاندەوە، بەژن و باڵایەکی زۆر جوانی هەبوو، تەواو نموونەی کچی کورد بوو، چاوەکانی گەورە و ڕەش بوون، دوو برۆی کەوانی هەبوو، زۆر گورجوگۆڵ و چالاک بوو ئەسپسوارێکی باشیش بوو، بەڵام وەک پەری خانمی خوشکی نە دەبوو لە ئەسپ سواریدا.

ڕۆژێک فەریبا خەریکی ناڵکردنی ئەسپەکەی بوو، ئەسپەکە نەدەوەستا و جوتەی دەهاویشت، ئەویش هونەری خۆی نواند و ئەسپەکەی لە زەوی تەختکرد. ئەسپەکە ماوەیەک لە سەر زەوی مایەوە و پاشان بڵند بوو هەڵسایەوە، ئینجا ئەسپەکە ئارام بووەوە و ناڵی کرد. لە شایی و هەڵپەڕکێدا ئەو هەمیشە سەرچۆپیگر بوو، زۆر جوان شایی دەکرد. پەنجەکانی درێژ بوو بۆ پیانۆ لێدان باش بوون، فلوتیشی باش لێدەدا. دیار بوو کە توانایەکی زۆر باشی هەبوو، زۆرم حەزدەکرد لەگەڵیدا تێکەڵ ببم، بەڵام دیوارە کۆمەڵایەتییەکان بەرزتر بوون لە هەموو دیوارەکانی تر، خۆ هەر دیاریش بوو کە منداڵانی خان نەیاندەویست لە من نزیک ببنەوە. عەلی خان بۆ خۆیشی هەرچەندە ڕێزی دەگرتم و خولقی دەکردم، بەڵام لە زۆر شتدا خۆی لە من دووورە پەرێز دەگرت. لە هاویندا کاری ئاژەڵداریی ئاسانتر و کەمترە، خان زیاتر دەچوو بۆ شار و فریای تەواوی کارەکانی دەکەوت، دەیانگوت خان بازرگانی دەکات. بازرگانی ڕۆن، پەنیر، کەشک و خوریی دەکرد. بەرهەمە ئاژەڵییەکانی لە خەڵکی گوند و هەوارەکان دەکڕی و دەیبرد لە تاران دەیفرۆشتەوە، ئەم قسانە حاجی ڕۆستەم و بێژەن گوتیان.

جارێک ویستم لە بیبی و بێژەن و خەڵکی تر پرسیار بکەم، سەبارەت بەچۆنێتی ژیانی عەلی خان و کوڕ و کچەکانی شتێک بزانم، بەڵام هەریەکە و بە جۆرێک وەڵامی دامەوە و تاڕادەیەکیش خۆیان بە دوور دەگرت لە وەڵامدانەوە.

فەریبا دەیان جار لە گڵپۆ جوانتربوو، بەڵام من دڵم هەر لە سەر گڵپۆ بوو، فەریبا جوانتر و پارەدارتر بوو، شوێنی کۆمەڵایەتیشی باشتربوو، جلوبەرگیشی لە گڵپۆ جوانتر و ڕازاوە تربوو، لە گڵپۆ نەرم و نیانتربوو، بەڵام من زیاتر حەزم لەو دەستە زبرانەی گڵپۆ بوو. عیشق لە دڵدایە نەک لە مێشک. خۆ ڕەنگە وا بیرم کردبێتەوە گڵپۆ بۆ من پاروویەکی ئاسانترە تا فەریبا.

کەسێک کە لە هەمووان خۆشحاڵتر بوو بە چوونی من بۆ هەوارەکەیان «یەلە» بوو. «یەلە» هەمیشە لەگەڵ مندا بوو، هەرگیز لێم دوور نەدەکەوتەوە، هەموو ڕۆژێک یەک کاتژمێر «یەلە»م فێری نووسین دەکرد، ئەویش زۆر بەخێرایی فێری نووسین و ناسینی پیتەکان دەبوو، خێرایی فێربوونی چەند بەرانبەر بە بێژەن بوو، کاتێک لە

شوێنێکەوە دەچووم بۆشوێنێکی تر «یەلە» لەگەڵمدا دەهات، تەنانەت نزیکەی دە شەو بۆ شوانی لەگەڵمدا هات. بیبی دەیگوت خۆزگە بۆمان دەلوا ئەم منداڵەمان لە گوندێک دانایە کە خوێندنگەی تێدابووایە، تا بە تەواوی فێری نووسین و خوێندن ببێت، پاشان هەر خۆیشی دەیگوت چ کەسێک ئامادەیە منداڵێکی زیادە لە خۆی بکات بەبار؟

«یەلە» خورجێنێکی دڕاوی پەیداکرد بوو، خورجێنەکەی لە ڕەشماڵی بیبی دانا بوو هەر کەسێک شتێکی پێبدایە دەیکردە نێو ئەو خورجێنەوە. بیبی پێیگوتبوو، ئەگەر هەر کەسێک پێیگوتی کارێکم بۆ بکە، کارەکەی بۆبکە و لەبەرامبەر کارەکە شتێکی لێ وەربگرە. «یەلە»ش لە هەر کەسە و شتێکی وەردەگرت، تەنانەت لەوانەش شتی وەردەگرت کەکاری بۆ نەدەکردن. هەندێک کەشک، خوریی، نان، ڕۆنی کۆکردبووەوە و خەریکبوو خورجێنەکەی پڕدە بوو. دەبەیەکی بچووکیشی هەبوو ڕۆنی تێدابوو، شتەکانی تری هەموو تێکەڵ کردبوو، واتە کەشک و پەنیر و خوریی و نانی هەمووی بەسەریەکدا تێکەڵ کردبوو. بیبی چەند کیسەیەکی بۆ دروست کرد بوو، کەشک و خوریی لێک جیاکردەوە. بیبی تورەکەیەکیشی بۆ دروست کرد و بۆی کردە ملی و پێیگوت کاتێک کەشک و پەنیرت لە خەڵکی وەرگرت بیکەرە ئەم تورەکەیەوە. لەکۆتاییدا «یەلە» بە هەوڵی بیبی فێربوو کە بۆ خۆی شت کۆبکاتەوە. بیبی پێیگوتبوو، بە بەلاش کار بۆ هیچ کەسێک نەکات، منیش ئەوەندەی لە تواناما هەبوو هەوڵم لەگەڵ «یەلە» و بێژەن دەدا بۆ فێربونی نووسین و خوێندن.

لە هەوارەکەدا پیاوان و منداڵان بە بەردەوامی کاریان دەکرد و هەموو جۆرە کارێکیان دەکرد. ئەو کارانەی کە پەیوەست بوون بە پیاوانەوە، پیاوان ئەنجامیان دەدا ئەو کارانەش کە پەیوەست بوون بەژنانەوە، ژنان ئەنجامیان دەدا. ژنە سادەکانی هۆزەکە گیانیان دەردەچوو لە بەیانی زووەوە تا نیوەشەو لە کارکردندا بوون. جگە لە عەلی خان ژنەکانی ئەویش هەر کاریان دەکرد. هەرچەندە مەڕەکان شیری زیاتریان تێدا بووایە ژنان دەبوو زیاتر کاربکەن. دەنگی مەشکەژەندنیش بە بەردەوامی دەهات.

ئەوان لە پێش بانگی بەیانییەوە هەڵدەسان بۆ مەشکەژەندن تاکو کاتی چێشتەنگاو. ئیتر دوای مەشکەژەندن دەبوو بچوونایە بۆ ئاوهێنان، جاری وا هەبوو کانی و ئاوەکە یەک، دوو کیلۆ مەتر لە ڕەشماڵەکانەوە دوور بوو. ئاوهێنان لە ئەستۆی ژناندا بوو، پاش ئاوهێنان ئیتر نان و چای بەیانیان ئامادە دەکرد. ئەوان منداڵی بچووکیان هەبوو، بە پارچە قوماشێک منداڵەکانیان دەبەست لە پشتیان و کارەکانیان ئەنجام دەدا. پاشان مێگەلەکە دەهاتەوە و بەزوویی دەچوون بۆ شیردۆشین و شیرەکەیان دەکوڵاند و

دەیانکرد بە ماست. ئێواران و شەوانیش مەشکەیان دەژەند، مەنجەڵی گەورەیان هەبوو پڕیاندەکرد لە شیر و جێگۆڕکێیان پێدەکردن و دۆکەیان دەکوڵاند و شیرێژەکەی سەردەکەوت و پاشان شیرێژەکەیان دەگرت و دەیانکردە کیسەوە تا ئاوەکەی بەتەواوی دەچۆڕایەوە دواتر کەمێک خوێیان پێوە دەکرد و بە دەست دەیانکردە پارچەی خڕخڕ و دەبوو بە کەشک. لەسەر ئەو هەموو کارەوە بە منداڵەکانیشیان ڕادەگەیشتن و شیریان پێدەدان و خاوێنیان دەکردنەوە و خواردنیان بۆ پیاوەکانیان ئامادە دەکرد. ژنان بەبێ وەستان و بە بەردەوامی کاریان دەکرد. کاتی عەسر دووبارە مێگەل دەهاتەوە و دووبارە شیردۆشین دەستی پێدەکردەوە. ئەگەر لە ڕۆژێکدا کەمێک بێکار بوونایە، ئەوا خەریکی ڕەشماڵ چنین دەبوون. ژنان نەدەبوو بێکاربن، مەنجەڵی گەورەی (مس)یان هەبوو دەیانشۆرین، خۆیان زۆر بە چێشتلێنانەوە خەریک نەدەکرد، هەفتانە لە یەکجار زیاتر چێشتی گەرمیان نەدەخوارد، هەر بۆیەش زۆر قاپوقاچاغیان نەدەشۆری، هەڵبەت پیاوانیش بە بێوەستان خەریکی کارکردن بوون.. چەند کەسێک لە دووری بیست مەتر لە ڕەشماڵەکانەوە خەریکی وردکردنی گۆشتی ئاژەڵی کێوی بوون، کە ڕاویان کردبوو، گۆشتیان دەبرژاند و کەبابیان دروستدەکرد بۆ ماڵی خان. بۆنی دوکەڵەکەش بە سەر خەڵکەکەدا دەچوو، ئاو بە دەمیاندا دەهاتە خوارەوەوە. هەندێک لە گۆشتی ئاژەڵە کێوییەکان دەدرا بە پۆلیسەکان، یان بەدیاری دەیانبرد بۆ شا. ئەوەندەی ئەو چوار هەفتەیە گۆشتی ئاژەڵی کێویم خوارد لە هەموو تەمەنمدا نەمخواردبوو.

لەبری سوپاسکردنی عەلی خان دەمەوێت تۆڵەی لێبکەمەوە. سیستەمی ئاژەڵداریی و ئاژەڵ بەخێوکردنی عەلی خان، لە کارگەیەکی گەورە دەچوو، مەکینەی هەڵسوڕانی کارگەکەش ژنان بوون، کە بێوچان شەو و ڕۆژ لەکارکردندا بوون. ژیان بەو جۆرەیە، عەلی خان و کچەکانی دەچوون بۆ ڕاو، ئەو ئاژەڵانەی دەیانکوشتن خۆیان گۆشتەکەیان دەخوارد و هەندێکیان دەکرد بە دیاری بۆ بنکەی پۆلیس و بۆ دۆستەکانیان لە شار، بەڵام خەڵکی هەوارەکەی خۆیان کە خزمەتی ئەوانیان دەکرد، سەر و قاچ و ورگ و ڕیخۆڵەی ئاژەڵەکەیان بەردەکەوت. بێگومان گەنجانی هەوارەکەش ڕاویان دەکرد، بەڵام ڕاوی کەو و کەروێشک.

ژنە برسییەکان کە منداڵیان لەسکدا بوو، یاخود منداڵیان بە پشتیانەوە بەستبوو، دەبوو هەمیشە سەرگەرمی کارکردنبن. منداڵەکانی خودالێخۆشبوو خەینسا وێڵ و سەرگەردان ببوون لە هەوارەکەدا، ئەوانیش هەریەکەیان «یەلە» یەک بوون بۆ خۆیان، باوکیان بەردەوام خەریکی کارکردن بوو بۆ ماڵی خان، هیچ کەسێک نەبوو بەو منداڵانە

ڕابگات.. باوکە هەژارەکەیان نەیدەتوانی هەم کار بکات و هەم ئاگاداری منداڵەکانیش بێت. کچە (١٣-١٤) ساڵەکەی خەینسا دەبوو، خوشک و برا بچووکەکانی کۆبکاتەوە و سەرپەرشتییان بکات.

ڕۆژێک بینیم «یەلە» خەریکە هێلکە دەدزێت. گوتم «یەلە» ئەو هێلکەیەت بۆ کێیە؟ گوتی دەیدەم بە نێرگزی کچی خەینسا. گوتم بۆچی نێرگز هێلکە و ڕۆنت بۆ دروستدەکات؟ گوتی نەخێر نێرگز هێلکە و ڕۆن بۆ مچۆل و خوشکەکەی دروستدەکات. مچۆل کوڕی خەینسا بوو هاوتەمەنی «یەلە» بوو. مچۆل قاچێکی شەل بوو هەمیشە نەخۆش بوو. «یەلە»ی تەمەن (٦-٧) ساڵی بێکەس و برسی، لە غەمی مچۆلدا بوو. هێلکەی بۆ ئەو دەدزی.

ئەو خەڵکە لە وەرزی بەهار و سەرەتای هاویندا دەبوو بە بەردەوامی کار بکەن بۆ ماڵی خان، پشوودانیان نەبوو. ئەم سروشتە جوانە بۆ ئەم خەڵکە هەژارە جگە لە بێگاری و خزمەتکاری شتێکی تر نەبوو. ژنانی میانساڵ ئەوەندە کاریان دەکرد و مەشکەیان دەژەند و بێخەویان دەکێشا، هەر ساڵە و چەند کەسێکیان لێ دەمرد، بەهۆی لێدانی سەکتەی دڵەوە. ئەو ژنانەی شانسیان هەبووایە، یەکراست دەمردن، بەڵام ئەگەر ئیفلیج بوونایە دەبوو بۆ پاروەوە نانێک لە گوندەکان و دەوروبەری شارەکاندا سواڵیان بکردایە تاکو دەمردن.

ئای خەڵکی شار ئەو پاروەوە نان و گۆشت بەرخەی کە دەیخۆن بەرهەمی کار و ڕەنجی داماوترین و هەژارترین کەسانی ئەم وڵاتەیە، بۆیە پێویستە لانیکەم دەست بە خۆراکەوە بگرن و زیادە خەرجیی نەکەن. خۆ کرێکارانی بەخێوکردنی مانگا، ژیانیان زۆر لە ژیانی ئەم کۆچەرییانە خراپترە. لانیکەم خێڵە کۆچەرییەکان هەوایەکی پاک هەڵدەمژن. خەڵکی کۆچەریی هەموو کارێکیان دەکرد. داریان دەهێنا، خورییان دەڕست، میوەی کێوی وەکو گوێژ و بەڵاڵوک و زرشک و هەنجیریان کۆدەکردەوە. لە بەهاردا کنگر و قارچکیان کۆدەکردەوە. ئەوانە هەمووی بۆماڵی خان بوو. مووچەی ئەو خەڵکە زەحمەتکێشە مانگی تەنها پێنج مەن ئارد و پێنج ڕیاڵ پارە بوو. کاتێک کە چوومە نێو ڕەشماڵی ئەو ماڵە کۆچەرییانەوە، هەژارییەکی لەڕادەبەدەرم بینی. دیارە خێڵەکانی تر، ژیانیان لەخێڵەکەی حاجی عەلی خان کەمێک باشتربوو، هەر ماڵێک نزیکەی (٦٠-٧٠) سەر مەڕیان هەبوو. هەندێک ماڵیش هەبوون نزیکەی سەد سەر مەڕی هەبوو، بۆیە تاڕادەیەک ئەمانە باری ژیانیان باشتربوو. خۆ دیارە ژیانیان وەک ژیانی عەلی خان نەبوو، وەکو کرێکارەکانی عەلی خانیش نەبوون. لە هەر هەوارێک چەند کەسێکی

هـەژاری وەک کرێکارەکانی عەلی خان هەبوون، ڕەنگە هەندێک خراپتریش بووبن. خەڵکەکە بەگشتی نەخوێندەوار و هەژار بوون، نەزانینی زمانی فارسیش ئەوەندەی تر هـەژاری کردبوون و سەری لێ تێکدابوون. ئەو خەڵکە چونکە بۆ هیچ شوێنێک نەڕۆیشتبوون و هیچ جێیەکیان نەدیبوو، وایاندەزانی هەموو دونیا بریتیە لەو چەند کیلۆمەترەی کە ئەوان تێیدا دەژین.

ڕەمەزان پیاوێکی تەمەن چلوپێنج ساڵ بوو، یەکێک بوو لە خزمەتکارەکانی عەلی خان. ڕەشماڵەکەی کەمێک لە ڕەشماڵی خانەوە دوور بوو، ئەو شوان نەبوو، بەڵکو دار و چیلکەی بۆماڵی خان دەهێنا و برینی لەشی گوێدرێژ و ئەسپ و حوشترەکانی پاکدەکردەوە و ڕنەکی دەکـردن. هەواڵەکانی خانی دەگەیاندە هـەوارەکانی تر و وەڵامەکەی بۆ خان دەهێنایەوە. ژنێک و هەشت منداڵی هەبوو، لە بەیانییەوە تا شەو بە بەردەوامی کاری دەکرد. لێم پرسی لە تـەواوی تەمەنتدا چ کاتێک پارەی زۆرت هەبووە و چەندت هەبووە؟ گوتی موهەندیس چەند ساڵێک پێش ئێستا پارەم هەبوو. گوتم چەندت هەبوو؟ گوتی بیستوپێنج ڕیاڵم هەبوو. ئەو لە تەمەنی چلوپێنج ساڵیدا زۆرترین پارە کە لە گیرفانی خۆیدا دیبووی تەنها بیستوپێنج ریاڵ بووە. لە ساڵی (١٣٤٧-١٩٦٨) هێشتا بەشێک لە کۆمەڵگەی خێڵەکی وڵات هەروەکو هۆزە کوردییەکان پەیوەندییان بە پارەوە نەبوو. خان ئارد و شیر و خوریی و جارجارێکیش هەندێک گۆشتی دەدا بە کرێکارەکانی. هەر بە چەند ساڵ جارێکیش یەک دەست جلی کۆنی پێدەدان، بەڵام ئەگەر کەسەکە شوان بووایە ساڵی فەرەنجییەک و چەند شەق و زڵلە و هەندێک جوێن و کوتەک کارییشی وەردەگرت.

ئێمە وا بیردەکەینەوە هەر کەسێک فەرمانبەری بانک بێت وا دەزانین پارەی زۆرە. هەر کەسێک لەگوند نیشتەجێ بێت باخ و خانووی هەیە. هەر کەسێک کۆچەریی بێت مەڕدارە. لەو ساڵانەدا هێشتا لە شارەکاندا کار نەبوو، زۆربەی خێڵەکییەکان ئاژەڵیان نەبوو یان هەندێکیان هەیانبوو، بەڵام زۆرکەم.

خودالێخۆشبوو دکتۆر نادری ئەفشار نادری، لە لێکۆڵینەوەی هۆزەکاندا لە دەیەی (١٣٤٠-١٩٦١) کاندا، تێکڕای ئاژەڵی بۆ هەر ماڵێک لەو کۆچەرییانە بە سیوپێنج سەر مەڕ دیـاری کردبوو، کاتێک ئاژەڵی هەر ماڵێک لە کۆچەرییەکانی وڵات سیوپێنج سەر بوو، تۆ پاشماوەکەی بخوێنەرەوە. داهاتی ئەم خەڵکە هەژارانە دەبێت چەند بووبێت؟ دکتۆر نادری دەنووسێت ڕۆژێک لە پیاوێکم پرسی نانت خواردووە؟ گوتی بەڵێ خواردوومە. گوتم نانت بە چی خوارد؟ گوتی بە ددانەکانم خـواردم. واتە ئەم

پیاوە کۆچەرییە هەژارە لەبیری ئەوەدا نەبووە کە دەبێت نانەکەی بە شۆربایەکەوە یان بە شتێکەوە بخوات. سوێند بەخوای گەورە منیش لەو سالانەدا کە لەنێو ئەو کۆچەرییانەدا بووم، لانیکەم دە جار لەو جۆرە وتانەم لە منداڵ، گەنج، ژن و پیاو بیستووە. نانخواردن بە ددان زیاتر پەیوەندی بە برسێتی و هەژارییەوە هەبووە. ئەگەر کەسێک لە «سەردەمی بەرد»دا ژیابێت هەر وەکو سەردەمی بەردیش بیردەکاتەوە. ئەو خەڵکە زۆر بەکەمی شاریان بینیبوو، کەسانی وەکو عەلی خان و بنەماڵەکەی و بیبی لە ناوچەکە و لە نێو تێکڕای کۆچەرییەکاندا زۆر کەم بوون. لە سەدا یەکی خەڵکەکە چاوکراوە نەبوون، بەڵام بەگشتی خەڵکانێکی دڵپاک و سەرڕاست و ڕاستگۆ بوون. ئەوان هیچ هەواڵێکیان لەم جیهانە و لە سەردەمەکان نەبوو. نە ڕادیۆ هەبوو، نە ڕۆژنامە و کتێب، نە خوێندەواریی، نە قوتابخانە هەبوو، نە ماموستا هەبوو، تازە خەریکبوو سوپای نەهێشتنی نەخوێندەواریی دەگەیشتە گوندەکان و ڕووناکییەکیان دەخستە نێو خەڵکەوە، بە قەڵەم و کاغەز خەڵکیان لە سەردەمی بەردەوە دەبرد بەرەو سەردەی مۆدێرنێتە، بەڵام کوردە کۆچەرییەکانی باکووری خۆراسان لە ساڵی (١٣٤٧-١٩٦٨) دا، لە نیعمەتی قوتابخانەی گەڕۆک سوودمەند نەبوون. ڕاستییەکەی ئەوەیە بنبڕکردنی نەخوێندەواری لە وڵاتی ئێمەدا کارێکی گرانە. لە ساڵی (١٣٩١-٢٠١٢) دا، هەندێک کەس وایان بڵاو کردەوە لە وڵاتدا دە ملیۆن نەخوێندەوار هەیە. وێڕای ئەو هەموو هەوڵ و تێکۆشانە هێشتا دە ملیۆن نەخوێندەوار لە وڵاتدا هەیە؟

ئەو خەڵکە هەموو کاریان دەکرد و نزای خێریان بۆ خان کرد، لە ماندووبووندا دەمردن و دەیانگوت ئەوە خواستی خودایە. کاتێک بە هۆی کارکردنی زۆرەوە ئیفلیج و پەککەوتە دەبوون ڕوویان لە دێهاتەکان دەکرد و دەبوونە دەرۆزەکەر و دەیانگوت ئەوە خواستی خودایە. خۆ، ئەگەر کەسێکیش نەخۆشبکەوتایە دەیانگوت ماڵی حەرامی خواردووە و حەرامخۆر بووە. لەگوندی (ئەسپەروچ) پیاوێکی خێڵەکیم بینی کە سەکتە لێدابوو، تووشی ئیفلیجی ببوو، خەڵکی گوندەکە کۆمەکیان دەکرد، زۆر هەژار و دەستکورت بوو، لە کەسێکم پرسی بۆچی ئەم پیاوە وای لێهاتووە؟ گوتی ئەوە ماڵی خەڵکی خواردووە. گوتم ماڵی کێی خواردووە؟ گوتی کەشکی لە ئەربابەکەی خۆی دزیووە. ئەو نەیدەزانی کە خاوەن کۆمپانیاکانی نەوت و خاوەن بانکەکان ملیاردەها دۆلاری خەڵکی ئەم جیهانە دەدزن، کەچی سەکتەشیان لێنادات و ئیفلیجیش نابن. خۆ ئەگەر ئەم ملیاردێرانە سەکتەش لێیان بدات و ئیفلیجیشبن نابن بە سواڵکەر، بەڵام ئەم داماوە ئەگەر یەک کیلۆ کەشکی ئەربابی خواردبێت، ئێستا بووە بە سواڵکەر.

شێرە ژنانی تێکۆشەر و ئازا و ڕەنجدەر، ڕۆڵێکی گرنگیان هەیە لە پەرەپێدانی سامانی وڵات و بەرهەمهێنانی خۆراک بۆ هاووڵاتیان. خەڵکەکە خوێندەوارییان نەبوو ڕادیۆ و ڕۆژنامەش نەبوو. هیچ کات گەشتیان نەکردبوو. منداڵانیشیان بۆهیچ شوێنێک نەڕۆیشتبوون ئەو کەمە هۆشیارییەش کە هەیانبوو بە هۆی سەربازییەوە بوو.

کاتێک مرۆڤ ئاگاداری ڕووداوەکانی جیهان و دەوروبەری خۆی نەبێت، ئەوا لە زیندانی نەزانی و دواکەوتندایە. لە ساڵەکانی دواییدا کۆچکردن و ڕۆیشتن بۆ شار و گوندەکان گەورەترین هۆکاری هۆشیاربوونەوەی ئەوان بوو. دروستکردنی جادە و هاتنە شار و چوونە شارە گەورەکان بەتایبەت تاران، وەرچەرخانێکی گەورەی لە مێشکی ئەو خەڵکەدا دروستکرد. دامەزراندنی سوپای خوێندەواری و مامۆستایانی قوتابخانەی گوندەکان، ببوونە هۆکارێک بۆ هۆشیاربوونەوەی خەڵکی. هاوکات پاتری قەڵەمی و شەپۆلەکانی ڕادیۆ، خزمەتێکی فەرهەنگیی گەورەیان کرد. کەسانێک کە هاتوچۆ بکەن و بڕۆن بۆ شاران و وڵاتان ببینن، هەرگیز فریوی کەس ناخۆن و ئەقڵیان کۆنترۆڵ ناکرێت. هەر وەک خودای گەورەش دەفەرموێت (سیروا في الأرض). کاتێک ئەو خەڵکە چوونە شار و بەچاوی خۆیان خەڵکی تر و شاریان بینی. ئیتر خانەکان نەیانتوانی چیتر کۆنترۆڵیان بکەن. دیکتاتۆرەکانیش تەنها دەتوانن بە سەر خەڵکانی گێل و ناهۆشیاردا فەرمانڕەوایی بکەن. دانایی هۆکاری گۆڕانکارییەکانە. ئەوانەی لە گۆڕانکاری و بەرەوپێشچوون دەترسن، لە هۆشیاری خەڵکیش دەترسن. هەر کاتێک خەڵکی هۆشیاربوون کورسی ژێر دیکتاتۆرەکان ڕادەکێشێت و دەربەدەری هەموو جیهانیان دەکات. دیکتاتۆرەکان هەر کارێک لە خزمەتی گەل و نیشتماندا بێت و بەسوودی هاووڵاتیان بێت، ئەوان بە قەدەغە و دژی یاسا ناوی دەبەن، بەڵام بە پێچەوانەوە هەر کار و فەرمانێک بۆ گێلکردنی خەڵکی بێت و بۆ گەڕانەوە بێت بۆ دواوە، ئەوان هانیدەدەن و هاوکاری دەکەن.

دەکرێت کەسێک لە پیشەکەی خۆیدا زۆر شارەزا و لێهاتوو بێت، بەڵام لە پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکاندا هیچ نەزانێت. شوانێک لە شوانیدا شارەزایە، بەڵام هیچ لە کێشە کۆمەڵایەتییەکان تێناگات. دکتۆرێکی مێشک و دەمار دەتوانێت وەک شوانێک وابێت، لە کاری نەشتەرگەریدا زۆر هۆشیار بێت، بەڵام لە کێشە کۆمەڵایەتییەکاندا، لە شوانێک کەمتر تێدەگات. کیمیازانێک و فیزیازانێک لە کارەکەی خۆیاندا سەردەردەکەون و شارەزان، بەڵام لە دونیای کێشە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکاندا، هیچ تێناگەن و جۆرەها بۆمبایش بۆ کەسانی وەک هیتلەر و سەدام حسێن دروست دەکەن.

دیارە ئێستا بارەکە گۆڕاوە، زۆربەی خەڵکە هەژار و مەڕدارەکان، وازیان لە ژیانی ئاژەڵداریی و کۆچەریی هێناوە و هاتونەتە نێو شارەکان. هاتنە شار، واتە هۆشیاربوونەوە، تەنانەت ئەگەر ڕووبەڕووی هەژاری و نەبوونییش ببنەوە. ئێستا گۆشتی مەڕ گران بووە. ڕۆنی گیایی جێگای ڕۆنی ئاژەڵی گرتوتەوە، کێڵگەی گەورەی بەخێوکردنی مانگا پەیدابووە، مەکینەی شیردۆشین چووەتە نێو ژیانی کۆچەرییەکانەوە. ئامرازەکانی گواستنەوە و هاتوچۆ جێگای ئەسپ و حوشتر و هێستریان گرتۆتەوە.. هاوکارییەکانی دەوڵەتیش بەرەو زیادی ڕۆیشتبوو. شارەکان پێویستییەکی زۆریان بە کرێکار هەبوو. ڕادیۆ و تەلەفزیۆن، ببوون بە پێداویستییەکی گشتی. هەمووان دەستیان خستە نێو دەستی یەکترییەوە. خەڵکە هەژار و کۆچەریەکانیان ڕەوانەی شارەکان کرد. ئەو کەسانەی لە شار نیشتەجێن و داوا دەکەن کۆچەریی و گوندنشینان کۆچ نەکەن بۆ شارەکان و نەبنە شار نشین، با ئەوانە خۆیان شار جێبهێڵن و بڕۆن لەبری ئەوان لە گوندەکان نیشتەجێبن. سوێند بە خودای گەورە، پەیدا کردنی کار بۆ هەژاران و دامەزراندنیان لە سەر کارێک گەورەترین خودا پەرستییە. من وا هەست دەکەم خاوەن کارگەکان و بەڵێندەرەکان کە کار بۆ هەزاران کەس پەیدا دەکەن، خۆشەویسترین کەس و نزیکترین کەسن لە خوداوە، ئەوان بەرهەمهێنی کارن بۆ گەنجەکانمان. کار، دەرمانی زۆرێک لە نەخۆشییە کۆمەڵایەتی و تەنانەت فیزیاییەکانیشە. لەساڵی (١٣٨٩-٢٠١٠) ئەندازیار سەید حەمیدی گرامی، مانگانە سێ ملیۆن تومەنی دەخستە بەر دەستی من، بەو پارەیە توانیم لە دەزگایەکی بڵاوکردنەوەدا کار بۆ شەش کەس پەیدا بکەم، بەڵام چونکە شارەزاییەکم لە بازرگانیدا نەبوو، نەمتوانی گەشە بە کارەکەم بدەم. لە ماوەی ساڵێکدا نرخی یەک بەند کاغەز لە (٨٧٥٠) تومەنەوە گەیشتە نەوەدوپێنج هەزار تومەن. نەمزانی زووتر، بەو پارەیە کاغەزی زیاتر بکڕم. هەندێک لە پارەکەم دا بە مووچەی کارمەندەکان. بەهۆی بەرزبوونەوەی پارەی بیانی و گرانبوونی نرخی کاغەز، لە شەش کارمەندە چواریان بێکار بوون و دەرکران. کاتێک ئەو خانمەی کە ماجستێری لە ئەدەبیاتدا هەبوو، لەگەڵ ئەو برادەرەی ماجستێری لە ماتماتیکدا هەبوو بێکار بوون. لەتاوا فرمێسک بە چاومدا هاتە خوارەوە. هەستم بە بچووکی خۆم دەکرد. ئاخر چۆن دەتوانیت پیاوێک کە ئێستا خاوەنی ژن و منداڵە بە هۆی نەزانینی خۆت و کەمتەرخەمیی حکومەتەوە بێکاری بکەیت. ئێستا من چوار کەسم بێکار کردووە. تۆ بیری لێبکەرەوە لە چۆنێتی ئەم ڕۆژگارە کە کەسانێک هەن چەندین کەس بێکار دەکەن. من زۆر سوپاسی ئەندازیار سەید حەمیدی گرامی دەکەم کە بەهۆی ئەوەوە توانیم کار

بۆ شەش کەس پەیدا بکەم، بەڵام دەبوو من چیمبکردایە تا کاری دەزگاکەمان بەردەوام بووایە؟ ئێستا من باسی یادەوەرییەکانیساڵی (١٣٤٧-١٩٦٨) دەکەم، بەڵام لە هەمانکاتدا باسی کێشە ئابوورییەکانی ساڵی (١٣٩١-٢٠١٢) دەکەم. ئەو کێشە ئابوورییانەی کە تووشمان هاتوون ١٠٪ ی بەهۆی گەمارۆ ئابوورییەکانی وڵاتانی خۆرئاواوەیە بەسەر وڵاتەکەماندا. ٩٠٪ ی بەهۆی ئیدارەیەکی خراپ و خراپ بەڕێوەبردنی وڵاتەوەیە. خودا ئاکامی ئەم سەرۆک کۆمارەمان بە خێر بگێڕێت کە نەیتوانی گوندێک ئاوەدان بکاتەوە، بەڵام دەیەوێت کێشەکانی هەموو جیهان چارەسەر بکات. ئیمە نموونەی بێبەزەییترین و بێ چاوڕووترین کەسین لەسەر گۆی زەویدا. ئێمە زەم و لۆمەی ئەو کەسانە دەکەین کە چەندین ساڵ ئاگاداری هەڵاوسان بوون و نەیاندەهێشت هەڵاوسان لە وڵاتدا ڕووبدات. ئێمەش هەستمان پێنەدەکرد هەڵاوسان مانای چییە؟ هەڵاوسان واتە دەوڵەمەندبوون و بە ملیاردێر بوونی ژمارەیەکی کەم لە خەڵکی و هەژاربوونی ٩٠٪ ی خەڵکانی تر. کەسێک لە ماوەی بیست ڕۆژدا لە ٨٥٪ ی میللەتی هەژار کرد کەچی هوتافی بۆ دەکێشین. من خۆم کەسێکم پاش پەنجا ساڵ، هەست بە هەژاری دەکەم. چەندین ساڵە نیوەی داهاتەکەم لێ دزراوە. وا تەمەنم گەیشت بە شەستوپێنج ساڵ هەر بۆیەش دەمەوێت کۆچ بکەم و وڵات جێبهێڵم.

ساڵانە لە ناوەڕاستی هاویندا شیری مەڕەکان کەم دەبن. شیردۆشین و مەشکەژەندن و کەشک دروستکردنیش کەمتر دەبێت، بەڵام کاری ژنەکان کەمتر نەدەبوو، ئەوان ڕەشماڵیان بۆ خۆیان و بۆ ماڵی عەلی خانیش دەچنی. کچانیش کاری جوانتریان دەکرد، فەرش و بەرگە پشتی‌یان دەچنی، بۆیە بەگشتی ژنان هەرگیز بێکار نەدەبوون و نەدەکرا پشوویەک بدەن، بەڵام هەر ئەم ژنانە لە ژنانی گوندنشین ئازادتر بوون. ژنانی گوندەکان کەمتر لە ژنانی کۆچەریی کاریان دەکرد، بەڵام ئازادییەکەشیان کەمتر بوو. ژنانی کۆچەریی لە کڕین و فرۆشتندا، لە قسەکردن لەگەڵ پیاواندا، لە سەماکردن و شاییکردن و گۆرانی گوتندا سەد جار لە ژنانی گوندنشین ئازادتر بوون.

ئەوساڵە من کەلوپەل و پێویستییەکانی شەستونۆ ماڵم نووسی. واتا نووسیم ئەو ماڵانە چیان هەیە. هەر لە فەرش و مەنجەڵ و کاسە و سێپای مەشکەژەندن و مەشکە و فەرەنجی و لێفە و بەتانی و جلوبەرگ و پێڵاو، هەموویم نووسی. هەموو پێداویستیەکانی پەنجاودوو ماڵ، لەو ساڵەدا هەر ماڵە و بایی دووسەدوپەنجا تومەن بوو. واتا ئەگەر بیانویستایە ئەو کەلوپەلانە بە تازەیی بکڕن ئەوا بە دووسەدوپەنجا تومەن دەیانکڕی. سەیرکەن چەندە ژیانێکی هەژارانەیان هەبووە. هەشت ماڵ هەموو

کەلوپەلی هەرماڵێکیان بایی نزیکەی پێنجسەد تومەن دەبوو. چوار ماڵیان هەر ماڵە و کەلوپەلەکەی بایی نزیکەی حەوتسەد تومەن دەبوو. سێ ماڵیش نزیکەی بایی هەزار تومەن و دوو ماڵیش زیاتر لە دوو هەزار تومەن.

من لە ماوەی ئەو چوار هەفتەیەدا، بێژەن و «یەلە»م فێری هەموو پیتەکان کرد، بێژەن زۆر بەباشی فێری نووسین ببوو. «یەلە»ش فێری نووسینی پیتەکان ببوو. بەڵام نەک وەک بێژەن. بێژەن هەمیشە خەریکی نووسین بوو، دەیویست نامە بۆ گوڵسەنەم بنووسێت، بەڵام «یەلە» کەسێکی نەبوو تاکو نامەی بۆ بنووسێت. دایکی بێژەن دەیگوت گوڵسەنەم خوێندەوارییەکی کەمی هەیە. گوڵسەنەم تەنها ساڵێک چووەتە لای سوپای فێرکاری و وانەی خوێندووە. دایکی بێژەن کوڕەکەی هاندەدا تا بەزوویی فێری خوێندن و نووسین ببێت. دەیگوت گوڵسەنەم چاوەڕوانی نامەی بێژەن دەکات.. ئاخ خۆزگە هەموو عاشقە نەخوێندەوارەکانی دونیا فێری خوێندەواری ببونایە، بەڵام بەداخەوە ئێستا مۆبایل هەموو جوانییەکانی نووسینی ونکردووە. هەڵبەت کورتە نامەی مۆبایلیش شتێکی خراپ نییە.

ڕۆژی سەرژمێری مێگەلەکان گەیشت، هەر کەسێک ئارەزووی هەبووایە دەیتوانی لە هاوبەشەکەی جیا ببێتەوە، ساڵ کۆتایی هات و بێژەنیش لە شوانێتی ئازاد بوو، واتە بێژەن لە شوانی ماڵی خاڵی یا عەلی خان ڕزگاری بوو. بێژەن قسەکانی ئەردۆی قبوڵکرد بوو. بەرانەکانی فرۆشت و بە پارەکەی مەڕی کڕی بوو. لەگەڵ چەند کەسێکیش ڕێکەوتبوو (١٠٧) مەڕیشی بەشوانکارە هێنابوو. لەگەڵ چەند کەسێکی تریش قسەی کردبوو کە بێنە لای ئەو و بەیەکەوە مێگەلە مەڕ دروستبکەن. ئەو بۆخۆی بەگشتی شەستوحەوت سەر مەڕ و بزنی هەبوو، (١٠٧) سەر مەڕیشی بەشوانکارە هێنابوو. تێکڕا ببووە خاوەنی (١٧٤) سەر مەڕ و بزن. ئەوانەی کە لەگەڵیدا ڕێککەوتبوون مێگەل دروستبکەن، هیچ یەکێکیان لە نەوەد سەر مەڕ زیاتریان نەبوو. کەواتە بێژەن دەبوو بە سەرۆکی هەوارەکە. ئەو کە دەیویست ببێت بە سەرپەرشتیاری شوانەکان ئەوەی نەکرد و ئێستا وا دەبێتە خان. ئەمە جۆرێک بوو لە دیموکراسی لە چوارچێوەی سەرمایەداریدا. هەر کەسێک ژمارەی مەڕەکانی زۆرتر بێت ئەوا ئەو دەبێتە لێپرسراوی هەموو خاوەن مەڕەکان. کەواتە بێژەن وەک خانێکی لێدێت. ئەگەر خانیش نەبێت ئەوا بە خان بانگ دەکرێت. ئەگەر ژمارەی مەڕەکانت کەم بێت هەم هەژار دەبیت و هەم پایەی کۆمەڵایەتیشت هەرەس دەهێنێت. بۆیە دەبێت وریابیت. بنچینەی کار ئەوەیە هەر کەسێک مەڕی زیاتری هەبێت دەبێتە گەورەی خەڵکانی هەموو هەوارەکە و هەموو

پرس و ڕایەکیش بەو دەکرێت و سەرۆکایەتی هەوارەکە لای ئەوە. بێژەنی پاڵەوان بوو بە سەرۆکی هەوارێکی تازەی چواردە ماڵی. ئەو (١٧٤) سەر مەڕی هەبوو. ژمارەی مەڕەکانی ئەو زیاتر بوو لە مەڕی هەر خێزانێکی هەوارەکە. بێژەن کە بوو بە سەرۆکی هەوارەکە هیچ لەخۆی نەگۆڕا. هەر خۆی بوو بە شوانی مێگەلەکە. گوتی موهەندیس من ئەمساڵ نابێت کرێ بدەم بە شوان. خۆم دەبم بە شوانی مێگەلەکەم، من دەبێت پارە کۆبکەمەوە و ژمارەی مەڕەکانم زیاد بکەم. ئەردۆش لەلای عەلی خان مایەوە، بەڵام نەبوو بە شوان بەڵکو وەک هاوکارێکی شوان مایەوە.

ئەردۆ وەک سەربازێکی نێو سوپا وا بوو، هەرگیز نەدەبوو بە ئەفسەر. ئەردۆ لە کاری کەشناسی و ئەستێرە ناسیدا ئەفسەر بوو. ئەگەر خوێندەواری هەبووایە لە بواری کەشناسی و ئەستێرە ناسیدا زانایەکی بلیمەت دەبوو. بێژەن و هاوکارەکانی هەوارێکی تازەیان لە نزیک کانییەک دروستکرد. بێژەن دەبوو ژن بهێنێت. چونکە مەڕداری بەبێ ژن ناکرێت. بێژەن خۆیشی گوتی دەبێ ژن بهێنم. دایکی لە تەنیشتیەوە وەستا بوو، دایکی بێژەن ژنێکی ماندوو و زەحمەتکێش بوو، خوشکی حاجی عەلی خان بوو، بەڵام لەپێش هەمووشتێکدا دایکی بێژەن بوو. لەو ساڵانەدا کە بێژەن شوان بوو هیچ هەواڵک لە خان بوونی نەبوو، خەو و خۆراک و کەلوپەل و ژیانی لە خان نەدەچوو. حاجی عەلی خان بە لەدەستدانی بێژەن، شوانێکی بەهێز و کارا و دڵسۆزی لەدەستدا. ئەو کەسەی لە جێی بێژەن ببوو بە شوان کەسێکی بە ئەزموونی تەمەن چلوپێنج ساڵ بوو، بەڵام زۆر دڵسۆز نەبوو. من دوازدە ڕۆژ لەو چوار هەفتەیە لە هەوارەکەی بێژەن بووم. بە هەموو ئەندامانی ئەو هەوارە ئاشنا بووم. بەتایبەت دایکی بێژەن. دایکێک کە ڕۆژی سەد جار نزای خێری بۆ کوڕەکەی دەکرد. دایکی بێژەن فارسی بەباشی نەدەزانی، بەڵام هەموو قسەیەکی سادەی فارسی تێدەگەیشت. ئەو زۆری گلەیی لە براکەی هەبوو. هەمیشە نزای دەکرد. بێژەن ببێت بە خان و بتوانێت مەڕی زیاتر بکڕێت، دایکی بێژەن ناوی زوبێدە بوو.

زوبێدە ژنێکی ئازا بوو، تەنها ئەو کوڕەی هەبوو، هاوسەرەکەی زۆر زوو مردبوو. کاتێک بێژەن تەمەنی دە ساڵ بووە، هاوسەرەکەی مردبوو. زوبێدە چوار منداڵی ببوو، بەڵام تەنها بێژەنی بۆ مابوو.. ژنێکی گەورە و ئازا بوو، تەمەنی چلودوو ساڵ زیاتر نەبوو، ئەویش وەک ژنانی تر کاری بۆ خان دەکرد، بەڵام ئێستا کوڕەکەی بووە بە خاوەنی مێگەلی خۆی، بۆیە دەبێت کار بۆ کوڕەکەی خۆی بکات. جارێک پێمگوت پێویستە یەکێک لە کچەکانی عەلی خان بۆ بێژەن بهێنێت، ئەویش بە کوردی قسەیەکی

کرد. تێگەیشتم کە دەڵێت (ئاومان بە یەک جۆگەدا ناڕوات). بێژەنیش گوتی من کچی خانم ناوێت. ئەو کچێکی تری دەویست. ئەو گوڵسەنەمی دەویست. من دایکی بێژەنم خۆشدەویست، وەکو دایکم وابوو، لەگەڵ دایکمدا هاوتەمەن بوون، هەردووکیان یەکی یەک کوڕیان هەبوو، هەردووکیان زوو هاوسەرەکانیان مردبوون. هەردووکیان نزایان دەکرد بۆ کوڕە تاقانەکانیان.

هەوڵمدەدا بەسەر خۆمدا زاڵ ببم و کەمتر لە گڵپۆ نزیک ببمەوە. کاتێک بیبی گوتی وەرە ئەم کچە بەرە و بڕۆرەوە بۆ شار، لەگەڵ ئەودا ژیانێکی خۆش دەگوزەرێنیت. منیش گوتم بیبی من نیازی ژنهێنانم نییە. هیچ چارەیەکم نەبوو یا دەبوو ژن بهێنم یا دەبوو خۆم دوورەپەرێز بگرم. بیبی بێدەنگ بوو، هیچ قسەیەکی نەکرد، بەڵام تێگەیشتم کە هێشتا دڵسارد نییە. ئایا ئەو لەگەڵ گڵپۆ و ماڵەوەیاندا قسەی کردبوو یان نا؟

جارێکیان لە ڕەشماڵی بیبی بووم، گڵپۆ هات نەیزانی من لەوێم، دەموچاوی سوور هەڵگەڕا، تیشکی چاوەکانی وەک تیرێک دای لەسەر دڵم. بیبی گوتی گڵپۆ دانیشە، ئەویش گوتی دەبێ بڕۆم، باوەژنەکەم کاری پێم هەیە. تەنانەت نەشیگوت بۆچی هاتووە بۆ ڕەشماڵی بیبی؟ لە دڵی خۆمدا گوتم بەڕاستی دونیایەکی هیچە لەگەڵ ئەم کچەدا زەماوەند بکەم، بەڵام دایکم زۆر ئارەزووی لەسەر من کۆکردبووەوە، من ژیانێکی ڕێکوپێک و باشم نەبوو. لە نزیک فولکەی سەعدابادی مەشهەد، لەگەڵ چوار هاوڕێی یەزدیم لە خانوویەکی دوو ژووری بێ حەمامدا ژیانم دەگوزەراند.

دایکم دەیویست بێت بۆ مەشهەد و لە لای من بمێنێتەوە. باری ئابووریشمان باش نەبوو. لە تاقیگەی زانکۆ کارم دەکرد، کارەکەشم دروستکردنی نەخشە بوو. ئەو کاتە کۆمپیوتەر نەبوو، نەخشەمان بەدەست دروستدەکرد. ئەو کەمە پارەیەی هەم بوو، ئەویش لای کوڕە مامەکەم بوو، مانگانە بڕێکی کەمی بۆ دەناردم و نەدەکرا بەو کەمە پارەیە زەماوەند بکەم. تەمەنیشم لە بیست ساڵ زیاتر نەبوو.

کاتێک بێژەن هەواری تازەی دروستکرد. منیش بڕیارمدا هەواری حاجی عەلی خان جێبهێڵم و بچم بۆ هەواری بێژەن، واتە ویستم هەواری گڵپۆ جێبهێڵم. بیبی نەیدەهێشت من لە ڕەشماڵەکەم تەنیابم، خواردنی بۆ دروست دەکردم، بەڵام من دەبوو لەم هەوارە بڕۆم. گوتم بیبی من دەمەوێت بچم بۆ هەوارەکەی بێژەن. گوتی ئەی ڕات دەربارەی گڵپۆ چیە؟ گوتم هیچ. گوتی موهەندیس مەڵێ هیچ، من دەزانم کە خۆشتدەوێت. گوتم بیبی بۆچی وا پێداگریی دەکەیت؟ گوتی دانیشە تا بەتەواوی قسەی دڵی خۆمت بۆ بکەم. نیو کاتژمێر قسەی بۆ کردم. پوختەی قسەکانی ئەوەبوو کە گڵپۆ منداڵ بووە

کاتێک دایکی مردووە، باوکی دووبارە ژنی هێناوەتەوە، باوەژنەکەی لەگەڵ گڵپۆ زۆر خراپە، هەمیشە لێیدەدات و لە ڕەشماڵەکە دەریدەکات، بەردەوام بوختانی بۆ دەکات. جارێک بوختانی دزی بۆ دەکات، جارێک بوختانی ناموس. گڵپۆ دووجار لە هەوارەکە ڕایکردووە و چووەتە ئەو شاخ و کێوە، سێ ڕۆژ بە دوایدا گەڕاون تا دۆزیویانەتەوە کاتێک هێناویانەتەوە باوکی و باوەژنەکەی تا توانیویانە لێیانداوە. بیبی گوتی باوکی و باوەژنەکەی زۆر بۆی خراپن. جارێکیان گڵپۆ نەوتی کرد بەخۆیدا بەنیاز بوو خۆی بسووتێنێت. خواستی خودا وابوو دەنکە شخارتەکە ئاگری نەگرتبوو. ژنی دراوسێکەیان چاوی لێببوو کە خەریکە شخارتە بە داوێنی کراسەکەیەوە دەنێت. بەخێرایی ڕۆیشتبوو گرتبووی و نەیهێشتبوو، هەموو جلوبەرگیشیی نەوتاوی ببوو. بیبی پووری باوکی گڵپۆ بوو. گڵپۆ تەمەنی بیست ساڵ بوو. بە پێی ئەو قسانە بێت کە لە بارەیەوە دەکرا، هیچ کەسێک ئەوی نەدەویست، بەڵام ئێستا گەنجێکی خەڵکی شار پەیدا بووە و ئەوی خۆشدەوێت. بیبی دەیگوت لەمە باشتر دەستناکەوێت. هەر کارێکی پێیبکەیت دەیکات. ئەگەر لە شاردا دەستکێش و گۆرەوی بچنێت نانی خۆی پەیدا دەکات، بەڕاستی بیبی دەیویست ئەم کچە ڕزگار بکات.

من گڵپۆم خۆشدەویست، بە بینینی خۆشحاڵ دەبووم، بەڵام من پیاوی ژنهێنان نەبووم. من لەو تەمەنەدا ئازایەتی ژنهێنانم نەبوو. چووم بۆ هەوارەکەی بێژەن. بێژەن ڕەشماڵێکی بۆ هەڵدام، لە هەوارەکەی بێژەن هیچ کەسێک تفەنگی نەبوو. هیچ کەسێک ئەسپی نەبوو. هەندێک لە ماڵەکان حوشترێکیان هەبوو. هەندێکیان تەنها وڵاخێکیان هەبوو. لە ڕاو و گۆشتی ئاژەڵی کێوی، لە کچانی ئەسپسوار و تفەنگ بە شان، هیچ هەواڵێک نەبوو. شەش ماڵ بە داهاتی خۆیان دەیانتوانی ژیانی مەمرە و مەژی بگوزەرێنن، بەڵام هەشت ماڵی تریان ژمارەی ئاژەڵەکانیان زۆر کەم بوو. ئەمانە دەبوو کاریان بۆ خەڵکی تر بکردایە. هاوکات خۆراکە سروشتییەکانیشیان کۆدەکردەوە. سێ ماڵ لەو هەشت ماڵە کەتیرە و زرشک و گیا کێویشیان کۆدەکردەوە. لە کاتی قارچکدا دەچوون قارچکیان دەهێنا و دەیانخوارد. چەند ماڵێکیش کاریان بۆ خەڵکی هەوارەکانی تر دەکرد. چەند گەنجێکیش بۆ کارکردن ڕۆیشتبوون بۆ شار و گوندەکانی تر. سەرەتای کۆچ بوو، سەرەتای هوشیاری بوو، سەرەتای هاتنی هەواڵەکانی شار بوو بۆ هەوارگەی کۆچەرییەکان. ڕەشماڵەکان هەمووی بچووک بوون، بێژەن ڕەشماڵێکی مووی کەمێک گەورەتری هەڵدابوو. دەیوەست زەماوەند بکات. هەر بۆیە دەبوو ماڵەکەی تازە بکاتەوە. من چەند شەو لەگەڵ بێژەن و مێگەلەکەی دەچووم بۆ دەشت و دەر. تاڕا دەیەک

فێری شوانی ببووم، بەڵام ئەگەر کەسێک بیەوێت ببێت بە شوان دەبێت (٢-٣) ساڵ شاگردی بکات. دیارە دەبێت مەرجی شوانێتیشی تێدابێت. «یەلە»ش لە هەموو شوێنێک لەگەڵ مندا بوو. گرنگترین شت کە لە هەوارەکەی بێژەن و پاشانیش لە هەوارەکانی تر فێری بووم هاوژیانی و پێکەوە ژیانی خەڵکەکە بوو. خەڵکی یەک هەواری هۆزێک بەڵێنیان دەدا بۆ ماوەی یەک ساڵ بەیەکەوە بژین و هاوبەشی یەکتربن. هاوبەشییەکیان دروست دەکرد بەبێ هیچ نووسراوێکی بنچینەیی. ئەو هاوبەشیەش مێگەلەکەیان بوو. بەڕێوبەرێکی کارکردەیان هەڵدەبژارد و پێیاندەگوت شوان. ماوەی هاوبەشیکردنەکەیان یەک ساڵی تەواو بوو. من ماوەی چلوسێ ساڵە لەگەڵ هەواری کۆچەرییەکانی وڵاتدا پەیوەندیم هەیە. لە تەواوی ئەو ماوە درێژەدا نەمدیووە و نەمبیستووە مێگەلەکەیان پێش کاتی دیاریکرا و لەیەکتری جیابکەنەوە. گیانی هاوکاری و هاوژیانی لە هەوارەکاندا بەردەوامی هەبووە. هەوارگەی هۆزەکان واتە فەرهەنگی هەموو میللەت، بە هەموو جوانییەکانییەوە. لەوێ هەموو کەس ئازاد بوو، بەڵام هەمووشیان پێکەوە هاوبەشبوون. یەک کەس بۆ هەمووان بوو هەموانیش بۆیەک کەس بوون. ئەمە دروشمی ئەلیکساندەر دۆمایە لە ڕۆمانە بەناوبانگەکەیدا، بەڵام سەدەها ساڵ و هەزاران ساڵ پێش ئەلیکساندەر دۆما کتێبی سێ تفەنگدار خەڵکی ئەم وڵاتە و خێڵەکیەکانی جیهان ئەم دروشمەیان بە کردەوە پیادەکردووە.

نەخوێندەوارترین خەڵکانی ئێمە خاوەنی فەرهەنگێکی قوڵ و دەوڵەمەندن. خەڵکانێک کە هەر کەسێکیان (١٠-١٢) سەر ئاژەڵی هەیە هاوبەشیەک یان هاوکاریەکی یەک ساڵە لەنێوان خۆیاندا پێکدەهێنن. بەدرێژای بیستوحەوت ساڵ کە من لە نزیکەوە ئاگادارییەکم هەبووە لە کۆچەرییەکان، لە تەواوی ئێراندا ئەو بەڵێنەی کە دەبەسترا لە بارەی هەوار و مێگەلەوە تا کاتی دیاری کراو بەڵێنەکە هەڵنەدەوەشایەوە. هەموو خەڵکی هەوارەکە پابەند دەبوون بەو بەڵێنەوە. لە هەمان کاتدا دە ئەندازیار و دکتۆر بە یەکەوە کۆدەبنەوە و هاوبەشییەک دروستدەکەن. ئەگەری وازیهێنان و هەڵوەشاندنەوەی هاوبەشەکەیان لە ساڵی یەکەمدا ٦٣٪ کەمتر نابێت. لە ماوەی پێنج ساڵدا ئەگەری هەڵوەشانەوەیان ٨٤ ٪ دەبێت. ئاماری ئەم ڕاستیە نیشانیدەدات کە خێڵەکییەکان نەخوێندەوارن، بەڵام خاوەنی فەرهەنگن. گوندنشینان کەم خوێندەوارن، بەڵام فەرهانگی هاوژیانیان پێکەوەیە. ئەوان جۆگە ئاوێک بەیەکەوە دروستدەکەن و هەروەکو جۆگە ئاوەکانی یەزد، کرمان، گوناباد، تەبەس، فیردەوس و کاشان (٥٠٠ تا ١٠٠٠) ساڵ، سەدەها بنەماڵە پێکەوە هاوبەش بوون تێیدا، هاوبەشیەکەیان لە دڵەوەیە و بەڕاستیە. خۆ ئەگەر وا نەبن جۆگە ئاوەکەیان وشک

دەکات و گوندەکانیشیان وێران دەبێت. هەر کەسێک ئەم دابە جوانەی پێکەوە ژیانی داهێناوە، ئەوە دابونەریت و پێشکەوتن و فەرهەنگی ئێمەی ڕۆشن کردۆتەوە. من چەند جۆگە ئاوێک دەزانم کە موسڵمان و زەردەشتی، موسڵمان و یەهودی، شیعە و سوننە، کورد، تورک، فارس و تورکمان پێکەوە هاوبەشن. ئەوانە بەدرێژای دەیان بەڵکو سەدان ساڵ بەئاوی یەک جۆگە کشتوکاڵیان کردووە و لە سەری ژیاون. ئەم شاکاری پێکەوە ژیان و ئاشتیخوازییە لە تەواوی کۆمەڵگەکانی جیهاندا هەیە. ئەمەیە مانای ڕاستەقینەی فەرهەنگ.

لە ساڵی (١٣٤٧-١٩٦٨) هێشتا ژمارەیەک یەهودی لە شێروان نیشتەجێ بوون. کاتێک لە هەوارەکەی بێژەن بووم ڕۆژێک دێوەرەیەک (چەرچی) هات. کاتێک وردەواڵەکانی بڵاو کردەوە، زانیم کە یەهودییە. ئەو دێوەرەیە ناوی ئەلیاس بوو، سێ ڕۆژ لەو هەوارە مایەوە و خوریی و ڕۆن و کەشکی بەقەرز لەخەڵکەکە کڕی. پاشان سێ هێستر و گوێدرێژێکی بەکرێ گرت. شتەکانی بارکرد و بەرەو شار کەوتەڕێ. یەک ڕیاڵ پارەشی پێنەبوو. ئەو سێ ڕۆژەی لەوێ بوو لەسەر ئایینی خۆی خوداپەرستی دەکرد. هیچ کەسێک ئەوی ئازار نەدەدا. یەهودییەکان ماست و گۆشت بەیەکەوە ناخۆن. ئەلیاس بە ئایینی خۆی کەسێکی زۆر بەدین بوو. بێژەن پێیگوت ئەلیاس دەتەوێت لەگەڵ ئێمەدا نانبخۆیت، ئەویش گوتی پاڵەوان ئەگەر من بە تەنها نانبخۆم بۆ هەردوو لامان باشترە، بەڵام چایەکە لەگەڵ ئێوەدا دەخۆمەوە. هیچ کەسێک هیچ ئاماژەیەکی بۆ جیاوازی بیر و ئایینی ئەو نەدەکرد، کاڵاکانی بە قەرز برد و ڕۆیشت. ئەلیاس هەموو ساڵێک ئەو کارەی دەکرد. پاشان پارەکەشی لەکاتی خۆی دا بۆ دەهێنان. فەرهەنگی ئێران فەرهەنگی سێ هەزار ساڵە. کە فەرهانگی هاوژیانی و خۆشگوزەرانییە.

کاتێک لە هەواری عەلی خان بووم، هەستمکرد ڕەوتی هەوارەکە لەژێر دەسەڵاتی خاندایە، بەڵام کاتێک چووم بۆ هەواری بێژەن و هەوارەکانی تر تێگەیشتم کە ڕەوتی هەوارەکە پەیوەستە بە فەرهەنگی خەڵکەوە.. کاتێک لە هەوارەکەی بێژەن بووم، کوڕێکی تورکمانی جەڵەبکڕ (چێودار)، هاتبوو بۆ هەوارەکە بۆ کڕینی بەرخ و کاوڕ. خەڵکەکەش کاوڕەکانییان پێدا، بڕیار وابوو پاش سێ مانگی تر پارەکانییان بۆ بهێنێت. هیچ کەسێک لە ناوی ئەو جەڵەبکڕە تورکمانە سوننەیەی نەپرسی و ناونیشانی لێ وەرنەگرت. ئەویش کاوڕەکانی پێش خۆی دا و ڕۆیشت. کاتێک کە ڕۆیشت لە خەڵکەکەم پرسی، ئایە ئێوە ئەم پیاوە تورکمانە سوننە مەزهەبە دەناسن؟ گوتیان نەخێر نایناسین. گوتم ئەی بۆچی لێتان نەپرسی ناوی چیە؟ گوتیان پێویست ناکات. گوتم تاکو ئێستا مامەڵەی

ترتان لەگەڵیدا هەبووە؟ گوتیان نەخێر، ئەوە یەکەم جاریەتی دێتە هەوارەکەمان و کاوڕمان لێدەکڕێت. گوتم ئەی چۆن ئێوە نەوەدوچوار سەر کاوڕتان پێدا و ڕۆیشت. بێژەن گوتی ئەو لەم وڵاتە دوور ناکەوێتەوە و پاش سێ مانگی تر پارەکە دەهێنێت و پێماندەدات، ئەو جەلەب کرە و کاتێک قسەم لەگەڵدا کرد بۆم دەرکەوت کە ڕاست دەکات و کەسێکی ساختەچی نییە. گوتم باشە خۆ ئەو لە هۆزی ئێوە نەبوو، هەر لە مەزهەبی ئێوەش نەبوو. چۆن باوەڕتان بە قسەی ئەو پیاوە کرد؟ بێژەن و هەموو ئەوانەی کە کاوڕییان پێفرۆشتبوو گوتیان، ئەو ڕاستدەکات و پێویست بە لێکۆڵینەوە ناکات. بێژەنیش گوتی پێویستە ئەویش بە هۆی ئێمەوە پارووە نانێک بخوات. گەنجێکی مەڕداری کوردی شیعە، دەیگوت پێویستە جەڵەبکرێکی تورکمانی سوننە پارووە نانێک لە دەستی ئێمە بخوات. ژمارەیەک کۆچەریی کوردی شیعە بەرهەمەکانی خۆیان بەقەرز دا بە بەقاڵێکی یەهودی، ئەوان دەیانگوت ئەو بەقاڵە یەهودییە پێویستە پارووە نانێک لەدەستی ئێمە بخوات. دەیانگوت بەقاڵە یەهودییەکە و جەڵەبکرە سوننەکە پێویستە پارووە نانێک بخۆن. ئەوان لەکاتی خۆیدا پارەکەش دەهێنن و بەتەواوی پێماندەدەن. ئایا مامۆستایانی زانکۆکانی ئێمە، کاتێک وانەکان دابەش دەکەن ئەو بیردۆزە لەبەرچاو دەگرن؟ سوێند بە حەزرەتی عەباس ٨٠٪ لەبەرچاوی ناگرن. من لە شوێنێکی تردا هەوڵدەدەم بۆتان باسبکەم کە چۆن هەندێک لە مامۆستاکانی زانکۆکانی ئێمە، ئامادەن وەکو بزنمژە خوێنی هاوکارەکانی خۆیان بمژن. هەرچەندە من سوپاسی هەموو مامۆستا باش و ڕەوشت بەرزەکانی وڵاتەکەم دەکەم، بەڵام پێویستە مرۆڤایەتی لە کۆچەرییان و گوندنشینانەوە فێرببین. نەک لە دامەزراوەی ئیدارەی ئێمە. وانەی مرۆڤایەتی کە من لە هەواری کوردەکانی باکووری خۆراسان بە سەرپەرشتی بێژەنی پاڵەوان یا لە هەوارێکی ناوچەی بەختیاری بە سەرپەرشتی (ئاغا جەعفەرقولی ڕۆستەمی) یا لە گوندی (کەرگەز)ی تورکماننشین بەسەر پەرشتی (ئاغا ئیشان) یا لە هەوارێکی بلوچی چابەهار لەسەر دەستی گەورە پیاو و ڕیش سپی حاجی محەمەد حسێن فێر بووم، هەرگیز لە گروپەکانی جوگرافییای زانکۆی مەشهەد یان هیچ زانکۆیەکی تر فێر نەبووم. من لە زۆربەی گروپەکانی زانکۆ جگە لە داریۆنیزمی کۆمەڵایەتی و وانەی ململانێ لەپێناوی مانەوەدا، جگە لە حەسادەت و تەمەنێکی بەفیرۆچوو، شتێکی تر فێر نەبووم. بێهۆ نییە کە من چەندین جار گوتوومە زانکۆکانی ئێمە نە خۆرهەڵاتی و نە خۆرئاوایی و نە ئیسلامی ئێرانین، بەڵکو وەک دوکانێک وان بەبێ حساب و بەبێ نووسین. من لە هەواری کۆچەرییان و گوندەکان وانەی دادپەروەریی و کۆمەڵایەتی فێربووم. فێری

ترتان لەگەڵیدا هەبووە؟ گوتیان نەخێر، ئەوە یەکەم جاریەتی دێتە هەوارەکەمان و کاوڕمان لێدەکڕێت. گوتم ئەی چۆن ئێوە نەوەدوچوار سەر کاوڕتان پێدا و ڕۆیشت. بێژەن گوتی ئەو لەم وڵاتە دوور ناکەوێتەوە و پاش سێ مانگی تر پارەکە دەهێنێت و پێماندەدات، ئەو جەلەب کرە و کاتێک قسەم لەگەڵدا کرد بۆم دەرکەوت کە ڕاست دەکات و کەسێکی ساختەچی نییە. گوتم باشە خۆ ئەو لە هۆزی ئێوە نەبوو، هەر لە مەزهەبی ئێوەش نەبوو. چۆن باوەڕتان بە قسەی ئەو پیاوە کرد؟ بێژەن و هەموو ئەوانەی کە کاوڕییان پێفرۆشتبوو گوتیان، ئەو ڕاستدەکات و پێویست بە لێکۆڵینەوە ناکات. بێژەنیش گوتی پێویستە ئەویش بە هۆی ئێمەوە پاروە نانێک بخوات. گەنجێکی مەڕداری کوردی شیعە، دەیگوت پێویستە جەڵەبکڕێکی تورکمانی سوننە پاروە نانێک لە دەستی ئێمە بخوات. ژمارەیەک کۆچەریی کوردی شیعە بەرهەمەکانی خۆیان بەقەرز دا بە بەقاڵێکی یەهودی، ئەوان دەیانگوت ئەو بەقاڵە یەهودییە پێویستە پاروە نانێک لەدەستی ئێمە بخوات. دەیانگوت بەقاڵە یەهودییەکە و جەڵەبکرە سوننەکە پێویستە پاروە نانێک بخۆن. ئەوان لەکاتی خۆیدا پارەکەش دەهێنن و بەتەواوی پێماندەدەن. ئایا مامۆستایانی زانکۆکانی ئێمە، کاتێک وانەکان دابەش دەکەن ئەو بیردۆزە لەبەرچاو دەگرن؟ سوێند بە حەزرەتی عەباس ٨٠٪ لەبەرچاوی ناگرن. من لە شوێنێکی تردا هەوڵدەدەم بۆتان باسبکەم کە چۆن هەندێک لە مامۆستاکانی زانکۆکانی ئێمە، ئامادەن وەکو بزنمژە خوێنی هاوکارەکانی خۆیان بمژن. هەرچەندە من سوپاسی هەموو مامۆستا باش و ڕەوشت بەرزەکانی وڵاتەکەم دەکەم، بەڵام پێویستە مرۆڤایەتی لە کۆچەرییان و گوندنشینانەوە فێرببین. نەک لە دامـەزراوەی ئیدارەی ئێمە. وانەی مرۆڤایەتی کە من لە هـەواری کوردەکانی باکووری خۆراسان بە سەرپەرشتی بێژەنی پاڵەوان یا لە هەوارێکی ناوچەی بەختیاری بە سەرپەرشتی (ئاغا جەعفەرقولی ڕۆستەمی) یا لە گوندی (کەرگەز)ی تورکماننشین بەسەر پەرشتی (ئاغا ئیشان) یا لە هەوارێکی بلوچی چابەهار لەسەر دەستی گەورە پیاو و ڕیش سپی حاجی محەمەد حسێن فێر بووم، هەرگیز لە گروپەکانی جوگرافییای زانکۆی مەشهەد یان هیچ زانکۆیەکی تر فێر نەبووم. من لە زۆربەی گروپەکانی زانکۆ جگە لە داریۆنیزمی کۆمەڵایەتی و وانەی ململانێ لەپێناوی مانەوەدا، جگە لە حەسادەت و تەمەنێکی بەفیرۆچوو، شتێکی تر فێر نەبووم. بێهۆ نییە کە من چەندین جار گوتوومە زانکۆکانی ئێمە نە خۆرهەڵاتی و نە خۆرئاوایی و نە ئیسلامی ئێرانین، بەڵکو وەک دوکانێک وان بەبێ حساب و بەبێ نووسین. من لە هەواری کۆچەرییان و گوندەکان وانەی دادپەروەریی و کۆمەڵایەتی فێربووم. فێری

ئەو ڕێگەچارە کۆمەڵایەتییە بووم کە خەڵکانی هەژار، خەڵکانی کەم ئاژەڵ، خەڵکانی بێ زەویوزار بە زیندوویی بمێننەوە و بژین..

لە کۆتایی دا من چوار هەفتە لەو کێوە بووم. بێژەن دەیویست لە مانگی (شەهریوەر – ت یەکەم) دا زەماوەند بکات. خۆی و دایکیشی بەڵێنیان لێوەرگرتم ڕۆژی زەماوەند ئامادەبم لە لایان، کاتی ڕۆیشتنم هاتبوو، بێژەن لەسەر کاغەزێک بۆی نووسیبووم من مەندیسم خۆشدەوێت، منیش فێرمکرد بنووسێت موهەندیس نەک مەندیس. ڕۆیشتم بۆ هەواری عەلی خان و خوداحافیزییم لە ئەوانیش کرد.

«یەلە» لە بەردەممدا وەستا بوو، پێڵاوەکانی لە پێ کرد بوو، جلوبەرگیشی خاوێن بوو. منیش ماچم کرد. «یەلە» پێینابووە ساڵی حەوتەمی تەمەنییەوە. بیبی فێری کرد بوو کە سوپاسی من بکات. ئەو ڕۆژە عەلی خان لە ماڵ نەبوو، ژن و منداڵەکانیشی لەڕەشماڵەکە نەهاتنە دەرەوە. منیش لە پشتی ڕەشماڵەکەوە خوداحافیزییم لێکردن. حاجی ڕەمـەزان کەلوپەلەکانی منی لە وڵاخێک بار کردبوو، تاکو لای ئۆتۆمبێلەکە لەتەکما هات، خوداحافیزییمان لە یەکتری کرد و لە یەک جیا بووینەوە، من بەرەو شار و ئەو بەرەو هەوارەکە.

## زەماوەندی بێژەن

مانگی (شەهریوەر – ت یەکەم) بوو، ڕۆیشتم بۆ تەکمەران.. ئەو شوێنەی کە مەڕاسیمی بووک گواستنەوەی بێژەنی لێ ئەنجام دەدرا. بۆ زەماوەندەکە، حاجی عەلی خان ڕێزی لە خوشکەزاکەی خۆی نابوو، پازدە سەر مەڕی وەک دیاری پێشکەش کردبوو. خەڵکانی تریش دیاری باشیان پێشکەش کرد بوو. بێژەن ببوو بە پاڵەوانێکی بەناوبانگ، لە هەموو گوندەکانی دەوروبەرەوە خەڵکێکی زۆر هاتبوون بۆ زەماوەندەکەی. هەمووشیان لەگەڵ خۆیاندا دیارییان بۆ هێنابوو. نزیکەی چل سەر مەڕ و هەندێک پارەی بەدیاری بۆهاتبوو. بێژەنیش بۆ ئامادەکردنی خواردنی نیوەڕۆ نۆ سەر مەڕی سەربڕی بوو. چێشتێکی زۆری لێنابوو. حاجی عەلی خان لەو ساڵەدا نزیکەی سەدوهەشتا سەر لە مەڕەکانی لەناو چوو بوون، بەڵام هێشتا سوپاسی خودای دەکرد و دەیگوت ساڵێکی باش و بە بەرەکەت بووە.

لە مانگی شەهریوەردا گلێۆش شووی کردبوو، هەر چەندە پووریشی مرد بوو. ئەو بە منی گوت بەهۆی مردنی پوورییەوە تا یەک ساڵی تر ناتوانێت شوو بکات، بەڵام پاش سێ مانگ شووی کردبوو. هاوسەری گلێۆ تەمەنی چلوپێنج ساڵ بوو، خاوەنی

چل سەر مەڕ بوو، پیاوێکی کەتە و بەخۆوە بوو. لەو پارەیەی کە زانکۆ پێیاندا بووم دوو مەڕم کڕی بە سەدوهەشتا تومەن، یەکێکیانم پێشکەش بە بێژەن کرد ئەوی تریشم کرد بە دیاری بۆ گڵپۆ، بەڵام بۆچی بۆ گڵپۆ؟ ئەو چی بۆ من کردبوو؟ ئەو تەنها دڵی منی هێنابووە جۆشوخرۆش کە ئەمەش زۆر گرنگ بوو، بە ڕاستی گرنگترین کار بوو.

خۆم دانی پیادەنێم لە هەموو تەمەنمدا تەنها جارێک دڵم کەوتبووە لێدان و پاشان خەریکبوو دڵم بووەستێت و لەکاربکەوێت، دڵ لێدانەکەم بە جۆرێک بوو کە هیچ قسەیەکم بۆ نەکرا، تەنها ئەو جارە بوو بەس، دڵنیام ئەوەش لەئازایەتی و هێز و تواناوە نەبوو، بەڵکو لە ترسا بوو. نەمدەزانی لەنێوان ئەم خەڵکە کۆچەرییە میهرەبانانەدا ئەگەر تاوانێک یا گوناهێک بکەم پارچەی گەورەم گوێچکەم دەبێت، بۆیە دەبوو هەر لەوێ ژنێک بهێنم یان ئاگام لەهەڵسوکەوتەکانم بێت. تەنها کەسێک کە هەستی بەوە کردبوو من گڵپۆم خۆشدەوێت ئەم ژنە تەمەن حەفتاوپێنج ساڵە دەروونناسە بوو. ئەو بە یەک سەیرکردن پەی بە ڕازەکانی من بردبوو. دیارە ڕەنگ و ڕووخسار هەواڵی دەروون دەگەیەنن.. مەڕەکەم پێشکەش بە گڵپۆ کرد و هیچ کەسێک هیچ گومانێکی لێنەکردم، بەڵام بیبی زەردەخەنەیەکی کرد و ئیتر هیچ کەسی تر هیچ قسەیەکی نەکرد. هەر لەوێ زانیم کە هاوسەرەکەی گڵپۆ ژنێکی تریشی هەیە و گڵپۆ دەبێتە ژنی دووەمی.. ئەو پیاوە کۆچەریی نەبوو، بەڵکو گوندنشین بوو، گڵپۆی بردبوو بۆ گوند. ئیتر گڵپۆ لە هەوارەکە ڕۆیشت و وازی لە ژیانی کۆچەریی هێنا و کەوتە دوای چارەنوسی خۆی و لەگەڵ پیاوێک کە بیستوحەوت ساڵ لە خۆی گەورەتر بوو. منیش تەنها ئەوندەم دەسەڵات هەبوو گوتم خودایە تۆ کارێک بکەیت ئەم گڵپۆ داماوە بکەوێتە ژیانێکی بەختەوەرییەوە.

شایی و هەڵپەڕکێی کۆچەرییەکان بە گۆرانی و مۆسیقاوە بوو. شاییەکی گەورەیان ساز کردبوو. ژنان و پیاوان پێکەوە هەڵدەپەڕین. ئەوان هەموویان خزم و کەسی یەکتری بوون. هەژارترین کەسیش جلوبەرگی خاوێن و تازەی پۆشی بوو. ژنە بەتەمەنەکانیش دامێنی کراسەکانیان بەڕەنگی سوور ڕازاندبووەوە، لێواری خەتداریان لە کراسەکانیان دا بوو، کە هەر خەتێک نیشانە بوو بۆ بوونی منداڵێک. کچە گەنجەکانیش جلی جوان و ڕەنگاوڕەنگیان پۆشی بوو. پیاوانیش جۆرەها پێشبڕکێیان ئەنجام دەدا. وەک ئەسپسواری، یاریکردن بە دارێک، بەرزکردنەوەی بەردی گەورە و قورس. بێژەن چونکە زۆرانباز بوو. ببووە پاڵەوانی ناوچەکە، ژمارەیەکی زۆر لە زۆرانبازان هاتبوون بۆ زەماوەندەکەی.

ژنان بە تەنوور نانیان دروست دەکرد، ئەوە یەکەمجار بوو ببینم لەو هەوارانەدا بە

تەنوور نان دروستبکەن. ئەو کەسانەی لە دوورەوە هاتبوون هەر کەسە و شتێکی وەکو دیاری لەگەڵ خۆیدا هێنا بوو. جگە لە مەڕ و بزن، هەندێک کەس مریشک و کەڵەشێریان لەگەڵ خۆیاندا هێنابوو، هەندێکی تریش هێلکە، ڕۆن، کەرە، ماست و نان و برنجیان هێنابوو. واتە هەر کەسە و بەشی خواردنی خۆی بە زیادە وە هێنابوو. هەندێ کەسیش قوماشیان هێنابوو. بێگومان، هەندێ کەسیش پارەیان دەدا. بەگشتی بووک و زاوا هیچ خەرجییەکیان نەکەوتبووە سەر شان. تێچووی ئەو زەماوەندە گەورەیە کەوتبووە سەر شانی خەڵکەکە. کەسێک بە قەڵەم و دەفتەرەوە دانیشتبوو، هەر کەسێک شتێکی بهێنایە ئەو ناوی کەسەکە و بڕی شتەکەی دەنووسی. دەبوو بۆ زەماوەندی بووک گواستنەوە، ئەو پارە و کەلوپەلانەی کە بۆیان دەهات بەزوویی ڕادەستی بووک و زاوا بکرانایە. بۆ هەموو ئاهەنگەکانی بووک گواستنەوە و مەڕاسیمەکانی پرسە. ئەو کارە هەر دەکرا و پارە و خواردەمەنی کۆدەکرایەوە.

تیپە مۆسیقاییەکانی قوچان و شێروان کارێکی سەرسوڕهێنەریان ئەنجامدا. ئەو گروپانەی کە ناسرابوون بە عاشقەکان، بە جۆرێک گۆرانی و مۆسیقایان دەچڕی کە بێوێنە بوو. من لەوێ تێگەیشتم ئەو مۆسیقا و هەڵپەڕکێ جوانەی ئەوان، بەشێک بوو لە فەرهەنگە دەوڵەمەندەکەیان. مۆسیقاکەیان بەجۆرێک بوو کە غەم و شادی ئەوخەڵکەی نیشان دەدا.

کوردەکان، بە درێژایی سەدان ساڵ ببوونە قوربانی سروشت و مێژوو حوکمەتە یەک لەدوای یەکەکان. کوردەکان هەمیشە لە تێکۆشاندا بوون. ئەوان کەسانێکی دڵسۆز و پاسەوانی سنوورەکان بوون. ئەم کوردانەی خۆراسان بەدرێژایی مێژوو چەندین جار بۆ بەرگریکردن لە سنوورەکان شەهیدیان داوە. لە سەردەمانی ڕابردوودا زۆر جار ئەم کوردانەیان تووشی کێشە کردووە. کەسانێک کە بنچینەیان لە کوردەکانی کوردستان بووە، سیاسەتی سەفەوییەکان ئەمانی لە نیشتمانی خۆیان دابڕیووە. کەسانێک کە لەوەرگەکانیان بەگرنگترین پایەی ژیانیان دەزانن، کەسانێک کە تێکەڵ بە سیستەمی خێڵەکی بوون، خان و گەورەکانیان لێکەوتوون و دەربەدەر بوون. کاتێک گۆرانی (دختر قوچانی - کچە قوچانی) یان دەچڕی دەربەدەری و هەژاری و دابڕانی کچەکانی ئەوانم دەبینی. لە سەردەمی شۆڕشی مەشروتیەتدا، کاتێک گۆرانی سەرداری هەموو قوچان (ای ای رشید خان، سردار کل قوچان) یان دەگوت، پوختەی مێژووی تێکۆشانی ئەم کوردانەم دەبینی. ئەو فۆلکلۆرە دەوڵەمەندەی ئەوان سەدان جار دەوڵەمەندترە لە بەرنامە هونەرییەکانی شیراز. خۆ ئەگەر فەرەح پەهلەوی لەبری ئەوەی کە سەردانی

(مۆریس پوژاک) ی دەکرد سەردانی ئەم کوردانەی بکردایە و بە چاوی خۆی ژیانی پڕ مەینەتی و هونەرە پێشکەوتووەکەیانی ببینیایە، ڕەنگە ئێستا لە ئێراندا و لە نێو ماڵەکەی خۆیدا بووایە. لەدوای شۆڕش هەلومەرجێک هاتە پێش و ئاوڕێکی کەم لە کۆچەرییەکان درایەوە. تیپە مۆسیقییەکانی قوچان و بۆجنوورد بەرەوپێش چوون و لە نێو هۆڵەکاندا مۆسیقایان پێشکەش دەکرد. لە سەردەستی کەسانی وەکو مامۆستا عوسمان محەمەد پەرست و مامۆستا سەمەندەری.

«یەلە»ش لەتەکمەران بوو، پێڵاو و جلوبەرگم بۆ بردبوو. غەفار و عەبدال و موحسین و برزوو و کوڕانی هاوتەمەنیان لە مەڕاسیمەکەدا بەردەوام خەریکی کارکردن و خزمەتکردنی میوانەکان بوون. مەڕەکان شیریان تێدا نەمابوو. ژنان کاری شیردۆشین و کەشک دروستکردنیان نەمابوو. (شەهریوەر – ت یەکەم)، مانگی بووک گواستنەوە بوو. مێگەلەکە لە دەشت و کێو دەلەوەڕان، خەڵکیش خەریکی کەیف و شادی و خۆشی خۆیان بوون. خەڵکەکە هەژار بوون، بەڵام شاد و بە کەیف بوون.

دەبێت خەڵکی لە هەژاریشدا شاد و بێ خەمبن. زۆرێک لە هەژارەکان شاد و بێخەمترن لە دەوڵەمەندەکان. «یەلە»ش لە نووسیندا کەمێک پێشکەوتبوو. بیبی ئەوەندەی لە توانایدا بوو فێری نووسینی کردبوو، ئەو هەفتەیەی کە لەوێ بووم، ڕۆژانە چەند کاتژمێرێک وانەم بە «یەلە» دەدا. بیبی «یەلە»ی فێری چەندین هۆنراوە کردبوو. «یەلە» سەدان دێڕ هۆنراوەی حافزی لەبەر دەخوێندەوە، لەگەڵ چەندین هۆنراوەی میللی تر. لە مانگی شەهریوەردا تەنها یەک هەفتە لە دەشتی تەکمەران بووم. بڕیاربوو کاتی کۆچکردنیان بۆ (مەراوەتەپە) منیش لەگەڵیاندا بڕۆم، بەڵام کاتێک باسی کۆچ کرا بەرەو مەراوەتەپە، حاجی عەلی خان هیچ خولقێکی نەکردم، منیش گوتم پێویست ناکات خولقم بکات، عەلی خان هەرخۆی سروشتی وایە. بۆیە منیش بە عەلی خانم گوت ئیشەڵڵا کاتی کۆچکردنتان بەرەو مەراوەتەپە منیش لە خزمەتتاندا دێم. عەلی خان گوتی کۆچی زستانە زۆر ئەستەمە وەک و کۆچی بەهاران نییە. گوتم بەهار کاتێک لافاو هەڵسا خۆ من لەکاتی لافاوەکەش لەوێ بووم. گوتی هەر چۆنێک خۆت ئارەزوو دەکەیت. لە زەماوەندەکەی بێژەندا کچەکانی خانیش شایی و هەڵپەڕکێیان دەکرد، بەڵام پەری خانم کەمتر دەردەکەوت. ئەو یان لە نێو ڕەشماڵەکە دادەنیشت یا خەریکی ئەسپەکەی دەبوو. یان باشترە بڵێم بە هیچ جۆرێک بەشداری شایی و هەڵپەڕکێی نەدەکرد. کاتێک سڵاوم لێکرد، زۆر بە ساردی وەڵامی سڵاوەکەی دامەوە.

دەبوو لە مانگی (ئازەر – ت دووەم) دا، بڕۆیشتمایە بۆ (قورەمەیدان) لە باکووری

خۆرئاوای ئاشخانە. نەمتوانی زستانی ئەو ساڵە بۆ کۆچ لەگەڵیاندا بڕۆم. بەهار و هاوینیش نەچوومەوە بە لای هۆزەکاندا. عەلی خان لە بەهاری ساڵی (١٣٤٨-١٩٦٩) دا، سەردانێکی زانکۆی کرد و کاری بە دکتۆر عەباس هەبوو، کاتێک منی بینی لە هەواڵی پرسیم، بەڵام نەیگوت بۆچی نەچووم بۆ قورەمەیدان؟ تا لەگەڵ ئەواندا لە وێوە بڕۆم بۆ (مەراوە تەپە)، بەڵام من پێمگوت ڕەنگە ئەمساڵ کاتی کۆچکردنی زستانە بێم بۆلاتان و ئامادەی کۆچەکەتان ببم. ئەمجارەش خان زۆر لەسەری نەڕۆیشت.

هەواڵی بێژەنم لەخان پرسی. گوتی کاروباری زۆرباشە و بەگشتی هەموو ئەو (١٠٧) سەر مەڕەی بە شوانکارە لای بوو توانیوویەتی هەموویان بکڕێتەوە بۆ خۆی. لە سەرەتای مانگی (شەهریوەری ١٣٤٨- ئەیلولی ١٩٦٩) بێژەن لەگەڵ هاوسەرەکەیدا بۆ زیارەتی ئیمام ڕەزا هاتن بۆ مەشهەد، سەردانی منیشیان کرد. گوتی مێگەلەکەی بوو بە (٢١٥) سەر مەڕ، بەڵام هێشتا هەر خۆی شوانی مێگەلەکەیەتی. بێژەن سێ جار لەسەریەک لە زۆرانبازیدا یەکەم بووە. بەو هۆیەوە خەڵکی پاداشتی زۆریان کردبوو، دیاری زۆریان پێشکەش کردبوو. پێمگوت ناتەوێت لەگەڵ هاوسەرەکەتدا لە شار نیشتەجێ ببن. ئەو قسە هەمیشەییەکەی خۆی دووبارە کردەوە و گوتی یەک مەڕ بە هەموو شارەکانی ئەم جیهانە ناگۆڕمەوە. من ئەم قسەیەم لە دەیان و سەدان کەسی هۆزەکانی سەرتاسەری ئێراندا بیستووە. مەڕێک ناگۆڕمەوە بە هەموو جیهان.

پاییزی هەمان ساڵ حاجی ڕۆستەم و حاجی ڕەمەزان هاتن بۆ مەشهەد لە ئوتێلێکدا جێگیربوون. چووم بۆ سەردانیان، ئەوان بە ژن و منداڵەوە هاتبوون، منیش هەموویانم برد بۆ دیدەنی (کوهسەنگی) ئەوان ئەوەندە لەو کێو و دەشتە زەحمەتیان لەگەڵ مندا کێشابوو، بەڵام من تەنها یەک دوانیوەڕۆ توانیم لەکاتی خۆم بگرم و لە خزمەتیاندابم و تەنها یەک ئێوارە نانخواردنیان بۆ دابین بکەم، چونکە خوێندکار بووم و پارەم نەبوو، هەموو توانام هەر ئەوەندە بوو لەوە زیاتر هیچی ترم لە دەست نەدەهات. ئەوانم سواری عەرەبانەی ئەسپی کرد. ئەوان هەرگیز سواری ئەسپ و عەرەبانە نەببوون، کاتێک سوار بوون زۆر پێکەنین. حاجی ڕۆستەم دەیگوت من هەموو تەمەنم هەر لە سەرپشتی حوشتر بووم، بەڵام ئێستا وا لە ژوورێکدا دانیشتووم و ئەسپ ژوورەکە ڕادەکێشێت. حاجی ڕۆستەم دەیگوت خەڵکی شار ئەقڵێکی سەیریان هەیە، لەبری ئەوەی سواری پشتی ئەسپ ببن کەچی ژوورێک دروستدەکەن و ئەسپ ژوورەکە ڕادەکێشێت. ئەوان یەکەم جاریان بوو کە گالیسکە و عەرەبانە ببینن. نزیکەی چوار هەزار ساڵ تێپەڕی ببوو بە سەر دروستکردنی عەرەبانە و گالیسکەدا، ئەو تازە دەیگوت پێویستە

منیش عەرەبانەیەک دروستبکەم وبە حوشترێک ڕایبکێشم. ئەوەتا حوشترێک بەم جۆرە دەتوانێت باری یەک تایەفە بگوازێتەوە. گوتم حاجی ڕۆستەم وا سەردەمی گالیسکە و عەرەبانەش بەسەردەچێت، ئێستا سەردەمی ئۆتۆمبێلە. گوتی عەلی خان بەنیازە تراکتۆرێک بکڕێت بارەکان لە تراکتۆر بار بکات. حاجی ڕۆستەم و حاجی ڕەزا بیریان لەگۆڕانکارییەکان دەکردەوە، دەیانویست سوود لەگالیسکە وەربگرن، پێدەچێت زیاتر لە دە هەزار ساڵ بێت لەم جیهانەدا سوود گالیسکە وەرگیرا بێت.

## کۆچی زستانە

لە کۆتایی پاییزی ساڵی (١٣٤٨-١٩٦٩) ویستم بڕۆم بۆ (قورەمەیدان) تاکو لەوێوە لەگەڵ هۆزەکەی حاجی عەلی خاندا بڕۆم بۆ مەراوەتە. هەر لە پاییزی هەمان ساڵدا دکتۆر عەباس سەعیدی بۆ تەواوکردنی خوێندن و وەرگرتنی دکتۆرا ڕۆشتبوو بۆ پاریس.

لە ڕوانگەی گروپی جوگرافیاناسەکانەوە ڕۆیشتنی من بۆ نێو هەوارەکانی کۆچەرییەکان بۆ کاری تایبەتی خۆم بووە، پێشنیاری لێکۆڵینەوەی گروپ و زانکۆ نەبوو. خواستی هیچ یەکێک لە مامۆستاکان نەبوو، هەر بۆیەش نەدەکرا سوودمەندبم لە ئۆتۆمبێلی زانکۆ، ئەگەر بمویستایە بڕۆم، دەبوو لەسەر گیرفانی خۆم بڕۆم، زانکۆ پارەی پێنەدەدام. مۆڵەتم لە دکتۆر لوتفوڵلای موخەیەم وەرگرت کە پێویستیەکانی وەکو هەنگاوپێو، بەرزیپێو، دووربین، کامێرای وێنەگرتن، چەکوش، نەخشە و هەندێک پێویستی تر لە زانکۆ وەربگرم. کۆڵەپشتەکەم کردە کۆڵم و کیسە خەوەکەم هەڵگرت و هەر چۆنێک بوو دووسەد تومەنم پەیداکرد و ڕێگام گرتەبەر. ڕۆژی (٢٨ ئازەری ١٣٤٨=١٩-١٢-١٩٦٩) بوو ئەو کاتە بەشی زۆری جادەی مەشهەد - بۆجنوورد شۆستە بوو قیرتاو نەکرا بوو. بەیانی زۆر زوو ڕۆیشتم بۆ سەر جادەی قوچان، ویستم سواری پاسێک ببم و بڕۆم بۆ ئاشخانە، بەڵام پاس نەدەچوو بۆ ئاشخانە. ئەو سەردەمە پیکاب لە پاس زیاتر هەبوو. ئەو کاتە ئوتومبێلی کرێ کەم بوو. بەڵام پاسی بێنزی (١٨٠) هەبوو، ئەگەرچی ئەوانە زیاتر لە نێوان شارەکانی مەشهەد و تەرگوڕ کاریاندەکرد. لە نێوان مەشهەد و شارۆچکەکانی تردا تەنها پاسی گەورە هاتوچۆیان دەکرد، پاسەکانی تاران و گورگان زیاتر دوانیوەڕوان لە مەشهەد دەردەچوون. چەند کاتژمێرێک بوو لە بەردەم دەروازەی مەشهەد وەستا بووم، تەواو ماندوو و بێتاقەت ببووم. بینیم گەلابەیەکی دەتایەیی (ماک) هات. هۆڕنی بۆ لێدام سەیرم کرد شۆفێرەکەی ئاغا حاجی

غولام ڕەزای حەلەبی بوو، کە هاوڕێی حاجی مەحمود ئاغای ئەردەکانی و حاجی کازمی ئامۆزام بوو. دەستم لێڕاگرت و ئەویش جامی ئوتومبێلەکەی داگرت و گوتی ئاغای پاپۆلی بۆ کوێ دەچیت؟ گوتم دەمەوێت بچم بۆ ئاشخانە. حاجی گوتی وەرە سەرکەوە. بە شاگردەکەی گوت، کەلوپەلەکانی پاپۆلی بخەرە سەر بارەکە. منیش لەگەڵیاندا سوار بووم، کەوتینەڕێ و کەوتینە قسەکردن. حاجی باسی هاوڕێیەتی و دۆستایەتی خۆی و ئامۆزاکەمی دەکرد و باسی ژیانی شۆفێری خۆی دەکرد لە سەردەمی جەنگی دووەمی جیهانیدا، باسی بارکردنی دانەوێڵەی دەکرد لە بەندەر عەباسەوە بۆ جەلفا. باسی پاڵەوانان و پاڵەوانبازی و خۆشی کۆڕ و مەجلیسی ئەو سەردەمە و تێکڕای خۆشی و نەبوونی و دەردەسەرییەکانی سەردەمی جەنگی دەکرد، باسی ئامنەی دەکرد، ئەو ژنەی کە لە دەیەی (١٣٢٠-١٩٤١) سەرۆکی ماڵە خراپەکانی بەندەر عەباس بوو، لە هەمان کاتیشدا زۆر هاوکاری خەڵکانی هەژار و کەمدەستی ئەو شارەی کرد بوو، بەتایبەت زۆر هاوکاری شۆفێرانی کرد بوو لە کاتی بووونی هەر کێشەیەکدا و پارەی بە قەرز دەدا بە خەڵکی و سوودیشی لێ وەرنەدەگرتن.

لە دەیەی (١٣٤٠-١٩٦١) من ئەو ژنەم بینیوە کە هاوڕێی سەردەمی لاوی کوڕە مامەکەم بوو، من چەندین جار ئەوم بینیوە، ئەو لە بەندەر عەباسەوە دەهات بۆ یەزد. دەهات بۆ ماڵی کوڕە مامەکەم، هەر جارێک چەند تەنەکە خورما و یەک گونیە گوێزی هیندی و جۆرەها مزرەمەنی بەندەر عەباسی دەهێنا. چەند ڕۆژێک لە ماڵی کوڕە مامەکەم دەمایەوە. ئەوەش یەکێکە لە دیاردەکانی ئەو سەردەمە، ژنێک بەو هەموو ڕابوردووە خراپەوە لە تەمەنی شەستساڵیدا دەچوو بۆ ماڵی هاوڕێیەکی سەردەمی لاوێتی خۆی، ئەگەرچی ئەو هاوڕێیەی خاوەنی ژن و منداڵیش بوو. ئەو چەند ڕۆژێک لەو ماڵە دەمایەوە، ژنی خاوەن ماڵیش ئاگاداری ڕابردووی ئەو ژنە بووە لەگەڵ هاوسەرەکەی خۆیدا، بەڵام هیچ ڕووگرژییەکی پێوە نەدەبینرا و خزمەتیشی دەکرد. خۆزگە من ئەو کاتە چاوپێکەوتنێکم لەگەڵ ئامنەدا ساز بکردایە، ئێستا دەمتوانی یادەوەرییەکانم لەو بارەیەوە بنووسیایە. ئامنە لە ساڵی (١٣٧٢-١٩٩٣) لە تەمەنی نەوەد و چەند ساڵیدا لە شاری کرمان کۆچی دوایی کرد. بۆ مەڕاسیمی حەوتەمی ئامنە چەند کەسێک لە شۆفێران و خاوەن ئۆتۆمبێلەکان و پیر و پەککەتوەکانی یەزد چوون بۆ کرمان. من چەند مانگێک لە دوای مردنی ئامنە چەند کەسێکم لەوانە بینی کە چوو بوون بۆ مەڕاسیمی حەوتەی ئامنە، ئەوان لە چایخانەی نزیک مزگەوتی بەرخوردار دانیشتبوون. لە بارەی ئامنەوە پرسیارم لێکردن. لەبارەی مەڕاسیمی حەوتەکەیەوە. حاجی محەمەدی

نیلیزادە گوتی ژمارەیەکی زۆری خەڵک لە شارەکانی ئەسفەهان و یەزد و ڕەفسنجان و بەندەر عەباس و سیرجان و شارەکانی ترەوە هاتبوون و بەشداریان لە مەڕاسیمەکەیدا کردبوو. ئەوان چەند یادەوەرییەکیان لەبارەی ئامنەوە باسکرد ئەو هاوڕێ کۆنانەی دەیانگوت ئامنە کەسێک بوو بۆ خۆی و تایبەتمەندیەکی تایبەتی هەبوو، دەیانگوت ئامنە باخە خورمایەکی گەورەی هەیە لە (فین) ی بەندەر عەباس، باخی لیمۆ و پرتەقاڵی هەیە لە دێهاتەکانی حاجی ئابادی بەندەر عەباس. ئامنە تا کۆتایی تەمەنی سەردانی هاوڕێ دێرینەکانی دەکرد و خورما و مزرەمەنی بە دیاری بۆ دەبردن. ژنێکی هاوشێوەی ئامنەش لە ئەردەکانی یەزد هەبوو، ژنێک بوو ناسرا بوو بە (زەهرا مورچە) ئەویش زۆر هاوکاری شۆفێرەکانی کردبوو. من خۆم دەزانم کە چەند جار کەفالەتی ئەو شۆفێرانەی کردبوو کە لەو ڕێگاوبانەدا تووشی ڕووداوی هاتوچۆ دەبوون. ئێستاش ئەو شۆفێرە کۆنانە بەڕێزەوە باسی ئەو ژنە دەکەن کە چەندین خزمەتی پێکردون. مرۆڤ لە هەر شوێن و لە هەر بوارێکدا کار بکات ئەگەر ڕاستگۆ بێت و کارەکانی بە ڕاستگۆیی ئەنجام بدات و ڕەفتارەکانی لەگەڵ خەڵکیدا جوان بێت و خەڵکی لێی ڕازیبن، بە دڵنیایەوە خوداش لێی ڕازی دەبێت. ئەوە هاوشێوەکانی ئامنە و زەهرا مورچەیە کە لە سەردەمی جەنگی جیهانی دووەمدا بە جۆرێک خزمەتیان بە خەڵک کردووە. لە سەردەمی دیکتاتۆرە گەورەکانی ئەو سەر دەمەی وەکو هیتلەر و ستالیندا، مێژوو نرخی کەڵە دکتاتۆرەکان کەمتر لە هاوشێوەکانی ئامنە و زەهرا مورچە باسدەکات، کە ئەوەش یەکێکە لە سەر سوڕهێنەرەکانی ڕۆژگار.

جادەکە خۆڵ بوو، گەلابەکە دەبوو (١٠-١٢) تۆن باری لێ بنرایە، کەچی نزیکەی پازدە تەنی لێبارکرا بوو. حاجی لە لێخوڕیندا هیچ پەلەی نەبوو، زۆر بە هێواشی ماشێنەکەی لێدەخوڕی، دەمزانی کە حاجی لە کودەتای ساڵی (١٣٣٢-١٩٥٣) ی دکتۆر موسەدیقدا ڕۆڵێکی باشی هەبووە و پەیوەندییەکی باشی بە حەسەن ئەردەکانیەوە هەبووە. حەسەن ئەردەکانی لەو ساڵەدا ڕۆڵی شەعبان بێ مۆخی لە مەشهەد دەبینی و بگرە زۆر ئابڕومەندانە تریش. لەبارەی کودەتاکەوە پرسیارم لێکرد، بەڵام ئەو حەزی بە وشەی کودەتا نەدەکرد. گوتی شا کە لە دژی خۆی کودەتای نەکردووە، شا دژە کودەتای کردووە. بە کودەتا ئەویان لە وڵات دەر کردبوو، ئەویش لە دژی کودەتا، کودەتای کردووە، ئێمەش بەپێی توانای خۆمان بەشداری کودەتاکەمان کردووە. ئەو لە قسەکانیدا دیار بوو، کە پەشیمانە لەو ڕۆڵەی لە سەردەمی کودەتاکەدا بینیبووی، وا دەردەکەوت لایەنگری شا بێت و شای خۆشدەویست. هەر بۆیەش لێم پرسی پەشیمان

نیت لەو کارەی کە کردوتە. ئەویش ئاماژەیەکی کرد بۆ پشتی سەری خۆمان و لە پشتی شوشەی پەنجەرەکە نوسرا بوو (خودا، شا، نیشتمان) گوتی مرۆڤ دەبێت بۆ ئەم سیانە گیانی خۆی فیدا بکات. هەر کەسێک بیەوێت دژی ئەم سیانە بجولێتەوە ئێمە ئەگەر چەکیشمان نەبێت پێویستە بە مست و پێلەقە بەرگری بکەین. منیش ئەو رۆژە هیچی ترم لێنەپرسی. پاش چەند ساڵێک دووبارە چاوم بە حاجی غولام رەزای حەلەبی کەوتەوە، لەبارەی رۆژگـارەوە پرسیارم لێکرد، ئەم جارەیان گوتی ئامادە نییە لە پێناو هیچ کەسێک و هیچ شتێکدا بمرێت. گوتی ئەم شایەش هەم گەندەڵە و گەندەڵیش بەرهەمدەهێنێت و بیر لە هیچ کەس و هیچ شتێک ناکاتەوە، تەنها بیر لە خۆشگوزەرانییەکانی خۆی دەکاتەوە. گوتی ئەو رۆژە رۆیشت کە شا بیری لە یانە پاڵەوانییەکان و مەیدانەکانی بار و منداڵان و مەراسیمەکانی ئیمام حوسێن دەکردەوە، ئەو ئێستا تەنها بیر لە شەوئاهەنگەکانی و تەپڵ و مۆسیقا و سوڕدانی ژن و تەلەفزیۆن دەکاتەوە..

پاش چەند ساڵێک شا پشتیوانی خەڵکی لە دەستدا و تـەنها پشتی بەهێزی ساواک و هێزە چەکدارەکانی بەست، ئەو هێزە چەکدارانەی کە هەموو دکتاتورەکانی جیهان پشتی پێدەبەستن، شا وا بیری دەکردەوە کە بە هێزی ساواک دەتوانێت خەڵکی بترسێنێت. ساواک ئەو هەواڵانەی دەزانی کە چەند خوێندکارێک بەیەکەوە دەوەستن و شەوانە بە یەکەوە کۆدەبنەوە، بەڵام هەمان ساواک نەیدەتوانی پێشبینی بکات کە ئەو خەڵکە چ هێزێکیان هەیە؟ هەستیان بەوە نەکرد کە خەڵکێک ئەگەر یەکگرتووبن، ترسیان لە هەموو شتێک دەشکێت.

حاجی لە گوندی حەکیم ئابادی نێوان چناران و قوچان کاری هەبوو، لەو گوندەدا لانیکەم یەک کاتژمێرماینەوە، کاتێکیش گەیشتینە قوچان، حاجی ئۆتۆمبێلەکەی بەرەو ناو شار برد. گوتم حاجی بۆچی دەچیتە ناو شار؟ گوتی ئەمڕۆ میوانێکی خۆشەویستم هەیە، دەڕۆین شیشلیکی قوچان دەخۆین. لە یەکێک لە شەقامەکانی قوچان کەبابخانەیەک هەبوو بە ناوی کەبابخانەی خەیام. کەباب و شیشلیکی هەبوو. لە ڕاستیدا من یەکەم جارم بوو شیشلیک بخۆم، ئەو کاتە هیچ یەکێک لە ڕێستورانتەکانی تەربەقە و شاندیز و مەشهەد ئەو جۆرە خواردنەیان نەبوو. ڕێستورانتەکانی ناو شاری مەشهەد زیاتر برنج و کەبابیان هەبوو. منیش پارەی شیشلیکم پێنەبوو، بە هەر حاڵ من بۆ یەکەم جار و بە پارەی حاجی غولام ڕەزای حەڵبی لە شاری قوچان شیشلیکم خوارد. ئێوارە گەیشتینە گەردەنەی بەدرانلو، کە گەردەنەیەکی ترسناک و هەڵدێرە، ساڵانە لەو گەردەنەیە چەندین

کەس بە هۆی هەڵدێرانی ئۆتۆمبێلەوە دەمرن. لە ساڵی (١٣٨٠- ٢٠٠١) وە جادەی تازەی بۆ دروستکراوە، هەرچەندە ئەو جادەیەش هەر ترسناکە، بەڵام زۆر لە جادە کۆنەکە باشترە.

## حەمید تورکمان

کاتژمێرێک لە شەو تێپەڕی بوو کە لە خوار ئاشخانەوە لەئۆتۆمبێلەکەی کەربەلایی دابەزیم و خوداحافیزییم کرد. شەوێکی تاریک ببوو، دووری ڕێگاکە تا ئاشخانە دوو کیلۆ مەتر بوو. هیچ کەسێک لەو ناوە نەبوو، هەواش کەمێک ساردبوو. جێگایەک کە ئێستا (١٣٩٠-٢٠١١) جادەکەی قیرتاو کراوە و کارەبای پێگەیشتوە و ئۆتۆمبێل بەزۆری هاتوچۆی پێدا دەکات. لە ساڵی (١٣٤٨-١٩٦٩) دا، باڵدار باڵی تیا لێک نەدەدا. دەبوو چیم بکردایە. کیسە خەو و کۆڵە پشتەکەم دا بە کۆڵمدا و کەوتمەڕێ. خۆشم نەمدەزانی کە شەو دەبێت لەکوێ بخەوم؟ لە ئاشخانە نە میوانخانە هەبوو نە کاروانسەرایەک. شوێنەکە چۆڵەوانی بوو. گوێم لە حەپەی سەگەکان بوو، دارێکی ئەستوری باشم دۆزییەوە و گرتم بە دەستمەوە. ئیتر کێ دەڵێت خەڵکی شاری یەزد ترسنۆکن؟. هەور ئاسمانی گرتبوو، ئەستێرەکان دیار نەبوون، دونیا زۆر تایک بوو. خوێندکارێکی بچکۆلانە بەخۆی و کۆڵەپشتێکی قورسەوە دەیویست خۆی بگەیەنێتە گوندەکە. گوندێک کە ئێستا (١٣٩١-٢٠١٢) چەند بەرامبەر زیادیکردووە و بووە بە شارێکی قایمقام نشین. چەند سەگێک ماوەی چەند مەترێک لێم نزیک کەوتنەوە، هەر زوو زانیم کە ئەو سەگانە سەگی مێگەلە مەڕنین و غیرەتی ئەوەیان نییە پەلامارم بدەن، کات لەدوای کات ژمارەیان زیاد دەبوو، خۆشم نەمدەزانی بەنیازی چین، نەدەکرا بووەستم و نەدەکرا ڕابکەم. دەبوو بە هەمان شێوە بە هێواشی بڕۆیشتمایە. ژیانیش هەروایە، پڕیەتی لە سەگ و هاوڕێیەتیت دەکەن. ئەگەر ڕابکەیت نابووتت دەکەن، ئەگەر بووەستیت و بەردێک لەهەر سەگێک بدەیت هەرگیز بە ئاوات ناگەیت. ئەم بۆچوونە چەند ساڵێک لەوەدوا دکتۆر حسێن شکۆیی لە وتەیەکی دۆستۆیفسکی‌دا بۆی نووسیبووم، بەڵام من ئەو شەوە هەستم بەوە کرد. ئەوەی لە ڕێگەی ئاشخانەدا ڕوویدا هەر ئەوەیە لە ڕێگەی ژیاندا ڕوودەدات.

تێلاکەم توند بە دەستمەوە گرتبوو، هەرچەندە دڵنیا نەبووم ئەگەر سەگەکان هێرش بکەنە سەرم، ئایا دەتوانم بەرگری لەخۆم بکەم یان نا؟ زیاتر لە هەر شتێک لە بیری حەزرەتی عەباسدا بووم. خۆ خراپ نییە مرۆڤ جار جارێک بترسێت و لە قوڵایی دڵەوە یادێک لە خودای خۆی بکاتەوە. وا بزانم یەکێک لە هۆکارەکانی ئەو دکتاتۆرانەی کە

زوڵم دەکەن و خەڵکی دەچەوسێننەوە، ئەوەیە لە هیچ شتێک ناترسن، نە لە یاسا، نە لە ئەنجومەنی نوێنەران، نە لە یاسا نێودەوڵەتییەکان، بەڵکو تەنها پشتیان بە سەگەکانیان بەستووە و خودای گەورەشیان لە بیر کردووە. نموونەی ئەو دکتاتۆرانەش هیتلەر و مۆسۆلۆنی و ستالینن. لەم دواییانەش دا قەزافی و سەدام حسێن و موسا چۆمبی. بەڵێ بە ڕاستی ترسابووم، لە دڵی خۆمدا گوتم بەندەی خودا خۆت تووشی چ چارەنووسێک کردووە؟ خوێندنەکەت جێهێشتووە و هاتوویتە ئەم چۆڵەوانییە؟ جاری یەکەم کە هاتم بۆ ناو هۆزەکان لەسەر داوای دکتۆر عەباس سەعیدی بوو، کە ئەرکێکی پێسپاردم ئەویش وانە وتنەوە بوو بە بێژەن. جاری دواتریش کە ڕۆیشتم لەبەر خاتری بینینەوەی گڵپۆ بوو، دواجاریش بۆ زەماوەندی بێژەن بوو، بەڵام ئەمجارەیان هیچ شتێکی وا نەبوو، لە بینینی کۆچ و کۆچبەری هۆزەکان. ویستم هەست بە تەنیایی بکەم، لەو دەشت و چۆڵەوانیەدا هەستم بە ترسێکی زۆر دەکرد، لە دووریی پەنجا مەتر پێش یەکەم ماڵی گوندەکە یەک ڕەوە سەگی تر تێکەڵی سەگەکان بوون، ئیتر چواردەوریان گرتم و هێرشیان بۆ هێنام، منیش ئەو تێلایەی بەدەستمەوە بوو، بە هەموو هێزی خۆم کێشام بەسەری سەگێکیاندا ئەو بەستەزمانە دەستیکرد بە قرووسە قرووسک و ڕایکرد. تا ئەو کاتە نەمدەزانی کە ئەو هەموو هێزەم هەیە. ئایا ترس ئەوەندە هێز بە مرۆڤ دەبەخشێت؟ ئەمە یەکەمین لێدان و دوایین لێدان بوو. بەڕاکردنی ئەم سەگە، سەگەکانی تر نەیان توانی پەلامارم بدەن، نە ڕایانکرد و نە لێشم دوورکەوتنەوە، پێ بەپێ لەگەڵمادا هاتن تا گەیشتمە یەکەم ماڵی گوندی ئاشخانە. یەک ڕەوە سەگم لەگەڵ خۆمدا بردە ناو گوندەکەوە.

شەوێکی زۆر سارد بوو، سەرماکە بە تەواوی کاری تێکردبووم، بەڵام تا ئەو کاتە لە ترسی سەگەکان هەستم بە سەرما نەکردبوو. بە بینینی ماڵەکان و ڕووناکی نێو ماڵەکان تێگەیشتم هەوا چەند ساردە! ماڵێکم هەڵبژارد، وا هەستمدەکرد لە ماڵەکانی تر باشتربێت. لە دەرگاکەم دا، دەنگێک هات بە زمانی کوردی، بەڵام من هیچی لێ تێنەگەیشتم، ژنێکی بە تەمەن بە جلوبەرگی کوردییەوە دەرگاکەی کردەوە. گوتم من خەڵکی ئەم ناوچەیە نیم و دەمەوێت بچم بۆ میوانخانەیەک، ئایا لێرە میوانخانە هەیە؟ ئەو ژنە فارسی باش نەدەزانی گوتی کەمێک بووەستە. هێشتا سەگەکان لە دەوروبەرم بوون، بەڵام پەلاماریان نەدەدام، ئەوانیش دەیانزانی گەیشتوومەتە ئاوەدانی و کەمێک یاسا و پاسەوان هەیە. پیاوێکی تەمەن پەنجا ساڵ لە ماڵەکە هاتە دەرەوە و سەیرێکی کردم و گوتی بۆچی لێرە وەستاویت؟ فەرموو وەرە ژوورەوە، گوتم بەدوای میوانخانەدا

دەگەڕێم. گوتی لەم گوندەدا هەموو ماڵێک میوانخانەیە، دیارە خودا ئێمەی خۆشدەوێت بۆیە وا میوانێکی بۆ ناردووین. بەلای ئەو خەڵکەوە میوان گەورەترین دیاری خودا بوو. چەندین جار ئاگاداربووم ئەو خەڵکە میوانیان بە باشترین دیاری خودا زانیووە. لە سەردەمێکدا کە تەلەفزیۆن نەبوو، ڕادیۆ و بەرنامە نەبوو، هەواڵ نەبوو، ڕۆژنامە و کتێب نەبوو، میوان مایەی دڵخۆشکی بوو بۆ ئەوان. ئەوسا خەڵک بە سادەیی دەژیان میوانەکەشیان بە بەشێک لە خۆیان دەزانی و خواردنی تایبەتیان بۆ دروست نەدەکرد. خواردنی ئەوکاتە زیاتر چێشتێکی سادە بوو. یەک جام ئاویان زیاتر لەچێشتەکە دەکرد و پارووە نانێکیش پەیدا دەبوو. نە شیرینی هەبوو، نە میوە هەبوو، نەکورسی و قەنەفە هەبوو، تەنیا ڕێز و خۆشەویستی هەبوو. چا هەبوو جارجارێکیش کەمێک شەوچەرە هەبوو.

ئەم پیاوە کوردە منی بردە ژوورێکی پڕ لە منداڵەوە، ئەم پیاوە هەشت منداڵی لە ژنی یەکەمی هەبوو. کە هەموویان لە مراوتەپە بوون، یازدە منداڵیشی لە ژنی دووەمی هەبوو. دوو نەوەشی لە ژوورەکەدا بوون، سەرجەم سیازدە کەس لەو ژوورەدا بوون. خۆیان نان و چایان خواردبوو. سفرەیان ڕاخست و خواردنیان بۆ من هێنا، لە پەنیر و ڕۆنی زەرد، لە هۆی هاتنی منیان پرسیی بۆ ئەو ناوچەیە. گوتم دەچم بۆ قوڕەمەیدان و دەچم بۆلای هەوارەکەی حاجی عەلی خانی قارەمانلو. ئەو پیاوەش کۆچەریی بوو، بەڵام وازی لە کۆچەریی هێنا بوو لەگوند دادەنیشت و کاری چێوداری دەکرد، خانوویەکی گەورەی هەبوو. چەند ژوورێکی تێدابوو، بەڵام هەموویان لەیەک ژووردا کۆببوونەوە. ئەو حاجی عەلی خانی دەناسی، دوای نانخواردن گوتی ماندوویت دەتەوێت بخەویت. ئەگەر ناتەوێت بخەویت کەمێک شمشاڵت بۆ لێدەدەم. کوڕە گەورەکەی گوتی ساڵێک دەبێت باوکم شمشاڵی لێنەداوە. کچەکەشی گوتی شمشاڵی لێداوە، بەڵام بۆ ئێمەی لێنەداوە و بۆ خەڵکی تری لێداوە، ژنەکەشی بە کوردی گوتی ئێستاش کە لێیدەدات بۆ میوانەکەیە نەک بۆ ئێمە. پیاوەکەش گوتی ئاخێر لەبەر ئەوەیە کە گوتویانە هاتنی میوان خێر و بەرەکەتە. ئینجا گوتی بێدەنگبن و ئاهـ وناڵەم لە زمانی شمشاڵەکەمەوە ببیستن. تێگەیشتم کە من نەبوومە هۆی بارگرانی بۆیان، بەڵکو شادی و خۆشیم بۆ هێناون، سەرینێکیان هێنایە ژێر پشتمەوە و گوتیان بە تەواوی پشووبدە و قاچەکانت ڕاکێشە، قاپێک شەوچەرەیان لە بەردەمم دانا و پیاوی خانەخوێ شمشاڵەکەی خستە سەر لێوی، من هیچ شتێکم لە شمشاڵ و مۆسیقا نەدەزانی، بەڵام وابزانم هیچی کەمتر نەبوو لە مامۆستای خودالێخۆشبوو (کەسایی) مۆسیقاری ئێرانی. ئەو پیاوە بە شمشاڵەکەی

لەگەڵ هاوسەرەکەی قسەی دەکرد بە شمشاڵەکەی ڕێز و خۆشەویستی بۆ میوانەکەی دەردەبڕی.

لە ساڵی (١٣٧٢-١٩٩٣) خوێندکارانی ماستەری جوگرافیای زانکۆی فیردەوسیم بۆ گەشتێکی زانستی برد بۆ ناوچەی بەختیاری. لە یەکێک لە گوندەکانی ناوچەی بەختیاری هەر لەخۆمەوە لە دەرگایەکمدا، تاکو چەند پرسیارێک بکەم، پیاوێکی تەمەن حەفتا ساڵ لەگەڵ خێزانەکەیدا من و خوێندکارەکانیان لەگەڵ خۆیاندا بردە ژوورەوە و لە ژوورێکی گەورە دایانناین. منداڵانی ماڵەکە خەریکی چا لێنان بوون. ژن و پیاوی خاوەن ماڵ هەڵسان و دەستیان کرد بە سەما. ئەو ژن و پیاوە تەمەن حەفتا ساڵە بە سەما پێشوازییان لە ئێمە کرد. سەمای خێڵەکییەکان جوانترین پێشوازی و گەورەترین خزمەتە بە میوان. سوپاس بۆ خودا خوێندکارەکان لە ڕاپۆرتەکانیاندا باسی ئەو سەمایەیان نەکردبوو، خۆ ئەگەر باسیان بکردایە من نەمدەتوانی ئەوەندە وەڵامی خوێندکارانی تری بەشدار نەبووی گەشتەکەمان بدەمەوە لەسەر ئەو سەمایە.

ئەوشەوە لە ئاشخانە دەنگی شمشاڵەکەی عەباسی خاوەن ماڵ، منی برد بۆ جیهانێکی تر و زوو زووش چایەکیان بۆ تێدەکردم. شەو درەنگ بوو، منیان بردە ژوورێکی تایبەت بۆ نووستن، ژوورێکی خۆش بوو، نوێنی خاوێن و تازەیان بۆ دانابووم، کەوتمە خەوێکی قووڵەوە تا بەیانی ئاگام لە هیچ شتێک نەبوو. بەیانی کاتێک بەئاگاهاتم هەتاو کەوتبوو. عەباسی خاوەن ماڵ ڕۆیشتبوو بۆ سەر کارەکەی خۆی، کوڕە هەژدە ساڵەکەی لەماڵەوە بوو، وا بزانم ئەو کوڕەش لەبەر خاتری من لەماڵەوە بوو، ئەوان چوار منداڵیان دەچوون بۆ قوتابخانە. مریەمی خێزانی عەباس بەرچایی ئامادەکرد بوو، گوتم ئێوە چۆن لە دێهات نیشتەجێن؟ مریەم گوتی لەبەر ئەوەی منداڵەکانمان بنێرینە قوتابخانە، دەمانەوێت منداڵەکانمان خوێندەواربن، خۆم بە هاوسەرەکەمم گوت دەبێت کارێک بکەین منداڵەکانمان بخوێنن، ئەوەندە پێداگیریم کرد تا ناچارمکرد مەڕەکان بفرۆشێت و بێینە گوندی ئاشخانە. لێرە خانوومان دروستکرد و ئێستا کاروبارمان زۆر لەوکاتە باشترە، منداڵە گەورەکانیشمان لێرە کاردەکەن. حسێن کە کوڕە گەورەمانە تراکتۆری کڕیوە و کاری پێدەکات بۆ خەڵکی. دوای نانخواردن خوداحافیزییم کرد و کۆڵەپشتەکەم هەڵگرت و ڕۆیشتمە دەرەوە، دەبوو ئۆتۆمبێل پەیدا بکەم و بڕۆم بۆ قوڕەمەیدان. لە ئاشخانە چوارڕیانێکی لێبوو گوتیان ئەگەر لەچوارڕیانەکە بووەستیت ڕەنگە ئۆتۆمبێل پەیدا ببێت. تا نزیک نیوەڕۆ لەوێ وەستام، بەڵام هیچ ئۆتۆمبێلێک نەهات تا بەرەو قوڕەمەیدان بڕوات. خەڵکی گوتیان بەیانیان زوو

ئۆتۆمبێلێک دەڕوات بۆگوندەکانی دەوروبەری تورکمان. بۆیە دەبێت بەیانی زوو بێیت، جارجاریش ئۆتۆمبێلی سەربازی بەرەو شائاباد دەڕۆن. شائاباد شارۆچکەیەک بوو لە کۆتایی قورمەیدان، ئەم گوندە لە نزیک گەردەنەی شەلەمی بوو، لەو شوێنە ڕادار دانرابوو لەلایەن ئەمەریکییەکانەوە سەرپەرشتی دەکرا و هەر لەوێوە سەیری دەزگا موشەکییەکانی وڵاتی سۆڤیەتیان دەکرد. گوندی ڕاجیش گوندێکی لەو شێوەیە بوو، نەخۆشخانەیەکی لێ دامەزرا بوو کە تایبەت بوو بەو نەخۆشانەی تووشی (گەڕی) ببوون و لەلایەن خۆبەخشە ئایینییە فەرەنسییەکانەوە بەڕێوەدەچوو. جارجاریش ئۆتۆمبێلی فەرەنسییەکان لە ئاشخانەوە دەڕۆیشتن بەرەو گوندی ڕاجی، بەڵام ئایا ئۆتۆمبێلە سەربازییە ئەمریکایی و فەرەنسییەکان منیان لەگەڵ خۆیاندا هەڵدەگرت؟

کەسێک هاتە لامەوە و گوتی ئێستا ئۆتۆمبێل دەستناکەوێت، حوشترێک بەکرێ بگرە و بڕۆ بەرەو هەوارەکەی حاجی عەلی خان. لەو وتووێژەدا بووین، تراکتۆرێک هات، شۆفێری تراکتۆرەکە بە جلوبەرگەکانیدا دیاربووکە تورکمان بوو، لە بەردەمیدا وەستام و گوتم بۆ کوێ دەچیت؟ گوتی ئەمە تراکتۆری ماڵی حاجی ڕەحمانی ئینجەییە. منیش دەچم بۆ ئینجە.

حاجی ڕەحمان گەورەی تورکمانەکانی ئینجە بوو، تراکتۆری تازەی کڕی بوو پیاوێک کە کاری بۆ دەکرد ئەو تراکتۆرەی لێدەخوڕی، دەڕۆیشت بۆ گوندی ئینجەی خواروو. واتە تراکتۆرەکە بە هەموو دەشتی قورمەیدان دەگەڕا. داوام لە شۆفێرەکە کرد لەگەڵ خۆیدا بمبات. ئەویش زۆر بە میهرەبانییەوە گوتی فەرموو، کەلوپەلەکانی لێ وەرگرتم و خستە دوای تراکتۆرەکەوە. تراکتۆرەکە جگە لە کورسی شۆفێر لەملاولاوە دووکورسی تری هەبوو، لە سەر یەکێک لە کورسییەکان دانیشتم. کەوتینە ڕێگا، شۆفێرەکە ناوی حەمید بوو، تورکمان بوو، پیاوێکی زۆر میهرەبان بوو. من چەندین جار میوانی ئەوان بووم، جگە لە میهرەبانی و باشی هیچی ترم لێ نەبینیون. ئەویش حاجی عەلی خانی دەناسی، گوتی نێوان هەوارەکەی حاجی عەلی خان تاکو ئاشخانە (٣٥-٤٠) کیلۆ مەتر دەبێت.

ئاسمان ساماڵ بوو، خۆر بەدەرەوە بوو، بەڵام سەرما بوو، «با»یەکە لە دەموچاومی دەدا، زۆر سەرمامم بوو، بەڵام هیچ چارەیەک نەبوو، جادەکە خۆڵ وپڕ لە تاسە و چاڵ بوو. چەند جارێک خەریک بوو لە تراکتۆرەکە بکەومە خوارەوە. حەمید تراکتۆرەکەی لەگورگان وەرگرتبوو. تاکو ئاشخانە بە ئۆتۆمبێل هێنابووی، لەوێشەوە بە لێخوڕین دەیبرد بۆ ئینجەی خواروو..

دەشتی قورەمەیدان هەمووی موڵکی شاناز پەهلەوی بوو، شاناز تێکرای بە پارچەی سەد هێکتاری، دابەشکرد و فرۆشتی. حاجی رەحمانی ئینجەیی چەند پارچەیەکی لەو پارچە زەوییانە کڕیبوو. زەوییەکانی بۆ کشتوکاڵ بەکاردەهێنا، ئەو تراکتۆرەشی بۆ کێڵانی زەوییەکان کڕیبوو. کاتی نیوەڕۆ بوو حەمید تراکتۆرەکەی ڕاگرت و ویستی نوێژبکات. ئەویش وەکو تورکمانەکانی تر لەکاتی خۆیدا نوێژی دەکرد. منیش لەگەڵ ئەودا دابەزیم بۆ نوێژکردن. کاتێک خەریکی دەستنوێژگرتن بووم بەو ئاوە ساردە، سەرما چووە هەموو گیانمەوە و تەزیم. دوو موسڵمان بە دوو مەزهەب هەر کەسە و بە مەزهەبی خۆمان نوێژمان کرد، یەکێکمان دەستمانگرت بوو یەکێکمان بە دەستی کراوەوە. دوای تەواوبوونی نوێژ حەمید هەندێک دار و چیلکەی کۆکردەوە و ئاگرێکی کردەوە و قۆریی خستە سەر ئاگر بۆ چا لێنان، لەو سەرمایەدا تینی ئاگرەکە زۆر خۆش بوو. حەمید تەنها یەک پیاڵەی لابوو. یەکەم چای تێکرد و لە بەردەمی مندا دایینا، چونکە میوان بووم، هەندێک قاورمەشی پێبوو ناچاری کردم تا لەگەڵیدا بخۆم. زۆرترینی قاورمەکەی دا بە من.

هەر ماڵێکی تورکمان ڕۆژی جەژنی قوربان گوێرەکەیەک یاخود مەڕێک دەکەن بەقوربانی، بەڵام زیاتر گوێرەکە دەکەنە قوربانی، لە گۆشتەکەی بەشی خەڵکی تریش دەدەن. هەر بەو گۆشتە قاورمە دروستدەکەن. لە ئێستاشدا ساڵی (١٣٩١-٢٠١٢) ئەم دابونەریتە هەرماوە. زۆربەی دانیشتووانی گوندەکانی ئەو دەوروبەرە وەک کەلاتەی ئاوریشم، سەنگسار، کەلاتەی کاریز، کەناری ڕووباری سومبار، تەکنە تورکمان و وامانلی لە ڕۆژی جەژنی قورباندا گوێرەکە یاخود مەڕ دەکەنە قوربانی. ئەوان ورگی مەڕەکە یاخود گوێرەکەکە دەردەکەن و باش دەیشۆن و پاکی دەکەنەوە و دەیکرێنن تا وەکو میزەڵان تەنک دەبێت، قاورمەکە ئامادە دەکەن و دەیکەنە ئەو ورگەوە ئیتر ژەم بۆ ژەم کەمێک لە قاورمەکە دەردەکەن و گەرمی دەکەنەوە و دەیخۆن. من چەندین جار ئەو قاورمەیەم لە گوندە تورکمان نشینەکان خواردووە، ساڵی (١٣٨٨-٢٠٠٩) میوانی حاجی ئاخوندی سەرفرازبووم. لەگوندی کەلاتەی ئاوریشم، ئەم ئاخوندە بەڕێزە لەو قاورمەیەی دا بە من و هاوڕێکانم..

پەرێزەکانی گەنم و جۆ، ببووە هۆی مانەوەی زیاتری هۆزەکان لەو دەشتەدا. هۆزەکان پەرێزەکانیان لە جوتیاران دەکڕی، چونکە درەوی گەنم و جۆیان بە کەمپاین دەکرد، قەرسەڵی گەنم و جۆکە زیاتر لە پەرێزەکەدا دەمایەوە ئەوەش دەبووە لەوەڕێکی باش بۆ ئاژەڵەکان. خۆ ڕەنگە قورەمەیدان یەکەمین ناوچەی پارێزگای خۆراسانی گەورە

بووبێت کە بۆ درەوی گەنم وجۆی دێمی سوودیان لە کەمپاین وەرگرتبێت. قەرسەڵی کەمپاین بەرزە، واتە کەمپاین چڵە گەنمەکان (١٥-٢٠) سم بەرزتر لەزەوەییەوە دەبڕێت. بەمەش «کا» یەکی زۆر لەزەوییەوە دەمێنێتەوە، ئەم کایە ئەگەر کۆبکرێتەوە و بکوترێت باشترین خۆراکی ئاژەڵە. هۆزەکان ئەم قەرسەڵە دەکرن بۆ ئاژەڵەکانیان و تاماوەیەکی زیاتر لە قوڕەمەیدان دەمێننەوە و درەنگ تردەڕۆن بۆ تورکمان سەحرا.

حاجی عەلی خان دوو هەزار هێکتاری لەو پەرێزە کڕیبوو. سێ مانگ بوو مێگەلەکانی لە دەشتی قوڕەمەیدان دەلەوەڕان. ئەم دەشتە ئاوی نەبوو، بە پشتی حوشتر ئاویان لە شوێنە دوورەکانەوە دەهێنا. حەمید دەیگوت ڕەنگە بە تراکتۆر ئاوببات بۆ هۆزەکان و کرێیان لێوەربگرێت. واتە کاری ئاوفرۆشی دەکات. ئەمەش کارێکی تازە بوو. هەموو گۆڕانکارییەک کارێکی تازە پەیدادەکات.

مرۆڤ پێویستە سوود لە دەرفەتەکان ببینێت، ئەوەتا تراکتۆر دەکرن بۆ کێڵانی زەوییەکانیان. لەکاتی بێکاریشدا کە کێڵانی زەوی نامێنێت ئاو دەبات بۆ کۆچەرییەکان. دواتریش هەر بە هەمان شێوە بوو، کۆچەرییەکان لەپێناوی مانەوەی زیاتریان لە قوڕەمەیدان تانکەری چەند هەزار لیتریان دەکڕی و بە تراکتۆر لەدوورەوە ئاویان دەهێنا، سەرەتا بە تراکتۆری تورکمانەکان، بەڵام پاش چەند ساڵێک کۆچەرییەکان خۆیان تراکتۆریان کڕی.

وتارێکم بە زمانی فەرەنسی نووسیبوو دەربارەی گۆڕانکاری و ئامرازەکانی گواستنەوە لە نێو کۆچەرییەکاندا. پاشان وەرمگێڕایە سەر زمانی فارسی و لەگۆڤاری ئەدەبیاتی زانکۆی مەشهەد لە ساڵی (١٣٦٤-١٩٨٥) بڵاوم کردەوە. حەمید زانیارییەکی زۆری پێدام لەسەر قوڕەمەیدان، هۆزە تورکمانەکان، گەورە پیاوانی تورکمان. گفتوگۆیەکی زۆرمان کرد دەربارەی گوندەکانی تورکمانی ئامەد، ئینجەی خواروو، مراوتەپە.

## قوڕەمەیدان - پەری خانم

لە دوورەوە ژمارەیەک ڕەشماڵم بینی، وام هەستکرد ئەوە هەواری حاجی عەلی خان بێت. حەمید گوتی ئەوانە ڕەشماڵی عەبدولعەلی بلندن، لە بەردەمی ڕەشماڵەکاندا وەستاین. تراکتۆرەکە تازە بوو. حەمید پێی باش نەبوو بە خێرایی لێی بخوڕێت. سەرەتای دەستپێکردنی گێچی کیلۆ مەترەکەی بوو. خەڵکەکە هاتن و لە تراکتۆرەکە کۆبوونەوە، زۆربەیان تا ئەو ڕۆژە تراکتۆریان نەدیبوو. عەبدولعەلی ئێمەی برد بۆ

ڕەشماڵەکەی خۆی.

کورد و تورکمان دۆستایەتییەکی باشیان هەبوو بەیەکەوە، بەزوویی چایان بۆ ئامادە کردین. کورد و تورک و فارس پێکەوە بەدەوری قوڵکەکەدا دانیشتین. عەبدولعەلی کاتێک ئاگاداربوو لەهۆی هاتنم بۆ ئەو ناوچەیە. گوتی تۆ لێرە بمێنەرەوە، ئێمەش پاش چەند ڕۆژێکی تر دەچین بۆ تورکمان سەحرا، گوتی دووسبەی گەورەی هەموو هەوارەکانی ناوچەکە دەڕۆین بۆ هەوارەکەی حاجی عەلی خان، هەموومان دەبێت لەوێ کۆ ببینەوە و بەرنامەی کۆچکردن دادەنێین. نزیکەی بیست هەزار سەر مەڕ لە دەشتی قورەمەیدان هەبوون، ئەگەر بەبێ بەرنامە کۆچیان بکردایە ئەوا لە گەردەنەی شەلەمی تووشی تەنگوچەڵەمە دەبوون. عەبدولعەلی گوتی. هێشتا لێرە لەوەڕ هەیە، بەڵام وا خەریکە هەوا سارد دەبێت، ئیتر ڕۆژ بە ڕۆژ سەرماکەش زیاد دەکات، بۆیە دەبێت بەزوویی بڕۆین بۆ تورکمان سەحرا. بە عەبدولعەلی بڵندم گوت چونکە پێشتر هەواڵم ناردووە بۆ حاجی عەلی خان کە دەچم بۆ سەردانی، بۆیە دەبێت من بە زوویی بڕۆم بۆ هەوارەکەی ئەوان، بەڵام کە گەیشتینە تورکمان سەحرا بەدڵنیاییەوە دوو ڕۆژ لە لای تۆ دەمێنینەوە.

عەبدولعەلی سەرۆکی هەوارێک بوو، ئەو خۆی نزیکەی پێنجسەد سەر مەڕی هەبوو، چەند ماڵێکی تریش لەگەڵ ئەودا بوون، ئەو ماڵانەش هەموویان بەگشتی (٢٢٠) سەر مەڕیان هەبوو، تێکڕای مێگەلەکەیان دەبوو بە (٧٢٠) سەر مەڕ. دوای پشوودان و چا خواردنەوەیەک، دووبارە کەوتینەوە ڕێ، بەرەو باکوور و باکووری خۆرئاوا دەڕۆیشتین. تیشکی خۆرەکە ڕاستەوخۆ لە چاوی دەدام، گەرمیەکەی کەمێک لە سەرماکەی کەم کردبووەوە، بەڵام هەوا ڕوو لە ساردی بوو. هێشتا کاتژمێرێکی مابوو بۆ ئێوارە کە حەمید منی لە بەردەم ڕەشماڵەکانی حاجی عەلی خاندا دابەزاند. ڕەشماڵەکان کەمێک لەجادەکەوە دوور بوون، بەڵام لەبەر خاتری من تراکتۆرەکەی لە جادە کە لادا و بردمی تا بەردەم ڕەشماڵەکان. ئەم تورکمانە تەمەن سی و ئەوەندە ساڵەیە، منی لەو دەشتە دا نەبەزاند، خۆ ئەگەر لە سەر جادەکە دابیەزاندمایە، ئەوا دەبوو لایەنیکەم سێ کیلۆ مەتر بە پێ بڕۆشتمایە. ئیدەچوو شەوم بەسەردا بهاتایە تا دەگەیشتم.

لە مەشهەدەوە تا ئەوێ کرێی ئۆتۆمبێل و خواردنم نەدا بوو، واتە یەک ڕیاڵم خەرج نەکرد بوو، لە هەموو جیهادا وڵات لە وڵاتی ئێمە باشتر نییە. کاتێک تراکتۆرەکە لە جادەکە لایدا و بەرەو هەوارەکە ڕۆیشت، هەموو خەڵکەکە لەبەردەمی ڕەشماڵەکان

وەستابوون. هاتنی تراکتۆرەکە ڕووداوێکی تازە بوو، لەو ساڵانەدا ئەگەر ئۆتۆمبێلێک بهاتایە بۆ ئەو هەوارانە ئەوە نیشانەی هاتنی میوانێک بوو. کاتێک بە سواری تراکتۆرەکە گەیشتمە نزیکی ڕەشماڵەکان، غەفار و عەبدال و هاوڕێکانیان بەڕاکردن بەرەوپیرمان هاتن، هاواریان کرد موهەندیس هات، موهەندیس هات. عەلی خان چەند مەترێک هات بەرەو پیرم، مەنوچەهر و فەریبورزیش هاتن، بەڵام کچەکانی خان لەلای ئەو کۆمەڵە خەڵکە نەبوون کە وەستابوون و نەهاتن. عەلی خان بەڕێزەوە منی برد بۆ ڕەشماڵەکەی خۆی. حەمید دەیویست بە زوویی بگەڕێتەوە، بەڵام عەلی خان پێیگوت دەبێت چایەک بخۆیتەوە، ئیتر ئەویش لەگەڵماندا هات بۆ ڕەشماڵەکە. ئەو پیاوە تورکمانە کەمێک لە ڕەشماڵەکەدا پشوویدا. عەلی خان گوتی مێگەلەکەمان کێشەی بێئاوی هەیە، هەر لەوێ بڕیاردرا لە سبەینێوە حەمید ئاویان بۆ بهێنێت. حەمید خۆی تەنکەری هەبوو. گوتی تانکەرەکەی لە دوای تراکتۆرەکە دەبەستێت و لە ڕووباری (ئاموون) ـەوە ئاویان بۆ دەهێنێت، بەڵام ماتۆڕیان نییە دەبێ ڕێگا چارەیەک بدۆزینەوە کە لە ڕووبارەکەوە ئاو بکەنە نێو تەنکەرە پێنج هەزار لیترییەکەوە. یەکەمین کڕیاری ئاو بە تانکەر لە هەموو ئەو دەشتەدا، عەلی خان بوو. یەکەمین شۆفێری تراکتۆریش کە ئاوی بار کرد حەمید بوو. تراکتۆرەکەش هی حاجی ڕەحمانی ئینجە بوو.

بڕیاردرا حەمید مۆڵەتی ئاوهێنان لە حاجی ڕەحمان وەربگرێت. حەمید چایەکی بە چەند پارووە نان و ڕۆنی زەردەوە خوارد و خوداحافیزیی لێکردین و بەڵێنی لێ وەرگرتم کە سەرێک لەگوندکەی ئەوانیش بدەم. لەو تاریکە شەوەدا دەنگی تراکتۆر و ڕووناکی لایتەکانی شتێکی خۆشبوو بۆ هەموو خەڵکی هەوارەکە. عەبدال و هاوڕێکانی لە دەوری من بوون، منیش بسکیت و نوقڵ و نەباتم بۆ منداڵان هێنابوو. «یەلە»ش کاتێک منی بینی زۆر خۆشحاڵ بوو، بە پێچەوانەی جارانی پێشوو کە هەمیشە بێدەنگ بوو، ئەم جارە قسەی دەکرد، ئەو تەمەنی بەرەو نۆ ساڵی دەچوو، تۆپێکی یاریکردنم بۆ منداڵان هێنابوو، منداڵان لە خۆشی تۆپەکە بەو شەوە دەستیانکرد بە یاریکردن. هەڵبەت هەرگیز پێشتر یاری تۆپێنیان نەبینی بوو، تەنانەت هەر ناویشیان نەبیستبوو، ئەوان دەیانزانی تۆپ چییە، بەڵام یاری تۆپێنیان نەدەزانی. هەستمکرد عەلی خان هێنانی ئەو تۆپەی پێخۆش نەبوو. فەریبای کچی خان تۆپەکەی لە عەبدال وەرگرت و بە ئارەزووی خۆی شوتێکی لێدا، ئیتر لەو تاریکی شەوەدا یاری دەستپێکرد.

لە کۆتایی مانگی (ئازەر -ک یەکەم) دا، ژنان و منداڵان کارێکی زۆریان نامێنێت. لەو کاتەدا مەڕەکان نە شیریان تێدایە و نە بەچکەشیان هەیە، مەڕەکان دەبوو لە

تورکمان سەحرا بزانایە و بەچکەیان ببوایە. تێکەڵکردنی بەرانەکان لەگەڵ مەڕەکاندا بە بەرنامە بوو. بەرانەکانیان لەکاتێکدا تێکەڵی مەڕەکان دەکرد کە مەڕەکان لە مانگی ئەسفەند (مارت) دا لە تورکمان سەحرا بزێن. عەلی خانیش هەمان قسەی عەبدولعەلی دووبارە کردەوەو گوتی هەوا خەریکە سارد دەبێت، پێویستە کۆچ بکەین و بڕۆین بۆ تورکمان سەحرا، هەر چەندە ئێستا لێرە لەوەڕ زۆرە. عەلی خان بەردەوامبوو لە قسەکانی و گوتی کەمپاین گەنم و جۆکەی بە باشی درەو نەکردووە، دەنکە گەنم و جۆیەکی زۆر ڕژاوەتە نێو پەرێزەکەوە، مەڕەکان ئەو گەنم و جۆیە باش دەخۆن، هەر بۆیەش ئەمساڵ مەڕەکانمان زیاد قەڵەوبوون، هەروەها هێشتا لە بناری شاخەکانیش لەوەڕ زۆرە، کێشەی بێئاویش بە هۆی تراکتۆر و تانکەرەوە چارەسەرکراوە. عەلی خان دەیویست (١٥-٢٠) ڕۆژی تر لەو هەوارە بمێنێتەوە. لە سەرمادا تێپەڕ بوون لە گەردەنەی شەلەمی کارێکی دژوار و نارەحەت بوو.

گەردەنەی شەلەمی گەردەنەیەکی بەرزی نێوان قورەمەیدان و مراوتەپەیە. ئەم گەردەنەیە سنووری سروشتی نێوان هەردوو پارێزگاکانی خۆراسان و مازەندەرانی ئەو سەردەمە بوو، یا سنووری نێوان خۆراسان و دەشتی تورکمان سەحرا بوو، هاوکات سنووری مرۆڤەکانیش بوو، سنوورێک بوو لە نێوانی گوندە کورد نشین و فارس نشینە شیعەکان. لەگەڵ گوندە تورکمان نشینە سوننەکان. لەسەری گەردەنەی شەلەمی وێستگەی ڕادار هەبوو، ڕادارێک کە لەلایەن ئەمریکاییەکانەوە سەرپەرشتی دەکرا.

بڕیار وا بوو کە دوو هەفتە لە نێوان هۆزەکاندا بمێنمەوە، حەزمدەکرد لە ماوەی ئەم دوو هەفتەیەدا کۆچ دەستپێبکات. هەوارەکەی بێژەن (١ فرسەخ = ٦,٢٤ کم) لە هەواری حاجی عەلی خانەوە دوور بوو. ئەردۆش لەگەڵ شوانێکی تردا کاری دەکرد. مەڕەکان شیریان تێدا نەبوو، مێگەلەکان نەدەهاتنەوە بۆلای ڕەشماڵەکان، بەڵکو بە چەند ڕۆژ جارێک دەهاتنەوە. ئەردۆ سێ ڕۆژ بوو نەهاتبووەوە بۆ هەوارەکە، لەوە دەچوو شەو یا سبەی بێتەوە. نەمدەتوانی هیچ کارێک بکەم، یەک کاتژمێر بەو تاریکییە لەگەڵ کچان و کوڕان یاری تۆپێنم کرد. تێکڕا پازدە یاریکەر بووین، لە دوو لای گۆڕەپانەکەدا دوو دارمان چەقاند و پارچە قوماشێکی سپیمان بەسەری دارەکانەوە بەست. تاکو لە تاریکی شەودا دارگۆڵەکە ببینین. نە من شارەزاییم لە یاری تۆپێندا هەبوو نە منداڵەکانی تر، لە منداڵی دە ساڵییەوە تاکو پیاوی بیستوپێنج ساڵ بەشدارییان کرد لە یارییەکەدا، کوڕ و کچ هەموو بەدوای تۆپەکەدا ڕایاندەکرد. گوڵخەندانی کچی عەلی خان لە هەموان

باشتر یاریی دەکرد و لە ڕاکردندا پێش هەمووانی دەدایەوە، منیش تەواو هیلاک ببووم هەربۆیەش ناچار، بووم بە گۆڵچی، هیچ تۆپێکم بۆ نەدەگیرایەوە، لە ماوەی یەک کاتژمێردا هەشت گۆڵیان لێکردم، منیش لۆمەی تاریکە شەوەکەم دەکرد.

بۆ نانخواردنی ئێوارە چووم بۆ ڕەشماڵەکەی عەلی خان، ئەو ڕۆژە خان لەگەڵ کچەکانیدا ڕۆیشتبوو بۆ ڕاو، بەرانێکی گەورەیان کوشتبوو، خان دوو ڕانی بەرانەکەی بۆماڵی خۆیان دانابوو، ئەوی تریشی دابەشی ماڵەکانی تری هەوارەکە کردبوو. خەڵکی هەوارەکە ئەو شەوە بەگشتی میوانی سروشت بوون. جاری پێشووتر کە لە هەوارەکە بووم عەلی خان لە گۆشتی ڕاو بەشی هیچ کام لە ماڵەکانی نەدەدا، بەڵام ئەمجارە لەو بەرانە کێوییەی کە ڕاوی کردبوو گۆشتی بەشی هەموو ماڵەکان دابوو. زۆربوونی ئاژەڵی کێوی لە ناوچەکەدا دەبووە هۆی تێرکردنی سکی کرێکارەکانی عەلی خان. لە بەهاردا تاکو سەرەتای هاوین مەڕەکان شیریان زۆر تێدایە. کرێکارەکان و ماڵ و منداڵیان سوود لەو شیر و ماست و دۆیە دەبینن، بەڵام لە پاییز و زستاندا کە شیر و ماست و دۆ نامێنێت ڕاوی ئاژەڵە کێوییەکان جێگای ئەوانە پڕدەکەنەوە.

پەری خانم کچی حاجی عەلی خانیش بەرازێکی گەورەی ڕاوکردبوو، گۆشتی بەرازەکەی بە چەقۆ پارچە پارچە دەکرد و دەیدا بەسەگەکان. پەری خانم تەنها گۆشتە نەرمەکەی لێدەکردەوە و دەیدا بەسەگەکان، چونکە دەیانگوت ئێسقانی بەراز ددانی سەگەکان دەشکێنێت دەبوو سەگەکان ددانەکانیان قایم و بەهێزبن تاکو لە بەرەنگاربوونەوەی گورگدا بە توانابن. لەسەر سفرەی نانخواردنەکە تەنها پیاوان دانیشتبوون. پەری خانم بینی و سڵاوێکم لێکرد، ئەویش بە ساردی وەڵامی دامەوە، فەریبای خوشکیشی لەگەڵدا بوو، بەڵام ئەو هەر وەڵامی نەدامەوە. عەلی خان بەچەند کەسێکی گوت تاکو ڕەشماڵێکم بۆ هەڵبدەن؟ بە زوویی ڕەشماڵەکەم بۆ هەڵدرا. هاوسەرەکەی بیبی گوتی موهەندیس ئەمشەو لەڕەشماڵەکەی ئێمە بخەوە. گوتم ئەمشەو ماندووم دەچمەوە ڕەشماڵەکەی خۆم. «یەلە»ش وردە وردە هات و بەبێ ئەوەی پرسیارێک بکات یا قسەیەک بکات خۆی خستە نێو ڕەشماڵەکەی منەوە. ئەمجارە جوتێک پوتین و کتێبی فارسی پۆلەکانی یەکەم و دووەمم بۆ هێنا بوو. «یەلە» کاتێک چاوی بە پێڵاوەکان کەوت زۆر خۆشحاڵ بوو. ئەو پێڵاوانەی جاری پێشوو بۆم هێنا بوو، پیشانیدام، بەڵام بۆی بچووک ببوونەوە. ئەم پۆتینانە کە مارکەی کەوشی میللی بوون و لە باشترین چەرم دروستکرا بوو، نزیکەی یەک ساڵ و نیو لە نێو ئەو شاخ و بەردانەدا لەپێیدا بوو. پاشان بە «یەلە»م گوت کتێبی فارسیم بۆ هێناویت.

زۆری پێخۆش بوو. کتێبەکانی لە باوەش گرت، ئەمجارەیان بۆ هیچ کەسێک، هیچ شتێکم نەهێنابوو، هەم ئۆتۆمبێلم پێنەبوو هەم پارەشم نەبوو، تەنها کەمێک نوقڵ و بسکیتم هێنابوو. چەند قوتویەک گۆشتە ماسیم بۆ خۆم هێنابوو. منداڵەکان، عەبدال و مەحمود و غەفار و فەریبورز هاتن بۆ ڕەشماڵەکەم، بەڵام برزوویان لەگەڵدا نەبوو. هەواڵی بێژەنم لێپرسین گوتیان بێژەن ئێستا خوێندەوارە و کتێب دەخوێنێتەوە. بێژەن ڕۆیشتبوو بۆ گوندی (قازی) لەوێ سوپای فێرکاری کتێبی پۆلی یەکەمیان پێدابوو. گوتم بەیانی بێژەن دەدۆزمەوە. «یەلە»ش کاغەزەکانی دەرکرد و نووسینەوەیەکی زۆری کردبوو. پازدە مانگ بوو نەمبینی بوو، لە ماوەی ئەو پانزە مانگەدا باش پێشکەوتبوو، کتێبی پۆلی یەکەمی بە باشی دەخوێندەوە. بیبی بەردەوام هاوکاری کرد بوو. عەبدال گوتی موهەندیس وەرە با یاری نیشان شکاندنی بەرد بکەین. گوتم ئێستا شەوە و کوا ئەو یارییە دەکرێت؟ گوتی باشتر کە شەوە چەند هەنگاوێک لەڕەشماڵەکەی من دوورکەوتینەوە چەند بەردێکی گەورەیان لە سەر زەوی داکرد و بە نۆرە بەردیان تێدەگرتن. عەبدال و غەفار دەستیان ڕاستبوو هەمیشە لە نیشانەکەیان دەدا، بەڵام من تەنها جارێکیش نەمتوانی لە نیشانەکە بدەم. لێم پرسین برزوو لە کوێیە؟ گوتیان بۆ کارکردن ڕۆیشتووە بۆ بۆجنوورد.. سێ کاتژمێری شەو ڕۆیشتبوو شەکەت و ماندوو چوومە نێو ڕەشماڵەکەمەوە. هەندێک دار و چیلکەیان لە نێوڕەشماڵەکەدا بۆ دانا بووم. لە گەشتەکانی پێشووەوە فێر ببووم. بۆیە شخارتەم لەگەڵ خۆمدا هێنابوو، یەک دەستە شخارتەی تەورێزیم لەگەڵ خۆمدا هێنابوو، لە تەمەڵی خۆمدا ئاگرم نەکردەوە. «یەلە»ش بە خۆی و دوودانە جەواڵ و بەتانییەکی کۆنەوە هات و لە ڕەشماڵەکەی مندا لێی نووست. چوومە نێو کیسە خەوەکەمەوە و بەکڵاوی کیسە خەوەکەم سەریشم داپۆشی. لە ماوەی چەند چرکەیەکدا خەوم لێکەوت، بەیانی زوو بە دەنگی قوقەی کەڵەشێرەکانی هەوارەکە بەئاگاهاتم. لە نێوکیسە خەوەکەدا ئارەقەم کردبووەوە، دەبوو بۆ سوپاسگوزاری خودا هەڵسم و دوو ڕکات نوێژی بەیانی بکەم، بەڵام تەمەڵی و سەرمای دەرەوەی ڕەشماڵەکە و عەرەقەکردنەوەی نێو کیسە خەوەکە ڕێگربوون لە نوێژکردنم، پاش کەمێک مانەوەم لەکیسە خەوەکەدا هێزمدایە بەرخۆم و هەڵسام، ڕۆیشتمە دەرەوە دەستنوێژم گرت و هاتمەوە نێو ڕەشماڵەکە، دوو ڕکات نوێژم کرد، ئەو نوێژکردنە بە لامەوە نوێژێکی زۆر لەزەتبەخش بوو، چونکە هیچ کەسێک بە زۆر نوێژەکەی پێنەکردبووم و نوێژێک نەبوو بۆ ڕیایی کردبێتم، بەڵکو حەز و ویستی خۆم بوو. ئێستا زۆرێک لە خەڵکی خەویان پێباشترە لە خوداپەرستی. لە تەواوی ئێرانداو و

لەپێش شۆڕشدا کۆچەرییەکان کەمتر لەگوندنشینەکان پەیوەست بوون بە نوێژکردن و خوداپەرستییەوە. پێدەچێت هۆکەشی ئەوە بووبێت کە دوور بوون لە شار. هەندێک لەو خەڵکە لە هەموو تەمەنیاندا ڕەنگە مەلا و مزگەوتیان نەدیبێت.

دروستبوونی جادە و پەیدا بوونی ئۆتۆمبێل، کردنەوەی دەروازەیەک بوو بەڕووی هەوارنشیناندا تاکو بڕۆن سەردانی شارەکان بکەن. هەروەها سەردانی خەڵکی شارەکانیش بۆ نێو کۆچەرییەکان، وەک خوێندکاران کە بۆ زانیاری وەرگرتن سەردانیان دەکردن؛ ببووە هۆکارێکی تری چاوکرانەوە و ئاگاداربوون و زانینی هەموو ئەو شتانەی کە بەلایانەوە نامۆ بوون. ئیتر دۆخەکە گۆڕا، خەڵکی فێری نوێژکردن بوون، بەڵام کەمکەم نوێژی ڕییایش پەیدا بوو. نوێژکردنی ڕاستەقینە زیادیکرد، ڕیاکاریش هەر زیادیکرد.

ئێستا کە ئەم یادەوەرییانە دەنووسمەوە کاتژمێر (٣:٤٠) ی بەرەبەیانی ڕۆژی (١٤-٩-١٣٩٠=٢٤-١٢-٢٠١٢) یە تا ئەم بەروارە کە دواجارە کە چووم بۆ ناوچەی کوردە کۆچەرییەکان. یەک مانگ پێش ئێستا بوو. ئێستا هەلومەرجەکان لەگەڵ ساڵی (١٣٤٧-١٩٦٨) بەراورد دەکەم جیاوازییەکی زۆر دەبینم. جیاوازی لە ژیاندا، جیاوازی لە شێوازی بەرهەمهێناندا، لەکڕین و فرۆشتندا، جیاوازی لە میواندۆستیدا، جیاوازی لە یارییکردن، جیاوازی لە ئاژەڵداریی، جیاوازی لە نوێژکردندا. لە ساڵی (١٣٤٨-١٩٦٩) ژیان لە سەر شێوازی هەزار ساڵی پێش ئێستا بەردەوامی هەبوو. کەمێک گۆڕانکاری تێدا بوو ڕاستی و ڕاستگۆی و بیروباوەڕ هەروەک وهەزار ساڵ پێشتر بوو، بەڵام لە ساڵی (١٣٩٠-٢٠١١) دا لە نێو ڕەشماڵی کۆچەرییەکاندا، سینیی سەتەلایتم بینی. ئیتر دیارە کە شێوازی ژیان چەند گۆڕاوە. کاتێک لە نێو ڕەشماڵی کۆچەرییەکاندا کارەبا هەیە و سەیری تەلەفزیۆن دەکەین ئەوە دیارە کە شێوازی ژیان گۆڕانکاری بەسەرداهاتووە... کاتێک دەبینم هەندێک لەو ئاژەڵدارە بەڕێزانە عاشقی کەناڵە فارسییەکانن ئەوە مانای ئەوەیە کە گۆڕانکاری دروستبووە. کاتێک لە مانگی (ئابانی ١٣٩٠- ت یەکەمی ٢٠١١) خەریکی نانخواردن بووم لە ماڵی ناسیاوێکم، خاوەن ماڵ گوتی دوێنێ شەو ئاگاداری هەواڵەکانی ڕادیۆیی (B.B.C) بوویت. گوتم نەخێر، من خەریکی نووسینەوەی یادەوەرییەکانم بووم. گوتی بەپێی هەواڵەکانی (B.B.C) بێت نرخی دۆلار ئەوەندەی تر بەرز دەبێتەوە. ئەو پیاوە تەمەنی حەفتاوهەشت ساڵ بوو، لە ساڵی (١٣٤٧- ١٩٦٨) وە هاوڕێمە و زۆر لە من دڵنیا بوو، بۆیە بە ئازادانە قسەی لەگەڵدا دەکردم، پێکەوە لەبارەی گەنجەکانی ساڵی (١٣٩٠-٢٠١١) و منداڵانی ساڵی (١٣٤٧-١٩٦٨) قسەمان دەکرد. گوتی ئەو سەردەمە هەرچی هەبوو هەر ئەوە

بوو، بەڵام ئاغای پاپۆلی، ئەوەی ئێستا کە نییە ڕاستگۆییە. ئێستا هەموو کارەکانمان ڕیایین. لەو سەردەمەدا یەک گەنجمان ئالودە نەبوون، بەڵام ئێستا یەک گەنجی ساخمان نییە. سەد سەر مەڕ و بەرخمان بە قەرز دەدا بە چێودارەکان و نەماندەناسین و تەنانەت نەماندەزانی ناویشیان چییە، ئەوانیش لە کاتی خۆیدا پارەکەیان بە تەواوی بۆ دەهێنایین، بەڵام ئێستا هەرچەندە چێودارەکانیش دەناسین، کەچی فێڵمان لێدەکەن و نیوەی پارەکەشمان پێنادەن. ئەو کات لە پێنجسەد کەس، یەک کەسمان دەچوو بۆ مەککە و دەبوو بە حاجی، کاتێک دەگەڕایەوە هەموو کردەوەکانی حاجیانە بوو. ئێستا لە پێنجسەد کەس، چوارسەد کەسمان دەچین بۆ مەککە و دەبنە حاجی، بەڵام کارێکی باش ناکەین، جگە لە خراپە. ئەو کات لە هەر پێنجسەد کەس (٤٩٠) کەسمان نوێژمان نەدەکرد، بەڵام موسڵمانێکی تەواو بووین و پێنجیەکی زەکاتمان دەردەکرد، هەقی شێخ و سەیدمان دەدا. ئێستا هەموومان نوێژ دەکەین کەچی ڕیاڵێک لە دەستمان هەڵناوەرێت و دەست بەگیرفانماندا ناکەین. ئەو کات چاومان لە ئاسمان بڕی بوو کە خودا شتێکمان بۆ بنێرێت. ئێستا گوێمان لە ڕادیۆ و تەلەفزیۆن ڕاگرتووە تا بزانین حکومەت چیمان پێدەدات. ئەو کات لە هەژاریدا قەناعەتمان هەبوو دەوڵەمەند بووین، ئێستا قەناعەتمان نەماوە و لە دەوڵەمەندیدا هەژار بووین، ئەو کاتە مەڕەکانمان گیایان دەخوارد و قەڵە و دەبوون. ئێستا جۆ دەخۆن و بەرەکەتیان نەماوە. ئەو کات ئەگەر پێنجسەد سەر مەڕمان بمردایە کڕنۆشی سوپاسگوزاریمان دەبرد بۆ خودا و کوفرمان نەدەکرد، ئێستا ئەگەر یەک مەڕمان بمرێت جوێن بە هەموو کەس و هەموو دونیا دەدەین، ئەو کات لە هەزار گەنج کەسێک زیندانی نەبینی بوو. ئێستا لانیکەم لە دە گەنج یەکێکیان لە زیندانە. ئەو کات هەندێک لە خەڵکی سەر سنوورەکان ببوون بە کۆمۆنیست و لایەنگری سۆڤیەت، بەڵام درۆیان نەدەکرد، لە ڕاستیدا نەشماندەزانی کۆمۆنیست مانای چییە؟ بە بێئاگایی لایەنگری سۆڤیەت بووین. ئێستا لە هەر چوار کەسێک یەکێکیان لایەنگری عەرەبستانی سعودییەیە. ئەو کات نە قەرزاری بانک بووین و نە قیستمان لە سەر بوو، ئێستاش ئەگەر کەسێک قەرزاری بانک نەبێت هەر بوونیشی نییە، ئەو کات نەماندەزانی حەمام چییە؟ ئێستاش بەلانی کەمەوە هەفتەی جارێک دەچینە حەمام، ئەو کات زۆربەمان نوێژمان نەدەکرد، بەڵام لە گەڕەکەکەماندا چەند کەسێک هەبوون بەیانیان بە بەفر و سەرما خۆیان دەخستە ئاوی ڕووبارەکەوە تا خۆیان لەشپیسی دەربکەن، ئێستا کە حەمامی گەرم هەیە کەچی خۆیان ناشۆن و هەمیشە لەشیان پیسە. ئەو هاوڕێیەم ئەوەندەی لەم قسانە کرد تا تەواو ماندوو بوو، پاشان لە خودا پاڕایەوە

کە ڕێنمایی هەموو لایەک بکات. ئنجا گوتی ڕادیۆ و تەلەفزیۆن، هەموومانی کردووە بە خەڵکی شار. پاشان لێی پرسیم و گوتی هاوڕێی بەڕێزم بۆچی هەر چەندە ژیان خۆشتر و ئاسانتر بێت، نێوانمان لەگەڵ خودادا زیاتر دوور دەکەوێتەوە؟ با بگەڕێینەوە بۆساڵی (١٣٤٨-١٩٦٩).

بەیانی زوو هاوسەرەکەی بیبی هات بۆ ڕەشماڵەکەم ومنی برد بۆ ڕەشماڵەکەی خۆیان بۆ ژەمی بەیانی. گوتم دەمەوێت بچم بۆ سەردانی بێژەن. بیبی گوتی موهەندیس تۆ ئەمڕۆ لێرە بمێنەرەوە، خەڵکی ئەم هەوارە هێشتا تۆیان نەبینیوە، سبەی بڕۆ بۆ هەوارەکەی بێژەن. هاوسەرەکەی بیبی گوتی منیش وا بە باش دەزانم کە ئەمڕۆ نەچیت بۆ هەوارەکەی بێژەن، چونکە عەلی خانیش پێی باش نییە و دەڵێت هێشتا نەگەیشتویتە ئێرە کەچی دەڕوات بۆ لای بێژەن، بۆیە ئەمە باش نییە ئەگەر دەتویست سەردانی بێژەن بکەیت ڕاستەوخۆ بچوویتایە بۆ هەوارەکەی ئەو. گوتم باشە ئەمڕۆ ئەردۆ دەدۆزمەوە. گوتی ئەردۆ لەگەڵ مێگەلەکەدا (١فرسەخ = ٦،٢٤کم) ڕێگا لێرەوە دوورە.

هەوا سارد بوو هەموو ڕۆژێک پلەکانی گەرمیم چوار جار لە دەفتەرەکەمدا دەنووسی، کاتژمێر حەوتی بەیانی ڕۆژی (٣٠ ی ئازەری ١٣٤٨-٢١ک یەکەمی ١٩٦٩) لە دەشتی قورەمەیدان پلەی گەرمی دوو پلە سەروو سفر بوو. خەریکی نانخواردن بووم کە گوێم لەدەنگێک بوو بانگی دەکرد موهەندیس، موهەندیس.. مەنوچەهری کوڕی خان بوو منی بانگدەکرد بوو بۆ نانخواردنی بەیانی. هاوسەرەکەی بیبی وەڵامی دایەوە و گوتی موهەندیس نانی بەیانی خواردووە. هەتاو وردە وردە گەرم دەبوو، تیشک و تینەکەی بەرمدەکەوت و گیانمی گەرم داهێنابوو. کاتێک لەو دەشتە ساردەدا تیشکی خۆر گەرمییەکەی بە مرۆڤ دەبەخشێت، مرۆڤ زیاتر هەست بە خۆرپەرستی دەکات. خەڵکانی شارنشین، کەسانێک کە لەخانووی خۆش و گەرمدا دەژین، کەسانێک کە سوتەمەنی زۆر و هەرزانیان لەبەردەستدایە، هەرگیز ناتوانن تێبگەن بۆچی چەند هەزار ساڵ پێش ئێستا خەڵکی ڕوویان لە خۆرکردووە و گوتویانە ئەمە خودایە و پەرستویانە؟ کەسانێک کە گازێکی زۆر هەرزانیان دەستدەکەوێت و بەکاری دەهێنن بۆ خۆگەرمکردنەوە، ناتوانن تێبگەن کە بۆچی خەڵکانی دەشتە ساردەکانی ئاسیای ناوەڕاست ڕووە و خۆر دەوەستن و نوێژی بۆ دەکەن؟ دیارە هەموو دیاردە سروشتییەکان، نیعمەتێکن بۆ هەستکردن بە ڕاستییەکانی ئەم جیهانە. ڕاستیە مێژووییەکان، ڕاستیە کۆمەلایەتییەکان و هەموو ئەو ڕاستیانەی کە بوونیان هەیە. من لێرەدا هیچ کارێکم بە ئێوە نییە، من خۆم لە خانوویەکی گەرمدا، دەژیم کە دیواری ژوورەکانی ئەستوورن،

پەنجەرەکانیشی بە هیچ جۆرێک هەوای لێنایەتە ژوورەوە. هەر چەندە هەوا ساردتر بێت من ئاگری سۆپاکەم زیاتر دەکەم. من ئامادەنیم یەک کراسی زیادەش لەبەر بکەم بۆ خۆگەرمکردنەوە، هەروەها ئامادەش نیم یەک بەتانی زیادەش بە خۆمدا بدەم، من هەمیشە ئاگری سۆپاکەم زیاتر دەکەم، هاوکاتیش بیر و خەیاڵم لای ئەو هاونیشتمانییە بەرێز و بەرهەمهێنەرانەیە کە لەو دەشت و کێوە ساردەدا لەژێر ڕەشماڵدا دەژین، هاوکات بیر لەو کرێکارانەش دەکەمەوە کە جادە و ڕێگاوبانەکان بۆ هاتوچۆی ئێمە چاکدەکەن. بیر لەو ئەندازیار و کرێکارانە دەکەمەوە کە بە سارد و سەرمای زستان بۆرییەکانی ئاو و گاز بۆ ئێمە چاکدەکەن، تا ئێمە بێ ئاو و بێ گاز نەبین، بیر لە کرێکارانی کانەکان دەکەمەوە و ڕێزیان لێدەگرم، ئیتر من لەبەر خاتری ڕێزی ئەوان و ڕەنج و ماندوبوونیان ئاگری سۆپاکەم، کەم دەکەمەوە و نەوت و گازی زیادە بەکار ناهێنم.

قسەکانی بیبی و هاوسەرەکەیم لەگوێگرت، ئیتر لەو ڕۆژەوە باسی ڕۆیشتنم بۆ هەوارەکەی بێژەن نەکرد. چووم بۆ لای عەلی خان، پێمگوت دەمەوێت بڕۆم بۆلای ئەردۆ. عەلی خان گوتی مێگەلەکەی ئەردۆ (١فرسەخ = ٦,٢٤ کم) لێرەوە دوورە، مێگەلەکانی تر نزیکترن و ئەردۆ دوورە. عەبدال گوتی من موهەندیس دەبەم بۆلای ئەردۆ، بەڵام دەبێت بە سواری حوشتر بڕۆین. عەبدال و غەفار دوو حوشتریان هێنا، کۆپانیان خستە سەرپشتی یەکێکیان و من سواری بووم. ئەوانیش هەردوکیان بەبێ کۆپان سواری حوشترەکەی تر بوون، غەفار لە دواوە و عەبدال لە پێشەوە. عەبدال قاچەکانی بەملاولای ملی حوشترەکەدا شۆڕکردبووەوە. دوو کوڕە کۆچەریی بە خێرایی حوشترەکەیان لێدەخوڕی. بەبێ ئەوەی هیچ بترسن. منی شارنشینیش هەرچەندە حوشترەکەم کۆپانی لێکرابوو، بەڵام هێشتا هەر دەترسام لەسەر حوشترەکە بکەومە خوارەوە. ئەوان ڕۆیشتن و من جێمام. پاشان بە ناچاری گەڕانەوە بە شوێنمدا و بەیەکەوە کەوتینەڕێ. عەبدال کوڕێکی وریا و بەهۆش بوو، لە هەموو منداڵانی هۆزەکە بەهۆشتر بوو. زۆر ئازا و چاپووک بوو، هەرگیز نەدەوەستا و لە جووڵەدا بوو، بە بەهانەی جیا جیاوە مۆڵەتی لەخان وەردەگرت و سواری ئەسپێک دەبوو. باوکیشی تەنها وڵاخێکی هەبوو کە کاری پێدەکرد، ئەو وڵاخەش هەر هی خان بوو. عەبدال یا سواری حوشتر دەبوو یا سواری ئەسپ. بە دارلاسیکەکەی ڕاوی کەو و سوێسکەی دەکرد. عەبدال ئاوی دەهێنا و داری کۆدەکردەوە، گیای کێوی و زرشکی کۆدەکردەوە، گۆرانی دەگوت و شمشاڵی لێدەدا. لەو سارد و سەرمایەدا کە من جلی گەرمی ژێرەوەم لەبەردا بوو،

کراس و چاکەت و پانتۆڵم لەبەردابوو، لە سەر ئەوانەشەوە چاکەتێکی گەرمم لەبەرکرد بوو، بەڵام هێشتا هەر سەرمام بوو، بەڵام عەبدال تەنها یەک کراسی لەبەردا بوو هیچی تر. کاتێک لە کێو بووین بڕیار وا بوو پێکەوە پێشبڕکێی ڕاکردن بکەین. حاجی ڕەمەزان داوەر بوو لەنێوانماندا. من قەیتانی پێڵاوەکانم توند کرد و عەبدالیش پێڵاوەکانی دانا و بە پێپەتی لەگەڵ مندا کەوتە ڕاکردن، بە نێو ئەو هەموو بەردەدا، کەچی هێشتا ئەو پێشی منی دایەوە و من لەگەڵ ئەودا دەرنەچووم. غەفاریش هەروەکو عەبدال ئازا بوو، تۆپی یاریکردنەکەی لەگەڵ خۆی هێنابوو، لەو کێوە هەردووکیان سواری حوشترێک ببوون بەسواری حوشترەوە یاری تۆپانێیان دەکرد و تۆپەکەیان بۆ ئاسمان هەڵدەدا و دەیانگرتەوە. هەر کاتێک تۆپەکە بکەوتایەتە خوارەوە بەخێرایی یەکێکیان دادەبەزی و تۆپەکەیان هەڵدەگرتەوە و بەیەک خۆهەڵدان سواری حوشترەکە دەبوونەوە.

بەلای دوو مێگەلە مەڕدا تێپەڕبووین، شوانی مێگەلێکیان منی دەناسی ئەو مێگەلەش هەر هی عەلی خان بوو، پاش چاکوچۆنی هەواڵی ئەردۆم لێپرسی. بەردەوام بووم لە ڕۆیشتن، عەبدال و غەفار زۆر پێش من کەوتبوون و خۆیان گەیاندبووە لای ئەردۆ و لەحوشترەکە دابەزیبوون و ئەردۆش سواری حوشترەکە ببوو، بەرەو پیری من هات بوو. کاتێک بە من گەیشت، حوشترەکەی بەتەنیشت حوشترەکەی منەوە ڕاگرت و خۆی هەڵدایە سەر حوشترەکەی من و لەدواوە سوار بوو. دەستی لەملم کرد و ئەملاولای ماچکردم، وەک ئەوەی برا بچووکەکەی خۆی بینبێتەوە، پێکەوە ڕۆیشتین تا بە مێگەلەکە گەیشتینەوە. شوانەکە لەگەڵ عەبدال و غەفاردا چایان ئامادە کردبوو. مێگەلەکە هێواش هێواش دەلەوەڕان. ئەردۆ دەیگوت شوانی لەم دەشتەدا زۆر خۆشترە لە شوانێتی نێو شاخ، لێرە لەوەڕ زیاترە و مەڕەکانیش باشتر دەبینین. دەیگوت، بەڵام لێرە گورگ زیاترە، شەوانە دەبێت زۆر وریا بین.

سەگەکان بەدەوری مێگەلەکەدا دەگەڕان و پاسەوانییان دەکرد. هیچ مێگەلێک نەبوو گورگ چەند مەڕێکی لێ نەخواردبێت. ئەردۆ هێشتا نەببوو بە شوان، بەڵکو هەر شاگرد شوان بوو. ئەو لە هەموو تەمەنیدا نەببوو بە شوان. شوانی مێگەلەکە ناوی حەبیب بوو لە ئەردۆ گەنجتر بوو، کەسێکی بەهۆش بوو، هەموو مەڕەکانی مێگەلەکەی بەناو دەناسین. هەمیشە بیر و هۆشی لەسەر مەڕەکان بوو. ئەوان پێکەوە هەندێک یارییان بە تۆپەکە کرد. حەبیب دەیگوت عەلی خان مافی خۆیەتی ئەم تۆپە شەیتانە بە چەقۆ پارچە پارچە بکات. ئەوان پێشتریش یارییان بە تۆپ کرد بوو، بەڵام بە تۆپی موو، لە مووی مەڕ و ئاژەڵەکان تۆپیان دروستدەکرد، بەڵام تۆپی یاریکردن یاخود

تۆپی لاستیک ئەوە یەکەمین جار بوو کە بێت بۆ هەوارەکەیان. حەبیب دەیگوت تۆپ شەیتانە، ئەردۆ دەیگوت ئەم تۆپە یەکێک بووە لە ئەستێرەکان و کەوتۆتە خوارەوە بۆ سەر زەوی.

ئێستا کە شیردۆشین نەماوە مێگەلەکە لەهەوارەکەوە دوور بوو. مێگەلی ئەردۆ و حەبیب (١٠-١٢) ڕۆژ بوو نەگەڕابووەوە بۆ هەوارەکە. خۆشیان چەند ڕۆژێک بوو سەردانی هەوارەکەیان نەکرد بووەوە. کوڕەکەی حەبیب لە هەوارەکەوە خواردنی بۆ دەهێنان. هەر لەنزیک خۆیان چاڵێکیان هەڵکەند بوو کەمێک ئاوی بارانی تێدا کۆ ببووەوە. خۆشیان و مەڕەکانیش هەر لەو چاڵە ئاویان دەخواردەوە. کاتێک ئاوی چاڵەکە کەم دەبوو بە حوشتر لە ڕووباری (ئاموون)ەوە ئاویان دەهێنا، کاری ئەو ئاوهێنانەش لە ئەستۆی کرێکارانی هەوارنشینەکە بوو، یەک باران بارین کێشەی بێ ئاوی چارەسەر دەکرد. نانی نیوەڕۆم لەگەڵ حەبیب و ئەردۆ و عەبدال و غەفار خوارد. ئەردۆ ئاوی کوڵاند و هەندێک ڕۆنی مەڕی کردە قاپێکەوە. ئاوە کوڵاوەکەشی کرد بە سەر ڕۆنەکەدا، نانی لەکاسەکە گوشی و هەر پێنجمان لە یەک کاسەدا دەستمانکرد بەنانخواردن و بەدەم نانخواردنیشەوە قسەمان دەکرد و پێدەکەنین. هەڵبەت لەو هەوارە ساردەدا ئاگرەکەش بۆ خۆی نیعمەتێکی گەورە بوو. بایەکی سارد لە باکورەوە دەهات. خۆریش بەو دیودا شۆڕدەبووەوە، کات دوانیوەڕۆ بوو کاتی جێهێشتن و ماڵئاوایی بوو. بە ئەردۆم گوت سبەی دەچم بۆ لای بێژەن. گوتی بەبێژەن بڵێ بە زوویی بڕوات بەرەو تورکمان سەحرا. گوتم بۆچی؟ گوتی هەوا لە قوڕەمەیدان زۆر سارد دەبێت و بەفر و بارانێکی زۆر دەبارێت، بۆیە پێویستە بە زوویی لە گەردەنەی شەلەمی ئاودیو ببێت و خۆی و مێگەلەکەی بگەیەنێتە تورکمان سەحرا. گوتم بۆچی تۆش مێگەلەکە نابەیت بۆ تورکمان سەحرا؟ گوتی من خزمەتکاری عەلی خانم، هەرچی ئەو بڵێت من ئەوە دەکەم. عەلی خان تەماح گرتوویەتی، پارەی داوە و پەرێزی کڕیوە. دەیەوێت مەڕەکانی دوایین چڵە پوشی پەرێزەکان بخۆن. گوتم تۆ بە عەلی خانت گوتووە کە هەوا سارد دەبێت و بەفر دەبارێت؟ گوتی عەلی خان کەی گوێی لە قسەی من گرتووە؟ دوێنێ عەبدولعەلی بڵند بە سواری ئەسپەوە لێرەوە تێپەڕی ڕۆیشت بۆ ڕاو، پێمگوت ئاگاداربن هەواسارد دەبێت، بەڵام ئەو لە وەڵامدا پێیگوتم دووبارە تۆی شێت کەوتیتەوە قسە بێتامەکانت، هەر کاتێک هەوا ساردبوو ئەو کاتە دەڕۆین..

هێشتا خۆر تەواو ئاوا نەببوو کە گەیشتمەوە بەردەمی ڕەشماڵەکەی حاجی عەلی خان، بەسەر حوشترەکەوە بای سارد لەدەموچاومی دابوو، زۆرم سەرمابوو،

حەزمدەکرد بە زوویی بچمە ڕەشماڵەکەوە و کەسێک چایەکی گەرمم بداتێ. عەبدال لە حوشترەکەی دابەزی و حوشترەکەی منی خەواند تاکو دابەزم. پەری خانمی کچی عەلی خان بە تفەنگێکەوە وەستا بوو بە پێکەنینەوە گوتی موهەندیس سواری حوشتریش بوویت؟ ئەی کەی سواری ئەسپ دەبیت؟ سڵاوم کرد و عەلی خان گوتی موهەندیس ئەمشەو (شەوی یەڵدا) یە چایش ئامادەیە. چوومە نێو ڕەشماڵەکەی عەلی خان، ئامادەکاری تەواو بۆ شەوی یەڵدا کرابوو، هەموو شتێکیان دانابوو، تەنها شووتی لێ نەبوو، سینییەک چەرەس دانرا بوو، لە ناوەڕاستدا نوقڵ دانرابوو. نوسرەت خەریکی لەشیشدانی جگەری ئاژەڵی ڕاوکراو بوو. ڕەشماڵی خان گەرم بوو لە دوو ئاگرداندا ئاگریان کردبووەوە. ژنەکانی خان لەگەڵ منداڵەکانیاندا خەریکی وردکردنی گۆشت بوون. لە دووری ئاگردانەکەوە دانیشتم و چایەکم خواردەوە، دوو شیش دڵ و جگەریش بەشی من بوو. خواردنەوەی چای گەرم و خواردنی دڵ و جگەر هیلاکی لەشیان دەرکردم.

لەو کاتەدا کارکردن کەم بوو. هەندێک لە پیاوان و گەنجەکان بۆ کازکردن ڕۆیشتبوون بۆ بۆجنوورد، یەکەم ساڵ بوو کە چەند کەسێک بەیەکەوە بڕۆن بۆ کارکردن. باری ژیانی خەڵکی هەوارەکە لە هاوین خراپتر بوو. لە هاویندا بە هۆی بوونی شیر و ماست و ئاوی سازگار و هەوای فێنکی کوێستانەوە، خەڵکەکە ژیانیان باشتربوو، بەڵام لە سەرەتای زستاندا و لەو دەشتەدا شیر و ماست نەبوو، ئاویش کەم بوو. خەڵکەکە زۆر برسی بوون، ئەو خەڵکە هەژارە هەندێکیان گەنمی ڕژاوی نێو زەوییەکانیان کۆکردبووەوە. هەر ماڵێک و چەند کیلۆیەک گەنمیان دەستکەوت بوو، زۆردڵیان بەو گەنمە کەمە خۆشبوو. عەلی خان پێیگوتبوون ئەو گەنمەی کە لەسەر زەویەکە ڕژاوە، ئەوە بەشی مەڕەکانە و ئیتر نابێت هیچی تری لێکۆبکەنەوە بۆ خۆتان. ژنانیش بە هۆی بیکارییەوە زۆربەیان خەریکی چنینی ڕەشماڵ بوون.

عەلی خان کەوتە قسەکردن لەگەڵم، تا ئەو کاتە، بەو شێوەیە لەگەڵ مندا قسەی نەکردبوو، هەمیشە من پرسیارم لەو دەکرد دەربارەی مێگەلەکان ومەڕ و لەوەڕگە و شێوازی ڕاوکردن، ئەویش وەڵامی دەدامەوە، بەڵام ئەمجارەیان بە پێچەوانەوە، ئەو کەوتە پرسیارکردن لە من. دەمزانی کە پرسیارەکانی بە هۆی ئەو ڕێزگرتنەوە بوو کە ساڵی پار پۆلیسەکان لێیانگرتم. ماڵی حاجی عەلی خان هێشتا گومانیان لە من هەبوو، حاجی عەلی ڕووی تێکردم و گوتی تۆ کێیت؟ باوکت کاری چییە؟ خەڵکی کوێیت؟ بۆچی وازت لە کار و کاسبی خۆت هێناوە و دێیت بۆ نێو کۆچەرییەکان؟ مەگەر تۆ خوێندکار

نیت و پێویستیت بە ژیان نییە، ئەمە چۆن زانکۆیەکە تۆ لێی دەخوێنیت؟ ئەوان لە کاتی هاویندا مۆڵەتت پێدەدەن کە بێیت بۆلای ئێمە، بەڵام خۆ ئێستا کاتی زانکۆ و قوتابخانەیە، چۆن مۆڵەتیان پێداویت. منیش وەڵامم دایەوە و هەندێک لە قسەکانم بۆ ڕوونکردەوە، بەڵام ئەو قەناعەتی بە وەڵامەکانی من نەبوو. پەری خانم دانیشتبوو یاری بە ئاگری ناو ئاگردانەکە دەکرد و هیچ قسەیەکی نەدەکرد، بەڵام دیاربوو کە ناڕەحەت بوو. عەلی خان گوتی حکومەت مانگی چەندت مووچە دەداتێ؟ کاتێک گوتم خوێندکارم و هیچ مووچەیەک لە حکومەت وەرناگرم، گومانی زیاتر بوو. ژن و منداڵەکانیشی گوێیان بۆ قسەکانمان گرتبوو، پەری خانم یاری بەتفەنگەکەی دەکرد، تفەنگەکەی فیشەکی تێدابوو، چەند جارێک میلی تفەنگەکەی ڕاکێشا، بەڵام من نەمدەزانی دەیویست یاری بەتفەنگەکەی بکات، یاخود دەیویست من بترسێنێت.

ئەسەدی کوڕی خان لە هەوارەکەی خۆیەوە هاتبوو، ئەویش لە ڕەشماڵەکەدا دانیشتبوو. ئەسەدیش جارجارێک هاوتای باوکی پرسیاری دەکرد. پەری خانم گوتی باشە ئەگەر خوێندکاری زانکۆیت و مووچە لە حوکمەت وەرناگریت و نۆکەری حوکمەت نیت، ئەی بۆچی پار پۆلیسەکان هەستان لەبەرت و ڕێزێکی زۆریان لێگرتیت؟ دیاربوو ئەوان لە ترسی تۆ ڕۆیشتن و ئێمەیان جێهێشت. خان گوتی ئەمجارەش نامەی خۆناساندنت پێیە؟ منیش نامەی ناساندنی زانکۆم نیشاندان، بەڵام ئەوان قناعەتیان بە نامەکان نەکرد. ئەمجارەیان زانکۆ منی بە پۆلیس وقایمقامیەتی بۆجنوورد ناساند بوو. عەلی خان دەیزانی من خەڵکی شاری یەزدم، بۆ جاری دەیەم لێی پرسیم خەڵکی کوێی شاری یەزدیت؟ دەیویست باشتر بزانێت و ئەو تەنها یەک جاریش ڕۆیشتبوو بۆ یەزد.

هۆکاری ڕۆیشتنەکەشی بەم جۆرە گێڕایەوە. لە لەشکری کرمانەوە هاتبوون مەڕیان لێکڕی بوو. ئەو یەکەم جاربوو کە بۆ وەرگرتنی پارەی مەڕەکان بڕوات بۆ شارەکان. هەمیشە چێودارەکان خۆیان پارەی مەڕەکانیان بۆ هێنابوو، بەڵام ئەمجارەیان خۆی بە دوای پارەی مەڕە فرۆشراوەکانی کەوتبوو. نوێنەری سەرلەشکری کرمان گوتبووی بۆ وەرگرتنی پارەی مەڕەکانت دەبێت خۆت بێیت بۆ کرمان، چونکە دەبێت خۆت چەکی پارەکە ئیمزا بکەیت تا پارەکە وەربگریت. عەلی خان یەک دەبە ڕۆنی مەڕی لەگەڵ خۆیدا بردبوو، بە هەزار بەدبەختی خۆی گەیاندبووە کرمان. (١٤٠٠) سەر مەڕی بە لەشکری کرمان فرۆشت بوو. ژمارەیەکی زۆری مەڕەکانی هی خۆی بوون، هەندێکی تریش هی خەڵکانی تربوون. نزیکەی یەک هەفتە لە کرمان مابووەوە تا پارەکەی وەربگریت، لەکرمان لەگەڵ بازرگانێکی خەڵکی یەزد ئاشنایەتی پەیداکرد بوو،

کە ئەویش بۆ وەرگرتنی پارە لە لەشکری کرمان لەیەزدەوە هاتبوو. ئەو بازرگانە یەزدییە دانەوێڵە و ڕۆنی بە لەشکر فرۆشتبوو. ئەوبازرگانە ناوی حاجی ئەحمەدیە بوو، لەگەڵ عەلی خاندا ببوون بە هاوڕێی یەکتری. حاجی ئەحمەدیە لە کرمان خانوویەکی ئیجارە کردبوو، ئەو خانووە جێگای دانیشتنی بوو، لە هەمان کاتدا جێگای بازرگانی کردنیشی بوو. حاجی ئەحمەدیە، حاجی عەلی خانی بردبوو بۆ ماڵەکەی خۆی وخزمەتێکی زۆری کردبوو، هەردوکیان پارەکەیان لە لەشکری کرمان وەرگرتبوو ڕۆیشتبوون بۆ یەزد. حاجی عەلی خان چوار ڕۆژ لە یەزد میوانی حاجی ئەحمەدیە ببوو، کاتێک ناونیشانی دوکانی بازرگانییەکەی حاجی ئەحمەدیەم بە حاجی عەلی خان گوت، گوتی بۆچی تۆ ئەو دەناسیت؟ گوتم حاجی ئەحمەدیە هاوسەری ئامۆزاکەمە، ناوی هاوسەرەکەشی حاجی ڕەزوان خانمە باوکی هاوسەرەکەشی ناوی حاجی محەمەد عەلی پاپۆلییە. کاتێک ناوی عەباسی کوڕی ئەحمەدیە و منداڵەکانی ترم گوت و ناوی خزمەکانیم هەموو زانی، وەک گوڵ گەشانەوە. ئینجا عەلی خان باوەڕی پێکردم. پاش ماوەیەک لە پرسیارکردن دەستیکرد بە پێکەنین. منداڵەکانیشی هێمن بوونەوە. ئەسەدی کوڕە گەورەی عەلی خان تەمەنی لە چل ساڵ زیاتر بوو. ئەسەد لەو سەردەمەدا چەند کوڕێکی هەبوو، ئەو دەیویست هەموو کوڕەکانی بنێرێت بۆ قوتابخانە. پەری خانم و خوشکەکانی لە دەوری ئاگرەکە هەڵسان و ڕۆیشتن.

کوڕەکانی دیکەی عەلی خان حەیدەر و کەراڕ خۆیان سەرۆکی هەوار بوون و خاوەنی مێگەلە مەڕی خۆیان بوون، لەگەڵ عەلی خاندا نەبوون. ئەسەدیش لە هەوارێکی تر بوو. ئەو شەوە هاتبوون بۆ سەردانی باوکیان. عەلی خان لەو ساڵەدا پەیوەندی بە شاری یەزدەوە نەپچڕابوو. هەموو ساڵێک نزیکەی پێنجسەد مەن ڕۆنی زەردی بۆ حاجی ئەحمەدیە دەکڕی. هەندێک جار حاجی ئەحمەدیە ڕۆنەکەی دەنارد بۆ بازرگانەکانی مەشهەد و تەربەت و حەیدەریە و تاران.

ئاشنایەتی حاجی ئەحمەدیە لەگەڵ حاجی عەلی خان سوودێکی زۆری بۆ عەلی خان هەبوو. حاجی ئەحمەدیە بە عەلی خانی گوتبوو ساڵی چەند سەد مەن ڕۆنی بۆ بنێرێت. حاجی عەلی خان پێیگوتبوو، من ئەوەندە ڕۆنم نییە. حاجی ئەحمەدیە پێیگوتبوو لە خەڵکانی تر بیکڕەوە و بە منی بفرۆشەوە. هەر ئەو قسانەی حاجی ئەحمەدییە بوو بە هۆی ئەوەی کە حاجی عەلی خان ببێت بە بازرگان و هەر خۆی ڕۆن و کەشک و خوریی هۆزەکان بکڕێت و بیفرۆشێتەوە بە بازرگانەکان. ئەم بازرگانیکردنە ژیانی حاجی عەلی چەند بەرانبەر باشتر کردبوو، شارەزاییەکی باشی لە کاری بازرگانیدا

پەیداکرد بوو، پاشان ڕاستەوخۆ بەروبوومی ئاژەڵی دەنارد بۆ بازاڕەکانی تاران. حاجی عەلی خانی مەڕدار، کاری بازرگانیشی دەکرد، لە بۆجنووردیش خانووی باشی هەبوو. پاشان زانیم کە لە تارانیش خانووی هەیە. ئەو شەوە بەگشتی دەربارەی شاری یەزد و بازرگانە سەرڕاستەکانی قسەمانکرد. من زیاتر گوێم دەگرت. حاجی عەلی دەیگوت دە ساڵە و هەر ساڵێک بایی نزیکەی (٣٠٠) هەزار تومەن کاری بازرگانی لەگەڵ بازرگانەکانی یەزدا دەکات، ئەوان تەنها یەک ڕیاڵ فێڵیان لێنەکردووە، پارەکەشیان دوا نەخستووە، هەمیشە لەکاتی خۆیدا پارەکەیان بۆ ناردووە. (٣٠٠) هەزار تومەنی ئەوساڵانە دەزانی دەکاتە چەند؟ واتە نزیکەی پازدە ملیارد تومەنی سەرەتای ساڵی (١٣٩٠-٢٠١١) و سی ملیارد تومەنی کۆتایی ساڵی (١٣٩١-٢٠١٢).

پەری خانم دووبارە گەڕایەوە بۆ نێو ڕەشماڵەکە، بەڵام ئەمجارەیان بەبێ تفەنگ هاتەوە. ژن و زۆربەی منداڵەکانی خان نووستبوون، من دانیشتبووم لەگەڵ عەلی خان و ئەسەد و پەری خانم دا. پەری خانم مقاشەکەی لە ئاگردانەکە وەردەدا، ڕووناکی چرا دەستییەکە و ئاگری ئاگردانەکە لە سەر گۆنای دەدا. پەری خانم تەمەنی نزیکەی بیستوپێنج ساڵ دەبوو. دەستەکانی وەکو دەستی کچەکانی تر نەبوون. دەستی کچانی تری هۆزەکە زبر و قڵیشاو بوون، بەڵام دەستی پەری خانم دەستی کارکردن نەبوون، دەستەکانی ئەو تەنها هەوساری ئەسپ و دەسکی تفەنگی پێ گیرابوون، کراسێکی گوڵداری سووری لەبەردا بوو، لە بەر ڕووناکی ئاگرەکە کراسەکەی بریسکەی دەدایەوە. کراسەکەی تازە و لەباشترین جۆری قوماش بوو. دامێنی کراسەکەی بەگوڵی گەورەی زەرد و سوور ڕازابووەوە و تا قولەپێی هاتبوو. گۆرەوییەکی سپی ناسکی لەپێدا بوو. قاچەکانی دەرنەدەکەوتن. شەو درەنگ ببوو. ئەو سەرپۆشەی بەسەرییەوە بوو لایدا و دەموچاوی بەتەواوی دەرکەوت، ئەوە یەکەمجار بوو کە ڕوخساری ببینم. دووساڵ بوو ئەوم بینیبوو، بەڵام هیچ کاتێک ئەوەندە لە نزیکەوە نەمدی بوو، هیچ کاتێکیش ئەوەندە سەیرم نەکرد بوو. لووتێکی بچکۆلانە و جوانی هەبوو، چاوی گەورە و برۆکانی باریک بوون، بەگشتی نموونەی کچە کوردێکی کۆچەریی بوو.

لەناکاو بەبێ هیچ پێشەکییەک لێی پرسیم تۆ چوویت بۆ ئیسرائیل؟ گوتم نەخێر نەچووم بۆ ئیسرائیل. لەو کاتەدا حاجی عەلی خان بێدەنگ بوو. ئەمجارەیان گوتی ئەی ڕات چییە دەربارەی جەنگی ڤێتنام؟ بەو پرسیارە کەمێک تاسام، من وامدەزانی ئەو بە هیچ جۆرێک نازانێت ڤێتنام چییە؟ کەچی واباسی جەنگی ڤێتنام دەکات. لەو ساڵانەدا لەبارەی جەنگی ڤێتنامەوە باسێکی گەرموگوڕ هەبوو. ئینجا گوتی من کتێبی (جەنگی

شەکر لە کوبا) لە نووسینی (جان پۆڵ سارتەر) م خوێندۆتەوە. ئایا تۆ خوێندوتەتەوە؟ خۆشبەختانە کتێبێک لەلایەن دکتۆر سیروسی سوهامی و دکتۆر عەلی شەریعەتییەوە بە خوێندکاران ناسێنرا بوو، من ئەو کتێبەم خوێندبووەوە، بەڵام وەرگێڕانی چاپی یەکەمی کتێبەکە قەدەغەکرابوو. کتێبەکە بە بێ مۆڵەت چاپ کرابوو. لە بیری ئەوەدا بووم بە پەری خانم بڵێم کتێبی (جەنگی شەکر لەکوبا)م خوێندۆتەوە یان نا ؟ ئایا ئەوە تەڵەیەک نییە بۆ من؟. ئەو کاتە سەردەمێک بوو کە هەمووومان گومانمان لە یەکتری هەبوو، بە هیچ جۆرێک چاوەڕوانیم نەدەکرد لە نێو ڕەشماڵی خانێکی مەڕداری کوردی کۆچەرییدا لەم دەشتی قوڕەمەیدانەدا کتێبی (جەنگی شەکری کوبا) ی سارتەر پەیدا ببێت. عەلی خان گوتی ئەمشەو شەوی یەڵدایە، با هۆنراوەیەکی حافزتان لە سەر شەوی یەڵدا بۆ بخوێنمەوە:

**هاوڕێیان بە غەزەل پرچی یار شانە بکەین**
**شەوێکە خۆش و درێژی بەم قسانە بکەین**
**دڵان لە خەڵوەتی شادیی جەمن هەموو، یاران**
**بە چاوەزار دەمبەستی ڕەقیبی یانە بکەین**
**چەنگ و ڕوباب بە دەنگی بەرز و بڵند دەڵێن**
**لە لێوی خەڵکی دەروون نۆشی عاشقانە بکەن**
**بە گیانی یار کە عیشق ئابڕووبەر و هەڵە نین**
**ئەگەر بە لوتفی خودا تەکیە خالیسانە بکەین**
**گەلێکە بەین، لە بەینی ئەوین و عاشقی زار**
**کە یار ناز دەکا شیوەنێ شەوانە بکەین**
**یەکەم ئامۆژگاریی پیر ئەم کەلامە شیرینەیە**
**حەزەر لە هاوڕێی نامەردی ئەم زەمانە بکەن**

خان دێڕی کۆتایی چەند جارێک دووبارە کردەوە، کە ئامۆژگاری کچەکەی خۆی دەکرد.. پاشان ڕووی کردە پەری خانم و گوتی کات درەنگە بڕۆ بخەوە، سبەینێش هەر ڕۆژی خودایە. من هێشتا بە عەلی خانم نەگوتبوو کەسبەی دەمەوێت بچم بۆسەردانی بێژەن. پەری خانم لە جێگای خۆی هەڵسا و ڕووی کردە من و گوتی سبەی لەگەڵ ئێمەدا وەرە بۆ ڕاو. ئەسەد گوتی موهەندیس ناتوانێت سواری ئەسپ ببێت. پەری خانم

گوتی فێر دەبێت. عەلی خان گوتی تا سبەینێ خودا گەورەیە ئێستا بڕۆن بخەون.

«یەلە» لە ڕەشماڵەکەی مندا ئاگری کردبووەوە، بەڵام هێشتا ناو ڕەشماڵەکە ساردبوو. هەستمکرد کە من هیچ شتێک لە بارەی ئەم کۆچەرییانە و عەلی خان و بنەماڵەکەی نازانم. ئەو کچەی نێو کاتژمێر لەوە پێش وام هەستدەکرد جگە لەڕاو و ئەسپسواری هیچی تر نازانێت، کەچی ئێستا وا باسی سۆڤیەت و کوبا و ئیسرائیل دەکات. پاشان لەو ساڵانەی دواییدا زانیم، ژمارەیەکی زۆر لە ئەندامانی ساواک بۆ خولی هەواڵگریی چوو بوون بۆ ئیسرائیل. پرسیارەکەی پەری خانمیش هەر پەیوەندی بەوەوە هەبوو. پرسیارەکەی دوولایەنە بوو، واتە تۆ ساواکیت و خولت بینیوە. لە بارەی عەلی¬ خانیشەوە وا بیرم دەکردەوە هەموو ژیانی لەنێو مەڕ و بزندا بەسەربردووە، کەچی هۆنراوەی حافزی لەبەر بۆ دەخوێندمەوە، غەزەلێکیشی هەڵبژارد بوو کە پەیامێکی تێدا بوو، دەیگوت خۆتان بپارێزن لە قسەی نابەجێ و خۆتان بە دووربگرن لە کەسانی نەناسراو، بەڵام بۆچی عەلی خان ئەم هۆنراوەیەی هەڵبژارد؟

یەک کاتژمێر، لە نیوەی شەو لایدا بوو، هەوا سارد بوو، ئەگەرچی ئاگریش لە ڕەشماڵەکەدا هەبوو. سەیری گەرمیپێوم کرد نزیکی پلەی سفری سەدی بوو. «یەلە» لە نزیک ئاگرەکەوە نووستبوو، کەلوپەلەکانی خۆی لەوناوە بڵاوکردبووەوە، پێڵاوەکانی لەپێدابوون. منیش بەتانییەکم پێدادا، جەواڵێکم هێنا ئەویشم لە سەر بەتانییەکەوە پێدادا. خۆیشم لێی نووستم. کیسە خەوەکەم زۆر گەرم و باش بوو، زوو خەوم لێکەوت. بەیانی کە بەئاگاهاتم زۆر سارد بوو، لە کیسە خەوەکەم هاتمەدەرەوە، گوێم لە دەنگی عەبدال وغەفار و چەند کوڕ و کچێکی¬تر بوو کە خەریکی یاریکردن بوون بە تۆپەکە، کاتی بێکاری خەڵکەکە بوو، گەنجەکان دەیانتوانی و ماوەیان هەبوو بەیانیان دوو کاتژمێرێک یاری بکەن یاخود شەوانە ماوەیەک یاری بکەن. هێشتا خۆر تازە سەری دەرهێنا بوو، مندالانی (١٠-١٥) ساڵ پێکەوە بە کوڕ و کچەوە، یارییان دەکرد. مەنوچەهری کوڕی عەلی خان هات بۆ لام و گوتی خان چاوەڕوانی تۆ دەکات، بە ڕوویەکی خۆشەوە ڕۆیشتم بۆ ڕەشماڵەکەی خان. کە گەیشتمە نێو ڕەشماڵەکە سفرە ڕاخرا بوو، خان و ژن و منداڵەکانی هەموو لە دەوری سفرەکە دانیشتبوون.

عەلی خان فەرمووی دانیشتنی لێ کردم و گوتی هەوا زۆر سارد بووە، پێویستە بە زوویی باربکەین و بڕۆین بەرەو (مەراوەتەپە)، پێویستە هەر ئەمڕۆ بەزوویی لەگەڵ هەموو گەورە پیاوانی هەوارەکانی تر کۆببینەوە و بەرنامەی کۆچکردن بەرەو مراوتەپە دابنێین. پەری خانم گوتی من لەگەڵ منداڵەکاندا دەڕۆم بۆ ڕاو. بە شێوازی فەرمانکردن

گوتی موهەندیس تۆش لەگەڵ ئێمەدا وەرە بۆڕاو. بەڕاستی زۆرم حەزدەکرد لەگەڵیاندا بڕۆم، بەڵام من حەزم لەڕاو و کوشتنی گیانداران نەبوو. حەزم بە کوشتنی هیچ زیندەوەرێک نەدەکرد، بەتایبەت ئاژەڵە بێ زیانەکان، بەڵام لەوەش گرنگتر، لە سواربوونی ئەسپ دەترسام، بۆیە گوتم ئیشەڵڵا ڕۆژێکی تر لەگەڵتان دێم، بەڵام ئەمڕۆ حەزدەکەم لە لای عەلی خان بمێنمەوە.

پەری خانم تاقمی فیشەکدانەکەی بەست و تفەنگەکەشی کردە شانی، بەبێ ئەوەی قاچی لەسەر هیچ شتێک دابنێت یەکسەر لە زەوییەوە خۆی فڕێدایە سەرماینەکە. عەلی خان گوتی ئاگاداری ماینەکەبە و باش تێری بکە، ماینەکە ئاوسە، وریابە غاری پێنەکەیت. دووان لە خوشکەکانیشی سواری ئەسپ بوون و لەگەڵیدا ڕۆیشتن. هەستمکرد عەلی خان پێیناخۆش نەبوو کە لەگەڵیاندا نەڕۆیشتم.

عەلی خان زیاتر ڕێزی لێنام و گوتی دەبێت ئەمڕۆ سەرێک لە هەواری هۆزەکانی تر بدەم و بەرنامەی کۆچ دابنێین، لەگەڵ هەریەک لە وەلی خانی قارەمانلو، حاجی محەمەدی سلێمانی و عەبدولعەلی بڵند، ئەم کەسانە دەبوو بەرنامەی کۆچەکەیان دابنێن. گوتم دوێنێ ئەردۆ گوتوویەتی تا هەفتەیەکی تر هەوا زۆر سارد دەبێت. عەلی خان گوتی بەڵێ دەزانم، هەر خۆی درێژەی بە قسە کردندا و گوتی بەڵێ ڕادیۆی مۆسکۆ بەرنامەی کەشوهەوای بڵاوی کردەوە. منیش پێم سەیر بوو کە وایگوت. چونکە تا ئێستا لە هەوارەکەدا ڕادیۆم نەدبینی بوو. دیار بوو عەلی خان ڕادیۆی هەیە و گوێ لە ڕادیۆی مۆسکۆ دەگرێت. بیرم کردەوە گوتم ڕەنگە ئەردۆش گوێ لەڕادیۆی مۆسکۆ بگرێت و ڕەنگە پێشبینی کەشناسییەکەی بە هۆی ڕادیۆی مۆسکۆوە بووبێت. عەلی خان گوتی لە دوای لافاوەکەی پارەوە ڕادیۆیەکم کڕیووە، ڕادیۆکەم ئێزگەی مۆسکۆ و عیشق ئاباد و تاشقەند بەباشی وەردەگرێت. بە پێشبینی کەشوهەوای تورکمانستان، دەتوانین کەشوهەوای ئێرەش دیاری بکەین.

گوتم خان تۆ تورکمانی دەزانیت؟ گوتی بەڵێ باش دەزانم، من باوکم کوردە دایکیشم تورکمانە، ئینجا گوتی دایکم تەمەنی نەوەدودوو ساڵە و لە بۆجنوورد دادەنیشێت و یەکێک لە ژنەکانیشم تورکمانە. ئینجا تێگەیشتم بۆچی چەند منداڵێکی عەلی خان شێوەیان لە تورکمان دەچێت؟ عەلی خان بانگی کرد و گوتی جەوهەر خانم وەرە. من پێشتر جەوهەر خانمم بینی بوو، هەر بە ڕاستی لە شێوە و دیمەنیدا هەستی پێدەکرا تورکمانە و کورد نییە. وام هەستدەکرد ئەم ژنە لە هۆزی هەزارە بێت، وامدەزانی عەلی خان ژنێکی هەزارەی شیعەی هێناوە، بەڵام نەمدەزانی کە لەگەڵ ژنێکی سوننە

مەزهەبی تورکمان زەماوەندی کردووە. جەوهەر خانم هات و لە تەنیشت منەوە بەدیار ئاگردانەکەوە دانیشت. جەوهەر خانم تەمەنی پەنجا ساڵ دەبوو، دایکی پێنج منداڵ بوو.

حاجی ڕەزا بانگی کرد و گوتی خان فەرموو ئەگەر دەڕۆیت ئەسپەکەم بۆ ئامادە کردویت. عەلی خان گوتی تۆزێک بووەستە، پاش کەمێکی تر دەڕۆم، با هەتاو کەمێک گەرم ببێت. بە عەلی خانم گوت دەتوانم لەگەڵ تۆدا بێم. خان گوتی هەوا ساردە و ئەسپەکەش بەخێرایی دەڕوات دەترسم بکەویتە خوارەوە. گوتم من لە سواری ئەسپ دەترسم. سواری حوشتر دەبم. ئیتر بڕیار بوو حوشترێک بۆ من ئامادەبکەن. خان هەڵساو ڕۆیی تا کارەکانی ئەنجامبدات. من و جەوهەر خانم لە ژێر ڕەشماڵەکەدا مابنەوە، ژنێکی پاک و خاوێن، جلوبەرگێکی خاوێن و جوانی لەبەردابوو، وەک ئەوەی تازە لە جلشۆر هاتبنە دەرەوە، باڵای کەمێک بەرز بوو برۆکانی تورکمانی بوون. گوتم جەوهەر خانم خزم و کەسی تۆ لە کوێن؟ گوتی لە بۆجنوورد و گونبەد کاوسن. ئەو کچی یەکێک لە گەورە پیاوانی تورکمان بوو، بنەماڵەکەی نزیکەی سەد ساڵ دەبوو وازیان لە ژیانی کۆچەریی هێنابوو، لە بۆجنوورد دادەنیشتن، جەوهەر خانم خزمی (تەیمورتاش) بوو کە یەکێک بوو لە وەزیرە بەناوبانگەکانی ڕەزاشا.

پێش دروستبوونی یەکێتی سۆڤیەت، باوکی جەوهەر خانم کاری بازرگانی کردووە. لەگەڵ بوخارا و عیشق ئاباد. ئەو کاتە زۆربەی خزمەکانی لە عیشق ئاباد و یەکێتی سۆڤیەت بوون. ساڵی (١٣٤٨-١٩٦٩) هێشتا یەکێتی سۆڤیەت مابوو. منداڵەکانی جەوهەر خانم زمانی تورکمانیان بە باشی دەزانی، ئەوان لەسەر مەزهەبی سوننە بوون، سیان لە کچەکانی پابەند بوون بە مەزهەبی سوننەوە، بەڵام دوو کوڕەکەی لەسەر مەزهەبی شیعە بوون. گوتم ژنەکانی دیکەی عەلی خان لەسەر مەزهەبی شیعەن؟ گوتی بەڵێ ئەوان شیعەن. گوتم لەگەڵ ئەواندا تاکو ئێستا هیچ کێشەیەکت بۆ دروست بووە؟ گوتی نەخێر هەرگیز هیچ کێشەیەکم لەگەڵیاندا نەبووە. بەڕاستی یەکێتییەکی باش لە نێوان هەردوو مەزهەبی شیعە و سوننەدا هەبوو. خانێکی کورد باوکی شیعە بوو، دایکیشی تورکمانێکی سوننە بوو. عەلی خان سێ هاوسەری هەبوو، دوانیان شیعە بوون یەکێکیان سوننە بوو، ژنەکان لەژێر یەک ڕەشماڵدا دەژیان. هەڵبەت هاوسەرە گەورەکەی زیاتر لە بۆجنوورد دەمایەوە. لە نێوان کچەکانیشیدا سیانیان سوننە بوون و ئەوانی تریش شیعە بوون. تێکڕاش پێکەوە دەژیان. جەوهەر خانم چەندین ساڵ بوو ڕادیۆی هەبوو، گوێی لە ئێزگەی تورکمانستان دەگرت، ساڵی پێشوو عەلی خان ڕادیۆیەکی باشتری بۆ کڕی بوو، هەر بۆیە ئاگاداری هەموو هەواڵەکانی جیهان بوو، هەواڵەکانی بۆ عەلی خان و

کەسانی تریش دەگێڕایەوە. تەنها دووان لە کچەکانی لەگەڵ خۆیدا بوون، کوڕەکانیش ژنیان هێنابوو لەگەڵ ئەواندا نەدەژیان و ماڵی خۆیان جیا بوو، کچێکیشی بە ناوی فەرەنگیس شووی بە کوڕی خاڵی خۆی کردبوو. هاوسەری فەرەنگیس تورکمانێکی سوننە مەزهەب بوو، ئەفسەر بوو لە سوپادا و پلەیەکی بەرزیشی هەبوو، لە شاری عەجەبشێری ئازەربایجان خزمەتی دەکرد، بە ڕاستی جەوهەر خانم ژنێکی زۆر میهرەبان بوو. عەلی خان لە دەرەوەی ڕەشماڵەکە خەریکی ڕاستەڕێکردنی کارەکانی بوو، هەواڵی دەنارد بۆ شوانی مێگەلەکان، چەند کەسێکیش لە هەوارەکانی ترەوە هەواڵیان هێنا بوو، چاوەڕوانی فەرمانەکانی حاجی عەلی خان بوون. دەنگی خان لە دەرەوەی ڕەشماڵەکەوە هات. من و جەوهەر خانم بە دیار ئاگردانەکەوە دانیشتبووین.

لە ڕەشماڵەکەی عەلی خاندا سێ ئاگردان هەبوون، ئاگردانێک عەلی خان و میوانەکانی لەبەری دادەنیشتن، ئاگردانێکیش تایبەت بوو بە ژن و منداڵانی خان، ئاگردانی سێهەم تایبەت بوو بە چێشتلێنان. لە نێوان چێشتخانە و بەشەکەی تری ڕەشماڵەکەدا پەردەیەکی گوڵدار هەبوو، لە هاویندا کە چوومە نێو ڕەشماڵەکەوە پەردەکە دادرابووەوە، بەڵام لەم کاتەدا کە زستانە. پەردەکە لادرابوو، تاکو گەرمی ئاگردانەکە بە هەموو ناو ڕەشماڵەکەدا بڵاوببێتەوە.

جەوهەر خانم لە بۆجنوورد چوو بووە قوتابخانە، تا پۆلی یەکەمی ناوەندی خوێندبوو. کاتێک عەلی خان چووبوو بۆ داوای، باوکی جەوهەر خانم ڕازی نەببوو، بەڵام جەوهەر خانم عەلی خانی خۆشویستبوو. ئەو کاتە خان تەنها ژنێک و سێ منداڵی هەبووە. لە ساڵی (١٣١٢-١٩٣٣) شووکردنی کچێک بە پیاوێکی ژندار ئاسایی بوو.

جەوهەر خانم لە تەمەنی پازدە ساڵیدا شوی بە خان کردبوو، تا ئەوکاتە سیوشەش ساڵ بوو هاوسەری عەلی خان بوو. دواتر عەلی خان ژنێکی تریشی هێنابوو، جەوهەر خانم لەگەڵ خزم و کەسوکارەکانیدا هاتوچۆیەکی زۆری هەبوو، چەندین جار چوو بوو بۆ عەجەبشێر بۆ سەردانی کچەکەی و زاواکەی. ئەو زیاتر لە هەردوو ژنەکانی تری عەلی خان گەشت و سەردانی کردبوو. لەکاتی دووەم جەنگی جیهانیدا لەگەڵ دایک و باوکیدا ڕۆیشتبوو بۆ عیشق ئاباد. خزمەکانی دایک و باوکی لە نزیکی سنووری ئێران و تورکمانستان بوون. لە جەوهەر خانمم پرسی ئەردۆ زۆر جار پێشبینی کەشوهەوا و بارانبارین دەکات، ئایا ئەویش ڕادیۆی هەیە و گوێ لە ئێزگەی مۆسکۆ و عیشق ئاباد دەگرێت؟ جەوهەر خانم گوتی ئەردۆ ڕادیۆی نییە و هەمیشە ئەردۆ دوو ڕۆژ لەپێش ڕادیۆی مۆسکۆ و عیشق ئاباد پێشبینی کەشوهەوا و بارانبارین دەکات. گوتم باشە

ئەگەر پێشبینییەکانی ڕاستە، ئەی بۆچی هەندێک کەس دەڵێن ئەردۆ شێتە؟ جەوهەر خانم گوتی ئەردۆ زۆر ئاقڵە. ئەقڵی ئەو زۆر لە پێش ئەقڵی ئەم کۆچەرییانەوەیە، ئەردۆ لێرە زیندان کراوە، ئەردۆ پێویست بوو بڕوات بۆ شار و بخوێنێت.

جەوهەر خانم گوتی منیش جورئەت ناکەم هەندێک لە هەواڵ و دەنگوباسەکانی ڕادیۆ بۆ ئەم خەڵکە بگێڕمەوە، خان و منداڵەکانی خۆمان لە قسەکانم تێدەگەن، بەڵام خەڵکی هەوارەکە هەندێکیان لە قسەکانم تێناگەن، منیش سەرەتا کە هەندێک هەواڵم لە ڕادیۆ دەبیست و بۆ خەڵکەکەم دەگێڕایەوە، ئەوان وایاندەزانی من جادوگەرم. جەوهەر خانم گوتی تەنها قسەیەک کە لێرە کاری پێبکرێت، قسەیەکە لەبارەی کەشناسی و بارانبارینەوە. ئینجا گوتی جارێکیان لە بۆجنوورد ڕادیۆم کردبووەوە گوێم لە دەنگی مۆسکۆ دەگرت، ڕادیۆکە گوتی دوو ڕۆژی دیکە لە باکووری (کەپەداخ) باران دەبارێت. ئەو کاتە ڕادیۆی گەورە هەبوو، بە پاتری گەورە کاری دەکرد، ئەوسا زۆربەی کۆچەرییەکان ڕادیۆیان نەبینی بوو. منیش بۆ بەیانییەکەی هاتم بۆ لای هەوارەکەمان و پێمگوتن سبەینێ باران دەبارێت، هەروەش بوو ڕۆژی دواتر باران دەستیپێکرد. دوایی خەڵکەکە دەیانگوت جەوهەر خانم جادوگەرە و پێشبینی دەکات، هەر بۆیەش داوایان لێدەکردم کە پێشبینی چارەنووسیان بۆ دیاری بکەم. بۆیە عەلی خان پێیگوتم لەلای ئەم خەڵکە باسی ئایندە مەکە، هەمیشە دەربارەی ڕابردوو قسەیان لەگەڵدا بکە، ئەگەر دەربارەی ئایندەش قسەیان لەگەڵدا دەکەیت، لەبارەی ئایندەیەکی دوورەوە قسەبکە، قسەی بێسەروبەریان بۆ بکە، تەنها قسەی بێبنەمایان بۆ بکە و بڵێ ژیانتان باش دەبێت. بڵێ خودا تەمەنتان درێژدەکات، بڵێ خۆشبەخت دەبن. ئینجا جەوهەر خانم گوتی پاشان وردە وردە فێربووم چۆن لەگەڵ ئەم خەڵکەدا قسەبکەم.

یەک کاتژمێر لەگەڵ جەوهەر خانمدا بەدیار ئاگردانەکەوە دانیشتین و قسەمان کرد. عەلی خان بانگی کردم و گوتی موهەندیس ئەگەر دێیت وەرە با بڕۆین. کڵاوم کردە سەرم و ملپێچەکەم لە ملم ئاڵاند و کۆڵەپشتم هەڵگرت و دووربین و بەرزیپێو و گەرمیپێوم هەڵگرت و لە سەر پشتی حوشترەکە دامنان. عەبدال حوشتری ئامادەکرد بوو بە عەلی خانی گوت منیش لەگەڵ موهەندیسدا دێم. بەبێ ئەوەی چاوەڕوانی وەڵامی خان یا قسەیەکی من بکات خۆی هەڵدایە سەرپشتی حوشترەکە، ئینجا حوشترەکەی خەواند و منیش سەرکەوتم لەدوای ئەسپەکەی خانەوە کەوتینەڕێ، بەڵام هەندێک جار حوشترەکەی عەبدال پێش ئەسپەکەی خان دەکەوت.

هەوا زۆر سارد بوو، ئەو با ساردە لە دەموچاومانی دەدا، عەبدال جلوبەرگی

کەمێ لەبەردا بوو، کڵاوێکیشی لە سەردا بوو، دارلاستیکەکەی و بەردێکی لە گیرفانی دەرهێنا و نەمزانی نیشانی لەچی گرتبوو، لە ناکاو سەیرم کرد ئەسپەکەی خان تەکانێکی داو بەخێرایی ڕۆیشت، تومەس بەردی دارلاستیکەکەی لە ئەسپەکەی خان دابوو، بۆیە ئەسپەکەی ڕاپەڕی و بەخێرایی ڕۆیشت. خان ئاوڕێکی دایەوە و تێگەیشت کە ئەوە کاری عەبداڵە. عەبدال بە هێواشی پێیگوتم بە خودا تێهەڵدانەکەم مسۆگەرکرد. گوتم خان لە تۆ نادات. عەبدال گوتی خان بۆ خۆی هەرگیز لە کەس نادات، بەڵام کێی بوێت، بە کەسێکی تر بەلێدانی دەدات. لە ڕەشماڵەکانی وەلی خانی قارەمانلو نزیک بووینەوە، ئەویش مەڕدارێکی گەورە بوو، من پاشان ئەوم زیاتر ناسی، چەندین ساڵ پەیوەندیمان هەبوو. ڕۆژی (٢٣-٦-١٣٥٨=١٤-٨-١٩٧٩) لە بۆجنوورد لە ماڵی ئەوان میوان بووم، ماڵەکەی لە دەرەوەی شاری بۆجنووردی ئەوکاتە بوو، لە نزیکی بەنزیخانەی خۆرئاوای بۆجنوورد لە کۆڵانی فەرهادی. لە ساڵی (١٣٥٨-١٩٧٩) حاجی وەلی خانی قارەمانلو (فەرهادی) سێ ژن و حەڤدە منداڵی هەبوو، هەر وەکو حاجی عەلی خان سێ ژنی هەبوو نۆ کچ و هەشت کوڕی هەبوو، باوکی حاجی وەلی ناوی فەرهاد بوو هەر بەو هۆیەشەوە ناسناوەکەشیان (فەرهادی) بوو، باپیریشی ناوی حاجی ئەڵڵاوێردی بوو، باوکی حاجی ئەڵڵاوێردیش ناوی سلێمان بوو. باوک و باپیرە گەورەشیان هەر خەریکی کاری ئاژەڵداریی بوون، مامەکانی حاجی وەلی خانیش هەموویان کۆچەریی بوون، ئەو پێنج مامی هەبوو، یەکێکیان ناوی عەلی ئەسغەر بوو کە بە خۆی و ژن و تەواوی منداڵەکانیەوە لافاو بردبوونی. لە ساڵی (١٣٥٠-١٩٧١) دا، حاجی وەلی خان بە خۆی و مام و ئامۆزا و نەوەکانییەوە وازیان لە ژیانی کۆچەریی هێنا و بە تەواوی نیشتەجێبوون، هەندێکیان بوون بەشۆفێر و هاوکاری شۆفێر.

لەو ڕۆژە ساردەی سەرەتای زستاندا گەیشتینە هەوارەکەی حاجی وەلی خانی قارەمانلو. حاجی محەمەد سلێمانی و عەبدولعەلی بڵندیش لەوێ بوون. حاجی عەلی خان منی بە ئەوان ناساند. من پێشتر حاجی محەمەد سلێمانیم بینی بوو، شەوێکیش میوانی بووم، بەڵام یەکەمجار بووکە حاجی وەلی خان ببینم. لە دەوری ئاگردانەکە ئەو چوار پیاوە کەوتنە وتووێژ و چایان دەخواردەوە و بەرنامەی کۆچکردنیان دادەنا، دەبوو هەوارە بچووک و کەم ئاژەڵەکانی تریان ئاگادار بکردایەتەوە، تاکو ئەوان بەزوویی و لە پێش هەمووواندا بکەونەڕێ، دەبوو پاش چوار ڕۆژ دوای ئەوان هەواری حاجی محەمەد سلێمانی بەڕێبکەوتایە. ڕۆژی دواتریش دەبوو هەوارەکەی حاجی وەلی خان بڕۆیشتایە. حاجی عەلی خانیش بەخۆی و مێگەلەکانیەوە شەش ڕۆژ دواتر بەڕێبکەوتایە

و لە گەردەنەی شەلەمی ئاودیو ببوونایە. تێپەڕبوونی مێگەلەکانی حاجی عەلی خان، سێ ڕۆژی دەویست. عەبدولعەلی بڵندیش دەبوو تا دە ڕۆژی تر چاوەڕێ بکات و پاشان بکەوتایەڕێ یا دەبوو لە ڕێی ڕۆخی ڕووبارەوە بڕۆیشتنایە و مێگەلەکەی بەرەو مەراوەتەپە ببردایە. تێکڕای ڕەشماڵنشینانی دەشتی قورەمەیدان و کۆتایی خۆراسانی ئەتراک و کوێستانەکانی تر دەبوو لە گەردەنەی شەلەمییەوە تێپەڕینایە. چونکە جگە لەو ڕێیە هیچ ڕێیەکی تر نەبوو. هەڵبەت ژمارەیەکی زۆری کۆچەرییان لە باکووری ئەتراک و ناوچەی جەرگولانەوە دەڕۆیشتن بەرەو مەراوەتەپە، ئەوانەشی کە لە ڕێگەی قورەمەیدانەوە دەڕۆیشتن دەبوو لە گەردەنەی شەلەمییەوە بڕۆن. جگە لەم ڕێیە، ڕێیەکانی تر زۆر ترسناک و هەڵدێر بوون. تەنانەت بۆ تێپەڕبونی ئەسپ و حوشتریش بەکار نەدەهاتن. نزیکەی بیست هەزار سەر مەڕ، پێنجسەد سەر حوشتر، سەدەها ئەسپ و ولاخ و (٤٥٠) ماڵ، دەبوو لەماوەی تەنها دە ڕۆژدا لە گەردەنەی شەلەمیەوە ئاودیو بن و خۆیان بگەیەننە مەراوەتەپە. واتە ماوەی کۆچکردنەکەیان نزیکەی دە ڕۆژی دەخایاند. ئەگەر بە بەرنامە نەڕۆیشتنایە بەم هەموو قەرەباڵغییەوە دوچاری بێ لەوەڕی و بێ ئاوی دەبوونەوە. ئاژەڵەکان دەبوو (٨٠-٩٠) کیلۆمەتر ڕێگە ببڕن بەبێ لەوەڕ و بەبێ ئاو. کۆبوونەوەکەیان کۆتایی‌هات و بڕیاردرا حاجی محەمەد و عەلی بڵند هەوارە بچووکەکان ئاگادار بکەنەوە. منیش دەمویست بڕۆم بۆ هەوارەکەی بێژەن، ئەوان منیان ڕاسپارد کە هەواڵ بدەم بە بێژەن کە دەبێت ڕۆژی سێهەم بکەونەڕێ بەرەو مراوەتەپە.

حاجی وەلی بۆ نیوەڕۆ خوانێکی باشی ئامادەکربوو. بێگومان گۆشتەکەش گۆشتی ڕاو بوو. سروشت میوانداری هەمووانی کردبوو، دوای نانخواردنی نیوەڕۆ من و عەبدال بەرەو هەوارەکەی بێژەن بەڕێکەوتین. حاجی عەلی خانیش سواری ئەسپەکەی بوو بەرەو هەواری ئەسەدی کوڕی کەوتەڕێ. نزیکەی کاتژمێر دووی دوانیوەڕۆ گەیشتینە هەوارەکەی بێژەن، کە سەیرمانکرد یەک ڕەشماڵ بە پێوە نەمابوو هەوارەکەیان چۆڵکردبوو لەوێ ڕۆیشتبوون، هێشتا لە ئاگردانە کانیاندا گەرمی ئاگر مابوو، بەوەدا بۆمان دەرکەوت کە چەند کاتژمێرێکە ڕۆیشتوون. عەبدال گوتی دەڕۆین بەشوێنیاندا لەو دەشتودەرە شوانە مەڕ هەیە، لە هەواڵی ئەوان دەپرسین. عەبدال حوشترەکەی تاودا تا بەخێرایی بڕوات و زوو بگەینە لای بێژەن. حوشترەکە باری قورس نەبوو زۆر بە خێرایی دەڕۆیشت، پاش سێ خولەک گەیشتینە مێگەلە مەڕێک، شوانەکە گوتی هەوارەکەی بێژەن کاتژمێرێک دەبێت لێرەوە تێپەڕیوون. گەیشتن بە هەوارە تازەکەی بێژەن کارێکی سەخت نەبوو. ئەوان بە ژن و منداڵ و کەلوپەلەوە نەیاندەتوانی بەخێرایی

بڕۆن. بە عەبدالم گوت ئەگەر بە هەوارەکەی بێژەن گەیشتین کاتی شەو دەگەین. بەو شەوە چی بکەین؟ گوتی تۆ لە ئێستاوە خەم لە شەو دەخۆیت. شەو لای بێژەن دەمێنینەوە. گوتم دایک و باوکت نیگەرانی تۆ نابن. گوتی ئێمە منداڵی ئەم دەشتودەرەین، هیچ کەسێک نیگەرانی ئێمە نابێت و دەزانن کە من لەگەڵ تۆدام. عەبدال گوتی ئەی تۆ دایک و باوکت نیگەرانت نابن. گوتم من باوکم مردووە. ئیتر لەسەر پشتی حوشترەکە کەوتینە قسەکردن. گوتم عەبدال تۆ دەتەوێت چ کارێک بکەیت؟ گوتی دەمەوێت بچم بۆ گوندی (ئەسفەروج) بۆ لای ماڵی مامم لەوێ بخوێنم. گوتم زۆر حەزدەکەیت بخوێنیت؟ گوتی بەڵێ. گوتم پاش خوێندن دەتەوێت ببیت بەچی؟ گوتی نازانم گوتم ئەی بۆچی دەتەوێت بخوێنیت؟ گوتی دەمەوێت شانامە بخوێنمەوە، زۆر حەزم لە خوێندنەوەی شانامەیە، دەمەوێت بزانم ڕۆستەم کێ بووە و چ کارەبووە؟ گوتم حەزدەکەیت هەر ئەمشەو کەمێک نووسینت فێر بکەم؟ گوتی بەڵێ زۆر حەز دەکەم و کارێکی زۆرباشە.

نزیکی ئێوارە بوو قاچەکانم کەسیرە بوون، پلەی گەرمی دوو پلەی سەر و سفر بوو. عەبدال زۆر بە خێرایی حوشترەکەی لێدەخوڕی، پاش کەمێک عەبدال گوتی ئەوە هەوارەکەی بێژەنە وا لێمان دەرکەوت. هەرگیز تێنەگەیشتم، بۆچی ئەم کۆچەرییانە ئەوەندە زرنگ و وریان، چۆن وا هەستدەکەن و شتەکان وا بەزوویی درک پێدەکەن؟ ئەوان لە ئێمەی دانیشتووانی شارەکان باشتر دەبیستن و باشتر شتەکان دەناسن. عەبدال ڕاستی گوت ئەوە هەواری بێژەن بوو، ئەوان تازە گەیشتبوونە ئەو هەوارە و خەریکی هەڵدانی ڕەشماڵەکانیان بوون. کاتێک گەیشتینە هەوارەکە، بێژەن هاواری کرد، موهەندیس هات موهەندیس هات. منیش چاوەڕوانی ئەوەم نەکرد حوشترەکە بخەوێت و دابەزم، لەسەر حوشترەکەوە خۆم هەڵدایە باوەشی بێژەن و ئەملاولای یەکمان ماچکرد و یەکترمان لەباوەشگرت. چوینە نێو ڕەشماڵەکەوە و بەزوویی ئاگریان کردەوە و قاچەکانم تەزی بوون، لە دەوری ئاگرەکە دانیشتین و قاچم گەرمکردەوە. بێژەن کتێبی پۆلی سێهەمی سەرەتایی و دەفتەرەکەی کە نووسینەوەی تێدا نووسیبووەوە و هێنایە بەردەمم. پێم سەیر بوو چۆن لەو دەشتودەرە ئەو نووسینە جوانانەی نووسیبووەوە. گوڵسەنەمی هاوسەریشی چای بۆ تێکردین. بێژەن بەگوڵسەنەمی گوت ئەوە موهەندیس هات بۆ سەردانمان. خەڵکی هەوارەکە هەموویان خەریکی ڕەشماڵ هەڵدان بوون، کەلوپەلەکانی بێژەنیان دەخستە نێو ڕەشماڵەکەوە. خەڵکەکە چ کارێکیان بۆ حاجی عەلی خان دەکرد هەر هەمان کاریشیان بۆ بێژەن دەکرد.

گوڵسەنەم تەمەنی (١٧-١٨) ساڵ دەبوو کچە مامی بێژەن بوو، کچێکی ئازاو وریا

بوو. فارسییەکی زۆر باشی دەزانی. عەبدال گوتی گوڵسەنەم خوێندەوارییەکی باشی هەیە و وانەش بە من دەڵێتەوە. گوڵسەنەم لەگوندنشینەکان بوو، سوپای فێرکاری فێری خوێندنیان کردبوو، ئەویش وانەی بە بێژەن دەگوتەوە، لەو دەشتەدا ژن و مێرد مامۆستای یەکتری بوون. سەیری دەفتەرەکەی گوڵسەنەمم کرد، دەستوخەتێکی جوانی هەبوو. گوڵسەنەم زۆر بە باشی کتێبی دەخوێندەوە، گوڵسەنەم گوتی موهەندیس بێژەن شانامە دەخوێنێتەوە، لەناو خورجێنەکەدا شانامەیەکی گەورەی دەرهێنا و ڕووناکی چراکە پەڕەکانی شانامەی ڕووناک دەکردەوە

**بە ڕێورەسمەوە بهن بەخێری بێنن**
**تیکرا هەموو دەشتودەر بە گوڵ داچێنن**
**وەک بێژەن لە بیشەدا هەڵبێنن چاوی**
**بجۆشێ خوێنی لە جەستەی توورە و گراوی**
**بەرازەکان، بەرازەکان، با پێی نەزانن هاوار**
**کە بێژەن لەسەر زینەوە کەوتۆتە خوار**

بێژەن چیرۆکی بێژەن و مەنیژەی زۆر بە باشی دەخوێندەوە. وردە وردە، دانیشتووانی هەوارەکە دەستیان لەکارەکانیان هەڵدەگرت و بەرەو ڕەشماڵەکەی بێژەن دەهاتن. هەندێک جار گوڵسەنەم هاوکاری بێژەنی دەکرد و هەندێک جاریش بێژەن هاوکاری گوڵسەنەمی دەکرد. منیش هەستم بە

خۆشییەکی زۆر دەکرد، چونکە لە ماوەی ساڵ و نیوێکدا بێژەن زۆر بەرەوپێشچوو بوو، دەیتوانی بەباشی شانامە بخوێنێتەوە. کە بەڕاستی توانایەکی زۆر باشی هەبوو.

لەم هەوارانەدا و لە نێو ئەو کۆچەرییانەدا توانایەکی باش بەدیدەکرا. ئەوان بەردەوام لە کارکردندا بوون و هەموو توانای خۆیان خستبووە گەڕ، تا کو ئێمە گۆشتی مەڕ و ڕۆنی زەرد بخۆین. خۆزگە ئێمەش فێر ببوینایە زیادە خەرجییمان نەکردایە لە بەفیڕۆدانی خۆراکدا.

بەهەرحاڵ من ئەو شەوە شەوێکی شاعیرانەم هەبوو.. بووک و زاوای لاو سفرەیەکی جوانی پڕ میهرەبانی و خۆشەویستیان ڕازاندبووەوە. بە بێژەنم گوت ئەمڕۆ عەلی خان بەرنامەی کۆچکردنی داناوە و تۆش دەبێت سێ ڕۆژی تر بەڕێبکەویت. بێژەن گوتی ئێستا هەوا زۆر سارد بووە، ماڵەکان و مەڕەکان تووشی ئازار و ناڕەحەتی دەبن، زۆر

نزیکیشە ڕێگای گەردەنەی شەلەمی بگیرێت بەهۆی بەفر و بارانەوە. ئەردۆش هەواڵی بۆ ناردووم لە دوو ڕۆژی داهاتوودا هەوا زیاتر سارد دەبێت. گوتم ئەردۆ بە منیشدا هەواڵی بۆ تۆ ناردووە، کە هەرچی زووترە باربکەیت و بڕۆیت. بێژەن گوتی ئەردۆ هەواڵی بۆهەموو هەوارەکان ناردووە کە هەوا ساردتر دەبێت و بەزوویی کۆچبکەن، بەڵام بەداخەوە هەمووان دەڵێن ئەردۆ شێتە، بەڵام من هەرگیز شێتیم لە ئەردۆ نەدیوە. ئەو چەندین ساڵ هاوکاری من بووە لە شوانیدا، ئەردۆ هەر قسەیەک بکات ڕاست دەردەچێت.

بێژەن گوتی ئەم بەیانییە مێگەلەکەم بەڕێکردووە، ئەمڕۆش نیوەڕۆکەی هەوارمان جێهێشتووە و هاتووین بۆ ئێرە، بەیانی زوو لێرەوە بەڕێدەکەوین و لە گەردەنەی شەلەمی ئاودیو دەبین، بە شوانەکانیشم گوتووە یەکڕاست مێگەلەکە ببەنە تورکمان سەحرا، لە هیچ شوێنێک نەوەستن و شەو و ڕۆژ بە بەردەوامی بڕۆن، بۆ خۆیشمان تا سێ ڕۆژی تردەگەینە دەشتی (ئاق تەقە) تۆش لەگەڵ ئێمەدا وەرە. گوتم کەلوپەلەکانم لەلای هەوارەکەی عەلی خانە، حوشترێکی عەلی خانیشم هێناوە لەگەڵ عەبدالدا هاتووم، دەبێت بە زوویی بڕۆمەوە بۆ لای عەلی خان و لەگەڵ ئەواندا دێم، بەڵام کە گەیشتینە تورکمان سەحرا یەکڕاست دێم بۆ لای تۆ. لەبارەی کار و گوزەرانیانەوە پرسیارم لە بێژەن کرد، ئەویش گوتی نزیکەی (٢٣٠) سەر مەڕی خۆمم هەیە، خاوەنی سێ حوشتریش بوو، حوشترێکیشی وەک دیاری وەرگرتبوو. دوو حوشتر و وڵاخێکیشی کڕیبوو، بە هۆی ئەوەی کە ببوو بەپاڵەوان سوودێکی زۆری وەرگرتبوو. لە هەموو شوێنێک قەرزیان پێدابوو. بێژەن خۆیشی کەسێکی سەرڕاست بوو دووسەد مەڕیشی بەشوانکارە وەرگرتبوو. لە هەوارەکەی ئەودا یازدە ماڵ هەبوون، تێکڕا (٧٤٠) سەر مەڕیان هەبوو. خەڵکی هەوارەکەی کەسانی میهرەبان و بەڕێز بوون. بێژەن سەرۆکی هەوارەکە بوو، واتە کوێخای هەوارەکە بوو. گوتم ئەوا بۆ خۆت بوویت بە خان. گوتی هێشتا نەبووم بە خان، ئێستاش من شوانی دەکەم. گوتم ئەمشەو نەڕۆیشتی بۆ شوانی؟ گوتی نەخێر پێویست ناکات بچم، شوانێکی باشم هەیە. دوو کەسیشم لە هەوارەکە لەگەڵ مێگەلەکەدا ناردووە، من بۆخۆم دەبێت خەڵکی هەوارەکەم لەگەردەنەی شەلەمی ئاودیو بکەم. گوتم مەڕەکانت بفرۆشە و لەگوندێک نیشتەجێبە. ئەویش قسەکانی پێشووی دووبارە کردەوە و گوتی موهەندیس من مەڕێکم بە هەموو گوندەکان ناگۆڕمەوە. گوڵسەنەم گوتی موهەندیس ڕۆژێک دێت لە شار نیشتەجێ دەبین و واز لە کۆچەریی دەهێنین. بێژەن گوتی نەخێر هەرگیز ناچین بۆ شار. گوڵسەنەم

گوتی پێویستە منداڵەکانمان بخوێنن. تێگەیشتم کە گوڵسەنەم دووگیانە. گوڵسەنەم گوتی هەرچی زووترە لە شوێنێک نیشتەجێ بین باشترە. بێژەن گوتی هەرگیز لە هیچ شوێنێک نیشتەجێ نابم. ژن و مێرد، لەسەر هەموو شتێک کۆک بوون، تەنها لەسەر نیشتەجێ بوونیان ناکۆک بوون، بەڵام لەگەڵ یەکتریدا توند نەبوون. دیاربوو بێژەن زۆر لە ژنەکەی ڕازی بوو. گوڵسەنەمیش هەوڵیدەدا بێژەن ببێتە کەسێکی گەورە و بەڕێز. بێژەن ئەو ساڵەش لە پاڵەوانبازیدا سەرکەوتوبوو، پشتی هەمووانی لەزەوی دا بوو. چەند بەران و حوشترێکی بەدیاری وەرگرتبوو. چەند ڕۆژێک چوو بوو بۆ لای (سەفدەر) ی پاڵەوان. لەوێ سەفدەر هەندێک هونەری پاڵەوانبازیی فێرکرد بوو. لە دێهاتەکانی دەوروبەریش هەر کەسێک بیویستایە بەشداری پاڵەوانبازیی بکات، سەرەتا سەردانی سەفدەری دەکرد، تاکو فێری هونەری پاڵەوانبازیی بکات. لە هەوارەکەدا جگە لە چرای دەستی هیچ شتێکی تر نەبوو بۆ ڕووناکی. هەموو پێویستییەکانی ژیان هەر ئەوانەی هەزار ساڵ لەوەوبەر بوون. نە ڕادیۆ هەبوو نە هیچ شتێکی تر. لە دڵی خۆمدا گوتم ئەگەر جارێکی تر هاتمەوە ڕادیۆیەک بە دیاری بۆ بێژەن دەهێنم. بێژەن گوتی گوڵسەنەمی هاوسەرم دەنگێکی خۆشی هەیە. گوڵسەنەم تەنها گۆرانی بۆ بێژەن دەگوت و بۆ کەسی تری نەدەگوت. گوڵسەنەم بۆ ئێوارە خواردنێکی خۆش و بەلەزەتی بۆ ئێمە دروستکرد بوو. خۆشی لەسەر سفرە هەر لەگەڵ ئێمەدا دانیشت بۆ نانخواردن.

گوڵسەنەم گوتی موهەندیس هەموو ڕۆژێک بێژەن باسی تۆ دەکات، ڕۆژێک نییە باست نەکات، هەموو ڕۆژێک لە دەفتەرەکەیدا کە وشەیەک دەنووسێت دەڵێ خودا تەمەنی موهەندیس درێژبکات ئەو فێرە نووسینی کردووم. ئێستا بێژەن دەیەوێت فێری حساب ببێت، لە هەر گوندێک سوپای فێرکاری هەبێت ئەو سەردانیان دەکات. بێژەن گوتی گوڵسەنەم هەم هاوسەرمە و هەم مامۆستام. گوتم هیوادارم بەیەکەوە ژیانێکی درێژ و بەختەوەر بەسەرببەرن. بێژەن ڕێی بکەوتایە هەر گوندێک کە سوپای فێرکاری تێدا بووایە نووسینەکانی خۆی پیشاندەدان. منیش زۆر هانمدا کە بەردەوام بێت لە نووسین و خوێندنەوە. بێژەن گوتی کاتێک هاتیت بۆ تورکمان سەحرا، دەبێت لەوێش فێری نووسین و خوێندنی زیاترم بکەیت.

بێژەن دوایین قسەی بەهێواشی بەگوێمدا چرپاند و گوتی حاجی عەلی خان حەز بە بینینی تۆ ناکات و هیچ باوەڕێکی بە تۆ نییە. هەستمکرد کە من تا ئێستا بێژەنیش بەتەواوی ناناسم، هەندێک جار کە قسە دەکات بە کەسێکی سادەی دەبینم، بەڵام هەندێک جارکە سەیری دەکەم و گوێ لە قسەکانی دەگرم دەڵێم کەسێکی سادە نییە.

بەهەرحاڵ ئەو کەسێکی پاک و ڕاستگۆ بوو. بێژەن لە سەرەتای لاویتیدا بوو، بەڵام توانی بووی خۆی وەک پاڵەوانێک نیشانی هەموو کەسێک بدات. لە ماوەی هەژدە مانگدا لە شوانییەوە خۆی کرد بوو بە سەرۆکی هەوارێک، ژمارەی مەڕەکانی خۆی زیاد کردبوو، حوشتر و ئەسپ ولاخی کڕیبوو، ژنێکی باشی هەبوو، پێشبینییەکانی ئەردۆی هاوڕێی زۆر بە باشی وەرگرتبوو، بەبێ پرسوڕا بە خانەکانی هەوارەکانی تر، خۆی بڕیاری دابوو کە بڕوات بەرەو تورکمان سەحرا، ئەم بڕیارە مانای باوەڕ بەخۆبوونی بوو. مەڕدارە بچووکەکانی تر چاوەڕوانی بڕیاری خانەکانیان دەکرد. بێژەن بەرنامەی کۆچی خانەکانی هەڵوەشاندبووەوە و لەسەر بڕیاری خۆی مێگەلەکەی بەڕێخستبوو.

خۆماڵی کردنی پاوانەکان و چارەسەرکردنی کێشەی زەوی و پەیدابوونی سوپای خوێندن گەورەیی خانەکانی هێنابووە لەرزە. حەوت ساڵ بە سەر خۆماڵیکردنی لەوەڕگە و پاوانەکاندا تێپەڕی بوو. ئەوسا خانەکان هەستیان بەتێکشکانی دەروونیی خۆیان کردبوو.

بەیانی هەوا سارد و سەهۆڵبەندان بوو. بێژەن دوو پارچەی لە خوریی چنراوی هێنا و لە قاچی منیەوە پێچا. گوڵسەنەمیش جوتێک گۆرەوی و جوتێک دەستکێشی لە خوریی دروستکراوی پێدام، جوتێک گۆرەویشی دا بە عەبدال. کاتێک سواری حوشترەکە بووم گوڵسەنەم گوتی کەمێک بووەستن، ڕۆیشت شاڵێکی گەورەی لە خوریی دروستکراوی هێنا و لە سەری منیەوە ئاڵاند. عەبدالیش لە دواوە سواری حوشترەکە بوو. کەوتینەڕێ، ئاسمان هەور بوو، زۆریش سەرما بوو. گەرمیپێوەکەم دەرکرد پلەی گەرمی چوار پلەی ژێر سفر بوو. عەبدال حوشترە بێزمانەکەی بەخێرایی لێدەخوڕی و غاری پێدەدا. بە زوویی گەیشتینەوە هەوارەکە. «یەلە» شەو لە ڕەشماڵەکەی مندا نووستبوو. بەیانیش لە ڕەشماڵەکەدا ئاگری کردبووەوە بۆیە ڕەشماڵەکەم تاڕادەیەک گەرم بوو. ئاگرەکە گڕێکی باشی هەبوو. چوومە نێو کیسە خەوەکەمەوە تاکو خۆم گەرم بکەمەوە. عەلی خان دەیزانی هەوارەکەی بێژەن بەڕێکەوتوون. گوتی بێژەن کارێکی خراپیکردووە، نەدەبوو بەبێ بەرنامە بڕۆیشتایە، گەردەنی شەلەمی قەرەباڵغ دەبێت و هەمووان تووشی کێشە دەبن. گوتم بێژەن مەڕەکانی لەڕێگای خوارەوە بەڕێدەکات، تەنها ماڵەکان لە گەردەنەی شەلەمییەوە دەڕۆن. خان زۆر توڕە بوو لەوەی کە مەڕدارە بچووکەکان گوێ لە فەرمانەکانی خان ناگرن. عەلی خان گوتی وا خەریکە هەوا ساردتر دەبێت بۆیە، وای بەباشزانی کە دووبارە لەگەڵ وەلی خان و حاجی محەمەدی سلێمانی و عەبدولعەلی بلّند پرس و ڕادەست پێبکەنەوە.

هەستمکرد بڕیاری بەڕێکەوتنی بێژەن تەنها لەبەر ساردی هەوا نەبوو، بەڵکو بە کۆچی بێ بەرنامەیی دەیویست نارەزایی لەبەرانبەر خاندا دەرببڕێت، چونکە خانەکان هیچ حسابێکیان بۆ ئەو نەکردبوو، پرسوڕایان پێنەکرد بوو. بێژەنیش بەبێ فەرمانی ئەوان مێگەلەکەی خۆی بەڕێکردبوو. ڕۆژی دواتریش ماڵەکانیان بەڕێکەوتبوون و ڕۆیشتبوون. کۆچکردن بەبێ بڕیاری خان حساب نەکردنبوو بۆ خانەکان. بێژەن توانیبووی گوێیان بۆ نەگرێت و بڕیاری خۆی بدات. کارێکی باشمکرد کە بەبێ مۆڵەتی خان نەچووم بۆلای بێژەن، ئەوە یەکەمجار بوو مۆڵەت لە خان وەربگرم. بۆیە خان زۆر خۆشحاڵ بوو، کە گەڕامەوە پێیگوتم ئێرە ماڵی خۆتە و هەر کارێکت پێخۆشە ئەو کارە بکە.

پەری خانم لە ڕەشماڵەکە هاتە دەرەوە و گوتی موهەندیس ئێمە ئەمڕۆ بانگێشتی تۆ دەکەین و حەزدەکەین لەگەڵ ئێمەدا بێیت بۆ ڕاو، چونکە ئێمە تەنها ئەم دوو ڕۆژە لە قورەمەیدان دەمێنینەوە، ئێستاش کاتی ڕاوە و ئاژەڵی کێوی زۆرە، لە سواربوونی ئەسپ هیچ مەترسە. فەریبا خانم گوتی موهەندیس خۆی ئەسپسوارێکی باشە، بەڵام لای ئێمە خۆی وا نیشان دەدات. قسەکانی فەریبا خانم بە جۆرێک بوو وایدەزانی من ئەسپسوارێکی باشم و خۆم ئاشکرا ناکەم. عەلی خان جگە لە مەنوچەهر، هەموو کوڕەکانی تری ناردبوون بۆ هەوارەکانی تر، هەواڵی بۆ ناردبوون کە لە هەوارەکانی خۆیانبن، بەڵام کچەکانی خان دەیانویست بڕۆن بۆ ڕاوکردنی ئاژەڵی کێوی، ئەوان بەبێ ئەوەی چاوەڕوانی وەڵامی من بکەن بە حاجی ڕەزایان گوت بەزوویی چوار ئەسپ ئامادە بکات. فەریبا خانم گوتی موهەندیس لە سوپادا چۆن سواری ئەسپ دەبێت، لێرەش بە هەمان شێوە سوارببە. گوتم خۆ من لە سوپادا نیم. فەریبا گوتی وا نییە تۆ ئەفسەریت. گوتم باوەڕبکە من ئەفسەرنیم. فەریبا گوتی پار کاتێک ئەفسەرەکان هاتن سڵاوی سەربازیان بۆ تۆ کرد، من واهەستم کرد تۆ ئەفسەرێکی پلە بەرزبیت. گوتم من تەمەنم لە بیست ساڵ زیاتر نییە. چۆن چۆنی دەبمە ئەفسەر؟ پەری خانم گوتی موهەندیس قاچت بخەرە سەر ڕکابی زینەکە و سواربە و لەگەڵماندا وەرە بۆ ڕاوکردن، خۆشت تاقیبکەرەوە لە ئەسپسواریدا، ئەوەتا حاجی ڕەمەزان سەری ئەسپەکەی بۆ گرتویت، هیچ مەترسە و سواربە.

ئەو ئەسپەی کە بۆ منیان دانابوو سواریبم لە هەموو ئەسپەکان گەنجتر و چەموش تر بوو. کچەکان گوتیان مەترسە، سواربە و دابەزەوە. منیش سەیرێکی دەوروبەری خۆم کرد، عەلی خان لەوێ نەبوو تا پرسێکی پێبکەم. عەبدال گوتی موهەندیس ئەسپسواری

لە حوشترسواری خۆشتر و ئاسانترە. پەری خانم گوتی موهەندیس پەلەبکە درەنگە. گوڵخەندان گوتی موهەندیس کە سواربوویت و دووسەد مەترێک ڕۆیشتیت ترست دەشکێت. بە ناچاری بڕیارمدا لەگەڵیاندا بڕۆم بۆ ڕاو. حاجی ڕەمەزان هەوساری ئەسپەکەی گرتبوو، هیچ چارەیەکم نەبوو. هەرگیز سواری ئەسپ نەببووم، گوتم مۆڵەتم بدەن با بڕۆم کەلوپەلەکانم لەگەڵ خۆمدا هەڵگرم، ڕۆیشتم بۆ ڕەشماڵەکەی خۆم و پۆتینەکانم لەپێکردن، کڵاوەکەم لەسەرم کرد و گوتم خودایە خۆم بە تۆ دەسپێرم، لەدڵی خۆمدا گوتم هێواش هێواش دەڕۆم، قاچی چەپم خستە سەر ڕکابی زینی ئەسپەکە و تینم دایە خۆم و خۆم هەڵدایە سەرپشتی ئەسپەکە. پەری خانم بەڕێکەوت و فەریبا قامچییەکی لەئەسپەکەی مندا، ئەسپەکە ڕاچەنی و تەکانێکی دا بۆ پێشەوە و خەریکبوو بکەومە خوارەوە، بەڵام خۆم توند گرت و بە سەر ترسەکەمدا زاڵبووم. دووبارە قامچییەکی تری لێدایەوە، ئەمجارە گوڵخەندانی کچە بچووکی خا، ئەویش قامچییەکی تری لێدا، بەڵام ئەمجارەیان زۆرترسام، ئەوەندە ترسام خەریکبوو لەسەر ئەسپەکە بکەومە خوارەوە. خۆم بەسەر ئەسپەکەوە توند گرتبوو. سەرم چەماند بووەوە بۆ سەر زینی ئەسپەکە، ئەو ئەسپەی کە بۆمنیان دانا بوو لە هەموو ئەسپەکانی تر سرک و سەرکێشتر بوو، هەستمکرد کە بە ئەنقەست ئەو ئەسپەیان بۆ من داناوە. ئەمجارەش گوڵخەندان قامچییەکی تری لە ئەسپەکەمدا، ئەسپەکە ڕایکرد و پێش هەموو ئەسپەکان کەوتەوە، ئەمجارەشیان هێندەی نەمابوو بکەومە خوارەوە. گوێم لێبوو فەریبا هاواری کرد و گوتی ئەسپسواری نازانێت، بۆتان دەرکەوت کە قسەکەی من ڕاست دەرچوو، ئەم برادەرە موهەندیس نییە بەڵکو ساواکییە. ماوەی دوو کیلۆ مەتر ئەسپەکەم بە غاردان ڕۆیشت، هەستمکرد کەمەرم شکا بێت، شارەزا نەبووم و نەمدەزانی چۆن ئەسپەکەم هێواش بکەمەوەوە یا بیوەستێنم. ئەوانیش بە خێرایی ئەسپەکانیان لێدەخوڕی و گەیشتنە لای من. یەکێکیان لەلای چەپمەوە وەستا و یەکێکیشیان لە ڕاستمەوە، ئەوی تریان لەدواوە بوو. لە ناکاو گوڵخەندان بەهەموو هێزی خۆی قامچییەکی لە پشتم دا و ئازارەکەی بە هەموو گیانمدا بڵاوبووەوە، تا ئەوکاتە هەستم بە بەدیی ئەوان نەکردبوو، وام هەستکرد بوو کە ئەمانە دەیانەوێت شۆخیم پێبکەن. ئەسپەکەم بەخێرایی ڕایکرد. فەریبا هاواریکرد ئەسپەکە بگرن خۆیشی دەیویست لەقەیەکم لێبدات و لەسەر ئەسپەکەوە بمخاتە خوارەوە.

گوڵخەندان قامچییەکەی هەڵسوڕاند کە لێمی بدات، بەڵام قامچییەکە بەر من نەکەوت و لە ئەسپەکە درا، ئەسپەکە بەخێرایی ڕایکرد و پێش هەموویان کەوتەوە. زۆر ترسام،

هەستم بە دژواری دۆخەکە کرد، تێگەیشتم کە کچەکان دەیانەوێت لە ئەسپەکە بمخەنە خوارەوە. کەوتنە خوارەوە لە ئەسپ لەکاتی غارداندا واتە مردن. ئەسپەکە تەواو شەکەت بوو، تەنگە نەفەس ببوو، بەو سەرمایە ئەو ئاژەڵە هەموو گیانی ببوو بە عەرەقە.

لە دەشتەکەوە گەیشتبووینە بناری شاخەکە، هەوا سارد بوو، لە سەرمادا دەموچاوم دەبرژایەوە، بەڵام گیانم تەواو گەرم داهاتبوو. لە دامێنی کێوەکەدا چەند درەختێکی ئەرس هەبوو ئەسپەکانیان بەرەو لای درەختەکان برد. گوڵخەندان بە بەردەوامی قامچییەکەی هەڵدەسوڕاند و لە پشتمی دەدام. ئەسپەکان لەژێر درەختەکاندا وەستان. واتە ئەسپەکانیان فێرکرد بوو لەو شوێنەدا بووەستن، ئەسپەکەی منیش هەر لەوێ وەستا. هەر سێ خوشکەکە دابەزین. منیش بەوە دڵخۆشبووم کە نەکەوتبوومە خوارەوە، نەمدەزانی قاچم بخەمە سەر ڕکابی زینەکەو دابەزم. هەر دوو دەستم لە زینەکە بەردا و خۆم فڕێدایە خوارەوە، دیارە ئەو خۆخستنە خوارەوەیە لە ئەسپەکە لە نەشارەزایمدا بوو، هەرکە کەوتمە خوارەوە پەری خانم لولەی تفەنگەکەی خستە سەر سنگم و دوو خوشکەکەی تریشی لولەی تفەنگەکانیان خستە سەر پەراسوەکانم، هەرسێکیان بە یەکەوە گوتیان خۆتو گوتت ئەسپ سواری نازانم، ئێمەش باوەڕمانکرد، ئێستا پێمان بڵێ تۆ کێیت کە دوو ساڵە دەست لە ئێمە هەڵناگریت و هەموو هۆزەکەی ئێمەت تووشی دڵەڕاوکێ کردووە.

گوتم ئیتر تەواو تکایە هیچی تر ئەو یاریانەم لەگەڵدا مەکەن. پەری خانم میلی تفەنگەکەی ڕاکێشا و گوتی هەر لە ئێرە دەتکوژم، پێش ئەوەی بکوژرێیت باشتر وایە ڕاستییەکانمان پێبڵێیت، ئێمە دەزانین تۆ ساواکییەکی پیسیت و دوو ساڵە واز لە ئێمە ناهێنیت. خەریکبوو قسەیەک بکەم گوڵخەندان بە هەموو هێزی خۆی قۆناغە تفەنگێکی لە سکم سرەواند، ئازارێکی زۆرم پێگەیشت. ئەگەر زستان نەبووایە و ئەو هەموو جلوبەرگەم لەبەردا نەبووایە سکی دەدڕیم. پەری خانم گوتی بە زوویی خۆی و کۆڵەپشتەکەی بگەڕێن ودەمانچەکەی بدۆزنەوە، هەموو جێگایەک گەڕان، بەڵام هیچیان نەدۆزییەوە، کاتێک فەریبا خەریکی پشکنینی جلوبەرگەکانم بوو هەڵمی دەم و لووتی بە سەر دەموچاومدا بڵاو دەبووەوە. فەریبا زۆر تورە بوو، لوولەی تفەنگەکەی خستە سەر ڕوومەتم و گوتی کوا ناسنامەی ساواکیت لەکوێ داناوە؟ گوڵخەندان گوتی بۆچی مەگەر ساواکییەکان ناسنامە لەگەڵ خۆیاندا هەڵدەگرن؟ گوتم بە خودای گەورە من ساواکی نیم، ئەمجارەیان پەری خانم زللەیەکی لە بناگوێم دا، واهەستدەکەم هیچ پیاوێکی وەرزشکار ئەوەندە بەهێز زللە ناوەشێنێت. پەری خانم گوتی تۆ دەتگوت من

ئەسپسواری نازانم. فەریبا گوتی هەرچیم کرد، نەمتوانی لە ئەسپەکە بتخەمە خوارەوە.
پەری خانم گوتی وا باشتربوو تۆ لە ئەسپەکە بکەوتیتایە خوارەوە و شوێنێکت بشکایە یا بمردیتایە، بەڵام ئێستا کە خۆت نەمردوویت خۆم لێرە دەتکوژم، تەنها پێمان بڵی ئەو ڕاپۆرتانەی لەسەر ئێمە کۆتکردۆتەوە بۆ کوێی دەنێریت و دەیدەیت بە کێ؟.
گوڵخەندان لە هەر دوو خوشکەکانی بچووکتربوو. تەمەنی (١٦-١٧) ساڵ دەبوو، بەڵام لە هەردوکیان ناشرینتر بوو. گوتی با بیبەینە سەر ئەو بەرزاییە و لەوێوە فرێی بدەینە خوارەوە. فەریبا گوتی پێویست ناکات بە یەک فیشەک لەناوی دەبەین. پەری خانم گوتی قسەی گوڵخەندان تەواوە، ئەگەر فیشەکی پێوەبنێین دەزانن کە ئێمە کوشتوومانە، بەڵام ئەگەر لە شوێنێکی بەرزەوە فرێی بدەینە خوارەوە دەڵێن خۆی کەوتۆتە خوارەوە. گوڵخەندان ئەوەندە قۆناغە تفەنگی لەپشتمدابوو هەتا دوومانگ پشتم شین و مۆر ببووەوە. گوتیان هەڵسە و بکەوەڕێ. سکم و پشتم ئازارێکی زۆریان هەبوو، گوێشم بەهۆی زللەکەوە ئازارێکی زۆری هەبوو. هەرسێکیان لولەی تفەنگەکانیان ڕوو تێکردم و ئەملاولایان لێگرتبووم. ئەی خودایە ئەمە چ بەڵایەکە تووشی بووم؟. لەسەر ئەو بارە ناهەموارەشەوە بیرم لەوە دەکردەوەو دەمگوت خۆزگە پەری خانم هی من بووایە. گەنجێتی داستانێکی سەیرە، کچێک دەڵێت بە یەک فیشەک دەتکوژم، بەڵام تۆ لە بیر و خەیاڵێکی تردایت و ئاواتی بۆ بخوازیت. لە یەک کاتدا ئەو هەڕەشەی مردنت لێدەکات، بەڵام تۆ بیر لەشتێکی تر دەکەیتەوە. تەنها پێویستە لە تەمەنی بیست ساڵیدا بیت تاکو لەو بیر و خەیاڵانەدا بژیت. لەو چۆڵەوانیەدا هیچ کەسێک دیارنەبوو، هیچ گیانەوەرێکیش لەو ناوە نەبوو. گوتم ئێوە دەتانەوێت... هێشتا قسەکەم تەواو نەکرد بوو کە گوڵخەندان بە هەموو هێزیەوە لولەی تفەنگەکەی لەنێو چاوانمدا، لە تاو ئازار کەوتمە سەرزەوی و سەرم گێژبوو، خوێن بە هەموو دەموچاومدا هاتەخوارەوە، ناوچاوانم شکا. بە جۆرێک شکا کە ئێستاش پاش چلوسێ ساڵ شوێنەکەی بە ئاشکرا دیارە. لەسەر زەوییەکە کەوتبووم، دیسانەوە گوڵخەندان کەوتە شەق تێهەڵدانم، جوتێک پۆتینی قایمی لەپێدا بوو، شەقەکانیان ئازاریان زۆر بوو، هەردو لای کەلەکەم ئازاریان زۆر بوو، قۆناغە تفەنگێکی کێشا بە ئەژنۆی ڕاستمدا، وا هەستم کرد قاچم شکابێت، بە ئازارەوە و بە توڕەییەوە، هاوارمکرد بۆ وام لێدەکەن، من چیم کردووە؟ ئێوە خۆتان ساواکین کە منتان هێناوە بۆئەم چۆڵەوانیە و لێرە لێم دەدەن. هەر سێ خوشکەکە بە قۆناغە تفەنگ و شەق کەوتنە لێدانم، لە سەرزەوی کەوتبووم، سەر و دەموچاوم هەموو خوێن بوو. هەر بەو شێوەیەی لە سەر زەوی کەوتبووم سەیرێکی دەموچاوی پەری خانم کرد، لە

دڵی خۆمدا گوتم ئەگەر بە زیندویی مامەوە دەبم بە خاوەنی تۆ.

لەو کاتەدا سەیرم کرد وا ئەسپ سوارێک لە دوورەوە بەرەو لای ئێمە دێت، هاوارمکرد فریامکەون کوشتیانم. ئەوانیش ئەسپ سوارەکەیان بینی، پەری خانم گوتی ئەوە باوکمە وا بەرەو ئێرە دێت، هێندەی پێنەچوو عەلی خان گەیشتە لامان، هێشتا لە ئەسپەکەی دانەبەزی بوو دەستیکرد بە جوێندانی کچەکانی و گوتی ئێوە هەڵەیەکی گەورەتان کردووە، بۆچی واتان لەم کورە داماوە کردووە؟ فەریبا گوتی دەمانەوێت ئەم ساواکییە نا پیاوە بکوژین. عەلی خان گوتی ناماقوڵیتان کردووە، سەگبابینە بە مۆڵەتی کێ ئەم بەندەی خودایەتان هێناوە بۆ ئەم چۆڵەوانیە و لێرە لێیدەدەن؟ گوڵخەندان گوتی ئەم سەگبابە ساواکییە دەیەوێت دووبارە پەری خانم بەگرتن بدات و بینێرێتەوە بۆ زیندان. عەلی خان لە ئەسپەکەی دابەزی و منی بڵند کرد و گوتی ئەگەر ساواکی بێت و ئێوە ئەوتان بکوشتایە، لە سەر ئەو هەموو تایەفەکەمانیان دەکوشت، گەورە و بچووکیان لەناو دەبرین، ئەگەر ساواکیش نەبێت ئێوە گەنجێکی بێتاوانتان دەکوشت، بۆیە ئەم هەڵەیەی کردوتانە، بەسەرتانەوە ناچێت، ڕووی کردە پەری خانم و بە کوردی چەند قسەیەکی پێگوت؟ تێگەیشتم کە دەڵێت بەو کتێبانەی کە دەیانخوێنیتەوە ڕابردوویەکی خراپت بۆ خۆت تۆمارکردووە و ئێستاش دەتەوێت ببیت بە پیاوکوژ.

گوڵخەندان گوتی باوکە ئەم ساواکییە نەعلەتییە دەیگوت شارەزای ئەسپسواری نیم. کەچی بە جۆرێک سواربووە کە تۆش ناتوانیت ئەوها سواری ئەسپ ببیت. عەلی خان گوتی ئەسپسواری نابێتە هۆی ئەوەی کە کەسێک ساواکی بێت، خۆ ئەگەر ساواکیش بێت تۆ بۆت نییە ئازاری بدەیت، بەڵام تۆ دەتەوێت ببیت بە پیاوکوژ. ئەو سەردەمە بەسەرچوو، سەردەمی خانیش بەسەرچووە. عەلی خان دەیویست دڵنەوایی من بکات لە خۆرجێنی ئەسپەکەیدا مەتارە ئاوێکی دەرهێنا و دەموچاوی بۆ شۆردم، بەڵام خوێنەکە نەدەوەستا و بەردەوام خوێن دەهاتە خوارەوە. عەلی خان منی سواری ئەسپێک کرد و بە تووڕەییەوە بە کچەکانی گوت یاڵڵا برۆن، دووربکەونەوە، دوایی حسابی خۆمتان لەگەڵدا دەکەم. خان بە فارسی قسەی دەکرد، دیار بوو بۆ ئەوە بە فارسی قسەی لەگەڵ کچەکانیدا دەکرد تا من تێبگەم. کچەکان سواری ئەسپەکانیان بوونەوە و لە ئێمە دوورکەوتنەوە.

عەلی خان نەیدەتوانی خوێنی نێو چاوانم بووەستێنێت. پشتم، سکم، ئەژنۆم، هەردوو لای کەلەکەم، سەرم، هەموو گیانم ئازاری هەبوو. هەر ئەوەندە مابوو کە خانی بێچارە دەست و قاچم ماچ بکات. بە حاجی عەلی خانم گوت با چەند خولەکێک لێرە

سەبر بکەین بەڵکو کەمێک حاڵم باشتربێت پاشان بڕۆین. دووبارە هاوکاریکردم و لە ئەسپەکە دابەزیمەوە. زۆریشم سەرمابوو، لەژێر درەختێکی ئەرس دانیشتم. عەلی خان کەمێک ئاوی بەدەمەوە کردم، بەڵام هیچ شتێک نەبوو تا خوێنی نێو چاوانم بووەستێنێت، چونکە پارچە گۆشتێکی لێببووەوە. عەلی خان دەستیکرد هەڵڕشتنی دەردەدڵی خۆی و گوتی ئەم پەرییە خوێندکاری کۆلێژی ئەندازیاری کارەبا بوو لە زانکۆی تاران، تێکەڵاوی ڕێکخراوێکی چەپ ببوو، پاشان لەلایەن ساواکەوە دەستگیرکراو حوکمی دە ساڵ زیندانی بەسەردا درا. بە هەزار بەدبەختی و بەرتیلدان و سەردانیکردنی ئەم و ئەو و پڕکردنەوەی بەڵێنامە. پاش دوو ساڵ و نیو لەزیندان ئازادکرا، ئیتر لە زانکۆش دەریانکرد، لە شاری تاران خانوویەکمان هەبوو پەری لەو خانووەدا بوو، هەستمکرد لەوێش دووبارە پەیوەندیکردۆتەوە بە ڕێکخراوە چەپەکانەوە، بۆیە چووم بە شوێنیدا و هێنام بۆ بۆجنوورد، لەوێش وازی نەهێنا و خەریکی کاری سیاسی بوو. دووبارە دەستگیر کرایەوە و ئەمجارەیان سێ مانگ زیندانی کرا، دواتر بڕیاری دوورخستنەوەی درا بۆ جەزیرەی هورمز بۆماوەی دە ساڵ، ئەمجارەشیان زۆرم هەوڵ دا تا ئازاد کرا، بەڵیننامەم دا و موڵکێکی زۆرم بۆ خەواند بەو مەرجەی هەرگیز ڕوونەکاتەوە شار و دەبێت هەمیشە لەگەڵ هۆزەکەماندا بێت، بۆیە هێناومەتەوە لای خۆم، ئێستاش دەبێت بە بەردەوامی سەردانی بنکەکانی ساواکی بکات و خۆی بناسێنێت، ئەم کچەم زۆر تووڕە و توندە، کاتێک یەکەمجار تۆ هاتیت بۆهەوارەکەمان زۆری پێخۆشبوو کە خوێندکارێکی زانکۆ هاتووە، بەڵام دەترسا لەگەڵ تۆدا پەیوەندی بگرێت، چونکە بە گومان بوو لێت و بە پیاوی دەوڵەتی دەزانیت، ئەو کاتەش کە پۆلیسەکان هاتبوون بۆ هەوارەکەمان و ڕێزێکی زۆریان لە تۆ گرتبوو، ئیتر ئەو لەو کاتەوە ترسی زۆری لە تۆیە، دەیگوت ئەم موهەندیسە ساواکییە. لێتناشارمەوە منیش هەر لێت دەترسام و نیگەران بووم، گوتم ڕەنگە تۆ بۆیە هاتبیت تاکو ڕاپۆرت لەسەر ئێمە بنووسیت، ئێمەش خۆمان لەتۆ دەپاراست و نەشماندەویست تۆ نارەحەتبکەین و نەشماندەویست لێت نزیک ببینەوە، دووبارە هاوینی پار هاتیتەوە و باسی ساواکی بوونی تۆ لێرە بڵاوبووەوە. کاتێکیش بۆ زەماوەندی بێژەن و گڵپۆ هاتیت هەمان هەواڵی ساواکی بوونت بڵاو بووەوە، ئێستاش کە تۆ بەم سەرمای زستانە پەیدابوویتەوە هەموومان گومانمانکرد کە تۆ لەلایەن ساواکەوە نێردراویت، ئاخر چ کەسێک بەم سەرمای زستانە بۆ کۆچکردن ڕوودەکاتە ئەم چۆڵەوانییە؟ دوێنێ، هەر دوێنێ شەو کچەکان ویستبوویان لێتبدەن، جەوهەر خانم پێیزانی بوو، بەڵام بە ڕاست وەرینەگرتبوو. کاتێک بەیانی کچەکان تۆیان لەگەڵ خۆیاندا

برد بوو، من دەمویست برۆم بۆ هەواری حاجی محەمەدی سلێمانی، بەڵام جەوهەر خانم عەبدالی نارد بە شوێنمدا، گوتی کچەکان موهەندیسیان بەرەو چۆڵەوانییەکە بردووە، منیش بە غاردان هاتمەوە و گەیشتمە لاتان سوپاس بۆ خودا. عەلی خان گوتی بیکە بە خاتری ئەو کەسەی کە باوەڕت پێی هەیە ئێمە ببەخشە، هەر کارێک تۆ بڵێیت من ئەنجامی دەدەم، بەڵام تکا دەکەم، ئەم کچە شێتانەم ببەخشە. گوتم عەلی خانی بەڕێز سوێند دەخۆم بە خودای گەورە نە ساواکیم نە ئەفسەرم، ئەو نامەیەش کە پیشانی پۆلیسەکانم دابوو نوسرابوو لە مەشقی ئەفسەری بەخشراوە، گوتم ئەفسەرەکە خوێندەوارییەکەی باش نەبو، نەیتوانیبوو بە باشی نامەکە بخوێنێتەوە. تەنها وشەی ئەفسەری بینی بوو، ئیمزای سەرۆکی سوپای (دولوقاجاری) بینی بوو، لە ترساندا ڕێزی نواند.. بەهەرحاڵ، حاجی عەلی خان سواری ئەسپەکەی کردم و هێواش هێواش، بەرەو هەوارەکە هاتین. خان دەیویست هەر چۆنێک بێت وام لێبکات کە شکات نەکەم.

دوازدە کیلۆ مەتر لە شائابادوە دوور بووین، لە شائاباد بنکەیەکی گەورەی لێبوو، نازانم چۆنی بوو لە عەلی خانم پرسی لێرەوە تا کو شائاباد چەندە دوورە؟ بۆیە وایزانی بۆ شکاتکردن دەچم بۆ شائاباد. نزیکی ڕەشماڵەکان بووینەوە، هەستم بە ئازارێکی زۆر دەکرد سەرئێشەیەکی توند دایگرتبووم، خوێنی ناوچاوانیشم نە دەوەستا. چاوم لێبوو لە نزیکی ڕەشماڵەکەی حاجی عەلی خان ئاگرێکی گەورە کرابووەوە. کچەکانی عەلی خان لەدەوری ئاگرەکە بوون، کە نزیک بوومەوە سەیرم کرد پەری خانم، نیلۆفەر، گوڵخەندان، مەنو چەهر، خەریکی کتێب سووتاندنن. کتێبی نیوە سوتاووم لە ئاگرەکەدا دەبینی، کتێبێکی قەبارە گەورە لە ئاگرەکەدا بوو لە پشتەکەی نوسرابوو (کاپیتاڵ) من تا ئەو ڕۆژە کتێبی کاپیتاڵ، یا سەرمایەی مارکسم نەدیبوو، زانییم لەترسی من کتێبەکانیان دەسووتێنن. ڕوومکردە کچەکان و گوتم سوێند بە خودا، سوێند بە ئیمام حوسێن، سوێند بە ئیمام ڕەزا. من ساواکی نیم و فەرمانبەری هیچ دامودەزگایەکیش نیم، ئێوە بە نا هەق ئاواتان لەمن کرد و هەر لە خۆشتانەوە کتێبەکانتان دەسووتێنن.

حاجی عەلی هیچی نەگوت و منی بردە نێو ڕەشماڵەکەوە، بانگی جەوهەر خانمی کرد. جەوهەر خانمیش هات بۆلامان. عەلی خان گوتی موهەندیس لەسەر ئەسپ کەوتۆتە خوارەوە، وەرە سەیری برینەکانی بکە. بیبی ئاگادارکرایەوە، کوڕەکانیش زانیان کە من لە ئەسپ کەوتوومەتە خوارەوە ئەوانیش هاتن بۆ نێو ڕەشماڵەکەی خان. «بەلە»ش کاتێک خوێنی بینی بەدەم وچاومەوە دەستیکرد بە گریان، بیبی و جەوهەر خانم برینەکانیان بۆ بەستم. ئەژنۆم و بەلەکی قاچم تەواو برینداربوون، قاچم ئازارێکی

زۆری هەبوو، بەڵام نەمزانی کە بریندار بوون. پانتۆڵەکەم خوێناوی ببوو. لەناکاو پەری خانم هات لەلامەوە لەسەر دۆشەکەکە دانیشت. جەوهەر خانم خەریکبوو برینەکانی بۆ خاوێن دەکردمەوە. بیبی لەولاوە خەریکی دروستکردنی مەلهەم بوو، پەری قورئانێکی لەگەڵ خۆیدا هێنابوو. گوتی پاپۆلی باش گوێم بۆ بگرە، بەڵام قسەکانی بە جۆرێک دەکرد کە بیبی گوێی لێنەبێت، ئەوە یەکەمجار بوو کە بەناوی خۆمەوە بانگم بکەن. پەری گوتی من کۆمۆنیستم، هیچ باوەڕێکم بە بوونی خودا و بەپێغەمبەر نییە، نوێژیش ناکەم، ڕۆژووش ناگرم، بە هەموو ئەمانەوە تۆ دەست بخەرە سەر ئەم قورئانە و سوێند بخۆ، سوێند بخۆ کە فەرمانبەری ساواک و نێردراوی شوێنێکی تر نیت. دەستم خستە سەر قورئانەکە و سوێندم خوارد کە من لەلایەن هیچ شوێنێکەوە نەنێردراوم، هیچ کاریشم بەسەر بیروباوەڕی تووە نییە، هیچ کاریشم بەسەر کتێبەکانتەوە نییە. بە هیچ شێوەیەک ڕاپۆرتم لەسەر نەنووسیون و لەسەریشتان نانووسم، هەرگیز باسی ئەوەش ناکەم کە تۆ کتێبی کۆمۆنیستیت هەیە و شکاتیش ناکەم کە تۆ و خوشکەکانت ویستوتانە بمکوژن. گوتی خۆ سوێندت خوارد. گوتم ئەم قورئانە کەمەرم بشکێنێت ئەگەر بە درۆ سوێندی پێبخۆم. تۆش بەبێ هۆ لەمنت داو تووشی ئەم دەردەتکردم. جەوهەر خانم گوتی پەری خۆ باش گوێت لە قسەکانی بوو، من یەکەمجار گوتم ئەم پیاوە ساواکی نییە.

ژنەکەی تری خان هاتبووە ژوورەوە لەپشتی سەرمەوە وەستابوو، پەری خانم داوای لێبوردنی لێدەکردم، دیارە دەمزانی کە باوکی ناچاری کردووە بێت و داوای لێبووردنم لێبکات. لە ڕەشماڵەکە ڕۆیشتە دەرەوە. زانیم بۆیە دەڕوات تا ئاگرەکە بکوژێنێتەوە، پاش چەند خولەکێک عەلی خان لەگەڵ کچەکانی و مەنوچەهردا هاتنە نێو ڕەشماڵەکەوە. ژنەکەی تری خان هاتبوو. ئەو ژنە دایکی نیلۆفەر و گوڵخەندان بوو، دایکی پەری خانم ژنی یەکەمی خان بوو، ئەو لە بۆجنوورد دادەنیشێت. هەستم بە ئازار و «تا»یەکی زۆر کرد، ڕوومکردە بیبی و گوتم خەریکە تام لێدێت وپشتم ئازارێکی زۆری هەیە. بیبی گوتی جلەکانت دانێ با سەیرێکی پشتت بکەم.

هەستم دەکرد کە ئارەقەم کردبێتەوە، چاکەتەکەم دانا و سەیری پشتی کردم. بیبی گوتی پشتی موهەندیس هەموو خوێنی تێزاوە و شوێنی قوناغە تفەنگش بە باشی بەدیدەکرێت. بیبی تێگەیشتبوو ئەم برینانەی من پەیوەندی بە چییەوە هەیە؟ زانیبووی کە لە ئەسپ نەکەوتومەتە خوارەوە، بەڵکو لێیانداوم. لێی پرسیم چۆنچۆنی لە ئەسپەکە کەوتیتە خوارەوە؟ وەڵامم نەدایەوە. ڕۆیشتن لە ڕەشماڵەکەی خۆم و

کەلوپەلەکانیان بۆهێنام. جلوبەرگەکانم گۆڕی. بیبی و جەوهەر خانم مەلحەمیان لەپشتم داو نێوچاوانمیان بە پارچە قوماشێکی سپی بەست. دوو ڕۆژ لە ڕەشماڵەکەی عەلی خاندا کەوتم، هەموو خەڵکەکە ڕێزیان لێدەگرتم، کچەکانیش بە دەورمەوە بوون و لێم دوور نەدەکەوتنەوە، پەری خانم دەیویست دڵنیابێت کە شکاتیان لێناکەم. جەوهەر خانم دەیزانی لە ئەسپ نەکەوتوومەتە خوارەوە. پێی گوتم موهەندیس بەگەورەیی خۆت ئێمە ببەخشە، ئەم کچەمان ڕۆژێک دێت سەری هەموومان لە قوڕ دەنێت. گوێم لە دەنگە دەنگێک بوو لە دەرەوە، هەستمکرد وا ژنەکەی تری عەلی خان خەریکە لەسەر من لەگەڵ کچەکانیدا بەشەڕدێت.

«یەلە» زۆرترین کات لە لای من بوو، شەوانە دەچوو لە ڕەشماڵەکەی مندا دەنووست. ڕۆژی سێیەم هەستمکرد کەمێک باشتر بووم، ڕۆیشتم بۆ ڕەشماڵەکەی خۆم. هەوا زۆر ساردبوو، هەورێکی ڕەش ئاسمانی داپۆشی بوو، سات لەدوای سات سەرماکە توندتر دەبوو. عەلی خان هات بۆ ڕەشماڵەکەی من و گوتی کاتی کۆچکردنی ئێمە سێ ڕۆژی ترە، بەڵام بەم سەرمایە ناتوانین چیتر بووەستین، کاتیش درەنگ بووە، بۆیە پێویستە هەرچی زووترە لەگەردەنەی شەلەمی ئاودیو ببین. ئەو ڕۆژە ڕۆژی کۆچکردنی حاجی محەمەد سلێمانی بوو. مێگەل و ماڵەکانی حاجی محەمەد سلێمانی، لە تەنیشت هەوارەکەی حاجی عەلی خانەوە تێدەپەڕین. کەم کەم بەفر دایکرد و پاشان بەفربارینەکە زیادی کرد. حاجی عەلی خان بەو هەموو ئەزموونەوە کە هەیبوو، دەستەوەستان ببوو. گوتی ئەگەر تەنها سێ کاتژمێری تر بە بەردەوامی بەفر ببارێت گەردەنەی شەلەمی دەگیرێت و بێچارە و ماڵوێران دەبین. منیش لە دڵی خۆمدا گوتم دەگەڕێمەوە بۆ مەشهەد، بەڵام هیچ شتێک نەبوو پێی بڕۆم، دەبوو بەسواری حوشتر نزیکەی پەنجا کیلۆ مەتر ڕێگا ببڕم.

عەلی خان بڕیاریدا سبەی بەیانی زوو، واتە دوو ڕۆژ پێش ئەو کاتەی کە لەگەڵ خانەکانی تردا دیاریان کردبوو کۆچ بکەن، دیارە ئەوانی لەو بڕیارەی خۆی ئاگادارکردبووەوە. جۆرێک هاوئاهەنگی هەبوو لەنێوان کۆچەرییەکاندا. عەبدولعەلی بڵند، دڵنیا بوو بەو هەموو ئاژەڵە زۆرەوە کە هەیەتی دەبێت ئارامبگرێت تاکو کەشوهەوا لەبار دەبێت. عەلی خان دەیگوت بەفر زۆر کەوتووە نزیکەی سی سانتیمەرە، مەڕەکان ناتوانن خواردنی خۆیان لەژێر بەفرەوە پەیدا بکەن و هیچ ئالفێکمان نییە بیدەین بەمەڕەکان،، گەڕانەوەش بەرەو لای ئاشخانە ئەوە هەر نابێت، تەنها ڕێگامان ئەوەیە بەرەوپێش بڕۆین.

منیش ئەرکێک بووم بە سەریانەوە. نەخۆشبووم و باربووم بەسەریانەوە. لەوەش دەترسان ئەگەر بگەڕێمەوە شکاتیان لێبکەم، هیچ شتێک نەبوو پێی بگەڕێمەوە، خۆ ئەگەر لە جادەوە نزیک بووینایە ڕەنگە ئۆتۆمبێل هەبووایە پێیبگەڕامایەتەوە. خۆم بە خودا سپارد و لێرە ئەقڵ هیچ دەورێکی نەبوو. بیرمکردەوە هەرچۆنێک بێت خۆم بگەیەنمە ئینجەی خواروو، تا ئەوێش دوو فەرسەخ و نیو ڕێگابوو. نزیکترین ئاوایی لێمانەوە شائاباد بوو، ئەویش لەسەر ڕێگای کۆچکردنەکە بوو، واتە لەکاتی ڕۆیشتندا بەرەو مراوتەپە لە سێ کیلۆمەتری شائابادەوە تێدەپەڕین. نزیکی نیوەڕۆ بوو، هەمووان خەریکی خۆئامادەکردن بوون بۆ کۆچکردن، عەبدال و غەفار و فەریبورز هاتن بۆ دیدەنیم. عەبدال گوتی موهەندیس هەڵسە با شەرە بەفر بکەین و کەمێک بجوڵێیت گیانت باشتر دەبێت. گوڵخەندانیش کە لەگەڵیاندا بوو، بە شەرمەوە گوتی هەموو تاوانی من بوو کە موهەندیس لە ئەسپەکەی کەوتە خوارەوە. لە ڕەشماڵەکەی خان هاتمە دەرەوە و چووم بۆلای ڕەشماڵەکەی خۆم، هەوا زۆر سارد بوو، گەرمیپێوەکەم دەرهێنا و لە دەفتەرەکەمدا نووسیم، کاتژمێر (١١:٢٠) ی ڕۆژی (٣دەی ١٣٤٨-٢٤-١٢-١٩٦٩) لە قوڕەمەیدان، لە بەرزی (٦٤٠) مەتر لە ئاستی ڕووی دەریاوە پلەی گەرمی پێنج پلەی ژێر سفرە. ئاسمان نیوە هەور بوو، نزیکی نیوەڕۆ حاجی وەلی خانی قارەمانلو بە سواری ئەسپێکەوە گەیشت، چووە نێو ڕەشماڵەکەی حاجی عەلی خان و هەردوو خان پێکەوە کەوتنە وتووێژ لەبارەی کۆچکردنیانەوە، پاشان گەیشتنە ئەو ئەنجامەی کە هیچ چارەیەکیان نییە، جگە لەوەی هەرچی زووترە کۆچ بکەن، چونکە بەهۆی بەفربارین و بێ ئالفیەوە مەڕەکانیان لەبرساندا دەمرن و نەدەکرا بەرەو دواوەش بگەڕێینەوە، هیچ هۆکارێکی گواستنەوەش نەبوو تاکو ئالفی پێبهێنن. هەردوو خان گوتیان ئەگەر ساڵێکی تر بمانەوێت تاکو ئەم کاتە لە قوڕەمەیدان بمێنینەوە دەبێت ئۆتۆمبێل بکڕین، بەبێ ئۆتۆمبێل تووشی ئەم بارە ناهەموارە دەبین کە ئێستا تێیکەوتووین. وەلی خان گوتی ئەمڕۆ حاجی محەمەد سلێمانی بە خۆیان و ئاژەڵەکانیانەوە بەڕێکەوتوون، ئێستاش کە بەفرباریوە و لەوەڕەکەی داپۆشیوە هیچ جیاوازییەک نییە مەڕەکان لەڕێگادا برسی ببن یان لە قوڕەمەیدان، بەڵام ئومێدێک هەیە کاتێک گەیشتینە دامێنی چیا کە هێشتا پووش ژێر بەفر نەکەوتبێت.

هەردوو خان بڕیاریان دا چوار کەس لە پێشەوە بنێرن بۆ ناو تورکمانەکان بۆ کڕینی ئالف. ئەگەر توانیان هەندێک ئالفیش ببەنە لای گەردەنەی شەلەمی، بەو شێوەیە لە ڕێگادا مەڕەکان دەتوانن خواردن بخۆن. پەری خانم گوتی پێیان بڵێن هەندێک نەوت

بکرن و بیھێنن. عەلی خان بانگی حاجی ڕەزای کرد و پێی گوت بە خێرایی چەند کەسێک لەگەڵ خۆت بەرەو برۆ بەرەو مەراوەتەپە، حاجی وەلی خانیش پێی گوت لەناو تورکمانەکاندا ھەرچی ئازوخەیەکت دەستکەوت بیکرە و بۆمانی بنێرەوە، ھەرچەند کیلۆ مەترێک و ھەندێک کا و جۆ لە لێواری جادەکە دابنێن، ئێمە مێگەلە مەڕ و ئاژەڵەکان بە سەر جادەکەدا لێدەخوڕین. حاجی وەلی خان بانگی لێکرد و گوتی بیرت نەچێت نەوتیش بکرن. ھەر لە نێوان دوو فەرسەخ ڕێگادا ھەندێک نەوتیش دانێن. عەلی خان گوتی بە سواری ئەسپ برۆ، بەڵام دوو حوشتریش لەگەڵ خۆتدا ببە نەوەکو ئەسپەکان لەگەردەنەی شەلەمی لەنێو بەفردا کێشەتان بۆ دروستبکەن. حاجی وەلی خان گوتی لە ھەوارەکەی ئێمەش حوشترێک لەگەڵ خۆتاندا ببەن. جلوبەرگی گەرمیان لەبەرکرد و ھەر یەکە و فەرەنجییەکی لەبەرکرد و پاش نیو کاتژمێر حاجی رەمەزان و دوو کەسی تر لە ھەوارەکە بەڕێکەوتن. ئەوان نزیکەی سێ مانگ دەبوو لە قوڕەمەیدان بوون، بەڵام ئێستا ھەر کەسە و دەیویست بەزوویی بارگەوبنەی خۆی کۆ بکاتەوە، بۆئەوەی بەیانی زوو پێش ھەتاوکەوتن باربکەن و بکەونەڕێ..

بەفر زۆر بەخێرایی دەباری، نزیکی نیوەڕۆ بەرزی بەفرەکە گەیشت بووە چلوپێنج سانتیمەتر، بەڵام دوای نیوەڕۆ بەفرەکە کەمێک ھێواشی کردەوە. ھەورەکان کەمێک ڕەوینەوە، دیسانەوە لەکاتی عەسردا ھەورەکان پەیدا بوونەوە. ھەوڵمدا لە ڕەشماڵەکەم نەیەمە دەرەوە نەوەک سەرمام ببێت، چونکە تەواوی ئێسقانەکانم بەتایبەت پشتم و ئەژنۆکانم ئازارێکی زۆریان ھەبوو. «یەلە» بە بەردەوامی داری دەھێنا و دەیخستە سەر ئاگرەکە، نەمدەزانی ئەو ھەموو دارە لەکوێوە دەھێنێت. جەوھەر خانم بارانگیرێکی درێژی تورکمانی بۆ ھێنام، لەو بارانگیرانە بوو کە لە خوریی دروستکرابوو، زۆریش گەورە بوو، ئەوەندەی لێفەیەک دەبوو. گوتی موھەندیس ئەمە لە سەر جلەکانتەوە لەبەربکە. بارانگیرەکە زۆر قورس بوو، بەڵام بەڕاستی گەرم بوو، فەریباش کڵاوێکی لە خوریی چندراوی بۆ ھێنام، گوتم سوپاست دەکەم کڵاوم ھەیە و نامەوێت. گوتی ئەم کڵاوە شتێکی ترە دەبێ بتەوێت. کڵاوەکەم لێوەرگرت، بەڵام بەڕاستی کڵاوێکی گەرم و باش بوو. ھەموو سەر و گوێمی دادەپۆشی. ژنەکەی بێژەنیش جوتێک دەستکێش و جوتێک گۆرەوی و جوتێک پووزەوانە و ملپێچێکی پێدابووم، ئیتر منیش ھەندێک کەلوپەلی باشم کۆکردبووەوە..

کوڕان و کچان لە نێو بەفرەکەدا یارییان دەکرد. دەنگە دەنگ و پێکەنینیان دەھات. دوای نیوەڕۆ نیوەی ڕەشماڵەکانی خان کۆکرابوونەوە. «یەلە»ش بە جۆرێک ئاگرەکەی

خۆشکردبوو خەریک بوو ڕەشماڵەکە بسووتێت، لە ڕەشماڵەکە هاتمە دەرەوە چەند هەنگاوێک نەڕۆیشتمە پێشەوە تۆپەڵە بەفرێکی گەورە بەر لاملم کەوت. ئاوڕمدایەوە سەیرم کرد گوڵخەندانە تۆپەڵە بەفرەکەی تێگرتووم. بە زۆرزانی خۆیەوە ڕووی وەرگێڕا و تۆپەڵە بەفری دووەمی کێشا بە دەموچاومدا، گەڕامەوە بەرەو ڕەشماڵەکە، تۆپەڵە بەفری سێهەم بەر پشتم کەوت. خوشکەکانیشی سەیریان دەکرد. غەفار و فەریبورزیش تۆپەڵە بەفریان بەرەو گوڵخەندان دەهاویشت، وابزانم ئەوە یەکەم جار بوو کە منداڵان بتوانن تۆپەڵە بەفر بەرەو کچەکانی خان بهاوێژن. هەستمکرد ئەو شەڕە بەفرەیان بۆ ڕەوینەوەی ڕق و تووڕەیی من ئەنجامدا بوو. هەر بەڕاستی من زۆر تووڕەبووم، چونکە ئەوان بەنیازی کوشتن ئەو هەموەیان لە من دا. بە ڕاستی دەیانویست من بکوژن، خۆ ئەگەر باوکیان لەوکاتدا نەگەیشتبایە منیان کوشتبوو. شتێک کە منی زۆر نارەحەت دەکرد ئەوەبوو کە گومانم لە حاجی عەلی خان هەبوو، هەستم دەکرد کچەکان لەسەر پرسوڕای باوکیان ئەوکارەیان ئەنجام داوە، هەر بە بڕیاری ئەویش لەمنیان داوە، واتە ئەوان لەسەر بڕیاری باوکیان منیان سواری ئەسپکردووە و ئەسپەکەیان ڕاودەنا و لێیاندەدا تاکو من بکەومە خوارەوە و بەرزەوی بکەوم و بمرم، یا شوێنێکم بشکێت. کاتێک عەلی خان بینی بووی من لەئەسپەکە نەکەوتوومەتە خوارەوە، ڕەنگە کچەکان بە جۆرێک منیان بکوشتایە کە هەستی پێبکرێت بەدەستی ئەنقەست کوژراوم. هەربۆیەش بە زوویی خۆی گەیاندۆتە لامان و تاکو من ڕزگار بکات.

ئەوان دەیانگوت جەوهەر خانم عەبدالی ناردووە بە شوێن خاندا تاکو خان بەشوێن ئێمەدا بێت، لەمەدا کەمێک ساختەیی بەدیدەکرا. من هەموو شوێنەکانی ئەو ناوچەیەم لە سەر نەخشە دیاری کردبوو، شوێنی درەختە ئەرسەکان، شوێنێک کە کچەکان لەمنیاندا، دووریەکە بە جۆرێک بووکە ئەگەر عەلی خان بۆ ئەو شوێنەی کە باسیاندەکرد ڕۆیشتبێت، دەبوو لانیکەم نیو کاتژمێر درەنگتر بگەیشتایەتە لای من، هەر بۆیەش ڕووداوەکە گوماناوی بوو. وا هەستم دەکرد کچەکان لەسەر بڕیاری باوکیان ئەم کارەیان کردبێت، دیارە بڕیارەکەیان وا نەبووە بە تفەنگ لێمبدەن یا بە تفەنگ بمکوژن، یا لە شوێنێکەوە فڕێمدەنە خوارەوە، بڕیارەکەیان وابووە کە من سواری ئەسپ بکەن و ئەسپەکە تەنگەتاو بکەن تاکو من لە سەر ئەسپەکەوە بکەومە خوارەوە، دوور نییە عەلی خان لە دووریی یەک کیلۆ مەتر لە پشتی ئێمەوە بووبێت. کاتێک بینیوێتی من لە ئەسپەکە نەکەوتوومەتە خوارەوە و خەریکن لێمدەدەن خۆی گەیاندبووە ئێمە. شتێکی تر کە منی خستبووە گومانەوە. دووربینەکەی بوو کە لە ملی دابوو. هەمیشە عەلی خان

کاتێک دەچوو بۆ ڕاو دووربینی لەگەڵ خۆیدا دەبرد. ئەو ڕۆژە عەلی خان نەڕۆیشتبوو بۆ ڕاوکردن، بەڵام ڕەنگە چوو بێت بۆ ڕاوی من. بڕیارمدا ئەگەر دڵنیابووم لەوەی ئەم کارە دەستی عەلی خانی تێدایە خۆم بگەیەنمە نزیکترین بنکەی پۆلیس و شکات بکەم، بەڵام من کەسێکی سەیرم ئەگەر ببینم کەسێک مافی خەڵکانی تری خواردووە زۆر تورە دەبم، بەڵام لەسەر گەورەترین تاوان کە بەرامبەر بەخۆم کرابێت تاوانبارەکان دەبەخشم، هیچ کاتێک ناتوانم کینەی کەسێک لە دڵبگرم بەتایبەت کینەی ئەوانەی کە داوای لێبوردن دەکەن، دیارە ئەگەر کەسێک هەموو شتێک بخاتە ژێر پێیەوە ناتوانم چاوپۆشی لێبکەم و بیبەخشم...

کاتێک سەرۆکی زانکۆ بە غیابی مامۆستایەک دادگایی دەکات ناتوانم لێیخۆش ببم، نا شکرێت لێی خۆش ببم، ئەو کە بەندەکانی مافی مرۆڤ دەخاتە ژێر پێیەوە چۆن دەبێت لێی خۆش ببیت؟ کاتێک وەزیرێکی وەکو مستەفا موعین پشگیری لەم جۆرە کارانە دەکات، ئەویش شایانی ئەوە نییە لێی خۆش ببیت.

پەری خانم خوێندکاری قۆناغی چوارەمی کۆلێژی ئەندازیاری کارەبای زانکۆی تاران بوو، ئەو ساڵێک پێش چوونە زانکۆ لە تاران نیشتەجێ بووە، واتە لانیکەم پێنج ساڵ لە تاران ژیاوە و تێکەڵاوی سیاسەت بووە و چووەتە بەشی چەکداری ڕێکخراوێکی سیاسیەوە، بە دڵنیاییەوە ئەو وا بیری کردۆتەوە کە دەبێت ڕژێمی شا بڕوخێت، بۆیە پاشان گرتوویانە و زیندانیان کردووە و لە زانکۆش دەریانکردووە. باوکیشی لە تارانەوە هێناویەتیەوە بۆ بۆجنوورد، لە بۆجنووردیشەوە دووبارە دەسگیرکراوەتەوە، پاشان باوکی هێناویەتییەوە بۆ نێو هۆزەکەی خۆیان، کە بە ڕاستی باوکی ئەوی دوورخستبووەوە. لەو لاشەوە کوڕێکی گەنج دێت و پرسیار لە هەموو شتێک دەکات لە ژمارەی مەڕ و حوشتر و سەرجەم ئاژەڵەکان بەپێی ویستی خان هەڵسوکەوت ناکات و بە بێ پرسی خان مەڕاسیم بۆ ئیمام عەباس ڕێکدەخات.

لە دڵی خۆمدا گوتم بە ڕاستی منیش بم لەبری ئەوان گوماندەکەم، منیش ئەگەر وەک ئەم کچە ئاواتەکانم بە با بڕوات و زیندانی بکرێم و لێدان بخۆم و ئەشکەنجە بدرێم، کارێکی ئاوا بەسەر ئەم خوێندکارەدا دەهێنم. چەند جارێک ویستم بە ناوی ئاشتییەوە تۆپەڵە بەفرێک بگرمە کچەکانی خان، لە دڵی خۆمدا گوتم با خۆم سووک نەکەم لە لایان. کەلوپەلەکانم لە نێو ڕەشماڵەکەدا کۆکرنەوە، نێو کاتژمێر دانیشتم و یادەوەرییەکانم نووسینەوە.

جەوهەر خانم هەواڵی نارد عەلی خان گەڕاوەتەوە. دووبارە ڕۆیشتمەوە بۆ

ڕەشماڵەکەی عەلی خان. پێش ئەوەی کە کچەکان لێمبدەن وا بیرم دەکردەوە لە ماوەی چلوپێنج ڕۆژ ئامادەبوونم لە نێو هۆزەکاندا فێری هەموو ژیانی نێو هۆزەکان دەبم. تازە دەمویست فێرببم، لەکاتێکدا پێشتر دوو هەفتە لە کاتی بەهار و چوار هەفتە لە کاتی هاوین و هەفتەیەک لە سەرەتای پاییزدا لە نێو ئەواندا بووم. ئەو خەڵکە هەموویان لەژێر چاودێری کەسێکدا بوون، کە ئەویش عەلی خان بوو. هیچ کەسێک بیری لە گرفتارییەکانی پەری خانم نەکردبووەوە، بەڵام هەموویان بەدەستییەوە گرفتار ببوون، دیارە کاتێک کە چوو بوو بۆ زانکۆ هەموویان وایانزانی بوو کچی خان دەبێت بە ئەندازیاری کارەبایی. ئەو خەڵکە لە خۆیان نەپرسیبوو، بۆچی پەری خانم چەند ساڵێک لە تاران بووە و کەچی ئێستا گەڕاوەتەوە بۆ نێو هۆزەکەی؟ لەو ماوەیەدا کە من هاتوچۆی ئەو هۆزەم کردووە هیچ کەسێک لەبارەی پەری خانمەوە قسەیەکی لەگەڵدا نەکردووم، تەنانەت هیچ کەسێک پێینەگوتوم کە پەری خانم ئەندازیارە. یا پێم بڵێن پەری خانم خوێندەوارە، دیارە کەسێک پێی گوتم پەری خانم کتێبی هەیە، بەڵام هیچ کەس نەیگوت پەری خانم لە تاران بووە.

بێژەن پێی گوتم عەلی خان هیچ باوەڕێکی بە من نییە و گومانم لێدەکات و گوتی ئەگەر باوەڕی عەلی خان بەدەستبێنیت زۆر شت تێدەگەیت. گوتم وا باشە دەربارەی پەری خانم هەندێک پرسیار لە عەبدال بکەم، پاشان گوتم با وانەکەم و دووبارە دەردەسەری بۆ خۆم دروست نەکەم، لەوە دەترسام کە عەبدال بڕوات و قسەکانی من بۆ ئەوان بگێڕێتەوە، جا ئەوکات ئەوان گومانم لێ پەیدا دەکەنەوە، ئەوسا دیار نییە چیم بەسەردێت، یا دەبێت بڕۆم لە بنکەیەک شکات بکەم یا ئەو بابەتە لە بیری خۆم بەرمەوە.

وا بیرم کردەوە ئەگەر بمەوێت لێکۆڵینەوە بکەم لەبارەی هۆزە کوردە کۆچەرییەکانی خۆراسانەوە، دەبێت ئەو بابەتە بەتەواوی لە بیری خۆم ببەمەوە، چونکە ئەگەر ئەو بابەتە لە بیری خۆم ببەمەوە، ئەوسا عەلی خان و کوڕەکانی و تێکڕای خەڵکەکەش باشتر هاوکاری من دەکەن و پەیوەندیم لەگەڵ هەموو خەڵکی ناوچەکە باشتر دەبێت، لەوەش گرنگتر هەستی لاوێتیم بوو کە هێشتا پەری خانمم خۆشدەویست، بەم هەموو ڕق و کینەیەوە حەزم لێی بوو.

ئازارێکی زۆرم هەبوو، هەوا زۆر سارد بوو، چرکە بە چرکە ساردتر دەبوو. ئەو هەموو جلوبەرگەی لەبەرم کردبوون زۆر قورس بوون، بەڵام هیچ چارەیەکم نەبوو بەم سەرما و بەفرە نەمدەتوانی بۆ هیچ شوێنێک بڕۆم. عەلی خان دەستوری دابوو هەر ئەو ڕۆژە مێگەلەکان بەرەو گەردەنەی شەلەمی بەڕێبکەون. حەیدەر و ئەسەد و کەراڕ لێپرسراوی ڕێکخستنی مێگەلەکان بوون. ئەسەد و حەیدەر خاوەنی هەواری سەربەخۆی

خۆیان بوون. ئەمان دەبوو کارێک بکەن لە ڕێگادا هیچ مەڕێک جێ نەمێنێت. حاجی ڕۆستەم گوتی مەڕەکان باش قەڵەو بوون ئەگەر تاکو چلوهەشت کاتژمێری تریش هیچ خواردنێک نەخۆن دەتوانن بە ڕێگادا بڕۆن. ئەو دەیگوت ئەگەر مەڕ سکی تێربێت بەرگەی سەرما و سەهۆڵبەندان دەگرێت، بەڵام ئەگەر سکی بەتاڵ بێت زوو لە پێدەکەوێت. ئەو دەیگوت لە دامێنی چیاکان گیا لە بەفر بەرزترە، لەوێ مەڕەکان شتێک بۆ خۆیان پەیدا دەکەن.

ئەوان دەبوو هەرچی زووترە خۆیان بگەیەننە تورکمان سەحرا. عەلی خان نیگەرانی حوشترەکان بوو، دەیگوت ئەگەر هەوا زۆر سارد بێت حوشترەکان شەکەت دەبن، خۆ ئەگەر حوشترەکان بارەکانیان بەڕێکوپێکی لێ بار بکرێت یەکسەر لێرەوە تا مەراوەتەپە دەتوانن بڕۆن. واتە تا (٥٠-٦٠) کیلۆ مەتر بە بەردەوامی دەتوانن بڕۆن، بەڵام ئەگەر سەرما و سەهۆڵبەندان بێت و باریان قورس بێت تەنها دەتوانن (٣٠-٤٠) کیلۆ مەتر ڕێگا ببڕن.

«یەلە»ش لە من جیا نەدەبووەوە. ئەو کاتێک زانیبووی من لە ئەسپ کەوتوومەتە خوارەوە، هەمیشە لەلامەوە بوو لێم دوور نەدەکەوتەوە، کاتێک لە سەر پشت کەوتبووم، ئەویش لە لامەوەبوو، ئەو هەمیشە هاوکاری دەکردم، ئاوی بۆ دەهێنام، دەچووە لای جەوهەر خانم و چای بۆ دەهێنام، لە ڕەنگ و ڕوویدا دیاربوو کە زۆر نیگەرانی منە، بەڵام هیچ قسەیەکی نەدەکرد. «یەلە» هەرچی جلوبەرگی هەیبوو لەبەری کردبوو، پۆتینە تازەکانیشی لەپێ کرد بوون. یەکێک لە ژنەکانی هەوارەکەی حەیدەر جوتێک دەستکێش و ملپێچێکی خوریی بۆ دروست کردبوو، بەڵام جلەکانی بۆ هەوای چەند پلەی ژێر سفر نەدەبوو.

## گەردەنەی شەلەمی

نیوەڕۆ بوو حاجی ڕۆستەم پێشنیاری بۆ عەلی خان کرد، چەندماڵێک بە باری سووکەوە بکەونەڕێ. خان دوودڵبوو، گوتی لەگەڵ وەلی خان و ئەوانی دیکەدا بەڵێنی تریان هەیە، دەترسێت ڕێگاوبان قەرەباڵغ بێت. خان گوتی تا دەتوانن لە ژێر ڕەشماڵەکاندا ئاگر بکەنەوە تا ڕەشماڵەکان وشکببنەوە و قورس نەبن. ڕەشماڵی لە موو دروستکراو زۆر بەهێزە، بەڵام موو ئاو لە خۆی دەگرێت و قورس دەبێت، ئەو بەفرەی کەوتبووە سەر ڕەشماڵەکان، ڕەشماڵەکانی تەڕکردبوو. هەڵبەت بەفرەکە بە بەردەوامی لەسەر ڕەشماڵەکانەوە دەکەوتە خوارەوە، بەڵام ڕەشماڵەکان تەواو تەڕ و قورس ببوون.

خان دەیگوت هەڵەی ئێمە ئەوەیە کە هیچ ئاڵفێکمان ئامادە نەکردووە بۆ ئاژەڵەکانمان، ئەگەر هەندێک ئاڵفمان ئامادە بکردایە ئەوا باشتر وابوو لێرە بمێنینەوە. حاجی ڕۆستەم گوتی با کەسێک بڕوات بۆ شائاباد بەڵکو خەڵکی گوندەکە یاخود سەربازانی بنکەکە هاوکاریمان بکەن. خان گوتی کوا کێ دەتوانێت لەم کاتەدا ئاڵفی چوار هەزار سەر ئاژەڵ دابین بکات؟ سوپا و بنکەی سەربازی بە ڕاستی دەیانەوێت ئێمە تیابچین و کەسیشمان نەمێنین. لە ڕەشماڵەکەی خاندا بەدیار ئاگرەکەوە دانیشتبووم، خان ڕووی تێکردم و گوتی. موهەندیس شا دەڵێت ئێران ئەمە و ئەوەیە. ئەوانە دەڵێن هۆز و کۆچەریی نیشانەی دواکەوتوییە، کاتێک ئێمە هەین و ئەم هەموو کۆچەرییە هەن و بوونی ئەم ژیانە بەدبەخت و پڕ چەرمەسەرییە خۆی لە خۆیدا پوچەڵبوونەوەی قسەکانی شایە. ئێمە نیشانەی دواکەوتوویی وڵاتین. گەر ڕاستت دەوێت ئەم ئاژەڵدارییە دواکەوتوییە. ژیان بەسەربردن لە ڕەشماڵدا لەم سەردەمەدا نیشانەی دواکەوتوییە. ئێمە کە چەند سەد ماڵین لەم دەشتودەرەدا تەنانەت یەک ئۆتۆمبێلمان نییە کە خۆمانی پێ ڕزگار بکەین، نە هۆکارێکی گەیاندن نە ئۆتۆمبێلێک هەیە تا دەنگمان بە شوێنێک بگەیەنێت. تەنانەت ئەگەر ئۆتۆمبێلیشمان هەبووایە پێی دەچووین بۆ تورکمان سەحرا یاخود بۆ ئاشخانە جۆ و ئاڵف‌مان دەهێنا.

پەری خانم گوتی سەد جار پێمگوتیت ئۆتۆمبێلێک بکڕە، بەڵام تۆ پێتدەگوتم بە ئۆتۆمبێل دەتەوێت هەمان کاری تاران بکەیت تەنها جێبێکی لەکارکەوتووت هەیە کە ئەویش لە بۆجنووردە. خان بە تەشەرەوە بە کچەکەی گوت تۆ زۆر بلێیی دەکەیت، لە نێوان ئەم وتووێژەی ئێمەدا دەتەوێت گەورەیی خۆت بنوێنیت، ئەو ئۆتۆمبێلەی کە تۆ دەتەوێت بەکاری ئێمە نایات. عەلی خان بەردەوام بوولە قسەکانی و گوتی شا دەیەوێت ئێمە نابووت بکات، شا بە بێ کۆچەرییەکان باشتر دەتوانێت بڵێت ئێران وڵاتێکی پێشکەوتووە. ئەم ڕەشماڵە کۆچەرییانە دڕکێکن لە چاوی شادا. ئەمە یەکەم جار بوو کە خان قسەی سیاسی بکات، ئەوها بە ڕوون و ئاشکرایی دژی شا قسە بکات، ئەو لەو بەفربارینە زۆر بێتاقەت ببوو. عەلی خان ڕێگای پێش و پاشی لێداخرا بوو، هاواری بە کەسێک نەدەگەیشت، دڵنیا بوو لەوەی کە هیچ کەسێک ناتوانێت دەستی یارمەتی بۆ درێژ بکات، هیچ هۆیەکی پەیوەندیکردن نەبوو جگە لەوەی کە کەسێک بە پیادەڕەوی بڕوات و هەواڵ ببات. ئەو بە تووڕەییەوە ئەو قسانەی دەکرد، دەیویست بەو شێوەیە من تێبگەیەنێت کە ئەو بڕوای تەواوی بە من هەیە.

کچەکانیش کە بەدەوری ئاگردانەکەوە دانیشتبوون و گوێیان بۆ قسەکانی باوکیان

شل کردبوو. جەوهەر خانم دەیویست قسەکان بگۆڕێت، ئەو ژنێکی زرنگ بوو، دەیزانی خان دەیەوێت قسە لەبارەی سیاسەتەوە بکات و دەیەوێت ڕاستەوخۆ شا بخاتە ژێر پرسیارەوە. جەوهەر خانم پرسیاری کرد و گوتی خان، وا باشتر نییە ئێمەی ژن و منداڵ بنێرێت بۆ گوندی ئەمەند یا ئینجە؟ کە هەوا باشتر بوو ئەو کات ئێمەش دێین بۆ لاتان، خۆ لەوێ شوێنێک پەیدا دەبێت لێی بحەوێینەوە، خۆراک و پێداویستیش لەگەڵ خۆماندا دەبەین یا لەوێ پەیدای دەکەین. ماوەیەک ئەم قسانە بەردەوام بوو. خان گوتی ئێمە بەفرمان زۆر بینیوە، بۆ خۆمان هیچ کێشەیەکمان نییە هەر چۆنێک بێت لە گەردەنەی شەلەمی ئاو دیو دەبین، بەڵام بۆ مەڕەکانمان ئەگەر خواردنیان بۆ پەیدا نەکەین کێشەیەکی گەورە ڕووبەڕوومان دەبێتەوە. لە دوورەوە دیار بوو کە حوشترەکان و مەڕەکان ڕێچکەیان بەستبوو ملیان لە هەورازی گەردەنەی شەلەمی نابوو.

گەنجەکان گوتیان وا هەواری عەبدولعەلی بڵندیش باریانکردووە و بەرەو گەردەنە دەڕۆن. خان گوتی ئەویش پەیمانەکەی شکاندووە، بڕیار بوو ئەو لە دوای هەمووانەوە بڕوات..دانیشتووانی هەوارەکە پێشتر ڕەشماڵەکانیان کۆکردبووەوە و دەرکی جەواڵەکانیان دروو بوو. بڕیار وابوو هەر چەند ماڵێک لە ژێر یەک ڕەشماڵدا بخەون تا بەیانی دوا نەکەون و بە زوویی بکەونەڕێ. گەنجەکانیشیان ئاگادار کردبوونەوە کە هەموو حوشترەکان لە کێو بهێننەوە و لە نزیک هەوارەکە کۆیان بکەنەوە. زۆربەی حوشترەکان نزیکەی سێ مانگ دەبوو کە لەو دەشتەدا بەرەڵا بوون، دیارە چەند ڕۆژێک لەوەبەر چەند کەسێک دیاریکرابوون بۆ کۆکرنەوەی حوشترەکان، حوشترەکان وردە وردە کۆ دەبوونەوە.

لە ناکاو دەنگ بەرزبووەوە گوتیان برزوو هات، برزوو هات، لە کونی ڕەشماڵەکەوە سەیری دەرەوەم کرد لە باشوورەوە یەک ڕەوە حوشتر دەهاتن. بەفر کێوەکانی بەرامبەر هەوارەکەی تەواو سپی کردبوو. برزوو دەرکەوت و ئەو لە کەسێکی کۆچەریی نەدەچوو، بەو بەفر و سەرمایە کراسێکی دڕاو و چاکەتێکی کۆنی لەبەردابوو.. لە حوشترەکەی دابەزی و منیش بۆ بینینی برزوو لە ڕەشماڵەکە چوومە دەرەوە. ئەو سەرەتا منی بەو کلێتە گوڵنکدارەوە نەناسیەوە، کە لە سەرما بوو. کاتێک گوتم برزوو چۆنیت! ئەویش گوتی ئەهای موهەندیس ئەوە تۆیت؟ چۆن شکڵ و شێوەیەکت پەیداکردووە؟ هەر لە پیرەمێردە تورکمانەکان دەچیت، بەم کلێتەوە خەریک بوو نەتناسمەوە. فەریبورز گوتی موهەندیس لە ئەسپ کەوتۆتە خوارەوە. دایکی برزوو ڕووی کردە کوڕەکەی و

گوتی چۆنی بوو هاتیت؟ بۆچی هاتوویتەوە؟ ئەویش گوتی لە شار کار نەبوو بە هۆی سەرماوە کارکردن وەستاوە، منیش بۆیە هاتوومەتەوە تاکو هاوکاری ئێوە بکەم. برزوو هاوکارێکی باش بوو بۆ دایک و باوکی، دایک و باوکی بە ئومێدی ئەوە ناردبوویان بۆ شار تاکو لەوێ کاربکات و برە پارەیەکیان بۆ بنێرێتەوە.

منداڵەکان بە خۆشی و شادیەوە ڕوویانکردە برزوو و گوتیان بڕۆین حوشترەکان کۆبکەینەوە. کوڕەکان بەناو بەفردا ڕایاندەکرد و هەریەکەیان حوشترێکی دەگرت تاسواریبین و بڕۆن حوشترەکانی تر کۆبکەنەوە. هێشتا دونیا ڕووناک بوو، داری ڕەشماڵەکانیان بەستبوو، حاجی ڕۆستەم گوتی هەندێک جۆ بدەن بە ئەسپەکان و هەمووتان ئەم شەو زوو بخەون، بەیانی زوو پێش خۆرهەڵاتن بەڕێدەکەوین.

بەفربارین بەردەوام بوو، لە نێو ڕەشماڵەکەدا لەگەڵ ئەو خێزانەدا بەدیار ئاگردانەکەوە دانیشتبووم. ئەوان منیشیان وەک ئەندامێکی بنەماڵەکەیان سەیردەکرد، نەمدەزانی هیچ گومانێکیان لە من هەبوو یان نا، بەڵام هەستمدەکرد قسەکانی خان لەبارەی شاوە قسەی مانادار بوون و بە کچەکەی گوت من بڕوام بەم گەنجە هەیە. منیش هەستمکرد کە عەلی خان خۆشی هۆگریەکی سیاسی هەیە. دەمزانی کە هەندێک لە خانەکانی باکووری خۆراسان هەر لەکۆنەوە پەیوەندی و خۆشەویستیان بۆ سۆڤیەت هەبووە و تاکو ئێستاش ئەو پەیوەندییە هەر بەردەوامە. دەمزانی کە حیزبی تودە لەگوندەکانی دەرگیز و کەلات نادری و هەندێک لە گوند و شارەکانی باکووری خۆراسان لایەنگیری سۆڤیەتن.

کاتێک پەری خانم لە تاران لەگەڵ گروپێکی کۆمۆنیستدا تێکەڵاو ببووە، هەڵبەت پێشتر هەستێکی لا دروستبووە بەرامبەر بە سۆڤیەت. من دەمزانی کە زۆرێک لە خانەکان و خەڵکی باکووری خۆراسان لایەنگری خودالێخۆشبوو دکتۆر موسەدیقن. لە دەرگیز خودالێخۆشبوو ئەبوفەزڵی قاسمی ئەندامی بەرەی میللی بوو، هەروەها لە (لاین) حاجی ئەرجومەندی لاینی لایەنگری دکتۆر مسەدیق بوو. لە ساڵی (١٣٣٢-١٩٥٣) لە باکووری خۆراسان شا دەسەڵاتێکی ئەو تۆی نەبوو.

پەری خانم زۆر قسەی لەگەڵ مندا دەکرد، لێی پرسیم ئایا باوکم لە بارەی منەوە هیچ قسەیەکی لەگەڵدا کردویت؟ گوتم بەڵێ. ئنجا گوتی من ساڵی (١٣٤٢-١٩٦٣) چوومە کۆلێژی ئەندازیاری تاران، بەڵام لە مانگی (ئەسفەندی١٣٤٣ = ت یەکەم ١٩٦٤) پۆلیس گرتیانم، داستانی دەستگیرکرن و ئەشکەنجەدانی هەمووی بۆ گێڕامەوە و گوتی سەرەتا بە دە ساڵ زیندانی حوکم درام، باوکم پارەیەکی زۆری خەرجکرد و هەموو موڵکەکانی

فرۆشت تا من ئازاد بکرێم. لە ساڵی (١٣٤٥-١٩٦٦) ئازاد کرام. بڕیار وابوو هەر لە تاراندا بمێنمەوە، بەڵام ئەندامانی گرووپەکەمان وازیان لێنەهێنام، دەیانویست بچمە گرووپێکی چەکدارییەوە، ئەوان دەیانزانی من لە بەکارهێنانی چەک و ئەسپسواری شارەزام، هەر بۆیە هەمیشە لە پەیوەندیدا بوون لەگەڵمدا. باوکیشم بەم کارەی زانی و بە زوویی منی هێنایەوە بۆ بۆجنوورد، بەڵام مانگێک لە بۆجنوورد نەبوم، دوبارە دەستگیرکرامەوە، ئەمجارەش باوکم هەوڵێکی زۆریدا بۆ ڕزگار بوونم. پاش سێ مانگ مانەوەم لە زیندان بڕیاری دوورخستنەوەم درا بۆ ماوەی دە ساڵ بۆ جەزیرەی هورمز، دووبارە باوکم هەوڵێکی زۆریدا تا ئازاد بکرێم، پاش هەوڵ و ماندوبوونێکی زۆری باوکم بەو مەرجە ئازادیانکردم کە منیش بێمەوە لای هۆزەکەی خۆمان و لەگەڵ ئەواندا بژیم و نەچمەوە بۆ شار، کاتێکیش کە تۆ هاتیت بۆ ناو هۆزەکەی ئێمە، من وا هەستم دەکرد تۆ لە لایەن پۆلیسەوە نێردرابێت و لێپرسراوی کارەکانی من بیت، بۆیە دەمویست سەرت پانبکەمەوە، ئێستاش زۆر پەشیمانم و داواکارم کە بمبەخشیت، خوشکەکانیشم لەو کارەی کردومانە پەشیمانن، هیوادارم بتوانم تۆڵەت بۆبکەمەوە. پەری خانم لەدایکبووی (١٣٢٢-١٩٤٣) بوو، واتە پێنج ساڵ لە من گەورەتربوو. ئەو بەگشتی دوو ساڵ و نۆ مانگ لە زینداندا بووە، لە ناو هۆزەکەیاندا تەنها ئەو کتێبی دەخوێندەوە و ڕاوی دەکرد، نیوەی کتێبەکانی لە ترسی من سووتاند بوو، وا هەستی کردبوو ئەگەر من شکاتی لێبکەم ڕەشماڵەکەیان دەپشکنن ئەو کات کتێبەکانی دەدۆزنەوە و دەیبەنەوە بۆ زیندان، بۆیە وای بە باش زانیبوو کتێبە کۆمۆنیستییەکانی بسووتێنێت، پێیگوتم ئێستا کتێبەکانی ئەندازیار مەهدی بازرگان دەخوێنێتەوە.

کەس و ڕێکخروە چەپەکان دەیانویست گۆڕانکاری لە بیروباوەڕدا بکەن. جەلال ئالئەحمەدیش یەکێکە لە ئەوانە. ماوەیەک بەیەکەوە بەدیار ئاگردانەکەوە دانیشتبووین، لە بارەی کتێبی گیانی گەلان قسەمان کرد. بە پەری خانمم گوت تۆ کەسێکی چەپ بوویت دەتویست چی بکەیت؟ گوتی دەمویست خەڵکی لە هەژاری ڕزگاربکەم، دەمویست کۆمەڵگەیەکمان هەبێت کە هەژاری تێدا نەمێنێت. گوتم زۆر باشە هەر لە ئێرەوە دەستپێبکە، ئەوەتا ئەو هەموو خەڵکە هەژارەی دەوروبەرت کە دەیانبینیت هەموویان نۆکەری باوکی تۆن، هەموویان نانی شەویان نییە بیخۆن. گوتی منیش هەمیشە لەگەڵ باوکمدا لەسەر ئەوکێشەیە لە شەڕدام. گوتم لانیکەم خوێندنگەیەک بۆ منداڵانی هەوارەکەتان بنیاتبنێ و فێری خوێند و نووسینیان بکە. نیلۆفەر و گوڵخەندان گوتیان بیرێکی جوانە. چۆن موهەندیس هاتووە وانە بە بێژەن و «یەلە» دەڵێتەوە،

زۆرباش دەبێت ئەگەر ئێمەش لێرە وانە بە منداڵانی هۆزەکەمان بڵێینەوە و فێری نووسین و خوێندنەوەیان بکەین.

لە نیلۆفەر و گوڵخەندانم پرسی ئەی چۆنە ئێوە نەچوون بۆ قوتابخانە؟ گوتیان ئێمە لە بۆجنوورد چووینە قوتابخانە. نیلۆفەر پۆلی هەشت بوو گوڵخەندانیش پۆلی شەش بوو. کاتێک پەری خانمیان گرت. خان ئێمەشی لە قوتابخانە دەرکرد و گوتی پێویست ناکات بچنە قوتابخانە وەرنەوە بۆلای هۆز و لای خۆمانبن، هەر چۆنێک بێت ئەوە باشترە نەوەک بچنە زیندانەوە.

دوای نانی ئێوارە، عەلی خان گوتی منداڵان ئەم شەو زوو بخەون بەیانی زوو لەگەڵ خۆرهەڵاتندا دەکەوینەڕێ. من لە کیسە خەوە کەمدا لە ناو ڕەشماڵی ماڵی خاندا نووستم. ڕەشماڵەکەی منیان کۆکردبووەوە، کاتێک چوومە کیسە خەوەکەمەوە ئازاری گیانم زیاتر بوو. «یەلە»ش لەلای منەوە نووست، ئەو منداڵە تەنها بەتانییەکی دڕاوی هەبوو بەتانییەکەی بەسەر خۆیدا کێشا. جەوهەر خانمیش لەسەرەوە لێفەیەکی پیادا دا. «یەلە» گونیەیەکی هەبوو هەموو ئەو شتانەی کە کۆی کردبوونەوە خستبوونیە نێو گونیەکەوە. شتەکانیش خوریی و بووز و بوون، «یەلە» دەیگوت کە هەندێک کیسە خۆراکیشی لە نێو گونیەکەدا هەیە، گونیەکەی خستبووە باوەشییەوە و نووستبوو.

بەیانی زوو بەدەنگە دەنگ بەئاگاهاتم، چەند حوشترێک ئامادە کرابوون بۆ ڕۆیشتن، حاجی ڕۆستەم لێپرسراوی ڕێڕۆشتن بوو. هەر کەسە و لێپرسراوی کارێک بوو، زۆر بەخێرایی ڕەشماڵ و کەلوپەلەکانی خانیان لە حوشترێک بارکرد و خانیش لەسەر بارەکەوە سوار بوو. منداڵە بچووکەکانیشیان سواری حوشتر کرد. مەنوچەهر سواری ئەسپێک بوو لە پێشەوە دەڕۆیشت و بەفرەکەی دەشکاند. منیش سواری حوشترێک بووم، بەڵام قاچم ئازاری هەبوو. ئەو قۆناغە تفەنگەی گوڵخەندان لە ئەژنۆمی دابوو کاری خۆی کردبوو. نەمدەتوانی چەند کیلۆ مەترێک بەپێ بڕۆم.

دەبوو شەو لە شوێنێکدا و لە گەردەنەی شەلەمی بخەوین، هەمووان خۆیان ئامادە کردبوو بۆ سەرما. منیش لەبیری ئەوەدا بووم کە ئۆتۆمبێلێکم دەستبکەوێت و بگەڕێمەوە بۆ مەشهەد، بەڵام ئۆتۆمبێل لە کوێ هەیە؟ بۆیە ناچار منیش سواری حوشترێک بووم، ئەو بارانگیرەی کە جەوهەر خانم پێیدا بووم، بە ڕاستی فریام کەوت، هەموو گیانمی داپۆشی بوو دەست و قاچ و دەموچاوم، تەنها چاوەکانم دیار بوون. کچان و ژنانی خان هەموو سواری ئەسپ ببوون، بەڵام ئەوانی تر هەموویان بە پیادە بە ناو بەفرەکەدا دەڕۆشتن.

بیبی سواری گوێدرێژێک ببوو، مورتەزای هاوسەری بیبی لەدوای گوێدرێژەکەوە دەڕۆیشت، ئەو پیاوە تەمەنی حەفتاوپێنج ساڵ بوو. من نەمدەزانی چیبکەم، تەنها خۆم بەخودا سپارد. سەیری پێشەوەی خۆمانم دەکرد، بینیم یەک مێگەلە مەڕ بەرەو گەردەنە دەڕۆیشتن. مەڕەکان دوو ڕۆژ بوو لەناو بەفردا بوون، خۆ ئەگەر بەفر ڕووی زەوی دانەپۆشیبایە مەڕەکان باشتر دەیانتوانی بەڕێگادا بڕۆن. ئەو حوشترەی کە من سواری ببووم باریشی لێ بارکرابوو. من لەسەر بارەکەوە سوار ببووم، هەر لەسەر بارەکەوە زینێکیان لێ قایم کردبوو، منیش لەسەر زینەکەوە سوار ببووم. تەکانی ڕۆیشتنی حوشترەکە زیاتر گیانی ئازار دەدام، وردە وردە زیاتر هەستم بەسەرما دەکرد. کاتژمێر (٨:٣٠) ی بەیانی (٤-١٠-١٣٤٨=٢٥-١٢-١٩٦٩) بوو. پلەی گەرما حەوت پلە ژێر سفر بوو لە بەرزایی (٦٨٢) مەتر بەرزی لە ئاستی ڕووی دەریاوە. دەشتێکی پان و بەرین بوو، هێشتا نەگەیشتبووینە دامێنی کێوەکە. لە ماوەی چوار کاتژمێر ڕێکردندا تەنها چل مەتر بەرز ببووینەوە. بەرزییەکەی (٧٢٤) مەتر بوو، لێرەدا هەوا زۆر سارتر بوو لەو شوێنەی کە لێوەی بەڕێکەوتبووین.

عەلی خان خۆی بۆ ڕووداوی سەخت ئامادە کردبوو، بەرنامەیەکی وردی بۆ ئەم کۆچە دانا بوو، بۆ هەر کارێک لێپرسراوێکی تایبەتی دیاریکرد بوو. تەنانەت ئەو منداڵانەش کە تەمەنیان کەمێک لە سەرەوە بوو، بەپێی توانای خۆیان کاریان پێسپێردرا بوو. هەستم دەکرد لە هەوارەکانی تریش بە هەمان شێوە منداڵان کاریان پێسپێردرا بێت، خان هەموو پێشهاتێکی لەبەرچاو گرتبوو. تەنانەت کەسێکی بۆ چاودێری منداڵانیش دیاریکرد بوو. عەبدال لێپرسراوی چەند ژن و پیاوێکی بەتەمەن بوو، برزوو چاودێری چەند کەسێکی تری دەکرد، بە جۆرێک هەمووان ئاگاداری یەکتری بوون و نەدەبوو کەسێک جێبمێنێت. غەفار چاودێری منداڵە بچووکەکانی دەکرد، «یەلە»ش لەناو بەفرەکەدا پێبەپێی حوشترەکان دەڕۆیشت.

بە غەفارم گوت «یەلە» توانای نەماوە و زۆر بێهێزە، ئەگەر دەکرێت سواری حوشترێکی بکە. گوتی باشە کاتێک دانیشتین بۆ نانخواردن ئەو کاتە سواری حوشترێکی دەکەم. لەسەر حوشترەکەوە بیرم لە هەوڵ و ماندووبوونی ئەو خەڵکە هەژارە دەکردەوە کە چۆن گۆشت و خوریی و شیرەمەنی بەرهەمدێنن، بەڵام بە چ ڕەنج و ماندووبوونێک؟ ئەو کاتە لە قورەمەیدان دێهات زۆر کەم بوو، ئەو ئاوەدانییەی کە لە ناوچەکەدا هەبوو بە هۆی کۆچەرییەکانەوە بوو. دەنگی زەنگۆڵەی ملی حوشترەکان لەو دەشتەدا ئاوازێکی خۆشی خولقاندبوو، خەڵکەکە هیچی نانی بەیانیان نەخواردبوو، هەر

کەسێک ئەگەر شتێکی لە گیرفانیدا بووایە دەری دەکرد و دەیخوارد.

پەری خانم ئەسپەکەی خۆی لە حوشترەکەی من نزیک کردەوە و گوتی موهەندیس ماندوو نەبیت، گوتم سوپاس تۆش ماندوو نەبیت. هێشتا ڕووی خۆی نیشان نەدابووم، دیارە جگە لە ماڵی خان هەموو خەڵکەکە وایان دەزانی من لە ئەسپ بەربوومەتەوە، پەری کیسەیەکی بچکۆلانەی پێدام بستە و دەنکە کولەکە و هەنجیری وشک و کشمیش و قەیسی وشک و بادەم و نوقڵی تێدا بوو. ئەمانە هی شەوی یەڵدا بوون لای مابووەوە. هیچ کەسێک نانی بەیانی نەخوارد بوو، چنگێکم لەو چەرەساتە دا بە «یەلە»، بەڵام هەندێکی ڕژایە ناو بەفرەکەوە، «یەلە»ش لەنێو بەفرەکەدا بۆیاندەگەڕا. کاتێکم زانی «یەلە» بەجێماوە، بانگی غەفارم کرد و پێمگوت ئاگاداری «یەلە» بە، ناتوانێت بڕوات با جێنەمێنێت، باشبوو غەفار «یەلە»ی خستە سەر پشتی حوشترێک. منداڵە بچووکەکانی تریشیان لە سەر باری حوشترەکانەوە سوارکردن. حوشترەکان باریان پێوە بوو، منداڵەکانیش هەر وەک و من لەسەر بارەکەوە سوار ببوون. هەر چەندە حوشترەکەی من زینێکی لە سەر بارەکەوە لێکرا بوو، من لەسەر زینەکەوە سوار ببووم، بەڵام ئەو منداڵانە لەسەر بارەکەوە یەکڕاست سوار ببوون. نزیکی کاتژمێر دەی بەیانی دابەزین بۆ پشوودان. بەگشتی شەش کاتژمێر بوو بەڕێگاوە بووین. لەو بەفرەدا کۆتەرەیەک، پارچەدارێکی وشکمان دەست نەدەکەوت بۆ ئاگرکردنەوە، بۆیە کە بەڕێگادا دەهاتین هەر کەسێک دارێک یا دڕکێکی بینی بوو کۆیان کردبووەوە و لەسەر پشتی وڵاخەکان دایاننا بوون، بەڵام دار و کۆتەرەکان تەڕبوون.. لە کاتی ئاگرکردنەوەدا کەمێک نەوتیان بە دار و کۆتەرەکاندا کرد و ئاگر کرایەوە، هەمووان لە دەوری ئاگرەکە کۆبوونەوە بۆ خۆگەرمکردنەوە. لە هەمووی خراپتر قاچەکانمان بوو، چونکە پێڵاوەکانمان ببوو بە سەهۆڵ، زۆربەی خەڵکەکە پێڵاوی باشی لەپێدا نەبوو، من جوتێک پۆتینی چەرمم لە پێدا بوو لە مارکەی کەوشی میللی بوو، دیارە کەوشی میللی ئەو سەردەمە نەک هی ئەم سەردەمە.

خۆم بە خەجاڵەت دەزانی، ئەو خەڵکەی بە پێ دەڕۆشتن و پێڵاوەکانیان بەفر پێوەی بەستبووی، ببوو بە سەهۆڵ، بەڵام پێڵاوەکانی من وانەبوو، چونکە من پیادە نەبووم. برزوو لە سەرمادا ڕەنگی تەواو گۆڕابوو. لە کۆڵە پشتەکەمدا چاکەتێکی زیادەم پێبوو پێمدا ئەویش سوک لێی وەرگرتم و هەرچەندە کەمێک بۆ ئەو بچووک بوو، بەڵام هەر لە بەری کرد.

«یەلە»ش هاتبووە لای منەوە و لێم دوور نەدەکەوتەوە، دیار بوو ئەویش زۆری

سەرما بوو. ڕوومکردە بیبی و پێمگوت «یەلە» سەرمایەتی، ئەویش گوتی هەموومان سەرمامانە. حاجی ڕۆستەم گوتی هەر کەسێک جلوبەرگی گەرمی لایە با بیکاتە بەری. ئەوانەی کە جلوبەرگی زیادەیان پێبوو خستبوویانە نێو خۆرجێنەکەی مەعسومەوە. مەعسومە ژنی یەکێک لە شوانەکانی خان بوو، ژنێکی هەژار بوو، خوشکەکەی مرد بوو دوو منداڵی خوشکەکەی لای ئەم بوون و بەخێوی دەکردن. منداڵەکانی خوشکەکەی ئەکبەر تەمەنی دە ساڵ بوو، ڕەسوڵیش تەمەنی دوازدە ساڵ بوو. مەعسومە چاکەتێکی هێناو دای بە «یەلە»، «یەلە» ئەویشی لەسەر جلە کانیەوە لەبەرکرد. دوان لە منداڵەکانی خەینسا سەرمایان بوو. سێ منداڵی تری خەینسا لە بۆجنوورد ببوون بە خزمەتکاری ماڵان.

چا لێنرا و نانی بەیانیمان لەوێ هەر بەسەرپێوە خوارد و کەمێک جۆیان دا بە ئەسپەکان و حوشترەکانیش پاڵکەوتبوون و پشوویان دەدا. تەنانەت نەپەرژانە سەر ئەوەی کە بارەکان لەو بەستەزمانانە بکەنەوە تا کەمێک بە بێبار پشوو بدەن. منداڵان ئەوەندە سەرمایان ببوو تاقەتی شەڕە بەفریان نەما بوو، کچەکانی خانیش لە سەرماندا لە پەنایەکەوە کز دانیشتبوون.

پەری خانم لێی پرسیمی بە بۆچوونی تۆ ئەم ژیانە بەکەڵکی چی دێت؟ گوتم نازانم، بەڵام چەندین هەزار ساڵە ژیان ئەوها هاتووە. گوتی ئەمە ژیانی ئێران نییە. گوتم ڕاستە، بەڵام من خەڵکی یەزدم خۆ ئەگەر پاش دە پشتی تریش نەوەکانم لە شارێکی تریش بژین هەر یەزدیین، یا خەڵکی ئەو شارەن کە تێیدا دەژین. بۆچی مەگەر ئەم ژیانە ژیانێکی ئێرانیانە نییە؟ کە هەزاران ساڵە لە ئێراندا بەردەوامی هەیە. گوتی دەبێت فاتیحا بۆ ئەم ژیانە بخوێنین. گوتم تۆ بۆ خۆت فاتیحای بۆ بخوێنە. گوتم تۆ کارێک بکە بەڵکو باوکت لە گوندێک دانیشێت و کاری کشتوکاڵ بکات یا لە شاردا دانیشێت و خەریکی کاری بازرگانی بێت، گوتی ئاخر باوکم ئێستاش دەڵێت مەڕێک بەسەد گوند ناگۆڕمەوە. عەلی خان فەرمانی دا و بەرێکەوتین. حاجی ڕۆستەم هاواری کرد یەڵڵا هەڵسن نان و چاتان خوارد و گەرمتان بووەتەوە، با بکەوینەڕێ، بەڵام کام گەرمبوونەوەیە! هەر ئەو پێ جووڵەیە لەو سەرمایەدا خراپتری کردین.

لە بناری کێوەکەوە چاوم لە هەندێک شتی ڕەش بوو بەناو بەفرەکەدا دەڕۆیشتن. تومەس ئەوە ئاژەڵی هۆزەکانی تر بوون کە دەیانویست لە گەردەنەی شەلەمییەوە سەربکەون و ئاودیوبن. لە ماوەی نیو کاتژمێر وەستاندا، هەمووان لە نێو خورجینەکانیاندا بەدوای جلوبەرگی تردا دەگەڕان تا بیاندۆزنەوە و لەبەریبکەن.

برزوو هەندێک جلە کۆن و سەرجلی ئەسپ و وڵاخەکانی لە سەر پشتی حوشترێک ڕێکخست، شوێنێکی بۆ مورتەزای هاوسەری بیبی دروستکرد و سواری حوشترەکەی کرد و بە گوریسێک لە سەر پشتی حوشترەکە توند بەستی تاکو نەکەوێت، ئەو پیاوە پیرە داماوە بە تەواوی پەکی کەوتبوو، توانای ڕۆیشتنی نەمابوو، بیبیش پەکی کەوتبوو سەرما بە تەواوی کاری تێکردبوو، خەریکبوو دەبوو بە سەهۆڵ. منداڵە بچووکەکانیش ئەوەندەیان جلیان بۆ لە بەرکردبوون وەک تۆپ خڕ ببوون، هەر منداڵە و لە سەر پشتی حوشترێک جێگایان بۆ کردنەوە و سواریانکردن. ئەردۆ و مێگەلەکەش نزیکەی (١فرسەخ = ٦،٢٤ کم) لە پێش ئێمەوە بوون، مێگەلەکانی تری عەلی خان و مێگەلی هەوارەکانی تر لە بناری شاخەکە و لە پشتی ئێمەوە بوون. برزوو لە هەمووان کەمتر جلوبەرگی لەبەردابوو، بەڵام لە هەمووان ئازاتر و چالاکتر بوو. بیرم لە داستانەکەی عوبێدی زاکانی دەکردەوە.

عوبێد دەیگوت ڕۆژێک هەوا زۆر سارد بوو. سوڵتان مەحمودی غەزنەوی جلوبەرگێکی زۆری لەبەر کردبوو، بەڵام هێشتا هەر سەرمای بوو، لە پڕێکا چاوی کەوت بە تەلهەک کە تەنها کراسێکی لەبەردا بوو بەناو بەفردا دەڕۆشتن. سوڵتان بانگی تەلهەکی کرد و پێیگوت ئەوە چ نەهێنیەکە؟ من ئەم هەموو جلوبەرگەم لەبەردایە کەچی هەر سەرمامە، بەڵام تۆ تەنها یەک کراست لە بەردایە و سەرمات نییە؟ تەلهەک گوتی سوڵتانی بەڕێز من هەرچی جلوبەرگێکم هەمە لەبەرمکردووە، تۆش هەرچی جلوبەرگت هەیە لەبەری بکە ئەو کاتە سەرمات نابێت.

من ئەوەندە جلم لەبەرکردبوو خۆ ئەگەر بە پێ بڕۆیشتمایە بە هیچ جۆرێک توانای ڕۆیشتنم نەدەبوو. کچان و ژنانی خان لێیان دەپرسیم حاڵت چۆنە؟ هەر یەکە و شتێکیشی پێدەدام کە بیخۆم. لە دوای ئەو هەموو لێدانەی کە لێیاندام زۆر میهرەبان بوون لە گەڵمدا، خۆ پێشتریش هەر زۆر باشبوون لە گەڵمدا. وردە وردە خەریکبوو ترسیان لێم نەمێنێت، دەیانزانی ناچم شکات بکەم، خۆ ئەگەر شکاتم بکردایە دەبوو بچم بۆ شائاباد، ئێمە چەند کیلۆ مەترێک لە دووری شائابادوە تێپەڕین، کاتێک کە گەیشتینە ڕاستی شائاباد خەریکبوو سەری حوشترەکەم بسوڕێنم بەرەو شائاباد بڕۆم، بەڵام گوتم واناکەم ئەمە یاریکردن نییە، ڕەنگە کچەکانی خان بە خێرایی پێشم پێبگرن و دەستبکەنەوە بە لێدانم. لە دڵی خۆمدا گوتم بەندەی خودا، خۆت بگەیەنە شائاباد و لانیکەم خۆت لەم سەرمایە ڕزگار بکە، خۆت بگەیەنە بنکەی ئەمریکاییەکان، یا بچۆرە ماڵێک لە گوندەکە. دووبارە گوتم ئەم کچانە ویستیان بمکوژن ڕەنگە ئەمشەو کارێک بکەن لە

سەرماندا بمرم. ئەمجارەش گوتم لەو بنکە سەربازییەی کە ئەمریکاییەکانی تێدان بە هیچ جۆرێک دالّدەم نادەن و ڕێگەم پێنادەن بچمە بەر دەرگاکەیان، ڕەنگە لە گوندەکەشدا هیچ کەسێک دالّدەم نەدات. لە دلّی خۆمدا گوتم ئای چەندە کەسێکی ترسنۆکم دەخێرا دەنگ لە حوشترەکە بکەو بە خێرایی بەرەو شائاباد برۆ. لە بیرکردنەوەدا بووم نەمدەزانی بڕیاری چی بدەم؟ دووبارە بە خۆمم گوت خۆ من بەڵێنم داوە شکات نەکەم، خۆ ناکرێت خۆم بە درۆ بخەمەوە، تازە من بەڵێنم بە خان داوە شکات نەکەم. خۆ ئەگەر ئەم خانە خۆی دەستی نەبێت لەو کارەدا کە بە سەریاندا هێنام، بۆچی تووشی کێشە و دەردی سەریی بکەم؟ بۆچی پیاوێکی پیری تەمەن شەستوپێنج ساڵ بەم سارد و سەرمایە تووشی کێشە و نارەحەتی بکەم. لەم بیرکردنەوەیەدا بووم، لە ناکاو پەری خانم لێم نزیک بووەوە گوتی باوکم دەڵێت ئەگەر موهەندیس دەیەوێت بچێت بۆ شائاباد ئەوا ئێمە کەس و ناسیاومان هەیە لەوێ، با حوشترەکەش لەگەڵ خۆیدا بەرێت، دوایی خۆمان دێینەوە و حوشترەکە وەردەگرینەوە، باری حوشترەکەش هەمووی خواردەمەنییە و بیدات بە خەڵکی گوندەکە. ئنجا پەری خانم بە پێکەنینەوە گوتی موهەندیس هەوا زۆر ساردە پێشنیارێکی خراپ نییە، ئەگەر جێگە بۆ ئێمەش هەبوو ئەوا ئێمەش دێین، بەڵام ئێمە کۆچەریین و خوومان بەم ژیانەوە گرتووە، تۆ برۆ بۆ ئاواییەکە.

منیش لەسەر حوشترەکەوە سەیرێکی پەری خانم کرد و دەموچاوی لە سەرمادا شین هەڵگەڕا بوو، دیاربوو سەرما کاری لە ئێسقانەکانیشی کردبوو، بەڵام قیت لەسەر ئەسپەکەوە سوار ببوو، لە هەردوو کونە لووتیەوە هەڵم دەهاتە دەرەوە، لە کونە لووتی ئەسپەکەشیەوە هەڵم دەهاتە دەرەوە. سەیرێکی کاروانەکەم کرد کە نزیکەی چل حوشتر و ئەسپ و گوێدرێژ دەبوون، یەک بەدوای یەکدا ڕیزیان بەستبوو دەڕۆیشتن. وابزانم من لە ناوەڕاستدا بووم، هەموومان لە هەوڵی ڕۆشتندا بووین. زیاتر لە دە منداڵ بەسەر پشتی حوشترەکانەوە خۆیان قایمکردبوو، نزیکەی پەنجا کەس لە ژن و پیاو بە پیادە بە جادە سەهۆڵابەندانەکەدا دەڕۆشتن، قاچیان لە سەرمادا خەریک بوو ئیفلیج دەبوو، منیش سەرما کاری لە پشتم کردبوو ئازارێکی زۆری هەبوو، ئەو ئەژنۆیەم کە گوڵخەندان بە قۆناغی تفەنگەکەی لێیدابوو زیاتر لە هەموو گیانم ئازاری هەبوو، بۆیە لە دلّی خۆمدا گوتم پێشنیارێکی جوانە، خەریکبوو بڵێم زۆر باشە دەڕۆم، بەڵام فەریبا و گوڵخەندانیش لێم نزیک بوونەوە و گوتیان موهەندیس ئەگەر حەزدەکەی تۆ برۆ، خەریکبوو بڵێم دەڕۆم بەڵام، سەیرێکی پەری خانم کرد و ئەویش لێم نزیک بووەوە و سەیرێکی کردم و چاوەڕوانی وەڵامی من بوو، لەو کاتەدا دڵم کەوتە لەرزە و هەستم

جولا و دێوی نووستووی لاوی بەئاگاهات و دڵم بۆ پەری خانم کەوتە لێدان، وەک ئەوەی کە هەرگیز سەرمام نەبوو بێت، خوێن بە خێرایی لە هەموو گیانمدا دەسوڕا، دەمویست بڵێم پەری تا گیانم تێدا بێت هەمیشە لەگەڵ تۆدام، تۆ و بنەماڵەکەت و هۆزەکەت بە تەنها جێناهێڵم.

پەیوەندی گەنج لەگەڵ دونیادا خۆی لە خۆیدا داستانێکە. ئەم هەموو بیر و خەیاڵە لە ماوەی چەند چرکەیەکدا بە مێشکمدا هات، نازانم چۆن بوو کە گوتم زۆر سوپاس پەری گیان، من لەگەڵ ئێوەدا دەمێنمەوە. نازانم ئاگاداری وشەی پەری گیان بوو یان نا، بەڵام نیلۆفەر گوێی لە وشەی پەری گیان بوو، بزەیەکی هاتێ و ڕووی خۆی وەرگێڕا. زۆر پێت لەم وشەیەدا هەبوون. نیلۆفەر تەکانێکی بە ئەسپەکەی خۆی داو شەلاقێکی لە ڕانی ئەسپەکەی گوڵخەندان دا، ڕەنگە ویستبێتی لەم سەرمایەدا بەستووەکانی گەنجی نێوان من و پەری خانم بکات بە ئاو. ئنجا گوتی موهەندیس لە لامان دەمێنیتەوە؟ گوتم بەڵێ. گوتی زۆر خۆشحاڵم و ئەسپەکەی بەرەو پێش تەکاندا. من مامەوە لەگەڵ کۆڵێ بیرو خەیاڵی گەنجێتیدا.

پەری دووەم کچ بوو لەو هۆزەدا کە دڵمی هێنابێتە جۆش، گڵپۆم بیر چوو بووەوە، ڕەنگە پەیوەندیم بە گڵپۆوە جۆرێکیتر بوو بێت، دڵم ئارەزوی پەری هەبوو، دڵم حەزیدەکرد پەری هی من بێت، دڵم دەیویست تۆڵە لە پەری بکەمەوە، کچێک کە چەند ڕۆژ لەمەوبەر دەیویست من بە تفەنگەکەی بکوژێت، بەڵام ئێستا دەیەوێت بە نیگاکانی من بکوژێت. ئیتر بیرم لای کۆچ، دەنگی زەنگوڵەی حوشترەکان، جوانییەکانی بەفر، ترس لە سەرما و بەستەڵەک و گرفتارییەکانی شەو، نەبوو. پەریش بە وشەی پەری گیان تێگەیشت کە من ماڵی بووم، ئیتر گرفتاری بووم و لێم دوورکەوتەوە، لەوەشە، دڵنیا بووبێت کە من شکات ناکەم و ترسی لێم نەمابێت، نازانم ئەو وشەیە لای ئەو مانای هەبوو یان نا ؟

چەند ساڵێک لەوەدوا کاتێک دڵم بۆ خۆشەویستێک لە دەرەوەی وڵات لێیدەدا، بەیەکەوە نهێنی جیاوازی خۆشەویست و خۆشەویستەکەم دەنووسی، بە تەنها پیتی (م) چەند دەتوانێ پەیوەندی نێوان دوو ناسیاو و دوو خۆشەویست بگۆڕێت. یەک پیتی (م) چەند دەتوانێت پەیوەندی نێوان ژن و پیاوێک بگۆڕێت، یەک پیتی (م) چەند دەتوانێت دڵەکان لە یەکتر نزیک بکاتەوە. وشەی (گیان) پەیوەندی من و پەری بردە جیهانێکی ترەوە. لانیکەم لەسەر پشتی حوشتر لەو سەرمای زەمهەریرەدا وشەی (گیان) جیهانی ئێمەی گۆڕی بوو. هەمیشە بیردەکەمەوە وشەکانی بمبەخشە، داوای

لێبووردن دەکەم، گیانەکەم، خۆشەویستم، قوربانتبم، لەخزمەتتدام، ڕێزت هەیە، ئەمانە و تێکڕای وشەکانی هاوشێوەی ئەمانە چەند دەتوانن پەیوەندی نێوان کەسەکان توووند و تۆڵتر بکات. یا ئەم وشانە چەندە دەتوانن تاوانەکان لە دادگادا کەم بکەنەوە. لە ڕابردوویەکی زۆر دوور نا، کاتێک هەموومان بەیەکەوە کێشەیەکمان دەبوو بە زوویی پەشیمان دەبووینەوە و داوای لێبووردنمان دەکرد، ئەو کاتە ئاشتی و ئاشتەوایی لە ئێستا زیاتربوو. لە هەر کۆمەڵگەیەکدا وشەی تکات لێدەکەم، گیانەکەم، خۆشەویستەکەم ئەمانە و هەموو وشەکانی هاوشێوەیان زیاتر بەکارهات ئەوا لەو کۆمەڵگەیەدا خۆشی و خۆشەویستی و ئاشتی زیاتر بەرقەرار دەبێت.

خان پێشبینی کردبوو کە تا دوانیوەڕۆ دەبێت یەکڕاست بڕۆین و دەیویست لە تەنگەبەری گەردەنەی شەلەمی ئاودیو ببین. لەوە بەدووا دەچووینە سنوری پارێزگای مازندەران و ڕووە و دەریا دەبووینەوە و هەوا گەرمتر دەبوو. لە دوای تێپەڕ بوونمان لە گەردەنە هەر شوێنێکمان پێباش بوو لا دەدەین بۆ پشوودان. هەور چڕ و پڕتر دەبوو، بەفر دەستیکردەوە بە بارین. ئێمەش لە خوار گەردەنەوە بووین، لە پێش ئێمەوە و لە پێچەکانی گەردەنەدا ڕیزی ئاژەڵەکان لە جووڵەدا بوون و بەردەوام دەڕۆشتن بۆ سەرکەوتن لە گەردەنە.

دیارە خان دەیزانی کە ناتوانین لە گەردەنە ئاو دیوو ببین، بۆیە بەدوا پەناگەیەکدا دەگەڕا. هەموومان ماندو ببووین و سەرما چووبووە گیانی ئەسپ و حوشتر و خەڵکەکەوە. هەمووان ماندووبوونیان بە ڕووەوە دیار بوو، کەسە بەتەمەنەکانیش دووا دەکەوتن. خان برزوو و غەفار و عەبدالی ئاگادار کردەوە کە ئاگاداری دوواوەی کاروانەکەبن. برزوو خورجێنێکی بەتاڵی لە خۆیەوە پێچابوو تا گەرمی بێتەوە. بەو خورجێنەوە زۆر سەرنجراکێش بوو، بەژن و باڵای هەر لە مەکسیکیەکان دەچوو.

منداڵە بچووکەکان بە سەر حوشترەکانەوە دەگریان، بەفریش خێراتر دەباری. (نێو فرسەخ = ٣,١٢ کم) دوور لە ئێمە، مێگەلە مەڕێک وەستا بوون. حاجی ڕۆستەم بانگی خانی کرد و گوتی لێرە بووەستین پشووبدەین. خان گوتی پێویستە بڕۆینە پێشتر شەوێکی سەختمان لە پێشە، ئەگەر هەموومان پێکەوە بین باشترە. چەند کەسێک گوتیان پێشەوە شوێنی عەبدولعەلی بڵندە. خان گوتی چی لەوە باشترە ئێمەش لەگەڵ ئەواندا بین؟ تا دەتوانن مێگەلەکە بەرەو پێش بەرن بەشوانەکان بڵێن نەوەستن، ئەگەر بووەستن مەڕەکان وەک سەهۆڵیان لێدێت، مەڕەکان دەبێت بەردەوامبن لە ڕۆیشتن.

کاتێک لە دەشتەکەی خوارەوە بووین وامانەزانی هێشتا بەفر گژوگیای دامێنی

کێوەکەی دانەپۆشیوە و مەڕەکان بە خواردنی ئەو گیایە تێردەبن، بەڵام زۆریی بەفرەکە گژوگیاکەی هەمووی داپۆشیبوو. لە دامێنی کێوەکە نزیکەی (٧٠-٨٠) سانتیمەتر بەفر کەوتبوو. بەتەواوی ڕێگاکەی داپۆشیبوو، بەفرەکە بەستبووی و ببووە سەهۆڵبەندان. خەڵکەکە هەموو پێڵاویان پڕ ببوو لە بەفر و سەهۆڵ. قاچی حوشترەکان لەسەر بەفرەکە دەخزی، بۆ ئەوەی کە حوشترەکان نەکەون بانگیان کرد بەناو بەفرەکەدا بڕۆن و بەسەر ڕێگا بەستووەکەدا نەڕۆن.

لەسەر حوشترەکەوە چاوم لێبوو خەڵکەکە لە سەرمادا دەستەکانیان لەیەک دەخشاند و قاچیان بە زەویدا دەکێشا تا ئەو بەفر و سەهۆڵەی بە پێڵاوەکانیانەوە بوو لێی ببێتەوە. ئیتر وردە وردە توانایان نەما پێ بەزەویدا بکێشن، سەرما هێزی لە بەر بڕیبوون. دوو کاتژمێر دەبوو پەری خانم هیچ قسەیەکی لەگەڵدا نەکردبووم، دووبارە لێم هاتەوە پێش و گوتی موهەندیس هەوا زۆر ساردە. منیش دەستم بە کیسە چەرە ساتەکەدا کرد و هەنجیرێکی وشکم دەرکرد و بۆمهەڵدا، لە هەوادا هەنجیرەکەی گرتەوە و ماچێکی کرد و بە ددانەکانی هەنجیرەکەی گرت. ماچکردنی هەنجیرە وشکەکە حاڵەتێکی لا خوڵقاندم کە پێناسە ناکرێت. هەموو گەنجەکان تووشی ئەو حاڵەتە بوون، بۆیە هیچ کەسێک وا بە سادەیی ناتوانێت پێناسەی بکات. لە نەریتی ئێمەدا پێناسە کردن کارێکی گرانە. دڵم بۆ ئەو نەریتە دەسووتێت کە دوچاری مقەست بووە و پارچە پارچە دەکرێت، خۆزگە هەموو مقەستەکان دەشکان، بەڵکو ئەوکات بتوانرایە هەندێک لە نەریتەکان پێناسە بکرانایە. پێویستە یادێک لە فیردەوسی زانای گەورە بکەینەوە، فیردەوسی پاکترین و باشترین شاعیری ئێمەیە. سەیرکەن چۆن بۆچوونە جوانەکانی خۆی دەخاتە ڕوو. هیچ شاعیرێکی تر وەک فیردەوسی وشەی جوان و ناسکی بە کار نەهێناوە.

**هەر وەک منداڵی جوان و کڵاشکەر**
**ژنێکی بۆ خواست خۆش ناو و گەوهەر**
**نەیبوو ئامرازی پێویستی بۆ کار**
**بۆ بەختی کردی بە شین و هاوار**
**کونە شەرابی ڕووت پەنهان بوو لای**
**کوڕەی بەرەو ژوور ڕاکێشا و هێنای**
**گوتی دەتوانیت حەوت پێک بنۆشی**
**تا پارێزراو بیت هەستکەی دڵخۆشی**

**گەر ئەمشەو تەنگی مهر بشکێنی**
**بە پاچ، لە لباد کەی بەرد دەردێنی**
**کلاشکەر لێیدا پێک تا شەش و حەوت**
**ئاگری ناخی تاوی سەند وەک نەوت**
**پێکەکان شەرمی جوامێریان بڕی**
**هات دەرگای ماڵی وەک پەردە دڕی**
**نەیجە لەکاری ناوەوە سست بوو**
**دڵشی وتی، سستی بەسەرچوو**
**سێ پێکی ترم پێدا بە پەنهان**
**لە ڕەگەزی ئەو نەبووە لە جیهان**
**هاوکات پێکەکە شاد دەبێت خەندان**
**لە لباد سەری دەردێنێ ئێسقان**

ئەم پارچە هۆنراوەیە شاکارێکی ئەدەبیاتی فارسیە، شاعیر بۆچوونەکانی خۆی ڕاستگۆیانە دەربڕیووە، وا هەست دەکەم ئەگەر ئێمە بتوانین جوانییەکان بەو شێوەیە پێناسە بکەین بێگومان ئەمانەت پارێز دەبین.

بەفرەکە زۆر بە خێرایی دەباری، دوێناش وردە وردە تاریک دەبوو، تەنانەت دە مەتر پێش خۆمان نەدەبینی. هێزی سەرما و گڤەگڤی «با» بەجۆرێک بوو کە کچەکانی خان ناچاربوون لە ئەسپەکانیان دابەزن. منیش بەسەر حوشترەکەوە، توند خۆم گرتبوو. دیار بوو ئاودیو بوون لە گەردەنەی شەلەمییەوە کارێکی وا ئاسان نەبوو. گوێم لێ بوو عەلی خان چەند قسەیەکی کرد، گوێمان لە دەنگی یەکتری بوو، بەڵام لە بەر تەمتومان و تاریکی چاومان لە هیچ نەبوو. شەوێکی سەخت و ترسناکمان لە پێش بوو، لە هەموو تەمەنمدا شەوی وا ناخۆشم نەبینیوە. خان بڕیاری وەستانیدا، خۆ ئەگەر خان بڕیاری وەستانی نەدایە نەدەتوانرا زیاتر بەرەو پێشەوە بڕۆین، هۆزەکەی عەبدولعەلی بڵندیش کەمێک لە پێش ئێمەوە وەستابوون، گەیشتبووینە بەردەم تەنگەبەرەکە. بەفر و بایەکی زۆر بە هێز لە تەنگەکەوە بەرەو ڕوومان دەهات، هەروەکو ئەوەی موبەریدەیەکی گەورە دانرابێت. عەبدولعەلی بڵند و هۆزەکەی لە دووری سەد مەترێک لە تەنگەکەوە وەستابوون، هیچ شتێک بە چاو نەدەبینرا، تەنها گوێمان لە وڕە وڕی «با» بوو کە زۆر بەهێز لە دەرووەکەوە دەهات.

عەبدولعەلی بلند بالایەکی بەرزی هەبوو، هاواری کرد دامێنی کێوەکە لەو دیوەوە بە بەفر ساف بووە. هیچ پەناگەیەک نەبوو، لە هەمان کاتدا نەدەتوانرا بەرەو پێشەوە بڕۆین، دەیانگوت درێژی تەنگە بەرەکە (نیو فرسەخ = ٣,١٢کم) ڕێگا نابێت، ئەو دیوی تەنگەکە سنووری پارێزگای مازندەرانی ئەو سەردەمە بوو. لەو دیوو تەنگەکەوە هەوا گەرمتربوو، بەڵام کێ دەیتوانی لە تەنگەکە نزیک ببێتەوە؟ لایتەکەم لە کۆڵە پشتەکەم دەرکرد، دەفتەری یادەوەرییەکانم دۆزیـەوە، بەڵام دەست کێشەکانم بە دەستمەوە چەسپ ببوون. زۆر بە زەحمەت دەستکێشەکانم لە دەستم داکەند.

لە دەفتەری یادەوەرییەکانمدا نووسیم دونیا تاریکە، بەفر بە خێرایی دەبارێت، بایەکی بەهێزی دێت، کاتژمێر (٥:٢٠) ئێوارەیە، لە بەرزی (٩٨٠) مەتر لەڕووی دەریاوە، پلەی گەرمی دوازدە پلە ژێر سفرە. کاتێک لە حوشترەکە دابەزیم هەستم بە ئازارێکی زۆری ئەژنۆم دەکرد. خەریکبوو بە سەر زەویدا بکەوم. سەرما کاری تێکردبووم. باران گیرەکەی جەوهەر خانم زۆر باش بوو، بەڵام ئەو سەرمایەی نەدەگێڕایەوە.

لەدۆخێکی ئاوا نالەباردا هەر کەسە و لە بیری خۆیدایە، بەڵام ئێمە لەو کات و شوێنەدا هەمووومان لە بیری یەکتریدا بووین. پیاوەکان هەوڵیاندەدا ڕەشماڵەکان هەڵبدەن، بەڵام «با»کە نەیدەهێشت. حاجی ڕۆستەم ڕەشماڵێکی بە گەنجەکان بڵاو کردبووەوە، گوتی ژنەکان و منداڵەکان بچنە ژێر ڕەشماڵەکەوە. ڕەشماڵێک کە بە تەواوی هەڵنەدرا بوو ژمارەیەک ژن و منداڵ لەتاو سەرما بەپەلە چوونە ژێری، ڕەشماڵەکە لەسەر سەریان بوو، ئەوانەی چووبوونە ژێری بەهۆی قورسی ڕەشماڵەکەوە تەنگە نەفەس بوون، بۆیە خێرا لە ژێری هاتنە دەرەوە.

هەوڵمدا کارێک بکەم، بۆیە چەند منداڵێکی بچووکم لە دەوری خۆم کۆکردەوە. منداڵانی (٧-١٠) ساڵم بانگکرد و گوتم وەرن بۆ ئێرە. ناوی زۆربەیانم دەزانی، وەک گوڵپەری، گوڵئەختەر، زەینەب، فاتمە، مەرزیە، ڕۆستەم، عەلی ڕەزا، عەلی ئەکبەر، ڕەسـوڵ و «یەلە»، دە دوانـزە منداڵی بچووک لێم کۆبوونەوە. وام بە بیردا هات هەر چۆنێک بێت، ئەم منداڵانە دەبێت بجوڵێن، دەنا سەرما دەیانبەستێت. منداڵەکان جلوبەرگی زۆر گەرمیان لە بەردا نەبوو. سێ چوار منداڵ خەریکبوو ڕەقدەبوونەوە. بارانگیرەکەی جەوهەر خانمم لە بەری خۆم داکەند و دام بەسەر ئەو منداڵانەدا، پاش چەند خولەکێک خەریکبوو منیش لە سەرما پەکم بکەوێت، کیسە خەوەکەم دەرکرد، کیسە خەوەکەم ئەمریکی بوو لە مەیدانی گومرگی تاران کڕیبووم. کیسە خەوێک بوو تایبەت بوو بە جەنگ، بە چەند جۆرێک بەکار دەهات، شەش دانە زنجیری هەبوو.

لە سەرمادا پەنجەکانم لە جووڵە کەوتبوون. هەر چۆنێک بوو وەک چاکەتم لێکرد و کردمە بەرم، لە بارانگیرەکە گەرمتر بوو، ئەو کیسە خەوە ڕزگاریکردم، بەڵام قاچ و دەموچاوم بەستبووی. هەوڵی پیاوەکان بۆ ڕەشماڵ هەڵدان هیچ سوودی نەبوو. دونیا بەزوویی تاریک داهات، باکەش زۆر بەهێزی بوو، هەموو خەریکبوو پەکمان بکەوێت. لە بەیانییەوە کەس هیچی نەخوارد بوو. عەبدولعەلی بڵند هاواری کرد حوشترەکان بهێنن، ئەو فەرمانی دا کە حوشترەکان بهێنن بە بازنەیی بیان خەوێنن. چەند بازنەیەکیان بە حوشتر دروستکرد. هەر (٦-٨) حوشترێک شێوەی بازنەیەکیان پێدروست کردن. تەنها یەک داریان لە زەوی چەقاند. پاشان بە هاوکاری عەبدال و برزوو و غەفار و حاجی ڕۆستەم توانیان ڕەشماڵێک سواری دارە چەقاوەکە بکەن و یەکەم ڕەشماڵیان هەڵدا. حوشترە کانیش کەوتنە ناو ڕەشماڵەکەوە، پەتی چوار دەوری ڕەشماڵەکەشیان بە قاچی حوشترەکانەوە بەستەوە. تەنها یەک دارێک لە ژێر ڕەشماڵەکەدا بوو.

بەفر و با زۆر بە توندی لە ڕەشماڵەکەیدەدا، بە زوویی منداڵەکانیان هێنایە نێو ڕەشماڵەکەوە. عەلی خان گوتی هەرچی زووە لە نێو ڕەشماڵەکەدا ئاگر بکەنەوە. کۆمەڵەکەی عەبدولعەلی‌یش بە هەمان شێوە ڕەشماڵێکیان هەڵدا. وام هەست دەکرد کە ئەو شەوە لەنێو ڕەشماڵەکەدا لە سەرماندا ڕق دەبمەوە و دەمرم. هیچ دارێک نەبوو تاکو ئاگری پێبکەینەوە و بیسوتێنین، بۆیە خان بڕیاریدا کە دیرەگی ڕەشماڵەکان بهێنن و بیان سوتێنن. نزیکەی دووسەد دیرەک لە چەند حوشترێک بارکرا بوون کوڕەکان بە خێرایی ڕۆیشتن تا دیرەگەکان بهێنن. چەند فانۆسێک پەیدابوو نەوتی فانۆسێکیان بەتاڵ کرد و کردیان بە دیرەگەکەدا ئاگریان تێبەردا، ئیتر ئاگر کرایەوە و دەوریان لێدا.

کە ئاگرەکە کرایەوە ویستم کڕنوشی بۆ بەرم، ویستم سەری ڕێز لە ئاست ئەو بەهرەیەی خودای گەورەدا نەوی بکەم، بەڕاستی تێگەیشتم کە بۆچی باپیرە گەورەی ئێمە ئاگری بە پیرۆز زانیوە؟ پێویستە لەم سەرما زۆرە و بەفر و بایەدا ڕێزێکی زۆر بۆ پیرۆزی ئاگر دابنێین. ڕەشماڵێکی تریش بەهەمان شێوە هەڵدرابوو. حوشترەکان لەژێر ڕەشماڵدا بوون. ئەم ئاژەڵە هێمن و لەسەر خۆیە هەڵمی لووتیان گەرمی بەخشبووە نێو ڕەشماڵەکە. هەندێک لە ژن و منداڵانی نێو ڕەشماڵەکەی ئێمە چوون بۆ ڕەشماڵەکەی تر و لای ئێمە کەمێک چۆڵ بوو. منیش بە دیار ئاگرەکەوە دانیشتبووم، تاکو ئەو کاتە هەستم بەوە نەکردبوو کە لە سەر بەفرەکە دانیشتووم. مەنوچەهر گوتی با بەفری نێو ڕەشماڵەکە فڕێ بدەینە دەرەوە. بە هەموومان بەفرەکەمان فڕێدایە دەرەوە.

ناو ڕەشماڵەکە زۆر سارد و تەڕ بوو. دەبوو کارێک بکەم تاکو کەمێک گەرمم

ببێتەوە. هێشتا حوشترەکان بارەکانیان پێوە بوو کەسێک نەبوو بارەکانیان لێبکاتەوە و جەواڵەکانیان بەتاڵ بکات. لە ڕەشماڵەکەدا هەر کەسە و هەر شتێکی بەردەستکەوتبوو دابووی بەسەر خۆیدا. منیش لەسەر خورجێنێک دانیشتبووم پشتم بە حوشترەکەوە دابوو، هەستمکرد خەریکە پشتم گەرم دەبێتەوە. گوێم لە قۆڕە قۆڕی ناو سکی ئەو حوشترە بەستەزمانانە بوو. ئەم ئاژەڵە داماوانە شەو و ڕۆژێک بوو هیچ شتێکیان نەخوارد بوو. عەلی خان خەمناک و کەسیرە لە ژێر ڕووناکیی چرایەکدا بێدەنگ دانیشتبوو. ئەو دەیویست شەڕ لەگەڵ سروشتدا بکات. هەر کاتێک کەمێک گەرم دەبووەوە دەڕۆیشتە دەرەوە، تا ئاگاداری ئاژەڵەکان بێت. لە ڕەشماڵی عەبدولعەلی بڵندەوە هاوار پەیدا بوو کە مەڕەکان خەریکن مرداردەبنەوە. ئەو بەستەزمانانە چەند ڕۆژ بوو هیچیان نەخواردبوو. لە بەیانی زووەوە تا ئەو کاتە چل کیلۆ مەتر ڕێگەیان بڕی بوو. ئەو هەموو ڕێگەیە و برسێتی و سەرما ئەو ئاژەڵانەیان لە پەلوپۆ خستبوو. شوانەکان نەیانتوانی بوو مێگەلە مەڕەکە لە تەنگەکە ئاودیو بکەن. خۆشیان بە کەپەنکەکانیانەوە لەگەڵ سەرما لە جەنگدا بوون. بەو شەوە تاریکە دەنگی لورە لوری گورگ و وژە وژی با، ئاوێتەی یەکتری ببوون. سەگەکانیش حەپە حەپیان بوو. بە بەردەوامی مێگەلە مەڕ لەدواوە دەهاتن. حاجی ڕۆستەم لەتاو سەرما خۆیکرد بەنێو ڕەشماڵەکەدا، جێگایان بۆ کردەوە تا بێتە لای ئاگرەوە. گوتی وابزانم ماڵوێران بووین، تاکو بەیانی یەک مەڕ بە زیندوویی نا مێنێت. شوانەکان دەڵێن هەر مەڕە و لە ڕێگادا مردار دەبێتەوە. پەری خانم هەڵساو لێفەیەکی لە خۆی ئالاند و لە ڕەشماڵەکە ڕۆشتە دەرەوە، دوای ئەو عەلی خانیش ڕۆیشتە دەرەوە. منیش ویستم گەرمیپێوەکەم هەڵبگرم و بڕۆمە دەرەوە، کیسە خەوەکەم وەک چاکەت لەبەر کردبوو، دەستەکانم لە نێویدا گیریان خواردبوو، بە مەنوچەهرم گوت بەڵکو ئەو زنجیرە بچووکانەی سەر کیسە خەوەکەم بۆ بکەیتەوە. ئەو منداڵە دەستەکانی لە گۆ کەوتبوون، توانای جووڵەیان نەمابوو. بە هەزار زەحمەت توانی یەکێک لە زنجیرەکان بکاتەوە. زنجیرەکەی تریش جەوهەر خانم بۆی کردمەوە، ئیتر دەستەکانم ئازاد بوون و لە ڕەشماڵەکە چوومە دەرەوە. تەنها چەند خولەکێک توانیم لە دەرەوە بمێنمەوە و بەزوویی گەڕامەوە نێو ڕەشماڵەکە، لە دەفتەرەکەمدا نووسیم کاتژمێر (٩:٥) شەوە بەفر و بایەکی بەهێزە پلەی گەرما هەژدە پلەی ژێر سفرە لە بەرزیی (٩٨٥) مەتر لەئاستی ڕووی دەریاوە.

ئاگری ناو ڕەشماڵەکە کەم بوو، نیلۆفەر و گوڵخەندان لەگەڵ دایکیاندا سەرپەرشتیی ئاگرەکەیان دەکرد. خۆ ئەگەر هەموو دارەکانیان بە زوویی بسووتاندایە ئەوا زوو

تەواو دەبوون و گڕی ئاگرەکەش سەردەکەوت و ڕەشماڵەکەی دەسووتاند. بە دایکی نیلۆفەریان دەگوت خانم جان. نازانم ئەو ناوی ڕاستەقینەی خۆی چی بوو؟ ئەو داوای کرد کە هەرچەند کەسێک لە بەردمی خۆیاندا ئاگر بکەنەوە، ئەو بە هەر چەند کەسێک و کەمێک دار و ئاگری پێدان و گوتی هەتا بەیانی دەبێت بەم کەمە دار و ئاگرە ئیدارە بکەن.

بە کردنەوەی چەند ئاگرێک لە نێو ڕەشماڵەکەدا گەرمی نێو ڕەشماڵەکە زیادیکرد. ئەو ڕەشماڵەی کە من تێیدابووم، بەو ئاگرە کەمە پلەی گەرما بەرزبووەوە و گەیشتە شەش پلەی ژێر سفر. لەو سەرمایەدا دانیشتن بەبێ جووڵە، واتە بوون بە سەهۆڵ. پەری خانم هاتەوە نێو ڕەشماڵەکە و گوتی تا بەیانی یەک مەڕ نامێنێت و هەموویان دەبن بە سەهۆڵ. یەکڕاست هاتە لای منەوە و گوتی خۆت گەرم داپۆشە و لەسەر جەواڵێک دانیشت و پشتی بە حوشترەکەوە دا. دەستەکانی لە بەردەم منەوە برد بۆ لای ئاگرەکە و گوتی دەرەوە زۆر ساردە. گوتم پلەی گەرما لە دەرەوە هەژدە پلەی ژێر سفر بوو. جەوهەر خانم و خانم جان سەیریان دەکردین کە ئەو هاتوو لەلای منەوە دانیشت، بەڵام هیچ کەسێک هیچ قسەیەکی نەکرد. نزیکەی بیستوپێنج کەس لەژێر ئەو ڕەشماڵە بچووکەدا بووین.

پەری خانم دەستکێشی خوریی لە دەستدابوون، بەڵام دیاربوو کە دەستەکانی تەزیبوون، دەستی بە دەستکێشەکانەوە لەسەر ئاگرەکە ڕاگرتبوو، بەفری سەردەستکێشەکانی دەتوایەوە و دڵۆپ دڵۆپ ئاو دەتکایە نێو ئاگرەکەوە. پاش ئەوەی کەمێک گەرم بووەوە گوتی جەوهەر خانم، خانم جان هەموومان برسیمانە تکایە شتێک پەیدا بکەن با بیخۆین. هەموو شتەکان بەسەر یەکدا کەوتبوون و تێکەڵ ببوون، نەدەزانرا ئەو حوشترانەی لە دەوروبەری ڕەشماڵەکە نووستبوون هی کێ بوون؟ خورجێنی سەر حوشترەکان لەو ناوەدا کەوتبوون. پاشان خۆراکێک پەیدا بوو کە نان و ڕۆنی بەستو بوو. بەهۆی ئاگرەکەوە نانەکەمان گەرم کردەوە و خواردمان.

عەبدال کە لە ڕەشماڵەکەی ئێمەدا بوو لە سەرماندا کز لە گۆشەیەکدا دانیشتبوو، لێفەیەکی بەسەر خۆیدا کێشا بوو. فلوتێکی دەرکرد و دەستیکرد بە فلوت لێدان. فلوتەکەی دەنگێکی حەزینی هەبوو، ئەگەر تۆمارم بکردایە ڕەنگە براوەی دەیان پێشبڕکێ بووایە.

هەندێک لە یادەوەرییەکانم لە کوردستاندا، لەبەرگی دووەمی شازادەی حەمامدا نووسیوە. خوێندکارێکی تەمەن بیست ساڵ نامەیەکی بۆ ناردبووم، نووسیبووی بۆچی ئەوکاتە چەند وێنەیەکت نەگرتووە؟ ئەو خوێندکارە بە جۆرێک نامەکەی نووسیبوو

من تێگەیشتم ئەو وا بیری کردۆتەوە، کە ئەو کاتەش کامێرا دیجیتاڵ و فلاش هەبووە. نەخێر، نەبوو. بەو شەوە و بە کامێرای مۆبیتەلی دوانزە فیلمی و بەو سارد و سەرمایە جێگای وێنە گرتن نەبوو. پەری خانیش نیگەرانی ئەسپەکەی بوو، گوتی ئەو ئاژەڵە بەستەزمانە ئەمشەو مرداردەبێتەوە. بە هاوکاری منداڵەکان ڕەشماڵێکی لە ئەسپەکەی ئالاند بوو. دەیگوت ئاژەڵەکان لەسەرماندا بێ جووڵە وەستاون.

عەلی خان بە لەرزەوە هاتەوە نێو ڕەشماڵەکە و گوتی تا بەیانی کارمان تەواو دەبێت، هیچ شتێک نامێنێت، ئەگەر خۆشمان نەمرین موعجیزەیە. لە ژێر ڕووناکی فانۆسەکەدا سەرنجم دابووە دەموچاوی عەلی خان، کاتێک بینی کچەکەی لە پاڵ مندا دانیشتووە چاوی بریسکەی دەدا، بەڵام نەمزانی بریسکەی چی بوو؟ سەری سوڕما بوو، یا خەمی دەخوارد، نازانم چی بوو؟ بەڵام لەو سەرمایەدا هیچی نەگوت. جەوهەر خانم گوتی خان ئەم شەو شەوێکی سەیرە. خان گوتی بەڵێ ئەم شەو جەژنی گورگەکانە. سەدان گورگ هێرشیان کردۆتە سەر مەڕە نیوە گیانەکان، نە شوانەکان و نە سەگەکان هیچیان پێناکرێت. خان گوتی بە شوانەکانم گوتووە گیانی خۆتان ڕزگار بکەن و خەمی مەڕەکانتان نەبێت.

خان خەریکبوو خۆی گەرم دەکردەوە. عەبدولعەلی بڵند هاتە ناو ڕەشماڵەکەوە و گوتی خان پێیان بڵێم هەموویان سەربڕن؟ مەڕەکان سەر بڕن و لاشەکانیان دەیبەستێت و پاشان دێین و دەیانبەین. عەلی خان پێکەنی و گوتی کێ سەریان بڕێت؟ چەند کەسمان هەیە؟ تازە مەڕەکان هەر یەکە و بەلایەکدا ڕۆیشتوون، خۆ لە شوێنێکدا کۆمەڵ نین، بەفر و باوبۆران مەڕەکانی بڵاوە پێکردووە. لەم بەفر و بایەدا هیچ شوانێک ناتوانێت مێگەلەکە کۆ بکاتەوە. لەم کەشە نالەبارەدا برۆ خۆت ڕزگار بکە، مەڕ ماڵی بایە و خۆت قایم بکە نەکەویت. لە ژێر ڕەشماڵەکانەوە و لە ژێر ملی حوشترەکانەوە با دەهاتە نێو ڕەشماڵەکەوە. چرکە دوای چرکە ژێر ڕەشماڵەکە سار تر دەبوو. خان گوتی کوڕەکان هەڵسن چەند مەڕێکی مرداروەبوو بە دەوری ڕەشماڵەکەوە بنێن تاکو «با» نەیاتە ناوەوە. دەبێت وا بکەن کە بای سارد نەیەتە ناوەوە. منیش خەریکبوو هەڵسم تا هاوکارییان بکەم، پەری خانم دەستیگرتم و دای نیشاندمەوە و گوتی موهەندیس کاری تۆ نییە، بە هەمان شێوە دەستیگرتبووم دەستی لە دەستکێشدا بوو توند دەستی دەگوشیم و گوتی موهەندیس ڕەنگە ئەم شەو هەموومان لەسەرمادا ڕەقبینەوە. تکایە لێم ببورە من هەڵەم کرد. منیش دووبارە دڵم بە خێرایی کەوتەوە لێدان.

جەوهەر خانم چاوی لێبوو کە دەستمان لە نێو دەستی یەکتردا بوو. بەو سارد و

سەرمایە پێکەنینم دەهات، گوتم تکایە هەرگیز بیر لە ڕابوردوو مەکەرەوە، زۆریش دڵنیام کە نامرین و ڕزگارمان دەبێت. نازانم عەلی خان چاوی لێبوو کەدەستمان خستبووە نێو دەستی یەکتری یان نا، بەڵام لانیکەم چەند کەسێک چاویان لێبوو. هەردووکمان دەستکێشمان لە دەستدا بوو، بەڵام دەستخستنە نێو دەست و گوشینی دەستەکان دڵەکان لەیەکتری نزیک دەکاتەوە. هیچ کەسێک لەو سەرمایەدا توانای ئەوەی نەبوو ئەو گەرمییە بەیەکتری ببەخشن، ڕەنگە هەندێکیان هەر خۆیان گیان و لەشیان گەرم بوو بێت. منداڵەکان خەریکبوون دەنووستن منیش «یەلە»م ونکردبوو لە غەفارم پرسی «یەلە» لەکوێیە؟ گوتی لە لای بیبی یە.

خان دەیگوت تا دەتوانن نەخەون، گەر دەشخەون با هەمووان بە یەکجار نەخەون، با چەند کەسێک ئێشک بگرن، تا دەتوانن لێفەکان بەسەر خۆتاندا بکێشن، لێفەکان بەو کەسانەدا بدەنەوە کە خەویان لێکەوتووە. هەستمکرد عەلی خان زۆردار و بێبەزەیی نییە، تێگەیشتم کە ئەو دەیەوێت ئەوانی تر داپۆشێت، خۆی چەند جارێک ڕۆیشتە دەرەوە هەر جارە و بە جۆرێک دەهاتەوە ژوورەوە. کات درەنگ ببوو، گفەگفی با کەمتر دەهات، کوڕەکان لاشەی مەڕە مرداربووەکانیان بە چواردەوری ڕەشماڵەکەوە نابوو، لورەی گورگ و حەپەی سەگەکان زیاتر دەگەیشتە گوێمان، برزوو لە دەرەوە هاتە ژوورەوە و گوتی مورتەزای هاوسەری بیبی مرد.

ئەو پیاوە زۆر بێهێز بوو بەرگەی ئەو هەموو ماندووبوون و سەرمایەی نەگرتبوو. خان گوتی هەر بە ڕاستی مرد! برزوو گوتی بەڵێ مرد! خان بە خێرایی لە جێگای خۆی هەڵسا، هەمووان بە دەنگی برزوو ڕاچڵەکین و هەستان، عەلی خان گوتی هەمووتان دانیشن کەس نەیاتە دەرەوە، کەسێک مردووە خۆ دەکەسی تر بە کوشت نادەم، لە جێگای خۆتان دانیشن. من توانای دانیشتنم نەمابوو، بۆیە بەخێرایی هەڵسام. پەری خانم گوتی حسێن دانیشە مەڕۆ، ئەمە یەکەم جار بوو پەری خانم بەناوی خۆمەوە بانگم بکات، گوتم دەڕۆم، پاش کەمێکی تر دەگەڕێمەوە.

کاتێک لە ڕەشماڵەکە چوومە دەرەوە وەک شمشێرێکی تیژ بەڕووومدا بهێنن وابوو. نێوانی هەردوو ڕەشماڵەکە پازدە مەتر زیاتر نەبوو، سەیرم کرد بەفر و باوبۆران هێواش بووەتەوە، بەڵام سەرماکە زیادیکرد بوو. بەردێک لە تەنیشت ڕەشماڵەکەوە بوو، گەرمیپێوەکەم لە سەر بەردەکە دانا، چەند حوشترێک لە نزیک خێمەکەوە وەستا بوون. ماوەی ئەو پازدە مەترەی نێوان ڕەشماڵەکان وەک لە نێو فرێزەر دابم وابوو. چوومە نێو ڕەشماڵەکەوە، ڕەشماڵەکەی ئەوان لە ڕەشماڵەکەی ئێمە ساردتر بوو. مورتەزا چۆن

دانیشتبوو هەر ئەو ها گیانی دەرچوو بوو. بیبی زۆر بەهێمنی دەگریا. سەرما بڕستی لە ئەویش بڕیبوو. هیچ کەسێک نەیدەزانی چیبکەین. خان لێفەیەکی هێنا و دای بە سەر لاشەی مورتەزادا و گوتی فاتیحا بخوێنن. لە کاتێکدا هەموومان لە سەرما دانە چۆقەمان پێکەوتبوو، فاتیحامان خوێند. خان گوتی دەوری ڕەشماڵەکان باش قایم بکەن و بچن چەند مەڕێکی مردارەوەبوو بهێنن بەدەوری خێمەکەدا دایانبنێن، ئاگرەکەش کەمێک زیاد بکەن، بە ئومێدی خودا هەموومان سەلامەت دەبین. ماوەی (٧-٨) خولەک دانیشتم، پەری خانم، گوڵخەندان، جەوهەر خانم و خانم جان هاتن. لەڕەشماڵەکە دا جێگای کەسی تری نەدەبووەوە، «یەلە»ش لە تەنیشت بیبی‌یەوە وەستابوو. سەرەخۆشیم لە بیبی کرد و لە ڕەشماڵەکە هاتمە دەرەوە. کات نیوەشەو بوو، باکە کەمێک هێواش ببووەوە، بەڵام سەرماکە زیادیکرد بوو. ڕۆیشتم گەرمپێوەکەم هێناو لایتەکەم لێدا سەیرم کرد هەشوهەوا بیست‌ویەک پلە ژێر سفرە، گوتم بە ڕاستی هەقە سەرما ڕەقمان بکاتەوە. چوومەوە نێو ڕەشماڵەکە و سەیرم کرد لەنێو ڕەشماڵەکەدا پلەی گەرمی هەشت ی ژێر سفرە. لەچاو دەرەوەدا، گەرمبوو.

گەنجەکان زیاتر لە پەنجا مەڕی مردارەوەبوویان بە چوار دەوری ڕەشماڵەکەدا دانا، دەمانویست خۆمان لە نێو سەهۆڵدا قایم بکەین تاکو نەبین بە سەهۆڵ. خان و کچەکانیش گەڕانەوە بۆ ژێر ڕەشماڵەکە، پەری خانم بێ هیچ شەرم و شکۆیەک دووبارە هات و لەلامەوە دانیشتەوە.

خان گوتی چەند کەسێکتان بخەون و چەند کەسێکتان ئێشکبگرن، ڕووی کردە من و گوتی موهەندیس و پەری با پێکەوە ئێشکبگرن، هێشتا قسەکانی تەواو نەکردبوو، کە برزوو هاتە ژوورەوە، چوار پارچە دڵ و سی و جگەری بەدەستەوە بوو، گوتی خان مەڕەکان خەریکە هەموویان مرداردەبنەوە، بۆیە چوار مەڕم سەر بڕی و سکیانم هەڵدڕی و سی و جگەر و دڵەکەیانم دەرکرد، فەرموون بخۆن با گەرم ببنەوە. خان گوتی کارێکی باشت کرد، بڕۆ دڵ و جگەری تر ببە بۆ ڕەشماڵەکەی تریش. خان فەرەنجیەکەی خۆی دا بە برزوو گوتی بڕۆ هەموو خەڵکەکە تێر بکە، با تێر بخۆن، ئەگەر سکیان تێر بێت سەرما کەمتر کاریان تێدەکات. ئاگرەکەیان زیاد کرد و دڵ و جگەرەکەیان پارچە پارچە کرد و هەندێک نانیان لە خورجینەکان دەرهێنا و پەری پارچە جگەرەکانی کردە نێو تاوەیەکەوە. دەستکێشە سپیەکانیشی هەمووی خوێناوی ببوو. دڵ و جگەری خستە سەر ئاگر و برژاندی و هەموو دەستمان کرد بە خواردن، هەرگیز خواردنی وا بەلەزەت و خۆشم نەخواردووە.

لە ناکاو لایەکی ڕەشماڵەکە کرایەوە و پیاوێک هاتە ژوورەوە، پیاوەکە فەرەنجییەکی لە خۆی ئالآند بوو، دەموو چاویشی داپۆشی بوو، لەناو خێمەکەدا قیت ڕاوەستا، بەبێ ئەوەی ورتەی لێوە بێت. خان گوتی ئەردۆ زیندوویت؟ ئەردۆ کەوتە سەر زەوی، بەخێرایی هێنایانە نزیک ئاگرەکە و پێڵاوەکانیان لە پێی داکەند، پێڵاو و پێستی قاچی هەمووی پێکەوە ببوون بە سەهۆڵ، فەرەنجیەکەی هەمووی بەفر بوو لەبەریان داکەند، نزیکیان کردەوە لە ئاگرەکە و لێفەیەکیان پێدادا. خان گوتی قاچەکانی لە ئاگرەکە دوور بخەنەوە و خێرا هەندێک ئاو گەرم بکەن. خان بە دەستی خۆی بە ئاوە گەرمەکەوە بە هێواشی دەستیکرد بە شێلانی قاچەکانی و هەموو گیانی. جەوهەر خانم و پەری خانم دەستیانکرد بە شێلانی دەستەکانی. لەناو ئەو ڕەشماڵە نیوە تاریکەدا کە تەنها چرایەکی نەوتی ڕوناکی کردبووەوە چ میهرەبانیەکم بینی لەلایەن عەلی خان و کچەکانی و هەموو ئەو خەڵکە سەرما بردووەوە؟

ئەردۆ هیچی نەدەگوت، بێهۆش کەوتبوو، جەوهەر خانم گوتی پێویستە گەرم داپۆشین. گوڵخەندان دانەویەوە و ئەردۆی کردە باوەشی. ئەم کچە ئەو شوانەی وەک منداڵێک لە باوەش گرت تا بە تەوای گەرمی ببێتەوە. پاشان ئەردۆیان بە لێفە و نوێنی گەرم داپۆشی. خان چەند دیرەگە ڕەشماڵێکی شکاند و هەر لە نێو ڕەشماڵەکەدا لە پێنج جێگای تردا ئاگری کردەوە. ئەردۆ کاتژمێر سێی بەرەبەیان چاوەکانی هەڵهێنا. گەرمیپێوەکەم لەناو ڕەشماڵەکەدا چوار پلەی ژێر سفری پیشاندا. پەری خانم کەمێک ئاوی گەرمی کردە گەروی ئەردۆوە، ئەردۆ هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشا و ڕووی کردە عەلی خان و پێی گوت، من پێم نەگوتی هەوا زۆر سارد دەبێت، پێویستە زووتر بڕۆین. خان گوتی ئەردۆ هێمن بەرەوە، تاکو بەیانی تەنها مەڕێک نامێنێت. ئەردۆ دایە پرمەی گریان و گوتی مەڕەکان وەک و گەڵای دار هەڵدەوەرن و دەکەونە سەر بەفرەکە، برسیەتی و سەرما و بەفر و با هەموو مەڕەکانی لەناوبرد، خۆ ئەگەر سەرما و بەفر و با نەبووایە هێزێکیان تێدا دەما. خۆزگە ئەمڕۆ هەر لە دەوری هەوارەکە بووینایە، خۆ ئەگەر بە برسێتی بمانایەتەوە باشتربوو لەوەی کە ماندووش ببین و سەرماش بەم دەردەمان بەرێت، لەوێ بووینایە لەناو ڕەشماڵەکاندا مەڕەکانیش جێیان دەبووەوە. عەلی خان گوتی تۆ لەمەڕەکان گەڕێ، ئەی شوانەکان چیان بەسەر هات و لەکوێن؟ ئەردۆ گوتی نازانم. خان گوتی کەسێک نەیتوانی ئاگر بکاتەوە؟ ئەردۆ گوتی خۆ دار نەبوو، «با»کەش نەیدەهێشت شخارتە گڕ بگرێت. خان زۆر خەمی لە شوانەکان دەخوارد. ئەردۆ گوتی محسنۆی شوان هەر ئێوارە دوو مەڕی سەر بڕی و

پێستەکەیانی داماڵی و دای بەسەر فەرەنجیەکەی خۆیدا. خان گوتی خۆزگە تۆش ئەو کارەت بکردایە. ئەردۆ گوتی بە خودا یەکەمجار دڵم نەهات و دواییش دەستم هێزی تیانەما بوو نەمدەتوانی. جەوهەر خانم پارچە جگەرێکی خستە نێو تاوەکەوە و دای بە ئەردۆ. عەلی خان سەیری قاچەکانی ئەردۆی دەکرد، بەهێواشی بە پەری خانمی گوت ئەو قاچانەی جارێکی تر نابنەوە بە قاچ، بەجۆرێک پەنجەی قاچەکانی سەرما بردوونی ئێستا هیچ هەست بە ئازار ناکات، پاش کاتژمێرێکی تر کە پەنجەکانی گەرم بوونەوە ئەو کاتە هاواری دەگاتە ئاسمان.

هەندێک کەس نووستبوون، منیش خەوم زڕابوو. ئەردۆ لە سەر جەواڵێک ڕاکشابوو، ژێری هەمووی چاڵوچۆڵ و وردە بەرد بوو، وەک هەموو ئەوانی تر. لێفەیەکیان دا بە سەریدا و خەوی لێکەوت. خانیش هەر بە دانیشتنەوە لێفەیەکی بەسەر خۆیدا کێشا و خەوی لێکەوت، جەوهەر خانم و خانم جان بەخەبەر بوون. جەوهەر خانم سەری نووستووەکانی دادەپۆشی. عەبدال و برزوو ڕۆیشتبوونە دەرەوە، دیار بوو ڕۆشتبوون بۆ ڕەشماڵەکەی تر. پەری خانم چەند خولەکێک ڕۆیشتە دەرەوە و بەزوویی گەڕایەوە و گوتی حوشترەکان هەموو خەریکە (یەخ) دەبن و حوشترە وەستاوەکانیش خەریکە وشک دەبنەوە. منیش کاری سەر ئاوم هەبوو، بەڵام بەو سەرمایە چۆن بڕۆیشتمایە؟ ناچار هەڵسام و لێفەیەکم بەسەری خۆمدا داو گەرمیپێوەکەشم هەڵگرت و لەگەڵ خۆمدا بردم و لەسەر هەمان بەردی پێشوو جێگیرم کرد. لە دەرەوە تەنها چوار خولەک توانیم بمێنمەوە. پلەی گەرمی، بیستودوو پلە ژێر سفر بوو، هاتمەوە نێو ڕەشماڵەکە پشتم دا بە پشتی حوشترەکەوە و قاچەکانم کەمێک بەرەو لای ئەو کەسانە درێژ کرد کە نووستبوون،. پەری خانم هات و لە تەنیشتمەوە دانیشت و لێفەکەی بەسەر خۆیدا کێشا و گوتی موهەندیس زۆر خەمی شوانەکانمە، ئێستا لەو چۆڵەوانیە لەسەرمادا گیانیان دەرچووە. پەری گوتی خەوم دێت، ڕۆیشتە ئەولاتر بۆ لای باوەژنەکانی و لێفەکەی لەخۆیەوە پێچا و نووست. جەوهەر خانمیش لبادێکی پێدادا. نازانم منیش کەی خەوم لێکەوت. کاتێک بەئاگاهاتم دونیا ڕووناک ببووەوە. جەوهەر خانم خەریکبوو ئاگرەکەی خۆشدەکرد. کەمێک خۆم بەرزکردەوە و سڵاوم لێکرد و سەیرێکی ئەملاولای خۆمم کرد. ڕووناکی فانۆسەکە کەم ببوو، بەڵام ناو ڕەشماڵەکە باشتر دەبینرا. جەوهەر خانم تێگەیشت چاو بۆ کەسێک دەگێڕم، بە دەست ئاماژەیەکی بۆ کردم، بینیم پەری خانم لە ژێر لێفە و لبادێکدا بە تەنیشت خوشکەکانیەوە نووستووە. جەوهەر خانم گوتی موهەندیس شەوێکی ناخۆشمان بە ڕێکرد. ئێستا دەبێت بزانم منداڵەکان لەکوێن؟

خەڵکەکانی تر چ بەڵایەکیان بەسەر هاتووە! هیچ هەواڵێک لە ئەسەد، حەیدەر، کەڕار، فەرهاد و منداڵەکانی تر نازانم، خودا دەرگای خێریان لێ بکاتەوە.

لە دەرەوەی ڕەشماڵەکە، بوو بە هاوار هاوار.. دەنگی شیوەن و گریان لە ڕەشماڵەکەی عەبدولعەلی بڵندەوە دەهات. لەژێر لێفەکە هاتمە دەرەوە پشتم و ئەژنۆم ئازاری زۆریان هەبوو. برینەکەی نێو چاوانم وەک ئەوی بیبەری تیژی پێدا کرابێت، دەبرژایەوە. سەرما کاری لە ئێسقانەکانم کردبوو. دەنگی شیوەنەکە زیاتر بوو منیش خۆم گەیاندە دەرگای ڕەشماڵەکە هەر وەک ئەوی چووبێتمە نێو فرێزەرەوە، بەرزی بەفرەکە یەک مەتر زیاتر بوو. دەوروبەری ڕەشماڵەکەی عەبدولعەلی قەرەباڵغ بوو. بینیم دایکێک و منداڵە چوار ساڵەکەی لە نێو بەفرەکەدا مردبوون، نیوە شەو منداڵەکە کاری سەر ئاوی هەبووە، کاتێک دایکەکە منداڵەکەی لە ڕەشماڵەکە هێناوەتە دەرەوە، لەبەر تاریکی، بەرپێی خۆی نەبینییوە، کەوتووە بە زەویدا و سنگی بەر بەردێک کەوتووە، ڕەنگە بەو کەوتنە بێهۆش بوو بێت، تەرمی منداڵەکەش چوار مەتر دوور لە خۆی کەوتبوو. بەو تاریکی و سەرمایە هیچ کەسێک ئاگادار نەببوو کە ئەو دایک و منداڵە نەگەڕاونەتەوە بۆ نێو ڕەشماڵەکە. ئەو ژنە، پیاوەکەشی لەوێ نەبوو، لەگەڵ مێگەلە مەڕەکەدا ڕۆشتبوو. ژنەکە نەیتوانی بوو لەو هەڵدێرەوە سەربکەوێتەوە یا هاوارێک بکات. ئیتر لەو بارەیەوە هەر کەسە و قسەیەکی دەکرد. سەرماکە بە جۆرێک بوو نەدەتوانرا لەدەرەوەی ڕەشماڵەکە بووەستیت، ناو ڕەشماڵەکەش جمەی دەهات، حوشترەکانیش نووستبوون نەیاندەویست هەڵسن. سەرێکم لە ڕەشماڵی بیبی دا، بینیم بیبی هێشتا لە تەنیشت تەرمی هاوسەرەکەیەوە دانیشتووە. مورتەزا بە جۆرێک دانیشتبوو وەک پاڵی بە ڕەشماڵەکەوە دابێت، وابوو. جلەکانیان لە بەری داکەندبوو، تەنها کراسێکی لەبەردا مابوو. بیبی گوتی موهەندیس چاک بێکەس بووم. منیش لەلایەوە دانیشتم، گوتی لێفەیەک بخەرە پاڵ پشتت. لێفەیەک لەوێ بوو دام بە سەر خۆمدا، گوتم بیبی خەم مەخۆ، تەمەنی درێژی بۆ تۆ جێهێشتبێت. گوتی من تەمەنی درێژم بۆ چییە؟ پیاوەکەم مرد، ئێمە نزیکەی شەست ساڵ پێکەوە بووین، بەیەکەوە ژیانمان گوزەراند خەم و شادیم لەگەڵ ئەو بووە. ئێستا لەم سەهۆڵبەندانەدا چی لە تەرمەکەی بکەم؟ خۆ ناتوانین ئەسپەردەی خاکیشی بکەین. گوتم خەم مەخۆ، ئەم پیاوانە کارێک دەکەن. پێمگوت ئەی بۆچی تەرمەکەت ڕووت کردۆتەوە؟ ئەی کوا جلەکانی لە کوێن؟ گوتی برزوو خەریکبوو لە سەرما ڕەق بێتەوە، منیش جلوبەرگ و چاکەت و دەستکێشەکانی مورتەزام دا بە برزوو، ئەو منداڵە زۆر هاوکاری ئێمەی کردووە، ئەو هاوکاری هەمووانی دەکرد ئەگەر دوێنێ شەو ئەو

نەبووایە ڕەنگە منیش بمردمایە، بینیت چۆن مەڕەکانی سەر بڕیوو جەرگ و دڵەکەی دا بەو خەڵکە تا بیخۆن... چەند ساڵێک لەوەو دوا لە برزووم پرسی بە ڕاستی لەو شەوەدا چۆن ئەو مەڕانەت سەر بڕی؟ گوتی موهەندیس چەقۆیەکی گەورەم دەکرد بە شاڕەگی ملیاندا و سەرم دەبڕین و پاشان سکیانم هەڵدەدڕی جەرگ و دڵەکەم ڕادەکێشایە دەرەوە.

ڕەشماڵەکەی بیبی لە ڕەشماڵەکەی ئێمە ساردتر بوو، یەک پارچە سەهۆڵ بوو، بەفرگرێک بوو بۆخۆی. بیبی لێفەکەی لە خۆی ئالاند بوو، گوتی موهەندیس برینەکانت چاک بوونەوە، گوتم بیبی هەموو گیانم ئازاری هەیە، برینی نێو چاوانم دەسوتێتەوە، لێمپرسی بیبی هەرگیز لە تەمەندا سەرمای بەم جۆرەت بینیوە؟ گوتی نەخێر هەرگیز نەمدیوە. کەی ئەم سەرمایە لێرە هەبوویێت، ئەو کاتە ئێمە لێرە نەبووین، ئنجا گوتی ساڵانی پێشوو، لەم کاتەدا ئێمە لە تورکمان سەحرا بووین، ئەم سەرمایە تایبەتە، ئەم سەرمایە بەڵایەکە و خودا ناردوویەتی، ئێمە تاوانێکمان کردووە، خودا بمانبەخشێت، هەڵبەت تاوانێکمان کردووە بۆیە خودا ئەم بەڵایەی بۆ ناردوین، ئێستاش ئەگەر عەلی خان و پیاوەکان بیرێک نەکەنەوە هەموومان لێرەدا دەمرین، خۆ دار و کۆتەرەش نییە تا ئاگر بکەینەوە، دیرەگی ڕەشماڵەکانیش وا تەواو بوون. چەند کەسێک هاتنە نێو ڕەشماڵەکەوە، نەیانتوانی بوو لە سەرمای دەرەوە بووەستن. من خوداحافیزییم لە بیبی کرد و گەڕامەوە بۆ ڕەشماڵەکەی خۆمان. بیرم هاتەوە کە «یەلە»م لە ڕەشماڵەکەی بیبی دا نەبینی، ئەی ئەو منداڵە چی لێهاتووە؟ ئەوەندە سەرما بوو کە نەمتوانی بگەڕێمەوە بۆ ڕەشماڵەکەی بیبی و هەواڵی «یەلە» بپرسم. کە چوومە ژوورەوە سەیرم کرد هەموویان بە خەبەربوون. ئاگرەکەیان کەمێک خۆشکردبوو، بەفریان دەهێنا و دەیانکردە قابلەمەوە و دەیانتواندەوە، دەیانویست ئاو گەرم بکەن. عەلی خان و عەبدولعەلی بڵند هاتنە نێو ڕەشماڵەکەوە، ئەو دوو پیاوە نەیاندەزانی چیبکەن. عەلی خان گوتی پێویستە کەسێک بنێرین بۆ شائاباد و داوای هاوکاری لە سەربازەکان بکەین.

هەواڵ هات کە ژمارەیەکی زۆر لە ئەسپەکانیش مرداربوونەتەوە. نیلۆفەر سەیرێکی دەرەوەی کرد بە گریانەوە هاتەوە و گوتی ئەسپی گوڵخەندان کەوتۆتە سەر زەوی. گەنجەکان هەواڵیان هێنا کە ئەو دەشتە پڕ بووە لە مەڕی مردارەوەبوو. عەلی خان گوتی ئەی هەواڵی شوانەکان، هیچ هەواڵێک لە شوانەکان نەبوو، هیچ کەس نەیدەتوانی پێنجسەد مەتر لە ڕەشماڵەکان دوور بکەوێتەوە. خان هاواری کرد، کوا برزوو لە کوێیە ئادەی بە زوویی بانگی بکەن؟ فەریبورز ڕۆیشت و برزووی هێنا. خان گوتی برزوو

دەتوانیت بە سواری حوشتر بڕۆیت بۆ شائاباد و داوای هاوکاری لە بنکە سەربازییەکە بکەیت؟ برزوو گوتی بەڵێ خان دەتوانم! خان ڕووی کردە جەوهەر خانم و گوتی جلوبەرگی گەرممان هەیە. جەوهەر خانم گوتی ئەگەر لە نێو خورجێنەکەدا هەبێت، نازانم لە کوێیە؟ چەند پارچە جلوبەرگی گەرم و ئەستووریان بۆ برزوو پەیدا کرد. برزوو ئەوەندەی قوماش لە دەوری سەری ئاڵاندبوو کەڵلەی سەری لە قابلەمەیەکی گەورە دەچوو. برزوو سواری حوشترێک بوو، بەرەو شائاباد کەوتەڕێ. گوڵخەندان دەستیکرد بە گریان و هاوارکردن کە ئەسپەکەی مردووە. بۆ یەکەمین جار بوو بینیم کە عەلی خان دەنگی بەرز کردەوە و گوتی کچم تا ئێستا سێ کەس مردوون، براکانت هەواڵیان نییەو کەس نازانێت لە کوێن؟ سێ هەوار لە هۆزەکەمان دیار نییە چیان بە سەر هاتووە، کەچی ئێستا تۆ بۆ ئەسپێک دەگریت.

پەری خانم گوتی خۆ ئێمە لە ڕادارەکەوە زۆر نزیکین ئەگەر چەند فیشەکێک ڕووە و ئەوان بتەقێنین ڕەنگە تێبگەن و بێن و بزانن چی ڕوویداوە؟ خان گوتی بیرێکی خراپ نییە. پەری خانم ڕووی کردە من و گوتی حسێن تفەنگەکەم بدەرێ. باوکیشی سەیری من و پەری خانمی دەکرد، دەموچاوم بەو سەرمایە سوور ببووەوە، لە دڵی خۆمدا گوتم موهەندیس لە کوێ و حسێن لە کوێ؟. لە ناکاو دەنگی برزوو هات هێشتا پێنج خولەک نەبوو ڕۆیشتبوو، گەڕایەوە و هاواری دەکرد هاتن.. بە هانامانەوە هاتن! وا ئۆتۆمبێلەکان بەرەو ئێرە دێن. دەنگی ئۆتۆمبێلەکان دەهات. هەموومان لە ڕەشماڵەکانەوە هاتبوونە دەرەوە. کە سەیرمان کرد شەش ئۆتۆمبێل بەرەو لای ئێمە دەهاتن. پەری خانم هاواریکرد تفەنگەکان... تفەنگەکان... پەری خانم و نیلۆفەر و مەنوچەهر و عەبدال و غەفار و هەر کەسە و پەلاماری تفەنگێکیان داو دەیانویست لە جێگایەکدا حەشاریان بدەن. خان هاواری کرد و گوتی بە زوویی بیان بەنە پشتی ئەو بەردە گەورەیە حەشاریان بدەن. ئۆتۆمبێلەکان نزیک ببوونەوە. دەنگیان بە باشی دەگەیشتە لای ئێمە. پەری خانم و ئەوانی تر تفەنگەکانیان حەشاردا و گەڕانەوە. عەلی خان گوتی دیار نییە بۆ هاوکاری ئێمە هاتوون یاخود دەڕۆن و تێدەپەڕن.

پاش چەند چرکەیەک یەکەمین ئۆتۆمبێل لە دووریی بیست مەتر وەستا، ئەفسەرێک و دوو سەرباز دابەزین، ئەفسەرەکە گوتی هەمووتان سەلامەتن. عەبدولعەلی گوتی سێ کەس مردوون، ئەفسەرەکە گوتی بە زوویی کەلوپەلەکانتان کۆبکەنەوە و بیان خەنە نێو ئۆتۆمبێلەکەوە.

من لە دەفتەری یادەوەرییەکانم نووسیم ڕۆژی چوارشەممە (٤-١٠-١٣٤٨=٢٥-

١٢-١٩٦٩) کاتژمێر (٨:٤٥) ی بەیانی، پلەی گەرما بیستودوو پلەی ژێر سفرە لە بەرزی (٩٨٧) مەتر لە ئاستی ڕووی دەریاوە. ئۆتۆمبێلی دووەم و سێیەمیش گەیشتن، نزیکەی بیست سەرباز و ئەفسەر لە سێ ئۆتۆمبێل دابەزین. سەرما، کاری لە ئەوانیش کردبوو، عەلی خان گوتی بە خێرایی ژنان و منداڵان بە لێفە و دۆشەکەوە بڕۆنە نێو ئۆتۆمبێلەکەوە، قەرەباڵغی دروست مەکەن. هیچ کەسێک هێزی کارکردنی نەبوو، بەڵام هیوا ئەوانی گەرم کردبووەوە. هەر کەسە و هەر چییەکی بەردەست بکەوتایە فڕێی دەدایە نێو ئۆتۆمبێلەکەوە. ئەژنۆم ئازاری زۆر بوو، ڕانم وەک ئەوە وابوو کە شکابێت، هەستم دەکرد سەرما خەریکە گێژم دەکات، پشتەسەرم هەر وەکو لە بەفردا بێت وابوو، کیسە خەوەکەم لە خۆمەوە پێچابوو نەیدەهێشت بە خێرایی بڕۆم، ئۆتۆمبێلی یەکەم ڕۆشت و ئۆتۆمبێلی دووەمیش پڕ بوو. تەرمەکانیان خستە نێو ئوتومیلی سێیەمەوە تازیەدارەکان سواربوون و بیبی شیان سوارکرد.

لە ناکاو سەیرم کرد گونیەیەک وەک فەردەیەکی پڕ بە ڕێگادا دەڕوات، تومەس ئەوە «یەلە» بوو، «یەلە» چووبووە ناو گونیەیەکەوە سەریشی بە قوماش و کڵاوەکەی داپۆشی بوو، پەنجەکانی قاچی لە گونیەکەوە هاتبوونە دەرەوە، نەیدەتوانی باش بە ڕێگادا بڕوات، هێواش هێواش دەڕۆیشت. منیش پێکەنینم پێدەهات، گوتم «یەلە» ئەوە تۆیت؟! ئەم منداڵە خۆی وا گەرم کردبووەوە، هیچ منداڵێکی تر بیری لە کاری لەو جۆرە نەکردبووەوە. سەربازێک بە پێکەنینەوە هەر بە گونیەکەوە بڵندی کردەوە و هەڵیدایە نێو ئۆتۆمبێلەکەوە. ڕۆیشتنی ئۆتۆمبێلەکان بەناو ئەو بەفرەدا، بەو جادە خراپ و باریکەدا خۆی لەخۆیدا داستانێکە. سەربازەکانیش خەریکبوو لە سەرمادا ڕەق دەبوونەوە. ئۆتۆمبێلەکان چادریان پێوە بوو، دیار نەبوو لەکاتی ڕۆیشتندا «با» چ کارێکمان پێدەکات، خەڵکەکە هیچ قەرەباڵغیان دروست نەکرد و هەموویان هاوکاری یەکتریان دەکرد.

فەرهەنگی ئێرانی باڵا دەستبوو، خەڵکەکە نەخوێندەوار بوون، بەڵام ڕۆشنبیر بوون. عەلی خان و عەبدولعەلی بڵند و حاجی ڕۆستەم سەر پەرشتی خەڵکەکەیان دەکرد. برزوو وەک پیاوێکی ئازا کاریدەکرد و گیانی گەرم داهاتبوو. ژن و منداڵانی سواری ئوتومیلەکان دەکرد. عەلی خان بانگی برزووی کرد و گوتی برزوو دەتوانیت هەرچی ئاژەڵی زیندووە بیان بەیت بۆ شائاباد؟ برزوو گوتی بەڵێ خان دڵنیابە. خان گوتی ئەسپ و حوشترەکان بەرە، مەرە زیندووەکانیش هەموونیان ببە. ئەگەر توانیت ئاژەڵەکان بهێنیت ئەوا یەک حوشترت پێدەدەم. عەبدال و غەفار و برزوو لەگەڵ سێ کەسی تری هەوارەکەی عەبدولعەلی خەریکی گەیاندنی ئاژەڵەکان بوون. عەلی

خان گوتی ئاگاداری خۆتانبن، جلوبەرگی گەرم لەبەر بکەن. دیار بوو ڕۆژی پێشتر حەیدەر بە خۆی و مێگەل و تەواوی خەڵکی هەوارەکەیەوە خۆی گەیاندبووە شائاباد. حەیدەر لەبری ئەوەی ڕوو بکاتە کێو و گەردەنەی شەلەمی بەرەو گوندێک ڕۆیشتبوو. یەکڕاست چوو بووە بنکە سەربازییەکە و داوای هاوکاری لێکردبوون. خەڵکی گوندەکە جێگای خۆی و تەواوی خەڵکی هەوارەکەیان کردبووەوە.

بەیانی زوو بنکە سەربازییەکە چەند ئۆتۆمبێلێکی بۆ هاوکاری ئێمە ناردبوو، جادەکە دیار نەبوو، بەفر هەموو شوێنێکی داپۆشی بوو. بەفر بارینی شەویش شوین پێکانی ڕۆژی پێشتری داپۆشی بوو. عەلی خان لە ئەفسەرەکەی پرسی ئایا خەڵکی هەوارەکەی حەیدەر هەموو سەلامەتن؟ ئەفسەرەکە گوتی تەنها یەک پیرەژن مردووە، سێ کەسیش سەرما کاری تێکردبوون، نێردران بۆ نەخۆشخانەی گوندی ڕاجی. خان زۆر نیگەرانی ئەسەد و خەڵکی لای ئەو بوو، هیچ هەواڵێکیانی نەدەزانی. ئەسەد تاقە برای پەری خانم بوو، ئەوان دایکیان یەک بوو، پەری دەیگوت ئیشەڵڵا براکەم سەلامەتە.

تۆی خوێنەر، پێویستە لە سەرمای ژێر پلەی بیستودوو دا بمێنیتەوە، تاکو بزانیت کاتێک من ئەم بەسەرهاتە دەنووسم، تۆش هەست بکەیت ئێمە لە چ بارودۆخێکی سەختدا بووین. هیچ کەسێک کاتی ئەوەی نەبوو کە نانی بەیانی بخوات، قابلەمە بەفرەکە توابووەوە، بەڵام ئاگرەکە ئەوەندە نەبوو تا ئاوەکە بکوڵێنێت. ئۆتۆمبێلی چوارەمیش پڕببوو، ژنەکانی عەلی خان و مەنوچەهر ڕۆیشتبوون، تەنها کچەکان مابوونەوە. کچەکان بەدوای ئەسپەکانەوە بوون ئەوان خەمی ئەسپەکانیان بوو. پەری خانم گوتی ئێمەش سواری ئۆتۆمبێل دەبین، گوتی موهەندیس تۆش لەگەڵ ئێمەدا سەرکەوە. ئەفسەرێک هاواری کرد، هیچ کەسێک جێ نەمێنێت، کوڕەکان بۆ خێرا نایەن و سەرکەون، ئەوانیش گوتیان ئێمە لەگەڵ ئەسپ و حوشترەکاندا دێین. ئەفسەرەکە گوتی نەخێر نابێت، خەڵکەکە دەبێت هەمووی بێت و نابێت کەس جێ بمێنێت. ئەسپ و حوشتر با بمرن، بەڵام ئەوان گوێیان بە قسەکانی ئەفسەرەکە نەدا. پەری خانم دەستی گرتبووم و فشاری دەدا، گوتی سەرکەوین؟ ئەو بە هاوکاری سەربازێک سەرکەوت، پاشان دەستی منیشی گرت و ڕایکێشام بۆ ناو ئۆتۆمبێلەکە. بەجۆرێک ڕایکێشام کە هەڵمی هەناسەی لە دەموچاوم دەدرا، لە هەموو تەمەنمدا هیچ کاتێک گەرمی وا لەزەتبەخش بەر دەموچاوم نەکەوتووە. دەمویست ئەو هەڵمە، ئەو هەناسە گەرمە هەمیشە بەرەو ڕووم بێت. لە ئۆتۆمبێلەکەدا سەرما زۆری بۆ هێنامەوە و پارچە ڕاخەرێکم لە خۆمەوە ئاڵاند، پەری خانمیش لەگەڵ نیلۆفەردا هەر یەکە و لێفەیەکیان لە خۆیانەوە پێچا. هەر

وەکو جەواڵێکی پڕ یاخود وەکو فەردە چەوەندەرێک لە گۆشەیەکدا کز دانیشتبووم. گوڵخەندانیش هەر بۆ ئەسپەکەی دەگریا. ژنەکەی حاجی ڕەمەزان لە کاتی سواربوونی ئۆتۆمبێلەکەدا کەوتەخوارەوە و ئازاری پێگەیشت، دەنگی شکانی ئێسکی قاچی هات، سەربازەکان بە خێرایی هەڵیانگرتەوە و خستیانەوە نێو ئۆتۆمبێلەکەوە، خەڵکەش لەناو ئۆتۆمبێلەکەوە ڕایانکێشا، جێگەیەکیان بۆ کردەوە و لێفەیەکیان پێدا دا. ئەو ژنە داماوە لە تاو ئازاری قاچی هاوار هاواری بوو.. سەربازێک کچە شەش ساڵەکەی خەینسای بەرزکردەوە و خستیە نێو ئۆتۆمبێلەکەوە. ئەو منداڵە بێ دایکە لە سەرماندا خەریکبوو ڕەق هەڵبێت، پەری خانم بانگی کرد و گوتی (گوڵدوخت) وەرە لای منەوە. پەری خانم لێفەکەی لەسەر خۆی لادا و ئەو منداڵەی وەک منداڵی خۆی لە ئامێزگرت و لێفەکەی لە خۆی و منداڵەکەوە پێچا، زۆر بە سۆزەوە ئەو منداڵەی دەلاواندەوە تا هەست بە بێ دایکی نەکات. پەری خانم هاواری کرد ئەی عەباسی برای ئەم منداڵە لە کوێیە؟ سەربازێک ئەویشی هێنایە ناو ئۆتۆمبێلەکەوە. عەباس تەمەنی پێنج ساڵ بوو، نیلۆفەریش عەباسی بردە لای خۆیەوە و کردیە باوەشی، لێفەکەی لە خۆی و منداڵەکەوە پێچا. باوکی ئەو منداڵانەش بە هاوکاری سەربازەکان سەرکەوتە نێو ئۆتۆمبێلەکە، بەڵام نیوە مردوو ببوو، بە شوێن منداڵەکانیدا دەگەڕا. پەری خانم پێیگوت خەمت نەبێت منداڵەکان لای من و نیلۆفەرن. پیاوێک هات و یەکڕاست خۆی بەسەر مندا دا و لەسەرم دانیشت. منیش هاوارمکرد ئای کەمەرم شکا. گوتی موهەندیس ئەوە تۆ بوویت، بە خودا وامزانی خورجێنە و لەوێ دانراوە. هەموو شوێنێکی خۆمم داپۆشی بوو، ئەوانی تریش هەر وایان کردبوو. پەری خانم لە پشت سەرمەوە خواردنی دەکرد بە دەم گوڵدوختەوە و نازی دەکێشا. مرۆڤ چەند بوونەوەرێکی سەیرە، هەر ئەو کچانە چەند ڕۆژێک لەوەوبەر دەیانویست من بکوژن، کەچی ئێستا وەک دایکێکی دڵسۆز چاودێری منداڵی بێ دایک دەکەن، دوو خوشک هەر یەکە و منداڵێکیان وەک جگەرگۆشەی خۆیان لە باوەش گرتبوو.. ئۆتۆمبێلەکە کەوتەڕێ، باشبوو بە هۆی بەفر و سەهۆڵبەندانەوە شوفێرەکە نەیدەتوانی بە خێرایی لێبخوڕێت. دەنا دیار نەبوو کە بای بەهێز بە چ دەردێکمان دەبات. کۆڵە پشتەکەم لە باوەشگرتبوو تاکو گەرمم ببێتەوە، جانتا و کەلوپەلەکانی ترم بە جۆرێک لە ئۆتۆمبێلەکەدا قایمکردبوو، تاکو بایەکە کەمتر لێمبدات. پەری خانم ڕووی تێکردم و گوتی شکور حاڵت باشە. گوتم لە سایەی خودا و سەری تۆوە باشم. سەرما کاری لە هەمووومان کردبوو، لە ئۆتۆمبێلەکەدا لانیکەم بیست‌وپێنج کەس وەکو بیست‌وپێنج فەردە دانیشتبووین. هەر کەسە و لێفەیەک، لبادێک،

سەرجلێکی بە سەر خۆیدا کێشا بوو. دوو کەس کە هیچ شتێکیان دەستنەکەوتبوو هەریەکەی خورجێنێکیان بە تاڵ کردبوو چووبوونە نێوی.

ڕێگەمان زۆر دوور نەبوو، تا شائاباد هەر (٥ -٦) کیلۆ مەتر زیاتر نەبوو، بەڵام ئەوان ئێمەیان نەدەبرد بۆ شائاباد. چونکە شائاباد ناوچەیەکی سەربازیی بوو، گوندێکی بچووکی لێبوو ئەو خەڵکە کەمە توانای ئەوەیان نەبوو بتوانن ئیدارەی ئێمە بدەن، بۆیە ئێمەیان بەرەو گوندی ڕاجی برد، کە بنکەیەکی چارەسەرکردنی نەخۆشی (گەڕیی) لێ دانرا بو،و لەلایەن فەرەنسیەکانەوە سەر پەرشتی دەکرا. پێشتر زۆر باسی ئەو گوندەیان بۆ کردبووم، بەڵام هەرگیز نەچووبووم و نەمبینی بوو.

لەکۆڵەپشتەکەمدا هەندێک چەرەسم دەرکرد، چەند هەنجیرێکی وشکم دایەدەست کچەکان، پەری خانم سەیرێکی کردم، هەنجیرەکەی ماچکرد و خواردی. هێزی گەنجی لە هەر حاڵەتێکدا بێت کاری خۆی دەکات، تەنانەت لەو سەرمایەشدا. نیلۆفەر چاوی لێبوو کە خوشکەکەی هەنجیرەکەی ماچکرد، بۆیە پێکەنینێک گرتی و ڕووی خۆی وەرگێڕا. چەرەسەکەم هەمووی دابەشکرد بە سەر خەڵکەکەدا، لەو ساتەدا حەزمدەکرد هەموو هەنجیری وشکی دونیا لای من بووایە و بمدایە بە پەری خانم، دەزانم ئەویش هەمووی ماچ دەکرد و دەیخوارد.

## گوندی ڕاجی

ئۆتۆمبێلەکان لە سەر بەفرەکە دەخزین و هێواش هێواش بەرەو خوار دەڕۆیشتن، ئەو ڕێگایەی ئێمە ڕۆژی پێشووتر لەدوای نیوەڕۆوە بە ماوەی شەش کاتژمێر بڕیبوومان، ئۆتۆمبێلەکان لە ماوەی نیوکاتژمێردا بڕیان، پاشان بەرەو گوندەکە پێچیان کردەوە و ئێمەیان لەبەردەم قوتابخانەی گوندەکەدا دابەزاند. پۆلەکانی قوتابخانەکەیان بۆ گەرم کردبووین، کارمەندەکان لە چاوەڕوانی ئێمەدا بوون. سێ خوشکی ئایینی خۆبەخشی فەرەنسی لەو سەهۆڵبەندانەدا خەریکی دابینکردنی جێگابوون بۆ ئێمە. من پێشتر یەکجار بۆ سەردانی شوێنی چارەسەری نەخۆشی (گەڕیی) چووبووم بۆ نەخۆشخانەی مەشهەد، بەڵام لە نەخۆشخانەکەدا شوێنی چارەسەرکردنی نەخۆشەکانم نەبینی بوو. ئەم شوێنەش بەتایبەتی بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشی گەڕی دروستکرابوو، شوێنێک بوو نەخۆشەکانیان لێ چارەسەر دەکرد و پاشان دەیانگێڕانەوە بۆناو کۆمەڵگە. گوندەکە ئاوەدان بوو، هەر لە گوندەکەدا شوێنێک هەبوو لە سەر شێوازی نوێ مانگای تێدا بەخێو دەکرا، هەر لەو گوندەدا ڕەز و باخی نوێیان بنیاد نابوو لە سەر شێوازی

تازەی وڵاتی فەرەنسا، پیشەسازی دەستیی و چەندین کاری دیکەیان فێری نەخۆشەکان دەکرد. شتێکی کەمم لەبارەی ئەم گوندەوە خوێندبووەوە. ئەو ڕۆژە هەموو شتێک لەژێر بەفر و بەستەڵەکدا بوو. لە ناوچەیەکی بچکۆلانەدا بنکەیەکی ئاسمانی بە هاوکاری ئەمریکاییەکان لەکاردا بوو، لە ئەو بنکەیەوە سەیری ئاسمانی سۆڤیەتیان دەکرد. فەرەنسییەکانیش بۆ چاودێری و چارەسەری نەخۆشی گەڕیی ئامادەکارییەکی باشیان کردبوو. ئامادەبوونی فەرەنسییەکان لەو شوێنەدا لە پێناوی کارێکی سیاسیدا یا هەر شتێکی تردا بووبێت من نازانم، ئەوان بۆ هەرچی و بۆ هەر مەبەستێک هاتبوون گرنگ ئەوە بوو ژووری گەرمیان بۆ ئێمە ئامادە کردبوو.

گوندەکە نەخۆشخانەیەکی باشی هەبوو. یەک دکتۆر و سێ کچی فەرەنسی و چەند پەرستارێکی ئێرانی لێبوو. لاشـەی مردووەکانیان لە شوێنێکدا دانا بوو، بۆئەوەی هەر کاتێک کەشوهەوا باش بوو، بە خاکیان بسپێرن. لە هەوارەکەی حەیدەر، پیاوێک و منداڵێک بە هۆی نەخۆشی سییەکانەوە مردبوون، ژمارەی مردووەکان لە هەڵکشاندا بوو، تا ئەو کاتە شەش کەس لەکۆچەرییەکان و سێ کەسیش لە خەڵکی گوندەکە مردبوون. دەنگی هاوار و گریانێکی زۆر دەبیسترا. شۆربایەکی گەرمیان بۆ ئامادەکرد بووین. کاتژمێر دەی پێشنیوەڕۆ بوو، شۆربای گەرم لە گەروومانەوە دەڕۆیشتە خوارەوە. پێڵاوەکانم داکەند، هەردوو قاچم ببوون بە سەهۆڵ، بەڵام ڕەش نەببوون. دکتۆر خەریکی چارەسەرکردنی پەنجەی قاچی ئەردۆ بوو، دکتۆر گوتی ئەم چارەسەرە سوودێکی ئەوتۆی نییە، وا پێویست دەکات پەنجەکانی ببڕدرێنەوە، هەر فرسەتێک هەڵبکەوێت و ڕێگا بکرێتەوە دەبێت بەڕێبکرێت بۆ بۆجنوورد. ژمارەمان زیاتر لە هەشتاوپێنج کەس بوو. خەڵکانی هەواری عەلی خان و هەواری عەبدول بڵند و چەند کەسێکی هەوارەکەی حەیدەریش لەوێ بوون. عەلی خان بە هەموو لایەکدا دەڕۆیشت تا هەواڵی ئەسەدی کوڕی بزانێت. خۆی گوتی هەڵەیەکی گەورەم کرد کە ئەم منداڵانەم کرد بە سەرپەرشتیاری ئەسپ و حوشترەکان.. منیش لاکەلەکەم ئازاری هەبوو، هەستم بە ئازارێکی زۆر دەکرد وەک ئەوە بوو ئێسقانی لاکەلەکەم لە جێگەی خۆی نەمابێت، هەرچەند گیانم گەرمتر بووایە زیاتر هەستم بە ئازار دەکرد. بۆمان دەرکەوت حەڤدە کەس پەنجەی قاچیان ڕەشبووەتەوە، چەند کەسێکی تریش پەنجەی دەستیان ڕەشببوون، ئەوانە بەگەرم بوونەوە زیاتر هەستیان بە ئازار دەکرد. دکتۆر و دەرمـان بەشی ئەو هەموو خەڵکەی نەدەکرد، دکتۆر دەیگوت لەم کاتە سـارد و سەرمایەدا باش نییە کەسێک بنێرم بۆ بۆجنوورد، لەو گوندەوە تاکو بۆجنوورد نزیکەی

سەدوهەشتا کیلۆ مەتر ڕێگا بوو، لە کاتێکدا ئۆتۆمبێلیش نەبوو لە گوندەکەدا. بێسیم هەبوو لە گوندەکە دا بۆ پەیوەندی کردن. عەلی خان و حاجی ڕۆستەم ڕۆیشتبوون بۆ بنکەکە تاکو بە بێسیم پەیوەندی بکەن بە بنکەکانی تری ناوچەکەوە، بەڵکو هەواڵێکی ئەسەدیان دەستبکەوێت. منیش لەگەڵ ماڵ و منداڵەکەی عەلی خان و ژنەکەی حاجی ڕۆستەم و حاجی ڕەمەزان و بیبی لە ژوورێکدا بووین، واتە لە پۆلێکی قوتابخانەکەدا بووین. قوتابخانە و نەخۆشخانەکە لە نزیک یەکتری بوون. دکتۆرەکە لە قوتابخانەکەدا چارەسەری نەخۆشەکانی دەکرد. ئەو نەخۆشانەی باری تەندروستی‌یان باش نەبووایە دەیناردن بۆ نەخۆشخانەکە. چەند کەسێک تووشی نەخۆشی ئاوسانی سییەکان ببوون، ئەو کەسانەیان لە نەخۆشخانەکەدا چارەسەر کرد. پەری خانم بە دکتۆرەکەی گوت. ئەم بەڕێزە خوێندکاری زانکۆیە، بۆ لێکۆڵینەوە هاتووە بۆ هەوارەکەی ئێمە، چەند ڕۆژێک بەر لە ئێستا لە ئەسپ کەوتۆتە خوارەوە، ئێستاش ئازارێکی زۆری هەیە. دکتۆر دەستیکرد بەچارەسەرکردنی من، بەڵام گوتی دەبێت من بچم بۆ نەخۆشخانەکە، بڕیار بوو کچێکی فەڕەنسی کە ئەویش پەرستیار بوو لە نەخۆشخانەکە چارەسەرم بۆ بکات. منیان برد بۆ نەخۆشخانەکە و پەری خانم لەگەڵمدا هات، نیلۆفەریش کۆکەیەکی توندی گرتبوو. کچە فەڕەنسییەکە پارچە قوماشەکەی سەر نێو چەوانمی کردەوە، برینەکەم هەوی کردبوو. گوتی لانیکەم دەبوو پێنج تەقەڵی لێبدرایە، بۆچی نەتان دووریوەتەوە؟ گوتم لەو چۆڵەوانییە کەسێک نەبوو بیدورێتەوە. برینەکەمی پاککردەوە و دەرمانیکرد، بەڵام نەدەکرا تەقەڵی لێبدات، گۆشتی چوار دەوری برینەکە ڕزیبوو. دکتۆرەکەش هات و گوتی برای خوێندکار چۆنیت؟ گوتم سوپاس زۆر خراپ نیم. چاوی بە برینەکە کەوت و گوتی برینەکەت خراپە، بەڵام ناکرێت بدورێتەوە، گۆشتی نییە و کێمی کردووە. برینی نێو چەوانیان بۆ بەستم و پانتۆڵەکەم دانا، تا ئەو کاتە وامدەزانی تەنها ئەژنۆم بریندارە و ئازاری هەیە، بەڵام سەیرم کرد هەر دوو قاچم لە خوار ئەژنۆمەوە بریندارن، گۆشتی ڕانم شین ببوونەوە. گوتم دکتۆر پشتم ئازاری زۆری هەیە. جلەکانی پێدانام و گوتی تۆپشتیشت هەمووی برینە دەبێت بدورێتەوە. پەری خانم و نیلۆفەریش سەیری پشتیان دەکردم. پشتمیان تیمار کرد. ئەو شوێنەی کە گوڵخەندان بە لەقە لێیدابوو ئازارێکی زۆری هەبوو. دکتۆر گوتی دوو بڕبڕەی پشتت کێشەیان هەیە. دکتۆر لە سەر ڕوو ڕایکێشام. بە هاوکاری کچە فەڕەنسییەکان فشاری خستە لەسەر بڕبڕەی پشتم. لە تاو ئازار هاوارم لێ بڵند بوو، هەموو گیانم شین ببووەوە. لە دواییدا بەو هەموو برین و ئازارەوە دکتۆر چارەکێک برینەکانمی تیمار کرد. دکتۆر گوتی ناسناوت چییە؟ منیش

ناو و ناسناوی خۆمم پێگوت. دکتۆر گوتی من دەزانم کە تۆ لە ئەسپ بەرنەبوویتەوە، بەڵکو لێیان داویت. گوتم دکتۆری بەڕێز من لە ئەسپ کەوتومەتە خوارەوە. دکتۆر تەمەنی پەنجاوپەنجا ساڵ دەبوو، گوتی من سی ساڵە کاری دکتۆری دەکەم. لانیکەم لەو ماوەیەدا بیست کەس لە ئەسپ کەوتوونەتە خوارەوە و سەردانیان کردووم، هیچ کەس لەوانە ئاوایان لێنەهاتووە و برینی وایان پێوە نەبووە، کاتێک کەسێک لە ئەسپ دەکەوێتە خوارەوە تەنها یەک شوێنی لە زەوی دەدات و شوێنێکی دەشکێت، بەڵام تۆ لە بنپێتەوە تا تەپڵی سەرت بریندار بووە، مەگەر بڵێم لە ئەسپ بەربوویتەوە، دووبارە سواربوویتەوە و بەربویتەوە. سێبارە و چواربارە و چەند بارە سواربوویت و بەربوویتەوە. ئینجا مەرهەمێکی فەرەنسی لە برینەکانی پشتم دا و بە لەفافێک پێچای. گوتی ڕەنگە تا یەک مانگی تر ئازارت هەبێت، گوتی ئێمە لێرە ناتوانین زیاترت بۆ بکەین، واباشترە بڕۆیت بۆ شار و لە نەخۆشخانە بکەویت، چونکە تۆ لەبەر هەوکردنی برینەکانت «تا»ت لیهاتووە و پێویستە حەبی ئەنتی بایۆتیک بەکاربهێنیت، بۆ ئەژنۆشت دەبێت بچیت ئەشیعەی بۆ بگریت. قسەکانی تەواو کرد و ڕۆیشت بۆ لای نەخۆشەکانی تر. پەری خانم دەستی گرتبووم و فرمێسک بە چاوەکانیدا دەهاتە خوارەوە. گوتی نەفرەتی خودا لە من بێت بۆ کارێک کە کردم. نیلۆفەر ئێمەی جێهێشت و ڕۆیشت، لە نەخۆشخانەکەدا سێ قەرەوێڵە هەبوو، بەڵام حەوت کەسی لێ خەوێنرا بوو. چوار دۆشەکی تریان هێنا بوو، لەسەر زەوییەکە بۆیان ڕاخستبوون، من لەسەر یەکێک لە قەرەوێڵەکان ڕاکشابووم. ژمارەی نەخۆشەکان بەرەو زیاتر دەڕۆیشت، زۆربەیان تووشی ئاوسانی سییەکان ببوون. نەخۆشی ڕەشبوونەوەی پەنجەکانی دەست و قاچیش زۆر بوون. بیرمکردەوە پێویست ناکات بچمە نەخۆشخانە بخەوم، هەرچەندە دکتۆر وای پێگوتم کە بچم لە نەخۆشخانە بخەوم. نزیکی نیوەڕۆ بوو عەلی خان بەخۆشحاڵییەوە هات بۆ سەردانم، خۆشحاڵیەکەی بۆ ئەوە بوو کە هەواڵی ئەسەدی کوڕی زانیبوو، بەخۆی و مێگەلەکەی و تەواوی ماڵەکانی هەوارەکەیەوە سەلامەتن. ئەسەد بەرەو لای گەردەنەی شەلەمی نەڕۆیشتبوو، بەڵکو بە پێچەوانەوە بۆدواوە گەڕابووەوە، ڕۆیشتبوو بۆگوندی ئینجەی تورکمان نشین. هەوارەکەی ئەسەد تەنها هەوار بو کە تێکڕای خەڵک و ئاژەڵەکانی سەلامەتبوون، هیچ زیانێکیان بەرنەکەوتبوو.

کاتژمێر سێی دوانیوەڕۆ بوو، کە دەنگی هاوار و گریان بەرزبووەوە، یەکێک لە شوانەکانی هەوارەکەی حەیدەر کە لە نەخۆشخانە کەوتبوو گیانی لە دەستدابوو. ژمارەی مردووانی کۆچەرییەکان گەیشتە حەوت کەس، دەیانگوت دوو سێ کەسی تریش حاڵیان

باش نییە و ڕەنگە بمرن. دکتۆری نەخۆشخانەکە داوای دەرمان و هاوکاری کرد بوو، دکتۆری بنکە سەربازییەکە هاتبوو بۆ هاوکاری کردن، بەڵام ئەوانیش دەرمانیان کەم بوو. ئەو کەسانەی تووشی ئاوسانی سییەکان و سەرمابردەیی ببوون، ژمارەیان زۆر زیادی کردبوو.

ئاسمان هەور بوو، منیش خەوم دەهات و وەنەوزم دەدا. دوانیوەڕۆ بوو، دوو کەس بە جلوبەرگی سەربازییەوە لەگەڵ کەسێکی سڤیل هاتنە ژوورەوە و گوتیان پاپۆلی کێیە؟ گوتم فەرموون منم!گوتیان وەرە لەگەڵماندا، منیان برد بۆ ژووری سەرۆکی نەخۆشخانە، کە ژووری هەمان ئەو دکتۆرە بوو کە چارەسەرەکەی بۆ کردم، کەسی تر لەو ژوورەدا نەبوو. یەکێکیان لێی پرسیم و گوتی تۆ لێرە چی دەکەیت؟ گوتم من خوێنکاری بەشی جوگرافیام بۆ لێکۆڵینەوە هاتووم، لێکۆڵینەوە دەکەم لەسەر هۆزە کۆچەرییەکان. گوتی هیچ بەڵگە نامەیەکت پێیە؟ گوتم بەڵێ پێمە. گوتیان کوا؟ گوتم وا لە کۆڵەپشتەکەمدایە. بانگی کەسێکیان کرد بچێت کۆڵە پشتەکەم بۆ بهێنێت. ئەو کەسەش کە ڕۆیشتبوو گوتبووی کۆڵە پشتەکەی پاپۆلی بهێنن. ئەو نەیگوت بووکێشەکە چییە؟ پەری خانم وا تێگەیشتبوو کە من خۆم داوای کۆڵەپشتەکەمم کردووە. ئەویش کۆڵە پشتەکەمی هەڵگرتبوو، لەگەڵ ئەو کەسەدا هاتبوو. پەری خانم هاتە ژوورەوە، کاتێک بینی لە ژوورەکەدا دوو کەس هەیە بە جلوبەرگی سەربازی و پلەی ئەفسەری باڵا، ڕەنگی تەواو تێکچوو. پەری خانم ویستی کۆڵە پشتەکە بداتە دەست من، بەڵام ئەو کەسەی کە جلوبەرگی مەدەنی لەبەردا بوو هەڵسا و کۆڵە پشتەکەی لێوەرگرت. پەری ویستی بڕوات، بەڵام هەر ئەو کەسە پێیگوت ئەگەر هەڵە نەبم تۆ پەری قارەمانلویت، باشە تۆ ئەم کوڕە گەنجە دەناسیت؟ پەری گوتی ئەو خوێندکارە و بۆ لێکۆڵینەوە هاتووە بۆ نێو هۆزەکەی ئێمە. پیاوەکە گوتی بۆ لێکۆڵینەوە هاتووە، بەڵام دیارە میوانی ئێوەیە. پەری خانم گوتی لە هەوارەکەی ئێمە بوو. پیاوەکە گوتی تۆش هەر لە هەوارەکە بوویت و پێکەوە باسی کێشە و پێشهاتەکانتان کردووە. ئەو پیاوە کۆڵەپشتەکەمی کردەوە و هەموو کەلوپەلەکانی دەرکرد و لەسەر مێزەێک کە لە ژوورەکەدا بوو بڵاویکردنەوە، ڕووی کردە ئەفسەرەکە و گوتی ناوی کەلوپەلەکانی بنووسە. گەرمیپێو، قیبلەنما، نەخشەیەکی (١-٢٥٠٠٠٠) ناوچەکە، پرگال، ڕاستە، دووربین و کامێرا. دواتر هەنگاوپێوەکەی هەڵگرت و گوتی ئەمە چییە؟ گوتم هەنگاوپێوە. گوتی بەکەڵکی چیدێت؟ گوتم کاتێک بەڕێگەدا دەڕۆیت هەنگاوەکانت تۆمار دەکات و نیشانی دەدات چەند هەنگاو ڕۆیشتوویت. گوتی ئەی نامەی ناسینەکەت کوا؟ گوتم وا لە ناو جانتا بچووکەکەدایە.

نامەکە هی سەردانەکانی پێشوو بوو. پەری خانم ویستی قسە بکات. ئەو پیاوە پێیگوت تۆ بێدەنگبە و قسەمەکە. پاشان بەمنی گوت تۆ لە پارەوە واتا نزیکەی (١٩-٢٠) مانگ بە بەردەوامی هاتوچۆی ئەم هۆزانەت کردووە؟ هەمیشە میوانی حاجی عەلی خانی قارەمانلو بوویت. کۆڵە پشتەکەشت پەری خانمی قارەمانلو ئاگاداری بووە. گوتم بەشی یەکەمی قسەکەت کە میوانی حاجی عەلی خان بووم ڕاستە. بەڵام کۆڵە پشتەکەم هەر لای خۆم بووە.

یەکێک لە ئەفسەرەکان گوتی، بەڵام دکتۆر ڕاپۆرتی لەسەر تۆ نووسیووە کە لە ئەسپ نەکەوتویتە خوارەوە. گوتم چوار ڕۆژ لەمەوبەر من لە ئەسپ کەوتوومەتە خوارەوە. گوتی بەڵام ڕاپۆرتی دکتۆر دەڵێت لە ئەسپ نەکەوتوویتە خوارەوە، برینەکانت شوێنی لێدانە، ئەوە تا نووسیویەتی شوێنی لێدانی قامچی بە ئاشکرا بەپشتەوە دیارە، پشتت شوێنی لێدانی قۆناغە تفەنگی برنەوی پێوە دیارە، شوێنی برنەوە، لەو برنەوە قاچاخە بێ مۆڵەتانەی کە پەری خانم هەیەتی. پەری خانم خەریکبوو قسە بکات، بەڵام پێیانگوت بێدەنگبە و قسە نەکەیت. منیش گوتم هەر چۆنێک بێت من لە ئەسپ کەوتوومەتە خوارەوە. گوتی باش گوێبگرە تۆ لە نێوان ئەم هەموو خان و هۆزانەدا چوویت بوویتە میوانی حاجی عەلی خان، میوانی کەسێک بوویت کە هەمیشە دژایەتی شای کردووە، میوانی کەسێک بوویت کە لە ڕاپەڕینی (٢٨مـــوردادی١٣٣٢=١٩-٨-١٩٥٣) لایەنگری دکتۆر سەدیق بووە، میوانی کەسێک بوویت کە چەکی هەڵگرتووە بەرامبەر بە شا، میوانی کەسێک بوویت کە دادگای وڵات بڕیاری دوو ساڵ زیندانی کردنی بەسەردا سەپاند و دوو ساڵی تەواو زیندانیکراوە. ڕووی کردە پەری خانم و گوتی باوکت ساڵی (١٣٣٢-١٣٣٤=١٩٥٣- ١٩٥٥) زیندانی بووە یان نا؟ پەری خانم گوتی بەڵێ بەهەمان تاوان کە تۆ باسی دەکەیت زیندانی بووە. ئەو پیاوە بەردەوام بوو لە قسەکردن، گوتی تۆ میوانی کەسێک بوویت کە کوڕێکی لە ئەڵمانیای خۆرهەڵات بووە بە پەنابەر و لە دژی شا چالاکی دەکات. گوتم ئەو شتانە تۆ باسیان دەکەیت من بەهیچ شێوەیەک نەمزانیوە. ئینجا گوتی کەسێک ئێستاش کوڕێکی زیندانییە لە تاران، بەهۆی بوونی میوانی ئاژاوەگێرەوە و دەستبەسەردا گرتنی نارنجۆک لە ماڵەکەیدا و هەوڵدان بۆ دروستکردنی پشێوی و ئاژاوەگێڕی لە وڵاتدا. خانێک کە لە ئاژاوە گێڕییەکانی قوم و تاراندا دەستێکی باڵای هەبووە و ماڵ بەماڵ بەسەر ئاژاوەگێڕەکاندا گەڕاوە و تەنەکە ڕۆنی بەسەردا دابەشکردوون، کەسێک کە باوکی ئەو پەری خانمەیە کە لێرە دانیشتووە و ئاگاداری کۆڵەپشتەکەی تۆدەکات، دوو جار زیندانی کراوە، پەری خانمێک کە ئەندامی

حیزبی تودە بووە و پاشان پەیوەندی کردووە بە گروپە چەپە توندڕەوەکانەوە، خانمێک کە هەمیشە ئاژاوەگێڕبووە و دژی ئاسایشی وڵات بووە، کەسێک کە لە ماڵەکەیدا گروپێکی توندڕەو دەسگیرکراوە، کەسێک کە کتێبخانەی گەڕۆکی هەیە و ئەویش کتێبی کۆمۆنیستین و ئێستاش بەدوای کتێبەکانی موهەندیس مەهدی بازرگان و موتەهەری و تاڵەقانی و عەلی شەریعەتیەوەیە. ئەم کچە نوێژ نەکەرێکی موسڵمانە. گوتم ئەم شتانەی کە تۆ باسیان دەکەیت من نەمزانیوە. ئەی نازانی کە پەری خانم لە هاوسەری جیابووەتەوە و بێوەژنە... پەری خانم لەناکاو وەک شێر هەڵسا و بەسەریدا نەڕاندی، گوتی بێدەنگبە من هەموو خزم و کەس و تایەفەکەم لێرەن، کارێکت بەسەردا دێنم لێرە بەزیندوویی نەچیتە دەرەوە. پیاوە مەدەنییەکە بە پێڕابواردنەوە گوتی هیچ خۆت نارەحەت مەکە. پەری خانمیش پێیگوت تۆ کوڕی (چوپو) نیت. تۆ دەیان جار هاتیت بۆ داخوازی من، بەڵام من ئامادە نەبووم شوو بە پیاوێکی وەک تۆ بکەم، ئێستاش هەرچی بەدەمدا هاتووە گوتووتە. پەری خانم گوتی هیچ کەسێکی ئەم دەزگای ساواکیە لێرە نییە، تا پێش بەم نەفامە بگرێت، تاکو کێشە تایبەتییەکانی خۆی تێکەڵ بە کێشەی ئاسایش نەکات. پیاوە مەدەنییەکە دەترسا لەوەی دەنگی پەری خانم بگاتە دەرەوە و خزم و کەسەکانی بە ئاگابێن و بێنە نێو کێشەکەوە. نەخشەکەی لە سەر مێزەکە بڵاوکردەوە و گوتی. برای خوێندکار ئەم نەخشەیە تایبەتە بەم ناوچەیە، تۆ نەتدەزانی کە بنکەی ڕاداری شائاباد یەکێکە لە هەستیارترین خاڵی سەربازی وڵات. گوتم دەمزانی لەو شوێنەدا بنکەیەک هەیە، بەڵام نەمدەزانی کە بنکەیەکی هەستیاری سەربازییە. گوتی تۆ نەخشەیەکی بنکەکەت لایە، نەخشەی سنووری وڵاتی سۆڤیەتت پێیە. نازانیت هاتوویت بۆ کوێ؟ گوتم زیادەڕۆیی مەکە ئەم نەخشەیە هەموو ئەفسەرێک دەزانێت کە نەخشەیەکی فێرکارییە و بۆکار و کردەوەی تر بەکارنایەت. لە ناکاو یەکێک لە ئەفسەرەکان هاواری کرد و گوتی بەچکە خوێندکاری کۆمۆنیست، نۆکەری سۆڤیەت، ژێر نەخشەکە بخوێنەوە. لە ژێر نەخشەکەدا نوسرابوو نەخشەی چالاکی هاوبەش. گوتم چالاکی هاوبەش لەکوێیە؟ لە جێی خۆی هەڵسا و گوتی ئێران و ئەمریکا. گوتم زۆر تەواوە چالاکی هاوبەشی ئێران و ئەمریکایە. گوتم بەندەی خودا من کەسێکی سادەی خەڵکی شاری یەزدم. حەز بەزانین و لێکۆڵینەوە لەسەر ژیانی هۆزە کۆچەرییەکان دەکەم. هاتووم لەبارەی ژیانی کوردەکانەوە لێکۆڵینەوە بکەم، بەڵام بەهۆی کەشوهەواوە تووشی کێشە و گرفت بووم، کەچی ئێوە پێمدەڵێن نەخشەی چالاکی هاوبەشی ئێران و ئەمریکام لایە و هاتووم بۆ وڵاتی سۆڤیەت کار بکەم، لە ڕوانگەی منەوە نۆکەری بۆ

ئەمریکا و بۆشۆڤیەت هەردوکیان خراپن. هەردوکیان بۆ وڵاتی ئێمە خراپن. کەسە مەدەنییەکە گوتی هیچ کەسێک داوای وەڵام دانەوەی لە تۆ نەکردووە. دووبارە پرسیاری کردەوە و گوتی تۆ دەڵێیت لە سواری ئەسپ کەوتوومەتە خوارەوە، بەڵام ڕاپۆرتی دکتۆر چی دەڵێت؟ ئەوەتا دەڵێت برینەکانی گیانت بە هۆی لێدانەوەیە. گوتی جلەکانت داکەنە. جلەکانم دانا و سەیری پشتیان کردم و گوتیان پەری خانم تۆش وەرە سەیری شوێنی قامچی بکە لە سەر پشتی، ئەوەتا بە جوانی هەستی پێدەکرێت. گوتم من هەرچییەکم بێت هیچ پەیوەندی بەم خانمەوە نییە. کەسە مەدەنییەکە گوتی ئێستا ئێمە جۆرێک لە پەیوەندی دیاری دەکەین. پەری خانم هاواری کرد و گوتی کاتێک بەربۆتەوە ڕەشمەی ئەسپەکە لە پشتی ئاڵاوە. ڕەنگە ئەوە شوێنی ڕەشمەکە بێت. منیش گوتم ڕاستدەکات وایە حەزدەکەن برۆن بە دکتۆرەکە بڵێن شوێنی ڕەشمەی ئەسپەکەیە یان نا. دکتۆریش کەسێکی سەر بەخۆیان بوو، ئەگەر چ پێویستی دەکرد ڕاپۆرت بنووسێت؟ لە کاتێکدا کە من خۆم گوتوومە لە ئەسپ کەوتوومەتە خوارەوە. کەسە مەدەنییەکە گوتی هەرچۆنێک بێت ئێمە تۆ دەبەین بۆ بنکەکەی خۆمان و لەوێوە دەتنێرین بۆ بۆجنوورد، ئەوکات لەوێ ڕاستییەکان دەردەکەون. دەرگای ژوورەکە کرایەوە حاجی عەلی خان هاتە ژوورەوە، خان سڵاوی کرد و هەر سێ کەسەکە وەڵامی سڵاویان دایەوە. عەلی خان گوتی ئەوە خێرە؟ ئەوان هەرسێکیان عەلی خانیان دەناسی و گوتیان تۆ میوانێکی گومان لێکراوت هەیە، دەبێت بۆ لێکۆڵینەوە ڕەوانەی بۆجنوورد بکرێت. پەری خانمی کچیشت سێ مانگە خۆی بە بنکەی پۆلیس نەناساندووە. عەلی خان گوتی ئێمەش سێ مانگە لە قورەمەیدان نیشتەجێین، لەوێ هیچ بنکەیەکی لێ نییە، منیش هەر کاتێک چووبم بۆ ئاشخانە سەردانی بنکەکەم کردووە و پێمگوتوون پەری خانم وا لە قورەمەیدانە. کەسە مەدەنییەکە گوتی پەری خانم دەبێت خۆی بروات بۆ بنکە. عەلی خان گوتی من بەڵێننامەم داوە هەر کاتێک ئەوان داوایانکرد من ڕادەستیان بکەم. کەسە مەدەنییەکە گوتی ئەم برادەرە دەڵێت لە ئەسپ کەوتومەتە خوارەوە، بەڵام ڕاپۆرتی دکتۆر دەڵێت بە لێدان بریندار کراوە، تۆ ڕات چیە لەسەر ئەمە؟ عەلی خان گوتی ئەوە لە خۆی بپرسن خۆ من لەگەڵ ئەودا نەبووم، ئەو ئەسپێکی لە ئێمە وەرگرتووە و پاشان بە سەری شکاوەوە هاتەوە و گوتی لە ئەسپەکە کەوتوومەتە خوارەوە، ئەگەر لەگەڵ کەسێکدا شەڕی کردووە با بۆ خۆی پێتان بڵێت. منیش گوتم من لەگەڵ هیچ کەسێکدا بەشەڕ نەهاتووم، خۆم لە ئەسپەکە کەوتمە خوارەوە. پەری خانم ڕووی کردە باوکی و گوتی ئەم ڕەسوڵە دیسانەوە قسەی نابەجێ دەکات دیسانەوە کێشە تایبەتییەکانی خۆی

تێکەڵی کێشەی ئاسایش دەکات. عەلی خان گوتی ئەمە ڕەسوڵی کوڕی عەباس خانە، من خۆم گەورەم کردووە، بەڵام چەند ساڵێکە لەگەڵ باوکیدا کێشەم هەیە، بەڵام باوکی ئەوندە پیاوە کێشەی نێوان خۆم و خۆی تێکەڵ بەکێشەی سیاسی من و پەری خانم ناکات. نازانم پیاوەتی کوڕەکەی بۆ ئەو دەگەڕێتەوە یان نا؟ هیوادارم وردە کێشەی نێوان من و باوکی نەخاتە ئەستۆی ئەم کوڕە گەنجە. کەسە مەدەنییەکە گوتی کۆڵەپشتی ئەم گەنجە بۆچی لای کچەکەی تۆیە؟ عەلی خان گوتی ئەو کۆڵە پشتەکەی لای خۆی بووە، لای پەری نەبووە. کۆڵە پشتەکەی لەژوورەکەدا بووە ئێوەش داواتان کردووە و پەریش بۆی هێناون. عەلی خان گوتی باشە ئێستا ئێوە دەتانەوێت چی بکەن؟ ئەفسەرەکە گوتی ئێمە ئەم خوێندکارە لەژێر چاودێری خۆماندا دەنێرین بۆ بۆجنوورد. عەلی خان گوتی زۆر باشە بینێرن، بەڵام ئەم برادەرە دەیویست بڕوات بۆ تورکمان سەحرا ئێستا بەم سارد و سەرمایە ناتوانێت بڕوات بۆ تورکمان سەحرا، هەروەها دیاریش نییە کە ئێمەش دەچین بۆ تورکمان سەحرا یان نا، چونکە هەموو مەڕەکانم مرداربوونەوە، لە سێ مێگەلە مەڕ تەنها سەدوپەنجا سەر مەڕی نیوە گیانم بۆ ماوەتەوە. ئەفسەرێکیان گوتی مێگەلێکت سەلامەتەو وا لەگوندی ئینجەیە. عەلی خان گوتی خۆتان دەزانن ئەسەد ماڵی لەمن جیایە ئەو مێگەلە هی خۆیەتی نەک هی من، من لە چلودوو حوشتر تەنها چواردە حوشترم ماوە لە هەشت ماینی ڕەسەنی بە نرخ تەنها چواریان بە زیندوویی ماون. چەند کەسێکش لە خزم و کەسەکانم مردوون و هێشتا لاشەکانیان سپاردەی خاک نەکراون، بەم حاڵەمانەوە ئێوەش هاتوون لێرە لێکۆڵینەوە لەگەڵ کچەکەم و ئەم کوڕە میوانەدا دەکەن، ئەم کوڕە خوێندکارێکی سادەیە و خەڵکی شاری یەزدە، هاتووە بۆ لێکۆڵینەوە لەبارەی هۆزە کۆچەرییەکانەوە، بۆخۆی دەڵێت لە ئەسپ کەوتوومەتە خوارەوە، ئێوەش دەڵێن لێیان داویت. ئێستا ئەگەر ئەم کوڕە یەزدییە لێیان دابێت ئێمە چی بکەین؟ با بۆخۆی بڕوات ئەو کەسە بدۆزێتەوە کە لێیداوە. ئەفسەرێکیان ڕووی کردە من و گوتی تۆ خەڵکی شاری یەزدیت؟ گوتم بەڵێ. ناسناویشم پاپۆلی یەزدییە. گوتی خەڵکی یەزدیت، یاخود ناسناوت پاپۆلی یەزدییە. گوتم خەڵکی شاری یەزدم. گوتی دبلۆمت لەکوێ وەرگرتووە؟ گوتم لەئامادەیی ڕەزا پەهلەوی یەزد. گوتی بۆچی لێرە خەڵکی یەزد هەیە؟ گوتم بەڵێ، دە کۆشکی گوندی ڕاجی هی یەزدییەکانە. گوتی بۆچی نەچوویت بۆلای ئەوان؟ گوتم من لەبارەی کۆچەرییەکانەوە زانیاری کۆدەکەمەوە. کەسە مەدەنییەکە گوتی عەلی خان تۆ لەگەڵ پەری خانمدا بڕۆ، ئێمە ئەم کوڕە دەبەین بۆ بنکەکەی خۆمان و لەوێ بە بێسیم لە ناسنامەکەی دەکۆڵینەوە، ئەم بەندەی خودایە

خەڵکی شاری یەزدە هەوڵ دەدەین ڕێگا چارەیەکی بۆ بدۆزینەوە، بەڵام چونکە کارەکە گوماناوییە ناتوانین کێشەکەی لەبەرچاو نەگرین. عەلی خان گوتی ئەم بەندەیَ خودایە نەخۆشە. ئەفسەرەکە گوتی ئێمە لە بنکەکەماندا دەرمانخانەمان هەیە و لەوێ چارەسەری بۆ دەکەین. یەکێک لە ئەفسەرەکان ڕووی کردە من و گوتی کەلوپەلەکانت کۆبکەرەوە و با بڕۆین. ئەوان کوڵە پشتەکەمیان کۆکردەوە و هەڵیانگرت، خۆشم کیسە خەو و جانتاکەم هەڵگرت و سواری جیپێک بووین. هەوا ئەوەندە سارد بوو، نەک من ئەو سێ کەسەش لە سەرمادا لەرزیان لێهاتبوو. کاتێک کە سواربووین کەسە مەدەنییەکە لێی پرسیم ئەم هۆزە چەند تفەنگیان هەبوو. گوتم من هیچ تفەنگێکم پێ نەبینیون. گوتی پەری خانم هەموو ڕۆژێک دەڕوات بۆ ڕاوکردن چۆن تۆ تفەنگت پێنەدیوە؟ گوتم من هیچم پێنەدیوە. گوتم عەلی خان و منداڵەکانی وایان هەست دەکرد من ساواکی بم و بۆچاودێری کردنی ئەوان ڕۆیشتبم. گوتی بۆیە لێیان داویت. گوتم هیچ کەسێک لە منی نەداوە. گوتی ئاغای پاپۆلی خۆت تووشی دەردی سەری مەکە، ئەوانە هەزاران فێڵ و تەڵەکەیان هەیە، من بە ئانقەست پەری خانم لەژوورەکە دا هێشتەوە تاکو کار و کردەوەکانیان ڕووبەڕوو پێبڵێم، ئەوانە تاکو ئێستا لەگەڵ چەندین کەس شەڕە تفەنگیان کردووە، لە هەموو تایەفەکەیاندا کەسێکی باشی تێدا نییە، تۆ هەست بەوە دەکەیت کە ئەم حاجی عەلی خانە بەم بەفر و بەستەڵەکە چەند کەسی ناردووە حوشترەکان بهێنن؟ حاجی عەلی ئەوانی ئامۆژگاری کردووە کە تفەنگ وفیشەکەکان بشارنەوە.

گەیشتینە بنکەکە، لە نزیک بنکەکە خانوویەکی گەورە هەبوو منیان برد بۆ ئەو خانووە. پیاوە مەدەنییەکە گوتی یان بە ڕاستی پێمدەڵێیت کە تۆ چ پەیوەندییەکت بەم کچە کۆمۆنیست و ئەم عەلی خانەوە هەیە، کە هەمیشە دژایەتی شا دەکەن، یا دەکەمە ئەو ژوورە ساردەوە هەتاکو لە سەرمادا دەمریت. گوتم بەسەرچاو چیت دەوێت بە ڕاستی و بەبێ درۆ پێت دەڵێم. قەڵەم و کاغەزی دایەدەستم و گوتی فەرموو بنووسە؟ گوتم تۆ پرسیارەکانت بکە و با منیش وەڵامەکانت بۆ دەنووسم! ئەو هەمان ئەو پرسیارانەی لێکردم کە پێشتر لێی پرسی بووم، لە سەر کاغەز بۆی نووسیم. منیش هەمان ئەو وەڵامانەی کە پێشتر دابوومەوە، نووسیمەوە. کات گەیشتە شەو، دونیا تاریک بوو. ئەو ژوورەی منیان لێدانا بوو زۆر ساردبوو. گوتم من سەرمامە و ژوورەکەش ساردە. ئەو زۆپایەی لە ژوورەکەدا بوو کەمێک نەوتیان بۆ زیاد کرد. گوتم برسیمە پاش نیو کاتژمێر خواردنیان بۆ هێنام. هەردوو ئەفسەرەکە ڕۆیشتن من و کەسە مەدەنییەکە ماینەوە. تا نزیکی بەیانی جۆرەها پرسیاری لێکردم سەد جار هەمان پرسیارەکانی

پێشووی لێدووبارە دەکردمەوە، دەیانجار مەرایی بۆ کردم، سەدان هەڕەشەشی لێکردم، تەمەنی (٣٥-٣٦) ساڵ دەبوو. ئەویش تەواو هیلاک ببوو. لە پڕ گوتی تا ئێستا لەگەڵ پەری خانمدا نووستویت؟ گوتم بەندەی خودا تۆ چۆن قسەی لەو جۆرە بە کچی خەڵکی دەڵێیت؟ گوتی ئەو کچە کۆمۆنیستە گرنگی بەو شتانە نادات، تۆ دەزانیت ئەم کچە ماوەی یەک ساڵ لەگەڵ گروپێکدا کە هەموویان کوڕ بوون پێکەوە لە ژوورێکدا دەژیان، دەبێت چیان کردبێت پێکەوە؟ گوتم نازانم؟ خۆ من لەگەڵیاندا نەبووم، گوتم تۆ وا دەزانیت ئەم کچە یا هەر کچێکی تری کۆچەرییەکان دەتوانێت لە بەرچاوی دایک و باوک و براکانی لەگەڵ کەسێکدا بخەوێت؟ گوتی باشە پێکەوە ڕۆیشتوون بۆڕا و خۆ ئەو دەشتودەرەش فراوانە و چۆڵەوانیشە. گوتم من لەگەڵیدا نەڕۆیشتوم بۆ ڕاو، بەڵام تۆ بیر لە شتی خراپ دەکەیتەوە. گوتی باشە ئێستا فەرموو لێرە بخەوە. ڕۆیشتم بۆ توالێت، تەوالێتەکە لەناو خانووەکەدا نەبوو بەڵکو لە دەرەوە بوو. سەرما و سەهۆڵبەندان بوو، ئاویش هەمووی بەستبووی، لە ژوورەکەدا زیندانیان کردم. گوتی هەوای ژوورەکە خۆشە. بەتانییەکیان بۆ هێنابووم. گوتی بەتانییەکە لە ژێر خۆتدا ڕابخە، کیسە خەوەکەشت ئەمریکییە و زۆرباشە، بەیانیش بەڕێتدەکەم بۆ بۆجنوورد. گوتم من لە بۆجنوورد کەسێک ناناسم تکات لێدەکەم بۆ مەشهەدم بەڕێبکە. گوتی چونکە خەڵکی یەزدیت و کوڕێکی باشیش دیاریت، سبەی بە بێسیم پەیوەندی دەکەم بە مەشهەد و بۆجنووردەوە، ئەگەر مۆڵەتیان دا یەکسەر بەڕێتدەکەم بۆ مەشهەد. گوتم ئەگەر دەتەوێت گەورەیی بنوێنیت سبەی مۆڵەتم بدە با لەگەڵ مامۆستاکەم دکتۆر لوتفوڵڵای مەفخەم پایان بە تەلەفۆن قسە بکەم. گوتی کام مەفخەم پایان؟ گوتم مامۆستای جوگرافیایە لەزانکۆی مەشهەد. گوتی وامزانی مامۆستای مۆسیقا دەڵێیت. گوتم دکتۆر لوتفوڵڵا هەم مامۆستای جوگرافیایە و هەم مۆسیقاریشە. گوتی ئەوەی کتێبی لەسەر مۆسیقا نووسیووە؟ گوتم بەڵێ. گوتی هەمان ئەوکەسەیە کە ئاوازەکانی میرزا عەبدواڵڵای نووسیوەتەوە؟ گوتم بەڵێ خۆیەتی. گوتی دەڵێن سروودی شا هەر ئەو دایناوە. گوتم منیش وامبیستووە، بەڵام نازانم ڕاستە یان نا. گوتی ئێمە لێرە ڕێگامان پێنەدراوە کە بهێڵین خەڵکی لێرەوە تەلەفۆن بکەن. گوتم کەواتە من ببە بۆ نەخۆشخانەکە لەوێوە تەلەفۆن دەکەم. گوتی با کەمێک بیری لێبکەمەوە، پاشان گوتی دایکت لە یەزدە؟ گوتم بەڵێ گوتی خزم و کەست هەیە لەوێ؟ گوتم بەڵێ. گوتی من هاوسەرەکەم خەڵکی یەزدە و چەندین جار ڕۆیشتووم بۆ یەزد. شێوازی قسەکردنی لەگەڵمدا گۆڕا و بە میهرەبانییەوە قسەی دەکرد. گوتی هەوڵدەدەم سبەی کارێک بکەم تاکو لەگەڵ دکتۆر لوتفوڵڵادا قسە بکەیت، ئێستا بۆخۆت بخەوە،

کاتێک خەریکبوو دەرگاکەم لەسەر دابخات، گوتی دڵنیابم کە خۆت ناکوژیت؟ گوتم بۆچی خۆم بکوژم؟ گوتی مێشکی هەندێکتان بە جۆرێک شۆڕاوەتەوە کاتێک ویستیان لێکۆڵینەوەتان لەگەڵدا بکەن خۆتان دەکوژن. گوتم بۆچی تۆ ئەوەندە گومانت لە من هەیە؟ گوتی کاری من ئەوەیە کە گومان لە هەموو کەسانی سەر ڕووی ئەم زەوییە بکەم. گوتم من بە پێچەوانەی تووە بیر دەکەمەوە بە هەموو کەسانی سەر ڕووی ئەم زەمینە گەشبینم. گوتی ئەگەر وابێت کڵاوت لەسەردەنێن. جانتا و کوڵەپشتەکەمی لەگەڵ خۆی هەڵگرت و دەرگای لە سەر داخستم و ڕۆیشت. زۆر ماندوو بووم، هەموو گیانم ئازاری هەبوو، ژوورەکە ڕاخەری تێدا نەبوو، بەڵکو کاشی کراو بوو، ژوورەکە سارد بوو، هیچ خانوویەکی بە دەورەوە نەبوو، زۆپا نەوتییەکەش دڵۆپ دڵۆپ نەوتی بۆ دەهات، بەو کەمە نەوتە ئەو ژوورە گەورەیە گەرم نەدەبوو. بەتانییەکەم چوارقەد کرد و لەسەرزەویەکە ڕامخست و چوومە نێو کیسە خەوەکەمەوە، زۆر ماندوو بووم، هەر لە بیرکردنەوەدا بووم و خەوم لێنەدەکەوت، پاشان گوتم پێویست ناکات ئەوەندە بیر لەم کێشەیە بکەمەوە خۆ نامکوژن. ناخۆشترین و خراپترین سەرمام لەو شەوەدا بینی، پیاوانی تەمەن حەفتا ساڵیش سەرمای لەو جۆرەیان نەدیبوو. بیرم لەوە دەکردەوە کە ئەم عەلی خانە چەندە پیاوێکی زرنگ و هۆشیارە، بەڵام بۆچی من وابیرم لێکردبووەوە کە لە ناو ئەو شاخ و چۆڵەوانییەدا کەسانی خوێندەوار بوونیان نییە؟ زانیاری لەبارەی عەلی خان و بنەماڵەکەیەوە زۆر بوو، بەڵام من هیچم نەزانی بوو. ئەو ڕۆژە زانیم، پەری خانم شووی کردووە و لە پیاوەکەشی جیا بووەتەوە. برۆ کەوانەکەی و چاوە گەورەکانی پەری هاتنەوە بیرم، پێکەنینم بە خۆم دەهات، بەم هەموو ماندووبوون و شەکەتییەوە هێزی گەنجیم کەوتبووە جووڵە. ئیتر لە هیچ تێنەگەیشتم، ویستم خەونی خۆش ببینم، خەونێکی شیرین لەگەڵ کچێکی وەکو پەری خانمدا، لە باخێک پیاسە بکەین. دەنگی تەقەتەقی دەرگاکە هات. لەخەو ڕاپەڕیم، پیاوە مەدەنییەکە هاتە ژوورەوە. خزمەتکارێک بەدوایەوە بوو، لە سەر سینییەک خواردنی بەیانی بۆ هێنابووم. لەگەڵ کرنەوەی دەرگاکە سەرمایەکی زۆر هاتە ژوورەوە خەریکبوو لە کیسە خەوەکەم بێمە دەرەوە. ئەو پیاوە مەدەنییە گوتی باش نووستیت. نانی بەیانیت بخۆو دەتبەم بۆ گوندەکە لەوێوە تەلەفۆن بکە بۆ مەشهەد. من هاوکاریم کردوویت، بڕیار دراوە ڕاستەوخۆ بنێردرێیت بۆ مەشهەد. گوتم کەی دەمنێرن؟ گوتی ئێستا ڕێگاکان گیراون. گەردەنەی (بەدرانلو) گیراوە و تا ئاشخانەش ڕێگاکە زۆر خراپە دەبێت شۆفڵ بێت و جادەکان پاکبکاتەوە، بۆیە دەبێت چەند ڕۆژێک لێرە میوانی ئێمە بێت. سواری

جێبەکەیان کردم و بردیانم بۆ گوندەکە، لەوێوە بردیانم بۆ شوێنی تەلەفۆنکردن و زۆر بەزەحمەت توانیم تەلەفۆنی زانکۆ وەربگرم، تەلەفۆنەکە مۆدێلی کۆن بوو، بەسیم بەیەکەوە بەسترابوون. حاجی ناسری تەلەفۆنچی هەر چۆنێک بوو دکتۆر لوتفوڵڵای بۆ پەیدا کردم. لەگەڵ دکتۆردا قسەم کرد و کێشەکەم تێگەیاند، دکتۆر گوتی هیچ مەترسە، هەرچییەکم لەدەست بێت بەزوویی بۆتی ئەنجام دەدەم. خەریک بوو تەلەفۆنەکە دابخەمەوە، بەڵام کەسە مەدەنییەکە گوتی تەلەفۆنەکە دامەخەرەوە و بیدەرە دەست من. منیش تەلەفۆنەکەم دایە دەستی و ئەویش لەگەڵ دکتۆردا چاکوچۆنی کرد. گوتی من خوێندکاری ناڕاستەوخۆی تۆم، لەسەر یۆلیۆن و تار کاردەکەم، کتێبەکانی تۆم پەیداکردووە دەیانخوێنمەوە، ئەگەر مۆڵەتم بدەیت دەمەوێت ڕۆژێک بێم بۆ مەشهەد و بە خزمەتت بگەم.. ماوەیەک لەگەڵ دکتۆر لوتفوڵڵادا قسەی کرد، من لەقسەکانی دکتۆر تێنەدەگەیشتم، بەڵام پیاوە مەدەنییەکە لەمنەوە نزیکبوو لە تەواوی قسەکانی تێدەگەیشتم. گوێم لێبوو دەیگوت بەسەر چاو فەرمانەکانی تۆ دەخەمە سەرچاوم. کاتێک تەلەفۆنەکەی داخستەوە گوتی دکتۆر زۆر لە تۆ دڵنیایە و ڕێزی تۆی زۆر لەلایە. گوتم ئەوە گەورەیی خۆیەتی. گوتی بەڵام پاپۆلی باش بزانە کە من هێشتا لە تۆ دڵنیانیم، تۆیان کۆمۆنیستیت و لەگەڵ ئەم کچەدا کاری سیاسی دەکەیت. یاخود هاوڕێیەتیت لەگەڵ ئەم کچەدا هەیە. هەر بۆیەش باسی هیچ شتێک ناکەیت. یاخود تۆ کەسێکی سادە و بێئاگایت و دەتەوێت پایەی خۆت بخەیتە مەترسییەوە بۆ ئەوەی لە خانێکی سەر ڕێبازی موسەدیق و کچێکی تودەیی بەرگری بکەیت. گوتی تۆ دەزانیت ئەو کچ و باوکە چەندین جار لەسەر موسەدیق و حیزبی تودە لەیەکتری توڕە بوون؟ گوتم تۆ چۆن ئەمە دەزانیت؟ گوتی لە هەوارەکەیاندا خەڵکی خۆمان هەیە. زانیم ئەم قسەیەی بە ڕاست نییە. گوتم تۆ یۆلیۆن لێدەدەیت؟ گوتی بەڵێ کاتێک لە تاران بووم لە بەشی مۆسیقا دەمخوێند. مامۆستاکەم لەسەر کتێبەکانی دکتۆر لوتفوڵڵا وانەی پێدەگوتینەوە. ئەو پیاوە لەگەڵمدا میهرەبانتر بوو، سواری جێبەکەی کردمەوە و هێنامیەوە بۆ هەمان ژوورەکەی شەو تێیدا نووستبووم. گوتم تۆ دەتەوێت من تا چەند ڕۆژی تر لەم ژوورە سارد و چۆڵەدا بهێڵیتەوە؟ گوتی من زۆر هاوکاری تۆم کردووە ئەگەرنا دەبوو لە زیندانی بنکەکەماندا بوویتایە. گوتم ئینجا خۆ ئێرە لەگەڵ ئەوێ هیچ جیاوازییەکی نییە. گوتی ئەگەر نارازیت هەر ئێستا دەتگوازمەوە بۆئەوێ. منیش هیچم نەگوت و بێدەنگ بووم. ژوورێکی (٤٥X) مەتر تەنها یەک مێز و کورسییەکی تێدابوو. پەنجەرەکانی بە ئاسن دروستکرا بوون و شوێنی شوشەکانیشی زۆر بچووک بوون بە جۆرێک بوو

هیچ کەسێک نەیدەتوانی لێی دەرباز ببێت. پەنجەرەکان محاجەرەیان تێگیرابوون، لە دەرەوەش دەکرانەوە و پەردەشی پێوە بوو، گڵۆپێکیش لەناوەڕاستی ژوورەکەدا هەبوو هیچی تر، دۆلابێکی بەتاڵیشی تێدا بوو، توالێتەکانیش لە دەرەوەی خانووەکەدا بوون. دووریی نێوان ژوورەکەی من تاکو بنکەکە (٧٠-٨٠) مەتر دەبوو. کەسە مەدەنییەکە گوتی پێیاندەڵێم نانی نیوەڕۆ و ئێوارەشت بۆ بهێنن. منی کردەوە ژوورەوە و لە دیوی دەرەوە دەرگاکەی لە سەر داخستم و ڕۆیشت.

تەنها خۆم و کیسە خەوەکەم بووین. ئەوان شەوی پێشتر کۆڵەپشتەکەمیان لەگەڵ خۆیاندا برد بوو. هەر ئەو پیاوە جانتا بچکۆلەکەشمی بردبوو، کە مۆڵەت نامەکەمی تێدا بوو دەفتەری یادەوەریی و قەڵەمەکەشمی برد بوو. من مامەوە و لەگەڵ ژوورێکی بەتاڵ و سپیەتی بەفر تاکو سەر لووتکەی کێوەکان، باڵندەیەک بە ئاسمانەوە نەبوو، ژوورەکەش لە یەک لاوە پەنجەرەی هەبوو، لەسەر بەتانییەکە دانیشتم و کیسە خەوەکەم کردەوە و لە خۆمەوە پێچا، سەرمایەکی زۆر بەهێز بوو، وام هەست دەکرد کە زۆپاکەش دەسووتا پلەی گەرمی لە ژوورەکەدا سفر پلەی سەدی بووبێت. ئەو لایەم کە ڕووی لە زۆپاکە بوو سوور ببووەوە، لاکەی دیکەشم وەک ببوو بە سەهۆڵ. ئەو پیاوە نیوەڕۆ گەڕایەوە بۆلام و یەک سینی خواردنیشی هێنابوو لەسەر مێزەکە دایناو. گوتی نانەکەت بخۆ و بڕۆ. گوتم بۆ کوێ بڕۆم؟ گوتی لە مەشهەدەوە تەلەفۆنیان کردووە کە ئازاد بکرێیت، دکتۆر لوتفوڵڵا بووە بە کەفیلت. گوتی کاتێک کە گەیشتیتە مەشهەد ئەو خۆی بانگت دەکات و قسەت لەگەڵدا دەکات، وا هەست دەکەم لەوێش ئازاد بکرێیت. گوتم کەواتە کۆڵەپشتەکەمم پێبدەنەوە. ڕۆیشت لە نێو جێبەکەدا کۆڵەپشت و جانتاکەمی بۆ هێنام. سەیری کۆڵەپشتەکەمم کرد هەمووشتەکانی تێدابوو، تەنها نەخشەکەی تێدا نەبوو. گوتم نەخشەکەی تێدا نییە. گوتی ئەوە هاوپێچی دۆسیەکەتی دەکەم و خۆم دەینێرم. پاش چەند وتووێژێک نەخشەکەی بۆهێنام و گوتی ئەوش نەخشەکە لەگەڵ خۆتا ببە و بڕۆ. ئەگەر حەزدەکەیت دۆسیەکەشت دەدەمە دەست و خۆت ببە. گوتم زۆر سوپاست دەکەم بۆ ئەو متمانەیەی بە منت هەیە. گوتم بەڵام من ئێستا بەم بەفر و سەهۆڵبەندانە چۆن بڕۆم بۆ گوندەکە؟ لێرەوە تاکو گوندەکە سێ کیلۆ مەتر ڕێگا دەبێت. گوتی ئێستا پێیاندەڵم کە بێن بتگەیەننە گوندەکە. خۆی سواری جێبەکە بوو ڕۆیشت، پاش پازدە خولەک سەربازێک بە هەمان جێبەوە هات و منی سوارکرد و ڕۆیشتین بەرەو گوندەکە، لە گوندەکەدا لە بەردەمی قوتابخانەکە دابەزیم. یەکەم کەس کە منی بینی عەبدولعەلی بڵند بوو، بە دەنگێکی بەرز هاواری کرد و گوتی موهەندیس هاتەوە. یەکێک گوتی

سڵاوات لە گیانی پاکی پێغەمبەر. هەر کەسێک لەوێ بوو سڵاواتی لێدەدا. عەلی خان و منداڵانی لە ژوورەکەیان هاتنە دەرەوە. عەلی خان بە سەرسوڕمانەوە سەیری دەکردم، پەری خانم پەنجەکانی بە شێوەی ژمارە حەوت بڵند کرد، واتە سەرکەوتو بوویت. ئەسپەندیان هێنا و دوکەڵیان دروستکرد. عەلی خان باوەشی پێدا کردم و ماچیکردم، بەڵام من بچکۆلانە بووم تاکو سەر سنگی ئەو دەبووم. ئەو پیاوێکی تەمەن شەستوپێنجساڵ بوو، وەکو کێو لەبەردەممدا وەستابوو. کوڕەکانیش، برزوو و عەبداڵ ئەو مەڕو حوشترانەی کە زیندووبوون، هەموویان هێنابوونەوە. خۆشیان زۆر سەرمایان ببوو، ڕۆیشتبوون بۆ نەخۆشخانەکە. عەبدولعەلی بڵند گوتی موهەندیس ماڵوێران بووم. لە (٥٥٠) سەر مەڕ و بەرخ تەنها سیوحەوت مەڕم بۆ ماوەتەوە، دوو ئەسپم هەبوو هەردوکیان تۆپیون. حاجی عەلی خان گوتی عەبدولعەلی سەرت سەلامەت بێت ماڵی دونیا بایە دێت و دەڕوات. عەبدولعەلی گوتی بە خودا بۆخۆشمان هەر ماڵی باین هەردەبێت بڕۆین. عەلی خان بە کەیف بوو، وەک ئەوەی هیچ شتێک ڕووی نەدابێت. بەیانی گوتبووی حوشترێک سەرببڕن و خواردن بۆ هەمووان دروستبکەن. دوو کەسی تریش لە کۆچەرییەکان مردبوون، شوانێک و منداڵێکی (٧-٨) ساڵ. ژمارەی مردووەکان لە زیادبووندا بوو، زۆربەیان بەهۆی ئاوسانی سییەکانەوە دەمردن. زەوی بەستبووی بەفرێکی زۆر باریبوو، کەس نەیدەتوانی گۆڕ هەڵکەنێت، تەرمەکان لە نێو ژوورێکدا بوون کە پەنجەرەکانی کراوە بوون، چاوەڕوانی ئەوەیان دەکرد کەمێک هەوا خۆش ببێت و بە خاکیان بسپێرن. سێ کچی فەرەنسی لێپرسراوی کاروباری خەڵکەکە بوون. عەلی خان منی بردە ژوورەکەی خۆیەوە چایەکیان بۆ تێکردم و حاڵم هاتەوە سەرخۆ. عەلی خان گوتی چی بوو، چی ڕوویدا؟ منیش تێکڕای بەسەرهاتەکەم بۆ گێڕایەوە. گوڵخەندان گوتی بە ڕاستی ئێمە نەمانزانی تۆ ئەوەندە پیاویت، ئەمجارەش من داوای لێبوردنت لێدەکەم. عەلی خان چایەکی دیکەی بۆ دانام و گوتی قاچەکانت درێژبکە، بە تەواوی پشوو بدە. گوتم دەڕۆم شوێنێک پەیدا دەکەم تا کەمێک بخەوم. جەوهەر خانم گوتی هەموو ژوورەکان پڕن، شوێنی بەتاڵ نەماوە، هەر لە شوێنی خۆت بخەوە، ڕەنگە ئێمە ئەمشەو بچین بۆ ماڵە ئاشناکانمان، ئەم ژوورەش زۆر قەرەباڵغە و ڕێگاش بەستراوە. لە عەلی خانم پرسی بەرنامەتان چیە و چی دەکەن؟ ئایا دەڕۆن بۆ تورکمان سەحرا؟ عەلی خان گوتی ئاغای پاپۆلی من لەگەڵ منداڵەکاندا قسەم کردووە، ئەو چەند سەر ئاژەڵەی کە ماوەمە دەیانفرۆشم و دەڕۆم بۆ تاران. گوتم دەتەوێت لە تاران چی بکەیت؟ گوتی خودا گەورەیە، خانوویەکم هەیە، لە مەیدانی (بار) یش دوکانێکم هەیە،

چەند ساڵێکە ئەوانەم هەیە. ساڵی (١٣٣٢-١٩٥٣) کە دەسگیرکرام و بردیانم بۆ زیندان، هەژدە هەزار تومەن قەرزم لای پیاوێک هەبوو، ئەو سەردەمە ئەو برە پارەیە یەکجار زۆر بوو، وامدەزانی ئەو کەسە پارەکەی خواردوم و نامداتەوە، پاش دوو سێ مانگ کە من لە زیندان بووم، ئەو حاجییەی پارەکەم لای بوو، هات بۆ سەردانم و پێیگوتم پارەکەت هەر لای خۆمە و چی لێبکەم؟ گوتم حاجی دیار نییە من تاکەی لەزینداندا دەمێنمەوە، کێ دەڵێت نامکوژن؟ من ژن و منداڵم هەیە.. تۆ ئەو پارەیەی من بخەرە کارەوە و سوودە کەشی بدە بەژن و منداڵەکانم. حاجی گوتی دوکانێکی گەورە بە تەنیشت دوکانەکەی خۆمەوەیە، خاوەنەکەی دەیفرۆشرێت، ئەوەت بۆ دەکرم. ئەگەر کەسێکی سەر ڕاستم دەستکەوت دوکانەکەی پێدەدەم کاری تێدا بکات. ئەگەر کەسێکی واشم دەست نەکەوت ئەوا دوکانەکەت بۆ دەدەم بە کرێ و کرێکەی دەنێرم بۆ ژن و منداڵەکانت. بەم جۆرە من بووم بە خاوەنی دوکانێک لە مەیدانی (بار)ی تاران، ئێستاش ساڵانە دەیدەم بەکرێ، چەند مانگێکی تری ماوە گرێبەستی ئەمساڵی تەواو دەبێت و خۆم دەچمە سەر دوکانەکە و کاری تێدا دەکەم. ڕۆن و کەشک و خوریی و پێستەی تێدا دەفرۆشم. خان گوتی ئەو حاجییەی بازاڕ، خودا دەست بە تەمەنیەوە بگرێت. تەنها بە حەوت هەزار تومەن ئەو دوکانە گەورەیەی بۆ کڕیوم، بە پارە زیادەکەی تریش پارچە زەوییەکیشی لە گەڕەکی (قەلهەک) بۆ کڕیبووم. پاشان خۆم لەسەر زەوییەکە خانووم دروستکرد، خانووەکەشم داوە بە کرێ، نزیکی نەورۆز ماوەی کرێکەی ئەویش تەواو دەبێت. پەری خانم گوتی باش بوو لە کۆتاییدا باوکم هاتە سەر ئەو بڕیارەی مەڕەکان بفرۆشێت و بەرەو تاران بڕۆین.

پیاوێک کە بە درێژایی تەمەنی دەیگوت مەڕێک بە هەموو دونیا ناگۆڕمەوە، ئێستا تەسلیم بووە و.. تەسلیم بە ڕقی سروشت بووە، تەسلیم بە تەمەن و پیریی خۆی بووە. دیار بوو تەسلیمی قسەی خەڵک ببوو. ئەو دەیگوت لەم دەشتودەرەدا و لە نێو ئەم هەوارە بچووکەدا مرۆڤ هەر کارێک بکات هەموو خەڵکی پێی دەزانن. کاربەدەستانی دەوڵەت هەمیشە کێشەمان بۆ دروست دەکەن، منداڵەکانم تووشی کێشە دەکەن، هیچ شتێک لە خودا شاراوە نییە و تۆش با بیزانیت یەکێک لە کورەکانم ڕایکردووە و لە دەرەوەی وڵاتە. ئەوەشیان -ئاماژەی بە پەری خانم دا- بەو شێوەیە باسی لێوە دەکرێت کە خۆت باش بیستووتە، کوڕێکم لە تاران لە زیندانداییە، لە تاران خەڵک ونە، لەوێ کەس نازانێت ئێمە کێین، پیاوانی دەوڵەتیش لەوێ بە شوێنماندا ناگەڕێن و کێشەمان بۆ دروست ناکەن، بۆیە دەڕۆم تاکو بژیم، دەڕۆم تاکو ونببم، ئێمە لە یاری

ئاژەڵدارییدا دۆڕاوین. پەری خانم گوتی تازە دەمانەوێت لە یاری ژیاندا براوەبین، ئەگەر بڕۆین بۆ تاران دەچینە دونیایەکی ترەوە. عەلی خان گوتی بەو مەرجەی تۆ و هاوڕێکانت وازبهێنن. پەری خانم گوتی من بڕیاردەدەم نزیکی هاوڕێکانم نەکەومەوە. عەلی خان گوتی دەڕۆین و ون دەبین.

دکتۆر غولام ئیبراهیمی بەم شێوە پێناسەی شاردەکات، کە من تا ئێستا پێناسەی وا جوانم نەبیستووە. ئەو دەیگوت «شار جێگایەکە مرۆڤ دۆستی تایبەتی لێی هەیە». ئەم پێناسە زانستییە هەمان قسەیە، کە عەلی خان گوتی دەڕۆم لەتاراندا ون دەبم. بۆچی دەیویست ون ببێت؟ چونکە دەیویست لە خەڵکانی دیکە نزیک ببێتەوە. ئەگەر ئەم پێناسەیە لەگوێ بگرن لە ئێراندا تەنها یەک شار هەیە ئەویش تارانە. من هەمیشە گوتوومە مەشهەد گوندێکی پەنجا هەزار کەسییە، لێرەدا پێکهاتەی کاروباری کۆمەڵایەتی مەشهەد بە جۆرێکە، کە هەموو کەسەکان دەتوانن بەدوای یەکتریدا بگەڕێن و ئاگایان لە یەکتری بێت، کاتێک لە هەواری کۆچەرییەکاندا یا لە گوندێکدا یا لە شارێکی بچووکدا دەژیت، هەموو کەسەکان ئاگاداری کاروبار و چۆنێتی ژیانی یەکترین. هەمووان دەزانن چی دەخۆیت؟ بۆکوێ دەچیت؟ چی لەبەردەکەیت و چیت زانیوە؟ عەلی خان و پەری خانم دەیانویست بڕۆن بۆ شوێنێک هیچ کەس نەزانێت چی دەکەن.. لە ڕاڕەوی قوتابخانەکەدا خەڵکی دانیشتبوون یا نووستبوون، هەموویان لە نا ئومێدیدا سەریان داخستبوو. خان چەند کەسێکی نارد تاکو لەگەڵ پیاوماقوڵ و ڕیش سپییانی گوندەکەدا قسەبکەن، بەڵکو ڕێگەچارەیەک بۆ بە خاکسپاردنی مردووەکانیان بدۆزنەوە. خەڵکەکە دەیانگوت ئەوە تاوانە ئەم مردووانە لە ژوورێکدا دانراون و بەخاک نەسپێردراون. لەو کاتەدا عەبدولعەلی بڵند و حاجی ڕۆستەم هاتنە ژوورەوە و گوتیان وا چەند کەسێکی خێرخواز. گۆڕیان هەڵکەندووە هەر ئێستا مردووەکان بەخاک دەسپێرین. با، بڕۆین خێرا نوێژی مردوویان لەسەربکەین. بە زوویی نوێژیان لەسەر کرا و بەخاکیان سپاردن. ئەمجارە کەس بە منی نەگوت نوێژی مردوو بکەم. چونکە ئەمجارەیان فێر ببووم چۆن نوێژی مردوو دەکرێت. کاری ئەم وڵاتەی ئێمە ئەوهایە کاتێک لە شتێک نازانیت بە زۆر پەلکێشت دەکەن و کارەکەت پێئەنجام دەدەن، کاتێک شارەزایت و سەر لە کارەکە دەردەکەیت کارەکەت پێناسپێرن. لێرەدا یادی خەینسای بێچارە هاتەوە یادم کە من نوێژی مردووم لە سەر کرد. دوای نانخواردنی نیوەڕۆ دەفتەرەکەم دەرکرد بۆ نووسینەوەی یادەوەرییەکانم. دەستمکرد بە نووسینی بڕی ئەو زیانانەی لە خەڵکەکە کەوتبوو. فەرهاد توپکانلو گوتی یەک حوشتر، هەژدە سەر مەڕ نۆ بزن، یەک وڵاخیش

ئێستا حەوت مەڕو یەک وڵاخم ماوە. ڕەزای تۆپکانلو بیستوچوار مەڕ، شەش بزن، یەک حوشتری هەبوو. گوتی ئێستا تەنها سێ مەڕم ماوە، لەو کاتەدا فرمێسک بە چاوەکانیدا دەهاتنە خوارەوە و گوتی موهەندیس هەژار و گەدا ماینەوە. ئێستا نازانم چی بکەم؟ دەبێت ڕوو بکەمە کوێ؟ خانەکانیش هەژار بوون، ئیتر خانیش نامێنن، ئێمەش جگە لە ئاژەڵداریی هیچ کارێکی تر نازانین. گوتم ژن و منداڵت هەموو سەلامەتن. گوتی بەڵێ سوپاس بۆ خودا. گوتم تەمەنت چەندە؟ گوتی سیوحەوت ساڵم. گوتم دڵنیابە برسی نابن. گوتی خودا بکات پەرێشان نەبین، من خۆم دەڕۆم بۆ شارەکان کرێکاری دەکەم، بەڵام نازانم ژن و منداڵەکانم بەکێ بسپێرم؟ پرسیارم لە هەر کەسێک دەکرد لانیکەم سێ بەشی ئاژەڵەکانی لەدەستدابوو. منیش گریانم دەهات بۆیان. ئەو خەڵکە بەو هەموو هەژارییەوە، بەڵام نەفسێکی بەرزیان هەبوو. سروشت وەلای خستبوون، ئەوان پاروووە نان و کەشکێکیان دەستدەکەوت، ئێستا ئەو پاروە نان و کەشکەشیان لەدەستچووە.

بیری لێبکەرەوە کەسێک خاوەنی بیستوچوار سەر مەڕ و شەش سەر بزن بووە، کەچی خۆی بە دەوڵەمەند زانیوە، ئێستاش بە نەمانی مەڕەکانی ئەویش هەژار کەوتووە. شا دەیویست بەم خەڵکە هەژارەوە وڵات بەرەو دەروازەیەکی پێشکەوتنی گەورە بەرێت. ئەوە بوو خۆی کۆتاییەکەی بینی. هەر کەسێک بیەوێت ئەو خەڵکە بەو جۆرە هەژار بکات، خۆی کۆتاییەکەی بەباشی دەبینێت..

من مامۆستایەکی خانەنشینی زانکۆ بووم، لە ساڵی (١٣٩١-٢٠١٢) دا هەستم بە هەژاریی خۆم دەکرد، بە تەواوی هەستدەکەم کە من و چەند ملیۆن کەسی وەک من هەژار کەوتووین، تاکو چەند کەسێکی دیاریکراو دەوڵەمەند بین. ئەوانەی کە دەبنە هۆکاری ئەم کارە نارەوایە دەبێت بە ئێش و ئازارەوە سەر بنێنەوە، ئەوە قسەی من نییە، بەڵکو قسەی خودای گەورەیە. من نزیکەی پەنجاوپێنج ساڵ هەوڵم دا تاکو لە هەژاری ڕزگارم ببێت، بەڵام لەناکاو لە ماوەی بیست ڕۆژدا نرخی پارەی وڵات نیواونیو دابەزی، ملیۆنەها کەسی وەکو منیان هەژار کرد، چەند هەزار کەسیش بوون بە ملیاردێر. خودای گەورە ڕەحم بەکرێکار و فەرمانبەرە هەژارەکان بکات کە مووچەیەکی کەم دێتە دەستیان و بەشی هیچیان ناکات.

با بگەڕێینەوە بۆ ساڵی (١٣٤٨-١٩٦٩) ڕۆژ درەنگ بوو، بانگی ئێوارەشی دا بوو، هێشتا هیچ هاوکاری و خزمەتگوزارییەک بەو خەڵکە سەرگەردانە نەگەیشتبوو. بە گشتی چواردە کەس مردبوون. یازدە کەس لە کۆچەرییەکان و سێ کەسی خەڵکی گوندی ڕاجی. عەلی خان بانگی کردم و گوتی موهەندیس ئەو خەڵکە دڵتەنگ و جەرگ

سووتاون، واز لە پرسیارکردن و نووسین بهێنە، وەرە مەڕاسیمێک ڕێکبخە با ئەو خەڵکە هەندێک بگرین و کڵوکۆی دڵیان دامرکێتەوە و خاوەن مردووەکان ئارام ببنەوە. گوتم بەسەرچاو هەر ئێستا خەڵکەکە ئاگادار بکەنەوە و منیش ئامادەم. عەلی خان بانگی حاجی ڕۆستەمی کرد و گوتی موهەندیس دەیەوێت مەڕاسیمێک سازبکات خەڵکەکە کۆبکەرەوە. حاجی ڕۆستەم و حاجی ڕەزا و عەبدول بڵند و چەند کەسێکی تر خەڵکەکەیان ئاگادارکردەوە. پێیانگوتن لە ڕاڕەوی قوتابخانەکە دابنیشن. موهەندیس مەڕاسیم دەگێرێک. منیش چووم و دەستمکرد بە خوێندنی مەڕاسیمی ئیمام حسێن. پاشان باسی دەردیسەرییەکانی حەزرەتی زەینەبم بۆ کردن، ئەو خەڵکە بە جۆرێک کەوتنە گریان کە خۆشم گریانم دەهات، سەیرم کرد حاجی عەلی خانیش هۆن هۆن دەگری، لە هەموو تەمەنمدا گریانی بەو جۆرەم نەبینیبوو. نەمزانی گریانەکە چەندی بۆ ئیمام حسێن و ئیمام زەینەب بوو، چەندیشی بۆ لە دەستدانی کەسە خۆشەویستەکانیان و بۆ لە دەستدانی مەڕ و حوشترەکانیان بوو، چەندیشی بۆ هەژاریی و ئایندەی خۆیان بوو. دەزانم کە نە من ویستم مەڕاسیمەکە تەواو بکەم و نە ئەوانیش ویستیان تەواو ببێت. کاتێک مەڕاسیمەکەم تەواو کرد عەبدولعەلی گوتی موهەندیس من نەمدەزانی تۆ شارەزاییت لە مەڕاسیمدا هەیە، بە ڕاستی بە خوێندنی مەڕاسیمەکەی تۆ کەمێک دڵم هاتەوە سەرخۆ، مەڕەکانم هەموو لەدەستداوە، تازە زیندوو نابنەوە، حەزمدەکرد بگریم، بەڵام لە بەرچاوی ئەو خەڵکە نەدەکرا بگریم، باش بوو بە مەڕاسیمەکەی تۆ، هەموومان کەفوکوڵی دڵمان ڕشت، ئیتر لە ئەمڕۆ بە دواوە من ئاژەڵداریی ناکەم و دەچمە کەناری ڕووباری ئەتراک لەوێ خەریکی کشتوکاڵ و پەموو چاندن دەبم.

پاشان ئەو هەر ئەو کارەی کرد کە گوتی. ئەو چەندین ساڵ لە کەناری ڕووباری ئەتراک خەریکی کارکردن بوو. گوندێکی بێ ئاوی لەنێوان جادەی (پێش قەڵا و ئاغمزار) دا دروستکرد خۆی و بنەماڵەکەی لە زەوییەکانی دەم ڕووبارەکە کرێکارییان دەکرد، تا ساڵی (١٣٦٤-١٩٨٥) چەند جارێک سەردانم کردن، ئەو پیاوێکی زۆر خۆڕاگر و ئازا بوو، لە دەیەی (١٣٧٠-١٩٩١) دا کۆچی دوایی کرد. دواین جار لەگەڵ چەند هاوڕێیەکمدا لە هاوینی (١٣٩١-٢٠١٢) دا چووم بۆ ئەو ناوچەیە و لە هەواڵی کوڕەکانیم پرسی، بەڵام هیچیان لەوێ نەمابوون، ڕۆیشتبوون بۆ بۆجنوورد و دێهاتەکانی تر، تەنها یادەوەرییەکانیان لەوێ جێمابوو.

شەو هەواڵیان هێنا کە حاجی وەلی خانی قارەمانلو نزیکەی هەموو مەڕەکانی لەناو چوون. بەفر و سەهۆڵبەندان خانەکانی ماڵوێران کردبوو. حاجی وەلی خان حەقدە

منداڵی هەبوو، ئەو پاشان ئەو چەند سەر مەڕەی کە مابووی فرۆشتنی و لە خۆرئاوای شاری بۆجنوورد لە نزیک بەنزیخانەکە زەوی کڕی و کێڵگەی مریشک بەخێوکردنی دامەزراند. من دوایین جار ئەوم لە ساڵی (١٣٥٨-١٩٧٩) دا بینی و لە (١٦-٢-١٣٩١=٦-٥-٢٠١٢) دا سەردانی کوڕی کچەکەیم کرد لە بۆجنوورد.

لە کاتژمێر یازدەی شەوی (٧ی مانگی دەی = ٢٨ی کانونی یەکەم)دا پلەی گەرما بیست‌وحەوت پلە ژێر سفر بوو، کەشناسی مەشهەدیش هەمان ژمارەی بڵاوکردەوە. سەرمایەکی زۆر ترسناک بوو. ڕێگەی پەنجا مەتری نێوان قوتابخانە و نەخۆشخانەکە زۆر بە ئەستەم هاتوچۆی پێدا دەکرا. برزوو و عەبدال و فەریبورز لە نەخۆشخانە دەرچووبوون، لەگەڵ هاوڕێ و هاوتەمەنەکانی خۆیاندا لە ڕاڕەوی قوتابخانەکە یاری تۆپێنیان دەکرد وەک ئەوەی هیچ شتێک ڕووی نەدابێت، «یەلە»ش وریا ببووەوە و هاوکاری کچە فەڕەنسییەکانی دەکرد، بە بەردەوامی لەگەڵ ئەواندا بوو، لێیان جیا نەدەبووەوە و هەر کارێکیان پێبسپاردایە ئەنجامی دەدا، دەست و دەموچاوی زۆر خاوێن بوو، پێڵاوەکانیشی بۆیاخ کردبوو، چەند شەوێک بوو ئەوم نەبینی بوو، ڕۆژێک گوتم «یەلە» شەو لە کوێ دەخەویت؟ گوتی خوشکە فەڕەنسییەکانم قەرەوێڵەیان داومەتێ لەسەری دەخەوم. گوتم لەکوێ؟ گوتی ئەوانە شەوان من دەبەنەوە بۆ ماڵی خۆیان. دوو ڕۆژ دواتر «یەلە»م بینییەوە سەیرم کرد چەند وشەیەکی فەڕەنسی فێرببوو.

خواردن و خواردەمەنی لە گوندەکەدا لە تەواوبووندا بوو، ڕێگەکانیش نەکرابوونەوە. هیچ ئۆتۆمبێلێک لە ئاشخانە و تورکمان سەحراوە هاتوچۆیان نەدەکرد. هەموو ڕێگەکان بەهۆی سەهۆڵبەندانەوە داخرابوون، بەڵام پەیوەندییەکانی من لەگەڵ عەلی خان و بنەماڵەکەی گەرموگوڕتر ببوو. دوای مەڕاسیمەکە پەری خانم گوتی حسێن مەڕاسیم زۆر باش دەخوێنیت. گوتم خۆتۆ پێشتریش گوێت لە خوێندنی مەڕاسیمی من بووە. گوتی ساڵی پار لە ڕەشماڵەکەی گوڵبەهاردا مەڕاسیمێکت خوێند، ئەو کاتە حەزمدەکرد بە یەک فیشەک مێشکت بپرژێنم، بەڵام ئەمجارە فرمێسک بە چاوانمدا هاتە خوارەوە. گوتم فرمێسکەکانت بۆ من بوو یا بۆ گیان لەدەستدانی ئەسپەکەت؟ گوتی بە هەرچیت باوەڕ هەیە هەژاری و ماڵوێرانی ئەو خەڵکە و مەرگی ئەو چەند کەسە منیان هێنایە گریان، جا باوەڕ دەکەیت یان نا ئەوە کەیفی خۆتە، بەڵام تۆ وا بیردەکەیتەوە چونکە من کۆمۆنیستم مرۆڤ نیم؟ گوتم وا نییە کاتێک بینیم لەو سەرمایەدا منداڵە پێنج ساڵەکەی خەینسات لە باوەش گرتبوو، گەرمت دەکردەوە تێگەیشتم کە تۆ چ هەست و

میهرەبانییەکت هەیە. گوتی دڵم زۆر تەنگە حەزدەکەم بەیەکەوە هەندێک قسە بکەین. گوتم باشە، بەڵام بەو مەرجەی قسەکانمان باسی سیاسەت نەبێت. گوتی تۆ لە من تورەیت؟ خەریک بوو بڵێم بەندەی خودا چۆن تورە لێت تورە نیم، لە کاتێکدا تۆ ویستت من بکوژیت، خۆت و خوشکەکانت بە نیازی مردن لێتان دەدام، بەهۆی تووە ساواک دۆسیەیەکی گەورەی بۆ کردومەتەوە، کە هێشتا دیار نییە لە دوایدا چی ڕوودەدات؟ سەیرێکی کردم و چاوەڕوانی وەڵام بوو، بە بێ ویستی خۆم، گوتم کاتێک سەیری تۆ دەکەم جگە لە هونەر هیچی تر لە تۆدا نابینم.

**چاوی بەدبین دەربەڕێت و کوێر ببێت**
**لە دیدی خۆی خەوش لە هونەریش دەگرێت**
**گەر هونەرێکت هەبێت و حەفتا خەوش**
**دۆست جگە لە هونەرەکەت هیچ نابینێت**

پێکەنینێکی کرد و گوتی جگە لە جوگرافیا لە ئەدەبیشدا شارەزایت هەیە؟ دیارە گوڵستانیشت لەبەرە..

عەلی خان نزیکەی سەدوپەنجا سەر مەڕی دابەشکرد بەسەر خەڵکی هەوارەکەیدا، ئەوە هاوکارییەکی باش بوو، بۆ ئەو خەڵکە هەژارە، حوشترێکیشی دا بە برزوو. ڕۆژێکیان هەوا زۆر سارد نەبوو عەلی خان و عەبدولعەلی باڵند دوو ئۆتۆمبێلیان بەکرێگرت و چەند کەسێکیان لەگەڵ خۆیاندا سوارکرد و ڕۆیشتن بۆهەوارەکە. واتە بۆئەو شوێنەی چەند شەوێک لەوەوبەر هەموو ئاژەڵەکانیان تیاچوون و خۆشمان هێندەی نەمابوو تیابچین. ئەو کەلوپەلانەی لێیان جێمابوو کۆیان کردبووەوە و هێنابوویاننەوە. منیش لە گوندەکەدا مابوومەوە و سەردانێکی بەشی چارەسەری نەخۆشیی گەڕیم کرد و هەندێک قسەم لەگەڵ کردن نەخۆشەکانی ئەوێ زۆربەیان کێشەی جەستەیان هەبوو. توانای کارکردنیان کەمبوو. لە نەخۆشخانەکەدا ڕاهێنانیان پێدەکردن و فێریان دەکردن کە باوەڕیان بە خۆیان هەبێت. وایان لێدەکردن چۆن دووبارە بگەڕێنەوە نێو کۆمەڵگە، چۆن کار بکەن؟ فێری پیشە دەستییەکانیان دەکردن، ئامادەیان دەکردن تاکو بگەڕێنەوە بۆ ژیانی ئاسایی. هەندێک لەو نەخۆشانە پێکەوە زەماوەندان کردبوو.

ئەو سێ خوشکە فەڕەنسییە کۆچەرییەکانیان فێردەکرد چۆن بچنە توالێت، فێریان دەکردن هەمیشە دوای چوونە توالێت دەبێت دەستیان بە ئاو و سابوون بشۆن، فێریان دەکردن کە دەوروبەری خۆیان گسک بدەن و شوێنی نووستن و دانیشتنیان خاوێن ڕابگرن. «یەلە»ش دەهات و دەیگوت ئەو خوشکانە گوتویانە ڕاڕەوەکە جوان گسک

بدەن و پیسییەکانیش کۆبکەنەوە و بیانکەنە نێو سەتڵی خۆڵە کانەوە. «یەلە» ببوو بە وتەبێژی کچە فەرەنسییەکان. چوار ماڵ لەوانەی لە هەوارەکەی عەبدولعەلی بڵند بوون، هەر لە گوندەکە کاری بەخێوکردنی مانگایان دەستکەوتبوو. بە هەر ماڵێکیان ژوورێکیان پێدان و نیشتەجێ بوون و دەیانگوت خودا گەورەیە. برزوو بێتاقەت و غەمگین بوو، رۆژێک هاوتەمەنەکانی خۆی لە دەوری کۆبووبوونەوە، گوتم برزوو بۆچی وا دۆش داماویت؟ غەفار گوتی ئەوە دەزگیرانەکەی مردووە. غەفار هەر ئەوەندەی گوت و برزوو پەلاماریدا، تا من فریا کەوتم لەیەکیان بکەمەوە غەفار چەند شەقێکی خوارد و لە لوتییەوە خوێن هات. پاشان لەیەکم کردنەوە و منیش پێم سەیر بوو، گوتم بۆچی برزوو دەزگیرانی هەبوو تاکو بمرێت؟ چونکە لەو چەند رۆژەدا کچی گەنج نەمرد بوو. تەنها ژنی گەنج کەوتبوون یا بە هۆی سەرماوە مردبوون. ئەوانەی تریش کە مردبوون یا پیر بوون یا منداڵ. ویستم بپرسم ئەو کێشەیە چییە؟ عەبدال پەنجەکانی خستە نێو لوتییەوە. ئیدی منیش چیدی پرسیارم نەکرد. کاتێک لەگەڵ عەبدالدا تەنها ماینەوە گوتم ئەو بابەتە چی بوو؟ گوتی ئەوە، برزوو ماکەرێکی هەبوو ئەو ماکەرە لە بەفرەکەدا مرد. غەفار سەری خستبووە سەری و پێیگوت بوو تۆ لەبەر خاتری دەزگیرانەکەت نەچوویت بۆ شار بۆ کارکردن، ئەوا دەزگیرانەکەشت مرد ئیتر لێرە کارت نەماوە و برۆ بۆ شار. دیار بوو برزوو بۆ خواردن لە هیچ شتێک نەدەگەڕایەوە بۆ تێرکردنی نەفسیشی لەهچ شتێک نەدەگەڕایەوە، ئەو کوڕە گەنجە وەک فیشەکی ئاگراوی وابوو هیچ کاتێک بێکار نەبوو لە سەختترین کاتدا ئەو بێ جووڵە نەبوو. مارمێلکە، مار، کەروێشک، بەراز، گورگ و ڕێوی دەکوشت و دەیخواردن. پاشماوەی ئەو مەڕانەی کە گورگ خواردبوونی ئەوانەشی دەخوارد. دەیگوت بۆ کەسانی برسی لەو چۆڵە وانیەدا حەرام و حەڵاڵ هیچ مانایەکیان نییە.

من هەموو ڕۆژێک یادەوەرییەکانی خۆم دەنووسیەوە. دوا نیوەڕۆیانیش مەڕاسیمم ڕێکدەخست. واتە خەڵکەکە خۆیان دەهاتن دەیانگوت موهەندیس کاتی مەڕاسیمە. ڕۆژێکیان بڕیار وابوو لە مزگەوتی گوندەکە مەڕاسیمیان بۆ بخوێنم، تاکو خەڵکی گوندەکەش هەموویان بێن بۆ مزگەوت و گوێ لە مەڕاسیمەکە بگرن. هەوا زۆر سارد بوو، مزگەوتیان باش گەرم کردبوو، خەڵکێکی زۆر کۆببوونەوە. منیش چوومە سەر مینبەر ویستم باسی موسیبەتی منداڵانی موسلیمی کوڕی عەقیل بکەم، کە سەیرم کرد ئەو پیاوە مەدەنیەی لێکۆڵینەوەی لەگەڵدا دەکردم هاتە نێو خەڵکەکەوە. زانیم کەسێک هەواڵی ئەو مەڕاسیمەی پێڕاگەیاندووە. هەر بۆیە ئەویش هاتبوو تا ڕاپۆرتێک بنووسێت.

منیش کە مەڕاسیمەکەم خوێند، بەجۆرێک خوێندم کە منداڵەکانی موسلیمیان کوشت و سەرە بڕاوەکانیان خستنە نێو تەنووری خولییەوە و لەتاواندا باڵندەکان بە ئاسمانەوە دەگریان. لە کۆتایی مەڕاسیمەکە دا، سەیرم کرد ئەو پیاوە خەریکە فرمێسکەکانی دەسڕێت. کاتێک خەڵکەکە ڕۆیشتن ئەو چاوەڕوانی منی دەکرد. گوتی ئاغای پاپۆلی بۆچی تۆ شێخیت؟ گوتم ئێستا موسیبەتێک بەرۆکی ئەم خەڵکەی گرتووە. ئاژەڵەکانیان لەدەستداوە، ئەم مەڕاسیمە ئارامیان دەکاتەوە.گوتم چاوم لێبوو تۆش گریایت. گوتی بۆچی من موسڵمان نیم؟ ئێمەش نۆکەری ئیمام حسێنین. گوتم خودا قبوڵی بکات. گوتی بەڕاستی پێتبڵێم کەسێک هەواڵی بۆهێنام کە تۆ دەتەوێت مەڕاسیم بگێڕیت. منیش بۆیە هاتم تاکو بزانم چی دەکەیت؟ وامزانی دەچیتە سەر مینبەر و باسی سیاسەت دەکەیت، بەڵام کاتێک سەیرم کرد تەنها مەڕاسیمێک بوو هیچی تر، بەڕاستی مەڕاسیمێکی دڵنشین بوو، منیش بەهۆی ئەو مەڕاسیمەی خوێندت و ئیمام حسێنت بیرهێنامەوە. ئەوا دەڕۆم دۆسیەکەت وەک ئاو لێدەکەم. گوتم وەک ئاو لێکردن مانای چییە؟ گوتی بە جۆرێک دۆسیەکەت بۆ دەنووسم وەک ئەوەی هیچ شتێک نەبوو بێت و هەرگیز بانگت نەکەن. گوتم بۆم دەرکەوت کە تۆش بە ڕاستی باوەڕێکی توندت بە ئیمام حسێن هەیە. گوتی پێیانگوتوم کە مەڕاسیمەکەت تۆمار بکەم، بەڵام ئێمەش موسڵمانین، ئەگەر مەڕاسیم سیاسی نەبێت گوێی پێنادرێت. ئەو پیاوە بۆ یەکەمجار خۆی بەناوی ئاغای حەیدەری بەمن ناساند هەر چەندە دەزانم کە ئەو ناوە ناوێکی خوازراو بوو. گوتی من لەم مەڕاسیمەوە بۆم دەرکەوت کە تۆ کەسێکی کۆمۆنیست نیت، من تا ئێستا وا بیرم دەکردەوە کە تۆ ڕاپۆرتت دابێت بە سۆڤیەت، یا پەیوەندیت بە پەری خانمەوە هەبێت و بۆیە هاتوویت تاکو بەیەکەوە دژی حکومەت کارێک بکەن، بەڵام ئێستا بۆم دەرکەوت تۆ و پەری خانم ئاوتان بەیەک جۆگەدا ناڕوات، بەڵام وریابە نەکەویتە داویانەوە. گوتم دڵنیابە هەر ڕێگە بکرێتەوە من لێرە دەڕۆم. حەیدەری گوتی بەرنامەیەک هەیە کە ئەمانە لە شوێنێکدا نیشتەجێ بکەن.

ئاغای حەیدەری خوداحافیزیی کرد و ڕۆیشت. من ئیتر هەرگیز ئەوم نەبینییەوە. هەواڵی قسەکردنی من و حەیدەری هەر هەمان کات بە عەلی خان گەیشتبوو. بە ڕاستی دەزگای زانیاری و دژە زانیاری باش کاریان دەکرد. هەستمکرد عەلی خان دووبارە لێم کەوتۆتەوە گومان، هەر خۆم سەرجەم قسەکانم بۆ عەلی خان گێڕایەوە. ئەویش گوتی ئەوانە دەیانەوێت لە ئاوی لێڵدا ماسی بگرن، دەیانەوێت ئێمە نیشتەجێ بکەن. بۆ یەکەمین جار حەیدەری کوڕی عەلی خان گوتی باوکە من ئامادەم لە شوێنێکدا

نیشتەجێببم، خەریکبوو لە نێو ئەم سەهۆڵبەندانەدا هەموو ئەو خەڵکە بەکوشت بدەین، تازە هەموو مەڕەکانمان لەناوچوون، ئەمەش بوو بە ژیان، مەگەر خەڵکی ئەم دونیایە گۆشت و شیر ناخۆن، منیش دەڕۆم لە گۆشەیەکدا پارچە زەوییەک ئیجارە دەکەم و خەریکی کاری کشتوکاڵ دەبم، یا ئۆتۆمبێلێک دەکڕم و دەبم بە شۆفێر. عەلی خان بە توورەییەوە گوتی هەر ئەوە ماوە پێمانبڵێن کوڕی عەلی خان بووە بە خزمەتکاری خەڵکی، چەندین پشتە خانی خۆمان بەسەر خەڵکیدا سەپاندووە، کەچی ئێستا کوڕەکەمان دەیەوێت ببێت بە نۆکەری خەڵکی. ڕۆڵە گیان ئێمە چەندین پشتە خانین، خانی هۆزە کوردەکانی خۆراسان، پێش ئەوەی بێین بۆ خۆراسان باپیرە گەورەمان وەک بەشێک لە خانە ئازاکانی کوردستان لە دەوروبەری مەهاباد و سەردەشت و بانە بوون. ئێستا بۆچی بەسەرمایەک و بە لەدەستدانی کەمێک سامان خۆت دەدۆڕێنیت. تۆ کوڕی منیت پێویستە هەمیشە کارێک بکەیت لانیکەم چوار کەس بە هۆی تووە نانبخۆن. حەیدەر گوتی باوکە گیان خۆ من قسەیەکی ئەوتۆم نەکردووە. عەلی خان گوتی تەنها دەتەوێت پەڕی خۆت لە ئاو هەڵکێشیت، ئەی ئەو خەڵکەی کە لەگەڵتدان چیان لێدەکەیت؟ من دەڵێم دەڕۆم بۆ تاران و لەمەیدانی بار کاردەکەم، بەڵام ژیانی ئەم خەڵکەش دەستەبەر دەکەم، ئەوەتا هەموو ڕۆژێک دەڕۆم لەگەڵ پیاوماقوڵانی ئەم گوندە قسە دەکەم تاکو ڕازییان بکەم چەند کەسێک لێرە دابمەزرێنن، ئەوەتا چوار کەسیان بردن بۆ کێڵگەی بەخێوکردنی مانگا و ژووریشیان پێداون، بەڵێنیان پێداوم کار بۆیەک دوو کەسی تریش بدۆزنەوە، ئەگەر ئەم خەڵکە خوێندەوارییان هەبووایە چەند کەسێکیش لە فەرمانگاکاندا دادەمەزران. حەیدەر گوتی خوێندەواری تا پۆلی چەندیان دەوێت؟ من ئامادەم بڕۆم ببم بە کارمەند لە فەرمانگەیەکدا. ئەمجارەش عەلی خان توورەبووەوە و گوتی ڕۆڵە تۆ نابێت ببیت بە نۆکەری دەوڵەتی کودەتاچی! نانت حەرام دەبێت، تۆ تا چەندت خوێندووە؟ کاتێک پێمدەگوتیت بڕۆ بخوێنە، بەڵام تۆ دەتویست ئەسپسواری بکەیت. عەلی خان ڕووی کردە پەری خانم و گوتی ئەمەش ڕۆیشت بخوێنێت، بەڵام کارێکی کرد کە بینێرنەوە بۆ ئەو دەشتە. پەری خانم پێیناخۆش بوو، هەڵسا و ڕۆیشتە گۆشەیەکەوە و منداڵەکەی خەینسای خستە باوەشییەوە. بەو منداڵەوە خۆی سەرقاڵ کرد. عەلی خان ڕووی کردە کوڕەکەی گوتی نۆ ساڵت خوێندووە، دەتەوێت ببیت بە چایچی، دڵنیابە شتێک لەوە زیاترت نادەنێ، تۆ هیچ مەترسە من هەموو خەرجییەکی تۆ دەکێشم. خانم جان گوتی ئەوە چیتانە؟ خۆ ئەمە یەکەم جار نییە مەڕەکانمان دەمرن، دووبارە هەڵدەستینەوە هیچ خەفەت مەخۆن، هیچ کەسێکتان نابێت ببن بە نۆکەری

حکومەت. بۆ یەکەمین جار بوو ژنی سێهەمی عەلی خان کە دایکی سێ منداڵیشی بوو بەو شێوەیە قسە بکات، تا ئەو کاتە جگە لە قسەی سادە قسەی ترم لەو ژنە نەبیستبوو. گوتی عەلی خان ڕاستدەکات، چ منداڵەکانی من، چ خوشک و براکانیان نابێت ببن بە نۆکەری حکومەت، من هێشتا داخی براکەم وا لە سنگمدایە، مەگەر هەر ئەوان نەبوون براکەی منیان کوشت، گوێت لێبێت حەیدەر هەر ئەوان بوون کە براکەی منیان کوشت، تۆ ئێستا چوار مەڕت مردووە کەچی دەستەوەستان بوویت. حەیدەر گوتی خانم جان من لەدەست ئەم چۆڵەوانی و سەرما و گەرمایە ماندوو بووم. پەری خانم لە گۆشەیەکی ژوورەکەوە گوتی من لەگەڵ باوکمدا دەڕۆم بۆ تاران. حەیدەر گوتی نەخێر ڕێگایەکی ترت هەیە. ئەوان هەموویان تووڕە بوون، قسەی بێسەروبەریان دەکرد، بە جۆرێک قسەیان دەکرد کە پێشتر بەو جۆرە قسەیان نەکردبوو، پێشتر لە بەردەمی عەلی خاندا نەیاندەتوانی یەک قسەبکەن.

پەری خانم گوتی دەزگای ساواک دەیان جار بەمنیان گوتووە تەنیا پەشیمان نامەیەک بنووسە و ڕێگەت پێدەدەین بچیت خوێندنەکەت تەواوبکەیت و ببیت بە ئەندازیار. حەیدەر گوتی وا نییە ڕاستییەکەی بڵێ، پێیانگوتیت کە بچیت ببیت بە کارمەندی ساواک و هاوڕێکانت بەگرتن بدەیت، ئەوکاتە ڕێگەت دەدەن بچیتەوە سەر خوێندنەکەت. پەری خانم گوتی من چیم کردووە؟ بەم سەهۆڵبەندانە لە تەنیشت تووە دانیشتووم. عەلی خان گوتی بە هەمووتان دەڵێم تاکو من لە ژیاندابم هەر کارێک کە من پێمگوتن پێویستە لە سەرتان جێبەجێی بکەن، من نە دەمەوێت کچەکەم ببێت بە ئەندازیار و نە دەمەوێت ببێت بە نۆکەری حوکومەتی کودەتاچی، بەڵکو دەمەوێت لەو دەشت و کێوە گژوگیا بخۆن، پەشیماننامەش مەنووسە. ئەگەر پەشیماننامەش دەنووسیت لەم کار و کردەوە نابەجێیانەت بینووسە. پەری خانم گوتی دووبارە دەستت پێکردەوە... عەلی خان گوتی بەڵێ دەستمان پێکردەوە، سەد جاری تریش دەستی پێدەکەینەوە. ئەم برای موهەندیسە کە لەلامان دانیشتووە لە سیر تاکو پیاز ئاگاداری ژیانی ئێمەیە، ئێستاش هەندێک لە ئێوە دەڵێن ئەم بەندەی خودایە کارمەندی ئەم شوێن و ئەو شوێنە. عەلی خان بەردەوام بوو لە قسەکانی و گوتی پەری خانم باش گوێ بگرە و باش بزانە ئەو ساواکییانەی خزمەت بە وڵاتی خۆیان دەکەن زۆر بەشەرەفترن لەو کەسانەی کە نۆکەری بۆ سۆڤیەت دەکەن. پەری خانم گوتی ئێستا کێ دەیەوێت ببێت بە نۆکەری سۆڤیەت؟ ڕووی باوکی سۆڤیەت ڕەش بێت، ئەو قسانەی کە من دەیانکەم هەمووی ڕاستین. عەلی خان گوتی بەسە ئیتر دەمت دابخە و چیتر قسە مەکە، زۆر پەست و ناڕەحەتم زیاتر لە دوو

هەزار سەر مەڕم تێداچووە! دوان لە شوانەکانم مردوون، ماین و حوشترەکانم فەوتان، خەڵکانی هەوارەکەم مردوون، ئامۆزاکەم و هاوسەرەکەی بیبی مردوون، ئەردۆی بێچارە لە تەمەنی سێ ساڵییەوە کار بۆ من دەکات وا خەریکە دەمرێت، بەم حاڵەوە چۆن ناڕەحەت نابم؟ ئەگەر بەڕووکەش خۆم بە بێ کێشە نیشاندەدەم مانای ئەوە نییە کە خەم و خەفەتم نییە. خانم جان گوتی سەرت سەلامەت بێت ئەمجارەش وەک جارانی پێشووتر هەڵدەستینەوە. عەلی خان گوتی من تەمەنم گەیشتووەتە شەستوپێنج ساڵ، ئیتر ڕاستبوونەوەم کۆتایی هاتووە. لەناکاو لە ڕاڕەوەکەدا دەنگە دەنگ پەیدا بوو گوتیان ئەسەد هات. ئەسەدی کوڕە گەورەی خان هاتە ژوورەوە خەریکبوو لەسەرمادا ڕەق دەبووەوە. خان گوتی بۆچی بەم بەفر و سەرمایە ڕێگەت بڕیوە و هاتوویت بۆ ئێرە؟ ئەسەد گوتی زۆر بیری ئێوەم دەکرد دەمویست هەواڵتان بزانم، لە تەنیشت زۆپاکەوە جێگەیان بۆکردەوە. ئەسەد پیاوێکی گەورە بوو بە پێچەوانەی کەڕاری برایەوە ئەم کەسێکی ڕووخۆش بوو، باسی ڕۆژی بەفربارین و کێشەکانی بۆ کردین، کاتێک بەفربارین دەستیپێکرد بوو ئەو تەنها چەند کیلۆ مەترێک لەگوندی ئینجەوە دوور بووە. بە هەر دەردیسەرییەک بووە مێگەلەکەی گەیاندبووە گوندی ئینجە. ئەسەد گوتی حاجی ڕەحمانی تورکمان هەر کارێک لەدەستی هات بۆ ئێمەی کرد. لە مێگەلەکە تەنها شەش سەر مەڕ مرداربوونەوە. خەڵکەکەش هەمووی سەلامەتبوون. عەلی خان زۆر سوپاسی خودای کرد و گوتی ئێوە سیوچوارکەسی گەورە و بچووک، حاجی ڕەحمان چۆن جێگای کردوونەتەوە؟ ئەسەد گوتی ئەو ئێمەی بە سەر ماڵەکاندا دابەشکرد. ئەو بەڕێزانە نەیانهێشت ئێمە خواردنی خۆمان بخۆین. جەوهەر خانم گوتی زۆر باش دیارە کە ئێوە خزم و کەسی یەکترین، تۆش نیوە تورکمانیت. ئەسەد لە ژنی یەکەمی عەلی خان بوو، دایکی کورد بوو. ئەسەد گوتی لەم سەردەمەدا برا ڕەحم بە برا ناکات. پیاوێکی تورکمان پێنج ڕۆژە میوانداری لە سیوچوار کەس کردووە، ئالفی بۆ حەوتسەدوپەنجا سەر مەڕ و چەندین ماین و شازدە حوشتر دابین کردووە. نابێت ئێمە بڵێین چونکە خزم و کەسی یەکترین ئەرکی سەرشانییەتی؟ چونکە براکانی ئێمە نیوە تورکمانن. عەلی خان گوتی حاجی ڕەحمانی ئینجەیی پیاوێکی پیاوانە و خانەدانە. یەک کاتژمێر عەلی خان و منداڵەکانی خەریکی بەرنامەڕێژی بوون بڕیاریاندا کاتێک هەوا خۆش بوو ئەسەد بگەڕێتەوە بۆ تورکمان سەحرا، ئەو چەند مەڕەی مێگەلەکانی تر کە ماونەتەوە تێکەڵی مێگەلە مەڕەکانی خۆی بکات.

بیبی جان بە عەلی خانی گوت خاڵۆزا لە ژوورەکەی ئێمەدا چوار ماڵ ڕۆیشتوون.

ژوورەکەمان چۆڵ بووە، موهەندیس بێت بۆ ئەوێ باشترە و لەوێ باشتر پشوو دەدات. منیش کەلوپەلەکانم هەڵگرت و ڕۆیشتم بۆ ژوورەکەی بیبی. شەو درەنگ بوو، پۆلەکان پڕ ببوون لە خەڵکی سەرگەردان. لە ڕاڕەوەکەشدا خەڵک نووستبوون و لە خەوێکی قوڵدا بوون، وا هەستم دەکرد ئەم ژیانەیان خۆشتر بێت لە ژیانی نێو ڕەشماڵەکانیان، ئەم چەند ڕۆژە خواردنی باشتریان خواردبوو، ڕەنگە باشتریش نووستبن، کەمتریش کاریان کردبوو، کەمتریش هیلاک ببوون، دەیانزانی کە عەبدولعەلی بڵند، عەلی خان، وەلی خان، حاجی محەمەد سلێمانی. ئیتر ئاژەڵیان نەماوە و چیتر پێویستیان بە کرێکار نییە. ئەوان جگە لە هێزی دەست و بازووی خۆیان و منداڵەکانیان هیچ سەرمایەیەکی تریان نەبوو. چاوەڕوانی ئەوەیان دەکرد کارێکیان دەستبکەوێت، ئەوان جگە لە هەوار و هۆز و خێڵی خۆیان شتێکی تریان نەدەزانی، تەنانەت زمانی فاریسیشیان نەدەزانی. خەم و نیگەرانی بە سەر ئەو خەڵکە هەژارەدا زاڵببوو، ئەوان بە تەواوی چۆکیان دادا بوو، تەسلیم ببوون، تەسلیمی ڕاستییەکان ببوون، تەسلیمی سروشت ببوون، تەسلیمی بڕیاری خانەکان ببوون... لە ژوورەکەی بیبی دا (١٤-١٥) کەس نووستبوون، منیش لە گۆشەیەکەوە شوێنێکم دیاریکرد بۆ نووستن. بیبی گوتی موهەندیس خۆ بینیت چ بەڵایەکمان بەسەردا هات؟ ڕووداوەکە گەرماوگەرمە عەلی خان هێشتا بەخۆی نەزانیوە، ئەو زیاتر لە دوو هەزار سەر مەڕی لەدەستداوە، مێگەلەکەی حەیدەری کوڕی بە تەواوی لەنێو چووە. حەیدەر لەکاتی بەفرەکەدا مێگەلەکەی بەرەڵا کردووە و خەڵکەکەی خۆی گەیاندووەتە شائاباد. هەر بۆیەش تێکڕای مەڕەکانی خۆی و هی خەڵکەکەش لەناوچوون. عەلی خانیش لە ئەمڕۆ بە دواوە هەر بە ناو خان دەبێت و لە خانێتی دەکەوێت. بیبی گوتی هاوسەرەکەی منیش سەردەمانێک خان بوو، شوانێکی نا شارەزا لەکاتی بەهاردا مێگەلەکەی لەنێو شیوێکدا ڕاگرتبوو لەوکاتدا لافاو هاتبوو، ئاو هەموو مەڕەکانی بردبوو، بە شوانەکەشەوە، ئێمە کە دەڵێین ئاژەڵداریی ماڵی بایە ئەوە ماناکەیەتی، هاوسەرەکەم هیچ شتێکی تری نەبوو تەنها ئەو مێگەلەی هەبوو ئەویش ئاو بردی، بۆیە دەستەوەستان مایەوە ئیتر نەیتوانی جارێکی تر مێگەلە مەڕ دروستبکاتەوە، هاوسەرەکەم زۆر نائومێد ببوو نەیدەتوانی کرێکاریش بکات، بەڵام هەمیشە هەر خۆی بەخان دەزانی، تاکو دوو کاتژمێر پێش مردنیشی خۆی بە خان دەزانی، هەر لەبەر ئەوەش کە خۆی بە خان دەزانی سەرماکاری تێکرد و مرد، هەرچەندە پێمدەگوت پیاوەکە تۆ وا خەریکیت لە سەرمادا دەمریت، ئەو فەرەنجییە بدە بە سەرو شانتدا بەڵام ئەو دەیگوت من خانم، ئەگەر بشمرم فەرەنجی شوان بەسەر شانی خۆمدا نادەم. بۆیە

سەرما کاری تێکرد و مرد. لەوە دەترسم عەلی خانیش هەروەک هاوسەرەکەم مێشکی تێکبچێت و ببێتە کەسێکی نیوە شێت. پاشان هەر خۆی گوتی، بەڵام عەلی خان لە تاران و بۆجنوورد خانوو و ماڵی هەیە، بەڵام هاوسەرەکەم تەنها مەڕی هەبوو هیچی تری نەبوو. بیبی گوتی پاش لە ناوچوونی مەڕەکانمان ئێمەش هاتین بۆ هەواری کوڕی خاڵەکەم. عەلی خان کوڕە خاڵی منە، لەگەڵ هاوسەرەکەشمدا ئامۆزا بوو. عەلی خان لە کاتی گەنجێتی مندا، داوای منی لە باوکم کردبوو، بەڵام باوکم ڕازی نەببوو، باوکم دەیگوت ئەم عەلیە زۆر خۆبەزلزانە و من دەزانم کە ژنت بەسەردێنێت، بۆیە شوو بە کەسێکی تر بکەیت باشترە. دیارە من چەند ساڵێک لە عەلی خان گەورەترم، پاشان شووم بە مورتەزا کرد. مورتەزا کاروباری خراپی نەبوو، بەڵام باوەڕی بە خۆی نەبوو، سەیرکە بزانە عەلی خان چەند بە ورەیە و باوەڕی بە خۆی هەیە، ئەوەتا زیاتر لە دوو هەزار سەر مەڕی فەوتاوە، بەڵام کە سەیری ڕەنگوڕووی دەکەیت هەستی پێناکەیت، بەڵام عەبدولعەلی بڵند لە ماوەی ئەم چەند ڕۆژەدا پشتی شکاوە، ئەو تەمەنی پەنجا ساڵ دەبێت ئیتر ناتوانێت مێگەلە مەڕ دروست بکاتەوە. بیبی بە هێواشی قسەی بۆ دەکردم ژوورەکەش پڕ بوو لە خەڵک، بەڵام نووستبوون. بیبی گوتی من دەزانم تۆ ئێستا حەزت لە پەری خانمە، جاری پێشوو حەزت لە گڵپۆ بوو، بەڵام گڵپۆ شووی کرد و ڕۆیشت. بەم کارەساتەی بە سەرماندا هات عەلی خان ئیتر عەلی خانەکەی جاران نامێنێت، تۆش کەسێکی باش و ڕێکوپێکیت، ئەگەر پێت باشە چەند ڕۆژی تر با هەفتەی مردووەکانمان بەسەربچێت، خۆم کارەکانت بۆ ڕاستەڕێ دەکەم، بەڵام پەری خانم کێشەی کۆنی هەیە، پێویستە تۆ لە پێش هەموو شتێکدا ئەو کێشانە بزانیت. بیبی نەیدەزانی لەژووری لێکۆڵینەوەکەدا حەیدەری و دوو ئەفسەرەکە هەموو بەسەرهاتەکانی پەری خانمیان بۆ باسکردووم.

سەرماکە بەردەوام بوو، بە ڕۆژ پلەی گەرمی دە پلەی ژێر سفر بوو. بە شەویش بیست پلەی ژێر سفر بوو. قورەمەیدان ناوچەیەکی بەرفراوان بوو، تەنها دامەزراوەیەکی گرنگ کە تێیدا بوو بنکەی هێزی ئاسمانی شائاباد و نەخۆشخانە گەورەکەی گوندی ڕاجی بوو، ئەو نەخۆشخانەیەش تایبەت بوو بە ئەو کەسانەی تووشی نەخۆشی گەڕیی ببوون. ئۆتۆمبێل نەیدەتوانی هاتوچۆ بکات خۆ ئەگەر هاتوچۆ بۆ بنکە سەربازییەکە هەبووایە من پێمنەدەزانی.

هەمووان لە ژوورەکەدا نووستبوون، بیبی چەند ڕکاتێک نوێژی کرد و منیش دەفتەر و قەڵەمم دەرکرد و دەستمکرد بە نووسینەوەی بیرەوەرییەکانم و پاشان

لەپاڵ دیوارەکەدا چوومە نێو کیسە خەوەکەمەوە و لێی نووستم. بەیانی ئاسمان ساماڵ بوو، تیشکی خۆر لە پەنجەرەکەوە هاتبووە ژوورەوە. هەوای ژوورەکە کەمێک پیسببوو. وردە وردە. دەنگەدەنگی خەڵک لە ڕاڕەوەکەدا پەیدابووەوە، هەموو ڕیزیانگرت بوو بۆ توالێت، ئاویش بەستبووی، ڕۆیشتن بۆ توالێت کارەساتێک بوو، ژمارەیەکی زۆر لەو خەڵکە بە هیچ شێوەیەک توالێتیان نەدیبوو، بەڵام کاتێک هاتینە گوندەکە یەکەمین ئامۆژگاریکردنی بەرپرسەکان کە پێیانگوتین، چۆنێتی ڕۆیشتن بوو بۆ توالێت. بەرپرسەکان دانیشتنیان لە دەرەوەی توالێت قەدەغەکرد بوو. بەڵام هێشتا منداڵان و تەنانەت بەشێک لە گەورەکانیش دەچوون لە حەوشی قوتابخانەکەدا، دادەنیشتن. هەوا سارد بوو، مێش و مێشولە و بۆگەن بڵاو نەدەبووەوە، ئەردۆش بەردەوام لە تاو ئازار دەیناڵاند، پەنجەی قاچەکانی بە تەواوی ڕەشببوون، منیش چوومە لایەوە و کەمێک دڵمدایەوە. خۆ تەنها هەر ئەو وای لی نەهاتبوو، لانیکەم پازدە کەس پەنجەکانی دەست و قاچیان ڕەشببوو. ئەو داماوانە بە دەست ئازارەوە دەتلانەوە، چاوەڕوانی ئەوەیان دەکرد بنێردرێن بۆ بۆجنوورد. پزیشکی گوندەکە هەمان پزیشک بوو کە ڕاپۆرتی لە سەر من نووسی بوو، زۆر ئازایانە بەدەمیانەوە دەچوو چارەسەری دەکردن. دکتۆرێکی وریا و چالاک بوو. زۆر باش چارەسەری دەکرد و ڕاپۆرتی زۆر باشیشی دەنووسی.

لە گۆشەیەکی ژوورەکەدا دانیشتبووم و سەیری ئەو خەڵکەم دەکرد کە یەکە یەکە لە خەو هەڵدەستان، ئەوان نەیاندەزانی ئومێد و ئایندەیان چییە؟ ئەوان تەنها خواردنی سێ ڕۆژی خۆیانیان نەبوو، ئەو جلوبەرگەی لەبەریشیان دا بوو بەرگەی ئەوسەرمایەی نەدەگرت، ژمارەیەک لەوانە لەتاو سەرما خۆیان خزاندبووە نێو کۆپانی گوێدرێژ و سەر جلی ئەسپ و حوشترەکانەوە. ئەو بەشە ئاردەی کە عەلی خان و عەبدولعەلی بڵند پێیدا بوون ئەوەشیان نەما بوو، لەم دونیایەدا هیچیان نەبوو جگە لە خۆیان و بازووی کارکردنیان، لەو کاتەدا کاریش دەست نەدەکەوت. موسا عەلی پیاوێکی تەمەن چلوپێنج ساڵەی هەوارەکەی عەبدولعەلی بڵند بوو، چەندین جار داوای لە من دەکرد و دەیگوت موهەندیس من لەگەڵ خۆتدا ببە بۆ شار و بمکە بە نۆکەری خۆت. پێم گوت من خۆم خوێندکارم و هیچ کارێکم نییە. دەیگوت ئەوە نییە تۆ مەڕاسیم خوێنێکی باشیت، کەواتە تۆ پارەیەکی زۆریشت هەیە. گۆدەرز تەمەنی سیوحەوت ساڵ بوو، هەشت منداڵی هەبوو، ئەو لە هەوارەکەی حاجی محەمەد سلێمانی بوو، چەندین جار هۆن هۆن دەگریا. ئەو تەنها بیستویەک سەر مەڕی هەبوو، هەموویان فەوتابوون، ئەو دەیگوت بە لەناوچوونی مەڕەکانم ژن و منداڵەکانیشم لەناو دەچن، دەیگوت ئەم سەرمایە چەندە

بۆ ئێمە خراپ بوو، ئەوەندەش بۆ خەڵکی شار باش بوو، چونکە دەبێت ئێمەش بچین بۆ شار و لەوێ ببین بە خزمەتکار و نۆکەری خەڵکە دەوڵەمەندەکان. منیش گوتم هیچ مەترسە، خودا گەورەیە حکومەت هاوکاریت دەکات. کە وام گوت پێی سەیربوو. گوتی واتە پۆلیسەکان دەبنە مرۆڤ و هاوکاری ئێمە دەکەن؟ ئەو هەموو دامودەزگا دەوڵەتییەکانی بە پۆلیس دەزانی. لە ڕوانگەی ئەوەوە پۆلیس واتە خەڵکی چەوسێنەر و ئازاردەر. ڕۆژێک (٦-٧) کەس لەکرێکارەکانی خانەکان هاتن بۆلام و لێم کۆبوونەوە و داوای ڕێنماییان لە من دەکرد، منیش پێم گوتن دەوڵەت بەنیازە هاوکاریتان بکات، لە کۆتاییدا ئۆتۆمبێلی حکومەت دێت و لەو دەرودەشتە کۆتان دەکەنەوە و ئەم کۆشکە گەورانە هی حکومەتە، دکتۆر و دەرمان هەر هی حکومەتە، ئەم چەند ڕۆژەش کە خواردن بە ئێوە دراوە هەر هی حکومەت بووە. لە پڕێکا هەموویان گوتیان بۆچی ئێمە ئەم چەند ڕۆژە ماڵی حەرامان خواردووە؟ قاسم کە پیاوێکی تەمەن پەنجاوپێنج ساڵ بوو، گوتی من لە ئێستا بەدواوە یەک پاروو لەم خواردنە ناخۆم. یەکێکیان گوتی بۆچی نایخۆیت خۆ ئەوخواردنە هی حکومەت نییە، بەڵکو هی ئەو خەڵکەی دەرەوەن، هی فەرەنسییەکانە. گفتوگۆکە چووە سەر ئەوەی کە ماڵی حکومەت و وڵاتانی دەرەوە حەرامە یان حەڵاڵە، لە کۆتاییدا بە هەموومان قاسممان ڕازیکرد کە ئەو چەند ڕۆژەی تر کە لێرە دەمێنێتەوە، هەرچییەکیان پێدا بیخوات. پاشان عەلی خان پێیگوتم هەر ڕۆژە نا ڕۆژێک حوشترێک یا مەڕێک سەردەبڕین، چونکە هەندێک کەس خواردنەکە ناخۆن و دەڵێن ماڵی حکومەت حەرامە. دەوڵەتێک کە هەژارترین کەس خواردنەکەی بە حەرام بزانێت، چۆن دەتوانێت بە پایەداری بمێنێتەوە. پاش دە ساڵ ئەو حکومەتە بەو هەموو سەرباز و پۆلیس و ساواکییەی کە هەیبوو هەر ڕووخا. لە ڕاڕەوەکەدا دەنگەدەنگ پەیدا بوو، لەلایەن خەڵکی گوندەکەوە بۆ خواردنی بەیانی دوو مەنجەڵی گەورە نیسکیان هێنا بوو. عەبدولعەلی بڵند و غەفار چێشتی نیسکەکەیان دابەش دەکرد، منیش قاپەکەم هەڵگرت تا بڕۆم نیسک وەربگرم، مەنوچەهر هاتە لامەوە و گوتی موهەندیس عەلی خان گوتویەتی بۆ نانخواردنی بەیانی بێت بۆ ژوورەکەی ئێمە. بەگشتی منداڵەکانی عەلی خان نەیاندەگوت باوکە بەڵکو دەیانگوت خان. کە ڕۆیشتم لای ئەوان خوان ئامادە کرابوو. عەلی خان لەگوندەکەدا خانوویەکی پەیدا کردبوو، بڕیار وابوو دوای خواردنی نانی بەیانی بڕۆین بۆ ئەو خانووە. دیار نەبوو تا چەند ڕۆژێتر لە نێو ئەو بەفرەدا دەمێنینەوە. وەک ڕۆژانی تر پێشوازیان لێکردم، من لە نێوان کەڕار و حەیدەردا، دانیشتم، پەری خانم ڕێک بەرانبەری من دانیشت. عەلی خان خەریکی دانانی بەرنامە بوو لەگەڵ منداڵەکانیدا،

ئەسەد دەبوو بگەڕێتەوە بۆ گوندی ئینجە، مەڕەکانی و خەڵکی هەوارەکەی لەوێ بوون. ئەسەد گوتی با کەسێک لەگەڵمدا بێت و هاوکاریم بکات. عەلی خان گوتی کەڕار دێت بۆ هاوکاریت و کاتێک هەوا باش بوو دەبێت بە زوویی خۆت بگەیەنیتە مەراوەتەپە، لەوێ لەوەڕ زۆرە، ئاو و هەواش باشترە، بەڵام پێویستە بە ڕێکوپێکی بڕۆیت، ئەگەر ئۆتۆمبێلی باری پەیدا بکەیت و مەڕەکان بە ئۆتۆمبێل ببەیت باشترە. ئەمە یەکەم جار بوو کە دەیانویست بۆ کۆچکردن سوود لە ئۆتۆمبێل وەربگرن. پاشان کاتێک گەڕامەوە بۆ مەشهەد لەوێ تێگەیشتم کە سەرمای وەک ئەمجارە هەرگیز ڕووی نەدابوو، خۆ ئەگەر سالانی پێشتر سەرمای لەو جۆرە هەشبووبێت هیچ یەکێک لەو کەسانە بەبیریان نەدەهات. تا ساڵی (١٣٩١-٢٠١٢) سەرمای لەو جۆرە نەبینرا بوو. ئەم سەرما و بەفر و سەهۆڵبەندانە گۆڕانکارییەکی گەورەی لە ژیانی کۆچەرییەکانی ئێران و بەتایبەتی لە خۆراساندا دروستکرد، ئەنجامی ئەو سەرما و بەفرەم پاش چەندین ساڵ لە مەقالەیەکدا نووسی. بەشێکیشیم لەکتێبی کۆچەرییانی باکووری خۆراساندا نووسی. کتێبێک کە بەزمانی فەرەنسی نووسیم و بەڕێز دکتۆر ئەسغەری کەریمی وەریگێڕایە سەر زمانی فارسی. ئەو کتێبە لە فەرەنسا خەڵاتی ئەنجومەنی جوگرافیای فەرەنسای وەرگرت، لە ئێرانیشدا براوەی خەڵاتی کتێبی ساڵ بوو، بەڵام بەداخەوە ئێستا هیچ کەسێک ئامادە نییە دووبارە ئەم کتێبە لە چاپ بداتەوە.

بە هۆی ئەو سەرما زۆرەوە بەشێکی زۆر لە کۆچەرییانی ئێران نیشتەجێکران. ئەو بەیانییە لە بیری ئەوەدا بووم چۆن بگەڕێمەوە بۆ مەشهەد، پرسیار و وەڵامەکانم تەواوکردبوو، خەڵکەکەش ئەوەندە توانای قسەکردنیان نەمابوو، خۆشم هەموو گیانم چڵک و پیسی بوو، ئاو هەمووی بەستبووی، بۆریی ئاوەکانیش بەستبووی. تەنانەت بۆ چالێنانیش، دەچوون بەفریان دەهێنا و دەیانتواندەوە. هەر کاتێک لە ژوورەوە دەهاتمە دەرەوە سەرما کاری لە هەموو گیانم دەکرد، برینەکان و شوێنی لێدانەکان دەسووتانەوە، گوتم ئەمڕۆ سەردانێکی نەخۆشخانە دەکەم بۆ تیمارکردنی برینەکانم. عەلی خان گوتی موهەندیس، ئێمە خانوومان گرتووە، دوای نانخواردنی بەیانی هەموومان دەچین بۆئەوێ، تۆش لەگەڵ ئێمەدا وەرە. گوتم ئەگەر ئێوە مۆڵەتم بدەن من لە شوێنی خۆم دەمێنمەوە. عەلی خان گوتی تۆ میوانی ئێمەیت، باش نییە لێمان جیاببیتەوە، بیبیش هەر لەگەڵ ئێمەدا دێت. گوتم من لای حاجی ڕەزا و حاجی ڕۆستەم دەمێنمەوە. لەگەڵ عەبدولعەلی بڵندیش دۆستایەتیم پەیداکردووە. جەوهەر خانم گوتی موهەندیس لێمان دوورمەکەوەرەوە، منداڵەکان ئەو کارەیان لەگەڵ تۆدا کردووە و تۆش لەگەڵ ئێمەدا

ئاشتبوویتەوە، تۆش وەکو کوڕەکانی خۆمان وایت. پەری خانم سەیرێکی کردم و بەڵام هیچی نەگوت، سەیرکردنەکەی بە واتای ئەوە بوو کە لەگەڵیاندا بچم. گوڵخەندان گوتی خودا دەیزانێت هیچ نیازێکی خراپمان لەگەڵتا نییە، هەمووان دەستیانکرد بە پێکەنین. کاتێک سفرەکە کۆکرایەوە عەلی خان بانگی حاجی ڕۆستەمی کرد و گوتی وەرە با بڕۆین. حاجی ڕۆستەم ئامادەی هەموو کارێک بوو، بانگی برزووشی کرد. هەمووان خەریکی بەڕێکردنی ماڵی عەلی خان بوون. کەلوپەلەکانیان کۆکردنەوە و ڕۆیشتن. دووریی نێوان قوتابخانە و ئەو ماڵەی بۆی دەچوون، سەد مەتر زیاتر نەبوو. بەڵام دەبوو بەسەر بەفر و سەهۆڵدا بڕۆیشتنایە، لە ڕێگا چەند جارێک، چەند کەسێک خزین و کەوتن. جەوهەر خانم زۆر دڵسۆزانە چوو بووە ژێر باڵی خانم جانەوە تاکو نەکەوێت. ژنێکی شیعە و ژنێکی سوننە هەردووکیان هەوێی یەکتری بوون، بەجۆرێک ئەو ژنە هەوێکەی خۆی گرتبوو تاکو نەکەوێت، ئەوەندە بە پاکی و دڵسۆزانە یەکتریان گرتبوو، لەو کاتەدا تەنها من هەستم پێدەکرد. دایکم و ژنەکانی تری باوکمم بیرکەوتەوە.

لە کۆمەڵگەی خێڵەکی ئێمەدا، ژنان ڕۆڵێکی گرنگ دەبینن لە بەرهەمهێناندا، ژنانی خێڵەکی لە ژنانی گوندەکان ئازاترن، ژن سالاری زیاتر لە نێو کۆمەڵگەی خێڵەکیەکاندا هەیە تاکو گوندەکان. ئایا بنچینەی ئەم ئازادییە دەگەڕێتەوە بۆ ڕۆڵی ژنان لە بەرهەمهێناندا یا بۆ پرسی تر؟ لە هەر شوێنێکدا ژنان ڕۆڵیان لە بەرهەمهێناندا هەبێت، لەو شوێنە ئازادییەکەشیان زیاترە. لە باکووری وڵاتدا، ژنان ڕۆژانە لەکێڵگە و بازاڕەکاندا کاردەکەن، هەر بۆیەش لە ژنانی شوێنەکانی تر ئازادترن. لە شارەکەی ئێمەشدا ژنان کاریاندەکرد، کاری چنینین و ڕستنیان دەکرد، بەڵام ئەو ئازادییەیان نەبوو. لە وڵاتێکدا کە ژنان لەکار و لە کۆمەڵگەدا هیچ ڕۆڵێک نابینن. دیارە ناگەن بە ئازادییەکانیان، تاکو ژنان ئازاد نەبن شۆڕشەکانیش بەئامانج ناگەن، مەبەستم ئازادییە، کەسێک بە جۆرێکی تر لێکی نەداتەوە. شۆڕشەکانی بەهاری عەرەبی لە تونس، لیبیا، میسر و شوێنەکانی تر بەئامانجی تەواوەتی خۆیان نەگەیشتن، چونکە پیاوانیان ئامادەنین مافی ژنان بدەن. تاکو ژنانی عەرەب بە ئازادی نەگەن، پیاوانیشیان بە ئازادی ناگەن. هەڵبەت لە وڵاتانی تری عەرەبی وەک لبنان، تونس، مەراکیش، بەتایبەت جەزائیر ئازادترن لە وڵاتانی تری عەرەبی.

کۆڵەپشتەکەم لە کۆڵم بەست و کیسە خەوەکەم بەدەستێکمەوە و جانتاکەم بە دەستەکەی ترمەوە، کەوتمەڕێ، بەفرەکە بەستبووی، ڕێگەکە وەکو هەسان لوس بوو، قاچێکم خزی و خەریکبوو بکەوم، باشبوو بە زوویی کەڕار کەمەری گرتم و نەیهێشت

بکەوم، ئەگەرچی خۆیشی خورجێنێکی بەکۆڵەوە بوو، ڕووی کردە پەری خانم و گوتی کچێ کە تۆ هیچت بە دەستەوە نییە لانیکەم ئاگات لە موهەندیس بێت. تێگەیشتم کە من هێشتا ئەو خەڵکە ناناسم، ئەمجارەش کە میوانی عەلی خان بووم ڕێزی لێگرتم، بیرم لەوە کردەوە ئەگەر کەڕار بیویستایە بە یەک بۆکس منی دەکوشت، ئەوەندە بەهێز و گەورە بوو، بەڵام ئەو کەمەری گرتم و نەیهێشت بکەوم. لە باڵاو گەورەیی و هێزی شوانێکدا، دڵێکی میهرەبان هەبوو.

خانووەکە سێ ژوور و هۆڵێکی گەورە بوو، خانووەکانی گوندەکە تازە دروستکرا بوون، خانووەکە حەوشەیەکی گەورەی چەند سەد مەتریی هەبوو. بەفر بە جۆرێک داپۆشی بوو هاتوچۆ بۆ حەوشەکە نەدەکرا. خاوەنی خانووەکە گوتی دوێنێ شەو کە گوتیان ئێوە دێنە ئێرە، منیش هاتم و زۆپاکەم بۆ گەرم کردن و نانیشم بۆ هێناون، لە چێشتخانەکەشدا هەموو پێویستی و کەلوپەلێک هەیە. ئینجا گوتی تا هەر کاتێک پێتانخۆش بوو لێرەبن و ماڵ ماڵی خۆتانە. تەنانەت بۆتان هەیە چەند ساڵێکی تریش لێرە بمێننەوە. عەلی خان گوتی ماڵت ئاوەدان بێت زۆر سوپاست دەکەین، ئێمە زۆر لێرە نامێنینەوە هەر هەلێکمان بۆ هەڵبکەوێت دەڕۆین.

جەوهەر خانم ژنێکی ئیداریی بوو. گوتی کەلوپەلەکان باش ڕێکبخەن ڕەنگە تا سێ مانگی تر لێرە بمێننەوە. پەری خانم گوتی دایکە ڕەنگە زۆر حەز بە مانەوەی ئێرە بکەیت؟ جەوهەر خانم گوتی پەری گیان بۆ هەر کاتێک بێت ژیان هەر ژیانە، ئیتر بۆچی ئێرە باش ڕێک نەخەین؟ بەڵکو کەمێک خەمەکانمان بڕەوێنین. حەوتەی هاوسەرەکەی بیبی بوو، دەبوو بچین بۆ سەر قەبران. نزیکی نیوەڕۆ بوو، بنەماڵەی عەلی خان و خەڵکی تری زۆر چوونە سەر قەبران و فاتیحامان خوێند، هەوا ئەوەندە سارد بوو کە هیچ کەسێک نەیدەتوانی لە پێنج خولەک زیاتر بووەستێت. لە نێو بەفرەکەدا دەهاتم و دەچووم دڵیشم بۆ پەری خانم لێیدەدا. ئیتر گەنجییە و ناهێڵێت هیچ کارێک بکەیت. ئەو دڵە ڕۆژێک بۆ گلێۆ لێی دەدا و ڕۆژێک بۆ پەری خانم و ڕۆژێک بۆ... هەر گەنجێک بڵێیت دڵم بۆ کەس لێی نەداوە، ئەوە یا کەسێکی ڕیاکار و درۆزنە یاخود کەسێکی نەخۆشە. بیرم لەوە دەکردەوە کە چۆن دڵم بۆ کەسێک لێیدات کە تەنها دە ڕۆژ لەوە پێش بە ڕاستی دەیویست بمکوژێت، تا ئێستاش شوێنی برینەکان و شوێنی قامچییەکان بە لەشمەوە دیارن، بۆچی دڵم بۆکەسێک لێدەدات (٥-٦) ساڵ لەخۆم گەورەترە؟ بۆچی دڵم بۆ کچێک لێدەدات کە شووی کردووە و ئێستا بێوەژنە؟ کچێک لەڕووی کردەوە و بیرکردنەوەوە سەدوهەشتا پلە لەگەڵ مندا جیاوازە. ئەو پابەندە بە بیروباوەڕی

سۆڤیەتەوە و دەیەوێت ئەو ئایدۆلۆژیایەی ئەوان لە وڵاتی خۆماندا پیادە بکات. ئەی بیرکردنەوەی من چۆن بوو، نە باوەڕم بە ئایدیۆلۆژیای کۆمۆنیستی هەبوو، نە یەک تۆز باوەڕم بەقسەکانی دکتۆر عەلی شەریعەتی هەبوو. ئێستاش دوای چل و چەند ساڵ، کە بیری لێدەکەمەوە قسەکانی دکتۆر عەلی شەریعەتی هەمووی خەیاڵ بوون، ئێستاش کە بیری لێدەکەمەوە پێموایە قسەکانی شەریعەتی نە خۆرهەڵاتی، نەخۆرئاوایی و نە ئیسلامیین، قسەکانی تایبەت بوو بە خۆی. لەدڵی خۆمدا دەمپرسی بۆچی دڵت بۆ نیلۆفەر لێنادات کە هاوتەمەنی خۆتە؟ بۆچی دڵت بۆ گوڵخەندان لێنادات کە دوو ساڵ لە خۆت بچووکترە؟ ئەوان هەردوکیان لەپەری خانم جوانتر و شۆخ و شەنگترن، نەشم دەزانی لێدانی دڵم لە چ جۆرێکە؟

ئەسەد سواری حوشترێک بوو بەرەو ئینجە کەوتەڕێ. خان گوتی ئاگات لە خۆت بێت. ئەسەد دەبە نەوتێکی لەگەڵ خۆیدا برد، دەبەیەک کە سەری پێوە نەبوو، لەبری سەر تۆپەوانە موویەکیان دروستکرد بوو خستبوویە نێو دەمی دەبەکەوە. تۆپەوانە مووەکە ئەوەندەی تۆپێکی تێنس دەبوو. بۆ ئەوەی ئەگەر لە چۆڵەوانییەک سەرمای بوو، تۆپەڵە مووەکە بسوتێنێت. ئەو تۆپەڵە مووە لانیکەم بیست خولەک تا نیو کاتژمێر دەسووتێت، بەڵام بە گشتی پاش (٥-٦) خولەک ئەوسا گەرم دادێت. پاش خۆگەرمکردنەوە دەتوانرێت جارێکی تر بکرێتەوە بە سەرقاپی دەبەکە، بەڵام من زۆرم پێسەیر بوو، بۆچی ئەو شەوە ساردە بەفراوییەی گەردەنەی شەلەمی لەو تۆپەڵە مووەیان لەلا نەبوو. کەسێکی خەڵکی گوندەکە ئەو تۆپەڵە مووە و دەبە نەوتەکە دابووی بە ئەسەد. کیتەڵەیەکی گەورەشی لە هەمان کەس وەرگرتبوو. دەکرا هەر لەسەر پشتی حوشترەکەوە تۆپەڵە مووەکە لە نێو کیتەڵەکەدا دابنێت و ئاگر بکاتەوە و خۆی گەرم بکاتەوە. پەری خانم بە ئەسەدی گوت ئەگەر سەرمات بوو بە زوویی ئاگر لە تۆپەڵە مووەکە بەربدە. پێم سەیر بوو ئەندامانی خێزانەکەی حاجی عەلی زیاتر بە فارسی قسەیان دەکرد، بەڵام بنەماڵەکانی تر زیاتر یا بەگشتی بە کوردی قسەیان دەکرد. عەبدولعەلی بڵند هەمیشە بە زمانی کوردی دەدوا، تەنها لەگەڵ مندا بە فارسی قسەی دەکرد، لانیکەم نیوەی هەوارەکە زمانی فارسیان نەدەزانی. ئێمە لەسەر قەبرانەوە گەڕاینەوە، من لە ڕێگە ڕوومکردە پەری خانم و گوتم چەند شەوە خەونت پێوە دەبینم و دڵم بۆت لێدەدات. گوتی بەو شێوەیە نابێت کە دڵت بۆم لێدەدات، پێویستە لەگەڵ عەلی خانی باوکمدا قسە بکەیت. گوتم قسەی چی بکەم؟ گوتی پێی بڵێ کە دڵت بۆ من لێدەدات. گوتم هەروا بە ئاسانی. گوتی بەشێوەی خوازبێنی قسەی لەگەڵدا بکە. من مامەوە و دڵم و ئەقڵم،

هەستی گەنجی و شانسم، هەستم کرد پەیوەندی من و بنەماڵەی عەلی خان خەریکە دەچێتە قۆناغێکی ترەوە. کچێک یا ژنێک چەند ڕۆژ لەمەوبەر ویستی بمکوژێت، ئێستا وا دەڵێت وەرە بۆ خوازبێنیم. گوتم بە ڕاستی بێم بۆ داخوازیت؟ گوتی باشە کاتێک دڵت بۆ من لێدەدات ئایا ڕێگەی ترت هەیە؟ سەرماکە بەهێز بوو نێوان قەبرەکان و ماڵەوە پێنجسەد مەتر دەبوو، خەڵکەکەش بڵاوەیان لێکرد بوو، لەو ڕێگایە هەر کەسە و لەبیری خۆیدا بوو. ئێمە لە خەڵکەکە جێمابووین شتێک کە گیانی گەرم داهێنابووم، هەمان شت بوو کە کوڕە گەنجەکان لەگەڵ کچاندا قسە دەکەن و دەموچاویان سورهەڵدەگەڕێت. هەرگیز لەگەڵ هیچ ژنێکدا باسی داخوازیم نەکردبوو. گوتی حسێن گیان ئەگەر بە ڕاستی و بە حسێنی لەگەڵ تۆدا قسە بکەم نارەحەت نابیت؟ گوتم نەخێر. گوتی چەند ڕۆژێکە هەستم پێکردووە کە تۆ زیاد لە پێویست سەیرم دەکەیت. هەر کچێک ئاگاداری ئەم جۆرە سەیرکردنەی پیاوان بێت لە شێوەی سەیرکردنەکەی تێدەگات، قسەکردن پێویست ناکات زۆرم بیرکردۆتەوە، منیش قینم لە تۆ نییە، پێویستە ئەوە باش بزانیت کە من بیروباوەڕی کۆمۆنیستیم هەیە، بەڵام من کوردێکی موسڵمانم، تا ئێستا دەستی هیچ نا مەحرەمێک بەر دەستم نەکەوتووە، ئەو شەوەش کە دەستی تۆم لە نێودەستم نابوو، دەستی منیش و دەستی تۆش لەدەستکێشدا بوون، واشم بیردەکردەوە کە تا بەیانی کەسمان بە زیندویی نامێنین، وامدەزانی تا بەیانی سەرما دەمانکوژێت. پەری خانم بەردەوام بوو لە قسەکانی و گوتی کاتێک لەگەڵ گروپی هاوبیرەکانم پێکەوە بووین، ئەو هاوبیرانەم دەیانزانی کە من قبوڵناکەم بە چاوی خیانەت سەیرم بکەن، چونکە من کچە کوردێکم شەرەفی خۆم و بنەماڵەکەم لە هەموو شتێک لەلا گرنگترە. ئەگەر کەسێک بیەوێت دەست درێژی بکاتە سەرم.. دەستی برد بۆ کەمەری و گوتی بە یەک فیشەک مێشکی دەپژێنم. تا ئەو کاتە سەیری لاقەدی ئەوم نەکرد بوو، کاتێکیش کە سەیرم کرد بوو بە جلوبەرگەوە هیچم نەبینی بوو. پرسیم چەکت پێیە؟ گوتی من هەمیشە چەکدارم. دوگمەی چاکەتەکەی کردەوە دەمانچەیەکی لە کەمەری بەستبوو. گوتی ئەو دەمانچەیەم هەمیشە فیشەکی لەبەرە و ئامادەی تەقەکردنە. گوتم لەبەرچی دەمانچەت پێیە؟ گوتی ڕەنگە لە هەر کاتێکدا پەلامار بدرێم و بیانەوێت دەسگیرم بکەن، خۆ ئەگەر بیانەوێت دەسگیرم بکەن، لانیکەم سێ تا چوار کەسیان لێدەکوژم، چونکە تاقەتی لێکۆڵینەوەی ساواکم نییە. لە ناکاو ترسێک بەدڵمداهات، تا ئەو کاتە ئەوەندە نەترسابووم، تەنانەت ئەوکاتەش کە هەرسێ خوشکەکە لێیان دەدام و لولەی تفەنگەکەیان لەسەر سنگم دانا بوو، ئەوەندە نەترسا بووم. ڕەنگە ئەو کاتە دەرفەتی ترسانم نەبووبێت. مرۆڤ زۆر

کات دەرفەتی ترسانی نییە، بەڵام من ئەمجارەیان ترسام، من دەمویست خۆشەویستی لەگەڵ کام کچەدا بکەم. کچێکی کۆمۆنیستی چەکدار کە هەموو کاتێک ئامادەی کوشتن و مردنە، واتە من دەمویست لەگەڵ چەکدارێکی سەرەڕۆدا زەماوەند بکەم، ئەویش تێگەیشت کە من بەخۆمدا چوومەوە و گوتم ئێستا چۆن دەتەوێت شوو بە من بکەیت؟ گوتی بە ڕاستی پێت بڵێم یەکەم لەبەر پیاوەتی و لێهاتوییەکەت پێمخۆش بوو، هەر کەسێکی تر بووایە لەبری تۆ لە بەردەمی ئەو دوو ئەفسەر و کارمەندی ساواکییەدا هەموو ڕاستییەکانی دەگوت و منی تووشی دەردەسەری دەکرد، بەڵام تۆ وەک پیاو لەڕوویاندا وەستایت. گوتم تەنها لەبەر ئەوە. گوتی دوو کەس ئەگەر بیانەوێت تەمەنێک بەیەکەوە بژین دەبێت لەگەڵ یەکتریدا ڕاستگۆبن. باوکم دوای لەدەستدانی مەڕەکانی بڕیاری داوە لە جێگایەک بە یەکجاری نیشتەجێ بێت. دەیەوێت بمانبات بۆ تاران، هەموو شتێک ئامادەیە خانوومان هەیە، لە مەیدانی باری تاران دوکانێکمان هەیە، ئیتر هیچ کێشەیەکمان نییە، مەڕەکانیش هەموو فەوتان، ئەو مێگەلە مەڕەش کە ماوە هی ئەسەد و کەڕارە، حەیدەریش بۆ خۆی ماڵی جیایە. گوتم ئەگەر بچیت بۆ تاران بۆ تۆ باشترە؟ گوتی نەخێر، کاتێک حوکمی زیندانییەکەیان بۆ سووک کردم ویستیان لەبری ئەوە بۆماوەی دە ساڵ دوورم بخەنەوە بۆ بەندەر عەباس و جەزیرەی هورمز. باوکم بە هەزار دەردیسەری بەڵێننامەی بۆ واژۆکردن کە من دوور نەخرێمەوە و لەگەڵ خۆیدا بمهێنێت بۆ ئەم دەشتە. واتە من ئێستا بە جۆرێک لە جۆرەکان دوورخراوەم، لە بەڵێننامەکەدا وا نووسراوە کە من لە هیچ شار و گوندێکدا دانەنیشم، لەم ماوەیەدا بە هۆی ڕۆیشتن بۆ تاران و بۆجنوورد، دووجار تووشی گرفتارییان کردوم، ئەو ساواکییەی ئەو ڕۆژە لەوێ بوو هەمیشە خەریکی ڕاپۆرت نووسینە لە سەر من، وا هەستدەکەم ئەگەر شوو بکەم دەستبەردارم دەبن. گوتم بەڵام ئەگەر شوو بکەیت بە من لێکۆڵینەوەت لەگەڵدا دەکەن. گوتی دەمێکە پێیانگوتووم. ئەگەر شوو بکەیت ئێمە حسابت لەگەڵدا دەکەین، بەڵام بە ڕاستی من تۆم خۆشدەوێت، ڕەنگە خۆشەویستییەکەشت لەوەوە سەرچاوەی گرتبێت کە من لەم چۆڵەوانییەدا گیرمخواردووە، لێرە و لەم دەوروبەرە گەنجێک نابینین کە تەنها چوار ساڵ چووبێتە قوتابخانە. گوتم بەڵام من باری ئابووریم زۆر خراپە و خوێندکارم و پارەشم نییە. گوتی نیگەرانی کێشەی ئابووریی مەبە، من خۆم پارەم هەیە، زەویم هەیە، خانووم هەیە، تا زانکۆ تەواودەکەیت و کارێک پەیدا دەکەیت بیر لە پارە مەکەرەوە.. بەڕاستی لە دڵەوە حەزم نەدەکرد ژن بهێنم، تەمەنم بیستویەک ساڵ بوو، هیچ بەرنامەیەکی زەماوەندم نەبوو، ئەم بێوەژنەش (٥-٦) ساڵ لە من گەورەتر بوو،

لەسەر کاری سیاسی دەستگیر کرابوو، منیش هەرگیز لەگەڵ سیاسەتدا نێوانم نەبوو. گوتم خۆ ئەگەر زەماوەند بکەین دەبێت هەمیشە لە شەڕدابین. گوتی بۆچی؟ گوتم تۆ بەڕاستی کۆمۆنیست و لایەنگری سۆڤیەتیت، منیش دژی سۆڤیەتم. گوتی سۆڤیەت مۆدێلە. گوتم مۆدێلێک تەنانەت لە نێو بنەماڵەکەی خۆتدا ناتوانیت ناوی بهێنیت، لە هەوارەکەی خۆشتدا ناتوانیت ئەو مۆدێلە پیادە بکەیت، تۆ کچە خانیت. گوتی کچی خان بووم، بە خۆماڵیکردنی لەوەڕگەکان ئیتر خانەکان هیچ ڕۆڵێکیان نامێنێت، هەروەها بە لەناچوونی مەڕەکانیش ئیتر دەبێت فاتیحا بۆ گیانی خانەکانیش بخوێندرێت. من نزام دەکرد باوکم لەم ژیانە نەگبەتە دەست بکێشێتەوە، ئێستا ڕقی سروشت ئەوی شارنشین کردووە، بەڵام ڕقی ساواک یا من تووشی دورخستنەوە دەکات، یاخود پەلکێشی زیندانم دەکات. گوتم وا دەزانیت بە زەماوەندت لەگەڵ مندا ڕزگارت دەبێت؟ گوتی نازانم، بەڵام زەماوەند چارەسەرێکە. گوتم ئێستا بۆ پەلە دەکەیت؟ گوتی من پەلە ناکەم، گەنجێک لەسەر ڕێگامە و بڕیاری داوە زەماوەندم لەگەڵدا بکات، هەم ڕەوشتی پیاوانەیە و هەم خۆشمدەوێت. یەکەمین جار بوو بڵێت خۆشمدەوێت. سەرماکە بەهێز بوو، نزیک ماڵەوە بووینەوە، خەڵکەکە بەرەو قوتابخانەکە دەڕۆیشتن، گوڵخەندان و فەریبا چوو بوونە ژێر باڵی بیبیەوە. گەرمی ناو ژوورەکە و هەڵمی کتریی سەر زۆپاکە سەهۆڵی سەر لووت و برۆی ئێمەی تواندەوە، بەڵام دڵم خەریک بوو دەبوو بە سەهۆڵ. هەستی گەنجیم دەیەوێت بە دیوارێکی بڵندا هەڵمگێرێت، هەموو ئەندامانی خێزانەکەیان بەتایبەت عەلی خان و جەوهەر خانم لە ژێرەوە سەیری ئێمەیان دەکرد، ڕەنگە شەوی پێشتر گەورەکانیان لەبارەی ئێمەوە قسەیان کردبێت. بیبی گوتی ئیتر ڕەشماڵەکەم بێ ڕووناکیە، ئەو لە هەموو تەمەنیدا لە ژێر ڕەشماڵدا ژیا بوو. عەلی خان گوتی پوورزا بۆ خۆت سەلامەت بیت، ئیتر ئەوە ژیانە و دەسەلات نییە. بیبی گوتی بەڵێ وایە پێویستە لە بیری زیندووەکانماندا بین، لەبیری گەنجەکاندا بین.

ژیانی کۆچەریی ژیانێکی جوڵاوە، کۆچەرییەکان زۆر زووتر و باشتر لە ئێمەی شارنشین و گوندنشینەکان مردووەکانیان بیردەچێتەوە، ئەوان هەر لە ڕێگەی کۆچەکەیاندا مردووەکانیان بەخاک دەسپێرن و بۆ خۆیان دەڕۆن، کۆچەرییەکان گۆڕستانێکی زۆریان هەیە. گۆڕستانی هەوارەکانی هاوین و گۆڕستانی زستانە هەوارەکان و گۆڕستانی سەر ڕێگەکانیان و جگەلە وەش دەیان تەرمی مردووەکانیان لە گوندەکانی سەر ڕێگەی کۆچەکانیاندا بە خاک دەسپێرن. گوندنشینان و شارنشینان زیاتر پابەندن بە گۆڕەستان و مردووەکانیانەوە. من بۆ خۆم نیوەی خزمەکانم لە گۆرستانی (جەوهەرهور) ی یەزد

بەخاک سپێردراون. نیوەکەی تریشیان لە گۆڕستانی (خولد بەرین) تەنها باپیرەی دایکم لە (سەید سەحرا) بەخاک سپێردراوە. هەموو خزمەکانی باوکم، مامەکانم، پوورەکانم، کوڕە مامەکانم هەموو چەتری ئاسن بۆ گۆڕەکانیان دروست کراوە. تەنها گۆڕی باوکم گۆڕێکی سادە و بێ چەترە. تەنانەت گۆڕەکەی بە بەرد و خشتیش دیواری بۆ نەکراوە. چونکە باوکی من تەنها کەسێک بووە لە بنەماڵەی پاپۆلی دا کە سێ ژنی هەبووە، ئەو بێچارەیە ویستویەتی ژنەکانی شەرعی و یاساییبن، بەڵام خزمەکانی تری باوکم بەبێ یاسا و بەبێ بەڵێننامە ژنی تریان هێناوە، چەتریش بۆ گۆڕەکانیان دروستکراوە، ئەوان منداڵیان دروستکردووە. منداڵەکانیشیان نەویستووە. گۆڕەکانیشیان ئاوەدانە. هەندێک لە مردووەکان بەڕێزەوە لەژوورێکدا نێژراون. گۆڕەکەشیان بە بەردی گرانبەها هەڵچنراوە، لەناو ژوورەکەشدا فەرش ڕاخراوە. تۆش وریابە دوو سێ ژن نەهێنیت، «هێنانی ژنی دووەم عەقڵی شێر و دڵی کەری دەوێت»، خۆ تۆ هیچ یەکێکیانت نییە. ئەگەر ژنی دووەم بهێنیت لە ژیاندا تووشی دەردەسەری دەبیت، لەدوای مردنیش کێشە دەکەوێتە نێوان ژنەکانەوە و گۆڕەکەشت بە وێرانی دەمێنێتەوە، لەو دونیای تریشدا نازانم چیت بە سەر دێت. ڕۆژی دوایش لەبارەی گۆڕی خزمەکانیەوە پرسیارم لە بیبی کرد. ئەو خزم و کەسە مردووەکانی لە چلوحەوت شوێن و گوند بەخاک سپێردرا بوون. هەرگیز چاوەڕوانی ئەوەی نەکردبوو مورتەزای هاوسەری لە گوندی ڕاجی بە خاک بسپێردرێت.

عەلی خان بۆ هەندێک ئیشوکاری خۆی لە ماڵ ڕۆیشتە دەرەوە. منیش بێکار بووم، کارێکی تایبەتم نەبوو خۆمی پێوە سەرگەرم بکەم. جەوهەر خانم چای تێکرد و گوتی موهەندیس دانیشە چا بخۆرەوە، ژنانیش لەو ماڵەدا بێکاربوون. کاتێک لە ڕەشماڵدا بوون کاری جۆراوجۆریان، بەڵام لێرە هیچ کارێکیان نەبوو، جگە لە ئامادەکردنی ژەمە خواردنەکان. ژنەکانی حاجی ڕەمەزان و حاجی ڕۆستەم کاری چێشتلێنانیان دەکرد. خانم جانیش سەرپەرشتی دەکردن. عەلی خان دووبارە پێیگوتبوونەوە دوو مەڕی تر سەرببڕن. جەوهەر خانم دەیگوت عەلی خان دەیەوێت ئەو چەند مەڕەی ماون ئەوانیش تەواو بکات. ئەو خەڵکە لە ماوەی ئەو چەند ڕۆژەدا ئەوەندەی یەک ساڵ گۆشتیان خوارد بوو.

دیار بوو پەری خانم چاوەڕوانی وەڵامی من بوو. گوتم سەردانێکی قوتابخانەکە دەکەم. پەری خانم گوتی منیش دێم، لەڕێگەدا گوتی من تەواوی قسەکانم بە ڕاستی بە تۆ گوت، تۆش ڕای خۆتم پێبڵێ. گوتم من تەنها دایکێکم هەیە، پێویستە لەگەڵ ئەودا

قسە بکەم، نامەوێت بەبێ مۆڵەتی ئەو هیچ کارێک بکەم. گوتی باشە، بەڵام ڕای خۆت چییە؟ گوتم من ڕای خۆمم پێگوتیت، گوتی کوا گوتت چی؟ گوتم من دڵم بۆ تۆ لێدەدات. گوتی کەی وەڵامەکەم دەدەیتەوە؟ گوتم کاتێک لەگەڵ دایکمدا قسەم کرد. بۆیە پێویستە من بگەڕێمەوە بۆ مەشهەد. گوتی دایکت لە کوێیە؟ گوتم ئەو لەیەزد دەژی. من گەنجێکی کاڵفام بووم. بیرکردنەوەیەکی بەتاڵم هەبوو، بیرکردنەوەیەک کە ڕەنگە لە مێشکی هەموو گەنجێکدا هەبێت. هەستمکرد کەوتومەتە تەڵەکەوە. وەک مێشێکم لێهاتبوو کە کەوتبێتە داوی جاڵجاڵۆکەوە، هەتا دەستوپێ بجوڵێنێت زیاتر لە داوەکە توند دەبێت. بەو سەرمایە کەسێک لە کۆڵانەکانی گوندەکە نەبوو. پەری خانم گوتی من نایەم بۆ قوتابخانەکە دەگەڕێمەوە بۆ ماڵەوە، تۆش کاتێک کارەکانت تەواوکرد بە زوویی وەرەوە بۆ ماڵەوە، نانی نیوەڕۆ لای ئێمە بخۆ. لە قوتابخانەکە تێکەڵی کوڕەکان بووم، لەگەڵ عەبدولعەلی بڵند و کەسەکانی تر کەوتمە قسەکردن. عەبدولعەلی هەموو ئومێدێکی خۆی لەدەستدا بوو، دەیگوت ئەم سەرمایە وازمان لێناهێنێت. دوو ماڵی تریش لە گوندەکەدا کاریان پەیدا کردبوو، گوندەکە خۆی شوێنی کارکردن بوو، ژمارەیەک لە کێڵگەکانی مانگا بەخێوکردن و مریشک بەخێوکردن کاریان پەیدا کردبوو، ژمارەیەکیش ببوونە کرێکاری پاککەرەوە، وەک ئەوەی لێپرسراوانی گوندەکە چاوەڕوانی ئەو پێشهاتەبن تا کرێکاری هەرزانیان دەست بکەوێت. هەر چۆنێک بێت پەیدا بوونی کار بۆ ئەم هەژارانە بەختێکی باش بوو، بە تایبەت کە لە گوندەکەدا خانووی چۆڵیان دابوو بە کرێکارەکان. عەبدولعەلی بڵندیش بڕیاری دابوو لە کەناری ڕووباری ئەتراک خەریکی کاری کشتوکاڵی بێت، ئەو ئیتر توانای ئاژەڵداریی و کۆچەرێتی نەمابوو، چەندین ساڵ بوو خەونی بە بوون بە خانەوە دەبینی، بەڵام ئێستا بە یەک بەفر و سەهۆڵبەندان دەستبەرداری خەونەکەی ببوو، وەک ئەوەی کە من خەونم بە پەری خانمەوە دەبینی، بەڵام ڕێگەچارەی پەری خانم زەماوەند بوو، شتێک کە هیچ ئامادەکارییەکم بۆ نەکردبوو، بیرم لە بەتاڵبوونەوەی دەکردەوە. بیرم لەوە کردبووەوە بەبێ گرێبەست چەند ڕۆژێک لەگەڵ پەری خانمدا بم، بەڵکو ئەم خانمە بێوەژن و کۆمۆنیستە پێمبڵێت بەڵێ، بەڵام کاتێک دەمانچەکەی پیشاندام و گوتی هەر کەسێک بە خراپ بیر لە من بکاتەوە بە یەک فیشەک مێشکی دەپژێنم. ئەو دەیگوت من لەڕووی فکرەوە کۆمۆنیستم، بەڵام کوردێکی موسڵمانم. کەسێک بوو نە باوەڕی بە خودا هەبوو نە بە هیچ پێغەمبەرێک، بەڵام پابەندی ئەخلاقێکی گەورە بوو. هەمیشە دەفتەری نووسینەوەی بیرەوەرییەکانم لەگەڵ خۆمدا دەگێرا، بەڵام کامێراکەم فلیمی تێدا نەمابوو. ئەی ئەو هەموو وێنانەی کە گرتبوومن چییان بەسەر هات. من

لە سالانی (١٣٥٦-١٣٦٢=١٩٧٧-١٩٨٣) لە پاریس دەژیام، لە شەقامی (Rue de Reuilly) گەڕەکی (١٠٧) شوقەی شەش قاتی دەهەم. لەوێ ژێرزەمینەکەش هی من بوو. کۆمەڵێک کەلوپەلی زیادەمان هەبوو لەگەڵ جانتاکەم لەو ژێرزەمینەدا دامانناکبوون، لە کۆتایی شەش ساڵی خوێندکاریمدا بوومە خاوەنی ژوورێکی گەورە. هەر لەو ژووردا دوو منداڵیشم لەدایکبوون لەیلا و عەلی، یادیان بەخێربێت سەردەمێکی زۆر خۆشبوو. ڕۆژێک دزە بەڕێزەکان چووبوون جانتا و کەلوپەلی دەیان ژێرزەمینیان دزی بوو بە ژێر زەمینەکەی ئێمەشەوە. ئەو دزە بەڕێزانە جانتاکەشیان بردبووم کە پڕ بوو لە فیلم و وێنەی سەردەمی زانکۆ، وایانزانی بوو لەجانتاکەدا شتی تر هەیە. بۆیە بەداخەوە من ئەو وێنانەم هیچی نەماوە، هەموو وێنەکانی ساڵانی (١٣٤٦-١٣٥٦=١٩٦٧-١٩٧٧) م تێداچوون.

کات نیوەڕۆ بوو. عەبدولعەلی بلند زۆر هەوڵیدا تاکو نیوەڕۆ لای ئەوان بمێنمەوە. خەڵکی گوندەکە خواردنی گەرمیان بۆ هێنابوون. حاجی عەلی خان دوو مەڕی پێدا بوون و سەریان بڕیبوو. عەبدولعەلی گوتی ماڵی حاجی عەلی خان ئاوەدان بێت، ئەگەر ئەم خەڵکە لێرە هەر نان و پەنیریان بخواردایە هەموویان نەخۆش دەکەوتن، ئەوەتا لەو ڕۆژەوە هاتووین، حاجی عەلی خان هەموو ڕۆژێک دوو مەڕی سەربڕیوە و هەندێک ڕۆژیش حوشتری سەربڕیوە. خوداحافیزییم لە عەبدولعەلی کرد و گەڕامەوە بۆماڵی عەلی خان، لە ڕێگە بیرم لەوە دەکردەوە ڕێگە بکرێتەوە و بگەڕێمەوە بۆ مەشهەد. لەو سەرمایەدا یادەوەرییەکانم نووسیەوە. لە خۆمم دەپرسی بۆچی کاتێک لێیاندام شکاتم نەکرد؟ بیرێکی زۆرم کردەوە. لە دەفتەرەکەمدا نووسیم ڕەنگە بە جۆرێکی تر تۆڵەی خۆم بکەمەوە. ئەم پەری خانمە زۆر جوانە بەلامەوە ئەو کاتەش لولەی تفەنگەکەی تێکردبووم سەیرمدەکرد دڵم دەلەرزی، بیرم لەوە دەکردەوە ڕۆژێک دەبمە خاوەنی ئەم جوانە، کەواتە ناکرێت شکات بکەم.

مرۆڤ لە تەمەنی لاویدا چ بوونەوەرێکە؟ ئەوە هەمووی هێزی لاوێتیە کە چەندین جار ئەم هەموو یادەوەرییانەم بە بیر دێننەوە، یادەوەریی لە نێوان ترسی مردن و چێژی خۆشەویستی کچێک. ئایا هیچ ئاژەڵێک جگە لە مرۆڤ دەتوانێت بەو جۆرە بیربکاتەوە؟ ئایا هیچ ئاژەڵێک دەتوانێت لە یەک کاتدا هەم دوچاری ترسی مردن بێت و هەم چێژ لە بینین و جوانی وەربگرێت. من ئێستاش پێکەنینم بە گەمژەیی خۆم دێت. چۆن لەو کاتەدا کە بە مەبەستی کوشتنم لوولەی تفەنگیان تێکردبووم، لەبری ترس لە مردن، لە ئارەزووی پەری خانمدا بووم. ئێستاش کاتێک دەچیتە سەر جێگەی نووستن،

لەکاتی ماندوویەتی و تووڕەبووندا لەم ژیانە، بیرکردنەوە لە سەردەمی گەنجی و هەستە ناسکەکان، سەدان جار لە خواردنەوەی مەی و تلیاک کێشان باشترە.. بەڵێ ئەگەر لە بەردەم ئەو دوو ئەفسەر و ساواکییەدا قسەم نەکرد و هیچ نهێنییەکم نەدرکاند، کە پەری خانم و خوشکەکانی بە نیازی کوشتن لێیانداوم، وا تێمەگەن، ئەم کارەم لەبەر خاتری خۆشەویستییەک و پیاوەتیەکی ڕابردوو کرد بێت، بەڵکو دەمویست لە بەرچاوی پەری خانمدا ئازایەتی خۆم دەربخەم و دڵی ئەو بە دەستبهێنم، دەمویست سەرنجی ئەو ڕابکێشم بە لای خۆمدا، چونکە بەڕاستی ئارەزوویەکی سوتێنەرم هەبوو بۆی. هەر چەندە دەمزانی بچووکترین هەڵە لە نێو هۆزەکەدا دەبێتە هۆی لەناوچوونم.

لەکاتی نانخواردندا عەلی خان گوتی پیاوێک لێرە پاسێکی هەیە، ئەو گوتویەتی ئەگەر هەوا کەمێک باشتر بوو تا بجنوردتان دەبەم، ڕەنگە دووسبەی هەوا خۆشتر بێت، بەڵام ئەگەر هەوا هەر وەک ئێستا بێت لێرە دەمێنینەوە. خانم جان ڕووی کردە عەلی خان و گوتی تۆ ئەمڕۆ بەم سەرمایە بۆ کوێ چوویت؟ ئاگات لەخۆت بێت. سەرمات نەبێت. حەیدەر گوتی خان ئەمڕۆ مامەڵەی دەکرد. لەو کاتەدا هەموو پیاوانی هەوارەکەی عەلی خان و عەبدولعەلی ڕاما بوون نەیاندەزانی چی بکەن، من چووم بەسەریاندا و ئەم خەریکی مامەڵەکردن بوو. عەلی خان ڕۆیشتبوو چوار ئەسپی ئەسڵ و هەشت حوشتری بە لێپرسراوانی گوندەکە فرۆشتبوو، لەبری ئەوە کا و جۆ و وێنجەی لێکڕی بوون. کچەکان کەوتنە گلەیی و وتیان بۆچی ئەسپەکانت فرۆشتووە؟ عەلی خان گوتی ئەسپسواری تەواو بوو، مەگەر ئێوە نەتانگوت دەچین بۆ تاران. نیلۆفەر و گوڵخەندان خەمی ئەسپسواریان بوو. پەری خانم گوتی خان دووان لە ئەسپەکان هی من بوون، تۆ خۆت گوتت کە ئەو دوو ئەسپە هی منن. نیلۆفەر گوتی ئەی چی بۆ من بێت؟ پەری خانم گوتی ئەسپەکەی تۆ تۆپی، بەڵێ ئەسپی تۆ تۆپی کاتێک لەو سەرمایەدا خەریکبوو هەموومان دەمردین، بەڵام من ئاگاداری ئەسپەکانم دەکرد. گوڵخەندان گوتی تۆش لە تەنیشت ئێمەوە دانیشتبوویت. پەری خانم گوتی بەڵام من ئەو کوڕانەم ئاگادارکردۆتەوە تا ئەسپەکانم گەرم داپۆشن. پەری خانم بە عەلی خانی گوت ئێستا من بە نرخی دوو ئەسپ لەو مامەلەیەدا هاوبەشم، هەرچیت کڕیووە ئەگەر زیان بکەیت یان قازانج بە نرخی ئەو دوو ئەسپە هاوبەشم. پەری خانم ئابوورییانە بیری دەکردەوە. عەلی خان گوتی زۆر باشە تۆ لەسوود و زیان هاوبەشیت. ئەم کچە لەڕووی بیروباوەڕەوە کۆمۆنیست بوو، لەڕووی دابوونەریتەوە موسڵمان بوو، لەڕووی ئابوورییشەوە سەرمایەدار بوو. من تا ئەو کاتە هیچ کەسێکم نەدی بوو

ڕاستەوخۆ بڵێ من کۆمۆنیستم! پاشانیش هەرچی کۆمۆنیستێکم دیبێت بەدوای پارەدا ڕایکردووە، کۆمۆنیستانە قسەیان دەکرد، سەرمایەدارانە بیریاندەکردەوە و مامەڵەیان دەکرد و بەدوای کۆکردنەوەی سامانەوە بوون. حزبی کۆمۆنیستی فەڕەنساش لە سەردەمانێکدا دەوڵەمەندترین حزبی فەڕەنسا و ئەورووپا بوو. پەری خانم دەیویست باسی هاوبەشبوونی خۆی لەگەڵ باوکیدا بکات. ئەو دەیویست بزانێت بۆ چی باوکی ئەسپەکانی فرۆشتووە و بەو پارەیە ئالفی کڕیوە؟ عەلی خان گوتی ئێستا مێگەلەکەی ئەسەد پێویستی بە ئالف هەیە و هەندێک کا و جۆ دەنێرم بۆ ئەو، دووەم کۆچەریی و ئاژەڵدارەکان تا ئێستا ئالفیان هەڵ نەگرتووە، خۆ ئەگەر ئالف هەبێت ئاژەڵەکان دەیخۆن و ئەگەر نەبێت لە برسا قڕ دەبن. ئێستا هەمووتان تێگەیشتن کە دەبێت هەمیشە ئالفمان هەبێت، ئەگەر ئالفمان نەبێت ئاژەڵەکانمان ناژین. بازرگانانی ئالف قازانجێکی زۆر دەکەن، ئالف دەکڕن و پاش سێ مانگ پارەکەی دەدەن. جۆ کیلۆی بە هەشت ڕیاڵ بوو عەلی خان بۆ ماوەی سێ مانگ کیلۆی نۆ ڕیاڵی پێدا بوو، «کا»ش کیلۆی بە سێ ڕیاڵ بوو، ئەو کیلۆی سێ ڕیاڵ و نوی پێدا بوو، بەڵام پاش سێ مانگی تر پارەکەی دەدا. ئەسپەکانی بە سی‌ویەک هەزار تومەن فرۆشتبوو، هەشت حوشتریشی بە چواردە هەزار تومەن فرۆشتبوو. پێنج هەزار تومەنی وەرگرتبوو. بایی چل هەزار تومەنیش کا و جۆی کڕیبوو. نیلوفەر و گوڵخەندان خەمی فرۆشتنی ئەسپەکانیان بوو. پەری خانم گوتی خان ئەو حسابی کڕین و فرۆشتنە باش بنووسە. خان بە پەری خانمی گوت تۆش هاوبەشیت. پەری خانم گوتی موهەندیس پەڕە کاغەزێکم بدەرێ. منیش کاغەزێکم پێیدا. ئەویش بە قەڵەمەکەی خۆی نرخی فرۆشتنی ئەسپەکان و کڕینی ئالفەکەی بە تەواوی نووسی و لەسەر ئەو پسوڵەیەی کە عەلی خان وەریگرت بوو. پەری خانم زۆر زیرەک و وریا بوو. کاتی عەسر کە بەتەنها بووین گوتم تۆش مامەلە دەکەیت و لەگەڵ باوکتدا هاوبەشیت. گوتی من لەگەڵ باوکمدا هاوبەشم، مارەییەکەم کە پەنجا هەزار تومەن بوو داومەتە باوکم، لە مێگەلەکەشدا هاوبەشی بووم بە قازانجی ئاژەڵەکان پارچە زەوییەکم لە تاران کڕیوە بە لەناوچوونی مەڕەکان منیش زیانێکی گەورەم بەرکەوت، ئێستاش دەبێت لە بازرگانیدا هاوبەشبم. عەلی خان ئالفەکەی لە عەمباری گوندەکەدا دانا بوو، بۆ هەر مانگێک پێنجسەد تومەن کرێی عەمباری دەدا...

## گەڕبووانی گوندەکە

دوای نیوەڕۆ لەگەڵ کچەکان و مەنوچەهردا سەردانی ناو گوندەکەمان کرد و چووین بۆ سەردانی ئەو شوێنەی کە نەخۆشە گەڕبووەکانی لێبوو. ئەوان کەسانێکی میهرەبان بوون و ئومێدیان بە دوارۆژی خۆیان پەیدا کردبووەوە. یەکێک لەکارەکانی فەرەنسییەکان ئەوە بوو، ئەو نەخۆشانەی تووشی گەڕیی دەبوون و لە ژیان نا ئومێد دەبوون بیانگێڕنەوە بۆ ژیانی ئاسایی خۆیان.

بارامی ئەسالەتان، خەڵکی گوندی (تەبادکان) ی مەشهەد بوو، پێش سی ساڵ، واتە ساڵی (١٣١٨-١٩٣٩) تووشی نەخۆشی گەڕیی ببوو. لە گوندەکەی خۆی دەریان کردبوو، هیچ کەسێک ئامادە نەبوو لێی نزیک ببێتەوە، ڕووی کردبووە هەر گوندێک دەریانکرد بوو، لە هەموو شاری مەشهەدیشدا جێگایەک نەبوو ڕووی تێبکات، خەڵکی بەگشتی لێی ترسابوون، ترسابوون نەکا ئەوانیش بە هۆی ئەوەوە نەخۆشییەکە بگرن، پاشان ئەو لەگەڵ چەند کەسێکی تردا کە هەمان نەخۆشییان هەبوو لە نزیک گوندی (سیساوا) ی مەشهەد ژوورێکی بچکۆلانە دروست دەکەن و بەیەکەوە لە ئەو ژوورەدا نیشتەجێ دەبن، زۆر بە بەدبەختی دەژیان.

لێکدانەوەی ژیانی ئەو بەدبەختانە پێویستە لە شوێنێکی تردا بنووسین. بارام کاتژمێرێک چیرۆکی ژیان و نەهامەتییەکانی خۆی بۆگێڕامەوە، باسی برسێتی و بەدبەختی خۆی بۆ دەکردم. ساڵی (١٣٣٧-١٩٥٨) بردبوویان بۆ نەخۆشخانەی گەڕبووانی شاری مەشهەد، بۆ ماوەی نۆ ساڵ لەوێ لەژێر چارەسەردا ببوو. ئەو باسی میهرەبانی کچە خۆبەخشە فەرەنسییەکانی بۆ دەکردین، باسی ئەو کچە پەرستارانەی دەکرد کە تەرکی دونیایان کردبوو، ئەوانەی کە شار و وڵاتی خۆیان جێهێشتبوو وازیان لە ژیانی تایبەتی خۆیان هێنابوو، هاتبوون بۆ مەشهەد تاکو چارەسەری ئەو کەسانە بکەن کە تووشی نەخۆشی گەڕیی ببوون.

ئەو سێ پەرستارە خۆبەخشە، لە شوێنی حەوانەوەی خۆیانەوە، بە سواری پاسکیل دەچوون بۆ نەخۆشخانەکە. لەو ساڵانەدا هەموو خەڵکی مەشهەد ئەوانیان دەناسی، یەکێک لەوسێ کچە، چەند مانگێک وانەی فەرەنسی بە من گوتووەتەوە. بارام گوتی لە درێژەی ئەو ماوەیەدا کە لەژێر چارەسەردا بووە، دایک و باوکی مردوون. بارام دوای چارەسەرکردن ویستبووی بگەڕێتەوە بۆ گوندەکەی خۆیان، بەڵام برا و خوشکەکانی و خەڵکی گوندەکە لە گەڕانەوەی ترسا بوون، نەیانهێشتبوو بچێتەوە گوندەکەی خۆی و دەریانکردبوو. هەر بۆیەش جارێکی تر پەیوەندی بە کچە خۆبەخشەکانەوە کردبووەوە،

ئەوانیش بردبوویانەوە بۆ گوندەکە و قسەیان لەگەڵ خەڵکی گووندەکەدا کرد بوو کە کێشەی نەخۆشی نەماوە. هەر لەوێ هەموو پێداویستییەکانی ژیانیان بۆ دابین کردبوو. بارام لەگەڵ ژنێکی چارەسەرکراوی هەمان نەخۆشیەکەی خۆی زەماوەندی کرد بوو، ئەو لە تەمەنی چلوچوار ساڵیدا زەماوەند کردبوو، بارام فێری کاری باخەوانی ببوو، بەڵام دەستەکانی بێتوانا بوون، ئەو دەیگوت وەرزشێکی زۆر بە پەنجەکانم دەکەم، بەڵام هێشتا بێتوانان و هێزیان نییە، ناتوانم مقەستی درەخت هەڵپاچین بەکاربهێنم. بارام برینێکی قوڵ بە ڕوویەوە دیاربوو، لایەکی لووتی نەمابوو بە هۆی نەخۆشییەکەیەوە پەنجەیەکیشی نەمابوو، ژنەکەشی بیستوپێنج ساڵ بوو تووشی نەخۆشی گەڕیی ببوو، ژنێکی میهرەبان بوو، ئەویش چارەنووسی هەر وەکو بارام بوو. ئەو ژنە گوتی موهەندیس وەک تۆ بزانیت ئێمە دەبینە خاوەنی منداڵ. گوتم بە دڵنیاییەوە دەبن، لەوە زیاتر نەمدەزانی چی بڵێم؟

سەیرم کرد وا گوڵخەندان ڕووی وەرگێڕاوە و فرمێسکەکانی دەسڕێت. هەموو کەسێک خاوەنی چەند کەسایەتیەکە، هێشتا برینی نێو چاوانم چاک نەببووەوە کە بە قۆناخە تفەنگی گوڵخەندان بریندارکرا بوو، هێشتا سەرما برینەکانی گیانمی دەکزاندەوە، هێشتا زۆرێک لە برینەکانم پێچرابوون، کچێک کە لە لێدانی مندا هیچ بەزەییەکی نەبوو، کە چی ئێستا بە بینینی ژنێک کە تووشی نەخۆشی گەڕیی بووە. کەوتۆتە گریان.

لە دڵی هەر کەسێکدا تاوان و بەزەیی هەیە، لەدڵی هەمان کەسیشدا میهرەبانی و بەزەیی هەیە، ئێمە لێکۆڵینەوەکانی سوقرات و هیپاتیکس و هیچ کتێبێکمان نەخوێندۆتەوە، تاکو بزانین هەموو کەسێک هەم درۆزنە و هەم ڕاستگۆشە. پێویستە هەستی میهرەبانی کەسەکان بەهێز بکەین، پەروەردەکردنی ئێمە بەرەو کوێ دەڕوات؟ لە ناخی هەموو کەسێکدا خویەکی دڕندانە و دوژمنکارانە هەیە. هەموو کەسێک دەتوانێت خۆی بکات بە فریشتە و گشت کەسێکی خۆشبوێت و هەموو کەسێک خۆشی بووێت. کۆمەڵگە، دایک، باوک، قوتابخانە و مامۆستا دەتوانن ئەو خووە (هەستە) بە هێز بکەن، هەوڵبدەین هیچ کەسێک بە دوژمنکار نەزانین. نەفرەت لەوانەی ئاژاوەگێڕن، نەفرەت لەوانەی شەڕەنگێزن، نەفرەت لەوانەی تۆوی دووبەرەکی دەچێنن. زۆربەی خەڵکی بە هۆی پەروەردەی خراپەوە تووشی دوژمنکاریی دەبن و تووشی هەڵە دەبن و پاشان بەدوای چارەسەردا دەگەڕێن. خووی خراپ دەتوانێت مرۆڤ بگۆڕێت بۆ ئاژەڵێکی دڕندە، بەڵام فەرهەنگی ئێمە فەرهەنگی خۆشەویستی و میهرەبانییە. حافزی شاعیری گەورەمان چرای هەمیشەیمانە، ئەو چرایە ئێستا لە هەموو ماڵێکی ئێراندا هەیە. حافزی

گەورە لە دیوانەکەیدا زیاتر لە چوارسەدوچل جار وشەی خۆشەویستی، هاوڕێیەتی، هاوکاری، عیشقی بەکارهێناوە، بەڵام لە هەموو دیوانی حافزدا یەک جار وشەی دوژمن بەکارهاتووە ئەو دەڵێت.

**درەختی خۆشەویستی، خۆشی بۆ دڵ بە بار دێنێ**
**داری دوژمنی ببڕن، بەری ڕەنجبەخەسار دێنێ**

لە بیرکردنەوەیەکی قوڵدا بووم. هاوسەرەکەی بارام چایەکی لە بەردەمم دانا، گوتی خودا ئێمەی باش تاقیکردەوە. تاقیکردنەوەیەکی دوورودرێژ. من لە تەواوی بیستوپێنج ساڵ نەخۆشیمدا هەرگیز ناشکور نەبووم، بەمەرجێک ئومێدێک نەبووە بۆ چارەسەرم. ناشکور نەبووم کاتێک بە ئازارەوە دەتلامەوە، بە سەرما و گەرما چاوەڕوانی پارووە نانێک بووم کە دەستم نەدەکەوت. سوپاسی خودام دەکرد و نا ئومێد نەبووم، بەڵام لە سایەی خوداوە چاکبوومەوە و ڕزگارم بوو. خودا لە دایک و باوکی ئەو کەسە خۆش بێت کە ئەم درمانی چارەسەرەی دۆزییەوە، جا ئەو کەسە سەر بە هەر ئایین و مەزهەبێک بێت. بەدڵنیاییەوە ئەو کەسە جێگای بەهەشتە، تۆ نازانیت ئەم خوشکە خۆبەخشە مەسیحییانە چ ئەرکێک دەکێشن لەپێناوی ئێمەدا، ئەمانە فریشتەن، ئەمانە خەڵکی فەڕەنسان، لەوێوە هاتوون بۆ ئێرە، ئەو هەموو ڕێگا دوورەیان بڕیوە و لێرە لەم گوندە دوورە شارەدا فریای ئێمە دەکەون. پەری خانم گوتی لەبارەی خواردن و خۆراکەوە چۆنن؟ باش هاوکاریتان دەکەن. بارام و هاوسەرەکەی هەردوو گوتیان خودا خێریان بنووسێت، خودای گەورە خۆراکی ئێمە لەلایەن ئەوانەوە دەنێرێت. منیش سەیرێکی پەری خانم کرد و لە دڵی خۆمدا گوتم خودا خۆراکی منیش لە شوێنێکی ترەوە دەنێرێت. بە سەر هەستەکانی خۆمدا زاڵ بووم و لە ماڵی بارام و هاوسەرەکەیەوە بە ئومێدێکی ترەوە هاتمە دەرەوە.

بیبی لە ژوورە بچووکەکەیدا بەرماڵی ڕاخستبوو. بەردەوام نوێژی دەکرد. گوتم بیبی نوێژ زۆر دەکەیت. گوتی لە ماوەی ئەم چەند ڕۆژەدا ئەوەندەی هەموو تەمەنم نوێژم کردووە. تۆ دەزانی ئێمەی کۆچەریی کاتی نوێژکردنیشمان نییە، هەرچەندە نوێژکردنیش نازانم ئێستاش خۆم نازانم لە کاتی نوێژکردندا چی دەڵێم، لە نێو ئێمەدا کەسێک لە هەمووان لێمان نزیکتر بووبێت، هانامان بۆ بردبێت، سوێندمان بەسەری خواردبێت هەر ئیمامی عەباس بووە. بیبی بە هێواشی گوتی موهەندیس دەتەوێت چی بکەیت؟ گوتم چی بکەم ؟ گوتی تۆ هەر لەم کەسانەی ئێمە ژن دەهێنێت، گڵێۆت بە

نسیب نەبوو، ئەو کەسێکی هەژار و بێ کەسوکار بوو، ئەم کچانەی ئێمە کچی چاکن، بەم مەڕ قڕانەش ئیتر عەلی خان ئەو گەورەییەی جارانی نەماوە، بۆیە پێمباشە لێرە کەسێک دەستنیشان بکەیت. گوتم بیبی من چاوەڕوان دەکەم ئۆتۆمبێلێک پەیدا ببێت و لێرە بڕۆم. گوتی ئەوە دوایین قسەتە؟ گوتم بەڵێ. گوتی کەواتە من نزادەکەم هەوا خۆش ببێت و بە زوویی بڕۆیت...

## ڕۆیشتن لە گوندی ڕاجی

بە ڕۆژ پلەی گەرمی دەگەیشتە حەوت پلە ژێر سفر و شەوانیش هەندێک جار دەگەیشتە بیستوحەوت پلە ژێر سفر. من نامەوێت خشتەی ئاماری کەشناسیتان نیشانبدەم، ئێمە نزیکەی نۆ ڕۆژ بوو لەو گوندە بووین. بڕیار وا بوو ڕۆژی دەیەم بڕۆین بۆ بۆجنوورد. عەلی خان تێکڕای پیاوانی هەوارەکەی لە ڕاڕەوی قوتابخانەکە کۆکردەوە و گوتی ئەوا مەڕەکان هەموو فەوتان، بەڵام سوپاس بۆ خودا کە خۆمان ماوین، فاتیحا بۆ گیانی مردووەکانمان بخوێنن. عەلی خان گوتی من دەڕۆم بۆ بۆجنوورد هەر کەسێک لەگەڵ مندا دێت لەوێ کارێکی بۆ پەیدا دەکەم، بگەینەوە بەهار دیسانەوە ئاژەڵداریی دەست پێدەکەمەوە و مەڕو ماڵات پەیدا دەکەمەوە، کارێک دەکەم تووشی کێشە و نەبوونی نەبین، هەمووان گوتیان خوا تەمەنی خان درێژبکات.

بڕیاروا بوو حەیدەر و کەڕار و حاجی ڕۆستەم و حاجی ڕەمەزان سەرپەرشتی ئێش و کارەکان بکەن. عەلی خان ئامۆژگاری تەواوی حەیدەری کرد، ئەو دەبوو تەواوی کەلوپەلەکان کۆبکاتەوە و بیاننێرێت بۆ بۆجنوورد، ئەو مەڕ و حوشترانەی کە مابوونەوە تێکەڵ بە مێگەلەکەی ئەسەد بکرێن. چەند ماڵێکیش دەتوانن بڕۆن بۆ لای هەواری ئەسەد. دیاربوو ئەو ماڵانەش کێن، ئەو ماڵانە بوون کە زۆر هەژار بوون و هیچی وایان نەبوو. عەلی خان هەندێک پارەی دا بە کەڕار و گوتی هەر کاتێک هەوا خۆش بوو، هەمووان بنێرە بۆ بۆجنوورد، خۆشت بڕۆ بۆ تورکمان سەحرا بۆ هاوکاری ئەسەد. پەری خانم زۆر نیگەران بوو پێشنیاری کرد کە ئەویش لەگەڵ ئەسەددا بڕوات بۆ تورکمان سەحرا. عەلی خان گوتی بەڵێننامەم داوە کە تۆ لە شار و لە گوند ناتوانیت دانیشیت. عەلی خان گوتی ئێستا بە بیانووی بەفر و سەرماوە دەڕۆم بۆ شار لەوێ ڕێگەچارەیەک دەدۆزمەوە..

منیش لەگەڵ یەکبەیەکی خەڵکەکە و ماڵەکاندا ماڵئاواییم کرد. بەدوای «یەلە»دا دەگەڕام، پاشان دۆزیمەوە، بینیم لەگەڵ یەکێک لە خۆبەخشە فەرەنسییەکاندا قسەی

دەکرد. «یەلە» لە ماوەی نۆ ڕۆژدا فێری چەندین وشەی فەڕەنسی ببوو. گوتم «یەلە» ئێمە دەمانەوێت بڕۆین بۆ بۆجنوورد تۆ لەگەڵماندا دێیت یان نا؟ لەبری ئەوەی وەڵامی من بداتەوە، سەیرێکی کچە خۆبەخشەکەی کرد. کچە خۆبەخشەکە گوتی ئەم منداڵە دایک و باوک و هیچ کەسێکی نییە و تاک و تەنیایە، قسەمان لەگەڵ عەلی خاندا کردووە کە ئێمە لێرە چاودێریی دەکەین. عەلی خانیش پێیگوتین کار لەمە باشتر نابێت. کچەکە گوتی «یەلە» زۆر زیرەک و بەتوانایە ئەوەتا لە ماوەی ئەم چەند ڕۆژەدا تاڕادەیەک فێری فەڕەنسی بووە، ئینجا گوتی تۆ نیگەرانی «یەلە» مەبە، ئێمە وەک منداڵی خۆمان چاودێری دەکەین، گەورەی دەکەین و دەینێرینە قوتابخانە. منیش «یەلە»م ماچکرد و بیست تومەنم پێدا. ئەوکاتە «یەلە» تەمەنی هەشت ساڵ بوو. کاتێک ویستم بڕۆم ئەو بەزمانی فەڕەنسی خوداحافیزیی لێکردم. کاتێک خوداحافیزییم لە عەبدال و غەفار کرد، ئەوان دەستیانکرد بە گریان، برزوو گوتی پێویست بەگریان ناکات. سەردانمان دەکاتەوە. حاجی ڕۆستەم پاسەوان و لێپرسراوی عەمبارە ئالفەکانی عەلی خان بوو لەگوندەکەدا، برزووش هاوکاری دەکرد.. گەوهەر ژنێکی بەتەمەن بوو، هاوتەمەنی بیبی بوو، خۆی و عومرانی هاوسەری تەنها پازدە سەر مەڕیان هەبوو. چوار سەر لە مەڕەکانیان لە سەرماکەدا تیاچووبوون. یازدە مەڕیان بۆ مابووەوە. گەوهەر ئەسپەندی بۆ هەمووان سووتاند و دوکەڵی کرد، سینی ئەسپەندەکەی چەند جارێک بەدەوری سەری مندا سوڕاند. عەلی خان هەندێک پارەی خستە سەرسینی ئەسپەندەکە. منداڵانی خانیش هەریەکە و کەمێک پارەیان دانا. منیش دە تومەنم دانا، تیشکێکم لەچاوی بێ ڕووناکی ئەو ژنەدا بینی، من تیشکی لەو جۆرەم کەمتر بینیوە. گەوهەر بەگشتی هەشتا تومەن پارەی دەستکەوت. ئەو و هاوسەرەکەی دەیانویست بەو یازدە سەر مەڕەوە بڕۆن بۆ تورکمان سەحرا، بە چ ئومێدێکەوە؟ بە گەوهەر خانمم گوت بۆچی ئێوەش نایەن بۆ بۆجنوورد؟ گوتی بە چ ئومێدێکەوە بچین بۆ بۆجنوورد؟ عومرانی هاوسەری گوتی (نەهێزێک لە دەستماندایە و نە ئاڵتونمان لەتەرازوو دایە). بەو وتەیە سەرسام بووم، کە چۆن شوانێک بۆ قسەکردن سوود لە وتەکانی سەعدی شیرازی وەردەگرێت. لە دەریای بیرکردنەوەدا بووم، کاتێک عومران گوتی ڕەشماڵێکم هەیە و لەگەڵ چەند بزن و وڵاخێک، خودا گەورەیە و دەشتیش فراوانە و خەڵکیش میهرەبان. ئینجا گوتی ئێستا خەڵکەکە هەموویان هەژار و بێلانەن، واهەستدەکەم لە تورکمان سەحرا کەشوهەوا خۆشترە و تورکمانەکانیش میهرەبانن، لەوێ چەندین هاوڕێم هەیە دەچمە بەردەرگای ئەوان، دەزانم کە بەدەستی بەتاڵ ناگەڕێمەوە. گوتم عەلی خانیش گوتوویەتی ئەگەر

بێن بۆ بۆجنوورد بە برسیێتی نامێننەوە. عومران گوتی من بە ئومێدی خودا و ئیمام عەباس ڕوو لە کێو و دەشت دەکەم، بەڵام بە ئومێدی خان ناڕۆم بۆ بۆجنوورد. گوتی موهەندیس خودات لەگەڵ بێت، ڕەنگە یەکتری نەبینینەوە گەردنم ئازاد بکە. گوتم جگە لە چاکی و باشی لە ئێوە و لەو خەڵکە هیچ شتێکی ترم نەبینیوە. دیسانەوە گوتی توخودا گەردنم ئازاد بکە. ئەو پیرە مێردە دەستی کردە ملم و زۆر بە کوڵ دەستیکرد بە گریان. پاشان گوتی ئەو ڕۆژە کچەکانی عەلی خان بە منیان گوت کە ئەسپەکەیان بۆ زین بکەم، کاتێک خەریکی ئامادەکردنی ئەسپەکە بووم. گوێم لە قسەکانیان بوو، لەبەرنامەکەیان دەربارەی تۆ ئاگاداربووم، بەڵام نەمتوانی هیچ کارێک بکەم، تەنها توانیم جەوهەر خانم ئاگادار بکەمەوە. ئەویش عەلی خانی ئاگادارکردەوە. تکایە لێم ببوورە، من دەزانم تۆ لە ئەسپ نەکەوتویتە خوارەوە. دەموچاوە فرمێسکاوییەکەیم ماچکرد، لە ژێر ئەو هەموو جلوبەرگەوە گوێم لە لێدانی دڵی ئەو پیرەمێردە بوو، ئەو بە ئومێدی خودا دەڕۆیشت بۆ تورکمان سەحرا، بەڵام بە ئومێدی عەلی خان نەدەڕۆیشت بۆ شار. چەندە ئومێدی بە خۆی و بە خودا هەبوو، بە یازدە سەر مەڕەوە لە تەمەنی حەفتا ساڵیدا دەیتوانی چی بکات؟ وا هەستم دەکرد بەو سەرما سەختە ئەو پیرەمێردە لەگەڵ هاوسەرەکەیدا ناگەنە تورکمان سەحرا لەبرسا دەمرن.

پاش شەش ساڵ لە مانگی (فەروەردیینی ١٣٥٤= مارتی ١٩٧٥) دا لە لەوەڕگەکانی (ئاجی سوی) تورکمان سەحرا چاوم پێی کەوتەوە، زۆر بە توانا و گورجوگۆڵ بوو، شەوێک لە ڕەشماڵەکەیان میوانیان بووم (١٦٥) سەر مەڕی هەبوو لەگەڵ وڵاخێکدا، سێیەکی تراکتۆرێکیشی هەبوو. تراکتۆرێک کەلوپەلەکانی خۆیان پێدەگواستەوە و ئاڵفیشیان بۆ ئاژەڵەکان پێدەهێنا. ئەو کۆچەرییانە وردە وردە لە سەردەمی حوشترەوە دەچوون بۆ سەردەمی تراکتۆر. عومران مێگەلێکی بۆ خۆی دروست کردبوو، بە ئومێدی خودا و پشتبەستن بە خۆی و هەوڵ و ماندوبوونی کاری خۆی کردبوو.

من هەر کاتێک هەست بە ئیرەیی هاوڕێیانی زانکۆی فەردەوسی مەشهەد دەکەم، بەرەو ڕوویان دەوەستم. ئەوان دەیانەوێت لە شاری هیرات کارێم دەستبکەوێت، من دووبارە بە ئومێدی خودا و یادی عومران، چەقەنە لێدەدەم، کار پەیدادەکەم و دەچمە سەرکار. ئەگەر هەموو دونیا بخۆیت، سەگەکانی بەستەڵەکی باکوور دەتوانن تۆ بخۆن. لە هەموو تێکشکانێکدا سەرکەوتنێک هەیە. لە هەموو کێشەیەکدا پەندێک هەیە. پەندێک کە دوای ماوەیەکی درێژ دەردەکەوێت. لە ساڵی (١٣٥٤-١٩٧٥) دا عومران لێپرسراوی هەوارێک بوو، بۆ خۆی قەرەباڵغیەکی باشی لەدەور بوو. شەوێک لە ژێر ئاسمانی

جوانی تورکمان سەحرادا و لە بەردەمی ڕەشماڵەکەیدا ئاهەنگێکی گێڕا، بانگی کرد منداڵان وەرن یارییەک بۆ موهەندیس بکەن، واتە شایی و هەڵپەڕکی بکەن. ئەو شەوە شەوێک بوو شەوی خۆشی و شادی، شەوی سوپاسگوزاریی لە دەرگای خودادا. لە هەمووی خۆشتر ئەوە بوو کە عومران میوانێکی تورکمانی هەبوو، ئەو میوانە دووتاری لێدەدا، دووتارێک کە ئاوازەکەی هەمووانی دەبردەوە بۆ جیهانێکی تر. لە تورکمان سەحرا دا پیاوێکی تورکمانی سوننە لە نێو کوردانی شیعەدا بە دوو تاڵ سیم و پارچە تەختەیەک ئاوازێکی دەردەهێنا کە تا ئێستاش لەرەی لە گوێی مندایە. ئاوازی یەکبوونی گەل و مەزهەبەکانی ئێران بوو.

هەمووان دەیانزانی عەلی خان دەیەوێت بۆ هەمیشە بڕوات، بوونی حەیدەر و کەڕار نەیدەتوانی نا ئومێدی و ترس لە دڵی ئەو خەڵکەدا بڕەوێنێتەوە. هاوشێوەی کەسانی وەک عومران هەبوون کە بە پشتبەستن بە خۆیان دەیانتوانی بڕۆن بۆ تورکمان سەحر، بەڵام کەسانی سەرلێشێواویش هەبوون کەهیچ توانا و ئومێدێکیان نەبوو. ژنێکی میان ساڵ گوتی خان تۆ دەڕۆیت ئەی ئێمە چی بکەین؟ هاوسەرەکەی گوتی ژنەکە خودا گەورەیە. عەلی خان گوتی یەکەم خودا گەورەیە، دووەم ئەسەد و حەیدەر و کەڕار لەلاتانن. پاشان من دەڕۆم بۆ بۆجنوورد کار بۆ هەمووتان پەیدا دەکەم، دەڕۆم ئاژەڵ پەیدا دەکەم و مێگەلە مەڕێک دروستدەکەم، پێویستە بڕۆم پەناگەیەک دروستبکەم و کارێک بکەم تاکو بە سەرمایەک ئەو هەموو مرۆڤ و ئاژەڵە لە نێو نەچن. سەیرکەن ئەم چەند ڕۆژە ئەگەر ئەم گوندە نەبووایە هەموومان دەمردیین، ئەگەر ئۆتۆمبێل نەبووایە ئێمە دەمردیین، مەڕەکان، حوشترەکان، ئەسپەکانمان هەموو فەوتان، هاوڕێکانمان مردن، ئەم ژیانە بەو شێوەیە بەسە، ئەم کۆچەرییە بەسە، هەر کەسێک دەیەوێت بێت بۆ شار ئەوا حەیدەر بە ئۆتۆمبێل بەڕێتان دەکات، هەر کەسێک دەیەوێت بچێت بۆ تورکمان سەحرا ئەوا حەیدەر و ئەسەد لەوێ دەبن و هاوکاریتان دەکەن، من خۆشم هاوکاری بۆ ئێوە دەنێرم.. بەڵام قسەکردن بۆ کەسانێک کە نازانن ئەمڕۆ نیوەڕۆ کەسێک خواردنیان دەداتێ یان نا هیچی دیارنییە.

برزوو گوتی خان من دەڕۆم بۆ تاران، دەڕۆم لەوێ کرێکاری دەکەم ئێتر نامەوێت لێرە بمێنمەوە. غەفار گوتی برزوو منیش لەگەڵ خۆتدا ببە. عەلی خان ڕووی خۆی وەرگێڕا و کەوتەڕێ، دەستەسرە ئاوریشمیەکەی لە گیرفانی دەرهێنا و فرمێسکەکانی سەر ڕوومەتی سڕی و ئیتر وازی لەو ژیانە هێنا کە سەروەر و گەورەی ئەو خەڵکە بوو. ئەو وازی لە هۆزەکەی هێنا و بەدوای جۆرە ژیانێک کەوت کە نەیدەزانی چارەنووسی بە

چی دەکات؟ زۆرترین نیگەرانیەکەشی بۆکچەکەی بوو، کچێک کە دۆسیەیەکی گەورەی سیاسی بۆ کرابووەوە و ڕابردووی دوو جار زیندانی کردنی هەبوو.

ئەندامانی بنەماڵەی عەلی خان و ژنی حاجی ڕۆستەم و دوو ژن و سێ منداڵی نەخۆش کە بەردەوام دەکۆکین سواری پاسەکە بوون، شۆفێر و هاوکارەکەشی زنجیریان لەتایەی پاسەکە بەست، پاچ و خاکەنازیان خستە نێو پاسەکەوە، کورسییەکانی پاسەکە پڕ پڕ ببوون. لە نێوان کورسییەکانیشدا خەڵک دانیشتبوون. (٢٣-٢٤) کەس دەبووین، (٧-٨) کەس سەر بە هەوارەکەی عەبدولعەلی بڵند بوون. ئەوانی تر هەموویان لە تایەفەی عەلی خان بوون. پاسەکە کەوتەڕێ و خەڵکەکە دەستیان کرد بە سڵاوات لێدان. جادەکە بەفر گرتبووی، شۆفێرەکە پێشی خۆی باش نەدەبینی، بەهەزار زەحمەت گەیشتینە سەرجادە گشتییەکە. لەسەر جادەکە کەلاکی چەندین ئاژەڵی مردارەوەبوو کەوتبوون. کەلاکی مەڕ، حوشتر، ئەسپ، لە سەر بەفرەکە بوون. بێدەنگی خۆی بەسەر قوڕەمەیداندا کێشا بوو، بێدەنگی بەفر و مردن لەگەڵ دەنگی گرەگرِی مەکینەی پاسەکە تێکەڵی سروشت دەبوون. دەنگی منداڵان بەرزدەبووەوە کە لە پەنجەرەی پاسەکەوە مەڕە مرداربووەکانیان پیشان دەدایەن. لە چەند شوێنێک پاسەکە لە بەفردا دەچەقی و بەناچاری بە ژن وبپیاوەوە دادەبەزین بۆ پاڵنان. نزیکەی حەوت کاتژمێر بە ڕێگاوە بووین بۆ بڕینی پەنجاوپێنج کیلۆ مەتر. شۆفێرەکە بە عەلی خانی گوت چی بکەین، بەم بەفرە ناتوانین لە گەردەنەی (بەدرانلو) سەرکەوین؟ عەلی خان گوتی شەو لە ئاشخانە دەمێنینەوە. (٧-٨) کەسمان لەگەڵ بوون کە سەر بە هەواری عەبدولعەلی بڵند بوون، ئەوان ویستیان لە ئاشخانە دابەزن و بچنە ماڵە خزمەکانیان. ئەوان ڕۆیشتن و ئێمە نزیکەی پازدە کەس مابووینەوە. پاسەکە لە بەردەمی کۆڵانێکدا وەستا. ماڵی یەکێک لە دۆستانی عەلی خان لەو کۆڵانەدا بوو. کۆڵانەکان پڕ بوون لە بەفر، ئەوەندە بەفری تێدا بوو کە زۆر بە ناڕەحەتی هاتوچۆیان تێدا دەکرا. جادە و کۆڵانەکان چۆڵ بوون، کەس بەدی نەدەکرا، تەنها دارێک لەو ناوەندەدا دیار نەمابوو. چەند ڕۆژێک لەوەبەر کە لەئاشخانە بووم ئەمبەراوبەری شەقامەکە درەخت بوون، بەڵام ئێستا هیچ دارێک بەدی ناکرێت. عەلی خان دابەزی و ڕۆیشت بۆ ماڵی ئاشناکەی، پاش سێ خولەک سێ پیاو هاتن بۆ لامان بەگەرمی بەخێرهاتنی ژنەکانی عەلی خانیان کرد، دیار بوو ئەو سێ پیاوە دوو کوڕ و باوکێک بوون. لە شوێنی دابەزینەوە تا ماڵەکە پەنجا مەتر دەبوو. لەو ماوەیەدا چەند کەسێک کەوتن و هەڵسانەوە. لە حەوشی ماڵەکەدا بە بەرزی سێ مەتر بەفری لێبوو، بەفری سەربانەکە بوو کە ماڵیبوویان کەوتبووە نێو حەوشەکەوە.

هەمووومان چووینە ژوورێکەوە بە دەوری زۆپاکەدا دانیشتین. ئەژنۆکانم زۆریان سەرمابوو. هەر چەندە لە نزیک گەرمی پاسەکە شەوە سوار ببووم، بەڵام سەرما کاری لە ئێسقانەکانیشم کرد بوو. داماو ئەو ژن ومنداڵانە بوون کە لە بەشی دواوەی پاسەکەدا، دانیشتبوون.

شۆفێرەکە گوتی من شەو دەچم بۆ ماڵی هاورێیەکی خۆم بەیانی دێمەوە بەشوێنتاندا، تکایە ئێوەش زوو ئامادەبن. زۆپای نێو ژوورەکە بە دار گەرم کرابوو. خاوەن ماڵ بە کورەکەی گوت ئاگری زۆپاکە زیاد بکە، پاش چەند خولەکێک کوڕی خاوەن ماڵ بەیەک گوێنی پڕەوە هاتە ژوورەوە، گوێنیە کە تەپاڵە بوو، تەپاڵەیەک کە بە دەست ئامادە کرابوو. خاوەن ماڵ داوای لێبووردنی لە هەمووومان کرد و گوتی نەوتمان نەماوە و لەم شارەدا یەک دڵۆپ نەوت پەیدا نابێت، گوتیشی ڕۆژانی یەکەم و دووەمی بەفرەکە ڕیزبەستن بۆ وەرگرتنی نەوت دوورودرێژ بوو، لەسەر نەوت وەرگرتن چەند شەڕێک لە نێوان خەڵەکەدا ڕوویدا، ڕۆژی چوارەم نەوت تەواو بوو، ئێمەش ناچار زۆپای نەوتییەکەمان لابرد و زۆپای دارمان دانایەوە، بە هۆی پشتبەستن بە نەوت دارمان زۆر نەهێنا بوو، ئێستا ئەو دارەکەمەی کە هەمان بوو ئەویش تەواوبووە.

خەڵکی تەواوی دارەکانی سەرشەقام و کۆڵانەکانیان بڕییەوە بۆ سووتاندن، ئێستا ئەودارانەش تەواو بوون، بۆیە ئێمە لە ناچاریدا تەپاڵە دەسووتێنن. ئەو ماڵانەی کە ئاژەڵیان نییە خەریکن لەسەرماندا ڕەقهەڵدێن، ئێستا جگە لە نەوت و دار،، تەپاڵەش دەستناکەوێت. هەندێک ماڵ هەر شتێکی لە تەختەودار دروستکراویان هەبووبێت سووتاندویانە. خەڵک داوایان لە بەڕێوەبەری ناحیە کردووە بۆ سووتەمەنی، ئەویش لە وەڵامدا گوتوویەتی ئەگەر ئێوە دار و تەپاڵە و خەڵوزتان هەیە بیهێنن بۆ ماڵی ئێمە. ئێستا لێرە هەموو خەڵکی بۆ سووتەمەنی لە ناڕەحەتیدان.

قسە لەسەر کەمی سوتەمەنی و دار و تەپاڵە دەکرا، دەنگە دەنگێک لە نێوماڵەکەدا پەیدا بوو. عەلی خان دەیگوت ئەحمەد خان، ئەحمەد خان، وامەکە ئەوکارە مەکە، بەڵام کار لە کار ترازابوو، ئەحمەد خان بە چەقۆ تیژەکەی گەرووی مەڕەکەی بڕی بوو، گەرووی ئەو مەڕەی بڕیبوو کە ئێمە دەبوو شەو گۆشتەکەی بخۆین، خوێنی سوور بە سەر بەفرەکەدا ڕژابوو. جیاوازی ئێمە لەگەڵ گورگەکاندا چیە؟ هەردو لامان گۆشتی مەڕەکان دەخۆین، بەڵام ڕەنگە ئێمە ئازاتر بین لە گۆشت خواردن، چونکە بە زوویی

دەیخۆین. ئەو ئاژەڵە لە نێو بەفرەکەدا دەست و قاچی بە خێرایی دەجوڵاند، کاتێک ئارام بووەوە لاشەکەیان برد بۆ ژووری چێشتخانە تاکو لەوێ کەوڵی بکەن. دەبوو ئەو مەڕە سەرببڕدرێت، تاکو میوانەکان هەستبکەن کە خۆشەویستن.

ئەحمەد خانی خاوەن ماڵ لە عەلی خانی پرسی لە ژیانتدا، هەرگیز سەرمای ئاوا سەختت دیوە؟ عەلی خان گوتی هەرگیز نەمدیوە. باسی ڕێگیران و گەردەنەی بەدرانلو کرا، خاوەن ماڵ گوتی کارێکی زۆر باشتانکرد کە ئەمشەو نەڕۆیشتن بۆ بۆجنوورد، دەنا لە ڕێگادا بەهیلاک دەچوون. باس و گفتوگۆ لەسەر، سەرما و مردنی خەڵکی و مرداربوونەوەی ئەو هەموو مەڕ و ئاژەڵە بوو. ئەحمەد خان گوتی چوار باخ کە لە دەوروبەری ئاشخانە هەبوون، خەڵکەکە ڕۆیشتن درەختەکانیان بڕین و دارەکانیان سووتاند، ئیتر باخ لە دەوروبەری ئاشخانەدا نەماوە، هەرچەندە پێشتریش باخ کەم بوو.. لەو ناوچەیە زۆرتر کاری کشتوکاڵی دەکرا. پەری خانم لەگەڵ مندا کەوتەوە قسەکردن، باسی نووسەران سادقی هیدایەت، جەلالی ئێل ئەحمەدی، سەمەدی بەهرەنگی و چیرۆکی ماسیە ڕەشە بچکۆلانەکەی دەکرد. لەبارەی دکتۆر عەلی شەریعەتی و نووسینەکانی ئەوەوە پرسیاری دەکرد، دەیگوت حەزمدەکرد بچمە زانکۆی ئەدەبیاتی مەشهەد و دکتۆر عەلی شەریعەتی ببینم، گوتی ئەگەر لە جێگایەک نیشتەجێ ببم زیاتر کتێبی مێژوویی دەخوێنمەوە تاکو کتێبی ئەندازیاری. منیش گوتم زۆر حەزم بە خوێندنی ماتماتیک و ئەندازە دەکرد، چیرۆکی وازهێنانم لە قوتابخانەی ئێرانشەهر و وازهێنانم لە بەشی زانستی بۆ گێڕایەوە. حەزمدەکرد بزانم پەری خانم چۆن پەیوەندی کردووە بە ڕێکخراوێکی کۆمۆنیستیەوە، بەڵام ژوورەکە زۆر قەرەباڵغ بوو، شوێنی ئەو جۆرە پرسیارانە نەبوو. خاوەن ماڵەکەش کورد بوو، ژن و منداڵەکانی خەریکی کارکردن بوون. جەوهەر خانم و خانم جان و ژنەکانی تریش ڕۆیشتن بۆ ژووری چێشتخانە تاکو هاوکاری ژنانی خانەخوێ بکەن بۆ چێشتلێنان. پیاوەکان و هەرسێ کچەکانی عەلی خان و بیبی و چەند منداڵێک لە ژوورەکەدا مانەوە، منداڵەکانیش پارووە نانێکیان خوارد و لێی نووستن.

سەرما و ماندووبوون هەمووانی بێ تاقەت کردبوو، دوای نانی ئێوارە ژنەکان لە ژوورێکدا و پیاوەکانیش لە ژوورێکی تر نووستین. خاوەن ماڵ، ڕێزێکی زۆری لە من گرت، ئەم ماڵە کوردەش وەک تێکڕای کوردەکانی تر زۆر بەڕێز و میواندۆست بوون. عەلی خان گوتی ئەحمەد خان زۆرمان ماندوو کردن، ئەرکتان زۆر کێشا و ئەو مەڕەشتان بۆ ئێمە سەربڕی. ئەحمەد خانیش گوتی ئێوە ماڵی خۆتانە، ئێمە نمەکی

ئێوەمان لەبەرچاوە، زۆرمان گۆشت و ڕۆنی ئێوە خواردووە، ئەگەر تاکو یەک ساڵی تریش لێرە بمێننەوە، ئێرە ماڵی خۆتانە و ئێمەش لەخزمەتتانداین.

بەیانی لە خەو هەڵساین و هەمووومان خۆمان ئامادەکرد بۆ ڕۆیشتن، بەڵام پاسەکە دیار نەبوو. دەوروبەری کاتژمێر (٨:٥) شۆفێرەکە هات و گوتی گازۆیل دەستناکەوێت، هەموو شار گەڕاوم یەک دڵۆپ گازۆیل نییە. تەنها چەند تراکتۆرێک لەناو ئاشخانەدا هەبوون شۆفێرەکانیان پێشتر هەموو گازۆیلەکانیان کڕی بوو، تەنانەت ئەو ئۆتۆمبێلانەی کە لەوێوە هاتوچۆیان دەکرد لەکار وەستا بوون. شۆفێری پاسەکە گوتی لێپرسراوان گوتوویانە تا دوو ڕۆژی تر گازۆیلیان بۆ نایەت. ئەحمەد خان هەواڵی نارد بوو بۆ دۆستان و هاوڕێیانی حاجی عەلی خان تا بێن بۆ ماڵی ئەوان و چاویان بە خان بکەوێت (١٠-١٢) کەس هاتن بۆ سەردانی عەلی خان هەموویان پێداگریان کرد کە عەلی خان ئەو ڕۆژەش لە ئاشخانە بمێنێتەوە، بەڵام عەلی خان گوتی گازۆیل پەیدا دەکەین و دەڕۆین بەرەو بۆجنوورد. هەمووان گوتیان یەک دڵۆپ گازۆیل لێرە پەیدا نابێت. یەکێک لە دۆستەکانی حاجی عەلی خان کە ناوی مەحمود خان بوو لە هەمووان بە تەمەنتر بوو، تەمەنی هەشتاوپێنج ساڵ زیاتر دەبوو، ئەو چەندین ساڵ بوو لە ئاشخانە نیشتەجێ بوو، بۆ نانخواردنی نیوەڕۆ بانگهێشتی ماڵی خۆیانی کردین. عەلی خان هەلێکی بۆ هەڵکەوت تاکو سەردانێکی بازارەکەی ئاشخانە بکات و چاوێک بە کارە بازرگانییەکانی خۆیدا بگێڕێت. دیاربوو کە ئەو زیاتر لە سێ تۆن جۆ و کایەکی زۆری بە قەرزی سێ مانگ کڕیبوو. پەری خانم گوتی باوکە تووشی زەرەر نەبین. عەلی خان گوتی بەم سەرما و سەهۆڵبەندانە یان دەبێت ئەو ئاژەڵانەی کە ماومانن بمرن، یا دەبێت ئالفیان بۆ بکڕین، ئەو سەردەمە ڕۆی کە ئاژەڵەکانمان لە نێو لەوەڕگەکاندا بوون. پەری خانم کە خەمی سەرمایەکەی خۆی بوو. گوتی بەڵام ئاژەڵدارەکان پارەیان نەماوە و هەژار بوون. عەلی خان گوتی هەر کەسێک بیەوێت ئالف بکڕێت ئەگەر پارەکەشی نەبێت مەڕی هەیە، ئەگەر پارە نەدات دەبێت مەڕ یا حوشتر یا ئەسپ بدات. عەلی خان گوتی من ئێوە دەبەم بۆ بۆجنوورد، پاشان خۆم دەگەڕێمەوە بۆ ئاشخانە و گوندی ڕاجی، بۆ سەرپەرشتی کردنی کارەکانم.

ئەم پیاوە نە لە بەفر دەترسا و نەلە سەرما. هەمیشە کاری دەکرد و بازرگانی دەکرد بە قەرز شتی دەکڕی و ئومێدێکی زۆری بە ژیان هەبوو. کەسێک کە زیاتر لە هەمووان هانی خانی دەدا جەوهەر خانم بوو، ئەم ژنە لە عەلی خان ئازاتر بوو، ئەگەر عەلی خان لە کارەکانیدا سستی بنواندایە یا درەنگ بڕۆیشتایە بۆ کارێک جەوهەر خانم

لێی تووڕە دەبوو، پێی دەگوت خۆ دونیا ئاخیر نەبووە تۆ خانیت، تۆ کەسێکی خاوەن بروایت، ملک و سامانت هەیە. دەبێت تۆ ماڵێکی بیست کەسی یا سی کەسی بەخێو بکەیت، ئەو خەڵکە هەموویان چاویان لە دەستی تۆیە دە فەرموو هەڵسە و برۆ کارێک بکە. ئەو ژنە ژنێکی ڕاستگۆ و ژنێکی پێشڕەو بوو، ژنێکی ئازا و بەباوەڕ بوو، ژنێکی کارکردە و پەروەردەکار بوو، لەو ژنانە بوو کە پیاوە ڕووت و ڕەجاڵەکانی خۆیان دەکرد بە پاشا. ئەو ژنە لە کاروباری ناوماڵدا فەرمانبەری پیاوەکەی بوو، بەڵام بۆ کاروباری دەرەوە فەرماندەی پیاوەکەی بوو. بەکردەوە ڕەوتی ژیانیان بەدەستی ئەو دەگەڕا.

بەهۆی مانەوەمان لە ئاشخانە هەلێک پەیدا بوو کە لەگەڵ پەری خانم، نیلۆفەر، گوڵخەندان، مەنوچەهر، سەرێک لە بازاڕی ئاشخانە بدەین. پلەی گەرمی نزیکەی حەوت پلەی ژێر سفر بوو. نیلۆفەر و گوڵخەندان و مەنوچەهر ئێمەیان جێهێشت و لە پێش ئێمەوە ڕۆیشتن ئەوان بە ئانقەست ویستیان من و پەری خانم جێبهێڵن. پەری خانم پاڵتۆیەکی درێژ و جوتێک جزمەی لەپێدا بوو، سەرپۆشێکی کوردی دا بوو بە سەریدا. دووبارە لەبارەی کتێب و مامۆستا و زانکۆوە کەوتینە قسەکردن، پاشان لە بارەی مارکس و لینین کەوتە قسەکردن، گوتم تۆ دەزانیت من بە هیچ جۆرێک باوەڕم بەم قسانە نییە، باوەڕم بە هیچ ئایدۆلۆژیایەک نییە. ئەویش قسەکەی گۆڕی. لەو سەرمای زەمهەریرە و پیادەڕۆیی نێو بەفر و سەهۆڵبەندانەدا تەنها هێزی گەنجی بوو دەیتوانی ئاگاداریمان بکات. گوتی کەی لەگەڵ دایکتدا قسە دەکەیت؟ گوتم دەبێت برۆم بۆ مەشهەد.

سەیرمانکرد لە کۆلانێکدا (١٠-١٢) کەس دەنگە دەنگیانە. گوتم ئەوە چی ڕوویداوە؟ یەکێک گوتی لێرە ئاژەڵ بەخێو دەکرێت، خەڵکیش هاتوون تەپاڵە بکڕن لەسەر کڕینی تەپاڵە بووە بە شەڕ، یەک گونیە تەپاڵە بە پەنجا تومەن دەفرۆشن، خەڵکیش پارەی نییە خاوەن تەپاڵەکەش دەڵێت بە قەرز نایفرۆشم. پەنجا تومەن لەو ساڵەدا حەوت کیلۆ گۆشتی پێدەکڕدرا. پیاوێک یەک گونیە تەپاڵەی دابوو بە کۆڵیدا، چەند کەسێک دەورەیان دابوو، گونیە تەپاڵەکەیان لەسەر شانی فڕێدابووە خوارەوە و کابراشیان بە پێلەقە خستبووە ناو بەفرەکەوە، هەر کەسە و پەلاماری گونیە تەپاڵەکەی دەدا، هەر یەکە و چەند تەپاڵەیەکی بردبوو بۆ خۆی. گونیەکەش بە بەتاڵی بۆ کابرا مابووەوە، ئەویش هاواری دەکرد و دەیگوت لانیکەم پارەکەیم بدەنەوە. ئێمەش هاوکاریمان کرد و لە سەر زەوییەکە هەڵمانساندەوە. ئەو داماوە تەنها یەک تەپاڵەشیان لە گونیەکەدا بۆ نەهێشتبووەوە. پەری خانم گوتی لەسەر دەریای نەوت دانیشتووین و خەڵکیش

لەم سەرمایەدا تووشی ئەم گرفتارییە بوون. دووبارە دەیویست باسی شۆڕش و کۆمۆنیستی بێنێتە پێشەوە. گوتم بەندەی خودا تۆ قسەی بێسەروبەر دەکەیت. لانیکەم کە لە هەوارەکە بوویت شۆڕشی دروستکردنی توالێتت دەستپێبکردایە، تاکو ئەو خەڵکە دەوروبەری ڕەشماڵەکانیان پیس نەکردایە. گوتی ئەوە تۆ چی دەڵێیت؟ گوتم هەر ئەوەی کە باسمکرد. فەریبا گوتی ئێستا کە هیچ نەبووە لەسەر سۆڤیەت و توالێت هەراتانە.

خەریکبوو دەڕۆیشتین بەرەو ماڵی مەحمود خان، لە پەری خانم پرسی ئێستاش چەکت پێیە؟ گوتی بەڵێ یەک حەوت تیرم پێیە. گوتم دەترسم دەردەسەریت بۆ دروستبکات. گوتی سوێند بە گیانی هەموو خوشک و براکانم، سوێند بە گیانی تۆ ئەگەر بیانەوێت دووبارە من ببەنەوە بۆ زیندانی ساواک یەک فیشەک بەخەسار نادەم و چەند کەسێکیان لێدەکوژم، خۆ باش دەزانم لە تێکهەڵچوونەکەدا خۆشم دەکوژرێم. گوتم دوورنییە کێشە بۆ هەموو هۆزەکەت دروستبکەیت. گوتی منیش تەنها لەوە دەترسم، ئەگەر خۆم بە تەنهابم لە هیچ ڕووبەڕووبوونەوەیەک ناترسم، بەڵام ئەگەر لەگەڵ کەسوکارەکەم و خەڵکی تردا بم خەمی گیانی ئەوانمە. بە ڕاستی من لەم کچە ترسام، ئیتر دڵم بۆی لێ نەدەدا.

عومران گوتبووی ئەم کچە وەک ئەسپەکانی سەرکێشە، ئەو هەرگیز وازناهێنێت هەموو تایەفەکەشی بە کوشت دەدات. ئیتر دڵم بۆی لێنە دەدا، نازانم ڕاستییەکەی هی ئەوە بوو کە ئەو چەکی پێبوو دەترسام لەوەی کارێک بکات و ببێتە هۆی بە کوشتدانی خۆیشی و ئێمەش، یان هەستم دەکرد ئەم کچە یا ئەم ژنە شتێک بۆ من بەرهەم ناهێنێت. بە تەواوی دڵم لێی سارد ببووەوە، حەزم دەکرد ئۆتۆمبێلێک پەیدابێت و بڕۆم بەرەو بۆجنورد. گەیشتینە بەردەم ماڵی محمود خان و بەتوندی بە سەر سەهۆڵبەندانەکەدا کەوتم، ئێستاش پاش چلوسێ ساڵ هەست بە ئازاری پشتم دەکەم. پەری خانم بە خێرایی بنباڵی گرتم تا هەڵمسێنێت، ئازار گەیشتە پشت و دڵ و گەدەم، بەڵام دووبارە بە گەرمی دەستی پەری خانم دڵم کەوتەوە لێدان. دڵم بۆ ئەو لێیدەدا. زۆرێک لە ئێمەی پیاوان بە تایبەتی لە سەردەمی گەنجیدا بەیەک پێکەنین یا بە قسەیەکی خۆشی ژنان ملکەچ دەبین، تەنانەت هەندێک لە ئێمە ئامادەین لە پێناوی ژندا بە چوار چنگۆڵە بڕۆین. گوێم لە دەنگی پەری خانم بوو کە دەیگوت هیچ شوێنێکت شکاوە گوتم نازانم، بەڵام هەموو گیانم ئازاری هەیە. نازانم بۆچی هەر جارێک کە دوچاری کەوتن و لێدان و ئازار دەبمەوە دڵم بۆ ئەو کچە لێدەدا. حەزمدەکرد لە نێو ئەو بەفرە ساردەدا بکەوم و دەردەدڵ بکەم. پیاوێک لە ماڵەکە هاتە دەرەوە، بنباڵی گرتم و لەسەر بەفرەکە بەرزی

کردمەوە. گوتی هیچ شوێنێکت شکاوە؟ گوتم دڵم! ئەو پیاوە کەمێک ڕاما و گوتی چیت گوت.. دڵت؟ کوێت ئازاری هەیە؟ ئەو پیاوە یارمەتیدام تا من چوومە ژوورەوە. گوتی ئەم برادەرە بە زەویدا کەوتوە و دەڵێ دڵم شکاوە. خانم جان لە حەوشەکە بوو، لێوی خۆی بە ددان گەست.

مەحمود خان میوانێکی زۆری هەبوو، نزیکەی بیست‌وپێنج کەسی بانگهێشت کردبوو، لەسەر سفرەی نانخواردن باس باسی بەفربارین و سەهۆڵبەندان و مەڕ قڕان بوو. دیار بوو کە ژمارەیەکی زۆری مەڕ لە ژوورەکانیشدا لە سەرماندا مرداربوونەتەوە، مریشک و کەڵەشێریش زۆربەیان مرداربوونەوە، سەگ و پشیلە لەبرسان و لە سەرمادا تۆپیبوون. لە ماڵی مەحمود خاندا بە بەردەوامی داریان دەهێنا و دەیانخستە نێو سۆپاکەوە. یەکێک گوتی مەحمود خان تۆ ئەم هەموو دارەت لەکوێ هێناوە. مەحمود خان گوتی من باوەڕم بە نەوتی ئەم وڵاتە نییە. ئێمە ئێستا سۆپای نەوتیمان نییە، سەرەتای ساڵ یەک گەلابە دار و کۆتەرەم کڕی، بەڵام خەریکە دارەکانمان تەواو دەبێت. ئومێدەوارم هاتنی ئێوە ببێتە خێر و بەرەکەت و ئەم سەرمایە نەمێنێت. باسی بێخۆراکی و هەژاری و کەمی سوتەمەنی کرا. مەحمودخان گوتی ئەگەر چوار کەسی خێرەومەند لەم شارەدا نەبوونایە زۆر کەس لە برسا دەمردن.

دوای نانخواردن عەلی خان ڕۆیشتەوە بۆ بازاڕ. من و پەری خانم و منداڵەکانیش ڕۆیشتینە دەرەوە. عەسر لەکاتی گەڕانەوەماندا بۆ ماڵی ئەحمەدخان من و پەری پێکەوە کەوتینە قسەکردن، پەری خانم دەیویست گفتوگۆکەمان بەرەو مارکس و ئەنگڵس بەرین. منیش دەمویست بەرەو پاقلاوە و زلوبیا و برمەی یەزدی بەرم، پێشنیارم بۆ کرد کە بێت بۆ یەزد. گوتی دێم، پێکەنی و گوتی بەڵکو ببم بە بووکی یەزدییەکان، گوتی ئێستا ناتوانم کەسێک لەوان ڕامبکەم. گوتم تۆ ئەوەندەت بەسە کە ئەسپەکانت ڕامکردووە. گوتی من ئیتر ئەسپم نەماوە، لەو کاتەدا کەسێک پێشی پێگرتین و گوتی خودا شاهیدە من سواڵکەرنیم، بەڵام سەرما لەبنی هێناوین، تکایە هاوکاریەکم بکەن. پەری خانم دە تومەنی پێدا. کەسەکە ڕۆیشت و گوتم تۆ پارە دەبەخشیتەوە؟ گوتی من ئەو کەسە باش دەناسم. ئەوە ئاژەڵدارێکی مامناوەند بوو، بەڵام ئێستا هیچی نەماوە. سەردانی چەند دوکانێکمان کرد، هەموو خەڵکەکە بێزار بوون لە دەست سەرما و سەهۆڵبەندان، ئەو خەڵکە لە دەست هەژاری و بێ خۆراکی و بێ نەوتی دەیانناڵاند. خەڵکەکە بەگشتی هەژار و بێکار بوون، دوکاندارێک دەیگوت قەرزی زۆرم داوە بە خەڵکی هەژار و نەدار، خەریکە خۆشم دەکەومە سواڵکردن، هەموو دەستمایەکەم داوە

بە قەرز. خۆیشم پارەم قەرزکردووە و ئێستا قەرزدارم، بەڵام خەڵکەکە برسین و چی بکەم؟ هەموو دوکاندارەکان قەرزێکی زۆریان دابوو بە خەڵک. سەرما و بەفر خەریکە خەڵکی دەکوژێت، هیچ کەسێک نییە هاوکاری ئەو خەڵکە لێقەوماوە بکات، بۆچی حوکمەت هاوکاری خەڵک ناکات؟ لانیکەم نەوت بنێرێت تاکو گەرم ببنەوە، هیچ نەبێت دارێک، خەڵوزێک بنێرێت. جادە گیراوە ئۆتۆمبێلی سوپا لە بنکەکاندا وەستاون، هیچ کارێک ناکەن. منیش بە خەڵکەکەم گوت ئەگەر ئۆتۆمبێلەکانی سوپا نەهاتنایە بە هانای ئێمەوە، ئەوا ئێمە هەموومان دەمردین. پەری خانم گوتی بۆچی تۆ وا دەزانیت ئەگەر ئێمە چەند کیلۆ مەترێک لەڕادار و بنکەی ئەمریکییەکان و لە پازدە کیلۆمەتری ئەو گوندەی کە فەرەنسیەکان ئیدارەی دەدەن نەبووینایە دەهاتن بۆ ڕزگارکردنمان؟ ئەوان لەوە دەترسان ئێمە لەو شوێنە بمرین و هەواڵەکەش بە هەموو جیهاندا بڵاوببێتەوە. ئەی بۆچی ناچن بە هانای خەڵکانی ترەوە خەڵکی ئەم شارۆچکەیە تەنها دوو هەزار کەس دەبن خەریکە لە سەرما و لەبرسا دەمرن ئەی بۆچی کەس ئاوڕێکیان لێناداتەوە؟

لە گەڕانەوەماندا بۆ ماڵەوە. گوتم پەری خانم ئەمڕۆ مەحمود خان میوانداریییەکی گەورەی بۆ ڕێکخستبووین. گوتی باوکم زۆر خزمەتی بە ئەوان کردووە، کوڕەزاکەشی داوای نیلۆفەری خوشکمی کردووە. گوتم کەواتە بۆ زەماوەندەکەی بانگێشتم دەکەن. گوتی نیلۆفەر دەڵێت تاقەتی ژیانی کۆچەریی و عەشایەریی و گوندنشینیم نییە. ئەو دەیەوێت شوو بە خوێندەوارێک بکات و لە شاردا دابنیشێت. هەر بۆیە گوتویەتی شووی پێناکات. باوکم پیاوێکی ڕۆشنبیرە، ئەگەر وەک خەڵکانی تر بیری بکردایەتەوە ئەوا بە زۆر نیلۆفەری دەدا بە شوو، بەتایبەت لە ئێستادا کە باری دەروونی باش نییە و مەڕ و ئاژەڵەکانی لەدەستداوە. گوتم بەڵام مەحمود خان خەرجییەکی باشی کرد و ئەرکێکی زۆری کێشا. گوتی هیچ کەسێک بەبێ هۆ ئەو خەرجیە ناکات. گوتم ئەوە بیرکردنەوەی خۆتە. گوتی من خولم بینیوە و ڕاستییەکان دەڵێم. ئینجا گوتی وەک ئەوەی تۆ یاری بە ئەقڵی من دەکەیت. گوتم چ یارییەک؟ گوتی تۆ بیر لە ماڵی دونیا و پارە ناکەیتەوە، بەڵکو تۆ چاوەڕوانی شتی تر لە من دەکەیت؟ گوتم ئەی تۆ چاوەڕوانی چی لەمن دەکەیت؟ گوتی من ئەوەی ویستوومە ڕاستوڕەوان پێمگوتویت. ئەو شەوەش کە لەو ماڵە میوان بووین، باسی هەژاری و ماڵوێرانی خەڵکی دەکرا، هەر لەوێ عەلی خان خەریکی مامەڵە و کڕین و فرۆشتن بوو. یەکێک هات و جۆی دەویست و پارەی کاشی دەدا. عەلی خان بیست تۆن جۆی گوندەکەی پێفرۆشت، بە نرخی هەر کیلۆی دە ڕیاڵ، ئەو جۆیەی کە چەند ڕۆژ لەوە پێش کیلۆی هەشت ڕیاڵی پێدا بوو، عەلی خان

بیست هەزار تومەنی تەواوی وەرگرت، کاتێک پیاوەکە ڕۆیی پەری خانم بە باوکی گوت بەشەکەی خۆمم بدەرێ. باوک و کچ چوار هەزار تومەن قازانجیان کرد بوو. پەری خانم دوو هەزار تومەنی لە باوکی وەرگرت و دەفتەرەکەی هێنا نرخی کڕین و فرۆشتن و سوودەکەی نووسی. لەو ساڵەدا مووچەی مامۆستایەکی زانکۆ مانگی سێ هەزار تومەن بوو. عەلی خان دەیویست لە نێو ئەو بەفر و سەرمایەدا کاربکات. منیش دەمویست مانای کۆمۆنیستبوونی پەری خانم تێبگەم. ئەوان مەڕەکانیان تیاچووبوو، خەریکی بازرگانی کردن بوون. جەوهەر خانم ئەم هۆنراوەیەی خوێند.

**خودا دەرگایەک داخات بە حیکمەت**

**دەیکاتەوە لێت، دەروازەی ڕەحمەت**

## ڕۆیشتن لە ئاشخانە

سەرلەبەیانی ڕۆژی دواتر، هەواڵیان هێنا کە گازۆیل گەیشتووە، سواری پاسەکە بووین و کەوتینەڕێ. باسی تێپەڕبوون لە گەردەنەی بەدرانلو و توندی سەرما، سەهۆڵبەندان، پچڕانی زنجیری تایە، خزینی پاسەکە، پاڵنانی پاس و لەرز و سەرما نانووسم. لانیکەم ئێمە دە جار دابەزین و سوار بووینەوە. چەندین ئۆتۆمبێل لە لێواری جادەکە بێ خاوەن جێما بوون.. چەند پاسێکیش لەوێ جێما بوون وسەرنشینەکانیان ڕۆیشتبوون. کاتی نیوەڕۆ شەکەت و ماندوو گەیشتینە دەروازەی بۆجنوورد. لە بنکەی پۆلیسی هاتووچۆ تێپەڕین، لە بەردەمی بەنزیخانەی شار پۆلیسێک دەستی لێڕاگرتین و پاسەکەی وەستاند، دوو پۆلیسی چەکداری تر لەگەڵ دوو کەسی تردا کە جلی پۆلیسیان لەبەردا نەبوون لە بەنزیخانەکەوە هاتنە دەرەوە و هاتن بەرەو لای ئێمە. عەلی خان گوتی پەری ئاگاداربە سەرە ڕۆیی نەکەیت و هەموومان بە کوشت بدەیت. کەسێکی مەدەنی و پۆلیسێک لەگەڵماندا سواری پاسەکە بوون، پۆلیسێک و کەسەکەی تریش بەسواری ئۆتۆمبێلی خۆیان دوامان کەوتن. پۆلیسەکە بە شۆفێرەکەی گوت یەکڕاست بڕۆ بۆ ناوەندی شار. ئێمەیان بردە ناو خانوویەکی گەورەوە، خانووەکە حەوشەیەکی گەورەی هەبوو، پۆلیس و کەسەکەی تر دابەزین و ئێمە لە پاسەکەدا ماینەوە. پاش چارەکە کاتژمێرێک پۆلیسێک هات و دەرگای پاسەکەی کردەوە. بە عەلی خانی گوت بە هەمووان بڵێ کەلوپەلەکانیان دابگرن و بێنە خوارەوە. عەلی خان گوتی هەمووتان کەلوپەلەکانتان دابگرن و دابەزن. عەلی خان ئاوڕێکی دایەوە و بە چاوێکی

گوماناوییەوە سەیرێکی پەری خانمی کرد. پەری خانم لە ڕیزی سێهەمی دەستە چەپدا دانیشتبوو، منیش لە ڕیزی سێهەم لەلای دەستە ڕاستەوە بووم. کۆڵەپشتەکەم هەڵگرت تا لە پاسەکە دابەزم. پەری خانم قایشی دەمانچەکەی کردەوە و دەستی بۆلای من درێژکرد و گوتی ئەو کارەم بۆ بکە، منیش بێئاگا دەمانچەکەم لێوەرگرت. دەمانچە بە کیف و قایشەوە کەوتە دەست من، ئیتر واهەستم کرد کە من کەوتومەتە نێو زیندانەوە و لانیکەم دەبێت دە ساڵ لە زیندان بم. گوتم ئەمە چ ژنێکە؟ ئەمە چ کارێک بوو کردی؟ بۆچی ئەم دەمانچەیەی دا بە من و تووشی دەردیسەریم دەکات؟ شوێنی بیرکردنەوە نەبوو، شوێنی نارەزایی دەربڕینیش نەبوو، ئەم کچە کۆمۆنیستە سەرکێشە من بۆ بەرژەوەندییەکانی خۆی بەکاردەهێنێت. هەر لەوێ هەستم بە سادەیی خۆم کرد. کەسێک ئەم هەموو لێدان و تێهەڵدانەی خواردووە، کەچی هێشتا ئەم کچەی خۆشدەوێت، دیسانەوە دڵم بۆی لێدەدات. ناچار بووم، دەبوو کارێکم بکردایە، ویستم دەمانچەکە لەنێو پاسەکەدا بشارمەوە، بەڵام ئەوان هەموو خزم و کەسی یەکتری بوون تەنها من لە ناویاندا بێگانە بووم. بەخێرایی کیسە خەوەکەم کردەوە و دەمانچەکەم خستە نێویەوە. بە خێرایی کیسە خەوەکەم ڕاستوچەپ کردە شانم. هەموو لەپێش منەوە لە پاسەکە دابەزین، کۆڵەپشتەکەم بەدەستێکەوە و جانتاکەشم بەدەستەکەی ترمەوە بوو، کیسە خەوەکەشم بە کۆڵمەوە، لە پاسەکە دابەزیم. کاتێک هەموومان دابەزین، ئەفسەرێک بە پۆلیسێکی گوت بە جوانی ناو پاسەکە بگەڕێ، پۆلیسەکە بە تەواوی ناوپاسەکە گەڕا و گوتی هیچ شتێکی تێدا نییە. یەکێکیان گوتی کەلوپەلەکانتان هەڵبگرن و بە بێدەنگ بڕۆنە ژوورەوە، پۆلیسێکی تریش لەگەڵ شۆفێرەکەدا خەریکی داگرتنی کەلوپەلەکان بوو.. لە ژوورەوە یەکبەیەک دەیان پشکنین، خورجێن و جانتاکانمان تەنانەت گیرفانەکانیشمان دەگەڕان. نۆرە هاتە سەر من بە جلوبەرگ و کۆڵەپشتەکەمدا زانییان من لە بنەماڵەی ئەوان نیم. ئەفسەرێک گوتی تۆ لەگەڵ بنەماڵەی عەلی خاندا چی دەکەیت؟ گوتم من خوێندکارم، ڕۆیشتبووم بۆ لێکۆڵینەوە. گوتی تۆش کۆڵەپشتەکەت بکەرەوە. کەلوپەلی نێو کۆڵەپشتەکەمی دەرکرد و لەسەر مێزەکە دایبنان. سەیری گەرمپێو قیبلەنما و نەخشەکەی کرد و بە پاسەوانەکەی گوت جانتاکەی هەڵگرە. پاسەوانەکە جانتاکەی وەرگرت و چاوی بە دەفتەرەکەم کەوت و گوتی ئەمە چیە؟ گوتم ئەوە پرسیار و وەڵامە. ئەویش کەمێک سەیری کرد و بینی دەفتەرەکە ئارمی زانکۆی مەشهەدی لەسەر بوو.

دڵم بە خێرایی لێیدەدا، ئەمجاریان دڵم بۆ پەری خانم لێینەدەدا، بەڵکو لە ترسی

دەمانچەکەی کەمەری پەری خانم بوو کە لە نێو کیسە خەوەکەمدا بوو. دەمزانی ئەگەر دەمانچەکەم پێبگرن لانیکەم دە ساڵ زیندانی دەکرێم. ڕەنگە لە سێدارەش بدرامایە. ئای ئەمە چ کچێکی سەیرە؟ من دەمویست چۆنێتی پەیوەندی کردنی بە کۆمۆنیستەکانەوە بزانم، بەڵام ئەو لەولاوە سوودی لە دڵسافی من وەرگرت. بیرم لە ساویلکەیی خۆم دەکردەوە، ئاخر بۆچی من دەمانچەکەم لێوەرگرت؟ لە دڵی خۆمدا بەردەوام جوێنم بە خۆم و هەموو عەشیرەتی عەلی خان و پەری خانمیش دەدا. دەمگوت نەفرەت لەدڵم بێت ئەگەر جارێکی تر بۆ هیچ کچێکی تر لێبدات. گوتم خودایە بە هانامەوە بێیت، خودایە خۆم بە تۆ دەسپێرم.

پۆلیسێک گوتی تۆ ناسنامەت پێیە. گوتم بەڵێ پێمە، ناسنامەی زانکۆ و نامەی خۆناسینم پێیە. گوتی لە بۆجنوورد کەسێک دەناسییت؟ گوتم بەڵێ حەسەنی زەردکانلو دەناسم. ئەفسەرەکە شێوەی دەموچاوی گۆڕا و گوتی ئەو دەبێتە کەفیلت. گوتم نازانم ئێستا لە بۆجنووردە یان نا. گوتی من ئەم بەیانییە ئەوم بینیوە. گوتم ژمارەی تەلەفۆنی ماڵەکەیانم لایە. گوتی من تەلەفۆنی فەرمانگەکەیانم لایە. ئەگەر ئەو تۆ بناسێت ئیتر تۆ دەتوانیت بڕۆیت. ئەگەر کەفالەتیشت نەکات ئەوا ناچار دەبیت لێرە بمێنیتەوە. ئەفسەرەکە تەلەفۆنی بۆ حەسەن زەردکانلو کرد، پاش چاکوچۆنی گوتی کوڕێک لای ئێمەیە و دەڵێت حەسەن زەرکانلو دەمناسێت. منیش گوێم گرتبوو، خۆم ناساند.

حەسەن زەرکانلو یەکێک بوو لە خوێندکارە باشەکانی بەشی مێژوو، لە زانکۆ یەکتریمان ناسی، ئەو کەسێکی زیرەک و چالاک بوو، ڕەنگە پازدە ساڵ لە من گەورەتر بووبێت. پاشان چەند ساڵێک بوو بە سەرۆکی شارەوانی بۆجنوورد، خزمەتێکی باشی بەشاری بۆجنوورد کرد، پاشان بوو بە سەرۆکی شارەوانی حەیدەریە، ئەو شارەش لەسەر دەستی ئەو ئاوەدانبووەوە. تاکو گوتم من پاپۆلیم گوتی چۆنیت باشیت؟ بەخێرهاتی بۆ بۆجنوورد، ئەی بۆچی نەهاتوویت بۆماڵی ئێمە؟ گوتم ڕۆیشتبووم بۆ قورەمەیدان لەنێو بەفر و سەهۆڵبەنداندا عاسی ببووم، ئێستا ئەم برادەرانە پاسەکەیان ڕاگرتووین. گوتی لەکوێی گوتم نازانم ئەم شوێنە کوێیە؟ تەلەفۆنەکەم دایەدەست ئەفسەرەکە. ئەویش بە حەسەنی زەرکانلوی گوت لە فەرمانگەکەی خۆمانین. ئینجا ئەفسەرەکە تەلەفۆنەکەی دایەوە بە من، حەسەن زەرکانلو گوتی ئێستا دێم بۆلات، پاش چەند خولەکێک گەیشتە لامان چاکوچۆنیمان کرد.

دیار بوو کە لە گوندەکەوە بەڕێکەوتبووین ژمارەی پاسەکەیان دابوو بە ئاشخانە و بۆجنوورد ئەوان بەدوای پەری خانمەوە بوون. من هێشتا هەر بە پێوە وەستا بووم

کیسە خەوەکەشم بە کۆڵمەوە بوو، هەموو شتێک و هەموو کەسێکیان پشکنی، کەچی هیچ کەسێک لە کیسە خەوەکەی پشتی منی نەپرسی. حەسەن زەرکانلو گوتی ئەم کوڕە گەنجە خوێندکارە و کاری لێکۆڵینەوە دەکات و من کەفالەتی دەکەم و خۆشی ناسنامە و نامەی خۆناسینی پێیە. ئیتر منیان دایەوە دەستی ئەو هەناسەیەکی قوڵم هەڵکێشا و ئێستاش هەرکاتێک دەچمە بۆجنوورد و دەچمە ئەو شوێنە سوپاسی خودای گەورە دەکەم کە ئەو جارە لەوێ ڕزگارم بوو. حەسەن زەرکانلو گوتی ئێستا دەتەوێت چی بکەیت؟ گوتم ئەگەر ئۆتۆمبێل هەبێت دەڕۆم بۆ مەشهەد. ئەویش زۆری پێداگری کرد شەو لای ئەو بمێنمەوە و نەڕۆم بۆ مەشهەد. منیش گوتم دوازدە ڕۆژە لە مەشهەدەوە هاتووم و کاتم کەمە دەبێت بە زوویی بگەڕێمەوە. حەسەن کەلوپەلەکانمی خستە دوای ئۆتۆمبێلەکەی خۆی و گوتی سواربە. دەتبەم بۆ دەروازەی مەشهەد ئەگەر ئۆتۆمبێل هەبوو ئەوا بڕۆ بۆ مەشهەد، ئەگەر نەبوو ئەوا دەگەڕێینەوە بۆماڵی خۆمان و بەیانی زوو ئۆتۆمبێلت دەستدەکەوێت.

لەگەڵ عەلی خان و ماڵ وبنەماڵەکەی خوداحافیزییم نەکرد و یەکراست ڕۆیشتم، واتە هەڵاتم. حەسەنی زەرکانلو منی بردە دەروازەی مەشهەد، لەوێ پاسێک خەریکبوو دەڕۆیشت، خوداحافیزییم لە حەسەن کرد و سواربووم و بەرەو مەشهەد کەوتمەڕێ.. ئێوارە بوو پاسەکە لەپێش (بابا ئامان) وەستا، هێشتا تونێلی بابائامان لێنەدرا بوو ئۆتۆمبێلەکان دەبوو لە ڕێگای هەوراز و پێچاوپێچی گەردەنەوە بڕۆیشتنایە. شۆفێرەکە بە هاوکارەکەی گوت زنجیری تایەکان تاقیبکەرەوە بزانە نەپساون، ڕووباری بابا ئامانیش ئاوێکی زۆری پێدا دەڕۆیشت، هەوا زۆر سارد بوو، بە شۆفێرەکەم گوت دەتوانیت کەمێک بووەستیت تاکو بچم بۆ توالێت؟ گوتی باشە بەڵام پەلەبکە. کیسە خەوەکەم هەڵگرت و ڕۆیشتمە پشتی پاسەکەوە. کیسە خەوەکەم کردەوە و دەمانچەکەم دەرهێنا و لە کیفەکەی دەرم کردو فڕێمدایە نێو ڕووبارەکەوە. بە بێئاگایی خۆم کیفە قایشەکەم ماچ کرد، وەک ئەوەی یادگارییەکی پەری خانم لەبەردەستا بێت و ماچم کرد. کیف و قایشەکەم خستە نێو کیسە خەوەکە و هاتمەوە نێو پاسەکە، لە نێو پاسەکەدا لەسەر یەکێک لە کورسییەکانی ناوەڕاست دانیشتم.

بوو بەشەو دونیا تاریک بوو، پاسەکە لەڕێگای سەهۆڵبەندان و پێچاوپێچدا سەردەکەوت. منیش قایش و کیفەکەم بە سەر سنگی خۆمەوە دەنا. وەک ئەوەی ئەو قایشە پەری خانم بێت و بە سنگی خۆمیەوە بنێم. هەستێکی دوو لایەنەم هەبوو، هەستی ڕق و هەستی خۆشەویستی. پەری خانم ئێستا (١٣٩١-٢٠١٢) تەمەنی حەفتا

ساڵ دەبێت ئومێدەوارم کاتێک پەری خانم لە تەمەنی حەفتا ساڵیدا ئەم بیرەوەریانە دەخوێنێتەوە درک بە هەستی من بکات لە تەمەنی بیست ساڵیدا.

کاتێک گەیشتمەوە مەشهەد بەرە بەیان بوو شار لە ژێر بەفر و سەهۆڵبەنداندا بوو، ئەو ڕۆژە ساردترین ڕۆژێک بوو کە کەشوهەوا تۆماری کرد بوو لە مێژووی ئەو شارەدا. پلەی گەرمی لە هەندێک شەودا دەگەیشتە سی‌ویەک پلەی ژێر سفر. پاسەکە لە چوارڕێیانی باری مەشهەد دایبەزاندم، ماڵەکەمان لە شەقامی (کەفاش) بوو، دایکم لە مەشهەد بوو، بە درۆ بە پەری خانمم گوتبوو دایکم لە شاری یەزدە، یەکەم ساڵ بوو کە دایکم هاتبوو بۆ مەشهەد. ماوەی نێوان مەیدانی بار تاکو شەقامی کەفاش پێنجسەد مەتر زیاتر نەبوو. تەنها سەد مەترێک ڕۆیشتم، خەریکبوو بمبەستێت. هیچ زیندەوەرێک بە سەر شەقامەکەوە نەبوو، پشتە سەرم خەریکبوو ببێت بە سەهۆڵ. هەستمکرد توانای ئەوەم نییە بگەمە ماڵەوە، لەو کاتەدا حەمامی سەدەفم بیر هاتەوە کە دەکەوێتە نێوانی مەیدانی بار و شەقامی کەفاش. خۆم گەیاندە بەردەرگای حەمامەکە، بەڵام دەرگاکە داخرا بوو، بە مشت و بە پێلەقە لە دەرگاکەم دا، کەسێک لەودیوەوە هاواری لێکردم. گوتی پاش نیو کاتژمێری تر حەمام دەکرێتەوە، خەریکبوو لەسەرما لە هۆش خۆم بچم. گوتم واخەریکە لەسەرما دەمرم، دەرگاکە بکەرەوە. شەقێکم لە دەرگاکە هەڵدا و پیاوێک دەرگاکەی کردەوەو منی ڕاکێشایە ژوورەوە و دەرگاکەی داخستەوە. ئەو پیاوە منی بردە ژوورێکی نمرەیی تایبەتی حەمامەکەوە. ئەو ئاوە گرمە تەواو خۆشحاڵی کردم. کاتێک لە ژێر دوشی ئاوەگەرمەکەدا بووم. بیرم لە قایش و کیفی دەمانچەکەی پەری خانم دەکردەوە. دیسانەوە دڵم تەپە تەپ لێی دەدایەوە، ئەم گەنجێتییە جۆرێکە لە شێتی، لەگەنجیدا هەمیشە هێز بە فیڕۆ دەچێت.

لە پێش هەموشتێکدا دەبێت من سوپاسگوزاری خودابم، زۆر سەیربوو پۆلیسەکان هەموو شوێنێکی پاسەکە و هەموو گیانی سەرنشینان و هەموو کەلوپەلەکانیان پشکنی، گیرفانی پانتۆڵەکان دەگەڕان. دەستیان لە هەموو شوێنێکمان دەکوتا، تەنها دەستیان بۆ کیسە خەوەکەی کۆڵم نەبرد، ئایا ئەمە ڕێکەوت بوو یا بێ ئەزموونی پۆلیسەکان. چوار مانگ لە پەری خانم بێ هەواڵ بووم، لە هیچ کەسێکیش هەواڵم نەپرسین. وردە وردە لێدانی دڵم بۆی کەم دەبووەوە، وام بیرکردەوە کە ئەو خۆی دێت بۆ لام، لە خۆیشم دەپرسی، ئەمە چ جۆرە کچێک بوو، دەیویست من بکوژێت؟ کچێک کە دەیویست لەگەڵ مندا زەماوەند بکات، بەدڵنیایەوە دوای زەماوەند، منی تووشی دەردیسەری و کێشەی سیاسی دەکرد. کچێک کە لە ناخۆشترین کاتدا دەمانچەکەی قەدی خۆی دا بە من،

کچێک کە منی تووشی سێدارە و زیندان دەکرد، چۆن دەتوانم ئەو کچەم خۆشبوویێت؟ بەڵام من هەر هەستم دەکرد کە خۆشمدەوێت. پاش چوار مانگ ڕۆیشتم بۆ بۆجنوورد، ناونیشانی ماڵی عەلی خانم وەرگرت. هاوسەری حاجی ڕەمەزان دەرگای ماڵی حاجی عەلی خانی لێکردمەوە و ڕێزێکی زۆری لێگرتم. عەلی خان و پەری خانم و سەرجەمیان ڕۆیشتبوون بۆ تاران، بە دەستی بەتاڵەوە گەڕامەوە بۆ مەشهەد. نەمدەزانی ئەگەر پەری خانم لە بۆجنوورد بووایە، دەبوو چی پێبڵێم. ئێستا بیری لێدەکەمەوە بۆچی ڕۆیشتم بۆ بۆجنوورد؟ ئەمجارە بۆ لێکۆڵینەوە نەبوو. حاجی ڕەزا ناونیشان و ژمارە تەلەفۆنی ماڵی عەلی خانی پێدام، بە تەلەفۆن لەگەڵ عەلی خاندا قسەم کرد خان بانگهێشتی کردم و گوتی هەر کاتێک هاتیت بۆ تاران دەبێت سەردانمان بکەیت.

## هاوڕێیانم لە تاران

ساڵی (١٣٥٠-١٩٧٢) دایکم نەخۆش بوو، بۆ چارەسەر بردم بۆ تاران، یەک مانگ لە ماڵی هاوڕێی خۆشەویستم حسێن گورجی بووم، دایکیشم لە نەخۆشخانە بوو. ناونیشان و ژمارەی تەلەفۆنی ماڵی عەلی خانم پێبوو، بەڵام تەلەفۆنم بۆ نەکردن.

ساڵی (١٣٥٣-١٩٧٤) بۆ تێپەڕاندنی دوو مانگ دەورەی وێنەگرتنی ئاسمانیی چووم بۆ ڕێکخراوی جوگرافیای سوپا، ڕێکخراوەکە لە شەقامی (موعەلیم) بوو. ماڵی عەلی خانیش هەر لەسەر هەمان شەقام بوو، لە نزیک حوسێنیەی ئیرشاد، پاش چل ڕۆژ مانەوەم لە تاران، ڕۆژێکیان ڕۆیشتم بۆماڵی عەلی خان. پێشوازییەکی گەرمیان لێکردم. جەوهەر خانم و خانم جان زۆر ڕێزیان لێگرتم. پەری خانم و نیلۆفەر شوویان کردبوو و لە ماڵی خۆیان بوون. عەلی خان گوڵخەندانی بۆ خوێندن نارد بوو بۆ لەندەن. عەلی خان گوتی هیوادارم لە لەندەن نەبێت بە کۆمۆنیست. مەنوچەهریش خۆی ئامادەکرد بوو بۆتاقیکردنەوەی ئامادەیی.

عەلی خان ببووە بازرگانێکی سادەی ڕۆن و پێستە و خوریی، دوکانەکەشی لەمەیدانی (بار) بوو. حاجی ڕۆستەمیش هاوکاری دەکرد، برزوو لە مەیدانی بار ئۆتۆمبێلی گواستنەوەی هەبوو. هەواڵی غەفارم پرسی گوتیان بووە بە (ناجوور). گوتم ناجوور مانای چییە؟ گوتیان قاچاخچییە و تلیاک دەفرۆشێت. بیبی لە بۆجنوورد دەژیا لەگەڵ ژنە گەورەکەی عەلی خاندا، تەمەنی ببووە هەشتا ساڵ. عەلی خان لە تاراندا خانوویەکی گەورەی هەبوو، زەوییەکەی (٨٥٠) مەتر دەبوو، خانوویەکی دوقاتی لەسەر دروستکرد بوو زیاتر لە دە ژووری تێدابوو. جەوهەر خانم گوتی هەواڵی مردنی گڵپۆت

زانیوە. کە وایگوت خەریکبوو دڵم بووەستێت، جەرگم بۆی سووتا، گوتم ئەو کچە داماوە بۆچی مردووە؟ گوتی بە سەر منداڵەوە مرد... بەڵام خەڵکی دەڵێن هاوسەرەکەی هەمیشە لێیداوە، لە کاتێکدا دووگیان بووە و سکی نۆ مانگ بووە، هاوسەرەکەی لێیداوە و تووشی خوێنبەربوون بووە، منداڵەکەی نەمردووە. بەڵام خۆی مردووە! گڵێۆ هیچ کەسێکی نەبوو هەتا شکات بکات و تۆڵە لە هاوسەرەکەی بکرێتەوە و زیندانی بکەن. جەوهەر خانم ئاهێکی هەڵکێشاو گوتی ئەگەر عەلی خان وەک جاران لە هەوارەکان دەما، ئەو کارە ڕووی نەدەدا. گوتم خۆ گڵێۆ لە گوند دادەنیشت و عەلی خان لە هەوار بوو. ئەو لەوێ کوا دەسەڵاتی هەبوو؟ گوتی کاتێک عەلی خان لە ناوچەکەدا بوو هەتاکو پەنجا گوند بە دەوری خۆیەوە دەسەڵاتی هەبوو بە سەریاندا. ئەگەر خان لەناوچەکەدا بووایە ئەو پیاوە نەیدەتوانی ئاوا لە گڵێۆ بکات. جەوهەر خانم گوتی ئەو سەرمایە تێکڕای خەڵکەکەی بێ سەرپەرشتکرد. منداڵەکەی گڵێۆ زیندوە و ئەویشیان ناوناوە گڵێۆ. جەوهەر خانم گوتی ژنەکەی حاجی ڕۆستەمیش مرد.

عەلی خان زیاتر لە سی ماڵی لە کوردە کۆچەرییەکان لەگەڵ خۆیدا هێنا بوو بۆ تاران، هەموویان لە دەوروبەری مەیدانی (بار) دەژیان، هەندێکیان عەرەبانەی دەستگێڕیان پێبوو میوەیان لەسەردە فرۆشت. هەندێکیشیان کاری باشتریان پەیدا کرد بوو. لە عەلی خانم پرسی هەواڵی بێژەن چییە؟ گوتی بێژەن بۆخۆی بووە بە خان و گەرمیان و کوێستان دەکات. بێژەن ساڵی (١٣٥٢-١٩٧٣) بۆ سەردانی خاڵی هاتبوو بۆ تاران.

بە تەلەفۆن قسەم لەگەڵ پەری خانمدا کرد، ئەو بۆ شەو منی بانگێشتی ماڵی خۆیان کرد، چەند کەسێکی تریشی بانگهێشت کردبوو، برزووش لەو میوانداریيەدا ئامادە بوو، برزوو هێشتا ژنی نەهێنا بوو، ئەویش کەمێک خوێندن و نووسین فێر ببوو، دایک و باوکیشی هێنابوون بۆ تاران. ئەو کاری بۆ خۆیشی و بۆ عەلی خانیش دەکرد، برزوو گوتی زیاتر لە سی عەرەبانەی دەستی هەیە، کرێکارەکانی لەسەر عەرەبانە میوە و سەوزەی دەفرۆشن. گوتم ئینجا پارەکەیت پێدەدەن؟ گوتی ئەی چۆن نایدەن ئەگەر نەیدەن چاویان دەردەکەم. برزوو خۆی کاروبارێکی میوە فرۆشتنی باشی پێکهێنابوو، هەر خۆی هەموو شتێک بوو لەمەیدانەکەدا، خۆیشی کڕین و فرۆشتنی دەکرد. گوتم برزوو تۆ لەم کارە هیچ سوود وەردەگریت؟ گوتی موهەندیس میوە فرۆشی لەم مەیدانەدا قازانجی لە بانک زیاترە. جوتیاری هەژار ماڵەکەی خۆی بۆ ماوەی سێ مانگ بە قەرز دەدات بە ئێمە، ئێمەش بەیانی پارە دەدەین و ئێوارە پارەکە وەردەگرینەوە.

گوتی ئێمە گێزەر لەجوتیارەکان دەکڕین کیلۆی بە دوو قڕان خۆمان دەیفرۆشینەوە بە هەشت قڕان. گوتم ئەو کەسانەی لەلای تۆ کاردەکەن هەموویان لە کوردەکانی خۆراسانن. گوتی بەڵێ هەموویان لە خۆمانن، هەموویان لەبرسا ڕادەکەن و دێن بۆ تاران. گوتی تۆ لانیکەم دەکەس لەوانە دەناسیت کە کار بۆ من دەکەن، ئەگەر دەتەوێت ئەوان ببینیت. دەبێت بەیانی زوو بێیت بۆ مەیدان. گوتم من دەمەوێت ماڵ و ژیانیان بینم. گوتی زۆر باشە، بڕیارمان دا پێکەوە سەردانی چەند ماڵێکیان بکەین. عەبدالیش لەو دەشت و کێوە مابووەوە و هەر کۆچەریی بوو.

پەری خانم دوو منداڵی هەبوو، هاوسەرەکەشی کوڕی یەکێک لە هاوڕێکانی عەلی خان بوو، پیاوێکی بەڕێز بوو، ئەویش لە مەیدانی بار دوکانی هەبوو، ئیشوکاری پارەگۆڕینەوەی دەکرد. لە پەری خانم پرسی لەگەڵ دونیای کۆمۆنیستیدا چی دەکەیت؟ گوتی ئێستا کە هاوسەرەکەم سەرمایەدارە، ئەو قسە و بیر و خەیاڵە هی سەردەمی گەنجی بوون. گوتم ئەی ڕۆیشتی بۆ سۆڤیەت؟ گوتی نەچووم، چونکە ڤیزایان پێنەدام، بەڵام لەبری ئەوەی بچم بۆ سۆڤیەت لەگەڵ هاوسەرەکەمدا، دوو جار ڕۆیشتووم بۆ ولاتان. جارێکیان چووم بۆ ئەمریکا و چل ڕۆژ لەوێ مامەوە، ئێستا بەدوای کۆمۆنیستیدا ناگەڕێم. گوتم ماڵی عەلی خان پێنجسەد مەتر دوور نابێت لە حسێنییەی ئیرشادەوە. بۆ گوێگرتن لە وتارەکانی دکتۆر عەلی شەریعەتی سەردانی ئەوێ دەکەیت یان نا؟ پەری خانم گوتی حسێن ئاغا من تەنها شتێک کە باوەڕم پێی هەبێت هاوسەرەکەم و دوومنداڵەکەم و کار و کاسبی و هاوبەشییەکەمە لەگەڵ باوکمدا. گوتم بۆچی ئێستا لەگەڵ باوکتدا هاوبەشیت؟ گوتی بەڵێ لەگەڵیدا هاوبەشم، ناتوانێت دوو ڕیاڵی من بخوات، عەلی خان ئێستا تەمەنی حەفتاوپێنج ساڵە هەموو ڕۆژێک ناڕوات بۆسەر کار هەموو کارەکان لەدەست حەیدەری برامدایە، بەڵام حەیدەر خوێندەوارییەکی باشی نییە. گوتم ئەی ئابووریی کۆمۆنیستی سۆسیالیستی چی لێ بە سەرهات؟ گوتی ئەوە بیرکردنەوەی گەنجی و بێ ئەزموونی بوو. من لە دایک و باوکم دوور خرابوومەوە و کچێکی تەمەن چواردە ساڵ بووم، منیان بۆ خوێندن نارد بۆ تاران، عەلی خان منی لە بۆجنووردەوە هێنا بۆ تاران، ژن و پیاوێکی کۆچەریی سادەشی لەبەر من ناردە تاران، خانوویەکی کڕی و منی لە تاران بەو ژن و پیاوە سپارد و بۆ خۆی ڕۆیشت، دیارە منی بە هاوڕێکانیشی سپارد بوو. من کچی گەورەی بووم، باوکم هەموو ئارەزووەکانی خۆی لە سەر من هەڵچنی بوو، منیش کەسێکی چاو نەکراوە بووم، وانەکانیشم بە باشی دەخوێند.

تاران ئەو کاتە شارێکی بچووک بوو جار جارێک هاورێیانی باوکیشم سەردانیان دەکردم. باوکم کاتێک لە دوای کودەتای ساڵی (١٣٣٢-١٩٥٣) لە تاران کەوتە زیندانەوە هاورێی باشی پەیداکرد، هەموویان لە لایەنگرانی خودالێخۆشبوو دکتۆر محەمەد موسەدیق بوون. دبلۆمم بە باشی وەرگرت، لە تاقیکردنەوەشدا یەکەم بووم بۆ کۆلێژی ئەندازیاری، لە زانکۆدا لەگەڵ گروپێکدا ناسیاویم پەیدا کرد ئەوان منیان ڕاکێشا بە لای خۆیاندا، سەرەتا تەنها قسەکردنێکی ئاسایی بوو، پاشان وردە وردە کۆبوونەوە لە ژوورەکەدا دەستپێیکرد، سەرەتا تەنها مێشک شۆرینەوە بوو، هەرچی باوەڕێک لە مێشکمدا بوو ڕۆیشت و لە نێویانبرد تەنها ئەوەی کە بۆ من مایەوە غیرەت و شەرەفی عەشایەری بوو، پاشان هەرچییەکی ویستیان خستیانە نێو مێشکی منەوە، لەوەش سەیرتر ئێمە (١٠-١٢) کەس بووین بەیەکەوە لەیەک گروپدا بووین، هەمووشمان منداڵی دەوڵەمەند بووین و دژی سەرمایەداران دەجوڵاینەوە، ئێستاش کاتێک بیری لێدەکەمەوە هەموو زوڵم و ستەمی شا بوو ئێمەی تووشی ئەو توندڕەوییە کرد بوو. لە بارودۆخێکی لەو جۆرەدا کە ستەمێکی زۆر لەسەر کۆمەڵگە هەبێت، کاتێک دیموکراسی و ئازادی نەبێت. گەنجان و تەواوی خەڵکان ناتوانن هیچ قسەیەک بکەن و هیچ وتەیەکی تازە ببیستن، لە هەلومەرجێکی ئاوادا گەنجان و لاوان تینووی وتەی نوێن، لەو کاتەدا هیچ چارەیەک نییە جگە لەوەی کە بڕۆین و لە شوێنێکدا کۆببینەوە و پێکەوە قسەبکەین و ناڕەزایەتییەکانمان دەرببڕین. بەهۆی هەلومەرجی خۆسەپاندن و ملهوڕی ڕژێمەکانەوەیە کە گروپی نهێنی و ژێرزەمینی دروست دەبن. ئەوکاتە ئەوانەی ئەم گروپانە دروستدەکەن، بیر و بۆچوونی خۆیان دەگوازنەوە بۆ نێو مێشکی ئەو گەنجانە. خۆ ئەگەر ئازادی هەبووایە، ئەگەر لە زانکۆدا بمانتوانییایە بە ئازادی ڕای خۆمان دەرببڕین، بە هیچ شێوەیەک تێکەڵاوی گروپی کۆمۆنیستی نەدەبووین، یا ئەگەر بە زۆریش پەلکێشیان بکردینایە، بە نهێنی کارمان نەدەکرد، پێویستی بە بەکارهێنانی چەک نەدەکرد، وەکو پارتە کۆمۆنیستەکانی ئەوروپا دەچووینە سەر مێزی دەنگدان، بەڵام ئەو کێشەیە کێشەی من و ئەوانی تر نەبوو، بەڵکو کێشەکە کێشەی سیستەمێکی خۆسەپێن بوو، کێشەیەکی تری من ئەوە بوو کە عەلی خان منی لە بنەماڵەکەم دابڕی و دوریخستمەوە، منیش هیچ چارەیەکم نەبوو. باوکم ئاژەڵداریی دەکرد، شوێنی کارەکەشی لەو چۆڵەوانییە بوو، ئەو لەکاتی خۆماڵیکردنی نەوتدا هاتبوو بۆ تاران، لەوە تێگەیشتبوو کە مرۆڤ دەبێت خوێندەوار بێت، بەڵام ئەو تەمەنی بەسەرچوو بوو، تازە بە کەڵکی خوێندن نەدەهات، بۆیە ئارەزووەکانی خۆی خستنبووە سەر منداڵەکانی

و لەسەر ئەوان پیادەی دەکرد. ئەسەد و حەیدەر و کەڕار لە من گەورەتر بوون، بەڵام ئەوان پشتیوانی بوون لە کارکردندا و نەیدەویست ئەوان لەخۆی دوربخاتەوە. منیش کە یەکەم کچی بووم زۆریشی خۆشدەویستم، دەیویست هەر چۆنێک خۆی بیەوێت بەو جۆرە پەروەردەم بکات، بەڵام کاتێک من پەیوەندیم کرد بە پارتێکەوە بوومە هۆی ئەوەی خوشکەکانی ترم و تەنانەت مەنوچەهریش بێچارە بکەم. کاتێک من دەستگیرکرام و خرامە زیندانەوە، عەلی خان خوشکەکانی تریشمی لە قوتابخانە دەرکردن و بردنی بۆ نێو ڕەشماڵ بۆ لای خۆی، مەنوچەهریش نەیتوانی بە ڕێکوپێکی بچێتە قوتابخانە، بە تاقیکردنەوەی دەرەکی دبلۆمی وەرگرت و ئێستا دەیەوێت تاقیکردنەوەی زانکۆ بکات و بچێتە کۆلێژێک، ئێستا من چوومەتە ژیانی خۆمەوە هاوسەر و دوو منداڵم هەیە، پارەیەکی باشیشم هەیە، من تەنها کێشەم خوێندنەکەم بوو کە بۆم تەواو نەکرا. ئەم شایە نەفرەتیە وەک هەموو دیکتاتۆرەکانی تری جیهان ژیانی گەنجان و هەموو خەڵکی وڵاتی بە هەدەر داوە. گوتم، بەڵام تۆ دەتەوێت لەم سیستەمە سوودمەندبیت. گوتی سوودمەند دەبم، بەڵام نیگەرانم. گوتم لە چی نیگەرانیت؟ گوتی کاتێک حوکمەتەکەت دیکتاتۆربێت، هەموو خەڵکی نیگەران دەبێت، نیگەرانی لە چارەنووسی منداڵەکانیان، نیگەرانی لە قسەکردن، نیگەرانی لە سەرمایەگوزاری، نیگەرانی لە چارەنووسی گەل و وڵات.

ئەو کاتە ساڵی (١٣٥٣-١٩٧٤) بوو. پەری خانم گوتی بەدڵنیاییەوە پێتدەڵێم ئەم حوکمەتەی ئێمە بە جۆرێک سەرەوبن دەبێت و دەڕوخێت کە هیچ کەسێک باوەڕ ناکات. هەر بۆیەش دەمەوێت بە زوویی بڕۆین و ئەم وڵاتە جێبهێڵین، دەمەوێت بڕۆین بۆ لەندەن. من و هاوسەرەکەم هەموو کارەکانمان تەواو کردووە، پارەیەکی باشمان هەیە خانوویەکمان لە لەندەن کڕیوە، چەند مانگێکی تر لەگەڵ هاوسەرەکەمدا دەڕۆین بۆ لەندەن. عەلی خان پێم دەڵێت کۆمۆنیستەکانی لەندەن‌نشین. منیش پێی دەڵێم من ئیتر کۆمۆنیست نیم. عەلی خان دەڵێت کەسێک بیەوێت لە وڵاتی خۆی ڕابکات، وڵاتی خۆی جێبهێڵێت، بەکەڵکی هیچ شتێک نایەت. منیش دەڵێم کەسێک بیەوێت لێرە بمێنێتەوە بە ترس و لەرزەوە بژی و نەتوانێت دوو قسە لەگەڵ هاوڕێکانیدا بکات، ئەو کەسە مرۆڤ نییە. ئێستا من لە سەر دەستی ئەم ڕژێمە دۆسیەیەکم بۆ کراوەتەوە، لە هەر شوێنێک یەکێک لە هاوڕێ دێرینەکانم تووشی کێشەیەک ببن، ساواک یەکڕاست دێن بۆ لام و لە هەواڵم دەپرسن، کە ئەمەش لێکۆڵینەوەیەکی بەڕێزانەیە لە ناو ماڵەکەی خۆمدا. لە ڕوانگەی ساواکەوە ئێستاش من کچێکی کۆمۆنیستم. هەر کاتێک ئەم ڕژێمە ڕووخا و

شەماڵی ئازادی هەڵیکرد، ئەو کاتە منیش دەگەڕێمەوە بۆ وڵاتی خۆم.

من لەو شەوەوە ئیتر پەری خانمم نە بینیوەتەوە، بەڵام دەزانم کە نەگەڕاوەتەوە بۆ وڵات. پەری خانم کاتێک پێکەکەی بە سەلامەتی من بڵند کرد، گوتی بە ڕاستی دەمانچەکەت چی لێکرد؟ گوتم بە سەلامەتی تۆ دەمانچەکەم خستە نێو ڕووباری بابا ئامانەوە. گوتی کارێکی باشت کردووە، ئینجا گوتی ئێمە هەرگیز بە دوای ئەو تفەنگ و برنەوانەشدا نەچووین کە لەگەردەنەی شەلەمی حەشارماندان. پەری خانم گوتی ئێستا تێگەیشتم کە باشترین چەک پارەیە. پارە لە تفەنگ و تۆپ و تانک باشتر کار دەکات. گوتم تەنها پارە و هیچی تر؟ گوتی نەخێر هاوڕێیەتی و خۆشەویستی و دۆستایەتیش جێگای خۆی هەیە، سیاسەتیش جێگای خۆی هەیە. هاوسەری پەری خانم چیرۆک و بەسەرهاتی منی باش دەزانی. چیرۆکی لێدانەکەم، باسکردنی ئەو هەموو لێدانە و شاردنەوەی دەمانچەکە، ئەوانەی هەموو دەزانی، بەڵام نازانم پاشماوەکانی تری دەزانی یان نا...

موحسین ئاغای هاوسەری پەری خانم گوتی چەندین جار پەری باسی ئەوەی بۆکردووم ئەگەر ئەو ڕۆژە تۆ دەمانچەکەت نەشاردایەتەوە من و تۆ بەیەک نەدەگەیشتین، چونکە پەری لانیکەم دەساڵ دەچووە زیندانەوە. واتە ئەوکاتەش پەری لە زینداندا دەبوو. موحسین ئاغا گوتی دەرگای ماڵی ئێمە هەمیشە بە ڕووی هاوڕێیانی خۆشەویستی وەکو تۆدا کراوەیە.

من هەرگیز جارێکی تر نە چوومەوە بۆ لایان، دڵم مۆڵەتی ئەوەی پێنەدەدام کە بچم. ساڵی (١٣٥٦-١٩٧٧) دە ڕۆژ پێش ئەوەی بڕۆم بۆ فەڕەنسا، گەشتێک کە ماوەی شەش ساڵی پێچوو، تەلەفۆنێکم کرد بۆ دوکانەکەی حاجی عەلی خان، برزوو تەلەفۆنەکەی هەڵگرت، کاتێک هەواڵی عەلی خانم لێپرسی بەگریانەوە گوتی موهەندیس سێ ڕۆژی تر مەراسیمی چلەی عەلی خانە، تکایە تۆش وەرە، چونکە هەموو خزمان کۆدەبنەوە، پڕی دوو پاس خەڵک لە قوچان و شیروان و بۆجنووردەوە دێن. دوایین جار پەری خانمم بە جلوبەرگی ڕەشەوە لەماڵی عەلی خان بینی بۆ مەراسیمی مردنی باوکی لە لەندەنەوە هاتبووەوە بۆ تاران. لە ساڵی (١٣٥٦-١٩٧٧) تاکو ئێستا واتە ساڵی (١٣٩١-٢٠١٢) چاوم بە پەری خانم نەکەوتۆتەوە، بە تەلەفۆنیش قسەم لەگەڵدا نەکردووە و هیچ هەواڵێکی نازانم. تا چەند ساڵێک لەمەوبەر کیفی دەمانچەکەیم هەڵگرت بوو، بەڵام پاشان کیفەکە تەواو تێکچوو بوو. کارگوزاری ماڵەکەمان وای بەباش زانی بوو کە فڕێی بدات، بەڵام ئایا بە ڕاستی دەبوو فڕێی بدات؟ کاتێک سەیری ئەو کیفی دەمانچەیەم دەکرد یەک

دونیا بیرەوەریی تاڵ و شیرینم بیردەهاتەوە، بێ هۆ نییە خەڵکی یادگارییەکانیان بە باشی هەڵدەگرن و دیاری دەدەن بەیەکتری.

ئەو شەوەی لەماڵی پەری خانم بووم، هەواڵی زۆرێک لە هاوڕێ کۆنەکانی ئەو سەر دەمەم لە برزوو پرسی. ئەو گوتی عەبدال چەند سەر مەڕێکی هەیە و تا ئێستاش لەشاخەکانە، زۆرم لەگەڵدا گوت، بەلام نەهات بۆ تاران. غەفاریش ئیش و کارێکی باشی هەیە، بەلام قاچاخ چییە، ئەو لە ئێمە نییە، ئێمە کاسبکارین و ئەو تلیاک دەفرۆشێت، بەلام ئەم جۆرە کارانە پاشە ڕۆژیان باش نییە. غەفار لە ساڵی (١٣٦٧-١٩٨٨) بەهۆی مادده هۆش بەرەکانەوە لە تاران لەسێدارە درا. پێشبینییەکانی برزوو ڕاست دەرچوون، ئەو جۆرە کارانە پاشەڕۆژیان باش نییە و مایەی لەناوچوونە. کاتێک سەرما و سەهۆڵبەندانێک یان وشکەساڵییەک لە ولاتدا ڕوودەدات چ ئەنجامێکی هەیە؟ کوردە کۆچەرییەکان دەیانویست لە کێوەکاندا وەکو هەزار ساڵ پێش ئێستا بژین، کۆماڵگەیەکی دواکەوتوویان بنیاتنابوو، یەک سەرما و بەفربارین ئەوانی لە تونێلی مێژووەوە ئاودیو کرد و بەرەو شار بەڕێیکردن، شارێک کە دەیویست فێری مۆدێرنیتەیان بکات. کۆمەڵگەی خێڵەکی کۆن کە زۆر بە خێرایی و بە بێ خۆئامادەکردن دەهاتنە ناو ژیانی شارنشینەوە. چەند شەو لە دوای میوانیەکەی ماڵی پەری خانم لە ساڵی (١٣٥٣-١٩٧٤) دا، بە هاوکاری برزوو ڕۆیشتم بۆ دیدەنی ئەو هاوڕێ کوردە کۆچەرییانەی کە کۆچیان کرد بوو بۆ تاران. کەسانێک کە لە شەوی بەفر و سەهۆڵبەندانەکەدا پێکەوە بووین، هەندێک لەوانە لە تایەفەی عەلی خان بوون، هەندێکی تریشیان لە تایەفەکانی تر بوون. برزوو منی برد بۆ باشووری شاری تاران، بردمی بۆ ناو خانوویەکی گەورە، خانووەکە وا دەردەکەوت لە ڕابردوودا ئەمبارێکی گەورە بووبێت، ئەو شوێنە هەر وەکو ماڵەکەی نەنە قەمەر وابوو، لە هەژدە ژوور پێکهاتبوو، ئەوخانووە کاروانسەرا بوو، ماڵی کەسانی زگورتی و بێ ژن و منداڵ بوو. سیودوو کەس لە کوردە کۆچەرییەکانی دەوروبەری قۆچان و شێروان لەوێ بوون، چەند ژوورێکیش لەو خانووەدا کرا بوون بە ئەمبار. خانووەکە برزوو بەکرێی گرتبوو، ئەوانەی لەوێ بوون هەموویان تەمەنیان لەنێوان (١٨-٤٠) ساڵ بوو، تەنها یەک کەسی لێبوو تەمەنی پەنجا ساڵ بوو. ئەوان هەمویان بە عەرەبانەی دەستی میوەیان دەفرۆشت. (٨-٩) کەس لەوانە بە دەموچاو منیان دەناسی، بەلام زۆربەیان دەیانزانی من کێم. گەنجێکی موهەندیس کە چەند جارێک هاتبوو بۆ نێو هۆزەکە و لە لافاوەکەی بەهاری ساڵی (١٣٤٧-١٩٦٨) و سەهۆڵبەندانەکەی ساڵی (١٣٤٨-١٩٦٩) لەگەڵ هۆزەکەدا بووە و پەری خانم لێی داوە و خەریکبووە بمرێت.

کاتێک برزوو هاتە ناو خانووەکە بووە دەنگە دەنگ و گوتیان برزوو خان هات. برزووی گەنج کە لەبنەماڵەی کۆچەرییە هەژارەکان بوو، ئێستا لە شاری تاران بووە بە برزوو خان. دەنگە دەنگ پەیدا بوو دەیانگوت برزوو خان لەگەڵ موهەندیسدا هات. ئەسغەری شوانیش سەرپەرشتی ماڵەکەی دەکرد. من حەزم دەکرد لەگەڵ ئەو خەڵکەدا تەنها بم. بە برزووم گوت برزوو خان تۆ برۆ بۆلای کارەکەت، من یەک کاتژمێری تر لێرە دەبمێنمەوە. برزوو پێداگری کرد کە ئەویش دەمێنێتەوە، تکام لێکرد کە بڕوات ئەویش ڕۆیشت. برزووی حوشترسوار، برزووی گۆشتی هەموو زیندەوەرێک خۆر، ئێستا خاوەن ئوتومبێلە، ئوتومبێلی فیاتی هەیە، لەکاتی میوانیدا ویسکی دەخواتەوە و لەگەڵ کچاندا سەما دەکات. لە ماوەی (٥-٦) ساڵدا لە ژیانی خێڵەکیەوە چووبووە ناو سیستەمی ئەمریکاییەوە. خانوویەکی باشی لە نزیک شەقامی تەختی جەمشید (تالەقانی) کڕی بوو. ئەو دەیویست ژن بهێنێت. برزوو ڕۆیشت و من لای ئەسغەر مامەوە. ئەسغەر پێشتر لە هەوارەکەی عەلی خان بوو، ئەو شوانی مێگەلێک بوو، هەرگیز لەگەڵ ئەودا نەچووبووم بۆ کێو، ئەو شوانی مەڕە قسرەکانی خان بوو، لە بەفر و سەهۆڵبەندانەکەدا نزیکەی هەموو مەڕەکانی مێگەلەکەی ئەو لەناوچوو بوون، دوو پەنجەی دەستی چەپ و چوار پەنجەی قاچی بە هۆی سەرماوە ڕەش ببوون و بڕابوونەوە. ئەو پیاوێکی سی ساڵەی لات بوو، کاتی خۆی چەند جارێک لە هەوارەکە چاوم پێیکەوت بوو، ژن و منداڵەکانیم پێشتر دەناسین. ئەسغەر منی برد بۆ ماڵەکەی خۆی، لە ژوورێکدا و لەگەڵ پێنج کەسی تردا دەژیان. پاشان هەموو دانیشتووانی نێو خانووەکە هاتن بۆ ژوورەکەی ئەسغەر. ئەکبەر، موراد عەلی، فەرزانە، فەرەیدون، ئاغاهەمزە، کەریم، هەموویان هاتن بۆ ژوورەکەی ئەسغەر. هەموویان ژن و منداڵەکانیان لە گوندە کوردنشینەکانی بۆجنوورد و قۆچان لای خزم و کەسەکانیان جێهێشتبوو و خۆیان بۆکارکردن هاتبوون بۆ تاران. برزوو عارەبانەی دەستی دابوو بە هەموو ئەوانە، ئەوانیش میوە و سەوزەیان لە مەیدانەکە لەسەر حیسابی برزوو وەردەگرت. هەموو بەیانییەک ئەوان دەچوون بۆ مەیدانی سەوزە و میوە، شەوانە تا درەنگێکی شەو لەسەر شەقامەکان دەمانەوە تا میوەکەیان بە تەواوی دەفرۆشت. برزوو لەسەر شەقامەکان جێگای بۆ هەموویان دیاریکردبوو، ئەو ناو شاری تارانی ژمارەبەند کردبوو. ئەسغەر و هاوڕێکانی دەیانگوت برزوو هەموو مانگێک جێگاکانیان دەگۆڕێت، واتە هەر کەسێک لە شوێنە باشەکان و مامناوەندەکان و شوێنە خراپەکان جێگۆڕکێیان پێدەکرا. هەر وەکو هەواری خێڵە کۆچەرییەکان، چۆن لەوەڕگە و کانیاوەکان شوێنی خراپ و باش و مامناوەند هەبوو

جێگۆڕکێیان دەکرد، ئەویش ئەوها جێگۆڕکێی بە عەرەبانەکان دەکرد. ئەم گۆڕانکارییە لە شوێنی عەرەبانەکاندا، بۆ جیبەجێکردنی دادپەروەریی بوو لە کارەکەدا و ڕەنگە ئەو جێگۆڕکێیە بۆ ئەوە بووبێت کە هیچ کەسێک شوێنێک بە موڵکی خۆی نەزانێت. ئەسغەر گوتی نزیکەی بیست‌وپێنج کەسیش لە باکووری شار لە خانوویەکدا دەژین، برزوو لە مەیدانی میوەکەوە بە ئوتومبێلی کرێ میوە بۆ ئەوان دەگوازێتەوە، چونکە نەدەکرا لە باکووری تارانەوە بچین بۆ باشووری تاران. لە ساڵی (١٣٥٤-١٩٥٧)دا باکووری شاری تاران واتە شەقامی تەختی تاوس یا شەقامی شەهید (موتەهەری). لە خانووەکەدا هەر چەند کەسێک پێکەوە لە ژوورێکدا دەژیان، کاری چێشتلێنان و قاپشۆرین و گسکدان بە نۆرە بوو. دەبوو بە نۆرە هەر شەوە و کەسێک خەفەربێت. ئەوان هاتبوون بۆ تاران بەڵام هێشتا وشەی ئاژەڵدارییان بەکاردەهێنا. ئەو کەسەی کە نۆرەی خەفارەتی هەبوو دەبوو کاتی عەسر بگەڕێتەوە بۆخانووەکە تاکوو خواردن بۆ هاوڕێکانی تری دروستبکات. ئەوان گوتیان ئاغای موهەندیس حەزدەکەین بۆ نانی ئێوارە لای ئێمە بمێنێتەوە، ئەو شەوە خواردنی سیپەلکی مەڕییان هەبوو. کە لەگەڵ پیاز و پەتاتەدا سوریان کردبووەوە. خواردنێکی ناخۆش نەبوو لە تەمەنمدا ئەو جۆرە خواردنەم نەخوارد بوو. بەهەرحاڵ ئەوخواردنە سکی ئەوانی تێرکرد. دەبوو ڕۆژانە (١٤-١٥) کاتژمێرکاریان بکردایە و بە بەردەوامی هاوارییان بکردایە، سەوزە، پاقلە، باینجان، شوتی، کاڵەک و چی و چی. ئەگەر بە پارەکانیان خواردن وخۆراکی باشیان بکڕیایە، ئەوا پارەیەکی وا نەدەمایەوە بۆ ژن و منداڵەکانیان. محسنۆ گوتی موهەندیس بینیت سەرما و سەهۆڵبەندانێک چی بەسەر ئێمەدا هێنا؟ چۆن لە هۆز و شوێنی خۆمان دابڕایین؟ ئێستاش دەمانەوێت لێرە ببینە شتێکی تر. ئێمە کەسانێک بووین لەگەڵ مەڕ، لەوەڕگە، حوشتر و وڵاخ، کانیاو و ئاڵف و دەشت و شاخ ڕاهاتبووین، کەسانێک بووین لە ساڵێکدا مامەڵەی دە تومەنمان نەکردبوو، لە ساڵێکدا یەک درۆمان نەدەکرد، ئەگەر بە درۆ سوێندێکمان بە ئیمامی عەباس بخواردایە، واماندەزانی پشتمان دەشکێت، واتە ئەگەر سویندی درۆمان بە ئیمامی عەباس بخواردایە ئەوەندە دەترساین دەستمان نەدەچووە هیچ کارێک. محسنۆ گوتی کاتێک تەمەنم هەژدە ساڵ بوو، سوێندێکی درۆم بە ئیمامی عەباس خوارد، ئەوەندە ترسام کە هەمان ڕۆژ دەستم بە چەقۆیەکی گەورە بڕی تاکو دوو مانگ چاک نەبووەوە. کەچی ئێستا ڕۆژی بیست جار بە درۆ سوێند بە ئیمامی عەباس دەخۆم، باینجانی وارمین بە باینجانی شەهریار دەفرۆشم، گێزەری شاری ڕەی بە گێزەری ئەهواز دەفرۆشم، کاڵەکی شوێنێک بە شوێنێکی تر دەفرۆشم.

ڕۆژی سەد سوێندی درۆ دەخۆم، گرنگ ئەوەیە باوەڕم وایە ئەگەر سوێندی درۆش بخۆم هیچ شتێک ڕوونادات. ئەسغەر گوتی سوێندخواردنی درۆ زۆر ئاسانە. هەندێک لەگەنجەکانمان کە سەردانی شارەکان دەکەن، کاری ئەوەندە ناشیرین دەکەن لە ماوەی سەد ساڵدا باوک و باپیرانمان کاری وا قێزەونیان نەکردووە. تاران شوێنێکە ئێمە بە لاڕێدا دەبات. گوتی بۆ نموونە غەفار تا دوو ساڵ لەمەو بەر لەگەڵ ئێمەدا کاری دەکرد، سەیرم کرد وردە وردە وا لەگەڵ خەڵکی نامۆ و نەناسراودا تێکەڵاوی پەیداکردووە. پاشان بۆم دەرکەوت، بووە بە قاچاخچی و کڕین و فرۆشتن بە تلیاکەوە دەکات، هەربۆیەش لێرە دەرمانکرد. کەسێکی تریش لە خانووەکەی باکووری شار ببوو بە قاچاخچی. لە هەمووشی خراپتر ژنەکەی خۆی بۆ ئەملاولا دەبرد، خودا چارەنووسمان بەخێر بگێڕێت. ئیتر ئێمە کورد نین، چونکە خەریکە شەرافەتی کوردی کۆچەریی دەخەینە ژێر پێمانەوە.

هەر یەکە و لەبەر خۆیەوە قسەیەکی دەکرد. لە ناکاو فەریبورز بۆکسێکی لەپشتە سەری کەسێکدا کە لە تەنیشتییەوە دانیشتبوو. گوتی ئەم کەسە خوێڕییە هاوسەری خوشکەکەمە و ڕۆیشتووە بۆ بێ ناموسی و هەڵەیەکی گەورەی کردووە، ئێستا تووشی نەخۆشی سوزاک بووە. ئینجا گوتی ئەوە ئاغای موهەندیسە بەڵکو ڕێگا چارەیەکت بۆ بدۆزێتەوە. منیش هیچ دەسەڵاتێکم نەبوو. گوتم دەبێت بە زوویی سەردانی دکتۆر بکەیت. هاوسەری خوشکەکەی فەریبورز گوتی سەردانی دکتۆرم کردووە، بەڵام دکتۆر پارەی زۆری دەوێت، منیش ئەو پارەیەم نییە. چەند گەنجێکی تەمەن (٢٠-٢٥) ساڵیش لەوێ بوون. هیچ یەکێکیان زەماوەندیان نەکردبوو. گوتم ئێوە بۆچی زەماوەندیتان نەکردووە. هەموویان پێکەوە گوتیان بەچی زەماوەندی بکەین؟ کوا پارە هەیە؟ خانوو هەیە؟ تەقی لەهەموویان گەورەتر بوو. ڕیش سپی ماڵەکە بوو. گوتی ئەمانە کاتێک لەناو هۆزە کۆچەریەکاندا بوون. لە تەمەنی (١٧-١٨) ساڵیدا زەماوەندیان دەکرد، ئێستا لە شارێکی وەکو تاراندا چۆن چۆنی زەماوەند بکەن؟ هەریەک لەمانە تووشی چەندین هەڵە بوون. لە تاراندا ئایین و ئیمان بەبا چووە. تەقی گوتی ئەو سەردەمە بەسەرچوو کە گەنجەکانمان لە تەمەنی (١٦-١٧) ساڵیدا زەماوەند بکەن و هەریەکەیان ببێتە خاوەنی (٧-٨) منداڵ. من ئێستا تەمەنم بووە بە پەنجا ساڵ زۆر ئامۆژگاری ئەم گەنجانە دەکەم، بەڵام ئەمانە ئامۆژگاری لە گوێ ناگرن. ئەسغەر گوتی حاجی تەقی بەڕێز خودای گەورە تۆ پایەدار بکات، بەڕاستی تۆ سێبەرت لەسەر هەموومانە. پێویستە تۆ هەمیشە لە نزیک ئەم گەنجانە بیت، ئەگەر تۆ نەبیت، ئەوان ئەم خانووە دەکەن بە فەسادخانە.

هەموو قسەیان کرد، قسەی وایان دەکرد کە ناکرێت لێرە بینووسم. حاجی تەقی گوتی ئاغای موهەندیس، ڕاستییەکەی ئەوەیە، لە تاراندا کەسێکی سەڵتی بێ ژن و منداڵ، واتە کەسێکی بێ ئایین و بێ ئیمان، خودای گەورە بمانخاتە سەر ڕێگای ڕاست. بە یەکێکیانم گوت: بۆچی ئێوە خۆتان عەرەبانە ناکڕن و میوەی لەسەر بفرۆشن؟ وەک ئەوەی کە قسەیەکی خراپم کرد بێت، چونکە چەند کەسێک لەوانە کرێکاری برزوو نە بوون. دیار بوو برزوو بیری لەهەموو شتێک کردبووەوە، ئەگەر کەسێک بیویستایە ئەو هەڵەیە بکات و عەرەبانە بۆخۆی بکڕێت، ئەوا حیسابی بۆ دەکرد. بێهۆ نەبوو برزوو ببو بە یەکێک لە کەسە دیارەکانی مەیدانی تەڕە و میوە. برزوو پیاوی عەلی خان بوو، ئەوخەڵکانەش هەموویان پیاوی برزوو بوون. باسی داهات و خەرجیمان کرد، ئەوان لە دووری ماڵ و ژن ومنداڵەکانیان ڕەنجیان دەکێشا. چەند ساڵێک بوو لە تاران بوون، بەڵام هێشتا ئەوان ئارەزووی قومی ئاوی کانیاوەکانی کێوەکانی (گلۆلی) شیروانیان دەکرد. بەگشتی ئەوان ڕۆژانە چواردە تومەنیان وەردەگرت، ئەوکاتە دەیکردە دوو دۆلار، ڕۆژی پازدە کاتژمێر کاریان دەکرد. بۆهەر کاتژمێرێک نزیکەی یەک تومەن. دیارە یەک تومەنی بەنرخ و پڕ بەرەکەت. یەک تومەنی ئەوکاتە ئەوەندەی پێنج هەزار تومەنی ساڵی (١٣٩١-٢٠١٢) هێزی کڕینی هەبوو. فەریبورز دەیگوت پێش ئەوەی بێم بۆ تاران لە هەموو تەمەنمدا تیکەڵاوی کەسیکم نەکردووە کە نەمناسی بێت، بەڵام ئێستا لە بەیانییەوە تاکو شەو کەسێکی ناسیاو نابینم. تەنها شەوان لەگەڵ کەسە ناسیاوەکاندا بەدیار یەکتریەوە کۆدەبینەوە. هەموویان دەیانگوت کاتێک لە شوێنی خۆمان و لەناو هۆزەکانی خۆماندا بووین. هەموو خەڵکی دەورووبەری هۆزەکانی خۆمان دەناسی، باوکیان، دایکیان، ژنەکانیان، منداڵەکانییان. هەموویانمان دەناسین، بەڵام ئێستا لە تاراندا یەک کەس ناناسین. کاتێک لەناو هۆزەکەی خۆماندا بووین واماندەزانی هەموو هێز و توانای ئەم وڵاتە لە دەستی ئیمە و خاندایە، ئێستا تێگەیشتووین کە ئێمە بێ هۆ ژیاوین. ئێمە لەم وڵاتەدا هیچ نین. نە خویندەوارییمان هەیە، نە پارە، نە ئیشوکارێکی باش. نە خانوو و ماڵێکمان هەیە. ژن و منداڵەکانی ئێمە لە گوند و شارە بچووکەکاندا بە هەژاری و نەبوونی دەژین. ئێمە بەم هەموو کارکردن و ماندووبوونەوە ناتوانین سکی خۆمان تێر بکەین. چەند کەسیکیان گوتیان ئەگەر خوومان بەم ژیانە نەگبەتەوە نەگرتایە دووبارە دەبووینەوە بە ڕەشماڵنشین.

چەند کەسێکیان حەزیان لە سینەما بوو. هەندێک لە پارەکانیان بە چوونە سینەما لەدەستدەدا. هەڵبەت ئەو هەژارانە، نە کەسانی مەی خۆرەوە بوون نە تلیاک کێش بوون،

بەڵام لانیکەم (٥-٦) کەسیان سەردانی شاری نوێیان دەکرد. ئەوان هیچ سەرەڕۆییەکیان نەبوو، تەنها کاری خراپیان ڕۆیشتن بوو بۆ شاری نوێ. ئەوان سوێندی درۆشیان بە حەزرەتی عەباس دەخوارد. لەڕووی مەزهەبیشەوە کەمیک بێ باوەڕ ببوون. لەهەر ژوورێکدا ڕادیۆ یەک هەبوو. چەند کەسێکیان ڕیکۆردەریشیان هەبوو. بەزۆری گوێیان لە گۆرانییەکانی ئاغاسی دەگرت (محەمەد) هەموو فلیمەکانی (بیک ئیمانی) بینی بوو. کە (وەردی و فەردیین) دەوریان تێدا دەبینین. ئەو لە هەمووان زیاتر کاسێتی گۆرانی هەبوو. کاسێتەکانی، ئاغاسی، هایدە، گوگوشی کڕی بوون. ڕۆیشت ڕیکۆردەرەکەی هێنا و کاسێتی خستە سەر. عەلی دەنگی زۆر خۆش بوو، شمشاڵیشی لێدەدا، هەندێک گۆرانی بۆ گوتین و شمشاڵیشی بۆ لێداین. من دەنگناس نیم، بەڵام وام هەستدەکرد ئەگەر هانبدرایە و ڕاهێنانی پێبکرایە، زۆر لە ئیرەج کەمتر نەدەبوو. لەبارەی کچانی تارانی و خەڵکی تارانەوە زۆر قسەمان کرد. هەروەها باسی جیاوازی خەڵکی تاران لەگەڵ خەڵکە کۆچەرییەکانمان کرد، هەواڵی «یەلە»م لێ پرسین هەموویان پێکەوە گوتیان «یەلە» کاروباری زۆر باشە. «یەلە» لەگوندا دەژیت، ئەو بووە بە منداڵی خوشکە مەسیحیەکان. مەحمود گوتی «یەلە» لەگەڵ ئەواندا بە فەرەنسی قسەدەکات، چاکەت و پانتۆڵی تازە و خاوێن لەبەردەکات و بۆینباخ دەبەستێت. ئەسغەر گوتی «یەلە» جارجارێک دێت بۆ تاران، چەند جارێکیش سەردانی کردوین. «یەلە» ئێستا بووە بە کەسێکی تەواو. ئێستا (١٣٥٣-١٩٧٤) تەمەنی بووە بە (١٥-١٦)ساڵ. تا نیوەشەوێکی درەنگ لە لای ئەوان مامەوە. هەندێکیان ڕۆیشتن بۆ ژوورەکانیان و نووستن، چەند کەسێکی دیکەش دانیشتبوون و لە ماندوویێتیدا باوێشکیان دەدا. ئەسغەر گوتی ئاغای موهەندیس هەر لێرە بخەوە. گوتم دەڕۆم، بەڵام خۆزگە نەڕۆیشتمایە و هەر لەوێ بنووستمایە، بەو شەوە تەکسیش دەستنەدەکەوت، کاتژمێر یەکونیوی شەو تاکسیم دەستکەوت و ڕۆیشتم بۆ مەیدانی کاخ، مەیدانی (فەڵەستین). ئەو شەوە لەلای ئەوان زۆر شتم بیست. کە نووسینیان لێرەدا بە کارێکی باش نازانم. کۆچی خەڵکی هەژار، خەڵکانێک کە ژن و منداڵەکانییان لەگوند و دێهاتەکاندا بەرەڵا دەکەن، ئەوان لە پێناو پارووە نانێک و ئیجارەکردنی خانوودا چ زەحمەتێک دەکێشن؟ چ بەڵایەک دێتە پێشیان و چی دەبینن و چی دەبیستن؟ خەڵکانی نەخوێندەوار و کەم خوێندەوار هاتوون تاکو برە پارەیەکییان دەستبکەوێت، نە مووچەیەکی دیاریکراویان هەیە و نە کاتێکی دیاری کراویان هەیە بۆ کارکردن، نە بیمەیان هەبوو نە ئایندەیەکی ڕوون، ئەمانە لەو کوردانە بوون کە بەشەرەفەوە دەژیان و کەرامەتی خۆیان دەپاراست.

لە ساڵی (١٣٦٥-١٩٨٦) سەرپەرشتی لێکۆڵینەوەیەکم دەکرد لەسەر کۆچکردنی گوندەکانی خۆراسانی گەورە بۆ شارەکان، بۆ زیاتر تێگەیشتن و هەستکردن بەو کۆچکردنە نزیکەی یەک مانگ هەر شەوە و لە کاروانسەرایەک و لە کوخێکی تاران بووم. دەوروبەری مەیدانی ئەرجەنتینی ئێستا، ئەو کاتە چۆڵەوانی بوو. هەندێک کەس لەوێ کوخیان دروستکرد بوو و تێیدا دەژیان. چەندین شەو و ڕۆژ لەوێ کارم کرد، لەکاروانسەراکانی باشووری تاران تاکو نیوە شەو لە لای ئەو کوڕە گەنجانە بووم کە بۆ کارکردن هاتبوون بۆ تاران. چەندین شەو لە کاروانسەراکاندا خەریکی لێکۆڵینەوە بووم. لە هەر ژوورێکدا (٢٠-٤٠) کەس لەسەر کارتۆن دەنووستن. ئەمانە ژیانێکی زۆر دژواریان هەبوو. زۆربەی زۆری ئەو کۆچەریی و لادێییانەی کە چووبوون بۆ شارەکان بەرەی خۆیان بەئاودا دابوو، لە ترسی برسێتی ڕایانکرد بوو، تاکو بتوانن پارووە نانێک بۆ ماڵ و منداڵەکانیان بەدەستبهێنن، هەوڵیان دەدا لە شوێنێکدا کار بکەن. هەر بەو هۆیەشەوە چەندین ئافات بەسەر ژن و منداڵەکانیاندا دەهات. ئەوان ژنە گەنجەکانی خۆیان جێدەهێشت و ماوەی شەش مانگ، شەش مانگ دەچوون بۆ شار. من بە هۆی کارەکەمەوە و پەیوەندیم بە گوند و هۆزەکانەوە هەزاران یادەوەریی خۆش و سەدان یادەوەریی ناخۆسم لایە. ئایا ڕۆژێک دێت هەموو ئەوانە بنووسم و بڵاویان بکەمەوە. ئێستا چلوهەشت ساڵ بەسەر ئەو ڕۆژگارەدا تێپەڕیووە. لە زانکۆی فیردەوسی مەشهەد وانەم دەگوتەوە، بە هۆی هاوڕێیانی خەڵکی بۆجنووردەوە بیستم کە برزوو لە بازاڕی تاراندا کاروبارێکی باشی هەیە و شوێنی بازرگانییەکەشیان پێگوتبووم. ڕۆژێک لە بازاڕی تاران کارم هەبوو. حەزمکرد سەردانێکی برزوو بکەم، ساڵی (١٣٨١-٢٠٠٢) بوو بیستوپێنج ساڵ بوو یەکترمان نەبینی بوو، من لە ساڵی (١٣٥٦-١٩٧٧) بەدواوە نەمبینی بوو. سڵاوم لێکرد، بەڵام ئەو منی نەناسیەوە، کاتێک خۆم پێناساند باوەشی پێداکردم و لە زەوییەوە بڵندی کردم، ئەو ببوو بە ملیاردێر. کۆمپانیای هاوردە و ناردنی هەبوو، نووسینگەیەکی لەنێو بازاڕی تاران و نووسینگەیەکیشی لەمەلا سەدر هەبوو. بانگی کرد ئەسغەر، ئەسغەر وەرە موهەندیس هاتووە. هەمان ئەسغەری شوان بوو. ئەسغەر پیر ببوو چاودێری دوکانە بازرگانیەکانی برزووی دەکرد. لە ئەسغەرم پرسی ژیانت چۆنە؟ گوتی خودا تەمەنی برزوو خان درێژ بکات، هاوکارییەکی زۆرم دەکات. ئەو خانوویەکی دوو قاتی لە نزیک کەرەج هەبوو، بەیانیان زوو دەهات بۆ بازاڕ و ئێواران دەگەڕایەوە بۆ ماڵەوە. زۆرترین داهاتی لەسەر ئەو شاگردانەیە بوو کە وەریدەگرت. دەیگوت ماوەیەکی زۆر لە دوکانەکانی برزوو کاری کۆڵبەری کردووە، بەڵام چەند

ساڵێکە پیر بووە و چا دەگێڕێت.. (٧-٨) کەس لەو منداڵانەی سەردەمی کۆچەریی لە بازاڕەکەدا بوون و کاری کۆڵبەرییان دەکرد، چەند کەسێکی تریان کاری بەنایی و کرێکارییان دەکرد، چەند کەسێکیشیان پیر ببوون. غەفاریش گوللە باران کرابوو. عەبداڵیش خەریکی ئاژەڵداریی بوو نەهاتبوو بۆ شار. فەریبورز شاگردی چایخانە بوو. ئەو هاوڕێیانەی ئەسغەر کە لە خانووەکەدا بەیەکەوە دەژیان، پاش بیستوپێنج ساڵ مانەوەیان لەتاراندا، هیچ یەکێکیان باری ئابوورییان باش نەببوو. تەنها بە مەمرە و مەژی دەژیان، تەنها برزوو خۆی پێگەیاند بوو. سێ کەسی تریان لە کاروکاسبیدا سەرکەوتو بوون. برزوو بۆ نانخواردنی نیوەڕۆ لە نووسینگەکەی مەلا سەدر میوان داری لێکردم. لەوێ دوکانێکی گەورەی هەبوو، بە چەندین نووسەر و وەرگێڕەوە. خۆشی ببوو بە حاجی، هەواڵی هەمووانم لێپرسی ئاگای لەهەمووان بوو. چوار منداڵی عەلی خان لە لەندەن بوون، چەند کەسێکیشیان لە تاران بوون. ئەسەد لە بۆجنوورد بوو. گوتم حاجی ئاغا هەندێک باسی ژیانی خۆتم بۆ بکە. گوتی ئاغای دکتۆر شەو وەرە بۆ ماڵی خۆمان، هەموو شتێک دەبینیت و هەموو شتێکت پێدەڵێم. برزوو گوتی ئێستاش هەر ئەو کەسەم کە هەموو شتێکم دەخوارد، بەڵام باوەڕم بە هیچ شتێک نییە جگە لە پارە نەبێت. برزوو کەسێکی وریا بوو خوێندەوارییەکی باشی نەبوو، بەڵام لە نووسین و خوێندنەوە و کرین و فرۆشتن سەری دەردەکرد. پرسیاری ئەو کەسانەم لێکرد کە لەلای ئەو میوەیان دەفرۆشت. گوتی هەندێکیان مردوون و هەندێکیان گەڕاونەتەوە بۆ بۆجنوورد، چەند کەسێکیان ئالودەببوون و بوون بە سواڵکەر. سێ کەسیش لە کار و کاسبیدا سەرکەوتوو بوون. ئەویش هەمان قسەکانی ئەسغەری بۆ کردم. پاشان ژمارەی تەلەفۆنی لەندەنی پەری خانمی پێدام، بەڵام تاکو ئێستاش تەلەفۆنم بۆ نەکردووە. ئەو ڕۆژە نە چووم بۆ ماڵی برزوو، لە بەهاری ساڵی (١٣٩١-٢٠١٢) بۆ زانینی هەواڵی «یەلە» و مەڕاسیمی شووکردنی کچی برزوو شەوی دواتر چووم بۆ ماڵیان.

## دیسانەوە بێژەن

(٢٠ی فەروەردینی ١٣٤٩=٩-٤-١٩٧٠) ڕۆیشتم بۆ تورکمان سەحرا. بێژەن لەوێ خانێکی تەواو بوو، پێش سەرما سەختەکە ئەو لەگەردەنەی شەلەمی ئاودیو ببوو. ئەو تەنها یەک مەڕیشی نەفەوتا بوو. لە دوای سەرماکە ڕۆیشتبوو بۆ گوندەکانی دەوروبەر.

هەندێک لەو کەسانەی کە زۆربەی ئاژەڵەکانیان تێداچووبوون، ئاژەڵی کەمیان

بۆ مابووەوە، ویستبوویان ئاژەڵەکانیان بەرەڵا بکەن. بێژەن ئەو ئاژەڵانەی لێکڕی بوونەوە. مێگەلەکەی گەیشت بووە (٧٠٠) سەر. گوتم تۆ لە وشکە ساڵی و سەرما ناترسیت؟ گوتی من عاشقی مەڕم، مەڕیش ماڵی بایە، بۆیە پێویستە زۆر ئاگاداربم. ئەو هێشتا دەیگوت مەڕێک بە هەموو دونیا ناگۆڕمەوە. ساڵی (١٣٦٥-١٩٨٦) لە شێروان بەدوای بێژەندا دەگەڕام، زانیم لە یەکێک لەگوندەکانی شێروان نیشتەجێ بووە. کاتێک دۆزییمەوە خەریکی چنینی باخە سێوەکەی بوو، نیوەڕۆ میوانی ئەو بووم. گوتم بێژەن لەبیرت دێت دەتگوت «مەڕێک بە هەموو دونیا ناگۆڕمەوە». چۆن بوو ئێستا بوویتە جوتیار و کاری کشتوکاڵی دەکەیت؟ گوتی موهەندیس گێل بووم، نەمدەزانی مەڕ زیندە ماڵە، تەنانەت ناتوانی نیو ڕۆژیش بەرەڵای بکەیت و ئاگاداری نەکەیت، من ئەو کاتە زۆر شەکەت و ماندوو بووم، پشوویەکم بەخۆم نەدەدا، ئێستا کە کشتوکاڵ و باخداری دەکەم ساڵی سێ چوار مانگ پشوو دەدەم، لەگەڵ ژن و منداڵەکانمدا دەڕۆین بۆ گەشت و سەیران، لە ماوەی سی‌وپێنج ساڵ کاری ئاژەڵدارییمدا تەنها یەکجار ڕۆیشتووم بۆ تاران و مەشهەد، ئێستا لەگەڵ ژن و منداڵەکانمدا ساڵی چەند جارێک دەچین بۆ تاران و مەشهەد، هەموو ساڵێکیش دەڕۆین بۆ باکوور بۆ کەناری دەریا.

ساڵی (١٣٧٦-١٩٩٧) لێکۆڵینەوە لەسەر چۆنییەتی ئاوی بەربەستی (بازەرو) ی شێروان لە ژێر چاودێری مندا بوو. بە دوای بێژەندا گەڕام، بەڵام بێژەنێکی ترم دۆزییەوە، بە ناوی بێژەن ئەقدەسییەوە، ئەویش کۆچەریی بوو، بەڵام وازی لە کۆچەریتی هێنابوو. خەریکی کاری کشتوکاڵ بوو. لەگەڵ چەند هاوڕێیەکمدا ڕۆیشتم بۆ ماڵی بێژەنی ئەقدەسی. هەواڵی بێژەنی پاڵەوانم لێپرسی. گوتی ئەو لە بۆجنووردە و نووسینگەی کڕین و فرۆشتنی خانوو زەوی هەیە. کاتێک ڕۆیشتم بۆ بۆجنوورد نووسینگەی بێژەنم دۆزییەوە، کەسێک لە نووسینگەکە بوو. گوتی چیت دەوێت؟ خانوو، زەوی، چیت دەوێت؟ گوتم من کارم بەبێژەن هەیە. گوتی پاڵەوان زۆرترین کات لە تارانە، ئەو لێرە نووسینگەی هەیە، لە مانگێکدا دو سێ جار سەردانی ئێرە دەکاتەوە بۆ چۆنێتی ئیش و کارەکان. منیش هەر لەوێوە بە تەلەفۆن قسەم لەگەڵ بێژەندا کرد.

ساڵی (١٣٧٨-١٩٩٩) لە بۆجنوورد چاوم بە بێژەن کەوتەوە. زۆر خۆشحاڵ بوو بە بینینم، منی بردەوە بۆ ماڵەوە. گوتم وازت لەکاری کشتوکاڵی هێناوە؟ گوتی موهەندیس گێل بووم، نەمدەزانی چەند ساڵێک هاتمە شێروان تێگەیشتم شێروان بچووکە و کار و کاسبییەکەم هێنایە بۆجنوورد. پاشان زانیم بۆجنووردیش بچووکە بۆیە ڕۆیشتم بۆ تاران. ئێستا تەمەنم پەنجاوچوار ساڵە. کوڕەکەم دەڵێت تارانیش بچووکە.

کاتێک خەریکی نووسینی ئەم بەشەی بیرەوەریەکانم بووم، لە پاییزی ساڵی (١٣٩٠-٢٠١١) دا، شەوێک لە کۆشکە زۆر جوان و گەورەکەی بێژەندا لە تاران، لەیەکێک لەکۆلانەکانی شەقامی شیراز شەوێکی یادەوەریی خۆش بوو، لەگەڵ ماڵێکی کوردا کە منداڵە چواردە ساڵییەکەشیان لە زمانی کوردی تێدەگەیشت، بەڵام نەیدەتوانی قسەی پێبکات. جەوادی کوڕی بێژەن زۆر بە باشی بە ئینگلیزی قسەی دەکرد، شارەزایی زیاتر لە سەد کەناڵی سەتەلایتدا هەبوو، چەند هاوڕێیەکی هەبوون کە هیچیان ئێرانی نەبوون، لەگەڵ هاوڕێکانی هەفتانە جارێک پێکەوە کۆدەبوونەوە و بە ئینگلیزی قسەیان لەگەڵ یەکتریدا دەکرد. بێژەن دەیگوت ڕۆژگارێک بوو من ناوی سەد مەڕ و بزنم دەزانی، بەڵام ئێستا جەواد ناوی سەد کەناڵی سەتەلایت شارەزایە. بێژەن دەستێکی بە سەری کوڕەکەیدا هێنا و گوتی کاتێک من تەمەنم چواردە ساڵ بوو لەو کێوە لەگەڵ بزن و مەڕدا کۆبوونەوەم دەکرد، کەچی ئێستا کوڕەکەم لەگەڵ خەڵکانی هۆڵەندی و هیندی و کۆریایی و ڕووسی کۆبوونەوە دەکات. کاتێک من لەو کێوە بووم لەگەڵ خودادا ڕازونیازی خۆم باسدەکرد، بەڵام ئێستا ئەم کوڕەم ڕۆژی یەک کاتژمێر لەگەڵ (مارلین) کە کچێکی هۆڵەندییە قسە دەکات. گوڵسەنەم گوتی ئەوکاتەی ئێمە کۆچەریی بووین و لەڕەشماڵدا دەژیاین بە پێنج مانگ جارێک نەدەچووین بۆ حەمام، بەڵام ئێستا سەردەم گۆڕاوە. گوڵسەنەمیش دەڕۆیشت بۆ دەرەوە بۆ فێربونی زمانی ئینگلیزی. کوڕە گەورەکەی بێژەن لە ساڵی (١٣٨١-٢٠٠٢) بە دواوە لە سوید دەژیا. بێژەن و گوڵسەنەم لە ماوەی نۆ ساڵدا چوار جار چوو بوون بۆ سوید. دوایین قسەی بێژەن ئەوە بوو گوتی تارانیش بچووکە. گوتم وا دەزانیت سویدیش بچووکە و دەتەوێت بچیت بۆ شوێنێکی گەورەتر. بەڵێ ئەم جیهانە بچووکە. کەسێک کە لە ساڵی (١٣٥٠-١٩٧١) دا لە هەموو ئەم جیهانەدا تەنها سەر کێوەکانی قوچان تاکو دەشتی تورکمان سەحرا شارەزا بوو. لە ساڵی (١٣٩٠-٢٠١١) دا دەڵێت وڵاتی سویدیش بچووکە.

## یەلە

ئەو شەوەی کە لە ماڵی بێژەن بووم، هەواڵی یەلەم لێپرسی، بێژەن گوتی «یەلە»، لە وڵاتی فەڕەنسایە و دەڵێن ئەندازیارێکی پێشکەوتووی دروستکردنی فڕۆکەیە. بێژەن گوتی برزوو هەواڵی «یەلە»ی لایە. لە بێژەنم پرسی ئێستا ئێوە لەگەڵ ئەو کەس و خزم وناسیاوە کۆنانە یەکتری دەبینن، هیچ کاتێک بە یەکەوە کۆدەبنەوە؟ گوتی تەنها ئەگەر کەسێک بمرێت هەموومان ئاگاداردەکرێین و لە پرسەکەیدا یەکتری دەبینین.

گوتی ئێمە لە تاراندا ئاهەنگی زەماوەندی کوڕ و کچەکانمان جیاوازە. دەوڵەمەندەکان ماڵە هەژارەکان بانگهێشت ناکەن بۆ زەماوەندەکانیان. دەوڵەمەندەکانیش ناچن بۆ زەماوەندی ماڵە هەژارەکان، بەڵام لە مەڕاسیمی ب ەخاک سپاردنی مردووەکانمان و پرسەکاندا هەموو لایەک بەشداری دەکەن. کاتێک بێژەن گوتی «یەلە» ئەندازیارە و فڕۆکە دروستدەکات حەزمکرد چارەنووسی ئەو بزانم. هەر بۆیەش تەلەفۆنم بۆ برزوو کرد و پێکەوە قسەمان کرد، پاش هەواڵ پرسینی یەکتری و هەندێک باسوخواس بڕیار بوو لە کاتێکی تردا تەلەفۆنی بۆ بکەمەوە، بەڵام وا ڕێکەوت پاش دە ساڵ تەلەفۆنم بۆ کردەوە، ئەمجارەیان برزوو گوتی پاش چەند ڕۆژێکی تر زەماوەندی شووکردنی کچە بچووکەکەمە. دەبێت تۆش ئامادە بیت. منیش بەڵێنم پێدا کە ئامادەبم، لە کاتی خۆیدا چووم بۆ زەماوەندەکە. باسی چۆنێتی زەماوەندی کچەکەی برزوو ناکەم، چونکە بە هیچ جۆرێک لە زەماوەندی کوردەکانی خۆراسان نەدەچوو، هەروەها لەو زەماوەندانەش نەدەچوو کەمن بۆ کوڕ و کچی خۆمم ڕێکخستبوو. ئاهەنگی زەماوەندەکە لە یەکێک لەباخەکانی (لەویزان) بوو. تا گەیشتمە شوێنی زەماوەندەکە چەند جارێک داوای کارتی داوەتنامەیان لێکردم. واتە لە چەند پرسگەیەکەوە تێپەڕیم، هەڵبەت لەو ناوەدا یەک باخ نەبوو. بەڵکو چەندین باخ هەبوون. لە ئاهەنگەکەدا پارەیەکی زۆر خەرجکرا بوو، تیپی مۆسیقا و هەڵپەڕکی لەسەر شێوەی ئەورووپا ڕێکخرابوو، وام هەستدەکرد ئەو شەوە برزوو ئەوەندەی سێسەد زەماوەندی ناو کۆچەرییەکان پارەی خەرجکردبێت، یەک ئۆتۆمبێلی تازەی مۆدێل بەرزی جۆری (BMW) ی پێشکەش بە زاوا کرد. باوک و دایک و بنەماڵەی زاواش دیاریەکی زۆریان پێشکەش بە بووک کرد. بە هیچ شێوەیەک زەماوەندەکەیان لە زەماوەندی کۆچەرییەکان نەدەچوو. بێژەن و گوڵسەنەمیش هاتبوون بۆ زەماوەندەکە. گوڵسەنەم شێوازی زەماوەندەکەی زۆر پێناخۆشبوو، ئەو لە ساڵی (١٣٩٠- ٢٠١١) تەمەنی نزیکەی شەست ساڵ دەبوو، چەند ساڵ بوو لە تاران دەژیا، چەند جارێکیش ڕۆیشتبوو بۆ سوید. گوڵسەنەم لە سەر مۆدێلی تازە دەژیا، بەڵام خووڕەوشتی کۆچەریی و ئیسلامیانە بوو، سەرئێشەیەکی توندی کرد بە بەهانە و بە زوویی زەماوەندەکەی جێهێشت، بەڵام برزوو تا کاتژمێری (٢:٣٠) ی شەو مایەوە. برزوو، منی بە کوڕەکەی خۆی ناساند، کوڕەکەی تەمەنی سی ساڵ دەبوو، ئەندازیاری کارەبا بوو. برزوو بە کوڕەکەی گوت. ئاغای پاپۆلی زانیاری دەوێت لە بارەی «یەلە»وە. ئەویش ناونیشان و ژمارەی تەلەفۆن و ئیمەیلی «یەلە»ی پێدام. «یەلە» ناوی خۆی گۆڕی بوو، ناوێکی فەڕەنسی لە خۆی نابوو، بەڵام هاوڕێ کۆنەکانی هەر بە «یەلە»

ناویان دەبرد. کوڕەکەی برزوو هیچ زانیارییەکی دەربارەی ڕابردوی «یەلە» نەدەزانی، نەیدەزانی «یەلە» چۆن گەیشتووەتە وڵاتی فەرەنسا؟ کاتژمێر (٢:٣٠) ی دوای نیوەی شەو ویستم خوداحافیزیی لە برزوو بکەم، گوتم کوڕەکەت زانیاری تەواوی لەسەر ڕابردووی «یەلە» نییە. هەر بۆیە بڕیارماندا جارێکی تر کە هاتمەوە بۆ تاران یەکتری ببینین. پاش مانگێک تەلەفۆنم بۆ برزوو کرد. ئەویش بانگهێشتی کردم بۆ ماڵی خۆیان. من ناتوانم باسی ماڵ و ژیانی برزوو بکەم، پاش چل ساڵ خزمەتی ماموستایی لە زانکۆ لە خانوویەکی (١٦٠) مەتریدا دەژیم. برزوو لە خانوویەکدا دەژیا لانیکەم دووسەد ئەوەندەی خانووەکەی ئێمە نرخی هەبوو. کەلوپەلی ناو ماڵەکەشی نزیکەی پێنجسەد ئەوەندەی کەلوپەلی ماڵی ئێمە نرخی هەبوو. دیارە کار و کاسبی و بازاڕێکی باشی هەبوو، مامەڵەی نێودەوڵەتی داهاتێکی باشی هەیە. خودای گەورە زیاتری پێبدات. منیش لەم ژینەی خۆم ڕازیـم. بە برزووم گوت باسی «یەلە»م بۆ بکات. ئەویش گوتی «یەلە» لە کۆتایی ساڵی (١٣٥٨-١٩٧٩) دا هاتبوو بۆ تاران و هات بۆماڵی حاجی عەلی خان، ئەو کاتە منیش لە ماڵی خان بووم. «یەلە» گوتی بەهۆی شۆڕشەوە کچە خۆبەخشە فەرەنسییەکان گەڕاونەتەوە بۆ فەرەنسا. ئەوان ویستویانە «یەلە»ش لەگەڵ خۆیاندا ببەن بۆ فەرەنسا، بەڵام ناسنامەی نەبووە هەربۆیەش نەیتوانیوە پاسپۆرت وەربگرێت. «یەلە» زۆر هەوڵی دابوو، بەڵام ناسنامەی بۆ دەرنەکرابوو. کچە فەرەنسییەکان گوتبوویان ئێمە ناتوانین بە بێ پاسپۆرت و ناسانامە تۆ لەگەڵ خۆماندا ببەین بۆ فەرەنسا. کەسێک پێشنیاری بۆ کردبوون پاسپۆرتی تەزویری بۆ دروستبکەن، یاخود پاسپۆرتێک بکڕێت. کچە فەرەنسییەکان گوتبوویان ئێمە لەگەڵ ئەوەدانین تۆ پاسپۆرتی تەزویر دەربکەیت، پێویستە بۆخۆت هەوڵبدەیت بە شێوەیەکی یاسایی ناسنامە و پاسپۆرتی خۆت وەربگریت. «یەلە» داوای هاوکاری لە عەلی خان کردبوو، ئەویش بە منی گوت برزوو تۆ دەتوانیت چی بۆ بکەیت؟ برزوو گوتی ئەو کاتە من لەگەڵ غەفاردا قسەم نەبوو، هیچ پەیوەندییەکیشم لەگەڵیدا نەبوو، ئەو کاری قاچاخچێتی دەکرد، بەڵام دەمزانی لەکوێیە؟ دەمزانی ئەو کارە لە دەسەڵاتی غەفاردایە. منیش تەلەفۆنم بۆ کرد و باسی ئەو کێشەیەی «یەلە»م بۆ کرد، ئەویش بەڵێنی دا کارەکەی بۆ جێبەجێ بکات. نازانم غەفار چۆن پاسپۆرت و ناسنامەی بۆ «یەلە» دەرکرد. سەرەتای ساڵی (١٣٥٩-١٩٨٠) «یەلە» بۆ خوداحافیزیی هات بۆلای من و عەلی خان. گوتی دوو ڕۆژی تر دەڕۆم بۆ فەرەنسا. دەزانم پاشان لە فەرەنسا خوێندویەتی وبووە بە ئەندازیارێکی زۆر باش و لە کارگەی دروستکردنی فڕۆکەدا کاردەکات. لەگەڵ مندا پەیوەندی تەلەفۆنی

هەیە و ساڵی چەند جارێک لە هەواڵی یەکتری دەپرسین. لەم دواییەشدا کوڕەکەم ویستی بۆ تەواوکردنی خوێندن بچێت بۆ فەڕەنسا، هەر بۆیەش داوای ڕێنمایی لە «یەلە» کرد، ئێستا ئەوان پەیوەندییەکی باشیان پێکەوە هەیە.

لە مانگی (شەهریوەری ١٣٩١- ئەیلولی٢٠١٢) دا، چووم بۆ فەڕەنسا بۆ سەردانی کچەکەم. هومای پاپۆلی یەزدی کە خوێندکاری ماجستێری بایۆلۆجی بوو لە زانکۆی (مۆنپلیە). لەوێوە تەلەفۆنم کرد بۆ «یەلە»، تەلەفۆنەکەی داخرا بوو، بەڵام مۆبایلەکەی لەسەر زەنگی ئاگادارکردنەوە بوو، منیش پەیامێکم بۆ نارد، پاش دوو کاتژمێر پەیوەندی پێوە کردمەوە و بانگهێشتی کردم بۆ ماڵی خۆیان، لە شاری (تولوز) کە لەو شارەدا دەژیا. نێوانی مۆنپلیە تاکو تولوز زۆر دوور نییە. شەو لە ماڵی «یەلە» بووم. ماڵێکی سادەی هەبوو بە چەند هەزار کتێبێکەوە. کتێبخانەکەی جۆرەها کتێبی تیابوو لەبارەی فڕین و فڕۆکە و ئاسمان. جگە لەوەش کتێبی فەلسەفی و ڕۆمان و دەرونزانی و زانستی ئایینی مەسیحی هەبوو. هاوسەرەکەشی ئەندازیارێکی مەسیحی بوو هەر خەڵکی فەڕەنسا بوو. دوو منداڵیشی هەبوو، هەردوکیان گەورە ببوون. یەکێکیان لەشاری (گرۆنۆبڵ) دەیخوێند و ئەویتریشیان لە مانجستێری بریتانیا دەیخوێند. کتێبی «شازادەی حەمام»م وەک دیاریەک بۆ برد بوو. «یەلە» کاتێک زانی من خەریکی نووسینەوەی یادەوەرییەکانم و دەمەوێت داستانێکی کۆچی هۆزەکان و ئەو سەرما و سەهۆڵبەندانە بنووسمەوە.

ئەویش گوتی ئێستا لە سیرەوە تا پیاز باسی بەسەرهاتی خۆمت بۆ دەکەم. گوتی هەتا ئەو ڕۆژەی کە هاتمە گوندەکە بۆلای کچە خۆبەخشەکان خۆت ئاگاداریت. من لە گوندەکەدا لەلای کچە خۆبەخشەکان مامەوە و کەوتمە لای ئەوان، ئەوانیش منیان وەک منداڵی خۆیان چاودێری دەکرد. بڕیاریاندا یەکێکیان نووسین و خوێندنی فەڕەنسیم فێربکات، یەکێکیان ژمێریاریم فێربکات، ئەوی تریشیان مێژووم فێربکات. من ناسنامەم نەبوو. نەدەکرا لە قوتابخانەی گوندەکە ناونووس بکرێم، بەڵام لەگەڵ بەڕیوەبەری قوتابخانەکە قسەیانکرد کە منیش بچمە پۆلەوە وەکو خوێندکارانی تر دانیشم و وانە بخوێنم. هەموو ساڵێک من لە قوتابخانە یەکەم دەبووم. خۆبەخشە فەڕەنسییەکان ژیانێکی زۆر باشیان بۆ دابین کردبووم. بەیانیان زوو لەخەو هەڵیان دەستاندم، دەیانگوت دەبێت دوو جار بە چوار دەوری گوندەکەدا ڕابکەیت، گوندەکە گەورە نەبوو بەڵام واهەستدەکەم بە باخچەکانی چواردەوریەوە سێ کم دەبوو. هەموو ڕۆژێک من نزیکەی شەش کم ڕاکردنم دەکرد. پاشان دەبوو بچمە حەمام و خۆم بشۆم و پاشان

نانی بەیانی بخۆم و بڕۆم بۆ قوتابخانە. دوا نیوەڕوانش دەبوو لەسەر ئەوبەرنامەیەی کە بۆیان دانابووم کارم بکردایە. زمانی فەرەنسی و ژمارە و مێژووم دەخوێند. پاشان کە گەورەتر بووم دەبوو بەرنامەی وانەکانی فەرەنسام بخوێندایە. هەموو کتێبەکانی خوێندنی قوتابخانەی فەرەنسییان بۆ هێنابووم. کاتێک تەمەنم گەیشتە دە ساڵ کچە خۆبەخشەکان گوتیان تۆ موسڵمانیت دەبێت لەسەر ئایینەکەی خۆت نوێژ بکەیت. چەند ماڵێکی ئایینی لە گوندەکەدا هەبوون، خۆبەخشە فەرەنسییەکان داوایان لێکردن کە من فێری نوێژکردن بکەن. کاتێک تەمەنم گەیشتە چواردە ساڵ کچەکان هەموو ڕۆژێک کاتی مەلا بانگدان منیان هەڵدەستان بۆ نوێژکردن، دەیانگوت هەڵسە نوێژەکەت بکە. ئەوانیش بۆخۆیان خەریکی نزا کردن بوون لەسەر ئایینی خۆیان.

من لە کارەکانی کشتوکاڵ و باخداری و ئاژەڵداریی و دەرمانگەدا هاوکاری ئەوانم دەکرد. سەردانی نەخۆشەکانم دەکرد و دەرمان و پێداویستیەکانم بۆدەبردن. کاتێک تەمەنم بوو بە دوازدە ساڵ ئەو کچانە منیان لەگەڵ خۆیاندا دەبرد بۆ گەشت. چەندین جار لەگەڵیاندا ڕۆیشتم بۆ تاران، ئەسفەهان، مەشهەد. زاڵبوونم بەسەر زمانی فەرەنسیدا، بووە هۆی ئەوەی زۆر کەسی فەرەنسی بناسم. من تەمەنم لە دەوروبەری چواردە ساڵیدا بوو کە زۆرێک لە بەرهەمەکانی، مۆلێر، فیکتۆرهۆگۆ، تەنانەت لێکۆڵینەوەکانی ئەفلاتون و ئەرستۆم بە زمانی فەرەنسی خوێندەوە. شارەزاییەکی باشم لە مێژووی فەرەنسا، ئیتالیا، یۆنان و تەواوی ئەوروپادا پەیدا کرد بوو. کچە خۆبەخشەکان بەبێ ئەوەی فشارم بخەنە سەر کارێکی وایانکرد بوو کەمن ڕۆژانە لانیکەم (٥-٦) کاتژمێر کتێب بخوێنمەوە. بەشی هەرە زۆری ئینجیل و لێکدانەوەکانیم لەبەر بوو. هاوکات لەلای مەلای گوندەکە فێری قورئان خوێندنیش بووم. ئەو کچانە کارێکیان کردبوو کە من هەفتەی دوو ڕۆژ دوای نیوەڕوان بچم بۆ بنکەی ئاسمانی شائاباد بۆ فێربوونی زمانی ئینگلیزی، لەوێ چەند کەسێکی ئەمریکی لێبوو، یەکێک لەوان بڕیاریدا کە فێری زمانی ئینگلیزیم بکات. لە پاش ماوەیەک بەباشی فێری زمانی ئینگلیزی بووم. کچەکان زۆر دڵسۆز و میهرەبان بوون لەگەڵمدا، دەیانویست هەموو شتێکم فێربکەن. خەڵکی گوندەکە کاری ئاژەڵداریی و کشتوکاڵیان دەکرد. ئەو خوشکانە کارێکیان کرد کە من تێکەڵاوی ئەو خەڵکە ببم و لەوانەوە فێری کاری ئاژەڵداریی و کشتوکاڵ ببم. لە ساڵی (١٣٥٢-١٩٧٣) دا من تەمەنم دوازدە ساڵ بوو. بەڕێز (هۆبەرت دومورا) ی فەرەنسی هات بۆگوندەکە، نزیکەی سێ مانگ لەوێ مایەوە لەبارەی فراوانبوونی گوندەکە و باری نەخۆشەکان لێکۆڵینەوەی کرد، ئەوماوەیە من بووم بە وەرگێڕی. ئەو بەڕێزە چەندین

کتێبی جوگرافیایی و کۆمەڵناسی و کشتوکاڵیی لەگەڵ خۆیدا هێنا بوو. من لە ماوەیەکی زۆر کەمدا ئەو کتێبانەم خوێندەوە. کاتێک زانی من ئەو کتێبانەم خوێندۆتەوە، زیاتر منی هاندا بۆ خوێندنەوە، لە گوندەکەوە سەردانێکی تارانی کرد لەگەڕانەوەیدا چەند کتێبێکی بۆهێنام. لەسەردانێکی تریدا بۆ تاران منی لەگەڵ خۆیدا برد، لەوێ منی برد بۆ کتێبخانەیەکی گەورە کە جۆرەها کتێبی ئینگلیزی و فەڕەنسی تێدا بوو. منی کرد بە ئەندامی ئەو کتێبخانەیە. ئیتر من دەمتوانی لەوێ کتێب وەربگرم بۆ خوێندنەوە و دەستم بە هەموو جۆرە کتێبێک دەگەیشت.

هەر جارێکیش کچە فەڕەنسییەکان دەچوون بۆ تاران هەرکتێبێک من پێویستم بووایە بۆیان دەهێنام، لە هەمان کاتدا بنکەی ئاسمانی ئەمریکاییەکانیش کتێبیان پێدەدام بۆ خوێندنەوە، بەڵام کتێبەکانی بنکەکە زیاتر هونەریی بوون. من لە تەمەنی (١٥-١٦)ساڵیدا بەباشی فێری زمانی ئینگلیزی و فەڕەنسی ببووم. لە تاقیکردنەوەکانی قوتابخانەش بەشداریمدەکرد، بەڵام بەهۆی نەبوونی ناسنامەوە لە قوتابخانە ناوم تۆمارنەکرا. لەهەمان کاتدا بەناز پەروەردە نەکرام، دەبوو کاربکەم لەدوای تەمەنی پازدە ساڵیەوە کچە فەڕەنسییەکان لە بەرامبەر ئەو کارەی دەمکرد مووچەیەکیان بۆ دابینکردم. دەبوو خۆم خەرجیی خۆم بکێشم. ئەوان پێیانگوتم تۆ ئیتر گەورە بوویت، پێویستە بزانیت لەم جیهانەدا هیچ شتێک بە بەلاش نییە، ئەگەر بتەوێت دوارۆژێکی باشت بۆ دەستەبەر بکرێت و بە خۆشی بژیت دەبێت کاربکەیت. من لە ژمێریاری گوندەکەدا کارم دەکرد و مووچەیان پێدەدام. ئەوکاتە هەستم بەکێشەی بێناسنامەیی نەدەکرد، بەڕیوەبەری قوتابخانەکە چەند جارێک هەوڵی بۆ دابووم بۆ وەرگرتنی ناسنامە، بەڵام بەهۆی بوونی کێشەی ئیداری و بەتایبەت دووری گوندەکە لە بۆجنوورد کارەکەی بۆ ئەنجام نەدەدرا. کاتێک شۆڕش بەرپاکرا هەموو ئەو خەڵکە بیانیانەی لە ئێران بوون بە کچە فەڕەنسییەکانیشەوە گەڕانەوە بۆ وڵاتانی خۆیان. ئەو کچە فەڕەنسیانە دەیانویست منیش لەگەڵ خۆیاندا ببەن بۆ فەڕەنسا بۆیە منیش لەگەڵ ئەواندا هاتم بۆ تاران، ئەوان زۆر بە پەلە بوون دەیانویست هەرچی زووترە لە ئێران دەرچن و بڕۆن. منیش ناسنامەم نەبوو نەمدەتوانی پاسپۆرت وەربگرم، چونکە سەربازیم نەکردبوو. ئەگەر ناسنامەشم وەربگرتایە. بۆ وەرگرتنی پاسپۆرت دەبوو لە پێشدا بچم بۆ سەربازی، یا لە سەربازی ببەخشرێم. کەسێک پێشنیاری کرد بە پارە دەتوانم پاسپۆرتی تەزویر دەربکەم. کاتێک ئەوەم بە کچە فەڕەنسییەکان گوت ئەوان ئەوەیان قبوڵ نەکرد و گوتیان ناکرێت تۆ پاسپۆرتی تەزویرت هەبێت. بە هەرحاڵ ئەوان ڕۆیشتن و منیش بێکەس مامەوە. (٥-٦)

مانگ هاتوچۆم کرد نەمتوانی ناسنامە وەربگرم. لەکۆتاییدا سەردانی حاجی عەلی خانم کرد و ئەویش قسەی لەگەڵ برزوو کرد تاکو کارێکم بۆ بکات، برزووش منی بە غەفار سپارد، غەفاریش گوتی هەوڵ دەدەم ئەوکێشەیە چارەسەربکەم.

لەڕاپەڕینی ساڵی (١٣٥٧-١٩٧٨) دا هیچ کەسێک نەیدەتوانی بچێتە بەردەم فەرمانگەکان و بیەوێت کارێک بکات. پاش چەند ڕۆژێک غەفار بەیەک ناسنامە و کارتی خزمەتی سەربازی و شەهادەی دبلۆم و مۆڵەتی شۆفێری هات بۆلام گوتی فەرموو ئەوانە وەربگرە و بڕۆ خۆت داوای پاسپۆرت بکە. منیش وامزانی ئەم شتانە هی دزین و گوتم نامەوێت، ئەویش منی برد بۆ ماڵێک لە دێهاتەکانی دەوروبەری ڕامین، ماڵەکە پرسەیان هەبوو، خاوەنی ناسنامە و شتەکانی تر گەنجێکی بیستویەک ساڵ بوو، دوو ساڵ لەمن گەورەتر بوو. دووهەفتەبوو بەهۆی ڕووداوی ئۆتۆمبێلەوە مردبوو، بنەماڵەکەشی هەمووشتەکانیان بە غەفار فرۆشتبوو. غەفار گوتی ئێستا تێگەیشتی کە ئەم شتانە دزی نین، غەفار تەنها لەگەڵ یەک کەسدا قسەی کردبوو، ئەویش لەبری وێنەی مردووەکە وێنەی منی لەناسنامەکەدا بوو. ئیتر ئەوە بوو غەفار هاوکاری کردم و خۆشم پاسپۆرتم وەرگرت و ڕۆیشتم بەرەو پاریس، نازانم غەفار ئەو شتانەی بەچەند کڕیبوو و چەندەی خەرج کردبوو؟ هەر چەند هەوڵم دا هیچ پارەیەکی لێوەرنەگرتم. کاتێک بەڕێکەوتم عەلی خان و برزوو پێنج هەزار فەرەنگی فەرەنسیان پێدام.

کچە فەرەنسییەکان لە گوندێک دادەنیشتن لەنزیک (ئورلئان) من چووم بۆ لایان ئەوانیش لەو شارە خانوویەکیان بۆ بەکرێگرتم. من هەفتەی یەک ڕۆژ لەگەڵ ئەو کچانەدا بووم کچە فەرەنسییەکان زۆر هاوکاریانکردم تاکو توانیم شەهادەی دبلۆم وەربگرم، پاشان لە زانکۆ وەرگیرام. ساڵی یەکەمی خوێندن من یەکەمی کۆلێژ بووم، بۆیە خەرجیی خوێندنم چووە سەر زانکۆ. پاش چەند ساڵێک توانیم پولی تەکنیکی بە نمرەیەکی بەرز تەواو بکەم، بەڵام بەڕاستی زۆر شەکەت بووم، زۆربەی کات ڕۆژانە بیست کاتژمێر خەریکی وانە خوێندن بووم. لەکاتی خوێندندا لەکارگەیەکی بەرهەمهێنانی پارچەی فڕۆکەدا کارمدەکرد، پاش تەواوبوونی خوێندنیش هەر لە هەمان کارگە بووم بە فەرمانبەر. هەر لەوێش لەگەڵ هاوسەرەکەمدا یەکتریمان ناسی و زەماوەندمان کرد.

هاوسەرەکەم پیشەی میکانیکە، بەرهەمی زەماوەندشمان دوومنداڵە یەکێکیان لە مانچستەری بریتانیایە و ئەوی تریان لە گرنوبلە. «یەلە» گوتی دووان لەو کچە خۆبەخشانە کۆچی دواییان کردووە. ئەوی تریان تەمەنی نەوەد ساڵە و لە شاری (پەرواس) ی باشووری فەرەنسا دەژیت. «یەلە» گوتی لانیکەم مانگی جارێک دەچم بۆ

سەردانی.

ئەو شەوە تاکو بەیانی لەگەڵ «یەلە»دا پێکەوە قسەمان کرد. ئەو هەواڵی هەمووانی پرسی و لەساڵی (١٣٥٨-١٩٧٩) وە هەرگیز نەگەڕا بووەوە بۆ ئێران. گوتی لە ئێران هیچ کەسێکی نییە. نەمزانی ئەو هیچ لەبارەی غەفارەوە نازانێت، دواین جار کەباسی هاوکارییەکەی غەفاری کرد، گوتم خودا لێیخۆش بێت، ئەویش بەناڕەحەتییەوە گوتی بۆچی مەگەر مردووە؟ منیش ناچار بووم بەسەرهاتەکەی بۆ باسبکەم. بەم شیوەیە.

غەفار لە دەوروبەری ساڵی (١٣٦٧-١٩٨٨) دا بە هۆی کاری قاچاخچێتی تلیاکەوە گوللەباران کرا. «یەلە» دەستیکرد بەگریان و گوتی هەر جارێک هەواڵی غەفارم لە برزوو پرسیوە پێیدەگوتم قسەم لەگەڵیدا نییە و ئاگاداری نیم. ئەو ئاگاداری مردنی حاجی عەلی خان و ئەوانیتر بوو. گوتی دەزانیت بێژەن ئێستا لە تاران دادەنیشێت. ڕۆژی دواتر لەکاتی نانخواردنی بەیانیدا باسمان لە ئایین و مەزهەب دەکرد. «یەلە» گوتی من چەندین جار تەوراتم خوێندۆتەوە، جۆرەها لێکدانەویم لەدەمی ئەوسێ کچەوە بیستووە. هەندێک شارەزایم لەبارەی ئیسلامەوە هەیە. «یەلە» گوتی لەکارگەکەماندا ماوەیەکە بوداییەکان پڕوپاگەندە بۆ بودایی دەکەن و منیش زۆرشتم لەسەر ئەوانیش خوێندۆتەوە. «یەلە» گوتی من هیچ ئایینێکی تایبەتم نییە، بەڵام ئەخلاقی هەموو ئایینە گەورەکان پیادە دەکەم، گوتی من هەرگیز درۆناکەم، تەنها خاڵی ڕەش لەژیانی مندا ئەو ناسنامەیەیە کە هی کەسێکی مردووە و من بە شێوەیەکی نا یاسایی سوودم لێوەرگرتووە. من لەژیانمدا هەوڵدەدەم هەرگیز کەسێک ئازار نەدەم، هەرگیز تێکەڵاوی وتووێژی ئابووریی نەبووم، مافی هیچ کەسێکیشم نەخواردووە، من ئێستا خۆم و کارەکەم و کتێبەکانم و نووسینەکانم. «یەلە» گوتی ماوەیەک لەمەو پێش پێشنیاریان بۆ کردم بە مووچەیەکی زۆرەوە بڕۆم بۆ کارگەی دروستکردنی فڕۆکەی میراج کە فڕۆکەیەکی جەنگییە و بۆ کوشتنی خەڵک و سووتاندن و وێران کردنی ماڵی خەڵک بەکاردەهێنرێت، بۆیە بە نیوەی ئەو مووچەیە چوومە کارگەی دروستکردنی فڕۆکەی گەشتوگوزار، ئێستا لەوێ خەریکی کارکردنم، تاکو شەش مانگی ترخانەنشین دەبم. ئەو گوتی من خۆم داوام کردووە خانەنشین بکرێم، دەمەوێت کە ئێستا منداڵەکانم لێم دوورکەوتوونەتەوە لەگەڵ هاوسەرەکەمدا بڕۆین بۆ گەشتوگوزار. بەڵکو ڕۆژێک بۆمان هەڵکەوێت سەردانی کێوەکانی ئۆغاز و شێروان بکەم و سەردەمی ڕۆژانی پێپەتی و برسێتی و سواڵکردنی خۆم بەبیربهێنمەوە. ئەمە دواین وتەی «یەلە» بوو. کاتێک کە من خوداحافیزییم لێ کرد. گوتی بەڵکو ڕۆژێک بۆم بلوێت سەردانێکی کێوەکانی ئۆغاز

و شێروان بکەمەوە. تاکو هەژاری و سواڵکردنەکەی خۆم بیر بێتەوە.

من هەمیشە بیر لەوە دەکەمەوە ئەگەر ئەردۆش هەلێکی بۆ هەڵبکەوتایە ئەوا ئەویش دەبوو بە زانا و ئەستێرەناسیکی گەورەی جیهانی. چەندین هەزار ساڵە چ هێز و توانایەکی خەڵکانی کۆچەریی لەو دەشت و کێوەدا بە هەدەر چووە، بەڵام بە رێکەوت و بە هەوڵ و ماندووبوونیش کەسێکی وەک «یەلە»ش دروست دەبێت. پێویستە چەند هەزار کەسێک کۆچ بکەن و بە هەژاری و نەبوونی لە دەوروبەری شارەکانی تاران و مەشهەد و تەوریز بژین تا بە هەر دەردیسەرییەک بێت کەسانی وەکو «یەلە» و برزوو دەرکەون. من ئاگاداری ژیانی نزیکەی پەنجاوپێنج کەسم، لە پیاوانی ساڵی مەڕ قرانەکە، واتە ساڵی (١٣٤٨-١٩٦٩) و لە دوور و نزیکەوە دەیانناسم. نۆ کەس لەوانە لە کارو کاسبیدا سەرکەوتوو بوون. یەکێکیش لەوانە بووە بە زانایەکی بلیمەت کە ئەویش «یەلە»یە. غەفاریش قاچاخچی بوو گوولـلەباران کرا. (٧ -٨) کەسیشیان بە هەژاری و نەبوونی لە دەوروبەری شارەکاندا مردوون. چەند کەسێکیشیان گەڕاونەتەوە بۆ ناو هەواری کۆچەرییەکان. ئەوانی تریش بە مەمرەومەژی دەژین و ژیان دەبەنە سەر.

هەرکاتێک وشکە ساڵییەک لە باشووری خۆراسان ڕوودەدات ژمارەی عەرەبانەی دەستی لە شای مەشهەد زیاد دەکات. بۆیە پێویستە ئێمە لەسەر کەمبوونەوەی دانیشتووانی گوندەکان و کۆچەرییەکان بەرنامەیەکی تۆکمە دابڕێژین. کاتێک ڕۆژنامەی خۆراسان دەنووسێت چڕی دانیشتووانی دەوروبەری شاری مەشهەد تاکو سەر سنوور لە ملیۆنێک کەس تێپەڕیوە. وا هەست دەکەم من لە گەردەنەی شەلەمی سەرما لێیداوم، وا هەست دەکەم دانانی بەرنامە لە وڵاتی ئێمەدا دوچاری سەهۆڵبەندان بووەتەوە. ئاخر چۆن دەبێت لە شارێکدا دوو ملیۆن و نیو خەڵک بژین و لە دەوروبەریشیدا یەک ملیۆن کەس هەبێت.



۲۰۱/۳/۱۷ دکتۆر پاپولی لەسەر مەزاری سەرۆک مام جەلال



۲۰۱۹/۳/۲۰ سەهۆڵەکە - سلێمانی



دکتۆر پاپولیو هاوسەرەکەی و کوڕەکەی، سەیرانگای دوکان



گۆڕستانی شەهیدانی گۆپتەپە، ٢٠١٩/٣/٢٤



دکتۆر پاپولی یەزدی و تەها سێکانیانی، سێکانیان، ٢٠١٩/٣/٢١



٢٠١٩/٣/١٨ بەردەم پەیکەری نەرامسین، تەها سێکانیانی، دکتۆر پاپولی ، هاوسەرەکەی



۲۰۱۹/۳/۲۱ لە ڕاستەوە: مریەم حاجی محەمەد، خانم هومان، دکتۆر پاپولی، حەسەن حاجی حەمە ئەمین، تەها سێکانیانی



زانکۆی سلێمانی، ۲۰۱۹/۳/۲۵

دکتۆر پاپۆلی یەزدی، لەم بەرگەی بیرەوەرییەکانیدا، ئاوڕێکی مێژوویی، ئابووریی و کۆمەڵایەتیی لە کوردانی خوراسان داوەتەوە، بە وردی و زۆر بە ئەمانەت و ویژدانەوە چۆنێتی ژیان و گوزەرانی کوردە کۆچەرییەکانی خوراسانمان پێدەناسێنێت.

پاپۆلی، لە بەهاری ساڵی ١٩٦٨ دا، بە مەبەستی لێکۆڵینەوە سەبارەت بە هۆزە کوردەکانی باکووری خۆراسان، گەشتێک ئەنجام دەدات، پاشان هەر ئەو لێکۆڵینەوەیە، ساڵی ١٩٨٢ دەبێتە تێزی دکتۆراکەی لە زانکۆی سۆربۆن لە پاریس.



پاپۆلی دەڵێت: «ئێرەش هەر کوردستانە، جێگایەکە بەدرێژایی (٨٠) ساڵ گەڕیدەکانی وڵاتان بە کوردستانی خۆراسان ناویان بردووە». لەوێ دەمانباتە نێو ڕەشماڵ بە ڕەشماڵی کوردە کۆچەرییەکان، وەک کەسانی زۆر نزیکی خۆمان دەیاننناسین و هەڵسوکەوتیان لەگەڵ دەکەین. هەر لەوێ جیاوازی چینایەتی، زوڵم و زۆری خان، چیرۆکی ئەویندارى، بیری کۆمۆنیستی و تووڕەیی سروشت دەبینین، بە هەموو هەستێکەوە بەر ڕووداوەکانی گەردەنەی شەلەمی دەکەوین کە دەگاتە ئەوجی تراژیدیا و ململانێی نێوان مرۆڤ و سروشت.

پاپۆلی لەم بەرگەدا بە سینەماکاران و فیلمسازانی کورد دەڵێ فەرموون ئەوە سیناریۆ و چیرۆکی زیاتر لە فیلمێک، ئەگەر دەتانەوێت فیلمی دەگمەن و ناوازە دروست بکەن.

ساڵح بێچار